کۆکردنەوە و ڕێکخستنی
ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی



سەرجەمی بەرهەمی

# شاکر فەتاح

سەرجەمی بەرهەمی

# شاکر فەتاح

کتێبی سێیەم

سەرجەمی بەرهەمی

# شاکر فەتاح

کتێبی سێیەم

ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی
ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی

ناوی کتێب: سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح- کتێبی سێیەم
ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٧٦
دەرهێنانی هونەری و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی + دڵشاد مستەفا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣١٤)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# ئاكرێ

نووسراوێکی مێژوویییە. لە ساڵی ١٩٥١دا دانراوە، لە بابەت ئاکرێ و مێژوو و کۆمەڵایەتی و باری ئابووری و لێ هاتوویی و شارستانێتی و زانست و زەویناسی و ئازار و هاواری و بەزموورەزمی و هۆی دواکەوتنی و پێشنیاز بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی و پێشکەوتن و گەشەکردنیەوە دەدوێ.

شاکر فەتاح

سەرنجێک لەم کتێبە

نووسراوی (ئاکرێ) کاتی خۆی بەشێکی فراوان و گەورەی بۆ خۆی گرتووە لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردی و عەرەبییەکاندا، ئەو کاتەی مامۆستا خۆی بۆ جاری دووەم ١٩٥٠ لەو شارە قایمقام بووە.

بۆیە دەبینین لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی:

الأيام - بغداد، الفجر - الموصل، المثال - الموصل، جريدة أربيل، مجلة الحكم الذاتي - اربيل.

ژین - سلێمانی، هیوا - بەغدا، رۆژی نوێ - سلێمانی.

جگە لەوەی کە باسەکانی ناو ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی لە دووتوێی کتێبێکدا بەناوی (قضاء عقرة) وە لە ساڵی ١٩٥١دا بەعەرەبی[1] چاپ کردووە، بەڵام باشترین کارێک لەم رووە کە کردوویە ئەوە بووە کە سەرجەم ئەو وتار و نووسینانە کە لەملا و لەولای بلاوی کردونەوە، کردونی بەکوردی و لە فایلێکدا پاکنووسی کردوون (ساڵی ١٩٨٦) و ئامادەی کردوون بۆ چاپ.

جا بەم کارەی گەلێ ئەرکی لە کۆڵ ئێمە کردەوە و بیری ئەوەشمان لە مێشک دەرکرد کە کتێبی (قضاء عقرە) دیسان چاپ کەینەوە.

لێرەدا ئەوەی دەبێ بوترێ ئەو سەرنج و تێبینیە وردانەی مامۆستایە دەربارەی ژیانی هەمەلایەنەی ئەو قەزایە لەو سەردەمەدا و تۆمارکردنی گەلێ زانیاری بەنرخی مێژوویییە کە (ئێستا) هەمووی دەبنە ژێدەرێکی سەنگین بۆ هەر نووسەر و لێکۆڵەرەوەیەک کە بیەوێ دەربارەی ئاکرێ و دەڤەرەکەی بنووسێ.

دیارە پلەی لێپرسراوی خۆیشی وەک قایمقامێک، یارمەتیدەرێکی سەرەکی بووە بۆ بەدەستخستنی زۆربەی زانیارییەکان، جگە لە پەرۆشی خۆی بۆ بەرپاکردنی کۆمەڵێ چاکسازی فرە بابەت و لایەن لە قەزاکەدا.

---

(١) لە کتێبی (دەستنووسێکی شاکر فەتاحی شەهید) مامۆستا لە لاپەرە (٦٤)دا دەڵێ کە ١٩٥١ دامناوە، لە لاپەرە (٧٤)دا لە لیستی چاپکراوەکاندا هاتووە.

(بروانە ئەو سەرچاوەیە - وەزارەتی رۆشنبیری - هەولێر ١٩٩٨ - لە ئامادەکردنی فەلەکەدین کاکەیی و مەحموود زامدار - زنجیرەی ژمارە ٣٢).

ئاکرێ دەبێتە هاوینەهەوار

شاری ئاکرێ وای لێ دێت کە ببێتە هاوینەهەوارێکی جوانی ڕێکوپێکی ناوازە و نایاب، کە کەڵک و فەڕبەخشێ بەهاونیشتمانەکان. خودا یاربێ ئەمەیش بەم زووانە پێک دێت...

پێشکەشکردنی نووسراوەکە

بۆ ئەو کەسانەی گۆی زەوی بەنیشتمانی خۆیان دادەنێن و، خێزانی مرۆڤایەتی بەنەتەوەی خۆیان دەزانن و، لە هەر کوێیەک بن و، بۆ هەر نەتەوەیەک بێ، بەدڵێکی پڕ خۆشەویستییەوە بۆ کەڵک و فەڕبەخشین و، مرۆڤایەتی و خوداناسی تێ دەکۆشن و خەبات دەکەن... بۆ پیاوانی مەرد و چاکەخواز، ئەم نووسراوە بچووکەم پێشکەش دەکەم.

(شاکر فەتاح)

## پێشەکی

پێش ئەمەی بگەمە ناوچەی ئاکرێ، وەک جێ نوشینێک (قایقام) فەرمانی تێدا ببینم، زۆر کەس ئامۆژگارییان کردم، کە خۆم لە دانیشتوانی ناوچەکە بپارێزم و، تا زووە خۆمیان لێ دووربخەمەوە. لە زۆر کەسیشەوە کەوتە بەرگوێم، کە ناوچەی ئاکرێ هەتا بڵێیت خراپە و، خودا ئەو کەسە بپارێزێت کە لەوێدا تووشی فەرمانکردن دێت.

کە لە ڕۆژی (١١/٦/ ١٩٥٠)یشدا گەیشتمە ئاکرێ و دەستم کرد بەفەرمان کردن، (ناوچەی ئاکرێ)م وا هاتە پێش چاو کە یەجگار پاشکەوتوو و سەرگەردان و داڕزیوە، چ لە ڕووی بیروباوەڕ و ورەوە، چ لە ڕووی شارستانێتییەوە. منیش کە ئەوەم بۆ دەرکەوت، زانیم ڕازی چییە کە ناوچەی ئاکرێ لەناو کەسانی تردا ناوبانگی بەو جۆرە بەخراپ دەرچووە!... بەڵام کە باش لێی وردبوومەوە، بۆم دەرکەوت: دانیشتوانی ناوچەکە، لە باری سروشتی خۆیاندا، هیچ جیاوازییەکیان نییە لە دانیشتوانی ناوچەکانی تری عێراق. ئەوانە لە باری ئێستایاندا، بەهەموو کەم و کوڕییەکیانەوە کە هەیانە، بەزۆری بەهۆی فەرمانبەرانی خراپەوە تووشیان هاتوون. چونکە ئەو فەرمانبەرانە، بەپێچەوانەی فەرمانی سەرشانی خۆیان جووڵاونەتەوە، ناوچەکەیان بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان چەوساندۆتەوە و، ڕووتاندۆتەوە، بێجگە لەوە کاروباریشیان بەرەڵلا کردووە و، کەمتەرخەمییان لەگەڵدا نواندووە. لەبەر ئەوە ناوچەکە تا هاتووە وێران و سەرگەردان بووە، تا گەیشتۆتە ئەم بارە خراپە کە هەموو کەس سەری لێی سوڕدەمێنێ. تەنانەت ئەو فەرمانبەرانە، ئەمەندە لە ڕاستی و دادپەروەری لایان داوە، هەر کەسێک لە دانیشتوانی ناوچەکە سکاڵای دەردی خۆی کردبێ و لەسەر مافی ڕەوای خۆی هەڵیدابێ، بەبەدگۆ و چەنەبازیان داناوە. بەوەیش وازیان نەهێناوە داخی دڵی خۆیان بەهەموو کەسانێکی ناوچەکە ڕشتووە. تەنانەت کە لە ناوچەکەیش گوێزراونەتەوە، هەموو دەم توانج و پلاریان گرتۆتە دانیشتوانی ناوچەکە و، چاوڕاویان لێ کردوون و، هاش و هۆشی خراپیان دەربارەیان نواندووە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو فەرمانبەرانە، خۆیان شایستەی ئەو

جۆرە توانج و پلار و قسە ناشیرینانە بوون، کە وەک نەشتەر دڵ بریندار دەکەن. ڕاستی قسەکانیشمان بەوەدا دەردەکەوێت، کە گەلێک جار هەندێ لە کاربەدەستانی عێراق، کە کردەوە و کاری ئەو جۆرە فەرمانبەرە خراپانەیان لێ ئاشکرا دەبوو، زەبروزەنگیان بەسەردا دەنواندن و سزایان دەدان. جا بەدرێژایی سەدان ساڵان، ناوچەی ئاکرێی کڵۆڵ لەم بارەدا دەژیا. هەرچەندە چەند جارێک ئەو بارە، بەهۆی کردەوە و کاری هەندێک فەرمانبەرانی مرۆڤپەروەرەوە، ڕووی دەکردە چاکی و دەگۆڕا، بەڵام داخەکەم ئەو سەردەمە بچووکانە، بەکەم دادەنرێن لە چاو تەمەنە درێژەکەی ناوچەکەدا کە پڕی بووە لە ئازار و هاوار و سەرگەردانی.

ئیتر ئەمەندە و، هەروەک لە لاپەڕەکانی ئەم نووسراوەدا دەردەکەوێت (ناوچەی ئاکرێ) لە ناوچە هەرە گەورەکانی عێراقە و، بەیەکێک لە هەرە ناوچە جوانەکان و چاکەکان و گرنگەکانی دادەنرێ. هەروەها دانیشتوانی ناوچەکەیش تا ئەندازەیەکی گەورە زیرەک و بلیمەتن و ئامادەیشن بۆ پێشکەوتن و بەرزبوونەوە و سەربەرزیی. کردەوە و کاریان جوانە و ڕەوشت و خوویشیان پەسەندە. حەز بەچاکی دەکەن، چ بۆ نیشتمانەکەی خۆیان و، چ بۆ نیشتمانانی تر. ئامادەیشن بۆ ڕێککەوتن و خۆشەویستی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە دڵسۆزی خۆیان بۆ ئەوان دەردەخەن، نازی میوان دەکێشن و ڕێز لە داماو و کز و لێقەوماو دەگرن و، یارمەتی ئاوارە و بێچارەیش دەدەن. سەر بۆ کەس دانانەوێنن سەربەرزیی خۆیشیان دەپارێزن بەهەرچەندێکیش لە سەریان بکەوێت مافی خۆیان دەپارێزن. کەواتە کاربەدەستانی دڵسۆز پێیان دەکرێ، لەگەڵیاندا ڕێک بکەون و، ئاراستەیشیان بکەن بۆ کەڵک و چاکەی گشتی. چونکە دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ، تینووی پێشکەوتن و سەربەرزی و گەشەکردنن. کەواتە، ناوچەیەک کردەوە و ڕەوشتی دانیشتوەکانی وەهابێ، هەڵناگرێ ئەمەندە لە پاشکەوتوویی و داماویی ناسۆردا بمێنێتەوە. جا هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەم نووسراوە بچووکەم نووسیوە و، پێشکەشی خوێندەوارانی بەڕێزم کردووە لەگەڵ کاربەدەستە هێژاکاندا، تا ئەو ڕاستییانەی پێویستن لە بابەت (ناوچەی ئاکرێ) وە، بەپێی توانایی خۆم، بۆیان دەربخەم. جا ئەگەر توانیبێتم، هەست و یارمەتییە بەنرخەکانیان دەست بخەم بۆ ئەو ناوچە سەرگەردانە، ئەوا خۆم بەبەختیار دەزانم، بەچەشنێ دانیشتووەکانی، کە لە کانگای دڵیانەوە ئاوات دەخوازن، ناوچەکەیان بگاتە ئەو ئەندازەیەی خۆی بەخۆشگوزەران و ڕۆشنبیر و کامەران بزانێت. هەروەها سوپاسگوزاری کەسایەتییە بەڕێزەکانیان دەبم، کە ئەو یارمەتییە بەنرخانە پێشکەشی (ناوچەی ئاکرێ) دەکەن. ئیتر ئەمەندە و لە خودا دەپاڕێمەوە لەم خەباتەماندا سەرمان بخات.

شاکر فەتاح
جێنوشینی ناوچەی ئاکرێ
ئاکرێ: ١٩٥١/٣/٢٤[1]

---

(١) ئەم پێشەکییە وەک سەرەتایەک بۆ زنجیرە باسێک - لە ژمارە (٤) تەمووزی ١٩٦٠ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)دا لە لاپەڕە ٤٩دا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لە کۆتاییەکەیدا بەرواری ١٩٥١/١/١٥ی پێوەیە!.

## مێژووی ناوچەی ئاکرێ

### شاری ئاکرێ

(ئاکرێ) شارێکی زۆر کۆنە. بەپێی ئەو سەرگوروشتانەی لە دەمی دانیشتوانی ئاکرێ وە گوێمان لێیان دەبێ، ئاکرێ لەلایەن فەرمانداریکی زەردەشتییەوە دروست کراوە، کە ناوی (زەند) بووە. ئەو دروستکردنە پێنج سالی پێ چوو. ئەوەیش لە نزیک سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا ڕووی داوە. ئیتر شاری ئاکرێ چۆتە ژێر چنگی فەرمانڕەوایی (میدیا)ی کوردەوە، کە لە باکوری ئاکرێ چۆتە ژێر چنگی فەرمانڕەوایی (میدیا)ی کوردەوە، کە لە باکوری خاکی ئێراندا دامەزرابوو. پایتەختی ئەم فەرمانڕەواییە کوردەیش ناوی (ئەکباتان) بووە، کە لە جێگەی (هەمەدان)ی ئێستا دابووە. فەرمانڕەوایی میدیا توانی لەگەڵ فەرمانڕەوایی کلدانییەکاندا کە پایتەختیان (بابل) بوو، دەوڵەتی (ئاشوور) لەناو ببات و، هەرچییەکیشی هەیە لەناو هەردووکیاندا دابەشی بکەن. فەرماندە کوردەکەیش کە ناوی (زەند) بووە ناردوێتی بەشوێن پێغەمبەرێکی کورددا، کە ناوی (زەردەشت) بووە. ئەویش هاتووەتە شارە تازەکە و، سێ ڕۆژ تێیدا ماوەتەوە. لەسەر پۆپەکانی شاخەکەی چوار لای (ئاکرێ) ئاگری زەردەشتی کردۆتەوە وە بەناوی پیرۆزباییەوە. ئیتر بەو بۆنەیەوە شارەکە ناونراوە (ئاگرێ). کە واتای (ئاگر) دەبەخشێ و، ڕووناکی سرووشی باوەڕکردن بەخودا و پاکی و چاکی دەخاتە دڵی ئەو کەسانەوە کە تێیدا نیشتەجێ دەبن. ئەم جۆرە بیروباوەڕانەیش لە ئایینی زەردەشتییەوە هەڵدەقولێن. دوای ئەوە ناوی شارەکە وردە وردە دەگۆڕێ و دەبێتە (ئاکرێ). هەر بەو چەشنەی کە ئیمڕۆ ئاکرەییەکان خۆیان ناوی دەبەن. ئێمەیش نازانین ئەم سەرگوروشتەیە تا چ ئەندازەیەک باوەڕی پێ دەکرێ. چونکە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویمان لەبەردەست دانییە پشتی ئەو قسەیە بگرێ. ئەوەندە هەیە کە سەرنج لە چۆنێتی دروستکردنی جۆگەلەکان و سارداوەکان و بیرەکان و ژوورەکان دەدەین، کە لەسەر لوتکەکانی ئەو شاخەن کە دەڕوانێت بەسەر شاری ئاکرێی ئێستەدا و لە بەرد هەڵکەندراون، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەم شارە زۆر کۆنترە لە سەردەمەکانی ئیسلام و مەسیحی. ئەم جۆرە جێماوانەیش لەلایەن نەتەوەیەکی واوە دروست کراون و ماونەتەوە، کە زۆر کۆنن و، لە شارستانێتیشدا دەستێکی بالایان بووە. دیارە زۆر خاوەن باوەڕ و خاوەن خواست و بەچنگیش بوون، بۆیەکا توانیویانە ئەم شارەیان لە پاڵ ئەم شاخە سەختە سەرەولێژە بەرگەگرەدا دروست بکەن، نەک لە دەشتاییەکی پان و فراوان و ئاساندا. سا بۆیە شارەکە جێگایەکی جەنگی داگیر کردووە، لەگەڵ شوێنێکی بایەخدارە، بنکەیەکی بازرگانی گەورە و گرنگدا. ئەمەیش سەرسوڕمانی پێ ناوێ. چونکە شاری ئاکرێ، هەموو دەم، داگیرکەرانی پارێزگاری مووسڵ، چاویان تێ بڕیوە، بیگرن. چونکە بەهۆی داگیرکردنی ئەوەوە توانیویانە چنگ بگرن بەسەر ئەو هەموو خاکانەدا کە کەوتوونەتە ناوەند (زێی گەورە) و (ڕووباری خازر)ەوە.

## ناوچەی ئاکرێ

هەرچۆنێک بێ، ئەوە لەناو مێژوودا جێگیر بووە کە ناوچەی ئاکرێ، یەک لە دوای یەک، لەژێر چنگەی چەند فەرمانڕەواییەکی مێژووییدا بووە، کە بەناوبانگەکانیان ئەمانەن: میتانی کوردی، ئاشووریی، کلدانی، میدیای کوردی، فارسی، یۆنانی، ڕۆمانی، ئیسلامی، لەمەی دواییدا فەرمانڕەوایی (خلفاء الراشدین)، (ئەمەوی)، (عەباسی)، (ئەیووبی کوردی)، (میرنوشینی بادینانی کوردی) کە نزیکەی شەش سەد ساڵ ژیاوە، (میرنوشینی ڕەواندزی کوردی) کە لە ساڵی ۱۸۳۳ی زایینیدا و لەسەر دەستی (محەمەد پاشای گەورە)دا ئاکرێی گرت. دووبارە (میرنوشینی بادینان). لە دوای لەناوچوونی میرنوشینی سۆرانیش لە ڕەواندزدا، لەسەر دەستی (عوسمانی)یەکاندا، لەشکری تورکی عوسمانی کەلاتی ئاکرێی گرت و لە ساڵی (۱۸٤۳ز)دا خستیە ژێر چنگی خۆیەوە. وەک ئاکرەیییەکان دەیگێڕنەوە، لە گردێکەوە کە تا ئێستایش پێی دەڵێن (گری تۆپی)، کەلاتەکەیان داوەتە بەر تۆپ. ئیتر لەو ساکەوە (ئاکرێ) کراوە بەبنکەی ناوچەیەک کە لە دوو لای پێکهاتووە، واتا (لادێی سورچی) و (لادێی عشائر السبعە)، کە جێنوشینی (قایمقام)ێکی تورک کراوە بەسەرداری لەژێر فەرماندەی (والی مووسڵ)دا.

## بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش

ئەوەندە هەیە، هەر لەو ساکەوە تا دەگاتە سەردەمی داگیرکەرانی بەریتانیا ناوچەی ئاکرێ هەموو دەم لەناو شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە و شۆڕشدا ژیاوە، لەبەر خراپی کردەوە و کارەکانی فەرمابەرەکانی تورکی عوسمانی. بەڵام فەرمانڕەوایی عوسمانی توانیوێتی (شێخ عەبدولسەلام)ی شۆڕشگێری بارزانی بگرێ و، لەسەر دەستی (سلیمان نظیف)ی والی مووسڵدا بیکات بەداردا[1].

ئیتر لەو ساکەوە ناوچەی ئاکرێ تا ئەندازەیەک بێ دەنگ و سەنگی پێ براوە. بەڵام کە لەشکری بەریتانیا خاکی عێراقی لە ساڵی ۱۹۱۸دا داگیر کرد. ناوچەی ئاکرێیش لە ساڵی ۱۹۲۰دا چووە ژێر چنگیەوە. سەردارێکی ئینگلیزیان بەسەر ناوچەی ئاکرێوە دانا. سەردارەکە دەیویست بەتوندوتیژییەکەوە فەرمانداری بکات. هۆزەکانی ناوچەکە لێی ورووژان. (زێبارییەکان) و (بارزانییەکان) لێی ڕاست بوونەوە سەرداری (ئاکرێ) و (سەرداری زێبار)یان کوشت. هۆزەکان بەسەرکردایەتی (شێخ ئەحمەدی بارزانی)یەوە توانی یانی شاری (ئاکرێ) بگرن. چەند کەسێک لەو هۆزانە ئازاری دانیشتوانی شارەکەیان دا. بەڵام دوایی هەر لەو ساڵەدا، لەشکری بەریتانیا توانییان شارەکە بگرنەوە، بێ ئەمەی بەرەنگاریی بکرێن. دوا بەدوای ئەم شۆڕشە، یاخی بوونی شێخەکانی سورچی دەستی پێ کرد کە هۆیەکەی پەیوەندی بەکەسایەتی سەرکردەکانیەوە بوو، وەک (شێخ ڕەقیب) و (شێخ عوبێدوڵلا) و (شێخ قیوم) کە لە کوڕانی (شێخ محەمەد) بوون. ئەوانە پەنایان بردە بەر خاکی هەولێر و، لەگەڵ (ئۆزدەمیر)ی

---

(۱) بۆ زیاتر دەربارەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شۆڕشەکەی دژی داگیرکەران عوسمانییەکان ۱۹۰۸ - ۱۹۱٤/۱۲/۱/۲، بڕوانە: (پێ ڕەش - بارزان وحرکة الوعي القومي الكردي ۱۸۲٦ - ۱۹۱٤ مطبعة - ؟ - ۱۹۸۰).

سەرکردەی لەشکری (تورکی کەمالی)دا دەستیان خستە ناو دەستی یەکترەوە و، لە دژی فەرمانڕەوایی عێراقی ژێر دەستی بەریتانیا، تا نزیکەی سێ ساڵ شەڕ و شۆڕیان کرد. بەڵام کە فەرمانڕەوایی عێراق، چاوپۆشی لەیاخی بوونەکەیان کرد و، کەمەکێکیش جەریمەی کردن، بەپەشیمانییەکەوە گەڕانەوە شوێنی خۆیان.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عێراقیشدا، تا ئەندازەیەک ناوچەی ئاکرێ بێ دەنگ مایەوە. بەڵام بەهۆی کار و کردەوەی سەرەک هۆزەکانیەوە، لە ئاژاوە و شەڕ و شۆڕی ناوخۆ ڕزگاری نەبوو. لە ساڵی ١٩٤٥دا ئەم هۆزانە بوونە پاڵپشتی فەرمانڕەوایی عێراق لە کوژاندنەوەی شۆڕشی بارزاندا. لە ساڵی ١٩٤٤دا (لادێی بیرەکەپرە) خرایە سەر ناوچەی ئاکرێ. پێویستە ئەوەیش بگوترێ کە هۆزی زێباری کە لەم لادێیەدا نیشتەجێ بوون، لەسەرەتای شۆڕشەکەی بارزاندا لەگەڵ (شێخ ئەحمەد) و (مەلا مستەفا)ی بارزانیدا کە ئەوساکە سەرکردەی شۆڕشەکە بوون، هاوپەیمان بوون، بەهەردوولایان زیانێکی زۆریان لە فەرمانڕەوایی عێراقدا، کەچی لە دواییدا لەژێر سەرکردایەتی (مەحموود ئاغای زێباری) و خزمەکانیدا، هۆزەکە لە بارزانییەکان هەڵگەڕانەوە و لەگەڵ لەشکری فەرمانڕەواییدا بەرەنگاریی بارزانییەکانیان کرد. لە ساڵەکانی ١٩٤٧ و ١٩٤٨ و ١٩٤٩یشدا ئاژاوە و شەڕوشۆڕ و خوێنڕێژی لە ناوەند هۆزەکانی (هەرکی) و (گێژ) و (سورچی)دا، دوای ئەوە لە ناوەند (سورچی)یەکان خۆیاندا و، لە ناوەند (زێباری)یەکان خۆیاندا بەرپابوون. زیان و مەترسی و خەم و خەفەتێکی زۆر کەوتە ناوچەی ئاکرێوە. بەڵام لە بڕانەوەی ساڵی ١٩٤٩دا، سەرۆکەکانی ئەو هۆزانە، هۆشیان هاتەوە سەر خۆیان. کە فەرمانڕەوایی عێراق دەستی کرد بەچارەسەرکردنی بارەکە، لە ڕێی تایبەتی خۆیەوە ناوچەی ئاکرێ لە ساڵەکانی (١٩٥٠) و (١٩٥١)دا گەیشتە پۆیەی هێمنی و ئاسایش و ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی، وەک هەموو لایەکی خاکی پارێزگای مووسڵ.

## ئابووری

شاری ئاکرێ لەمەوپێش بنکەیەکی بازرگانی گرنگ بوو. بازرگانییەکەی دەگەیشتە شارە گرنگەکانی (عێراق) و (ئێران) و (تورکیا) و (سوریا). جاری وایش هەبوو دەگەیشتە شارەکانی ڕووسیای قەیسەری. هۆزەکانی ناوچەی ئاکرێ و هەندێک ناوچەی دراوسێیش پێویستییەکانی خۆیان لە شاری ئاکرێ دەکڕی و دەست دەکەوت. بەڵام لە ئەنجامی گرتنی سنوورەوە بازرگانییەکەی کەوتە نوشوستییەوە. کردنەوەی ڕێگا گشتییەکانیش بۆ ئۆتۆمبیل و دامەزراندنی ڕێگای ئاسن، ئەوەندەی تر کاری خراپی کردە سەر بازرگانی شاری ئاکرێ. چونکە هۆزە دراوسێکانی شاری ئاکرێ ڕاستەوخۆ دەستیان کرد بەهێنانی پێویستییەکانی خۆیان لە شارەکانی تری عێراقەوە. هەروەها بێ ئەمەی پەنا بەرنە بەر بازرگانانی شاری ئاکرێ، بەروبووم و کەلوپەلەکانی خۆیشیان ڕاستەوخۆ دەبردە ئەو شارانە و لەویانەدا دەیانفرۆشتن.

پیشەسازییەکەی ئاکرێیش بەهۆی پەیدابوونی دەستکردەکانی خاکەکانی بێگانە لە بازاڕەکانیدا لە شێوەیەکی زۆر و زەبەندەدا و، هەرزانی نرخەکانیان لەچاو نرخی کەلوپەل و دەستکردەکانی ئاکرێدا و،

نەگۆڕان و گەشەنەکردنی پیشەسازییەکانی ئاکرێیش بەپێی ڕۆژگاری تازە و پێویستییە تازەکانی کوردەواری، تا دەهات کز و لاوازتر دەبوو.

کشتوکاڵەکەی ئاکرێیش، لە ڕووی شێوەی بەرهەمهێنان و ئامێر و کەلوپەلی کشتوکاڵ و، دابەشکردن و فرۆشتنی بەروبوومەوە، هیچ گۆڕان و گەشەکردن و پەرەسەندنێکی نەکرد، هەروەکو سەدەکانی سەرەتای ژیانی ئادەمیزاد مابووەوە...

لە ئەنجامی ئەمانیشەوە -واتا داماوی زۆر لەسەر بەروبووم و کەلوپەل و، کەمبوونی بەروبووم و کەلوپەل، یاخود زۆربوونی کەلوپەل و بەرهەمی بێگانە و کەمبوونی فرۆشتنی بەرهەم و کەلوپەلی خۆماڵی بەبێگانە- هیچ پەیدا نەبوو ئەوە نەبێ کە لەناو نەتەوەکەماندا (هەژاری) و (نەخوێندەواری) و (نەخۆشی) و (زۆرداری) گەمارۆیان داین!...

بەڵام لە هاوینی ساڵی (١٩٥٠)وە ناوچەکە دەستی کرد بەڕێکخستنی هاوینەهەوارەکانی خۆی و، بانگەوازیشی بەهەموو لایەکدا بۆ ڕاهێشت بۆ ئەمەی گەشتیارانی بۆکێش بکات. جا ئەگەر ئەمە سەری گرت، بێگومان (باری ئابووری)ی ناوچەکە بەرەو چاکی دەڕوات. هەر بەو پێیەش بارەکانی تری ناوچەکەیش تا دێت پێش دەکەون.

## ئاوەدانی

لە پاش سەرگەردانییەکی زۆر کە لە ژێر سێبەری فەرمانداری عوسمانیدا تووشی ناوچەی ئاکرێ هات،[1] لەبەر (زۆرداری) و (کەم تەرخەمی)ی، سەردەمی فەرمانڕەوایی عێراق هاتە پێشەوە. لەم سەردەمەدا چەند ڕێگایەکی گشتی کرایەوە بۆ ئۆتۆمبیل، چەند پردێک دروست کرا، چەند ساختمانێکیش لە بنکەی ناوچەکە و لادێکانیدا دروست کران. ئامێرانی گفتوگۆکردنی نوێیش دامەزرێنران.[2]

چەند خوێندنگا و نەخۆشخانەیەکی سەر بەفەرمانڕەوایش کرانەوە. پرۆژەی ئاو و کارەبایش دامەزرێنران ساختمانەکانی شارەوانی و سەیرانگاهەکانی شاری ئاکرێیش دروست کران. لەبەر ئەوە ناوچەکە تا ئەندازەیەک ڕووی کردە ئاوەدانی. بەڵام هێشتا زۆری ماوە ئەو پرۆژانەی ئاکرێ داماوە لە سەریان، تێیدا دابمەزرێن. ئەوەی شایانی باسە، دانیشتوانی ناوچەکە، بەتایبەتی شاری ئاکرێ، لە ساڵەکانی ١٩٥٠ و ١٩٥١دا لە جووڵەی ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکەدا هاوبەشییەکی زۆریان نواند لەگەڵ جێنوشینییەکەیاندا. هەندێک لەو پرۆژانەی ڕاپانپەڕاندن لەسەر ئەرکی خۆیان بوو. هەندێکیشیان بۆ یاریدەدانی شارەوانی ئاکرێ و فەرمانڕەوایی بوو.

---

(١) هەروەها لەژێر دەسەڵاتی حوکمی حوکمەتەکەی بەغداوە کە داگیرکەری ئینگلیز پێکیەوەنا و باشووری کوردستانی کردە بەشێک لەو.

(٢) مەبەستی ڕاکێشانی هێڵی تەلەفۆن، وە دامەزراندنی فەرمانگەی پۆستە و گەیاندنە.

## ئاشی ئاو و ئاشی هەڵمی

لە ناوچەی ئاکرێدا (٣٤) ئاشی ئاوی و (٣) ئاشی هەڵمی هەیە. لەمانە:

(٧) ئاشی ئاوی و (١) ئاشی هەڵمی لە شاری ئاکرێدا دامەزراون.

(٨) ئاشی ئاوی لە لادێی بیرەکەپر دایە.

(١٠) ئاشی ئاوی لە لادێی سورچی دایە.

(٩) ئاشی ئاوی و (٢) ئاشی هەڵمی لە لادێی (عشائر السبعة) دایە.

## دامەزراوەکان و کارگە تازەکان

بێجگە لە ئاشە هەڵمییەکان و، مەکینەی کارەبا و پرۆژەی ئاو لە ئاکرێدا، هیچ مەکینەیەک بۆ کشتوکاڵ یاخود بۆ پیشەسازی لە ناوچەی ئاکرێدا دانەمەزراوە. هەرچی کشتوکاڵە لەسەر شێوەی کۆن بەرهەم دەهێنرێ. جاروبار مەکینەی کشتوکاڵ بۆ کێڵانی زەوی و دروێنە لە شاری مووسڵەوە، لەلایەن مووسڵییە خاوەن زەوییەکانەوە دەنێررێتە ناوچەی ئاکرێ. بەڵام هەر بۆ ماوەیەک دەمێننەوە.

## بەروبووم

بەرهەمە گرنگەکانی ناوچەی ئاکرێ لە بابەت کشتوکاڵەوە ئەمانەن: (برنج، جۆ، گەنم، کونجی، نیسک، نۆک، ماش، ترێ، شووتی، کاڵەک، سەوزەکان هەموویان، لۆکە، هەنار، هەنجیر، زەیتوون، سێو، قۆخ، قەیسی، بەهێ، توو، تەختەی دارتوو، سپیندار). بەرهەمە سروشتییەکانیش ئەمانەن: (گوێژ، مازوو، بەڕوو، قەزوان، کەتیرە، جەوی، دار، قامیش، بەفر، سەهۆڵ، بنێشت، قیر، ترش، هەنگوین، گەچ، بەردی خانوو).

بەروبوومی گیانلەبەرانیش کەماڵی دەکرێن ئەمانەن: (مەڕ، بزن، گاومانگا، کەڵەشێر و مریشک و قەل لەگەڵ ئەو بەرهەمانە کە لەو گیانلەبەرانە پەیدا دەبن، یان لەو بەرهەمانە دروست دەکرێن، وەک شیر و، ماست و، پەنیر و، فرۆ و، کەرە و، ڕۆن و، پێستە و، خوری و، مو و، هێلکە).

ئەو گیانلەبەرە دەشتەکی و، ئاوی و، ئەو پەلەوەرانەیش، کە دانیشتوانی ناوچەکە ڕاویان دەکەن، لەبەر گۆشتەکانیان، یاخود لەبەر کەوڵەکانیان، یان بۆ بەزموورەزم و ڕابواردن، ئەمانەن: (ئاسک، مامز، بزن، کەروێشک، ڕێوی، چەقەڵ، کەمتیار، سەگی ئاوی، بەراز، ماسی، کەو، پۆڕ، سوێسکە، قاز و قولنگ، گورگ، جاروبارێکیش کە کەم هەڵدەکەوێ پڵنگ و ورچ و فیلەگێژە و ژیشک).

## پیشەسازی

گرنگترین پیشەسازی ناوچەی ئاکرێ بریتییە لە دروستکردنی ڕۆن و پەنیر و ماست و هەموو بەرهەمێکی تر کە لە شیر دروست دەکرێن. هەروەها دروستکردنی (مێوژ و، دۆشاو و، سابوون و، دۆشاوی هەنار (ڕبەنار) و، مەی و، سرکە و، باسووق و سجووق و، جاو و، خام و، شاڵی خوری بۆ شەل و شەبک و، گۆرەوی و، هەگبەی خوری و، خورج و، بەڕە و، قاڵی و، ڕایەخ و، سنگی هەڵواسین و،

دارجگەرەی تەختــە و، دارجگەرەی بەرد و، کـەوش و، کـەلاش و، ڕەشک و، کـاسـە و، کـەچک و، شەکردانی تەختە و، چەقۆ و، خەنجەر و، خشـڵی زێڕ و زیو و، ئامێرانی کشتوکاڵی کۆنە بابەت و، ڕەژوو و، کلاو)یش لە ناوچەی ئاکرێ باون.

بەتەنشت ئەوانەیشەوە، هەموو جۆرە وەستایەک لە بازارەکانی ئاکرێدا دەست دەکەون، وەک: دارتاش و، بەرگدوروو و، خانوو دروستکەر و، ئاسنگەر و، تەنەکەچی و، سەرتاش و، چێشتکەر و، ڕەنگ کار، کە ئامـادەن دانیشـتـووان چییـان پێویست بێ بۆیان بکەن. سەیر ئەوەیە زۆربەی ئەم پیشـەسـازییـانە، بەتایبـەتی گـرنگەکـانیـان چ لە شـاری ئاکرێ و چ لە گوندەکـانی ناوچەی ئاکـرێدا، بەدەست دەکرێن و، ئافـرەتانیش هەڵی دەسووڕێنن و دروستی دەکەن. وا شـاری ئاکرێ خۆی ئامادەکـردووە بۆ بەجێ هێنانی گەورەترین پیشە و ناوازەترینی، کە ئەویش بریتییە لە پیشەی هاوینەهەوار پێکهێنان و ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی. ئەگەر خودا بکات و، ئەمە سەربگرێ، کەڵک و فەرێکی زۆر دەست دانیشـتوانی ناوچەکە دەکەوێ لەگەڵ هەموو عێراقییەکانی تردا. لە هاوینی ساڵی (١٩٥٠)وە دانیشتوانی شـاری ئاکرێ، لەگەڵ فەرمـانبەرانی میـریدا خەریکن، لە ڕووی ئاوەدانی و، ڕۆشنبیـری و، ڕێکخـستن و، ڕازاندنەوە، شـارەکـە پێش دەخەن و، ئامـادەی دەکـەن کـە ببـێـتـە هاوینەهەوارێکی ناوازە و نـایاب. لەم بابەتەوە لە لاپەڕەکانی پێشووی ئەم نووسراوەدا دوورودرێژ دوواوم، پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات.

## بازرگانی

ناوچەی ئاکـرێ ئەم بابەتانە دەفـرۆشێ بەدەرەوە: برنج، مـەڕ و بزن، ڕۆن، پەنیـر، مـوو، خـوری، دار، خەڵووز، کەوڵ، قەزوان، ترش، کەتیرە، بەڕوو، مازوو، جەوی، ترێ، هەنجیر، قۆخ، مێوژ، دۆشاو، لۆکە، کونجی، زەیتوون، هەنار، ڕەنار، توێکڵە هەنار.

لە دەرەوەیش ئەمـانە دەکـرێ: کـووتاڵ و بابەتی خـواردەمەنی و کـەرەسـتـەی خـانوو دروست کـردن و کەلوپەلی ناوماڵ.

## کانەکان

لە لاپاڵەکانی شاخەکانی (پێرس) و (ئاکرێ)دا، بەتایبەتی لە (ئاکرێ) و (شەهێ) و (باشقاڵ ئاغا) و (بێـخـمـە)دا کـانی خـەڵووزی بەرد و، قـیـر و، گـەچ و، ئاوی گـۆگـرداوی گـەرم هەن. ئەوەندە هەیە دانیـشـتـوانی ناوچەکـە لە ڕووی بازرگـانییـەوە هەر لە قـیـر و گـەچەکـەی کـەڵک وەردەگـرن. بەئاوە گۆگرداوییەکەیشی خۆیان دەشۆن، بۆ ئەمەی لە نەخۆشی پێست ڕزگاریان بێ.

## زانست

جاران زانست لەژێر چنگی پیاوانی ئایینیدا بوو، کە هەتا سەرەتای ئەم سەدەیەیش جێگایان هەبوو لە دڵاندا و ڕێزی تەواویان لێ دەگیرا: تێکڕا لەناو هەموو گوندێکی گەورە و گرنگدا خوێندنگایانی خۆماڵی لەناو مـزگەوتەکـانیـاندا دامـەزرابوون. بەڵام ئەو جـۆرە زانسـتـانەی کـە لەو خوێندنگایانەدا دەخـوێندران، بەزانسـتی وشـک هەڵاتوو دادەنران. چونکە بەپێی گۆڕان و گەشەکردنی ژیان و، داماوییـەکـانی نەتەوەی

کورد لە ئاکرێدا، کە هەموو دەم لە گۆڕاندا بوون، نەدەگۆڕان و بەرێوە نەدەچوون و گەشەیشیان نەدەکرد. بابەتەکانی خوێندن، بەزۆری یان ئایینی بوون، یان پەیوەندییان بەزمانەوە هەبوو. کەڵکیان هەر بۆ خوێندەوارەکان خۆیان هەبوو، نەک بۆ گەل. تەنانەت خوێندەوارەکان خۆیشیان، ئەندێشاوی بوون، دووربوون لە رووداوی ژیانەوە. ئەو جۆرە خوێندەوارانە زۆرتر بایەخیان بەتوێکڵی ژیان دەدا، نەک بەکاکڵی. تەنانەت بۆ گوزەران و ژیانی خۆیشیان لە دەستیان نەدەهات خۆیان خەریک بکەن بەکار و پیشە و فەرمانێکەوە. ئەوانە هەر چاویان لە دەستی گەلەکەیان بوو، پارەیان پێ ببەخشن و باروبوویان بکەن. هیچ کاتێ خەباتێکی شایستەیان نەدەکرد ببنە پێشەوای نەتەوەکەیان و پێشیان بخەن. واتا فەرمانی سەرشانی خۆیان بەرامبەر گەلەکەی خۆیان بەجێ نەدەهێنا. لەبەر ئەوە چارەنووسی خۆیان تووش هات کە دەبوو لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە هێز و دەسەڵات و گوزەرانیان دەست بکات بەکزی و نەمان، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی خوێندنگایانی میری هاتنەکایەوە. لە راستیدا ئەو خوێندەوارانە بۆیە وایان لێ هات کە لەسەر یاسای گەشەکردن، یاخود دەستووری پێشکەوتن و بەرزبوونەوە، یان یاسای خودایی نەدەرۆیشتن بەرێوە. ئەنجامیشیان بەوە دەگەیشت، رەنجیان بەباچوو و، ژیانیشیان لە ئەندازە دەرچوو!. لەگەڵ ئەمەیشدا لە ناوچەی ئاکرێدا گەلێک پیاوی گەورە و پەسەند پێگەیین، جێ ماوەکانیان لە نووسراوانی زانیاری و وێژەیی و ئایینیدا جێگای رێز و ئافەرینن. نەتەوەی کورد لە ئاکرێدا هەتا ئێستایش بەرێز و خۆشەویستییەوە ناویان دەهێنێ. لە سەردەمی ئیسلامیدا ئەمانە هەندێکیانن: (محەمەد کوڕی فضلون، مەلا ئەبوبەکر، مەلا مەحموود، مەلا یوسف، مەلا محەمەد کە بەناوی سەیدا مەجزووبەوە ناوبانگی دەرکردووە، مەلا سەعید) لە دانیشتوانی شاری ئاکرێن. (شێخ شەمسەدین، شێخ یونس، شێخ عەبدوڵلا، شخ عەبدولستار) لە دانیشتوانی گوندی (شۆش)ن. (شێخ مستەفا، شێخ محەمەد، مەلا محەمەد ئەبوزێد. مەلا عەبدوڵلا) لە زێبارییەکانن. (جەلالی سێبۆتی) لە لادێی (عشائر السبعە)[1]یە... هەتا ئێستاکەیش هەندێک لەو زانایانەمان لە ئارادان. یەکێکیان ناوی (هبە اللەی مفتی)یە کە ئەندامێکە لە کۆڕی ریش سپیانی عێراقدا[2] و، مامۆستای مزگەوتی گەورەی ئاکرێیە. یەکێکیشیان ناوی (خالید حەکیم)ە کە کاتی خۆی دادگەر بووە و ئێستا خانەنشینە و، ئامۆژگاری کارێکی ئایینییە. گەلێک هۆنراوەی نیشتمانی و دڵداری و دەروونی نایابی هەیە بەزمانی کوردی، کە

---

(١) لە راستیدا نەک هەر ئەمانەی مامۆستا باسیان لێوە دەکات، بەڵکو دەیان زانای ترمان هەبووە و ناویان ون بووە، وەک مامۆستا (محەمەد قزلجی) دەڵێ: «... ومع هذه المقدمة العلمية والتفوق الباهر، للأسف ضاعت تراجمهم ونسيت أساميهم واحوالهم بتأريخ صحيح مفصل الا جمعاً من الذين عاشوا في ابان الحضارة الأسلامية عند اتصال المواصلات واستمرار الرحلات العلمية والتعارف بين العلماء، فأولئك لهم اسم مذكور وذكر مشهور كالدينوريين والشهرزوريين والأربليين... وعبدالرحيم العراقي البارزاني استاذ الحافظ ابن حجر العسقلاني...» (محمد القزلجي، التعريف بمساجد، السليمانية ومدارسها الدينية، مطبعة النجاح، بغداد ١٩٣٨ ص ٨).

(٢) واتا (مجلس الاعيان) کە کاتی خۆی هەبووە.

نەتەوەی کورد ئاراستە دەکەن بۆ چاکی و بەرزی و پیرۆزی و پێشکەوتن. ئەمەندە و گەلێک چیرۆکی نەتەوەیی و نیشتمانی و ئامۆژگاری و دڵداری هەن، چ بەهۆنراوە و، چ بەپەخشان لەگەڵ جێ ماوانی تر، کە بەکوردی نووسراون و گوتراون، وەک بەیتە مێژووییە پڕ ساز و ئاوازەکان و، پەندی پێشینان و قسە نەستەقەکان و، مەتەڵەکان، کە لە ناوچەی ئاکرێدا دەبیسترێن، ئەوانە هەڵدەگرن و کۆبکرێنەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ، بۆ ئەمەی کەڵکیان لێ وەربگیرێ. داخەکەم زۆربەی ئەو کەلەپوورانە ناوی دانەرەکانیان نازانرێ. چونکە سالانیان بەسەردا تێپەڕیوە و، ڕۆژگاری خراپیش بەرەنگاریی کردوون. بەلام ئەوە لە نرخیان کەم ناکاتەوە، کە بە کەلەپوورێکی نەتەوەیی ڕۆشنبیری بەنرخ دابنرێن. نیشانەیشن بۆ ئەوەی کە نەتەوەی کورد لە ناوچەی ئاکرێدا بایەخێکی زۆری داوە بەپەروەردەکردنێکی دروست و بەهێز و، گیانێکی پاک و پیرۆز و، چێژکەیەکی بێ وەی و تەواو.

ئەو خوێندنگایانەیش کە فەرمانڕەوایی عێراق کردوونیەتەوە لە ناوچەی ئاکرێدا هەرچەندە لەچاو داماوی دانیشتووانی ناوچەکەدا بەژمارەیەکی کەم دادەنرێن بەلام کەڵکێکی زۆریان بەخشیوە بەنەتەوەکەمان لە ئاکرێدا. داخەکەم لەبەر کەمتەرخەمی خۆمان و بێ کارەیی هەندێک فەرمانبەرانی میری هەندێک لەو خوێندنگایانە داخرابوون. لە (١١) خوێندنگای سەرەتایی (٥)یان ماونەتەوە.

## ئایین

نەتەوە لەسەر ئایینی خونکارەکانی خۆی بووە.[1] لە پێشدا (ئایینی زەردەشتی) لە ناوچەکەدا بلاوبۆتەوە. ئایینی مەسیحیش کە کەمێک لە کوردستاندا بلاوببووەوە بەشی ناوچەی ئاکرێیش تێدابوو. ئایینی ئیسلامیش کە لە سالی (٢٠)ی کۆچیدا و لە سەردەمی پێشەوای مەزن (عومەر کوڕی خەتاب)دا لە ناوچەی ئاکرێدا بلاوبووەوە، لەلایەن دانیشتوانی ناوچەکەوە بەرەنگارییەکی زۆر نەکرا. ئەمەیش سەبارەت بەوەبوو کە زۆربەی ناوەرۆکی (ئایینی زەردەشتی) و (ئایینی ئیسلام) یەک دەگرنەوە. هەردوولایان باوەڕیان بەخودا و، بەنووسراوە ئایینییەکانی خودا و، بەپێغەمبەرانی خودا و، بەفریشتەکانی خودا و، بەڕۆژی چەندوچوون کردنی خودا لە ڕۆژی زیندووکردنەوەی مردووەکاندا هەیە. هەردوولایشیان هۆگری چاکەن و دژی خراپەن. لە هەر دوولایشیاندا مرۆڤی چاک لەلایەن خوداوە پاداشتی دەدرێتێ و، مرۆڤی خراپیش سزای دەدرێ. لە هەردوو لایشیاندا بەهەشت و دۆزەخ هەیە و، ئامانجی خودایش لە ئایینەکانی و لە پاداشت و سزاکانی چاکەی مرۆڤە و، دەیەوێ مرۆڤ لە دڕندەییەوە بگەیێنێتە پلەی فریشتەیی، یاخود مرۆڤی تەواو. ئێستاکەیش زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە موسلمانن و لەسەر ڕێڕەوی (شافعی)ن. بەشەکەی تریش لە دانیشتوانی ناوچەکە مەسیحین. لەم سەدانەی دواییەدا ڕێچکەی (قادری) و (نەقشەبندی) لەناو موسلمانەکاندا بلاوبوونەوە. هەروەها مەسیحییەکانیش دابەشبوون لە ناوەند ڕێڕەوی (کاتۆلیکی) و (نەستووری) و (ئۆرتۆدۆکسی)دا. (شێخەکان) و (قەشەکان) دەسەلاتێکی ئایینی بەهێزیان هەبوو. بەلام کە کوڕان و جێنشینانی ئەو خاوەن دەسەلاتانە لە

---

(١) لەسەر ئەو پەندە عەرەبیەی (الناس على دين ملوكهم)

فەرمانی سەرشانی خۆیان لایاندا و دەستیان دایە دەسەڵاتدارییەکی جیهانی پڕ زەبروزەنگ و زۆرداری، نەتەوەکە لەم ساڵانەی دواییەدا لێیان تەکینەوە و، دەسەڵاتەکانیان بەرەبەرە کزبوو و نەما. ئیتر لەوەدوا ئازادیخوازەکانی ناوچەی ئاکرێ لەو زۆروستەم و بەندەییە ڕزگاریان بوو.

لە سەرەتای سەدەی ئێستایشدا بیروباوەڕەکانی (نیشتمانی) و (نەتەوەیی) و (پێشکەوتنخوازی) لە ناوچەکەدا سەریان دەرهێنا. بەکورتی بزووتنەوە و جموجۆڵیان و کارگوزارییان بریتییە لە بەرەنگاربی کردنی ئەو بیروباوەڕە پڕوپووچانەی هەندێک پیاوانی ئاین و قەشەکان نووساندوویانە بەئاییینەکانەوە، بەمەستی ڕووتاندنەوە و چەوساندنەوەی نەتەوەکەیان لەگەڵ بەرەنگاربی کردنی (نەخوێندەواری) و (زۆرداری) و (نەخۆشی) و (هەژاری)، کە لەسەر دەستی زەویدارەکان و فەرمانڕەواییە زۆردارەکاندا تووشی نەتەوەی کورد هاتوون لە ناوچەی ئاکرێدا... جوولەکەکانیش کە لە هەزاران ساڵانەوە ڕەوویان کردووە و گەیشتوونەتە ئەم ناوچەیە، لەم دواییەدا، لە ساڵانی (١٩٥٠) و (١٩٥١)دا چوونەوە بۆ خاکی فەلەستین.

## جێماوی کۆن

لە شاری ئاکرێدا کەلاوەی گەلێک کەلات و ساختمان و جۆگا و سارداو و بیر و ژوور هەن کەلەبەرد دروست کراون و هەڵکەندراون، کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵان. کڵێسای یەعقووبییەکانی مەسیحی و، کەنشتەی جوولەکەکان و، مزگەوتە گەورەکەی موسڵمانان و، مزگەوتی (تولیتان) و، ئارامگای (شێخ عەبدولعەزیز)یش لەو جێماوە کۆنانەن.

بەتەنیشت دێی (گوندک)یشەوە کە لە لادێی سورچی دایە، چەند وێنەیەک کێشراوە، کە لەسەر بەرد هەڵکەندراون، شێوەی خونکارێک و کاربەدەستەکانی و سەربازەکانی پێشان دەدەن لە کاتی ڕاوکردندا...

لە گوندی (شۆش)یش جێماوی کەلاتێک و چەند نووسینێک بەشێوەی بزماری و، چەند ئارامگایەکی زۆر کۆن هەن، تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر مەسیح.

لە گوندەکانی (کەلادێر) و (کەلاتی) و (سوسناوا) و گردەکانی لادێی (عشائر السبعە)دا، جێ ماوی کەلات و بابەتانی تر هەن کە هەموویان مێژوویین و هی سەردەمی کۆنن.

کە لە ساڵی (١٩٥٠) و (١٩٥١)یشدا جووەکانی ئاکرێ گەڕانەوە فەلەستین، کۆمەڵێکی گەورەمان لە پێستە ئاسکی نووسراو بەشێوەی نووسینی (عیبرانی) دۆزییەوە، لەژێر زەمینی کەنشتەکەیاندا، ناردمانن بۆ دەسگای جێماوانی کۆن لە مووسڵ بۆ پاراستنیان.

## شارستانێتی و ڕۆشنبیری

ئەگەر باش وردبینەوە لەو جێماوە مێژووییانەی کە هەن لە ئاکرێ و شۆش و گوندکدا و، سەرنج لە چۆنێتی دروستکردنیان بدەین و، هەروەها ئەگەر تەماشای جۆر و ژمارەی ئەو کار و پیشانە بکەین کە لە ناوچەکەدا باون و، سەیری شێوەی دروستکردنی ساختمان و ئاوەدانی ناوچەکە بکەین و، لە باری ژیانی کۆمەلایەتی و، شێوەی گوزەران و لێ هاتوویی مێشکی دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ وردبینەوە، ئەوەمان

بۆ دەردەکەوێ کە ئەم ناوچەیە لە سەردەمانی ڕابردووی خۆیدا، تا چ ئەندازەیەک خاوەنی شارستانێتی و پێشکەوتوویی بووە، کە مافی هەیە پێیانەوە بنازرێ. چونکە لەگەڵ ئەو هەموو مەرگەسات و سەرگەردانی و ماڵوێرانییەدا کە بەسەر ئەم ناوچەیەدا هاتووە، لە سەرەتای مێژووەوە هەتا ئێستا، هێشتا دانیشتووەکانی گیانە پاکە خاوێنەکەی خۆیان پاراستووە، کە تینووی پێشکەوتن و بەرزبوونەوەیە. ئەم گیانەیش بەلای منەوە، هەر لەو شارستانێتی و ڕۆشنبیریییەوە پەیدا بووە کە لە سەردەمەکانی پێشوویاندا هەیانبووە. جا منیش هەر پشتە بەم گیانە بەهێز و هەرەتە و، گەشە کار و، هەلمەت بەرە دەبەستم، کە پێشبینی بکەم، کە ناوچەی ئاکرێ لە توانایدا هەیە گەورەیییەکەی پێشووی خۆی لە شارستانێتی و ڕۆشنبیری بەرز و پیرۆزدا بگێڕێتەوە بۆ خۆی.

## زەویناسی ناوچەی ئاکرێ

### سنوورەکەی

باکووری: ڕووباری زێی گەورە. ئەم سنووره ناوچەی ئاکرێ لە ناوچەکانی ڕەواندز و زێبار و ئامێدی جیا دەکاتەوە.

ڕۆژهەلاتی: ڕووباری زێی گەورە. ناوچەکە لە ناوچەکانی هەولێر و ڕەواندز جیا دەکاتەوە.

ڕۆژئاوای: ڕووباری خازر. ناوچەکە لە بەشێکی ناوچەی ئامێدی، ئینجا دهۆک و شێخان جیا دەکاتەوە.

باشووری: ڕووباری خازر. ناوچەکە لە بەشێکی ناوچەی (مووسڵ) و هەولێر جیا دەکاتەوە.

### پێوانەی

پێوانەی ناوچەی ئاکرێ دەگاتە (٢٨٩١) کیلۆمەترەی چوارگۆشەیی. لەم پێوانەیە نزیکەی دوو بەشی بەزەویی کشتوکاڵ دادەنرێ.

### سەرژمێری

سەرژمێری ناوچەی ئاکرێ بەپێی دوامین (ژمارە سەرکردن) کە لە ساڵی ١٩٤٧دا کراوە، هەروەها بەپێی پەڕاوە تۆمارکراوەکانی دەسگای سەرژمێرکردن (کە پەیوەندی بەهۆزی هەرکییەوە هەیە، کە ئەوان لە کاتی سەرژمێر کرنەکەدا لە هاوینەهەوارەکانی ئێراندا بوون) دەگاتە (٣٥٨١٨) کەس.

ئەویش بەم ڕەنگەیە

| نێرینە | مێینە | هەمووی |
|---|---|---|
| ٢٩٦٤ | ٢٦٢٧ | ٥٥٩١ ئاکرێ |
| ٤٠١٠ | ٤٨٤٥ | ٨٨٥٥ لادێیی بیرەکەپرە |
| ٣٠٦٧ | ٤٥٢٨ | ٧٥٩٥ لادێیی سورچی |
| ٤٢٣٦ | ٦٠٩٧ | ١٠٣٣٣ لادێیی عشائر السبعە |

| ١٥٥٥ | ١٨٨٩ | ٣٤٤٤ هۆزی کۆچەری هەریکی |
|---|---|---|
| ١٥٨٣٢ | ١٩٩٨٦ | ٣٥٨١٨ هەمووی |

ئەوەندە هەیە لەم ژمارە سەرە، هەزار کەسێکی جوولەکەی لێ ڕۆیشتووە بۆ فەڵەستین. کەواتە ئێستا سەرژمێری ناوچەی ئاکرێ دەگاتە (٣٤٨١٨) کەس.

## ژمارەی گوندەکان

ناوچەی ئاکرێ بەشاری ئاکرێ وە لە (٢٢٢) گوندی ئاوەدان پێکهاتووە (٧٢) گوندیان لە لادێی بیرەکەپرەدان. (٨٣ گوندیان لە لادێی سورچیدان (٦٧) گوندیشیان لە لادێی (عشائر السبعه) دان.

## گوندەکانی میری

لەم هەموو گوندانە (٤٤) گوندیان هی میرین. (٢٧) گوندیان کەوتوونەتە لادێی سورچییەوە. (٦) گوندیان کەوتوونەتە لادێی (عشائر السبعه)وە. (١١) گوندیشیان کەوتوونە لادێی (بیرەکەپرە)وە.

## گوندە وێرانەکان

لە ناوەندە نیوە سەدەی ڕابردوودا ژمارەی ئەو دێیانەی وێران بوون لەم ناوچەیەدا دەگاتە (٨١) دێ. لەمانە (٥٥) دێیان هی میری بوون. (٢٦) دێیشیان هی کەسانی تر بوون. بەم پێیە لە پێش پەنجا ساڵدا، ژمارەی گوندەکانی ناوچەی ئاکرێ گەیشتۆتە (٣٠٣) گوند. کەچی زۆرتر لە چواریەکیان وێران بوون. هۆیەکانی ئەم بارە ناهەموارەیش ئەمانە بوون: بەڕێوەبردنە خراپەکەی فەرمانڕەوایی عوسمانی، نەبوونی و گرانی سەردەمی شەڕی جیهانی یەکەم، هەروەها پشێوی و ئاژاوە و شۆڕشەکانی ناوچەکە

## کەش

کەشی ناوچەی ئاکرێ لە هاویندا مام ناوەندییە لە گوندەکانی سەر شاخدا بەڵام لە زستاندا ساردە. هەرچی گوندەکانی ناو دۆڵ و دەشتەکانن وەک ئەوانەی لە بەشێکی لادێکانی بیرەکەپرە و سورچی و، بەشی زۆری لادێی (عشائر السبعه)دان، لە هاویندا گەرمترن و، لە زستانیشدا وەک ئەوانی تر ساردن. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەو گوندانەی لەسەر شاخەکان دامەزراون و ڕوویان لە ڕۆژە و، ئاویان کەمە، یاخود دوورن لە تەووژمەکانی بارەشەوە، یان شاخەکان دەوریان گرتوون، لە گوندەکانی تر گەرمترن، وەک ئەو گوندانەی کەوتوونەتە بناری ئەو شاخانەی ڕووەو باشوورن لە شاخەکانی (پێرس) و (ئاکرێ)دا. بەڵام پۆپەکانی شاخەکان و ئەو جێگایانەی کەوتوونەتە سەربانی شاخەکان، لە هاویندا فێنکاییەکی وەهایان هەیە کە مرۆڤ دەگەشێنێتەوە. بەڵام لە زستاندا کەس ناتوانێ تێیاندا نیشتەجێ بێ، چونکە سەرمایەکی توندوتیژ و بەفرێکی زۆریان لێ دەبارێ.

## سروشتی زەوییەکەی

شاخەکانی ئاکرێ و پیرس و ئەو بان و گردانەی لێیان بۆتەوە نزیکەی نیوەی پێوانەی زەوی ناوچەی ئاکرێ داگیر دەکەن. جا لەم جۆرە زەوییە بەردەڵانانەدا ماوەیەکی تەسک هەیە بۆ چاندنی دانەوێڵە. بەڵام بۆ رواندنی باخ و رەزی داروردەخت زۆر بەکاردێن. بێجگ لەوە جێگای جەنگەڵ و دارستانی سروشتین، کە دانیشتوانی ناوچەکە بۆ داری سووتاندن و خەڵووز دروستکردن و پیشەسازی و کەلوپەلی خانوو دروستکردن بەکاریان دەهێنن و کەڵکێکی زۆریان لێ دەبینن. دیارە ئەگەر ئەم شاخە بڵندانەیش نەبوونایە، نە بەفەرمان بۆ کەڵەکە دەبوو، نە ئەم هەموو سەرچاوە ئاوە زۆرانەیشمان بۆ پەیدا دەبوو، تا بتوانین ئەو زەوییە دەشتایی و بەرز و نزمەی لادێکانی (عشائر السبعه) و (سورچی) و (بیرەکەپرە) ئاو بدەین، نە ئەو هەموو بەروبووم و بەرهەمانەیشمان دەست دەکەوت کە پڕن لە دانەوێڵە و میوە و سەوزە و بەری دار. ئەمەندە و هەروەک سەرنجی ڕاکێشاوم پۆپەی شاخەکانی ناوچەی ئاکرێ و بەشێکی گەورەیش لە لاپاڵەکانیان کە بەرەو ڕۆژن و ڕووەو باشوورن، بەردەڵانن و هیچیان تێدا نەڕواوە و زۆر سەختیشن بۆ پێدا ڕۆیشتن. کەچی بەشی زۆری زەوییەکانی لادێی (عشائر السبعه) دەشتایین یاخود هەوراز و نشێوییەکی کەمیان تێدایە، بریتین لە گڵێکی ڕووت و زۆر کەم بەردیان تێدا دەبینیت. ئەوەندە هەیە ئەم جۆرە زەوییانە کە بریتین لە گڵ کەم ئاون. کەواتە چارە هەر ئەوەیە کە توورومپای ئاو هەڵکێشان بەکار بهێنرێن بۆ ئەمەی تێروتەسەل لە ئاوی ڕووبارەکانی (زێی گەورە) و (خازر) ئەو زەوییە دەشتاییانە ئاوبدرێن. بەپێچەوانەی ئەو زەوییانە، ئەو دۆڵانەی لە نزیک هەردوو شاخەکەوەن، ئاویان زۆرە، وەک (دۆڵی نەهلە) کە لەلادێی بیرەکەپرە دایە و، بەڕاستی لە هەموو بەشەکانی تری ناوچەی ئاکرێ دەوڵەمەندتر و بەپیتترە و، زۆرتریش بەکەڵکی کشتوکاڵ دێت.

ڕەنگە لە هەموو جێگایەک تینوتر بۆ ئاو ئەو زەوییانە بێت کە نزیک بەلاپاڵەکانی شاخی پیرس بن کە ڕووەو باکوور هەڵکەوتوون و بەرامبەر ڕووباری زێی گەورە. چونکە هەرچەندە نزیکن لەو ڕووبارە گەورەیە کە ناوم برد، ئەوەندەی نەماوە کە لەتاو تینوویەتی بمرن. هۆی ئەوەیش ئەوەیە کە ئەو زەوییانە لە بارستایی ئاوی ڕووبارەکە زۆر بەرزترن. بریتین لە گڵ و خۆڵ لە شێوەیەکی دەشتایی پڕ بەرز و نزمیدا. ئێستاکە هیچ کشتوکاڵێکیان تێدا ناڕوێت، کشتوکاڵی زستانە نەبێت، کە مەمرەومەژی دەکەونە ژێر بەختی بارانەوە. بەکورتی زەوییەکانی ناوچەی ئاکرێ بۆ کشتوکاڵ زۆر بەکاردێن. ئەوەندە هەیە کەڵک و فەڕ دەستکەوتن لەم زەوییانە بەخەباتی فەرمانڕەواییەوە کە لە کۆڕی ئامۆژگاریی کردن و ئاراستەکردنی لادێییەکاندا بیکات لەگەڵ پشتگرتن و یارمەتیدانیان و دەستگیرۆیی کردنیان. هەروەها بەندیشە بەهەوڵ و تێکۆشانی خاوەن زەویوزارەکان و جووتیارەکانەوە، کە ئەم زەوییان لەسەر شێوەیەکی نوێ بەرهەم بهێنن.

## شاخە بەناوبانگەکان

گرنگترین شت لە ناوچەی ئاکرێدا کە هەن دوو شاخی درێژن لە ڕۆژهەلاتی ناوچەکەوە دەکشێن بۆ ڕۆژئاوای، لە ناوەند ڕووباری زێی گەورە و ڕووباری خازردا. ئەوەندەی نەماوە کە بلێین هەردوو شاخەکە بەرامبەری یەکتری جووت دەکشێن. (دۆلی نەهلە)یش کە بەچاونەندازە جوانەکانی و، گوندە ئاوەدانەکانی و بەروبوومە زۆرەکانی و سەرچاوە ئاوە تێروتەسەلەکانی بەناوبانگە، کەوتووەتە ناوەند ئەو هەردوو شاخەوە. ناوی یەکێک لەو شاخانە (شاخی ئاکرێ)یە کە لادێکانی بیرەکەپرە و سورچی لە یەکتر جیا دەکاتەوە. ناوی شاخەکەی تریشیان (شاخی پێرس)ە کە کەوتووەتە ناو لادێی بیرەکەپرەوە و (دۆلی نەهلە) و (دۆلکە و دۆلازێبار) لە یەکتر جیا دەکاتەوە. ئەو شوێنانەی لێ دەربچێ کە کەوتوونەتە سەر پۆپەی شاخەکان و، تەنیشت گوندەکان کە داربڕین و خەلووز دروست کردنیان تێدا بەکار دەهێنرێ، ئیتر هەردوو شاخەکە بەداروودرەختی بەڕوو و، مازوو و، گوێژ و، درەختانی سروشتیتر داپۆشراون. ئەو ڕێگایەیش کە لە شاری ئاکرێوە دەڕوات بۆ بیرەکەپرە بەسەر ئەم هەردوو شاخەدا هەلدەگەڕێ، ڕێگاکە هەتا بلێیت سەختە. لە سالانی سەختدا بەهۆی بەفری زستانەوە، دەبەسترێ کەس ناتوانێ هاتوچۆی تێدا بکات. هەرچی شاخی ئاکرێیە چەند گەلییەک کەرتی دەکات کە زۆر بەناوبانگن. گەلییەکان ئەمانەن: (حەسەن ماما، گوندک، شرتا). شاخی (پێرس)یش ئەم گەلییانە کەرتی دەکەن: (مار، دۆلەدەر و سپیندار).

جا لە لاپالەکان و بنارەکانی ئەم دوو شاخەدا زۆربەی گوندەکانی لادێی بیرەکەپرە لادێی سورچی دامەزراون. هەروەها زۆربەی سەرچاوە ئاوە ساردە سازگارەکان هەلدەقولێن، کە لە شوێنی خۆیاندا لێیان دەدوێم.

## ڕووبارە بەناوبانگەکان

ناوچەکە، لە لاکانی باکور و ڕۆژهەلات و، زۆربەی لاکانی ڕۆژئاوا و، باشوورییەوە، ناوەکانی ڕووباری زێی گەورە و ڕووباری خازر، دەورەی دەدەن. ئەم دوو ڕووبارە هەرچەندە ئێستاکە کەلکیان بۆ دانیشتووانی ناوچەکە کەمە، لە ڕووی کشتوکالەوە، کە هۆیەکەی ئەوەیە مەکینە و ئامێرانی کشتوکالی نوێیان تێدا بەکارناهێنن بۆ ئاو هەلکێشان، بەلام لە دوارۆژدا کە لادێییەکان هۆگری شێوەی کشتوکالی نوێ بوون، کەلک و فەرێکی زۆریان لەم دوو ڕووبارە دەست دەکەوێت. چونکە هەردوو ڕووبارەکە بەتەنیشتیانەوە گەلێک زەوی بێ ئاوی پان و فراوان هەن، کە لەوان بەرزتر هەلکەوتوون و، ئێستاکە هیچ کەلکێکی ئەوتۆیان لێ دەست ناکەوێت.

لەگەل ئەم بارەیشدا، ئاوی سەرچاوە ئاوەکان کە یەکتر دەگرنەوە و، گەلێک ناویان لێنراوە وەک چەمەکانی (سووسە، بریشوو، گبێل، شیڤا لالەیی و کەشتاو)، کە لە زەویوزاری گوندەکان دەچنە دەرەوە، لادێییەکان کەلکێکی ئەوتۆیان لێ نابینن، هەر لە ڕێی خۆیانەوە دەڕۆن تا دەگەنە (ڕووباری خازر) یان (زێی گەورە) و، دەڕژێنە ناویانەوە.

## شار و گوندە بەناوبانگەکان

١- ئاکرێ: بنکەی ناوچەکەیە. لە بناری شاخی ئاکرێ و لاپاڵەکانیدا دامەزراوە. بەئاوەدانی و ڕەزوباخ و، چاوئەندازی سروشتی جوان و، ئاو و بای سازگار و میوەی چاک و خۆشەوە بەناوبانگە. لە ڕاستیدا لە هەموو هاوینەهەوارەکانی ناوچەکە جوانتر و خۆشترە. ژمارە سەری دانیشتووەکانی دەگاتە (٥٠٠٠) کەس. چاکیی شارستانی و چاکیی لادێیی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە. تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەد ساڵێک پێش لە دایکبوونی مەسیح. جێ ماوی وەهای تێدایە کە یەجگار کۆنن. وا لە خوارەوە هەندێک زانیاری لە بابەت ئاکرێوە دەنووسم کە هی ئەم سەردەمەیەتی:

| ژمارە | ژمارە |
|---|---|
| ١١٥٨ خانوو | ٨ میس گەرەکان |
| ٢٤٦ دووکان | ٤ دارتاشەکان |
| ٣٨ کووتاڵفرۆش | ١٨ بەرگردووەکان |
| ٧٣ ئاوازەفرۆش | ٣ ئاسنگەرەکان |
| ١٢ چایچی | ٣ کەباب فرۆش |
| ٩ دانەوێڵەفرۆش | ٣ چێشتخانە |
| ٢ میوانخانە | ٢ تەنەکەچی |
| ٥ سەوزەفرۆش | ٦ پینەچی |
| ١٠٧ پیشەگەران | ٣ سۆل دوروو |
| ٤ نالبەندەکان | ٦ سەرتاشەکان |
| ٧ نانەواکان | ٣ بەرد شکێن |
| ٣ لۆکە شیکەرەوە | ١٠ ڕۆن زەیتوون خانە |
| ٤ کەوش دوروو | ١ خوێن گر |
| ٧ کەلاش دوروو | ١ یانە |
| ٣ کۆپان دوروو | ٥ سەیرانگاهی گشتی |
| ٥ زێڕەنگەر | ٨ مزگەوت |
| ١٠ زێوگەر | ١ مزگەوتی گەورە |
| ٩ کوشتیار (قصاب) | ٢ کلێسا |
| ٨ وستای خانوو بەبەرد و کسڵ | ٣ خوێندنگا |
| ١ وەستای خانوو بەبەرد و گەچ | ٥٠٠ باخەکان |
| ٦ بەرد هەڵکەن | ٣ گەرەکەکان |
| ٢ گەچ سوتێن | ٢ نووسراوخانەی گشتی |

٦ کسڵ سووتێن ١ ئۆتۆمبێل خانە
١ گەرماو
لە چەند جێگایەکی تری ئەم نووسراوە! زانیاری تریش لە بابەت شاری ئاکرێوە پێشکەش کراوە.
٢- بجێل: بنکەی لادێی سورچییە، بەهاوینەهەوارێکی جوان دانراوە. گوندێکی بچووکە، کەوتووەتە بنارێکی شاخی ئاکرێوە، کە پێی دەڵێن (سەری سادە). دەڵێن کاتێکی وەهای بەخۆیەوە دیوە کە زۆر گەورە و فراوان بووە. تەنانەت شاری ئاکرێیش لەژێر چنگی ئەودا بووە. سەد ساڵێک دەبێ کراوە بەمەڵبەندێک بۆ شێخەکانی لادێی سورچی. لەلایەن پەیرەوەکانیانەوە، گۆڕەکانی شێخەکانی سورچی دیدەنی دەکرێن.
٣- کەلاتی: گوندێکی بچووکە.کەوتووەتە سەر بنارێکی شاخی ئاکرێ کە لەو شوێنەدا ناویان ناوە (شاخی پەرات). ئەمیش بەهاوینەهەوارێکی خۆش و جوان دادەنرێت. جێماوی کەلاتێکی مێژوویی تێدایە کە میرە زەویدارەکان بەکاریان هێناوە.
٤- شۆش: گوندێکی گەورەیە. لەسەر بنارێکی شاخی ئاکرێ دامەزراوە. بەمیوەی ناوازە و نایابی جۆر جۆر و، ئاووبای سازگار و فێنک و چاوەندازی سروشتی جوان ناوبانگی دەرکردووە. ژمارە سەری دەگاتە (٧٠٠) کەس، جێ ماوەی زۆر کۆن و، جێگایاتی پیرۆزی تێدایە، کە نیشانەی ئەوەن لە سەردەمی کۆنیدا ئاوەدانی و شارستانیێتی تێدا بووە لەگەڵ بەچنگیدا. ژمارەیەکی گەورەیشی لە زانایان و، وێژەوانان و، سەرکردانی ناودارتێدا پەیدا بووە.
ئەم گوندانەی لەسەرەوە ناومان بردن لەگەڵ شاری ئاکرێدا کەوتوونەتە سنووری لادێی سورچییەوە.
٥- بەردەڕەشی گەورە: گوندێکی گەورەیە. بەڵام ئاوی کەمە و لە هاوینیشدا گەرمە. کەشەکەی سازگارە. کەوتووەتە ناو زەوییەکی دەشتاییەوە. بنکەی لادێی (عشائر السبعة)یە. کەوتووەتە باشووری ناوچەی ئاکرێوە. نزیکە لە ڕێگەی ئاکرێ و مووسڵە وەکە دەمێکە قیرتاو کراوە.
٦- دارەتوو: گوندێکی گەورەیە. کەم ئاوە. کەشەکەی سازگارە. لە هاویندا گەرمە. کەوتووەتە باشووری ناوچەکەوە لە لادێی (عشائر السبعة)دا. بەدانەوێڵە بەناوبانگە.
٧- زەنگەنان: گوندێکی گەورەیە. ئاوی کەمە. لە هاویندا گەرمە. بەڵام کەشێکی سازگاری هەیە. کەوتووەتە باشووری ناوچەکەوە لە لادێی (عشائر السبعة)دا. بەدانەوێڵە بەناوبانگە.
٨- بیرەکەپرە: گوندێکی بچووکە. نزیکە لە شاخی پیرس و ڕووباری زێی گەورەوە. بنکەی لادێی بیرەکەپرە. ئاوی کەمە. لە هاویندا کەشێکی سازگاری هەیە. چاوەندازانی سروشتی جوان دەورەیان داوە. شۆڕشەکانی بارزانییەکان لە نزیکیەوە قەوماون. بۆیەکا ناوبانگی دەرکردووە. سەردەمێکیش کرابوو بەبنکەی ناوچەی زێبار.
٩- دینارتە: گوندێکی بچووکە. چاوەندازانی سروشتی جوان چوارلایان گرتووە لە دۆڵی (نەهلە)دا. کەوتووەتە ناوەڕاستی ئەو دۆڵەی لە ناوەند شاخی ئاکرێ و شاخی پیرس دایە. لە چەقی ئەو ڕێگایەیشدایە کە لە ئاکرێوە دەکشێ بۆ بیرەکەپرە. لە هاویندا کەشەکەی سازگارە. ئاویشی زۆرە.

زەویەیەکی زۆریشی هەیە کە بۆ کشتوکاڵ دەست بدەن. بەمیوەی ڕەنگاوڕەنگیەوە ناوبانگی دەرکردووە. ئەمیش بەهۆی شۆڕشەکانی بارزانییەکانەوە ناوبانگی دەرچووە. باڵبارخانەیەکی تێدایە لەگەڵ نەخۆشخانە (مستوصف)ێکدا. لە سنووری لادێی بیرەکەپرە دایە.

١٠- سەری سادە: جێگایەکی جوان و هاوینەهەوارێکی خۆش و ناوازەیە. کەوتووەتە سەر پۆپەی زنجیرە شاخی ئاکرێ، لە نزیک گوندی بجیلەوە. لە هاوینێدا کزەبایەکی فێنکی خۆشی هەیە. شوێنەکەی وا هەڵکەوتووە، دەڕوانێت بەسەر دۆڵی نەهلە و لادێی سورچیدا، لەگەڵ زۆربەی زەوییەکانی ناوچەی ئاکرێ و ناوچەکانی دراوسێی. جەنگەڵستان و دارستانی دار بەڕوو و، دار مازوو چوارلایان تەنیوە. گەلێک سەرچاوەی ئاوی سارد و سازگاری تێدایە. سەردەمێک گوندی تێدا بووە. لەلایەن گوندەکانی دراوسێیەوە کراوە بەهاوینەهەوارێکی دەمدەمی و سەیرانگاهێکی هەموو دەمی لە کەشەکانی هاوین و پایز و بەهاردا.

## ڕێگا گشتییەکان

ڕێگای ئاکرێ و مووسڵ: گرنگترین ڕێگای بازرگانییەکە ناوچەی ئاکرێ دەبەستێ بەمووسڵەوە. ڕێگاکە قیرتاو کراوە، درێژایی دەگاتە (٩٥) کیلۆمەتر کە نزیکەی (٥٠) کیلۆمەترە لە سنووری ناوچە ئاکرێ دایە. بەپاتی لادێی سورچی دەبڕێ. بەدرێژی لادێی (عشائر السبعة) دەبڕێ.

ڕێگای ئاکرێ و بیرەکەپرە: ئەم ڕێگایە بەناو شاخە سەختەکاندا دەڕوات. درێژایی (٣٠) کیلۆمەتر دەبێ. دانیشتوانی لادێی بیرەکەپرە و زۆربەی دانیشتووانی ناوچەی زێبار و بەشێک لە دانیشتوانی ناوچەی ڕەواندز پێیدا دەڕۆن. لە زۆربەی ساڵاندا، لەبەر بەفر و بارانی زۆر، ئەم ڕێگایە لە ڕێوار بەربەست دەبێ. لە گەلێک ساڵانەوە نامەکاری لە ئارادایە بۆ کردنەوەی ڕێگای ئۆتۆمبیل لە ناوەند بنکەی ناوچەی ئاکرێ و بنکە لادێی بیرەکەپرەدا. بێ گومان ئەم ڕێگایە نرخێکی بەڕێوەبەرایەتی و سەربازی و بازرگانی و ئاوەدانی گەورەی هەیە بۆ ناوچەکە. دانیشتوانی ناوچەکە بەئاواتەوەن ڕۆژێک زووتر بکرێتەوە. چونکە ئەوان پاشکەوتووی دەستی ئەوەن کە نەکراوەتەوە. نەبوونی ئەو ڕێگایە پەکی هەموو کارێکی گرنگی خستوون.

ڕێگای ئاکرێ و بجێل: ئەم ڕێگایە بەناو شاخدا دەڕوات، بەڵام سەخت نییە. درێژیی (١٥) کیلۆمەترەیە. لە ساڵی ١٩٤٣دا دەست بەکردنەوەی کراوە بۆ ئۆتۆمبیل. بەڵام پاشان وەستێنراوە. دوای ئەوە لە برانەوەی ساڵی (١٩٥٠)دا دەست کرایەوە بەکردنەوە و تەواوکردنی. بەم زووانە تەواو دەبێ. هیچ نەماوەتەوە لە ڕێگاکە بکرێ پردێک نەبێ لەسەر چەمی (گبیل) کە ئاوەکەی لە تەنگی (حەسەن ماما) وە تێپەڕ دەکات. ئەم تەنگەیش بەناو شاخی ئاکرێدا پەیدا بووە. زۆربەی گوندەکانی لادێی سورچی کە کەوتوونەتە بەر ڕۆژهەڵاتی ناوچەکەوە لەم ڕێگایە کەڵکیان دەست دەکەوێ.

ڕێگای ئاکرێ و بەردەڕەشی گەورە: لە ڕێگای ( ئاکرێ و مووسڵ)ەوە لە ئاستی گوندی (شێوەڕێ)دا، لکێک جوێ دەبێتەوە دەچێ بۆ گوندی (بەردەڕەشی گەورە) کە بنکەی لادێی (عشائر السبعة)یە. ئەم

ڕێگایە درێژایی نزیکی (٢,٥) کیلۆمەترەیە. کیلۆمەترەیەکی لێ کراوەتەوە و بەردڕێژیش کراوە. ئەمە لە برانەوەی ساڵی (١٩٥٠)دا. ڕەنگە لە ساڵی (١٩٥١)دا تەواو ببێ.

ئیتر ئەمەندە پێویستە ئەوەیش پێشان بدەین کە ئۆتۆمبیل دەتوانێ بۆ ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی لادێکانی (عشائر السبعة) و سورچی بڕوات، چونکە هەرچەندە ڕێگاکان خوداکردن و سروشتین، بەڵام بەتێکۆشانێکی کەم تەخت دەکرێن.

## پردەکان

گەورەترین پردی ناوچەکە پێی دەڵێن (پردی مەندان) کە کەوتۆتە باشووری ناوچەکەوە و لەسەر ڕووباری (خازر) دروست کراوە. ئەم پردە لە سنووری لادێی (عشائر السبعة)دا دامەزراوە. ناوچەی ئاکرێ و ناوچەی مووسڵ دەبەستێ بەیەکترەوە. ئەمیش بەشێکە لە ڕێگای ئۆتۆمبیلی ناوەند ئاکرێ و مووسڵ. لە نزیک شاری ئاکرێ وە دوو پردی بچووک هەیە. هەروەها دوو پردی تریش هەن لەسەر چەمی (لالەیی) و چەمی (کەشتاو) کە کەوتوونەتە سەر ڕێگای ئۆتۆمبیلی ئاکرێ و مووسڵ.

### پردە بچکۆلەکان

لەسەرە ڕێگای ئاکرێ و مووسڵدا، لەناو سنووری ناوچەکەدا گەلێک پردە بچکۆلە (قنطرە) هەن، گرنگەکانیان ئەوانەن کە لە نزیک گوندەکانی (عامیانۆ، قۆزەبەک، جووجەری گەورە و جووجەری بچووک)ەوەن.

لەسەرە ڕێگای (ئاکرێ و بجێل)یشدا کە تازە کراوەتەوە، چوار پردە بچکۆلە هەن کە نزیکن لە شاری (ئاکرێ، جوونا، باشقاڵ ئاغا و باشقاڵ ڕەوەند)ەوە. لەناو شاری ئاکرێیشدا سێ پردە بچکۆلە هەن.

### بوارەکان

سێ بوار (معبر) لەسەر ڕووباری زێی گەورە هەن:

١- بواری بلە: ئەم بوارە نزیکە لە گوندی بیرەکەپرەوە. لەسەر ئەم بوارەوە دەپەڕنەوە بۆ بنکەی ناوچەی زێبار. کەوتووەتە باکوری ناوچەی ئاکرێوە.

٢- بواری سەرکەڤرۆک: ئەم بوارە لە گوندی (سەرکەڤرۆک)ەوە نزیکە کە لە سنووری لادێی سورچیدایە و کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی ناوچەکەوە. لەسەر ئەم بوارەوە دەپەڕنەوە بۆ لادێی (دێرە حەریر) کە بەشێکە لە ناوچەی (ڕەواندز)(*)

٣- بواری گرد مامک: ئەم بوارە لە نزیک گوندی (دەحلەڕێ)وە دامەزرێنراوە کە لەناو سنووری لادێی (عشائر السبعە) دایە و کەتووەتە ڕۆژهەڵاتی ناوچەکەوە. لەسەر ئەم بوارەوە دەپەڕنەوە بۆ لادێکانی (دێرە حەریر و هەولێر).

---

(*) لادێی دێرە حەریر لە ساڵی ١٩٥٢دا خرایە سەر ناوچەی شەقڵاوە. (ش. ف)

## هۆی گواستنەوە

دانیشتووانی ناوچەکە لە پێش هەموو هۆیەکدا بۆ گواستنەوەی خۆیان و کەلوپەلیان گیانلەبەر بەکاردەهێنن وەک ئێستر و بارگیر و کەر و گا. ئەمەیش لەو شوێنانەدا ڕوو دەدات کە ڕێگاکانیان شاخاوی و سەختن. بەڵام لەهەر جێگایەکدا ئۆتۆمبیل بتوانێت بڕوات، ئۆتۆمبیل بەکاردەهێنن. زۆربەی ئەو ئۆتۆمبیلانەی لە ڕێگا گشتییەکاندا بەکار دەهێنرێن، هی کەسانێکن کە لە دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ نین. ئەو ئۆتۆمبیلانەیش کە هی دانیشتووانی ناوچەکەن بریتین لە شەش ئۆتۆمبیلی (پیکاب) کە بۆ کرێ دانراون. دوو ئۆتۆمبیلی (جیپ) و سێ ئۆتۆمبیلیش هەن، هی کەسانێکن کە بۆ خۆیان بەکاریان دەهێنن، نەک بۆ کرێ. بێجگە لەوانە، ئۆتۆمبیلێکی (جیپ)ی چەکدار هەیە هی باڵبازخانەیە. ئۆتۆمبیلێکی (لۆری)ی گەورەیش هەیە هی سەربازخانەیە. هەر ئەوەندە ڕێگا گشتییەکانی ناوچەکە تەواو کران، ژمارەی ئۆتۆمبیل لە کن سەرەک هۆزەکانی لادێی (عشائر السبعة) و (بیرەکەپرە) و (سورچی) زۆر دەبن، چونکە ئەوانە چ بۆ کەلکی خۆیان بێ و، چ بۆ خۆش ڕابواردنی خۆیان، ئارەزووی کڕینیان دەکەن.

بوارەکانی میریش کە لەسەر ڕووباری زێی گەورەن، لەگەڵ بوارەکانی ئەو کەسانەدا کە لە سەردەمی هاتوچۆی هۆزە کۆچەرەکانی هەرکی و سورچیدا بەکار دەهێنرێن، کەڵکێکی زۆریان هەیە بۆ دانیشتووانی ناوچەکە لەکاتی گواستنەوە و هاتوچۆیاندا بۆ پارێزگای هەولێر.

## هۆی گفتوگۆکردن

لە ناوچەی ئاکرێدا (٣٢) ئامێری تەلەفۆن هەیە. لەمانە (٢٠) ئامێریان لە فەرمانگەکانی میریدا بەکار دەهێنرێن. (١٢) ئامێریشیان لە خانوو و جێگا فەرمانەکانی دانیشتووانی ناوچەکەدا بەکار دەهێنرێن. ئەوانە بەم شێوەیە دابەش بوون:

لە شاری ئاکرێدا: (١٠) تەلەفۆن لە فەرمانگەکاندا و، (١٢) تەلەفۆنیش لە خانووەکان و جێگا فەرمانەکانی دانیشتووانی شارەکەدا دامەزرێنراون.

لە لادێی بیرەکەپرەدا: (٤) تەلەفۆن لە فەرمانگەکاندا کاردەکەن.

لە سورچیدا: (٣) تەلەفۆن لە فەرمانگەکاندا کاردەکەن.

لە (عشائر السبعة)دا: (٣) تەلەفۆن لە فەرمانگەکاندا کاردەکەن.

بێجگە لەمانە تەلەفۆنی بێتەل و ئامێری گفتوگۆکردنی تر لە بنکەی لادێکان و هەندێک باڵبازخانە و سەربازخانەی ئاکرێدا هەن کە هەموویان سەر بەمیرین.

### ڕادیۆ

لە ناوچەکەدا (٥٦) ئامێری ڕادیۆ هەیە. لەمانە (٥٠) ئامێریان لە شاری ئاکرێدا بەکارەبا دەکەونە گەڕ، ئامێرێکیشیان بەپاتری ئیش دەکات. دوو ئامێری ڕادیۆیش لە لادێی بیرەکەپرەدا هەن کە بەپاتری

کارده‌کەن لە لادێی سورچیشدا دوو ڕادیۆیان هەیە کە بەپاتری دەکەونە گەڕ. بەڵام لادێی (عشائر السبعه) هەریەک ڕادیۆی تێدایە ئەویش بەپاتری ئیش دەکات. هەرچی گرامەفۆنە، لەبەر ئەوەی ڕادیۆ بووە بەباو، بەکارهێنانی لە کزبووندایە. هەر ئەوانە بەکاری دەهێنن کە دەستیان کورتە و ڕادیۆیان پێ ناکڕێ.

## دەسگایانی کارگێڕیی

بنکەی ناوچەکە بریتییە لە شاری ئاکرێ. ئەم شارە هەرچەندە بەناو کەوتۆتە ناو سنووری لادێی سورچییەوە، بەڵام لە ڕووی کارگێڕییەوە بەسەربەخۆ دادەنرێ، ڕاستەوخۆ لەژێر چنگی جێنوشین (قایمقام) دایە. هەروەها بیست گوندیش هەن کە نزیکن لە شاری ئاکرێوە، لەگەڵ باڵبازخانەی (گردەسێن) و (باکرمان)، لە ڕووی کارگێڕییەوە لەژێر چنگی باڵبازخانەی شاری ئاکرێدان، نەک باڵبازخانەی سورچی. ناوچەی ئاکرێ بریتییە لە سێ لادێ (ناحیە): بیرەکەپرە، بنکەکەی ناوی بیرەکەپرەیە. لادێی سورچی، بنکەکەی ناوی (بجێل)ە. لادێی (عشائر السبعة)، بنکەکەی ناوی (بەردەڕەشی گەورە)یە.

هەر لادێیەک لەم سێ لادێیە، کارگێڕێکی لادێ کاروباری هەڵدەسووڕێنێ کە هەرسێکیان لەژێر فەرمانی جێنشین دان. وا لە خوارەوە ناوی ئەو فەرمانگایانە دەبەین کە لەناو سنووری ئەو جێنشینی و لادێیانە دان:

لە ئاکرێدا: جێنشین، یاریدەدەری باڵباز، کارگێڕی سامان، دادگاه، شارەوانی، تاپۆ، کشتوکاڵ، سەربازگیری، بەیتاڵی، خوێندنگای کوڕان، خوێندنگای کچان، تەرخانکردنی سامان (أوقاف)، پۆستە و بروسکە، نەخۆشخانە (مستوصف)، لەشکرگاه (حامية)، (استهلاك)، نووسینگەی پارەخانە (كتابة الصندوق)، ئاو و کارەبا.

لە لادێی بیرەکەپرەدا: فەرمانگەی کارگێڕ، فەرمانبەری بنکەی باڵباز: لە بیرەکەپرەدا، لە دینارتەدا، لە هەشتکەدا. نەخۆشخانە: لە بیرەکەپرەدا، لە دینارتەدا. خوێندنگا: لە هۆکیدا.

لە لادێی سورچیدا: فەرمانگەی کارگێڕ، فەرمانبەری بنکەی باڵباز، نەخۆشخانە، باڵبازخانەی باکرمان، باڵبازخانەی گردەسێن.

لە لادێی (عشائر السبعه)دا: فەرمانگەی کارگێڕ، فەرمانبەری بنکەی باڵباز، باڵبازخانەی جووجەر. خوێندنگای کوڕان: لە بەردەڕەشی گەورەدا، لە زەنگەناندا. نەخۆشخانە، باڵبازخانەی مەندان.

## ئایین

زۆربەی دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ ئیسلامن لەسەر ڕێڕەوی (شافعی) ئەوانی تریش مەسیحین و دابەشبوون بەسەر ڕێڕەوەکانی (کاتۆلیکی و نەستووری و ئۆرتۆدۆکسی)دا.

## نەتەوەیی

دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ هەمووویان کوردن و ئاری نەژاد. بەڵام جووەکان کە لە ڕەگەزی (سامی) بوون لە ساڵەکانی (١٩٥٠) و (١٩٥١)دا لە ناوچەکەوە باریان کرد بۆ فەلەستین.

## زمان

ئەو زمانەی کە هەموو کەسێک لە ناوچەی ئاکرێدا قسەی پێ دەکات (زمانی کوردی)یە، بەهەردوو شێوەکەیەوە کە بریتین لە (سۆران و بادینانی). زمانی کوردیش دەستوور و رێنووسی خۆی هەیە کە لە هەموو لایەکدا ناسراوە و، ساز و ئاوازێکی خۆشی هەیە.

بێجگە لەوە لە کۆنترین زمانانی ئاری دادەنرێ. لە هەزاران ساڵ لەمەوپێشەوە هەموو جۆرە نووسراوێکی پێ نووسراوەتەوە لە بابەت زانیاری و هونەر و وێژەوە، تا ئیمڕۆ. زمانێکیشە فێربوونی ئاسانە. هەرچی مەسیحییەکانن بەتەنیشت ئەم زمانە نەتەوەیییەی خۆیشیانەوە، زمانی ئایینی کلدانیش دەزانن. هەرچی رۆشنبیرەکانیشن بێجگە لە زمانی کوردی زمانی عەرەبیش دەزانن لەگەڵ ئینگلیزیدا. لە پیاوە پیرەکانیشیاندا هی وایان تێدا هەیە زمانی فارسی و تورکیش دەزانێ.

## شوێنە پیرۆزەکان

دانیشتوانی ئاوچەکە ئەم ئارامگا و گۆڕانە بەپیرۆز دادەنێن. لەبەر ئەوە لەکاتی خۆیدا دەچنە دیدەنییان، بۆ مەبەستێک لە مەبەسەکانی خۆیان:

**لە شاری ئاکرێدا:**

١- ئارامگای (شێخ عەبدولعەزیز کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی): ئەم ئارامگایە کەوتووەتە شوێنێکی واوە کە بەهاوینەهەوارێکی جوان و خۆش دادەنرێ. گەلێک رەزوباخ و خانوو و دووکانیان لەسەر تەرخان کردووە.

لەلایەن دەسگای (تەرخان کراوەی قادری)[1]یەوە کە لە شاری (بەغدا)ە کاروباری بەرێوە دەبرێ. تەمەنی دەگەرێتەوە بۆ نزیک ساڵی (٧٠٠)ی کۆچی. ئەم ئارامگایە بۆ خۆپیرۆزکردن دیدەنی دەکرێ.

٢- ئارامگای سەیدا (مجذوب):[2] وەک دەڵێن دەبێ لە ساڵی (١٢٥٥)ی کۆچیدا مردبێ. یەکێک بووە لە جێگرەکانی (شێخ خالیدی نەقشبەندی)ی بەناوبانگ. (شێخ خالید) خۆی لە دانیشتووانی شاری سلێمانی بووە[3]. بەڵام لە شاری (دیمەشق)دا نێژراوە. پیاوێکی گەورە بووە لە خوداناسی و

(١) تەرخانکراو: بەمانای (وقف)، کەواتە (دائرة، ادارة، الوقف القادرية في بغداد).

(٢) شێخ محەمەد مەجزوبی عیمادی: یەکێکە لە خەلیفەکانی مەولانا خالیدی نەقسی، کە مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە (الشيخ معروف النودهي) یەکەیدا بەر لە ناوهێنانی دەڵێ: «إنتشرت طريقته - النقشبندية. أ. ب - وخلفاؤه في اكثر الممالك سابحون عابدون، لايدرك كثرتهم العادون، ولكن أذكر للتبرك نموذجاً، منهم...» لەناویاندا ناوی ئەم زاتەش دەبات.

(٣) (ضياءالدين خالد بن احمد بن حسين من عشيرة جاف، ينتهي نسبه الى الوالي الكامل پيرميكائيل) ناسراو بە: مەولانا خالیدی نەقشبەندی، لە ١٧٧٩ لە قەراغ هاتۆتە دنیاوە و لە ١٨٢٦ لە شام وەفاتی کردووە. بۆ زیاتر دەربارەی بروانە (یادداشتەکانی شاکر فەتاح)- کتێبی یەکەم) لەم پرۆژەیە. ل: ١٥٧-١٥٨ هەروا: محمد الخال، الشيخ معروف النودهي، مطبعة التمدن، بغداد ١٩٦١، ص ٣٨ - ٥٣.

زانایبدا. ئەمەیش هەر بۆ خۆپیرۆزکردن دەچنە سەری.

٣- دیدەنیگای (محمودی فضلون): دەڵێن لە یارەکانی (پێغەمبەر - محمد)ی دیوە. بۆ ئەوە دەچنە سەری کە لە نەخۆشی (پژمنی کەڵەشێری) ڕزگاریان ببێ.

٤- دیدەنیگای (شێخ ڕەجەب): ئەم شوێنە زۆر کۆنە.

٥- دیدەنیگای (شێخ باپیر): بۆیە سەری لێ دەدەن کە لە لەرزوتا ڕزگار بن.

٦- دیدەنیگای (مەلا حەسەن)ی زێباری. دەچنە سەری بۆ ئەمەی لەو نەخۆشییە ڕزگاربن کە جانەوەری حەفتا و حەف تووشیانی دەکات. کاتێ کە دەیتە ناو گوێیانەوە. (هەزار پێی لای خۆمان - أ. ب).

٧- دیدەنیگای (شێخ سندان).

٨- دیدەنیگای (شێخ محەمەدی زێبار).

٩- دیدەنیگای (سەید مەولی). ئافرەتەکان دەچنە سەری بۆ ئەمەی شیریان زۆرتر بێت بۆ منداڵەکانیان.

١٠- دیدەنیگای (شێخ معاف). ئافرەتەکان دەچنە سەری بۆ سک پڕبوون.

١١- دیدەنیگای (مەلا ئەحمەدی سورچی).

لە دەرەوەی ئاکرێدا:

١٢- دیدەنیگای (شێخ محەمەدی شێخ ئەحمەدی بجێلی). نزیکە لە گوندی بجێلەوە کە بنکەی لادێی سورچییە. لە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچیدا نێژراوە. بۆ پیرۆزی دەچنە سەری.

١٣- دیدەنیگای (شێخ ئەحمەدی) لە گوندی (کولەکا) لە لادێی سورچیدا. ئەم خوداناسە باپیرە گەورەی شێخەکانی سورچییە. لە ساڵی ١٢٧٣ی کۆچیدا نێژراوە. جێگری (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بووە. بۆ پیرۆزی دەچنە سەری.

١٤- دیدەنیگای (شێخ سەرگوڵ) لە گوندی (کولەکا)دا. بەلای دانیشتوانی لادێی سورچییەوە لەو دوو خوداناسەی پێشوو پایەی بەرزترە.

١٥- دیدەنیگای (شێخ ئیسماعیل)ی ولیانی. دەڵێن لە سەیدەکانی بەرزنجەیە کە لە خاکی پارێزگای سلێمانی دایە. لە گوندی (ڕووقی)دا کە لە لادێی (عشائر السبعة)دایە لە ساڵی ١١٠٤ی کۆچیدا نێژراوە. بۆ پیرۆزی سەری لێ دەدەن.[1]

---

(١) لێرەدا بەپێویستی دەزانین کە شتێ دەربارەی (شێخ سمایلی ولیانی) بۆ خوێنەری هێژا بنووسین، کە چۆن لە ناوچەی شارباژێڕەوە ئاوا کەوتۆتە ئەم دەڤەرە. بۆ ئەمەش لە کتێبە بەنرخەکەی جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسمان بەباشتر نەزانی (بنەماڵەی زانیاران): پوختەی باسەکەی دەربارەی ئەم شێخە خاوەن پایە و پیرۆزییە ئەوەیە کە (شێخ ئیسماعیل یەکێکە لە کوڕەکانی شێخ محەمەدی نۆدێ کە ئەویش نەوەیەکی پیرۆزی شێخ عیسا برای شێخ مووسای بەرزنجەین، شێخ محەمەد پێنج کوڕی بووە: شێخ ئیسماعیل، حەسەن، عەلی، ئەحمەد و محەمەدە سوورە. ئەمانە هەریەکە لە ناوچەیەکی دەڤەری سلێمانی نیشتەجێ دەبن، شێخ ئیسماعیل و شێخ حەسەن دەچنە قەرەداغ لە دێی -ولیان- دادەنیشن، شێخ سمایل =

١٦- دیدەنیگای (شێخ حەسەن). لە گوندی (خێلافت)دا کە دەکەوێتە ناو لادێی (عشائر السبعە) وە نێژراوە. بۆ پیرۆزی سەری لێ دەدەن.

١٧- دیدەنیگای (شێخ شەمسەدین). لە گوندی (شۆش)دا نێژراوە کە سەر بەلادێی سورچییە. بۆ پیرۆز بوون دەچنە سەر گۆڕەکەی.

١٨- دیدەنیگای (شێخ جبرائیل). لە گوندی (شۆش) دایە. ئەمیش بۆ پیرۆزبوون دەچنە سەری.

١٩- دیدەنیگای (ئووریا)ی کوژراو لە پێناوی خودادا. دەڵێن: یەکێک بووە لە کاربەدەستانی (داود) پێغەمبەر، کە لە نزیک گوندی شۆشەوە کوژراوە لەگەڵیدا بووە. جوولەکەکان لە پێش ڕەوکردنیاندا زۆر دەچوونە دیدەنی.

٢٠- دیدەنیگایەکیش لە خوارووی باخەکانی گوندی (شۆش)دا هەیە، دانیشتووانی ناوچەکە لەو باوەڕەدان کە (دانیال) پێغەمبەر لەوێدا نێژراوە. جاران جووەکان دەچوونە دیدەنی.

## پەرستگاکان

جاران بەشێوەیەکی تێکڕایی، لەناو هەموو گوندێکی موسڵمانەکاندا مزگەوتێکی ساکار هەبوو، گوندییەکان نوێژیان تێدا دەکرد. بەلام ئێستاکە وانییە. هەموو گوندێک. مزگەوتی تێدا نییە. ئەوەندە هەیە هێشتا پەرستنی خودا لە ئارادایە و زۆری لادێییەکان نوێژ و پاڕانەوەی خۆیان دەکەن. لە شاری ئاکرێیشدا هەشت مزگەوتی بچکۆلە و، یەک مزگەوتی گەورەی کۆن هەیە. ئەم یەکەیان لە کاتی دروستکردنیدا بایەخێکی زۆری پێ دراوە. دەڵێن لە سەردەمی جێنوشین (خلیفە)، (عومەری خەتاب)دا دروست کراوە. نوێژی ڕۆژانی هەینی لەوێدا دەکرێ. سامانی تەرخانکراو (أوقاف)ی بەرەو رووکراوەتەوە

---

= لە ئیرشاددا دەردەکەوێ و ناوبانگی دەرکرد، دەچێتە زیارەتی شێخی گەیلانی لە بەغدا و سوود لە ئیرشادی شێخ (ئەحمەد الاحسائی) وەردەگرێ. جا لە خزمەت ئەودا سلوک دەکا و ئیجازەی خەلافەتی لە ڕێبازی قادریدا لێ وەردەگرێ. دەگەڕێتەوە قەرەداغ و لە دێی قازانقایە دادەنیشێ، شێخ سمایل زۆر خاوەن تەصەوفی ڕۆحی بووە و گەلێ کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، لە دوایی ژیانیدا قازانقایە جێ دەهێڵێ و دەچێتە دەڤەری بادینان لە گوندی -گرد ڕێوی- دادەنیشێ خەریکی ئیرشاد دەبێ، سەردانی شام دەکات لە گەڕانەوەیدا دەچێتە موسڵ، لێرە نەخۆش دەکەوێ و وەفات دەکات، تەرمەکەی دەبەنەوە بۆ گوندەکەی خۆی و لەوێ بەخاک دەسپێررێ. شێخ سمایل لە ١٠٨١ کۆچیدا لە نۆدێ لە دایکبووە و لە ١١٥٨ کۆچی وەفات دەکات، حەوت کوڕی لە پاش جێماوە: عەبدولڕەزاق، عەبدولسەلام، عەبدولکەریم، مەحموود، مەعروف و عەبدوڵلا. عەبدولڕەزاق لە دێلێژە بووە (شێخ ڕەزای دێلێژە)، بەلام لە گوندی گردە ڕێوی - رووڤی، شێخ یەحیای کوڕی ماوەی بیست ساڵ ئیرشاد دەکات، دوای ئەم دێوانە خەلیفە مەلا مستەفا لە تەکیەکە دادەنیشێ و ماوەیەکی زۆر ئیرشاد دەکات. نەوەکانی تری لە دێکانی: قازانقایە و گۆیتەپە و هەشمزین و قەرەچێوار دادەنیشن و ئیرشاد دەکەن). بۆ زیاتر بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس: بنەماڵەی زانیاران، چ یەک ١٩٨٤ چاپخانەی شەفیق، بەغدا. ل ٣٠٩ - ٣٢٧.

زانستە ئایینییەکانیشی تێدا دەخوێندرێ. هەروەها گەلێک مزگەوتی تریش هەن لە گوندەکاندان وەک: (خێلاقت، باکرمان، گوندک، بجیل، باشقالێ ئاغا، باشقالێ ڕەوەند، جوونە، بەردەڕەشی گەورە، شۆش، بیرەکەپرە، هەرن، چاربۆت، هۆکی، بانی، پناخی، گەویلان، سووسنا، ڕووڤیا، دارەتوو، زەنگەنان، گۆمەزەرد و گردەپان). لە شاری ئاکرێیشدا دوو کلێسا هەن، یەکێکیان هی (یەعقووبی)یەکانە کە لەسەر ڕێڕەوی (ئۆرتۆدۆکس)ن. ئەم کلێسایە زۆر کۆنە. لە بەرد هەڵکەندراوە. لەناو ورگی شاخەکەی ئاکرێدا دروست کراوە. کلێساکەی تریشیان هی کلدانییەکانە کە لەسەر ڕێڕەوی (کاتۆلیک)ن. ئەمەی دواییان چەند ساختمانێکی تازە بابەتی لە تەنیشتەوە دروست کراوە کە لە چاو شاری ئاکرێدا بەناوازە دادەنرێن، هەریەکەیان بۆ مەبەستێک تەرخان کراوە وەک: خوێندنگا و، میوانخانە و، جێی ژیانی (مەتران) و (لە خوداترسەکان)، چ ئافرەت بن، چ پیاو. ئەم کلێسایە لەژێر چنگی (پاپا) دایە، کە لە (فاتیکان)ی ناو خاکی ئیتاڵیادا جێگر بووە، کە وەک فەرمانڕەواییەکی سەربەخۆ ڕێزی لێ دەگیرێ. بێجگە لەمانە چەند کلێسایەکی سادە و ساکاری تریش هەن، کە لەم گوندانەدان: (خرپە، شەرمن، خردس، خەرجاوا). دوو کەنشتەی جوولەکەیش لە ناوچەکەدا هەن: یەکێکیان لە شاری ئاکرێ دایە و، ئەوی تریشیان لە گوندی (شۆش) دایە. هەردووکیان یەجگار کۆنن. بەڵام ئێستاکە کەسیان تێدا نەماوە، چونکە جووەکان لە ساڵی ١٩٥٠ و ١٩٥١دا لە ناوچەکە ڕەویان کردووە بۆ فەلەستین.

## تەکیەکان

لە شاری ئاکرێدا تەکیەی (شێخ عبدولعەزیز)، لە گوندی شۆشدا تەکیەی (شێخ شەمسەدین)، لە گوندی ڕووڤیادا تەکیەی (شێخ ئیسماعیلی ولیانی). لە گوندی (گەویلان)یشدا تەکیەی (شێخ بەدیعی سورچی) هەن و تا ئێستایش لە کاردان.

## لە هاوینەهەوارەکانی ئاکرێدا

### چاوئەندازە سروشتییەکانی ئاکرێ

بەشی سەرووی شاخە بەرزەکەی پشت شاری (ئاکرێ)، هەرچەندە بەدیمەنە ڕەق و تەق و توندوتیژەکانی و، کەڵەبەردە گەورە ڕووت و قووتەکانی، کە هەر دەڵێی خۆیان ئامادە کردووە بۆ پەلاماردان، بەڕۆژی نیوەڕۆ گەورەیی و سامناکی و مەندیی خۆیانت پێشان دەدەن، بەڵام لە دەمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، بەجۆرێکی وەها دەگۆڕێن، پەیتا پەیتا ڕەنگەکان و سێبەرەکانیان، گەلێک چاوئەندازی سروشتی جوان جوان دروست دەکەن، کە هەروەک زەردەخەنەت بۆ بکەن و، ڕووخۆشیت لەگەڵدا بنوێن و، خۆشەویستیت بەرامبەر پێشان بدەن، وەهایە. ئیتر کاتێک بەخۆت دەزانیت، گەشکەدار بوویت و چاوبەست کراویت و، بەرامبەر ئەو شاخە شۆخ و شەنگە وەستاویت و، نیشانەی دڵخۆشی و سوپاس و ڕێزگرتنی خۆتی پێشان دەدەیت. هەرچی ڕەز و باخەکانی شاری (ئاکرێ)یشن و کەوتوونەتە بنار و دامێنی ئەو شاخەوە لە ڕاستیدا ئەمەندە ناوازە و ڕازاوەن، دامێنەکانی شاری ئاکرێیان وەک گوڵ ڕازاندۆتەوە. بێجگە لەوە وەک

شاه کلاوێک کە لە زەمرووت دروست کرابێت، چوارلایی سەری گردەکەی ناوەڕاستی شارەکەیان جوان کردووە و هێناوەتە فەڕ. ئەم سەری گردەیش ئەو جێگایەیە کە لە لاپاڵەکانیدا ژمارەیەکی زۆر لە خانووەکانی ئاکرێی لەسەر دروست کراوە، بەتایبەتی (سەیرانگای سەری گری) کە هەر لە دوورێکی بریسکەدار دەکات بەسەر ئەوسەری گردەوە و ناوێکی شایستەی خۆیان لێ ناوە، کە پێی دەڵێن: «مروارییەکەی ئاکرێ». ئەم ناوەیشیان لەبەر ئەوە لێ ناوە، کە سەیرانگاهەکە بەگەڵێک چرای ڕەنگاوڕەنگی جوان و پرشنگدار ڕازێنراوەتەوە کە جوانی و ڕووناکی پێ ببەخشن. لە ڕاستیدا ئەم ڕەزوباخە خۆشە بەخشندانە، کە ڕووخۆشی و پێکەنین و کەڵک و فەڕ پەخشان دەکەن، کاتێک بەخۆت دەزانیت چاوبەستت دەکەن. کە بەڕۆژ دەچیتە ناویانەوە، دەمێک بەهاژە و هووڕی ئاوە ڕوونە پاکەکانیانەوە خەریکت دەکەن کە لە قەڵبەزەکانی شاخەکانەوە دێنە خوارەوە و بەناو جۆگاکانیاندا گەشت دەکەن، دەمێکیش بەکزەبا بۆنە خۆشە فێنکەکانیان لە شت دەبووژێننەوە و، بەئاوە خۆشە ساردەکانیان و، میوە ڕەنگاوڕەنگە جوانەکانیان، خۆشی دەخەنە دڵتەوە و، دەمێکیش بەسێبەرە فراوانەکانیان و چاوئەندازە جوان و ڕەنگینەکانیان چاوبەست دەکەن.

کە شەویش دێت و مانگ لەناو جەرگی ئاسماندا دەردەکەوێت و، ئەستێرە گەشەکانیش لەناو شینایییەکەیدا وەک زێڕ دەبریسکێنەوە و، سەرەتاتکێ دەکەن لە ئەستێرە دەستکردەکانی شارە هەڵواسراوەکەی ئاکرێ، واتا چراخانەکانی، کە بەرسنگی شاخەکان و باخەکانییان ڕازاندۆتەوە، هەر لەو ئەستێرانە دەکەن کە لە ئاسمانێکی سەربەرەو خواردابن و دەستی مرۆڤ دایرشتبن... بەڵێ لە شەودا، هەڵگەڕێ بەسەر ئەو گردانەدا کە شاری هەڵواسراویان خستۆتە ناوەند خۆیانەوە جا کە گەیشتیتە سەرەپۆپەی ئەو گردانە، لەناو ئەو بێ دەنگی و سەنگییە نازەنینە و پیرۆزەدا، تەماشای گەورەیی گەردوونی مەزن بکە لەناو ئەم پارچە زەوییە نازدارەدا... دوای ئەوە گوێ بگرە لەو ساز و ئاواز و گۆرانییە خۆشانەی کە لە خانووە هاوینییەکانی ناو باخەکانەوە دێنە دەرێ کە لە کانگای دۆڵە قووڵەکەی ئاکرێدا بڵاوبوونەتەوە...

پشوویەک بدە... ئارامێک بگرە... کاتێک دەزانیت چەند تیشکێکی ناوازە و نایابی خودایی هاتە ناو دڵتەوە و، ناوەند دڵی تۆ و خودای گەورەی پاکی بێ هاوتای بەست بەیەکەوە. کە ئەوەیش پێک هات، خودات لەبەردەم دڵ و دەروونتدا دێتە پێش چاو، بەهەموو دەسەڵات و میهرەبانی و جوانی و بەخشندەیی و گەورەیییەکیەوە... ئینجا خۆشی لەوە دەبینیت کە لێی نزیک بوویتەوە و، هێزیش لەوە وەردەگریت کە ئاسیاوی لەگەڵیدا پەیدا دەکەیت، ئەنجامیش بەوە دەگات، هیوا و ئاواتەکانت تازە دەبنەوە و، چست و چالاکییەکانیشت گوڕ دەبەستنەوە و، زۆرتریش لە جاران باوەڕ بەخۆت دەکەیت. ئینجا کە ئەوانەت بۆ پێک هات، بەتوندوتیژی و هێز و هەڕەتێکی نوێوە بەرەنگاری ئەو تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفتانە دەبیت، کە لە ڕێی ژیانتدا دەبنە کۆسپ لەبەردەمتدا، وازیش ناهێنیت تا بەسەریاندا زاڵ دەبیت!...

وا تۆ لە پەرستگا مەزنەکەی سروشتدا نوێژەکانی خۆت تەواو کرد. هەموو شتێکت وا دێتە پێش چاو کە بێ دەنگ و سەنگ و بێ وەی و جوان و مەند و سەنگینە. کەواتە هەر لە جێی خۆتدا بنوو. دڵت

دانەچڵەکێ، دڵنیابە لە خۆت، گەشبین بە، دەروون خاوێن بە، باوەڕت بەدوارۆژی گەش و خۆشی خۆت هەبێ، هیچت لێ نایەت. بنوو بەدڵخۆشییەکەوە هەتا بەیانی...

وا شەو لە ئاهەنگە پڕ چاکە و فەڕەکەی خۆی بووەوە. موژدەی بەرەبەیانی ناسک و ناوازەیش سەری دەرهێنا. وا تۆیش بەشی خۆت پشووت دا و سرەوتت پێ گەیشت. وا دەنگی بلبلەکان و، خوڕەی ئاوە هەڵقوڵیوەکان و، بانگی کەڵ مشێرەکان و، جریوە جریوی پەلەوەرەکان و، خشەخشی گەڵای دارەکان، بەبۆنەی خەبەربوونتەوە ئاهەنگت بۆ دەگێڕن. کەواتە هەستەرە سەر پێ و خۆشی لە بینینی چاوئەندازە جوانە ناوازەکانی بەرەبەیانی ببینە!... گوێ بگرە لە بانگدەری مزگەوت کە دەڵێ: «خودا گەورەترە لە هەموو کەس!». ئای لەو وشانە چەند گەورەن! ئای لەو ئاشکرا کردنە چەند گەورەیە! ئای لەو بانگەوازە چەند گەورەیە کە داوامان لێ دەکات باوەڕ بەو گیانە گەورەیە بهێنین، کە هەر بەتەنیا خۆی لە توانایییدا هەیە سەربەستی و چاکە و سوودمان بپارێزێ و، ئارەزووە پەسند و دروستەکانیشمان بهێنێتە دی! ئەگەر ئارەزووت کرد نوێژی خۆت بکە.دوای ئەوە چێژکەی ناشتاکەت بکە لە یەکێک لەم سێ سەیرانگاهەدا: (سەری گری، سیپە و کانی زەر)، کە لەو جێگایانەدا لە باوەشی دایکە سروشتی جوان و شەنگ و شۆخ و خاوەن بەزەییدا نان دەخۆیت. پشوویەک بدە. ئینجا دوام کەوە بتبەم بۆ شارە هەڵواسراوەکە، ئاکرێ، تا بەڕۆژ هەر کەسێکی تێدایە و هەر شتێکیشی تێدایە پیشانتی بدەم.

## شاری ئاکرێ و دانیشتووەکانی

شارە واڵاکەی ئاکرێ وا لەبەر دەمتدایە. ئەم شارە بریتییە لە چەند چینە خانوویەک کە لە بناری شاخەکانەوە هەڵدەکشێن بۆ سەرەوە تا دەگەنە لاپاڵەکانیان. هەر وەک لەسەر پلیکانەیەک بووبن و پلە بەپلە سەرکەوتبنە سەرەوە واتە ئەم چینە خانووانە ژمارەیان دەگاتە بیست چین. تۆیش هەتا دەگەیتە چینی هەرە باڵای پێویستییت بەخەباتێکی زۆر هەیە. بەڵام کە گەیشتیتە ئەوێ و تەماشای ئەو هەموو ڕەزوباخانەی ئاکرێت کرد و، زەوییەکانی ناوچەی ئاکرێ و زەوییەکانی ناوچەکانی دراوسێی ئاکرێت چاو پێکەوت ڕەنج و ماندوێتییەکەت لەبیر دەچێتەوە. کڵێسای مەسیحییەکان و ساختمانە ناوازەکانیشت چاو پێ دەکەوێ وەک میوانخانە و خانووەکانی لە خوداترسەکان، چ پیاویان و، چ ئافرەتیان و، خوێندنگای کوڕان و کچانی مەسیحییەکان کە خوداناسییان فێر دەکەن. ئینجا لەوێوە سەیرێکی پێشدەمی خۆت بکە. کە تەماشا دەکەیت لە لاپاڵەکانی ئەو گردەی بەرامبەرتە و سەرەکەیدا گەلێک ساختمان دروست کراون، وەک سەرا و شارەوانی و فەرمانگەی کارەبا و ئاو و، خوێندنگای کوڕان و بازاڕی تازەکە شەقامێکی گەورەی بەناودا دەڕوات کە لە موسڵەوە دێت. هەروەها چاوت بە(سەیرانگای سەرا) و (سەیرانگای بەهەشتی منداڵان) و (سەیرانگای سەری گری) و (میوانخانەی باکور) و (میوانخانەی سورچی) و چاپخانە گشتییەکان و خانووی (یانەی فەرمانبەران)یشت چاو پێ دەکەوێ، کە هەموویان لە ساختمانە ناوازەکانی شارەکە دەژمێرێن. ئینجا لە دەوروپشتی خۆت ورد بەرەوە کە تەماشا دەکەیت هەرسێ گەڕەکەکەی شاری ئاکرێ لەبەردەمت دان کە ئەمانەن: (گۆڕاوا، قاپەکی، چوستەیی). ئەمانە بەهەرسێکیان (١١٥٨) خانوویان تێدایە، کە ژمارە سەرێکی (٥٠٠٠) پێنج هەزار

کەسییان لەناودا دەژی. دوای ئەوە وەرە خوارەوە بۆ ناو هەردوو بازاڕە کۆن و تازەکەی ئاکرێ. کە تەماشا دەکەیت (٢٤٦) دووکانیان تێدایە، لەناو ئەو دووکانانەیشدا هەموو جۆرە کەلوپەل و بەرهەم و دەستکردێکی خۆماڵی و بێگانە ئامادە کراون بۆ فرۆشتن. هەروەها گەلێک جۆر کار و پیشە و دەستکردیشیان تێدا دەبینیت. کە دەگەیتە دوایی بازاڕی کۆنەوە، (مزگەوتی گەورە)ی ئاکرێت چاو پێ دەکەوێت، کە لە کۆنترین مزگەوتانی عێراق دەژمێردرێت. مزگەوتەکە لە شێوەیەکی جواندا دروست کراوە. کەلوپەلی ناو ژوور و هۆڵەکەیشی ناوازەن. لە خوارەوە. مزگەوتەکە پەرستگایەکیشە و خوێندنگایەکی ئاینییشە، دەزگای تەرخانکاری (اوقاف)، لەگەڵ هەشت مزگەوتی تر کە لەناو شارەکەدان، بەڕەز و باخەکانیانەوە کاروباریان هەڵدەسووڕێنێ. کە سەرکەوتیتە سەرەوەیش بۆ ئەوپەڕی بازاڕە کۆنەکە و بەلای چەپدا لاتدا بۆ ناو گەرەکەکە ساختمانی نەخۆشخانە و، خوێندنگای کچان و، گەرماوی باوت چاو پێ دەکەوێت. ئەم گەرماوە تازە دروست کراوە، شێوەی دروست کردنەکەی و رێکوپێکییەکەی یەجگار هونەری ئەندازیاری و کۆمەلایەتی تێدا بەکارهێنراوە. جا هەر کاتێ دیدەنیی هاورێکانی خۆت کرد، لە بازرگانان و فەرمانبەران و، لە نزیک نیوەڕۆدا هەستت بەگەرما کرد، دەتوانیت ڕاستەوخۆ بچیتە (سەیرانگای کانی زەر).

## سەیرانگای کانی زەڕ

لێرەدا دەتوانیت لە (ئەستێرکی مەلەکردن)ەکەیدا مەلە بکەیت. ئاوی ئەستێرکەکە لە سەرچاوە ئاوێکی ساردەوە دێت، کە هەڵدەقوڵێتە دەرەوە بۆ ناوەوەی. تۆ دەتوانیت نانی نیوەڕوانت لەبن ئەو کەپرەدا بخۆیت کە دەڕوانێت بەسەر ئەو هەموو ڕەز و باخ و کانیاوانەدا کە لەژێر سایە و سێبەری شاخە سامناکەکەی ئاکرێدان. هەروەها دەیشتوانیت لەوێ بنوویت. دوای ئەوە ئارەزوو بکەیت بەناو ئەو ڕەز و باخانەدا دەڕۆیت کە دەتبەن بۆ ناو (سەیرانگای سیپە).

## سەیرانگای سیپە

کە گەیشتیتە سیپە چاوت بگەشێنەرەوە بەتەماشاکردنی تاڤگە ناوازەکەی کە لە بڵندییەکی سی گەزییەوە دەڕژێتە خوارەوە. چای ئێوارێ لەوێ بخۆرەوە. هەست دەکەیت بەخۆت لەناو فێنکاییەکی وا خۆشدا دانیشتوویت کە بەتەواوەتی لەش و هۆشت دەبووژێنێتەوە. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە تاڤگەکە دەڕژێتە ناو ئەستێرکەکەی سەیرانگاکەوە کە لە شێوەی سێوێکدا دروست کراوە، ئاوەکەی بەرز و نزم دەبێتەوە بەسەر ئاوی ناو ئەستێرکەکەوە، هەروەک هەڵپەڕکێ و سەما بکات وایە. جا لەو هەڵبەز و دابەزەوە کە ئاوی تاڤگەکە دەیکات پریشکە ئاو دەپرژێت بەهەموولایەکدا، تەوژمی هاتنە خوارەوەی تاڤگەکە و ئەو پریشکە ئاوانەیش وەک باوەشێن، بای ئەو ناوە دەبزوێنن و فێنکی دەکەنەوە. ئەو بایە فێنکەیش خۆی دەدات لە لق و پۆپی ئەو دار و درەخت و گژوگیا و گولانەی لە چوارلای تاڤگەکەیا گرتووە. ئەوانەیش بەچەشنی باوەشێنێکی گەورە کزەبایەکی فێنکی بۆنە خۆشەکانی ئەو گوڵ و ڕێحانە و گژوگیایانە دەدەن بەلووتتدا، کە بەوە دەتخەنە سرەوت و ئارام و کامەرانییەوە.

سەیرانگای سەرا

لە نزیکەی بانگی شێواندا کە گەرما ڕووەو نەمان دەچێ، دەتوانیت بەناو ئەو ڕێگایانەدا بڕۆیت کە ئەم لاو ئەولایان جۆگە ئاوە سارد و ڕوونەکان و درەختە سێبەردارەکان ڕازاندوویاننەتەوە، تا دەیگەیتەوە ناو شار. لەناو (سەیرانگای سەرا)دا دەگەیت بەدۆست و برادەرەکانت لە فەرمانبەرەکان و کەسانی تر. دەتوانیت لەوێ لەسەر یەکێک لە تەختەکان دابنیشیت و، لە بەرامبەرتەوە بەتاماشاکردنی ئەو سوڕک و ئەستێرکە چاوت بگەشێنیتەوە کە ئاوەکەی بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە و، کە دەڕژێتەوە خوارەوەیش بەپریشکەکانی ئەو چیمەن و گوڵ و ڕێحانانە ئاو دەدات و زیندووی دەکاتەوە، کە لە هەر چوارلایدا ڕواون. ئینجا کە تێر و پڕ سەیری ئەو چاوئەندازە جوانانەت کرد، تەماشایەکی دەوروپشتی خۆت بکە، دەبینیت ڕێگا گشتییەکانی هەر چوار لای سەیرانگاکە هاتوچۆکەری شارەکەیان پێدا دەڕوات. لە دوای ئەوانیشەوە کۆمەڵێک ساختمانی جوانت چاو پێ دەکەوێت لەگەڵ چایخانە گشتییەکاندا.

## بەهەشتی منداڵان

سەیرکە لە نزیکتەوە سەیرانگایەکی تر هەیە کە بەتایبەتی بۆ منداڵان دروست کراوە. لە ناوەڕاستی ئەستێرکێکی واوە کە لە شێوەی گوڵە نێرگسێکی ڕەنگاوڕەنگدا دروستکراوە، سوڕکێک ئاو بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە و، دەڕژێتە خوارەوە و، پریشکەکانی بەسەر چیمەن و گوڵ و ڕێحانەی جوان و ئازەنیندا پەخشان دەبێ، سەیرانگاکە فێنک دەکاتەوە.لەناو ئەو سەیرانگایەدا چەند کەلوپەلێکی یاریی منداڵان لە شێوەیەکی دڵ کێشکەر و ڕەنگاوڕەنگدا دامەزرێنراون، لەگەڵ نووسراودانێکی بچووکدا کە پڕە لەو نووسراو و گۆڤارانەی بۆ منداڵ بەکەڵک دێن. بەڕووی نووسراودانەکەیشەوە ڕۆژنامەیەک هەڵواسراوە کــە بەتایبــەتی بۆ منداڵانی ناوچەکــە دەرهێنراوە ناوی نراوە: (منداڵانی ئاکــرێ). بەســەر نووسراودانەکەیشەوە ڕادیۆیەک بۆ منداڵەکان دانراوە. ئەگەر منداڵت لەگەڵ خۆتدا هێناوە، بینێرە بۆ ئەو سەیرانگایە تا لەلایەن مـامـۆسـتـای سەرپەرشـتیکەری سەیرانگاکەوە ڕێی بدرێ یاری لەوێدا بکات خۆیشت بەتەماشاکردنی ئەو منداڵە جوانانە چاوت بگەشێنەرەوە، کە هەر لە گوڵ دەکەن و، دەبزوون و یاری دەکەن و بەزموڕزم و ئاهەنگ دەگێڕن و، مەشق دەکەن و، وەرزش دەکەن و، لە شێوەیەکی پاک و بێگەرد و بێ تاوانیـشـدا هەوای باڵی خـۆیان دەدە. لەوانەوە پرشنگی خۆشەویستی و دڵخۆشی و کامەرانی پەخشان دەبێ، تۆیش دەتوانیت بەشێکت لەو پرشنگە بەربکەوێ.

## ڕۆژنامەی ،ئاکرێ،

چاوت لێیە لە (سەیرانگای سەرا)دا، لەلای سەروویدا، تەختەیەکی چوارگۆشەی گەورە هەڵواسراوە؟ لەوێدا سندوقێکی بچووک بەتەختەکەوە داکوتراوە و، کلیل و کلۆمیش کراوە. لە ناوەڕاستی سنووقەکەدا درزێک هەڵکەندراوە. لەو درزەوە دانیشـتوانی ناوچەی ئاکرێ پێشنیـازەکـانیـان لە بابەت چاککردن و ڕێکخـستنی کاروباری ناوچەکەیانەوە کە لەسـەر قـاقەزێک نووسیـویانە دەخەنە ناو سنووقـەکەوە. هەندێکیشیـان لە بابەت گیروگرفتەکانی خۆیانەوە یاخود لە بابەت ئەو زانیارییانەوە کە بەپێویستیان

دەزانن بیزانن، قاقەز فڕێ دەدەنە ناو سنووقەکەوە. لەسەر ڕووی تەختە چوارگۆشەکەیش ڕۆژنامەیەک هەڵواسراوەکە ناوی نراوە (ئاکرێ). ئەم ڕۆژنامەیە، لەلایەن (شارەوانیی ئاکرێ)وە، هەموو هەفتەیەک جارێک و بەیەک دانەیش دەردەهێنرێ. مەبەسی شارەوانییش لەم ڕۆژنامەیە ئەمەیە کە دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ وریا بکاتەوە و ئاراستەیشیان بکات بۆ کەڵکی گشتیی. جا لەو ڕۆژنامەیەدا هەچ پرسێک کرابێ لەلایەن دانیشتوانی شارەکەوە لەلایەن دەستەی نووسەرانەوە وەرام دەدرێتەوە. بێجگە لەمە، لە ڕۆژنامەی ئاکرێدا، هەروەها دەنگوباسی ناوچەی ئاکرێ و قسە نەستەقەکانی ڕۆشنبیرانی ناوچەکە، و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی و، مێژووی جووڵەی ئاوەدانی و ڕۆشنبیری و بازرگانی و کۆمەلایەتی و گەلێک بابەتی تری ناوچەکە دەخوێنیتەوە. (بڕوانە کتێبی یەک لەم پرۆژەیە، ل: ٤٩٥ – ٥٣٩) ا. ب.

## یانەی فەرمانبەران

تۆ ئێستا ئەتوانیت یەکێک لە فەرمانبەرەکانی هاورێت ببەیت لەگەڵ خۆتدا و بچیتە ناو (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ)ی هاوینەیەوە، کە یەکجار شەنگ و جوان و ڕازاوەیە، هەروەک چاوت پێدەکەوێ ئەندامانی یانەکە لە شێوەیەکی زۆر شیریندا پێشوازیی هەموو میوانێک و ئاوارەیەک دەکەن. بێجگە لەوە، یاریی پاک و بێگەرد و، ساردەمەنیی خۆش و، نووسراو و ڕۆژنامە و گۆڤارانی چاک و بەکەڵک و، (ساز و ئاوازی پەسەند و گۆرانیی بەجۆش)یش دەخەنە بەردەستت پێیان ڕاببوێرێ.هەروەها لەوێدا جاروبار کۆڕی هەڵپەرکێ و ساز و ئاواز و، زانست و وێژە و کۆمەلایەتییش، لەگەڵ وتارە هەفتەییەکاندا دەبینیت.

لە یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێدا، تەقومار هەیە و، نەشەڕوشۆڕ و، نەجووڵەی زرنگ کاری. دروشمی گشتیی ئەندامەکانی بریتییە لە (خۆشەویستی)و (برایەتی) و (یەکسانی) و (ڕاژەی گشتی) و ئاراستەکردنی دانیشتوانی ناوچەکە بۆ سەربەرزی و پێشکەوتن. تۆماری کردەوە و کارەکانیشیان بەڵگەیە بۆ ڕاستیی قسەکەمان.

## سەیرانگای سەری گری

دەتەوێت نانی شێوانت لە بێدەنگ و سەنگیی شەو و جوانی و شیرینییەکەیدا بخۆیت؟ هەر لە ڕێگاکەی خۆتەوە کە لیوەی هاتوویت، بگەڕێرەوە. ئینجا هەڵگەڕێ بەلاپاڵی گردەکەدا تا دەگەیتە (سەیرانگای سەری گری). ئەم سەیرانگایە هەر لە دوورەوە. دەبریسکێتەوە. لەسەر ئەو گردە دروست کراوە کە کەوتۆتە ناوەڕاستی (شاری ئاکرێ)وە. تۆزێک پشوو بدە. دوای ئەوە چاوی خۆت بگەشێنەرەوە، بەتەماشاکردنی ئەو سورکە سەماکەرە پڕ بەزمە کە لە ناوەڕاستی ئەستێرکە جوان و ڕازاوەکەیدا هەڵدەقوڵێ و بەرز دەبێتەوە بەرەو ئاسمان. بۆنی ئەو کزەبا بۆنخۆشە بکە کە لە گوڵ و ڕێحانەکانی ناو سەیرانگاکەوە دێت. گوێ بگرە لەو ساز و ئاوازە نەرم و خۆشانەی کە لە ڕادیۆکەی سەیرانگاهەکەوە دێنە دەرەوە. دوای ئەوە تەماشای دەوروپشتت بکە: شاخە بڵندەکان و، باخ و ڕەزە

ناوازەکان و، چراخانە ڕەنگاوڕەنگەکانی شارە چاو بەستکارەکە ببینە، کە چۆن ڕازاوەتەوە. ئنجا لە بیروباوەڕە چاکە خوازەکانت و، ئاواتە نازەنینەکانیشت خۆشی بچێژە، لە ناوەند ئەو بێدەنگ و سەنگییە ناوازەیەدا، تا کاتی نوستنت دێت.

## سەیرانگای شێخ عەبدولعەزیز

ڕۆژی سێیەم دەتوانیت بچیتە (گەلیی شێخ عەبدولعەزیز). ئەویش بریتییە لە سەیرانگایەکی جوان، کە پڕە لە ڕەز و باخ و، کانیاوی سازگار و کەپر و سابات، کە چوارلای ئارامگاکەی (شێخ عەبدولعەزیز)ی کوڕی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)یان ڕازاندۆتەوە، تۆ دەتوانیت هەتا ئێواری بەخۆت و خێزانتەوە لەوێدا پشوو بدەیت و، سرەوتێکی تەواو بەخۆتان ببەخشیت. چونکە تۆ لەوێدا بێجگە لە چێژکەی خواردن و مەلەکردن و سرەوت بەخۆدان و تەماشاکردنی چاو ئەندازانی جوان، چێژکەیەکی گیانییش دەکەیت، لەو هاوینەهەوارە شەنگوشۆخەدا، لەبەردەم گیانە پاکە چاکەکەی ئەو (شێخە گەورە)یەدا.

ئەو سەیرانگایانەی لەمەوپێش ناوم بردن هەموویان کشت لایی بوون. بەڵام ئێستاکە تۆ دەتوانیت خۆشی لە بینینی ئەو سەیرانگایە تایبەتییانەیش ببینیت کە گەورە پیاوانی شارەکە و ڕۆشنبیرەکانی هەیانە.

پێویست بەوە ناکات خاوەنی ئەو سەیرانگایانە بناسیت. چونکە ئەو پیاوە ناسراوانە، لەوانەن، بەناسینی هەموو کەسێکی گەشتوگوزار کار و، هەموو ڕێزی لێ بگرن و، میواندارییی بکەن. کە سەرنجیان لێ دەدەیت، بەتەنیشت ڕەوشت و خووە بڵندەکانیانەوە و، کردارە شیرینەکانیانەوە، خاوەنی چێژکەیەکی بلیمەتی و ڕاست و دروستن لە دامەزراندنی سەیرانگاکانیاندا و ڕێکخستنیان و ڕازاندنەوەیاندا.

هەروەها هەر کامێکیان بگریت ئەوەندە لێهاتوویی و زیرەکیی و ڕۆشنبیریی لەباردا هەیە، کە دەتوانێت هەموو جۆرە گفتوگۆیەک و هەموو لێدوانی بابەتێکی بەکەڵک وخۆش پێشکەش بەمیوانەکانی خۆی بکات. کە سەرنج دەدەیت هەموو ئاگایان لە پێویستییە گشتییەکانی نەتەوەکەمان و گیروگرفتەکانمان هەیە، لەگەڵ شێوەی چارەسەرکردنیان. ئەوەندەیشیان لەباردا هەیە کە بەهەموو کوڵی دڵیانەوە ئازایانە و چالاکانە و چاکەخوازانە یارمەتیی ئەو کەسانە بدەن کە بەکەڵکی نیشتمان و نەتەوەکەیان دێن. ئەو پیاوانە لەڕاستیدا هەڵبژاردەی نەتەوەکەی خۆیانن و جێی شانازییانن. ئەو کەڵە پیاوانەم وا هاتە پێش چاو کە بەڕاستیی یاریدەی شارەوانییەکە و جێنشینییەکەی خۆیان دا لە پێشکەشکردنی ڕاژەدا بۆ ناوچەکەیان، بەتایبەتی بۆ شاری (ئاکرێ)، کە زۆر خۆشیان دەوێ.ئەوانە زۆر ڕەنجیان دا و سامانی خۆیان بەختکرد و، یارەیدەیان دا لەپێناو پێشکەوتنی ناوچەکەدا. زۆربەی ئەم سەیرانگایە گشتییانە و ئەم شەقامانە و ئەم پێویستییە گشتییانە، بەسایەی یارمەتی و خۆبەختکردنی ئەو پیاوانەوە پێکهاتوون.

## بەرەنگاریی نەخوێندەواری

یەکێک لەو هاریکاریانە (بەرەنگاریی کردنی نەخوێندەواری)یە کە لەلایەن سێ لاوی خوێندەواری ئاکرێییەوە جێبەجێ دەکرێ. وەرە لەگەڵمدا بۆ خوێندنگاکەیان. تەماشاکە ئەو لاوانە چۆن هەموو شەوێک دێنە ئەوێ و بەخۆڕایی بەدانیشتوانی شارەکەی خۆیان دەخوێنن، بێ ئەمەی خەمی سەروەت و کات و فرمان و کەڵک و چاکەی خۆیان بخۆن! لە ڕاستیدا، خودا ڕاستیان بۆ بکات، کردەوەکەیان لە کردەوەی پیاوچاکان و خوداپەرستان دەکات. لە یارمەتییەکەیاندا مەردایەتی و مرۆڤایەتییەکی گەورە دەردەکەوێت. کەم کەس هەن شتی وەها بخەنە ئەستۆی خۆیان. سوپاس بۆ خودا، لە شارە خۆشەویستەکەی (ئاکرێ)دا زۆری وەک ئەوان هەن. لە زۆربەی چینەکانی نەتەوە و دەسگاکانی میریدا، زۆر کەس لەو جۆرە پیاوانە هەن، کە هەر بەچەشنی ئەو سێ لاوە، ڕاژە گشتییەکان بۆ ناوچەی ئاکرێ پێشکەش دەکەن. لە ڕاستیدا هەر کار و فرمانێک لە سالانی (١٩٥٠) و (١٩٥١)دا جێبەجێ کراون، وەک وشککردنەوەی فرمێسکی هەژاران و لێقەوماوان و بێچاران و، دۆزینەوەی کار و فرمان بۆ بێکاران و، گەشەکردن بەزانست و هونەر و پیشەسازی و، ئاوەدانکردنەوە و ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی شارەکەو ناوچەکە، ئەوانە هەموویان یان بەشی زۆریان بەسایەی یارمەتیی ئەو پیاوە چاکانەوە پێکهاتوون. بێگومان ئەوانە ڕاژەی چاکیان پێشکەشی نیشتمانەکەی خۆیان کردووە. هەروەها بێگومانیشم لەوە کە خودای مەزن پاداشی چاکیان دەداتەوە.

## سەیرانگاکانی تری ناوچەکە

نەکەیت وەڕس ببیت لەوەی کە لە هاوینەهەوارەکانی شاری ئاکرێدا ماویتەوە. چونکە هێشتا ماوتە چەند گوند و چەند هاوینەهەوارێکی تریش لە دەوری ئاکرێ ببینیت و بەخۆشی تێیاندا ڕاببوێریت. هەروەها چەند کەسانێکی خاوەن ڕێزیشت ماوە لە ناوچەکەدا بیانبینیت کە ناسینێ پێیان دڵخۆش دەبیت. بێجگە لەوانە گەلێک بابەتانی تریش هەن دەتوانیت پێیان ڕاببوێریت. پێت خۆشە بەسواری بگەڕێیت، یان بەسەر شاخدا هەڵ بگەڕێیت؟... حەز دەکەیت ڕاوە باڵدار یاخود ڕاوە ماسی بکەیت؟ ئارەزووی بینینی کۆنە شوێنەوار دەکەیت، یان دەتەوێ دارودرەخت و گژوگیا و گوڵی سەیر سەیر بدۆزیتەوە؟... ئەی دڵت ناچێ بەبینینی پەرستگاکان ئارامگا پیرۆزەکاندا؟... لەوانە هەر کامێکیانت دەوێ ببینیت دەتوانیت بەئاسانی بۆی بچیت. دەتوانیت بچیت بۆ سەر شاخەکانی (ئاکرێ) و (پیرس) و (هاوینەهەواری سەری سادە) و، گوندەکانی (بجیل) و (کەلاتی) و (شۆش) و (سەردەریان) و (گوندک) و (گەلی سوولی) و (دڤری) و (زێراڤ) و (سوسناوا) و، ڕووبارەکانی (زێی گەورە) و (خازر). دەتوانیت بۆ ئەم هەموو شوێنانە بڕۆیت، کە نزیکن یان بەئۆتۆمۆبیل یان بەسواری ئەسپ، یان بەپێ. دەتوانیت ڕابواردنێکی خۆشی بێگەردیان تێدا ڕاببوێریت و کەڵکیشت پێ بگات. دەتوانیت هەر ئەو ڕۆژە یاخود ڕۆژی دوایی بگەڕێیتەوە ئاکرێ.

## کۆمەڵایەتی ناوچەی ئاکرێ

### دڵداری و ژن و مێردیی

بەزۆریی، لە ناوچەی ئاکرێدا، ژنهێنان لەسەر بنچینەیەکی خۆشەویستی دوولایی دادەمەزرێ لە ناوەند کوڕ و کچدا، کە هەردوولایان سەربەستی خۆیان بەکاردەهێنن لە کاتی مارەکردندا. بەڵام خۆیان حەز لەوە دەکەن کە کوڕ و کچ خزمی یەکتربن. ئەمەیش ژیری تێدایە، بۆ ئەمە دانراوە کە لەلایەکەوە خزمایەتی بپارێزرێ، لەلایەکی تریشەوە مافی خێزان یاخود هۆز و تیرە بپارێزرێ لە دەستکاریی بێگانە لە زەوی و خانوو و دووکان و سامانی یەکێک لە ژن و مێردەکە، کاتێک کە دەمرێ یاخود لەناودەچێ. نەبوونی پەچە و باڵاپۆشیش لەئارادا، لەگەڵ تێکەڵبوونی بێ گەرد لە ناوەند هەردوو ڕەگەزدا، کە بەبۆنەی هەرەوەزی کشتوکاڵ و داربڕین و ئاهەنگەکانەوە پێک دێت، ئەو هەلانە دەست کوڕ و کچ دەخەن کە یەکتر ببینن و بناسن و دڵی خۆیشیان بۆ یەکتر بکەنەوە بۆ ئەمەی ببنە هاوسەری یەکتری.

### کچ فڕاندن

ئەگەر کوڕ و کچە کە هەستیان کرد باوک و دایکیان ناهێڵن ژن و مێردییەکەیان سەربگرێ، هەردووکیان خۆیان دەرباز دەکەن بۆ لایەکی زانراو و، کەسایەتییەکی بەڕێزی ناسراو، لای ئەو یەکتری مارە دەکەن بێ ئەمەی پێش مارەکردنەکە کارێکی وایان کردبێ کە فری بەسەر داوێنپیسی و بێ ئابڕوویییەوە هەبێ. لە ناوچەی ئاکرێ فڕاندن بریتییە لە شۆڕشێک دژی دەسەڵاتی ناهەمواری باوک و دایک کە دەیانەوێ ئەو دڵدارییە پاک و بێ گەردەی لەناو[1] ئەو کوڕ و کچەدا پەیدا بووە لەناوی ببەن، کە لە ڕاستیدا لە ئاستی یاسای سروشتی و یاسای خواییدا هەڵدەگەڕێنەوە!. چونکە ئەو کچ فڕاندنە داوێنپیسی و بەدخوویی تێدا ڕوونادات. ئەم جۆرە دەستکاری کردنەیش لە ئەڤینی هەردوو دڵداردا، لەناو خێزانە دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارە لووت بەرزەکاندا ڕوودەدات. چونکە ئەو باوک و دایکانە بەدوای دڵخۆشی و کەڵکی ناپوختەی خۆیاندا دەگەڕێن، نەک دڵخۆشی و کەڵکی ڕۆڵەکانیان. ئەوەندە هەیە ئەم جۆرە دەستکاریی کردنە بەسایەی خوداوە لە ناوچەی ئاکرێدا کەم ڕوودەدات.

### یاسای دڵداری پیرۆزە

لێرەدا ژنهێنان زوو جێبەجێ دەکرێ. لەمەیشدا زرنگی هەیە، بۆ ئەمەی کچ و کوڕ لە داوێنپیسی دوور بخرێنەوە. ژنهێنانیش، لەناو چینی دەوڵەمەندان و دەسەڵاتداراندا نەبێ، زۆری تێ ناچێ. هۆی ئەمەیش ئەوەیە دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارەکان بەدوای مایە و سایە و پایەدا دەگەڕێن، بەدوای بابەتی گیانیدا ناگەڕێن. لەبەر ئەوە، ژیانی ژن و مێردی لەناو ئەم جۆرە چینەدا، زۆری پێ ناچێ تێک دەچێ و، شەڕوشۆڕ و خوێنڕشتن و سەرگەردانی لێ پەیدا دەبێ. ئەمەیش سزایەکە، لەلایەن سروشتەوە ئاراستەی ئەو کەسانە دەکرێ، کە ڕێز لە یاساکانی ناگرن، کە یەکێک لەو یاسایانە و لەسەروو هەموویانەوە،

---

(۱) ڕاستتر (لە نێوان).

(یاسای دڵداری)یە. چونکە (دڵداری) دەسەڵاتێکی وای هەیە، کە کەس ناتوانێ بەرەنگاری بکات. یاساکەیشی هەموو دەم سەردەگرێ و سەردەکەوێ بەسەر ئەو کەسانەدا کە دەیانەوێ بەربەستی بکەن. بەڵام خۆشبەختانە لەم ناوچەیەدا، زۆربەی دانیشتوان ڕێز لە یاسا پیرۆزەکەی دڵداری دەگرن، سا لەبەر ئەمەیە کە زۆربەی ئەو خێزانانەی لە ناوچەکەدا پەیدا دەبن و، پێک دێن، پەیوەندییان بەیەکترەوە بەهێزە و، بنچینەیان پتەوە و، بەروویەکی خۆش و سنگێکی فراوانیشەوە بەرەنگاریی هەموو کارەساتێکی ناهەموار و سەرگەردانی دەکەن لە ژیانیاندا.

## لێرەدا سروشت کاری کردۆتە سەر دڵداری و جوانی

ڕەنگە جوانی سروشتی ناوچەکە و، سازگاری ئاو و بایەکەی و، ژیانە سروشتییە پڕ تەندروستییەکەی، کە پڕە لە وەرزش و، خۆدانە بەر ڕۆژ و، بای پاک و، خواردنی خۆرشتی ساکار و بەکەڵک، بووبنە خوێندنگایەکی هەرە چاک کە کوڕان و کچان ڕابهێنێ بەخۆشەویستی و دڵدارییەکی پاک و بێگەردەوە. لام وایە هەر لەبەر ئەم خۆشەویستییە پاک و پیرۆزەیشە کە نەتەوەی کورد لە ناوچەی ئاکرێدا، لە ڕووی کۆمەڵایەتی و، تەندروستی و، ڕەوشت و خووی باشەوە. بەهێز و هەرەتەوە دەژی. منیش بەم بۆنەیەوە دەڵێم: کە سروشتە جوانەکەی ناوچەی ئاکرێ، کەسانی جوانی لێرەدا دروست کردووە، چ ژن بن چ پیاو. لە ڕاستیدا جوانی ئافرەتی کورد لەم ناوچەیەدا، جوانییەکی سروشتییە، پێویستی بەسووراو و سپیاو و، کوتانی دەم و چاو و، ڕەنگکردن و نەخش و نیگار نییە. خشڵیشی پێویست نییە. ئەمەیش پاداشتی سروشتە، خودا بەو کەسانەی دەبەخشێ کە ڕێز لە یاساکانی دەگرن.

## پایەی کەیبانوو

ژن بەناوی کوری هەرە گەورەیەوە بانگ دەکرێ. جڵەوی ماڵ ڕاگرتن و، ڕازاندنەوەی و، بەڕێوەبردنی، بەدەست خۆیەوەیە. خۆی کەیبانووی ماڵە. جا چونکە ژن بۆ خێزانەکە، خۆی لە پیاو زۆرتر دەرەنجێنێ و، لە هەموو کەسێکیش زۆرتر یاریدەی مێردەکەی خۆی دەدات لە پێگەیاندنی بەرهەم و دەرامەتدا، بێ گومان شایستەی خۆی لە مێردەکەیەوە ڕێزی دەست دەکەوێ. ژن لە ڕاستیدا کۆڵەکەی ماڵە و، جێی شانازیی خێزانە کە پێوەی بکات. چونکە ئەو بێجگە لە فەرمانەکانی ماڵەوەی، وەک پەروەردەکردنی منداڵ و، ئامادەکردنی چێشت و خۆرشت و، ماڵ ڕاگرتن و، خێزان بەڕێوەبردن و، میوان بەڕێکردن، هاریکاریی مێردەکەی خۆیشی دەکات لە فەرمانکردن و نان پەیداکردندا. تەنانەت هی وایان تێدایە، وەک ئافرەتە سورچی و هەرکییە کۆچەرەکان، بەزەبری کوتەک و چەکی کوشندەیش وەک پیاوان، خێزان و ماڵ لە دوژمن دەپارێزێ. جا لەبەر ئەم هۆیانەیە کە ژنانی ئەم ناوچەیە مافی خۆیان دەست کەوتووە و، سەربەستییان چنگ کەوتووە و، ئازایانە و سەربەستانە دەجووڵێنەوە. هەروەها شان بەشانی مێردەکانیان لە کاروباری خێزان و ماڵەکانیاندا بیروباوەڕی خۆیان دەردەبڕن و ڕێزیشیان لێ دەگیرێ!.

گەلێک جار کە سەرنجم لە ژیانی ئافرەتانی ئەم ناوچەیە دەدا، بۆیان خەمبار دەبووم. چونکە کەیبانووی بەسەزمان لە گوندەکانی ناوچەکەدا بەهۆی ئەو کار و فەرمانە زۆرانەیانەوە کە دەیکەن، هیچ کاتێکیان بۆ نامێنێتەوە کە سرەوتی تێدا بدەن و بحەسێنەوە. ئەم بارەیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆر لە

جوانی و تەندروستی خۆیان زوو بەزوو، لە پاش شووکردن، لەدەست بچن. کەواتە چینی خوێندەواران پێویستە لەسەریان چاودێری ژنەکانیان بکەن و، دڵیان ڕابگرن و، چەندیان لەدەست دێ خەمی خۆشگوزەرانی و کامەرانی و سەربەرزییان بخۆن، تا تۆڵەی ئەو ڕەنج و خۆبەختکردنەیان بۆ بکەنەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیانەیشە کە گەلێک ژن هەم گوێ نادەنە ئەوەی مێردەکانیان ژنی تر بهێنن. چونکە بەهۆی ئەو ژنە تازانەوە هەندێک چەوسانەوە وماندوێتییان لە کۆڵ دەبێتەوە. تەنانەت هەندێک ژنی وایش هەن کە مێردەکانیان نامێنن هیچ باکیان نییە. چونکە توانایی ئەوەیان هەیە بەرەنجی شانی خۆیان و بەپیشەی سەربەرزانە نانی خۆیان و منداڵەکانیان پەیدا بکەن و منداڵەکانیشیان بەباشی پەروەردە بکەن. هی وایشیان تێدا هەیە کە بوون بەبێوەژن، جارێکی تر شوو ناکەنەوە، هەر لەبەر ئەوەی چاکەی مێردە مردووەکانیان بدەنەوە.

## ناپاکی ژن و مێردی

ناپاکی ژن و مێردی، یاخود داوێنپیسی، ئەوەندەی ئەماوە بڵێم یەجگار کەمە، یاخود هەر نییە لەم ناوچەیەدا. چونکە نەریتی نەتەوەی کورد، لێرەدا وەهایە، کە ژن و پیاوی داوێنپیس هەردووکیان بکوژرێن. لەبەر ئەوە ئافرەتی داوێنپیس ناتوانێ لە ناوچەکەدا بمێنێتەوە. پیاوی داوێنپیسیش بەچاوێکی سووکەوە سەیری دەکرێ، ناوی بەخراپ دەبەن و کەنەفتیشی دەکەن، پێیشیدا ڕاناپەڕموون هیچ کارێکی پێ بسپێرن.

## پایەی مێرد

مێرد سەرۆکی خێزانە و هەرچی بڵێ ئەندامانی خێزان بەقسەی دەکەن. ژنی و منداڵەکانی و ئەندامەکانی خێزانەکەی، هەموویان لە کار و فەرمانەکانیدا یارمەتی دەدەن و، هەر ڕاوێژێکیشی پێویست بێ بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ماڵەکە پێشکەشی دەکەن. بەڵام کە هاتوو لایدا لە بەجێ هێنانی پێویستی سەرشانی بەرامبەر خێزانەکەی، خێزانەکەی لێی هەڵدەگەڕێنەوە و بەگوێی ناکەن.

ژنەکەیش و مێردەکەیش هەردووکیان بەزۆری منداڵەکانیانەوە شانازی دەکەن، بەتایبەتی بەکوڕەکانیانەوە. هەردوولایشیان بەوە زۆر شادمان دەبن کە منداڵەکانیان تا دوارۆژی ژیانیان لە ماڵێکدا لەگەڵیاندا بمێننەوە، تەنانەت لەپاش ژنهێنانیشیان و منداڵبوونیشیان بەوەیشەوە کە هاوبەشیان بن لە نان پەیداکردن و دەرامەتدا و، لە چێژکەی ئەو دەسکەوتانەدا. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە دەیانەوێ لە ڕووی ئابوورییەوە کەڵکی خۆیان بپارێزن و، هۆگری خێزانیشیان وەک خۆی بمێنێتەوە، لەگەڵ پایەی خێزانیدا.

## هۆز

چۆنێتی دروستبوونی هۆز لە تیرە و خێڵ و دەستەماڵ کە ئەمانیش هەریەکەیان لە خێزانەکان پێک دێن، بابەتێکی زانراو و ئاشکرایە، پێویست ناکات لێی بدوێم. بەڵام پەیوەندی تاکەکانی هۆزەکە، بەسەرۆکی هۆزەکەوە و، هەردووکیشیان بەهۆزەکە خۆیەوە بەگشتی، بەپێویستی دەزانم لێیان بدوێم.

## تاکەکانی هۆز و سەرۆکی هۆز

چونکە ئەو کارە گەورە و گرنگانەی بەکوێخادێ یاخود بەسەرەکی تیرە، یان بەسەرۆکی خێڵ چارەسەر ناکرێن، تاکەکانی هۆز بەناچاری دەچنە لای سەرۆکی هۆز چارەسەریان بکات. ئەمیش یان ڕەوشت و نەریتی هۆز لە چارەسەرکردنیاندا بەکاردەهێنێت، یاخود یاساکانی ئایین بەکاردەهێنێت، هەرچی کێشەی سەرۆک خۆیەتی و، پەیوەندی بەرژەوەندی خۆیەوە هەیە، یاخود بەئابڕوو و ژیانیەوە، سەرۆک لە چارەسەرکردنیدا خۆی بەهیچ ڕەوشت و نەریتێکی هۆزەکییەوە، یاخود بەیاساکانی ئایینەوە نابەستێتەوە، نە لەگەڵ تاک و تەرایانی خێزانی خۆیدا، نە لەگەڵ خزمانیدا، نە لەگەڵ تاکەکانی هۆزەکەیدا، نە لەگەڵ کەسانی تردا. چونکە تۆڵەسەندنەوە، کە خۆپەرستی و خۆپەسندی و خۆنواندن پاڵی پێوە دەنێن بێتە کایەوە، لەلای ئەو جۆرە سەرەک هۆزانە، تاکە یاسایەکی کاریگەرە و بەکاردەهێنرێ ئەگەر هێزێکی گەورە لە بەرامبەریاندا نەوەستێ، دەستبەرداری نابن. جا لێرەوەیە کە دەستدرێژی و دەستوەشاندن و زۆرداری ڕوودەدەن. لەمانەیشەوەیە کە ماڵوێرانی و سەرگەردانی تووشی سەرەک هۆزەکە و هۆزەکەی دێن. داخەکەم سەرەک هۆز و کەم هۆز هەن، کە لەم جۆرە بارە ناهەموارە پڕ ئازارانە ڕزگاریان ببێ!... لە ڕاستیدا ڕاستیان گوتووە: «دەسەڵاتداریی پیاو تێک دەدات. دەسەڵاتداریی بەرەڵلایش تێکدانێکی بەرەڵلا تووشی خاوەنی دەکات!» هەرچی سەرەک هۆزەکانن، دەسەڵاتەکانیان یەجگار فراوانن، بگرە ئەوەندەیان نەماوە بگەنە دەسەڵاتی خونکارە زۆردارەکانی سەردەمانی کۆن. ئەوانە لەناو هۆزەکانی خۆیاندا بریتین لە سەرۆکی فەرمانڕەواییەکی سروشتی. ئەگەر هێزێکی گەورە ڕێگایان لێ نەگرێت و لێی نەترسێن، باکیان نییە لە کەس، هەرچی ئارەزوو بکەن و لە دەستیان بێت دەیکەن. بەڵام خوداوڕاستان زۆر جار ئەو هێزە گەورەیەیان دێتە بەرامبەر، وەک هۆزێکی وا کە بەربەرەکانێیان بکات، یاخود فەرمانڕەواییەک کە بەدوای دادپەروەریدا بگەڕێت، یاخود کۆمەڵێک کە لەناو هۆزەکە خۆیدا پەیدا بووبێ و بەهێز و هەڕەتەوە بەرەنگاریی بکات لەسەر زۆر و ستەمەکانی. سەرەک هۆزەکان باج لە تاکەکانی هۆزەکانی خۆیان دەسێنن، چ لە بەرهەمی سروشتی بێ، چ لە بەرهەمی کشتوکاڵ بێ، چ لە بەرهەمی گیانلەبەران بێ. تەنانەت کە ئەو تاکانە ژنیش بهێنن یان سکاڵایان ببەنە بەر بۆ بڕینەوەی کێشەکانیان، باجیان لێ دەسێنن. سەرۆکی وەهام دیوە کە لادێیەکانی ژێردەستی کە بریتین لە هۆزەکەی خۆی و کرێکارییان کردبێ بۆ میری سەرانەی لە کرێکارەکان سەندووە!... بێجگە لەوە و لە بێگاریش سەرۆکەکان تاکەکانی هۆزەکەی خۆیان ناچار دەکەن چەکی کوشندە بکڕن، بۆ پاراستنی هۆزەکە و پاراستنی خۆیان. جاری وایش هەیە بەزۆر بێگاریان پێ دەکەن، لە داربڕین و کشتوکاڵ و گواستنەوەدا. هەر کەسێک لە هۆزەکە لێیان یاخی ببێ، بەپێی پلەی یاخیبوونەکەی بەریشم و تووڕەیی سەرۆکەکەی دەکەوێ، سا یان سەرزەنشت دەکرێ یان لێی دەدرێ. یان جەریمە دەکرێ، یان دەکوژرێ.

جا سەرۆکەکانی هۆزەکانی (زێباری، هەرکی، گێژ و سورچی) بەم شێوە و دەستوورەوە، بەڕێوە دەچن.

## لێ پرسینەوە لە سەرۆک هۆز

بەڵام ئەگەر سەرەک هۆزەکە لەلایەن فەرمانڕەواییـیەکی بەهێزی دادپەروەرەوە چەند و چوونی لەگەڵدا بکرێ، بێ گومـان دەسەڵاتەکەی کز دەبێ و، تۆڵەسەندنەوەکانیشی بەنهێنی جێبەجێ دەکرێن. ئەویش بەپێی ڕۆژ ڕەفتـار دەکات و، لەگەڵ فەرمانڕەواییدا گوزەران دەکات، بەنەرمییەکیشەوە داوای یارمەتی و هەرەوەز لە هۆزەکەی خۆی دەکات. ئەمەیش پێویستـە بگوترێ، کە تاکەکانی هۆزەکە سەرۆکەکەی خۆیان دی دادپەروەر و دڵسۆز و خاوەن بەزەییـیە لەگەڵیاندا، ئەوانیش فەرمانەکانی بەجێ دەهێنن و، کەڵ کی پێ دەگەیێنن و، دڵسۆزیشی لەگەڵدا دەنوێنن. تەنانەت لە چارەسەرکردنی کاروبارەکانیشیاندا بۆ لای ئەو دەچن، نەک بۆ لای میری. چونکە هۆزەکە ئەو بەسەرۆکی فەرمانڕەواییـیە سروشتییەکەی خۆیان دادەنێن، کە لە باریدا هەیە کار و فـەرمـانیـان زوو جێبـەجێ بکات و، کێشـەیان زوو ببـڕێنێتـەوە و، بەئاسـانی تەواویان بکات و، سـاکارانە و بەئەرکێکی زۆر کەم ڕایان بپـەڕێنێ. بەلای ئەوانەوە، بۆ چارەسـەرکردنی گیروگرفت و کێشەکانیان، ئەو سەرۆک هۆزەی خۆیان چاکترە لە فەرمانگەکانی فەرمانڕەوایی، کە کات و سامان و ڕەنجێکی زۆریان پێ بەخت دەکەن، کە ئەوانەیش لە وزەی ئەواندا نین پێیان هەڵبسن.

بەڵام ئەگەر سەرەک هۆزەکە، بەرامبەر هۆزەکەی خۆی فـەرمانی سەرشانی خۆی بەجێ نەهێنا، هۆزەکە هەر هەلێکی دەست بکەوێ، لێی یاخی دەبێ و، ڕوو دەکـاتە سـەرەک هۆزێکی تر کـە کـار و کـردەوە و ڕەوشت و خـووی سـەرۆکـانە بەکـار بهـێنێت. جـا ئەگـەر لە هەردوولا ڕەنجـەڕۆ و بەشی براوبوون لە دادپەروەری، ئیـتر ڕوو دەکەنە فـەرمانڕەوایی و ئەو لە جێی سەرەک هۆزی خۆیان دادەنێن. جا لێرەدا کە پێـویسـتـە بڵێم: ئەگـەر فـەرمـانڕەواییـیەکی دادپەروەری بەهێـز لە ئارادابێ و، چەند دادگـایێکی وایش دابمەزرێنرێ کـە کـاروباری ئەتەوە زوو ڕابپـەڕێنن و، ئەرکیـان زۆر نەبێ بەسـەر خـاوەن سکاڵاکـانەوە و، بایەخیش زۆر بدەن بەکەڵک و چاکەی هەموو هاونیشتـمانێک، هیچ هۆزێک پەنا ناباتە بەر سەرەک هۆز تا بڕینەوەی کاروباری خۆی پێ بسپێرێ و بەندەیەتی بکات.

## فەرمانەکانی سەرەک هۆز

سەرەک هۆز لەسەریەتی مافەکانی تاکەکانی هۆزەکەی خۆی و هۆزەکەی خۆی بەگشتی، لە زۆرروستەمی ناوخۆ و دەرەوە بپارێزێ. بەڵام ئەوە لە ئەستۆیدا نییە کە خەمی پێشکەوتنی هۆزەکەی خۆی بخوات، لە ڕووی ئابووری و کشـتـوکـاڵ و خـوێندەواری و تەندروسـتی و ئاوەدانییـەوە. هەروەها سـەرەک هۆز لەسـەریەتی، لە کـاروبای گرنگدا کـە پەیوەندی بەگشت هۆزەکـەیەوە هەیە، وەک شـەڕوشـۆڕ و، هەوار گـوێزانەوە و، نواندنی ملکەچی بۆ فـەرمـانڕەوایی، یاخـود یاخـیـبـوون لە فـەرمـانڕەوایی، ڕاوێژ بەکەڵەپیاوەکانی هۆزەکەی خۆی بکات. هەرچی هۆزەکـەیە کـە سـەرەک هۆز فەرمانی دەرکرد، بەجێی دەهێنێ، بەرپەرچی ناداتەوە، بەمـەرجێ ئەو فـەرمـانە مـەترسی و زیانی بۆ هۆزەکە تێدا نەبێ. بەڵام لە کاروباری ئاساییدا، سەرەک هۆز، پرس بەکەس ناکات، هەرچییەکی گوت هۆزەکە بۆی جێبەجێ دەکات.

## کڵۆڵی تاکەکان

ئەگەر تەماشای باری تاکەکان بکەین کە لەم شێوەیەدا گوزەران دەکەن لە خەم و خەفەت بەولاوە هیچی ترمان بۆ نامێنێتەوە. چونکە ئەو لەژێر چنگی فەرمانڕەواییەکی ناو فەرمانڕەواییەکدایە!... بۆ هەردوو فەرمانڕەواییەکیش، لە ڕەنجی شانی خۆی و ئاوڕەگی ناوچەوانی خۆی، پارە دەردەهێنێ و بەناوی باج و سەرانە و بێگارە وە پێشکەش دەکا!. جا هەتا تاکەکانی هۆزەکان لە ڕووی ئابوورییەوە، لەم بارە ناهەموارەدابن و ڕووبکەنە کزی، هەژاری و برسێتی بیانگەزن و، نەخۆشی تووشیان ببێ و، نەخوێندەواری سەریان لێ تێک بدات و، هیچ کەسێکیش فرایایان نەکەوێ لەم کزی و نەبوونی و بێ دەسەڵاتی و چارەڕەشییە ڕزگاریان بکات... واتا هەتا هۆزەکان لەم شێوەیەدا بژین و گوزەران بکەن، ئەوە هیچ گومانی تێدا نابێ، کە ئەو هۆزانە دەبنە نێچیری ئەو (فەرمانڕەوایی و دەستە و کۆمەڵانە)ی دەیانەوێ ئازاری (فەرمانڕەوایی و نەتەوە) بدەن و زیانیان پێ بگەیێنن!...

## چارەسەرکردنی باری لادێکان

دەترسم لە بابەت لام دابێ. بەڵام بیانووم ئەوەیە کە تکا لە پێشکەوتنخوازە مەردەکان بکەم و، بڵێم: کات بەبەریەوە نەماوە؛ پێویستە ڕاستکردنەوەی باری گوزەرانی لادێکانی ناوچەی ئاکرێ و هەموو ناوچەیەکی تر بخرێنە پێش هەموو ڕاستکردنەوەیەکی ترەوە. چونکە ڕاستکردنەوەی باری لادێکان بەبنچینەی هەموو ڕاستکردنەوەیەکی تر دادەنرێ، کە لەلایەن دەوڵەتەوە دەبێ بکرێ. لە دڵی دڵسۆزانی گەلەکەماندا تۆزێک ئارام نەماوە، تا لەمە زۆرتر چاوەڕوانی ڕاستکردنەوە و چاکەخوازی بن!... ڕاستکردنەوەی بار و چاکەکاری، دەبێ لە ئێستاوە دەست پێ بکرێت!... ئەگەر دەستیش پێ کرا، دەبێ لە پێش هەموو شوێنێکدا و، هەموو شتێکدا لە لادێوە دەست پێ بکرێ!...

## تاکەکانی هۆز فەرمانڕەواییەکی بەهێزی دادپەروەریان دەوێ

لەمەوپێش چەند جارێک گوتم: نەتەوەی کورد لە ئاکرێدا پڕ بەدڵ چاوەڕوانی فەرمانڕەواییەکی بەهێز و دادپەروەر و خاوەن بەزەیین، کە خەمی پێشکەوتنیان بخوات و بایەخیان پێ بدات. ئێستاکەیش وام پێ خۆشە بڵێم: تاکەکانی هۆزەکان لە کانگای دڵیانەوە دەیانەوێ لەم جووتە یاسایە - واتا لە (یاسای فەرمانڕەوایی) و (یاسای هۆزەکی)- ڕزگاریان ببێ!... ئەوانە یاسای فەرمانڕەواییەکی بەهێزی دادپەروەریان پێ خۆشترە لە یاسای هۆزەکی، کە هەر بەو دەکرێ لەم ڕزگاریان بکات. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە، کە هەموویان وەڕس بوون لەم ژیانەیان کە پڕێتی لە (هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی). دەیانەوێ ئەو ژیانەیان بگۆڕرێ و بکرێ بەژیانێکی پڕ کامەرانی و تەندروستی و سەرکەوتن و خۆشگوزەرانی، وەک هی جێگا پێشکەوتووەکانی جیهان!. ئەوانە دەیانەوێ لە ژیانی کۆمەڵایەتیاندا هەڵگەڕانەوەیەک بەرپا ببێ!... ئەم جۆرە هەڵگەڕانەوەیەش پێویستی بەلەناوبردنی سەرەک هۆزەکان و خوێنڕشتن نییە. هەر ئەوەندەی پێ دەوێ کە (دادپەروەری کۆمەڵایەتی) بکرێ بەیاسایەک و بدرێتە دەست کەسانی وەها بەکاری بهێنن، کە لێ هاتوو و کارامەبن و، خاوەنی کردەوە و ڕەوشتی بڵندبن. واتا لەو

جۆرە فەرمانبەرانەبن کە بتوانن هۆزیش و سەرەک هۆزیش وا لێ بکەن کە (یاسای هۆزەکی)یان لەبیر بچێتەوە، بێ ئەمەی هیچ لایەکیان ئازاری بگات، یاخود زیانی لێ بکەوێ.

ڕۆژگاریش ئەوەی دەرخستووە کە ئەو تاکانە جاری وا هەبووە ملیان بۆ پیاوانی ئایین کەچ کردووە، بێ ئەمەی ئەو شێخانە بەزەبری چەک و کوتەک ملیان پێ کەچ کردبن!... چونکە ئەو جۆرە شێخانە نە لەشکریان هەبووە و، نە تۆپ و تفەنگ و، نە گەلە کەشتی جەنگ. هیچ کاتێک هێزیان لەگەڵ بەکار نەهێناون و، زۆریان لێ نەکردوون، تا ملکەچییان بکەن. ئەو شێخانە هەر بەوە ملکەچییان فێرکردوون، کە کار و کردەوەیان لەگەڵیاندا باش بووە و، بەتەنگ کەڵک و چاکە و دڵخۆشی و سەربەرزییانەوە بوون و، کردەوە و ڕەوشتی بڵند و گیانی مرۆڤایەتی گەورە و گرنگیان لەگەڵدا بەکارهێناون. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە ئەم هۆزانە هەرچەندە هۆگری سەربەستی و بەرەڵلایین و، لە هەموو کۆتە و زنجیرێکیش خۆ ڕادەپسکێنن کە پەیوەندیی بەماف و سەربەستییانەوە هەبێت، هەروەها بەرەنگاریی هەموو کەسێکیش دەکەن کە ئازاری سەربەرزییان بدات و ڕێزیان لێ نەگرێت، بەڵام لە ڕاستیدا لە کەڵک و چاکەی خۆیان ئاگادارن و، تەنها مل بۆ ئەو کەسە دەدەن، کە دەتوانن پشتی پێ ببەستن بۆ پاراستنی (ماف و سەربەستی و سەربەرزی)یان. جا لەمەوەیە کە ئەوانە بەسەر ڕاستی و دڵسۆزییەوە بۆ ئەو شێخانە بوون بەپەیڕەو و پشتیوان و ملیان بۆ کەچ کردوون. تەنانەت ئەو دڵسۆزی و سەر ڕاستییەیان بۆ کوڕانی ئەو شێخانەیش نواندووە. جاری وا هەبووە چاویان لە گوناه و زۆرداری نەوە و وەچەی ئەو شێخانەیش پۆشیوە هەر لەبەر ئەوەی کە باوکیان لە ژیانی خۆیدا لەگەڵیاندا باش بووە!.

کەواتە ڕاستکردنەوەی کاروبار و چاکەکاری لەناو ئەم جۆرە هۆزانەدا ئاسانە. هیچ زیانێکیشی لێ پەیدا نابێ. هیچ سەرۆکێکیش لە میری ناورووژێنێ. چونکە نەتەوەی کورد لە ئاکرێدا، بەخوێندەوار و نەخوێندەواریانەوە، لە کانگای دڵیانەوە ئارەزووی ڕاستکردنەوەی کاروبار و چاکەکاری گشتی و پێشکەوتن دەکەن. گەلێکی لێ هاتوویشن بۆ پێشوازی کردنی هەموو پێشکەوتن و بەرزبوونەوەیەک کە بۆ گشت لا بێت. چونکە ئەوە، هەر لە زووەوە، ئاواتی هەرە گەورە و گرنگیانە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خۆیان بەکامەرانی و سەربەرزی و سەرکەوتن و خۆشگوزەرانییەوە ببینن لە ژیانیاندا.

## ئارەزوو و گیانبازی

(ئارەزوو و گیانبازی)ی ئایینی وهۆزایەتی و نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری، گەلێک جار لە سەردەمانی ڕابردوودا، هاتوونەتە ئاوەوە و خۆیان دەرخستووە. ئەمانەیش لەو کاتانەدا ڕوویان داوە و بەرپابوون کە زۆروستەم ڕوویان داوە، یاخود ئاژاوە و دووبەرەکی خراوەتە ناوچەکەوە، بەڵام فەرمانڕەواییەکانی ئەو سەردەمانە، خۆیان پێیانەوە ماندوو نەکردووە، بەشیرینی و زرنگی و شێنەیی چارەسەری هۆیەکانیان بکەن و، نەهێڵن جارێکی تر ڕووبدەنەوە. ئەنجامیش بەوە گەیشتووە ناوچەکە پڕ بووە لە کارەساتی کەتن و تاوان و خوێنڕێژی، کە زیانێکی زۆریان گەیاندووە بەنەتەوەیش و بەفەرمانڕەواییش!. بەسایەی خوداوە لە ڕۆژانی ئێستادا ئەو جۆرە ڕقەبەری و دوژمنایەتی و ئاژاوە و فیت نانەوانە نەماون یاخود ڕوویان کردۆتە کزی. لە ڕۆژانی ئاساییدا، کە شەڕوشۆڕ لەناو هۆزەکاندا، لە ئارادا

نەبن، نە ڕقـەبەری هەیە و، نە بەربەرەکـانێ و، نە نگەویسـتی. ئیـتـر ناوچەکـە وای لێ دێ، لەناو هۆزەکـاندا، کـڕین و فـرۆشتن و، ژن و ژنخوازی و، تێکەڵی پەیدابنەوە وەک جـاران. چونکە هەمـوویان وەها هەست بەخـۆیان دەکەن کە لە یەک ڕەگەز و یەک نەتەوە و یەک نیشـتمـان و یەک ئایینن. جا لەبەر ئەوە لەناو ئەم هۆزانەدا ژن و ژنخوازی و خزمـایەتی زۆر بەرچاو دەکەوێ، بام جوێ جوێیش بن. ئەم بارە لەناو شـاری ئاکـرێیـشدا، لە نـاوەند خـێزان و مـاڵـە جوێ جـوێکاندا هەروەهایە. بەڵام نەتەوەی کـورد لە ئاکـرێدا، ئێـسـتـا کە هەسـتـیـان کردووە بەزیانی هەمـوو دەمارگـیری و بەربەرەکـانێـیـەک، بۆ (ڕاسـتی و دروستی و دادپەروەری و سەربەستی) نەبێ پشـتگیری ناکەن. بۆیەکا سەرۆکەکان و خوێندەوارەکانیـان دەبینرێن، بەهەمـوو جـۆرە هۆز و ئایین و ڕێرەوییێکیـانەوە، دەسـتـیـان خـسـتـۆتە ناو دەسـتی یەکـتـری و فەرمانڕەوایی بەهەموو کوڵی دڵیانەوە خەبات دەکەن بۆ کەلک و چاکە و پێشکەوتنی ناوچەکەیان. ئەوانە ئێـسـتـاکـە خۆیان لە هەمـوو دەمـارگـیـرییـەکی نـاڕەسـەن ناپەسـەند دەپارێزن. ڕاسـتـیـیـەکـەی هەر ئەمـە بیـروباوەڕێکی ڕاست و دروسـتـە، کە دەبێ هەمـوو خـاوەن دڵ و دەروونێکی چـاک و پاک هۆگـری ببێ. وەهایشم دێتە پێش چاو، کە سـەردەمی خۆپەرسـتـەکـان و پوولپـەرسـتـەکـان و چەوسێنەرەوەکان خـەریکە بەسـەرڕبچێ، کـە لەژێر پەردەی دەمـارگـیـری ئایینی، یان نەتـەوەیی، یان هۆزەکـیـدا، خـوێنی نەتەوەی بەسەزمـانیـان دەمژی!... هەروەها سـەردەمی ئەو فەرمـانبـەرانەیش خەریکە بەسەرڕبچێ، کە دووبەرەکی و ئاژاوەیان دەنایەوە لەناو نـەتەوەکەماندا بۆ کەلکی ناپوختـە و گەنگ و ناپەسەندی خۆیان!... خـودا یاربێ نیـتـر ئەو سەردەمە ڕەشـە جارێکی تر ناگەڕێتەوە ناو نـاوچەکـەمان!... پێـویست وەهایە کە هەمـوولایەک (کـەڵکی گـشـتی) بکەن بەئامـانجی خـۆیان، نەک (کـەڵکی نـاپوخـتـەی تایبـەتی). هەروەها لەگـەڵ کاربەدەسـتـانی میـریشـیـدا دەست بخەنە دەستی یەکـتـری و، یارمـەتی یەکـتـری بدەن بۆ کەڵک و چاکەی گشتی ناوچەکەیان، ئەوەندەی پێیان دەکرێ.

## هۆزەکانی ناوچەکە

لە ناوچەی ئاکرێدا ئەم هۆزە گرنگانە نیشتەجێ بوون:

١- هۆزی زێبـاری: ئەم هۆزە لە هەردوو لادێی بیـرەکـەپرە و سـورچیـدا نیـشـتـەجێ بووە. ژمـارە سـەری بە(١١٣٠٣) کەس دادەنرێ. سەرۆکە ناسراوەکانیان ئەمانە: (مەحموود ئاغا و ئەحمەد ئاغا) کوڕانی (محەمەد ئاغا، شەوکەت ئاغـا کوڕی حەسەن ئاغـا، جەواد ئاغای عەلی ئاغا و مستەفای عـوسمـان ئاغا).

٢- هۆزی سورچی: لە هەردوو لادێی سـورچی و (عـشـائر السـبـعـە)دا نیـشـتـەجێ بووە. ژمـارە سـەری بە(٥٢٥٠) کـەس دادەنرێ، بەشێکی کـەمی هۆزەکـە بەکۆچەر دادەنرێن، کە تەنیـا لە وەرزی پاییز و زسـتـاندا لە ناوچەکەدا دەمێننەوە. سـەرۆکـە ناسـراوەکـانیـان ئەمـانەن: (شـێخ ڕەقـیب و شـێخ قـەیوم) کوڕانی شێخ محەمەد. (شێخ تۆفیق و شـێخ کەژۆ) کوڕانی (شـێخ عوبێدوڵلا). (شێخ ئەحمەد) و (شێخ سەدرەدین) کوڕانی (شێخ بەدیع).

٣- هۆزی هەرکی: لە لادێکانی سورچی و(عـشـائر السـبـعـە)دا نیشـتـەجێ دەبێ. چونکە کۆچەرە هەر لە

وەرزی پاییز و زستاندا لە ناوچەکەدا دەبن. ژمارە سەری بە(٣٤٤٤) کەس دادەنرێ. سەرۆکە ناسراوەکانی ئەمانەن: (سەیدی خانی حاجی ئاغا و محێدین جیهانگیر ئاغا).

٤- هۆزی گێژ: لە لادێی (عشائر السبعە)دا دادەنیشن. ژمارە سەری دەگاتە (١٧٠٠) کەس. سەرۆکە ناودارەکانی ئەمانەن: (ئەحمەد ئاغا و مشیر ئاغا) کوڕانی (ئیسماعیل ئاغای ڕووڤی).

٥- هۆزی ڕەژی کەری: لە لادێی (عشائر السبعە)دا دادەنیشن. ژمارە سەری بە(٣٥٠٠) کەس دادەنرێ، لە سەرۆکە ناسراوەکانی: (ئەمین ئەحمەد ئاغا)ی دارەتوو و، (قادر ئاغا)ی زەنگەنانن.

پێویستە ئەوەیش بگوترێ، کە ئەم هۆزانە لە ناوچەکانی تریشدا، دەستە و تیرە و خزم و کەسوکاریان هەیە، ئەگەر شتێکیان لێ بقەومێت یاریدەی یەکتری دەدەن.

### کەمینەتییە هۆزەکان

بێجگە لەمانە، گەلێک پۆلە هۆزی بچووکی تریش هەن، کە لە هۆزە جۆر لە جۆرەکان کەوتوونەتەوە، وەک هۆزەکانی (بۆت، شارک، خدری، گومار، شێخ بزەینی، زەنگەنە، مووسەیی و هەمووز) کە لە لادێی (عشائر السبعە)دا نیشتەجێ بوون. یان وەک هۆزی (جافەتی) کە لە لادێی سورچیدا نیشتەجێ بوون. هەروەها وەک (کلدانی، تیاری و ئاشووری) کە لە لادێکانی سورچی و بیرەکەپرەدا دانیشتوون. ئەم جۆرە پۆلە هۆزانە نەریتیان وەهایە کە لەگەڵ هۆزە گەورەکانی دەوروپشتیاندا تێکەڵ دەبن. کۆمەڵەی سەرژمێری ئەمانەیش خۆی دەدات لە (٥٠٣٠) کەس. لەم کۆمەڵە ژمارە سەری مەسیحییەکان دەگاتە (١٥٠٠) کەس. هەرچی دانیشتوانی شاری (ئاکرێ)یشن بەبنەچە دەچنەوە سەر ئەم هۆزانەی کە لە ناوچەکەدان، یاخود لە جێگایانی ترەوە هاتوون. ئەوەندە هەیە شارستانێتی و تێکەڵبوون و ژن و ژنخوازییان لەناو یەکتردا دەماری هۆزپەرستی کزکردوون. ناسراوەکانی شاری ئاکرێیش ئەمانەن: (هبەتوڵڵای موفتی، مستەفای مەلا جبرائیل، وەهاب ئاغای یاسین ئاغا، شێخ ئیبراهیم کوڕی شێخ باقر و خالید حەکیم).

## ڕەوشت و خوو و نەریت لە ناوچەی ئاکرێدا

### خواردن و خواردنەوە

دانیشتوانی ناوچەکە لە چێشتە چەورەکانیاندا ئەمانە بەکاردەهێنن: گەنم و جۆ و برنج و نیسک و نۆک و ڕۆن و سەوزە و ئەو گۆشتانەی کە ئایین پەسەندی دەکات وەکو گۆشتی مەڕ و بزن و گا و مانگا و ماسی و کەو و کۆتر و پۆڕ و مریشک و کەڵەشێر و کەروێشک، لەگەڵ بەرهەمی گیانلەبەراندا وەک شیر و ماست و پەنیر و فرۆ و کەرە و هێلکە، هەروەها میوە و بەری دار و، بەرهەمی هەندێک جروجانەوەر، وەک گەزۆ و هەنگوین. مەسیحییەکان بێجگە لەوانە گۆشتی بەرازیش دەخۆن. ئەوەندە هەیە هەرچی گۆشتە ناوبەناو دەخورێ. چینی هەژاران، ئەوەندەی نەماوە بڵێم، خۆرشتەکانیان بریتییە لە نان و چاو و هەندێک میوە و سەوزە و بەرهەمی گیانلەبەران. بەڵام هەرچەند دەرامەتیان زۆرتری لێ بێ، ئەوانیش زۆرتر بایەخ بەخواردەمەنی خۆیان دەدەن چ لە ڕووی زۆرییەوە، چ لە ڕووی جۆرییەوە، چ لە ڕووی شێوەی

دروستکردنیەوە. بەلام لە شاری ئاکرێدا گۆشت زۆر دەخۆن. لە چێشتەکانیشیاندا هونەرمەندی زۆر دەنوێنن. لەسەر خوانەکانیان شیرینی و ترشیات و ئاو و ماست و خۆشاو و بابەتی هەویرکارییش دەبینیت لەگەڵ سەوزە و میوەدا. بەلام هەژارەکانیان هەروەک هەژارەکانی لادێکان دەخۆن. چینی دەوڵەمەندانی ئاکرێ و سەرەک هۆزە دەوڵەمەندەکانیش وەک یەک دەخۆن. لێرەدا هەر باسی خواردن و خواردنەوەی دانیشتوانی ناوچەکەم کرد.

## ڕێزگرتن لە میوان

بەلام لەگەڵ میواندا. بەگەورە و بچووکیان و دەوڵەمەند و هەژاریانەوە، ڕەوشتیان وەک یەک: ڕێز لە میوانەکانیان بەجۆرێک دەگرن و، خۆشەویستی بەجۆرێک بەرامبەریان پێشان دەدەن، هەرچەندێکیان لە دەست بێت خواردن و خواردنەوەی ناوازە و نایاب و خۆشیان پێشکەش دەکەن. ئەم ئەرکەیش کە لە مەیدانی نێوان ئەوازیدا دەیخەنە ئەستۆی خۆیان زۆر لەسەریان دەوەستێ. خۆشە بڵێم: ئەم ڕەوشتە مەردانەیە سەری ناوچەی ئاکرێی بەرزکردۆتەوە و، مافیشیان هەیە پێوەی بنازن.

تۆیش وات دێتە پێش چاو کە (میوانپەروەری) لەسەروو هەموو دەستوورێکی نەتەوەییەوە، لە ناوچەکەدا، ڕاگیراوە، بەهەموو دڵسۆزییەکەوە، ڕێز و خۆشەویستی بەرامبەری دەنوێنرێ و، بەهەموو وردبینی و دووربینییەکەوە بەکاردەهێنرێ. داخەکەم وەهام دێتە پێش چاو کە سامانی نەتەوەکە، ئەوەندە کەمە، یارمەتی گەشەکردنی ئەم کردەوە و ڕەوشتە بڵندە نادات. چونکە تاک و تووکێک نەبێت، کەس لە ناوچەی ئاکرێدا بەرژد و دەست قووچاو دانانرێ. تۆیش بەتەنیشت ئەو هەموو خواردەمەنییانەوە کە لە ماڵەکانیاندا دەخرێنە بەردەمت بیانخۆیت، بەئاشکرا هەژاری بەئەندامانی خێزانەکەوە وەها دەبینیت، کە هەروەک ئەژدیهایەک بێت و قووتیان بدات وایە. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە، کە لادێییەکانی ئەم ناوچەیە وەها ڕاهاتوون: لە دەمی خۆیان دەگێڕنەوە، بەدەستیاو پارە لەم و لەو وەردەگرن، بەهەژاری و برسێتی و شڕ و پڕییەوە خۆیان ڕادەهێنن، بەلام هەموو شتێک لە پێناوی میوانداریدا بەخت دەکەن و، ناهێڵن کەس توانج و پلار لە پیاوەتی و مەردایەتییان بگرێت. چونکە (دەستووری میوانداری) بەلایانەوە بەرز و پیرۆزە، نایانەوێ بیشکێنن. بەڕاستی ئەم کردەوە جوانەیان، مرۆڤایەتییەکی ناوازەی تێدا دەبینرێ، لە ژیانی ناوچەکەیشدا وەک گەوهەرێکی شەوچرا دەبریسکێتەوە. پڕە لە شیرینی و دەست ڕەنگینی و پیاوەتی و سەربەرزی. بۆ نەتەوەی کورد لە ناوچەی ئاکرێدا، بووەتە جێگای شانازی و، نیشانەی نەژادی و جوانی و زیندەگانی. بەلام داخەکەم دانیشتوانی ناوچەکەی وا لێ کردووە بکەنە ئەوپەڕی هەژاری و هەناسە ساردی. جا هەتا ناوچەی ئاکرێ دەگاتە. ئەو ڕۆژەی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و زرنگ کاری پێش بکەوێ و، خۆشگوزەرانی دەست بکەوێ و، زانست و هونەر و پیشەسازییش دانیشتوانی ناوچەکە بگەیێنن بەژیانێکی پڕ خۆشی و کامەرانی، پێویستە لەسەر خەڵکە بەڕێزەکەی ناوچەی ئاکرێ ئەم نەریتە مرۆڤایەتییە پیرۆزەی خۆیان بپارێزن و، ئەنجامیشی هەرچۆنێک بێت، بەئارام و ئازایەتی و خۆڕاگرتنەوە، پێشوازی بکەن. لەوەیش دڵنیابن کە هەر ڕۆژێک دێت خودا دەروویان لێ بکاتەوە.

## جلوبەرگی ئافرەت

جلوبەرگی لادێییەکان و هۆزەکانی ناوچەی ئاکرێ، ساکارتر و کەم ئەرکترن لە هی دانیشتوانی شاری ئاکرێ، بەتایبەتی دەوڵەمەندەکانیان. ئافرەتی هۆزەکان جلوبەرگیان بریتییە لە: کراس، دەرپێ، کۆڵوانە، کلاو و پۆشی، پشتێنێکی ساکار، کەوشی خۆماڵی. هەندێ جاریش چەند خشڵێک بەخۆیاندا دەکەن وەک: کەمەرە و هەیاسە و گوارەی لە زیو دروست کراو. پارەی زیویش بەکلاوەکانیانەوە دەدروون. لووتەوانە یاخود خەزێمیش بەلووتیاندا هەڵدەواسن، گوارەیش دەکەنە گوێیان. هی وایشیان تێدایە کە چەناگەیان دەکوتن و، بازن دەکەنە دەستیان ملوانکەی کارەبا یاخود شووشەی ڕەنگاوڕەنگ دەکەنە ملیان.

کراس و شەرواڵی ئافرەتە سورچییەکان زۆر گەورە و فراونن، لە سیپاڵی لۆکە دروست دەکرێن، کە لە ڕەنگدا بەشینی خومی دادەنرێن. ئەمانە لە گەورە و بچووکیدا لە ئەندازەیان ترازاندووە، بەکاری ئابووری نایەن. کەچی سیپاڵی جلوبەرگی ئافرەتی هۆزەکانی تر وەک (زێباری) و (هەرکی) و (عشائر السبعة)، ڕەنگاوڕەنگ و چاکترن. لە ڕووی ئابووریشەوە باشترن. زۆربەی ئافرەتەکانی ئاکرێ بەم جۆرەی دوایی دەپۆشن. ئەوەندە هەیە ئافرەتە دەوڵەمەندەکانی شاری ئاکرێ و ناو هۆزە کۆچەرەکان، زۆرتر بایەخ دەدەن بەجلوبەرگی خۆیان، چ لە بابەت چۆنێتییەوە، چ لە بابەت چەندێتییەوە، چ لە بابەت چاکی و نرخ گرانییەوە!. ئەم جۆرە ئافرەتانە لە ژیانی سادە و ساکار زۆر دوور دەکەونەوە. باری ئابووری مێردەکانیشیان زۆر گران دەکەن، کە لە ئەندازە تێدەپەڕێ. چونکە بێجگە لەو جلوبەرگانەی ناومان بردن، ئەمانەیشیان لەگەڵدا دەپۆشن: کەوا، کلۆجە، سوخمە، بالاپۆش، گۆرەوی، کە ئەمانە هەموویان لە ئاوریشم یاخود سورمی نایاب و نرخ گران دروست دەکرێن، لەگەڵ گەلێک خشڵی گران و بەنرخ کە لە زێڕ دروست دەکرێن. جا ئەم بارە ناهەمواره لە ڕووی ئابوورییەوە هەر بەئەندامانی خێزانی ئەو ئافرەتە زیا نابەخشێ، هەروەها کاری خراپ لە تەندروستی و جوانی و ژیانی خێزانی و کۆمەڵایەتی ئافرەتەکە خۆیشی دەکات. چونکە لە ڕاستیدا ڕوویەکە لە ڕووەکانی شارستانێتی درۆ!. شاری ئاکرێش لە شارەکانی دراوسێیەوە وەریگرتووە لەبەرئەوە لاوە هۆشیارەکانی ئاکرێش دەستیان کردووە بەبەرەنگاری کردنی ئەم جۆرە جلوبەرگ و خشڵە زیان بەخشانە، کە لە ئەندازە بەدەر ئابووریی خێزان تەنگەتاو دەکەن. وا خەریکی ئەوەن یان ڕاستە و ڕاست بیگۆڕن و بیکەن بەجلوبەرگی شێوەی ڕۆژئاوایی و جیهانی، یاخود بیخەنە شێوەیەکی واوە کە بەکاری فرمان کردن بێت و، ئەمەندەیش پارەی تێ نەچێ کە زیان بەئابووری خێزانی بگەیێنێت. بێجگە لە چینی دەوڵەمەند و دەسەڵاتداران هەموو ئافرەتانی ناوچەی ئاکرێ سەربەستن، پەچە و بالاپۆش ناپۆشن. لە ڕاستیدا ناوچەی ئاکرێ پێویستە بەئافرەتەکانیەوە شانازی بکات. چونکە لە پیشەسازیی خۆماڵیدا بوونەتە کۆڵەکەی نەتەوەی کورد لە ئاکرێدا. ئابووری خێزانیش هەر بەهۆی ئەوانەوە پارێزراوە.

## جلوبەرگی پیاوان

هەرچی پیاوانن جلوبەرگیان بریتییە لەمانە: شەل و شەپک (پەشم و بەرگووز)، سوخمە، پشتێنی چیت، کڵاو و جامانە یاخود کڵاو و مشکی، گۆرەوی و پێڵاوی خۆماڵی واتا کەوش و کەڵاش. هەر ئەوەندەی ماوە کە بڵێم ئەم جلوبەرگانە لەشێوە و ڕێکخستن و ڕازاندنەوەدا زۆر لە هی ڕۆژئاوایی دەکات. لە شێوەی گشتییاندا بەجوان دادەنرێن. لە نەخش و نیگار و ڕەنگدا، ڕەنگاوڕەنگی تێدایە. لە وەرزی زستاندا پەستەکیش لەبەر دەکەن. ئەمیش جۆرە چاکەتێکە، کورتە و باڵیشی پێوە نییە. لە خوری پەستراو دروست دەکرێ. زۆربەی ئەم جلوبەرگانە ئاکرێییەکان خۆیان دروستی دەکەن. بەڵام هۆزەکانی لادێی (عشائر السبعە) و هەندێک لە دەوڵەمەندانی هۆزەکانی تر لەگەڵ دانیشوانی شاری ئاکرێ، لەگەڵ پەلاسە نیشتمانییەکانی خۆیاندا پەلاسی بێگانەیش تێکەڵ دەکەن. هەروەها پێڵاوی شێوەی بێگانە و هەندێک نیشتمانییەکانیاندا بەکاریان دەهێنن. پیاوان و ژنانیش بەکراسەکانیانەوە فەقیانەیان هەیە، جلوبەرگەکانیانی پێ دەبەستن لەسەر مەچەکیان. لە ناوەند کڵاو و جامانەکانیاندا کەمێک جیاوازی هەیە چ لە ڕووی ڕەنگیانەوە، چ لە ڕووی شێوەی و بەستنیانەوە. هەروەها لە بابەت شەڕواڵەکانیشیانەوە ئەو جیاوازییانە دەبینرێن لە ناوەند هۆزەکانی زێباری و هەرکی و سورچی و (عشائر السبعە)دا. بەڵام لە هەموو بارێکیاندا، ئەو جلوبەرگانە لەگەڵ کەشەکانیاندا و دەوروبەریاندا و باری دەروونییاندا سازاون. ئەوان چەکی کوشندەیش وەک خەنجەر و دەمانچە و تفەنگ بەپێویستی تەواوکردنی جلوبەرگەکانیان دادەنێن هونەرکاریشیان تێدا دەنوێنن چ لە جۆرەکانیدا و چ لە بەرگەکانیاندا و چ لە شێوەی هەڵگرتنیاندا.

## ڕاستی پەرستی جلوبەرگی کوردی

کورد، چ ئافرەتی و چ پیاوی، هەرچەند دەستیان بڕوات و بتوانن بکرن، ئەوەندە ڕووەو خۆڕازاندنەوە و جوانی و هونەرکاری، یاخود وردەکاری دەڕۆن لە جلوبەرگ و پۆشینیاندا. بەڵام بەشێوەیەکی تێکڕایی، جلوبەرگەکانیان جوانن، ڕازاوەن، دڵ کێش دەکەن، چونکە دڵتەڕی و کەلک و فەڕیان پێوە دیارە. ئەوەندەی نەماوە بڵێم لەگەڵ ئەندامانی لەشدا سازاون و چەسپاون. ئەو جلوبەرگانە، بەپێی پێویستی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییان هاتوونەتە کایەوە، ئەوانەیش بەشی خۆیان ڕاستی پەرستییەکی تایبەتی خۆیان هەیە. چونکە لە بنەچەدا، پێویستی ژیان دایهێناون، بەپێی گۆڕانی ژیانیش دەگۆڕێن. گەورەترین بەڵگەیش بۆ ئەم قسەیە، ئەوەیە کە گەلێک لە ڕۆشنبیرە لاوەکان دەبینین چ فەرمانبەرین، چ کەسانی تر، جلوبەرگی ڕۆژئاواییانە لەبەردەکەن، بەپێی باوی نوێ. تەنانەت هی وایشیان تێدایە، هەڵگەڕاوەتەوە لە ڕیش و سمێڵ، دەیانتاشێ، هەر لە تۆڵەی ئەوەدا، کە گەلێک ڕیش و سمێڵیان دەدی، تا ماوەیەکی نزیکیش لەمەوپێش ناپاکی گشتییان لەژێر مووەکانیاندا دەشاردەوە!... هی وایشیان تێدایە لە دژی کڵاو و جامانە شۆڕشی هەڵگیرساندووە، بەسەری ڕووتەوە دەگەڕێ، یاخود شەپقە لەسەر دەکات بۆ ئەمەی لە سەرما و گەرما سەری خۆی بپارێزێ و چاوی خۆیشی لە تیشکی ڕۆژ دووربخاتەوە. ئەوانە لە ڕاستیدا باکیان نییە لە کەس، لە توانج و پلاری کۆنەپەرستەکانیش ناترسن.

## جووڵەی جلوبەرگ گۆڕین

دەربارەی جلوبەرگی پیاو و ژن، لاوە خوێندەوارەکانی ئاکریێ، دەیانەوێ بگۆڕێ و، هەوڵیش بۆ ئەو گۆڕینە دەدەن. وایان پێ خۆشە جلوبەرگی ڕۆژئاوایی لەبەر بکەن کە لەناو هەموو جیهانی پێشکەوتوودا بڵاوبۆتەوە. لە ڕاستیدا ئەوانە باش بۆی چوون. چونکە وەک لێکیان داوەتەوە، جلوبەرگی ئەورووپایی، لەم ڕۆژگارەی ئێستایەدا، باشتر دەگونجێ لەگەڵ باری ئابووری و تەندروستی و کۆمەڵایەتییاندا. ڕاستییت دەوێ جلوبەرگی ئەورووپایی، باشتر بۆ کار و فەرمان و چست و چالاکی و گورج و گۆڵی و تێکۆشان و پێشکەوتن دەست دەدەن، بەڵام بەمەرجێ هەندێک لەو پارچانەی فرێ بدرێن کە زیان بەتەندروستی دەگەیێنێ، یاخود پەکی جووڵانەوە دەخەن، وەک یەخەی داخراو و، (بۆیباغ) و، (ئاسقی) و، گۆرەوی و، (پالتۆ) و، (پانتۆڵ)ە پان و پۆڕ و درێژەکانا... ئا ئەمەیە ڕازی ئەوەی لاوە خوێندەوارەکانی ئاکرێ ئارەزووی پۆشینی پۆشاکی ئەورووپایی، یاخود جیهانی دەکەن. چونکە ئەم پۆشاکانە بەکاری ئەوەیان دێت، کە لە شێوەیەکی ڕاست و دروست و گورج و گۆڵ و چست و چالاکیدا ڕاژەی گەورە گەورە پێشکەشی نەتەوە و نیشتمانەکەیان بکەن. منیش لەمەدا پشتگیرییان دەکەم. ئەوەندە هەیە بەپێویستی دەزانم هەریەکەیان دەستێک جلوبەرگی کوردانەی خۆمان لای خۆی بپارێزێ، بۆ ئەمەی لە ڕۆژانی جەژنی نەتەوەیی و ئاهەنگاندا[1] وەک یادگارێکی ناوازە لەبەریان بکات. چونکە پاراستنی کەلەپووری نەتەوەیی بەکارێکی بەرز و پیرۆز دادەنرێ، کە شایستەی ئەوەیە لەوان بوەشێتەوە.

## خانووبەرە

لە نیشتەجێی لادێی (عشائر السبعە) و بەشی باشووری لادێی سورچیدا هۆزەکان لە خانووی وادا دادەنیشن کە لە خشتی کاڵ و قوڕ دروست کراون. سەربانی بەشێکیشیان کەوانەیی دروست کراون تا باران کاریان تێ نەکات[2].

بەشەکانی تری ناوچەکە لەو خانووانەدا دادەنیشن کە لە بەرد و گەچ یاخود لە بەرد و کسڵ دروست کراون. هەرچی بەشی کۆچەری هۆزەکانی هەرکی و سورچین، لە هەموو وەرزەکاندا لەناو ڕەشماڵدا دەژین. خانووەکان هەرچەندە زۆربەیان لەسەر شێوەی کۆن دروست کراون و، ڕووناکی تەواویان نایێتە ناو، بەڵام دەرگا و پەنجەرە و کلاو ڕۆژنەیان تێدایە. کەچی لە هەندێکیشیاندا هونەرکاری بەکارهێنراوە لە شێوەی دروست کردن و، ڕەنگ کردن و، تەڕاودان و، ڕێکخستندا. ئەوەندەی نەماوە بڵێم خانووەکان وەک خانووەکانی ڕۆژئاوایی وان، چونکە نە حەوشیان هەیە، نە دیواری دەرەوە کە ڕۆژهەڵاتییەکان بەکاریان دەهێنن. بەجۆرێکی تێکرایی خانووەکانیان لە شێوەدا سادە و ساکارن، لە دیمەندا جوانن، لە دوورەوە بەسامن. زۆربەیان لە جێگایانی وادا دروست کراون کە بەرزن و دەڕوانن بەسەر چاوئەندازە جوانەکانی سروشتدا. ڕوویشیان لە ڕۆژە و پشتیشیان کردۆتە ڕەشەبا و گێژەلووکە. بەڵام زۆربەیان بۆ بابەتی خۆشتێ

---

(١) ڕاستتر: ئاهەنگەکاندا.

(٢) ڕاستتر: تا باراناویان پێوە نەوەستێ.

و خۆ پاککردنەوە ژووریان تێدا دروست نەکراوە. چونکە لە شاری ئاکرێ خۆی بەولاوە، گوندەکان پرۆژەی ئاویان بۆ دانەمەزرێنراوە، تا بتوانن ئەو جۆرە ژوورە تەندروستیانە لە خانووەکانیاندا دروست بکەن. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە ئەم شوێنە بەردەلانانە، کە زۆر سەختن بۆ هەڵکەندن، بەپارەیەکی زۆر نەبێ ناتوانرێ بیر و، کۆتاو و، جۆگایان تێدا هەڵ بکەندرێ، کە ئەوەیش لە وزەی زۆربەی لادێییەکاندا نییە بێجگە لە هەژارەکانیان.

## خانووی دەوڵەمەندەکان

پێویست بەگوتن ناکات کە ئاکرەییەکان، بەتایبەتی دەوڵەمەندەکانیان، هەروەها ئاغا و شێخە دەوڵەمەندەکانی ناو گوندەکان، چاکترین خانووی جوانیان لە ناوچەکەدا هەیە. لە زۆربەیاندا باخچەی رازاوە و، ئاوی سازگار و باخی بەردار هەن. تەنانەت کەسانی وەهایان تێدایە ئەمەندە دڵتەڕە و، گرفتاری جوانی سروشتە، لە خاکانی دوورەوە شەتڵ و قەڵەمی گوڵ و دار و درەختی ناوازە و نایابی هێناوەتە خانووەکەی خۆی و رووانداوونی و، بەوانە باخ و باخچەکانی خۆی وەها رازاندۆتەوە، کە هەر لە دوورەوە دەیبینیت دەڵێی بەهەشتە و خۆشی و سرەوت و کامەرانی دەخاتە دڵتەوە.

هی وایشیان تێدایە خانووەکەی خۆی لەسەر باوی نوێ نەبێ دروستی ناکات. تەنانەت هەندێکیان لە زووەوە دەستیان پێ کردووە، چەند خانوویەکی جوان و ناوازە و بەکەڵکیان دروست کردووە، چاوی پیاو دەگەشێننەوە. هەندێکی تریشیان خەریکی خۆئامادەکردنن بۆ دروستکردنی جوانترین خانوو و، رازاوەترین سەیرانگا و باخ و باخچەی ناوازە و نایاب.

## جووڵەی ئاوەدانکردنەوە

ئەوەی دڵ خۆش دەکات و، دەبێتە نیشانە بۆ ئەوەی کە نەتەوەی کورد لە ناوچەی ئاکرێدا تینووی پێشکەوتن و سەربەرزییە و، هەموو دەمێکیش بۆیان لە خەباتدایە، دوو کەس لە سەرۆکەکانی هۆزی هەرکی، یەکێکیشیان ئۆتۆمبیلێکی ناوازەیشی بۆ خۆی کڕیوە. هەردووکیشیان دەستیان کردووە بەکڕینی شایستەترین و جوانترین کەلوپەلی ناو ماڵ کە خانووەکانیانی پێ برازێننەوە. هەروەها نیازیشیان وەهایە کە هۆزەکەی خۆیان بهێننە سەر رێ، واز لە ژیانی کۆچەریی بهێنێ و، بکەوێتە ناو ژیانی ئاسایش و ئارام و دامەزراوییەوە و، هۆگری کشتوکاڵ و پیشەسازی بێت و بەئامێری میکانیکی تازەوە خەریکیان بێت. لە زەوییەکانی ئەو (٢٦) گوندەدا کە فەرمانڕەوایی، لە ساڵی (١٩٣٨)ەوە، بەرەو رووی کردوونەتەوە خانوو بۆ خۆی دروست بکات و تێیدا بژی و نانی خۆیشی لەو شێوە جوانەدا بەرهەم بهێنێ. جا ئەگەر هۆزی هەرکی، کە ژمارە سەریان بەپێی سەرژمارەی دوامین جار گەیشتۆتە (٣٤٤٤) کەس، ئەمەی بۆ چووە سەر، بێ گومان گەشەکردنێکی گەورە و گرنگ و زۆر لە ژیانیدا پەیدا دەبێ، کە لەوانەیە کەلکێکی زۆر بەخۆی و بەدانیشتوانی ناوچەکە بگەیێنێ.

ئەمە لەوێ و، لەسەرێکی تریشەوە، دانیشتوانی شاری ئاکرێیش زۆری نەماوە گۆڕان و گەشەکردنێکی زۆریان دەست بکەوێ. هەرچەندە ئەم گۆڕان و گەشەکردنە لە هی هۆزی هەرکی لە شێوەدا جیاوازە، بەڵام

لە کاکڵی ئەنجامدا لەیەک دەکەن. ئەمانیش بۆ خۆیان بڕیاریان داوە کە خانوو بەرەو دەسگا و دووکانی گشتی لەناو باخەکانیاندا دروست بکەن و بیدەن بەکرێ بەوانەی بەهاوین دینە ئاکرێ بۆ پشوودان و حەسانەوە و خۆش ڕابواردنی بێ گەرد. نیازیان وەهایە ئەو خانووانە لە تەنیشت خانووەکانی خۆیانەوە دروست بکەن کە لە هاویندا دێنە ناویان. هەر لە ئێستایشەوە دەستیان بەپرۆژەکەیان کردووە. شتی وایشیان دروست کردووە و بەرهەم هێناوە، دڵی هەموانیان پێ خۆش کردووە. جا ئەگەر ئەمەیش سەری گرت، بێ گومان لە ژیانی ناوچەکەدا شۆڕشێک بەرپا دەکات. واتا هەژارییەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە دەوڵەمەندی. هەناسە ساردییەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە کامەرانی. نەخوێندەوارییەکەی دەبێتە ڕۆشنبیری. نەخۆشییەکەیشی دەبێتە تەندروستی. تەنانەت لەوانەیە کار بکاتە سەر ژیانی عێراقییەکانی تر. چونکە سامانێکی زۆریان بۆ دەگێڕێتەوە، کە هەموو ساڵێک لەسەر دەستی ئەوانەدا کە دەچوون بۆ هاوینەهەوارەکانی بێگانە، بەفیڕۆ دەچووا...

## ئاهەنگەکان

ئاهەنگی لەدایکبوون: لە شەوی شەشەمی لەدایکبووندا ئاهەنگ دەگێڕن. نان و چێشت پێشکەشی خزم و کەسوکار و دۆست و یار دەکەن. لە ناوەند بەزم‌وڕەزمدا ڕادەبوێرن هەتا بەیانی. بەڵام ئەو ڕۆژەی کوڕەکە یاخود کچەکە لە دایک دەبێ پارە و خۆرشت بەسەر هەژاراندا دەبەشنەوە. ئەوەی شایانی باسە، ئەو خزم و کەسوکار و دۆستانەیش، هەتا ماوەی پانزە ڕۆژ نانی ئێوارە دەنێرن بۆ ئەو ماڵەی منداڵی بووە. ئەوەیش هەر لەبەر ئەوەی کە دایکەکە بیپەرژێتە سەر منداڵەکەی و خەمی خواردن و شتن و پاراستن و سرەوت و ئارامی بخوات. هەروەها بۆ ئەوەی بەئەرکی ماڵەکەوە گیرنەخوات تا هێز و هەرەتی دێنەوە جێی خۆیان. ئەم شتانەی گوتمان تایبەتییە بۆ منداڵە نێرینەکان. چونکە بەبۆنەی لەدایکبوونی کچەوە ئاهەنگ ناگێڕن! ئەمەیش بابەتێکی وەهایە کە سەرنج ڕادەکێشێ. جا لەبەر ئەوەی هیچ جیاوازییەک نییە لە ناوەند کوڕ و کچدا لە ڕووی گرنگییانەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە لاوەکانی ناوچەی ئاکرێ، بەتایبەتی خوێندەوارەکانیاندا هیوا دەکرێ کە خەریکی ئەوەبن ئەم جۆرە نەریتە ناڕەوایە هەڵبگرن و، بۆ منداڵانی کچانیش کە لەدایک دەبن. وەک کوڕان ئاهەنگیان بۆ بگێڕن، تا کۆمەڵایەتییەکەمان دووبەرەکی و ناکۆکی تێ نەکەوێ.

ئاهەنگی چووک بڕین: لە ڕۆژدا، بەبۆنەی چووک بڕینی منداڵانەوە، ئاهەنگ دەگێڕن. دەست دەکەن بەبەزم و زوڕنا و شمشاڵ لێ دەدەن. خواردەمەنیش بەسەر خزمان و دۆستان و هەژاراندا دابەش دەکەن. جاری وایش هەیە دیاری بۆ منداڵە چووک بڕاوەکە دەنێرن.

ئاهەنگی ژن هێنان: هەروەکو لەمەوپێش پێشانماندا بەبۆنەی ژن هێنانیشەوە ئاهەنگ دەگێڕن. ئاهەنگەکە سێ ڕۆژ درێژە دەکێشێ. لەم جۆرە ئاهەنگەدا بەتفەنگ ئاگردان و گرەوکردن لەسەر غارکردنیش بەئەسپ، خۆشی بەدڵی خۆیان دەگەیێنن. هەروەها دیاری بۆ خزم و دۆستانی (زاوا) دەنێرن. هەروەها لەوانەیشەوە کە دیارییان بۆ نێرراوە، بۆ (بووکێ) دیاری دەنێرن. جاری وا هەیە (ژن بەژن) لە ژن هێنانەکاندا دەکرێ. هەردوو کچەکە لەیەک کاتدا مارە دەکرێن!. بۆ وێنە ئەم خوشکی خۆی لەم مارە

دەکات!... جا هەر لەو ڕۆژەدا کە ئاهەنگ بۆ لایەکیان دەکرێ، ئاهەنگ بۆ ئەم لایش دەکرێ.

ئەمەیش سەیرەکە بیگێڕمەوە: دانیشتووانی شاری ئاکرێ نەریتیان وەهایە کە (زاوا) فرێ بدەنە ناو ئەستێرکی کانییەکەوە، کە پێی دەڵێن: «کانیا بووک و زاڤا». دوای ئەوە خۆیشیان دەست دەکەن بەخۆشتن لەگەڵ ئەودا. گوایە ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە زاواکە جلوبەرگەکانی خۆی داکەند، بەدیاری پێشکەشی هەژارێکی بکات و، خۆیشی جلوبەرگی تازە لەبەر بکات. پێویستە ئەوەیش بڵێم کە ئەم جۆرە بەزمە دەبێ لەو ڕۆژەدا بکرێ، کە شەوی (زاوا و بووکی) بەدوایدا دێت. بەڵام ئاهەنگێکی شەو تا بەیانی پێش ڕۆژی خۆشتنەکە دەکەوێ دوو ڕۆژێتریش پاش ڕۆژی خۆشتنەکە ئاهەنگەکە درێژە پێ دەدرێت. ئەرکی ئاهەنگی شەوی یەکەم لەسەر (زاوا) دەبێ. بەڵام ئەرکی هەرسێ ڕۆژی ئاهەنگەکان لەسەر خێزانی (بووکێ) دەبێ. ئەمەیش لەبەر ئەوە کە (بووکی تازە) بەکار و فەرمانی تازەکەیەوە خەریک نەبێت، هەتا لەو سێ ڕۆژەدا بەتەواوەتی سرەوتی پێ دەگات و دەحەسێتەوە و، خۆی بۆ ئەرکی ماڵی تازەی ئامادە دەکات. شەوی بووک و زاوایش، یاخود شەوی پەردە، دەبێ بەر شەوی هەینی بکەوێت، هەر لەبەر ئەوەی کە بەشەوێکی پیرۆز دادەنرێت.

ئاهەنگی جەژن: بەبۆنەی جەژنە ئایینییەکانی ئیسلامەوە، وەک (جەژنی مانگی ڕۆژوو) و (جەژنی کوشتی)، هەروەها بەبۆنەی جەژنی نەتەوەیی کوردەوە، (نەورۆز)، کە لە ٢١ی مانگی ئاداری هەموو ساڵێکدا دەست پێ دەکات، ئاهەنگ دەگێڕن. بەهار لەو ڕۆژەدا شەنگ و شۆخە، ئەوەندەی تر ئاهەنگەکە پڕ دەکات لە خۆشی و شادمانی بۆ هەمووان، کە لەو ڕۆژەدا دەچنە سەیران. هەروەها بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەریشەوە، لەگەڵ شەوی چوونی پێغەمبەردا بۆ ئاسمان و، شەوی بەرات و، مانگی ڕۆژوویشدا ئاهەنگ دەگێڕن.

ڕاستی پەرستی ئاهەنگەکان: لە ناوەند ئەم ئاهەنگانەدا کە دەکرێن، پیاوانی چاکەخواز و ڕەوشت بڵند دەکەونە ناوەوە و خەبات دەکەن، برایەتی و، خزمایەتی و، دۆستایەتی و، دراوسێیەتی لە ناوەند کەساندا تازە بکەنەوە و، بنج بەست بکەن و، کەسانی دڵ شکاوانیش لەگەڵ یەکتر ئاشت بکەنەوە و، ناخۆشیو ناکۆکی و دوژمنایەتی لە ئارادا نەهێڵن. بەتەنیشت ئەمانەیشەوە دەستگیرۆیی هەژار و داماو و لێ قەوماوی دانیشتوانی ناوچەکە بکەن. کەواتە ئەم ئاهەنگانە و ئەم بەزموڕەزمانە، لە ناوچەی ئاکرێدا لەگەڵ گیانی مرۆڤپەروەریدا و چاکەخوازیدا بەتەنیشت یەکترەوە دەڕۆن بەڕێوە. چونکە ئەنجامی ئەو کردەوە پیرۆز و بەرزانە، ئەمەندە گرنگ و بەنرخن، ئەوەیان لێ دەوەشێتەوە، کە تەندروستی پڕ بکەن لە هێز و هەڕەت و، کامەرانی بەرهەم بهێنن بۆ هەمووان و، خۆشەویستیشیان تازە بکەنەوە. بێجگە لەوانە هەژاریش تا ئەندازەیەکی گەورە لەناو ببەن و، ڕقەبەری و پشم و قین و بەربەرەکانێ و دوژمنایەتیش لەناودا نەهێڵن. کەواتە بام تۆماری بکەین لە دڵماندا، ئەم ئاهەنگ و زەماوەندانە و، ئەم بەزم و ڕەزمانە، تا چ ئەندازەیەکی گەورە، بەرز و پیرۆز و نەژاد ڕادەگیرێن. ئەم کردەوانەیشیان لە کەلەپوورە بەنرخەکانی باووباپیرە چاکەخوازەکانیانەوە بۆ ماوەتەوە، کە مایەی شانازین بۆ گەلەکەمان.

ئاهەنگ بۆ سروشت: لە وەرزی بەهاردا، کە ژیان لە هەموو ئافەریدەکراوێکدا لەسەر زەوی

نیشتمانەکەماندا تازە دەبێتەوە، سەیران و گەشتوگوزار لە ڕۆژانی چوارشەممە و هەینیدا، بۆ سەیرانگاکان دەست پێ دەکەنەوە. دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێیش بەگەورە و بچووکەوە و، بەدەوڵەمەند و هەژارەوە و، بەژن و پیاوەوە، دەست دەکەن بەخۆش ڕابواردن. خۆیان بەگەلێک یاری و وەرزشی بێ گەردەوە خەریک دەکەن وەک گرەوی ڕاکردن و، مەلەکردن و، هەڵپەڕین و، غارکردن بەئەسپ، هەڵگەڕان بەسەر شاخ و درەختدا و، نیشان نانەوە و، گۆرانی گوتن و، ساز و ئاوازلێدان. لەناو ئەو بەهەشتی سەرزەمینەیشدا، کە پڕە لە گوڵ و گوڵزار و چیمەن و لالەزار، لەژێر تیشکە زێڕینە بەکەڵکە ئاوازەکەی ڕۆژدا و، لەناو ئەو کزەبا پاک و خاوێنە بۆن خۆشەدا نان و چێشتە نایاب و ئاوازەکانیان دەخۆن. جا یەکێ لەم ئاهەنگانە کە لەبەر خۆشی سرشت دەکرێن، ڕۆژی (جەژنی نەورۆز)ە کە بەر ۲۱ی مانگی ئادار یاخود نەورۆز دەکەوێ.

## شین و شەپۆڕ

کە یەکێک دەمرێ، دانیشتووانی ناوچەکە پشم و قینی دڵ فرێ دەدەنە لاوە و، لە بیر خۆیانی دەبەنەوە. هەموو لایەک خۆیان دەکوتن بۆ یاریدەدانی ماڵە مردووەکە لە کاروباری ناشتنی مردووەکەدا. بێجگە لەوە هەتا سێ ڕۆژیش پاش ڕۆژی ناشتنی مردووەکە، سەرخۆشی و دڵدانەوە لەگەڵ ماڵە مردووەکەدا دەکەن هەرچی خزمەکانی مردووەکەن، ناهێڵن ماڵە مردووەکە چێشت بۆ خۆیان لێ بنێن بەدرێژایی ئەو چەند ڕۆژە پرسە بەنان و چێشتیان بۆ دەنێرن، تا ماڵە مردووەکە بەئەرکی چێشت لێ نانەوە ماندوو نەبن و سەرەوتیش بەلەش و دڵیان بکات. لە پرسەکەدا (قورئانی پیرۆز) دەخوێندرێتەوە. وتارانی چاکەخوازانەیش دەدرێ بەگوێی ماڵە مردوو و، ئەوانەدا کە لێیان کۆبوونەتەوە. بەڵام ئەم جۆرە بایەخ پێ دانە بۆ ئەو منداڵانە ناکرێ کە تەمەنیان لە دوو ساڵ کەمتر بێ. خواردەمەنی و پارە بەسەر هەژاراندا زۆر دابەش دەکرێ. نەریتیشیان وایە ئافرەتی ماڵە مردووەکە لە ئێوارانی هەموو ڕۆژێکی پێنج شەممەدا دەچنە سەر گۆڕی مردووەکەیان و، بۆ گیانی مردووەکە (فاتیحە) دەخوێنن و بۆی دەپاڕێنەوە لە خودا کە لە گوناهەکانی چاو بپۆشێ. ئینجا دەست دەکەن بەبەشینەوەی خواردەمەنی بەسەر هەژاراندا. پیاوانیش لە بەیانیانی ڕۆژانی هەینیدا هەر بەو جۆرە ڕەفتار دەکەن. ئەم جۆرە خەمخۆرییە کە بۆ مردووەکە دەکرێ جاری وا هەیە تا ساڵێک درێژە دەکێشێ. تەنانەت لە یەکەم ڕۆژی هەموو جەژنێکیشدا پیاوەکان، لە دوای ئەوانیش ئافرەتەکان سەرلەبەیانی دەچنە سەر گۆڕی مردووەکە پاڕانەوەی بۆ دەکەن و بەخشندەییش لەگەڵ هەژاراندا دەکەن.

### ڕێزگرتن لە مردووان

لەلای دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ مردوو یەجگار ڕێزی لێ دەگیرێ. تەنانەت دوژمنەکانیشیان خۆیان دەپارێزن لەوەی جنێویان پێ بدەن یاخود داشۆرییان بکەن. ئەو دارستانانەی پیاوێکی گەورەی تێدا نێژرابێ ئەو درەختانەی لەسەر گۆڕەکان ڕوێنرابن، ئەو ڕەز و باخانەی تەرخان کرابن بۆ گۆڕی پیاوە گەورەکان، کەس توخنیان ناکەوێ زیانیان پێ بگەیێنێ، بام یاساوڵیشیان لە دەور نەبێ!...

## دیدەنی گۆڕەکان

جاری وا هەیە خۆشەویستی نەتەوە بەرامبەر پیاوە ئایینییە چاکەکان لە پاش مردنیان زۆرتری لێ دێت. دانیشتوانی ناوچەکەیش دەچنە سەر گۆڕەکانیان بۆ ئەمەی پێی پیرۆزبێن، یاخود بۆ ئەمەی داوای یارمەتی لە گیانیان بکەن، بەڵکو ئەو نەخۆشییە تووشیان هاتووە، یان ئەو سەرگەردانییەی پێوەی خەریک ماون لە کۆڵیان بێتەوە. لەبەر ئەوە دەست دەکەن بەبارپووکردنی دەسگای ئەو گۆڕانە. بۆ دڵخۆشکردنی گیانی ئەو پیاوە گەورەیە کە لە گۆڕەکە دایە، پارە بەفەرمانبەری دەسگاکە دەدەن، نان و چێشت بەسەر هەژاراندا دەبەشنەوە. باوەڕیان وایە کە ئەوەیان کرد، پیاوە گەورە مردووەکە لای خودا بۆیان دەپاڕێتەوە کە لەو نەخۆشی و سەرگەردانییانە ڕزگاریان بکات!.

جاری وایش هەیە ئەمەندە خۆشەویستییەکەیان بەرامبەر پیاوە ئایینییە مردووەکان گڕ دەسێنێ، بۆ کوڕ و نەوەکانیان یارمەتی نانی و گیانی پێشکەش دەکەن. تەنانەت ئەگەر ئەو کوڕ و نەوانە زۆروستەمیشیان لێ بکەن و، دڵیشیان ئازار بدەن، لەبەر دڵی مردووەکە، چاویان لێ دەپۆشن!.

دوور نییە ئەم نەریتەی ناوچەی ئاکرێیە، لەوەوە هاتبێ کە مرۆڤ، لە پێش داهاتنی ئایینە ئاسمانییەکاندا، باپیرانی خۆیان پەرستووە. ئینجا ئەمانەیش ڕێزی ئەم پیاوە ئایینییانە، لە جێگای ئەوان دەگرن.

## بەزەیی هاتنەوەیان بەهەژار و داماو و پەککەوتەدا

دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ بەزەییان زۆر دێتەوە بەهەتیو و بێوەژن و پیر و پەککەوتە و منداڵ و ئافرەت و هەژار و نەخۆشاندا. چ بەدەم، چ بەدەست، چ بەپارە یارمەتییان دەدەن و، ڕێزیشیان لێ دەگرن و نازیشیان دەکێشن. تەنانەت ئەگەر ئەوانە ئازاری دڵیشیان دان و زیانیشیان پێ گەیاندن، چاویان لێ دەپۆشن و تۆڵەیان لێ ناکەنەوە!... بەڵام خوازەڵۆکی پەسەند ناکەن. لەبەر ئەوە خوازەڵۆک لەناویاندا کەم پەیدا دەبن و، مەگەر لە دەرەوە هاتبن. تەنانەت زۆر کوێر و پیر و پەککەوتەی هەژارم دیوە سەختی ژیان و بەش براوی لە گوزەرانی خۆشیان پێ باشتر بووە لەوەی دەست پان بکەنەوە لە کەسانی تر و، خۆیان بشکێنن، خەباتیان کردووە بەرەنجی شانی خۆیان و ئاورەگی ئاوچەوانیان نان پەیدا بکەن!...

بەڵگەیش بۆ ئەوەی کە دانیشتوانی ناوچەکە بێز لە خوازەڵۆکی دەکەنەوە و، کەنەفتی دەکەن، کە بیانەوێ قسەی سووک بەیەکێک لە پوولپەرستان بڵێن، پێی دەڵێت: «خوازەڵۆک»ە!. دەهۆڵ ژەن و زوڕنا لێدەریش بۆیە بەچاوی سووک تەماشا دەکەن، چونکە ئەوانیش وەک خوازەڵۆکەکان لەوانەی هەڵدەپەڕن پارە داوا دەکەن!.

ئافەرین بۆ ئەم کردەوە و ڕەوشتە مەردانەیە، کە دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ هەیانە، کە هەموویان لەسەر بنچینەی بیروباوەڕی پیاوەتی و مرۆڤایەتی دامەزراون. لە ڕاستیشدا هەر ئەم کردەوە و ڕەوشت و خوو و نەریتە بەرز و پیرۆزانەن کە ئەم نەتەوەی کوردەیان لە ئاکرێدا پاراستووە، لەناو ئەو هەموو کارەساتە خوێنینانە و ئەو لێ قەوماوی و سەرگەردانییانەدا کە هەزاران ساڵە تووشیان هاتوون.

## خۆشویستی کار و فەرمان و نان پەیداکردنی سەر بڵندانە

بەڵگەیش بۆ ئەوەی کە کار و فەرمانکردنیان پێ خۆشە و خۆش دەوێ و، هۆگری نان پەیداکردنێکی سەر بڵندانەن و، هەر کەسەیان پشت بەخۆی دەبەستێ لە نان پەیداکردن و هەموو کاروبارێکدا و، هەستیش دەکەن بەفەرمانی سەرشانی خۆیان بەرامبەر خێزانیان... بەڵگەیش بۆ ئەوانە ئەوەیە، کە منداڵەکانیان هەر لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە دەست دەکەن بەلەوەڕاندنی بەرخ و کارژۆڵە لە پاوانەکاندا. لاوان و ئافرەتانیش خەریکی داربڕین و فرۆشتنی دار و سەوزە و میوە و شیر و بەرهەمانی شیرن لە شار و بازێڕەکاندا، هەروەها خەریکی کشتوکاڵ کردن و ئاژەڵ لەوەڕاندنن بەچەشنی پیاوان!...

دەبێ ئەوەیشمان لەبیر نەچێ کە لایەنی پیشەسازی لە ئابووریی نەتەوەیی کورددا، کە لەم ناوچەیەدا لە ئارادایە، لە پێش هەموو کەسێکدا بەسەرشانی ئافرەتەوەیە. بەم بۆنەیەوە دەڵێم: ڕێزگرتنی دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ بەرامبەر (ئافرەت) و (منداڵ) گەیشتۆتە ڕادەیەکی وەها: کە زۆر کێشە و گیروگرفت دێنە پێشەوە، لەسەر دەستی ئەو دوو چینەدا چارەسەر دەکرێن. ئەویش بەم شێوەیە: کە ئافرەتێک یاخود منداڵێک دەنێرنە ماڵی خاوەن ماف، ئیتر هەر ئەوەندە تکایان لە خاوەن مافەکە کرد لە مافی خۆی خۆش بێ، بێ یەک و دوو لە هەموو مافەکانی خۆی، یاخود لە بەشێکی مافەکەی وازدەهێنێ و لە کابرای سکاڵا لێ کراو خۆش دەبێ!...

## هۆگربوون بەئایین و کردەوە و ڕەوشتی جوانەوە

دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ هۆگری ئایین و، کردەوە و ڕەوشتی چاک و، خووی شیرین و، نەریتی جوانن. نوێژ و ڕۆژوو و (حەج) دەکەن و سامان پاکژە (زەکات) دەدەن و، چاکەخواز بەپێی وزەی خۆیان ڕادەپەڕێن. کە تەماشای ڕەوشتیان دەکەیت لەگەڵ سەرۆکەکان و، هاوڕێکان و، بێگانە و، ئاوارەکاندا، یاخود لە کاتی هەڵگیرسانی جەنگ و، بڵاوبوونەوەی دەرد و، پەیدابوونی مەرگەسات و کارەساتدا، بەئاشکرا ئەم جۆرە کردەوە و ڕەوشتە جوانەیان پێوە دیارە و ئاشکرا دەبێ، وەک: ڕاستگۆیی و، دڵسۆزی و، قسەکردنی ڕاستەوڕاست و، ئازایی و، ئارام و، ئازار هەڵگرتن و، لە چاکەکردندا هاریکاری و، میوانداری و، ڕێزگرتن لە ئاوارە و بێگانە و، بەزەیی هاتنەوە بەکز و لاواز و بێ دەسەڵاتدا. بەڵام لەگەڵ دوژمنەکانیاندا کردەوە و ڕەوشتیان توندوتیژە و لە ئەندازە بەدەر دڵڕەقانەیە. چونکە سروشتیان وەهایە، زوو هەڵدەچن و تووڕە دەبن، زوویش تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە. کە تووڕە دەبن کۆ لە هیچ ناکەنەوە. نە گوێ دەدەنە هۆ و نە گوێ دەدەنە ئەنجام. لە ڕاستیدا هەرچەندە لەگەڵ دۆست و ناسیاو و بێگانەدا ڕەوشت بڵندن، بەڵام لەگەڵ دوژمنەکانیاندا دادپەروەر نین. ئەوەندە هەیە کە دوژمنەکانیان خۆیان دەدەنە دەستیان، یاخود لەگەڵیاندا ئاشت دەبنەوە، هیچ لە دڵیاندا نامێنێ. تکاکردنی دوژمنەکانیان و خۆدانیان بەدەستەوە بەلایانەوە پەسەندن، تەنانەت بەخۆشییشەوە پێشوازی دەکەن. چاوپۆشین لە پاش خۆدان بەدەستەوە، یاخود ڕێزگرتن لە دیل و بەزەیی پێ هاتنەوەی، لە سەرروو هەموو کردەوە شیرینەکانیانەوەن. بەڵام نازکردن بەخۆوە و، پاراستنی سەربەرزی و، سەربەستی خۆیان، یەجگار بەهێز و هەرەتەوە دەنوێنن. زۆر جاری وا هەیە ئەم جۆرە کردەوە و ڕەوشتانەیان تووشی تەنگ و چەڵەمە و ئەنجامی ناخۆشیان دەکەن. ناکۆکی و

دووبەرەکی و شەڕوشۆڕ و جەنگ کە لە ناوەندیاندا دەقەومێن و زیان بەدڵ و دەروون و تەندروستییان دەگەیێنن، ئەوانە هەموویان لەم ڕەوشت و خووەیانەوە پەیدا دەبن، کە پڕن لە ماڵوێرانی و سەرگەردانی. باریان هەر چۆنێک بێت، ئەوانە لە نەتەوەیەکن کە هەزاران ساڵانە بەم کردەوە و، ڕەوشت و خووە و نەریتانەوە ڕاهاتوون. هەتا ئێستاکەیش کردەوە و ڕەوشتی سوارچاکی بەنموونەی باڵای خۆیان دادەنێن، واتا هەروەک لە سەدەکانی ناوەڕاستدابن وەها دەژین!.

## گلەییەک کە لە جێی خۆدابێ

جا ئەوانەی کە دەڵێن ئەم ناوچەیە، دانیشتووەکانی، خۆشی لە زۆروستەم و، تێکدانی کۆمەڵایەتی و، شەڕوشۆڕ و، ئاژاوە و، خراپەکاری دەبینن، پێیان دەڵێم: زۆربەی دەرگای خانووەکانی ناو ناوچەکە کلیل و کلۆمی نییە، کیلۆون یاخود قفڵیان پێوە نییە. گوندییەکان زۆربەیان خانووەکانیان، کە پڕن لە خواردەمەنی و کەلوپەل، بێ ئەمەی کیلوونیان بکەن یاخود، قفڵیان لێ بدەن، بەجێییان دەهێڵن و، خۆیان دەچن بۆ ناو کەپرەکانیان لە هاویندا، تەنانەت یاساولیشیان بۆ پارێزگاری بەسەرەوە دانانێن. تەنانەت جاری وا هەیە بەشەو یاساووڵ بەسەر کشتوکاڵ و پاوان و خەرمانەکانیانەوە دانانێن. زۆربەی شوانەکانیشیان یان منداڵن، یان ئافرەت، یان کوڕ، هیچ کامێکیشیان چەکی کوشندەی پێ نییە. هۆزە کۆچەرەکانیشیان جاری وا هەیە پێستە پەنیرەکانیان لەناو ئەشکەوتەکانی ناوچەکەدا، یاخود لەناو بیرە ووشکبووەکاندا دادەنێن بەبێ یاساووڵ، چەند مانگێک بەسەریاندا تێپەڕ دەکات، ئینجا لە کوێستانەوە دەگەڕێنەوە بۆ هەوارە زستانییەکانیان و، هەڵیان دەگرنە دەرەوە و دەیانبەنەوە بۆماڵی خۆیان. هەروەها زۆربەی پەیماننامەی کڕین و فرۆشتنیان و دەستیاوەکانیان، بەبێ بروانامەی نووسراو گرێ دەدەن. تەنانەت جاری وا هەیە، کڕیار و فرۆشیار خۆیان نەبن، کەس لە کاتی پەیماننامەکاندا کە گرێیان دەدەن، بەدیاریانەوە نییە!.

جا من لەو کەسانە دەپرسم: ئاخۆ بیروباوەڕیان چییە دەربارەی ئەم کردەوە و کارانە، کە گەورەترین بەڵگەن بۆ ئەوەی کە نەتەوەی کورد لە ناوچەی ئاکرێدا باوەڕی بەخۆی هەیە و، پشت بەخۆیشی دەبەستێ و، سەربەرزیشە بەوەوە کە باوەڕی بەکەسانی تر هەیە. هەروەها باوەڕی بەچاکەکردن هەیە و، دڵیشی پاکە و، ڕێزیش لە ماف و سەربەستی کەسانی تر دەگرێ؟!. دیسانەوە لێیان دەپرسمەوە: ئایا نەتەوەیەک ستەمکار و ئاژاوەخواز و دۆستی خراپان بێ، لە باریدا هەیە ئەم جۆرە کردەوە و کار و ڕەوشتە جوان و بڵندانەی لێ بوەشێتەوە؟!... ئاخۆ ئەوە دەگونجێ (باوەڕکردن بەخودا) کە خۆشەویستی چاکەکردن و ئاسایش و دامەزراوی لێ دەوەشێتەوە، لەگەڵ (ترس)دا کە خۆشەویستی خراپەکاری و یاخی بوون لە خودا و ئاژاوەگەری لێ دەوەشێتەوە، هەردووکیان، لەیەک کاتدا و، لەناو یەک دڵدا، کۆببنەوە؟!.

من ناڵێم لەناو نەتەوەکەدا خراپەکار و تاوانبار نییە. چونکە گەلێک کارەساتی ناساز و ناشایستە و کەتن لە ناویاندا ڕوو دەدات. تەنانەت ڕۆژگاری وایان بەخۆیانەوە دیوە، هیچ ئاسایش و ئارام و سرەوتێکیان نەچێشتووە، بەڵێ دان بەمانەدا دەنێم. بەڵام هەرگیز لەگەڵ ئەو کەسانەدا نیم کە دەڵێن نەتەوەی کورد لە ناوچەی ئاکرێدا حەز بەئاژاوە و شەڕوشۆڕ و خراپەکاری دەکات. ئەو ڕاستییەش کە هیچ

گومانێکی تێدا نییە، ئەوەیە کە دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ ئەوەندەی زۆروستەم و کەمتەرخەمی لە سەرۆک و فەرماندارانی خۆیان بینیون، ئەوەندە تینووی (ڕاستی و دروستی و دادپەروەری) دەبن و خۆیشیان لە پێناویاندا بەخت دەکەن!.

## دادپەروەریی کۆمەڵایەتی تاوان لەناو دەبات

جا هەروەک (تاریکی) بەدەرکەوتنی (ڕووناکی) لەناودەچێ، هەر بەو ڕەنگەیش (تاوان)یش بەدەرکەوتنی (دادپەروەری کۆمەڵایەتی) لەناودەچێ، بەڵام تەنیا لەسەر دەستی ئەو سەردار و فەرماندارانەدا پێک دێ کە (دادپەروەری) دەکەن و بایەخ بەخۆشی و خۆشگوزەرانی نەتەوە دەدەن. جا ئەگەر کەسێک لەناو فەرمانداران کەسی وای ئەدۆزییەوە، پەنای بەرێتە بەر بۆ ئەمەی مافی خوراری بۆ بسێنێتەوە و، دادپەروەری بۆ بخاتە گەڕ، ئەوە دیارە یان بەدەستی خۆی تۆڵەی خۆی دەکاتەوە، یاخود دادگەران لەناو سەرەک هۆز و شێخ و سەرکار و کوێخاکاندا بۆ خۆی دروست دەکات، بۆ ئەمەی مافی داگیرکراوی خۆی بسێنێتەوە!... جا ئەگەر کارگێڕییەکی بەهێزی کارامە و زرنگ لە ئارادا هەبێ و، (ماف و سەربەستی) بۆ هەموو کەسێکی ناو ناوچەکە بپارێزێ و (دادپەروەریی کۆمەڵایەتی)یش لەناو دانیشتوانی ناوچەکەدا دابەش بکات، ئیتر هیچ دەسەڵاتدارێکی ناهەموار لەناو ناوچەکەدا پەیدا نابێ، نە لە سەرەک هۆزەکان و، نە لە سەرکارەکان و، نە لە شێخە ئایینییەکان!.

## زیانی کارگێڕی ستەمکار

کە هاتوو فەرمانڕەواییش (دادپەروەری)ی بۆ پیاوانی ساکار و نەخوێندەوار بەجێ هێشت، ئەوە دیارە کە تۆڵەسەندنەوە دەست پێ دەکات و، کەتن و تاوانیش ڕوو دەدەن و، لەناو دانیشتوانی ناوچەکە خۆیشیدا مەرگەسات و کارەساتی ناخۆش و سەرگەردانی و ماڵوێرانی ڕوو دەدەن! ئەمە هەر ئەگەر فەرمانڕەوایی فەرمانی سەرشانی خۆی بخاتە پشت گوێیەوە ئەی ئەگەر فەرمانبەرانی میری، خۆیان، زۆرداری لە دانیشتوانی ناوچەکە بکەن، دەبێ ناوچەکە چی لێ بێت؟! ئەی ئەگەر ئەو فەرمانبەرانە هەندێک لە دانیشتوانی ناوچەکەیان هاندا تاوانکاری لە دژی یەکتر بکەن، یان لە دژی فەرمانبەرانی تر بکەن، دەبێ ناوچەکە چی بەسەر بێت؟!.

ئەو فەرمانبەرانەی لەناو ناوچەی ئاکرێدا (دادپەروەری)یان بەکارهێناوە و، پیاوانە و مەردانە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەدا کار و فەرمانی خۆیان بەجێ هێناوە هەتا ئێستاکەیش دانیشتوانی ناوچەکە بەخۆشەویستییەوە یادیان دەکەن و، بەچاکییەوە ناویان دەبەن. بەڵام داخەکەم لە ماوەی ئەم هەزاران ساڵانەدا کە بەسەر ناوچەکەدا تێپەڕیوە، دانیشتوانی ناوچەکە، فەرماندارانی دادپەروەریان ئەمەندە کەم دیوە، کە ژمارەیان لە ژمارەی پەنجەکانی دەستێک تێپەڕ ناکات!... جا باری ناوچەکە، کەوابووبێ، ناوچەکەیش لە هەموو لایەکیەوە ئاژاوەگەری چواردەوری گرتبێ و، کەمتەرخەمی فەرمانڕەواییەکانی پێشوویش تووشی (هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و زۆرداری)ی کردبن، ئیتر هۆی ڕوودانی کەتن و تاوانکاری و خراپەکردن بۆ چ نەخەینە سەر ئەستۆی ئەم بارە ناهەموارانە و، بۆ چ بیخەینە سەر ئەستۆی دانیشتوانی ناوچەکە؟!

## کلۆلی بەسەر ئەوانەدا دێت کە قین لە دڵن

کەواتە کاتی ئەوە هاتووە کە بەو جۆرە کەسانە و، بەو جۆرە فەرمانبەرانە بڵێم کە دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێیان چەوساندۆتەوە و، رووتاندۆتەوە، بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان: هەرچییەکیان دەربارەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە گوتووە و نووسیوە، بە(هەڵە)، تەنیا لە دوو شتەوە پەیدا بووە. یان ئەوەتا لە بیروباوەڕ و دڵ و دەروون و گیانی دانیشتوانی ناوچەکە تێ نەگەیشتوون و لەسەر بنچینەیەکی زانستی لە بارودۆخی ناوچەکەیان نەکۆڵیوەتەوە و، ئاگاداری نەبوون، یان ئەوەتا پشم و قین و مەبەسی خراپ دڵی داگیرکردوون! جا ئەو جۆرە کەسانە و ئەو جۆرە فەرمانبەرانە، لە هەر دووباردا زیانیان بەدانیشتوانی ناوچەکە و بەفەرمانڕەوایش گەیاندووە. چونکە ڕاستییان گۆڕیوە و سەرەوژێر کردووە!... چونکە وەک بۆم دەرکەوتووە، لەم ناوچەیەدا هیچ شتێک ئەوەندەی ئەوە خۆشەویست نییە بەلای دانیشتوانی ناوچەکەوە، تەنانەت بەلای سەرۆک و دەسەڵاتدارەکانیشیەوە، کە فەرمانڕەواییەکی بەهێزی (دادپەروەر)، فەرمانداریيان بەسەرەوە بکات و، ناراستەیشیان بکات بۆ چاکەی گشتی!... لەم ماوە درێژەیشدا، کە لەم ناوچەیەدا فەرمان دەبینم و، دانیشتوانی ناوچەکەم تاقی کردۆتەوە، بۆم دەرکەوتووە کە هەموویان چاکترین یاریدەدەرن بۆ فەرمانڕەوایی لە دامەزراندنی ئاسایش و خۆشگوزەرانی و کامەرانیدا بۆ هەموان. ئاواتی هەرە گەورەیشیان ئەوەیە، کە فەرمانڕەوایی ماوەیان بداتێ، ڕاژە و کەڵک و چاکە، پێشکەش بەگشت دانیشتوانی ناوچەکەی خۆیان بکەن. جا کەوابێ، ئەوە زۆروستەمی تێدا نییە، کە نەتەوەیەک وەهابێ. توانج و پلاری تێ بگیرێ و پێی بگوترێ: هۆگری کەتن و تاوانبارییە؟!... ڕاستەوڕاست دەیڵێم: ئەو دڵڕەشانە، کە ئەو قسانە بەدەمیاندا دێ، لە ڕاستیدا خۆیان گوناهبار و تاوانکارن! هەر کارەسات و مەرگەساتێکیش لە ناوچەکەدا ڕوویان داوە، چ تاوان و چ شەڕوشۆڕ و چ شۆڕش لە سەردەمی فەرمانداری ئەواندا، ئەستۆی دەگرێتەوە و، بەرپرسیاریش خۆیانن. بێ گومانیشم لەوە، کە لەسەر دەستی خودادا، پەندێکی وایان پێ دەدرێ، کە شایستەی کردەوە و کاری خۆیان بێ!؟...

## خۆشرابواردن لە ناوچەی ئاکرێدا

### خۆشرابواردنەکانیان زۆرن

دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ ڕووخۆش و قسەخۆشن. لە کاتی سرەوت و پشوودانیاندا بەوە کاتی خۆیان بەسەر دەبەن کە خەریکی: گێڕانەوەی فەرموودەی شیرین و قسەی نەستەقی پەسەند و، هۆنراوەی ناوازە و، پەندی پێشینان و، مەتەڵ و، چیرۆک و بەیتی پڕ لە گۆرانی و دڵداری بێ گەرد و، ئازایەتی بێ هاوتا و، نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە و، کردەوە و ڕەوشتی جوان و پاک و پیرۆز دەبن. هەروەها بەوەیشەوە ڕادەبوێرن کە خەریکی هەڵپەڕکێی و گۆرانی گوتن و، ساز و ئاواز لێ دان و، ڕاو و، لاسایی کردنەوەی پێکەنین هێنەر و، گرەوی غاردانی بەئەسپ و، گرەوی نیشان نانەوە و، گەشتوگوزار و، سەیرانکردن دەبن. جا تۆ کە سەرنج لەم جۆرە خۆشرابواردنانە دەدوێت، تێ دەگەیت دانیشتوانی ناوچەکە تا چ ئەندازەیەک خاوەنی گیانی پاک و، دڵی چاک و، بیرۆکەی تەڕ و تازە و، زیرەکی ناوازە و، لێ هاتوویی

بەئەندازەن و، ڕەوشتی جوان و کردەوەی شیرینیان هەیە. وا لە خوارەوە لە بابەت هەندێکیانەوە دوور و درێژ دەدوێین.

## پەندی پێشینان و قسەی نەستەق

لە خوارەوە هەندێک لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی کە لە ناوچەی ئاکرێدا باون دەنووسم. سەیر ئەوەیە بەسەدان ساڵ بەسەر ئەم قسە و پەندانەدا تێپەڕیون، کەچی هێشتا هێز و هەڕەتی خۆیان پاراستووە و، بەکاردەهێنرێن و، کەڵکیان لێ وەردەگیرێ:

١- هیچ جەنگەڵستانێک بێ شێر نابێ.

٢- لە پاشملە قسەی خراپ دەربارەی کەس مەکە. هەرچەندە شاخ ناگات بەشاخ. بەڵام هەمووکەس بەرەو ڕووی یەکتر دەبنەوە.

٣- لە ئەنجامی چاکەکردن بێ هیوامەبە، تەنانەت بیخەیتە ناو ئاویشەوە چاکەکەت دێتەوەڕێ.

٤- ببیتە (قاروون)یش، دەست بڵاوی مەکە، لە ئەندازەی خۆیدا بەخت بکە.

٥- شەڕ لە بەتاڵی چاکترە.

٦- هەر کەسێ گوێ لە پیاوی ژیر نەگرێ، خۆی تووشی تیز پێ کردن دەکات.

٧- بۆ بەرامبەری خۆت دەستت نەقووچێ. چونکە سامانی پیاوی ڕژد، ڕۆژێک دێت دەبێتە پاروویەک و زۆردارێک قووتی دەدات.

٨- ئەگەر بەشیرینی بجووڵێینەوە، دەتوانین مار لە کون بێنینە دەرەوە.

٩- چاکەت لەبەرچاو بێت و بیشی دەرەوە. نەکەیت ئەو سفرەیەی نانی لەسەر دەخۆیت بیدڕیت.

١٠- هەموو دەم بەهاریکارییەوە فەرمان بکە. چونکە بەسوارێکی تەنیا تۆزی وا هەڵناستێ!.

## مەتەڵ

ئەمانەیش چەند مەتەڵێکن، کوردی، کە لە ناوچەی ئاکرێدا بەکاردەهێنرێن:

١- بیرێکە و پڕە لە ئاو. مارێکی مردووی تێدایە، کەچی بەسەر سەری مارەکەوە ئافرەتێکی سپی شۆخ و شەنگ وەستاوە.

-ئەمە چرایە-

٢- هەردوو لای پەرژینە. لە ناوەڕاستیشدا دوڕ و مەرجان هەیە.

-ئەمە چاوە-

٣- ئەشکەوتێکی تاریکە و پڕێتی لە دوڕ.

-ئەمە دەمە-

٤- وەک ترێ شیرینە. نابێ خاوەنەکەی لێی بخوات. کەچی بۆ کەسانی تر، بەپێی یاسا دەشێ لێی بخوات.

-ئەمە کچە-

٥- لە بنەچەدا لە حوشتر درێژترە، لە شەکریش شیرنترە، لە دەنکی هەرزنیش بچووکترە.
-ئەمە دەنکی هەنارە-
٦- زمزم! زەوی کون بکە!
-ئەمە دڵۆپەیە-
٧- کاسەیەکی چینییەو پڕە لە دوو جۆرە ئاو، کە کەوتنە ناو ئاوی گەرمەوە دەمەیێن.
-ئەمە هێلکەیە-
٨- لە کۆشکێک هاتمە دەرەوە کە دوو دەرگای هەبوو.
-ئەمە کراسە-
٩- نەرمە و گەرمە. کە بەنەخوێنەکەی ڕابکێشێت شوورەییە. کە دەستیشت پێدانا لەشکرێکی بێ شومارت چاو پێ دەکەوێ.
-ئەمە گیپەیە-

## گۆرانی

گۆرانی کوردی لە ناوچەی ئاکرێدا، خۆشە، ڕەنگاوڕەنگە، شیرینە، پڕە لە سۆز، هەست و تاسە و تەزووی دانیشتوانی ناوچەکە لە هەموو ڕوویەکی ژیانیاندا پێشان دەدات. هی وایان تێدایە دایکەکان بەجۆرێکی تایبەتی لەکاتی مەمکداندا بۆ منداڵەکانی خۆیانی دەیڵێن.هی وایشیان تێدایە، کەیبانووەکان دەیڵێن لەکاتی شیر دۆشینی مەڕ و بزن و مانگاکاندا. هی وایشیان تێدایە پەیوەندی بەجووتیارەکانەوە هەیە، بەژن و پیاوەوە، کە کاتی دروێنە، یاخود داربڕین، یان ساوەرکوتاندا. هەندێکیشیان پەیوەندییان بەشین و شەپۆڕەوە هەیە، کە بۆ سەرەک هۆز و پاڵەوانانی جەنگ و، شەڕوشۆڕ دەکرێن، یاخود بۆ دڵداری بێ گەرد و، چیرۆک و بەیتی مێژوویی وێژەیی دەکرێن، چ لە بابەت دڵدارییەکی ڕەوشت و کردەوە جوانەوە بێ وەک چیرۆکەکانی (مەم و زین، ستی و فەخی، خەج و سیامەند، شار و بنەفش، حەمک، مەتران، جبلی و کەژا گوڵی سوور) چ لە بابەت نیشتمانپەروەرییەکی خوێن گەرمانەوە بێ وەک: (دمدم، هەسپی ڕەش و خانەی لەپ زێڕین)، چ لە بابەت شین و شەپۆڕەوە بێ وەک چیرۆک و بەیتەکانی: (سیدک، لەڤەندی برا، زیاراچەتۆ و گوڵی جەوهەر ئاغا).

گۆرانی ئەم ناوچەیە، هەروەها پڕە لە بەستە و گۆرانی بەزموڕەم و هەڵپەڕکێ وەک: (نارینگ، سەری زاڤا و خودا خاڵی و ماڵی) کە پەیوەندییان بەشەوی زاواییەوە هەیە.

هەروەها گۆرانی پێکەنین و گاڵتەوگەپیش هەن وەک لە چیرۆک و بەیتەکانی: (قاندی، بووک و خەسوو و کێچ)دا دەگوترێن. هی وایشیان تێدایە پەیوەندی بەئایینەوە هەیە وەک بەیتەکانی: (شێخی سەنعانی، ئاڤدەل ئۆمەرا و سیسەبان).

بەکورتی گۆرانی کوردی لە ناوچەی ئاکرێدا یان (دڵداری)یە، یان (نیشتمانی خوێن گەرمانە)یە، یان (ئایینی)یە، یان (پێکەنین هێنەر)ە، یان بەبابەتی (کار و فەرمان)ە. ئەم گۆرانییانەیش یان بەتەنیا دەگوترێن یان بەکۆمەڵ، بەپێی بابەت و توانستیان. جاری وایش هەیە تاکە گۆرانیبێژێک گۆرانی دەڵێ و

ئەوانی تریش بەکۆمەڵ بۆی دەسێننەوە.

جا لەم گۆرانییە جۆرجۆر و ڕەنگاوڕەنگانەدا، هەریەکەیان ڕاستی پەرستی (فلسفە)یەک هەیە، یان مرۆڤ ئاراستە دەکات بۆ ڕەوشت و خووی چاک و کردەوەی بڵند، یان دڵی مرۆڤ خۆش دەکات و دەیهێنێتە پێکەنین، یان فێری زانیاری دەکات، یان دەماری مەردایەتی و نیشتمانپەروەری و خوداناسی دەبزوێنێ، یان لەش دەخاتە گەڕ و، گیان دەگەشێنێتەوە، بۆ ئەمەی بەکوڵی دڵەوە و بەڕاستی و دروستییەوە کار و فەرمان بکەن.

بێجگە لەمانە ئەو (بەیت) و (چیرۆک)انە بەسامانێکی کوردی وێژەیی و زمان و مێژوویی دادەنرێن کە نرخی نەتەوەییان هەرگیز تەواو نابێ.

## چیرۆک و بەیتەکان

ئەو چیرۆک و بەیتە پڕ گۆرانییانەی لەسەرەوە ناوم بردن، چ هی دڵداری و نیشتمانی، چ هی ئایینی و مێژوویی، چ هی وێژەیی و پێکەنین و فەرمان، خۆیان لە خۆیاندا، بریتین لە چیرۆک و بەیت، دەتوانرێ بێ گۆرانیش بخوێندرێنەوە. هەروەها چیرۆک و بەیت تریش هەن کە زۆرن، لە شەوانی ئاهەنگدا دەخوێندرێنەوە و گوێیان لێ دەگیرێ. هەرچی منداڵانن، بەتایبەتی چیرۆکی کورتی خۆیان هەیە وەک: (دەندک هەنار، زەنگ و بەنگ، دووری، پیرنەدەر و مام ڕووڤی)، کە منداڵ ئاراستە دەکەن بۆ خۆش ڕابواردن و، فێربوونی زانیاری و، کردەوە و ڕەوشتی بەرز و پیرۆز.

## ساز و ئاواز

دانیشتووانی ناوچەکە لە ئامێر و کەلوپەلی ساز و ئاواز بێبەش نەماونەتەوە. هەندێکیان لە کاتی هەڵپەرکێدا تەپڵ و، دەهۆڵ و، زوڕنا و، دووزەلە و، شمشاڵ، لێ دەدەن. لەگەڵ گۆرانییە ئایینییەکانیشدا، یان نای بەتەنیا لێ دەدەن، یان دەف، یان شمشاڵ، لەو کاتەدا کە کۆبوونەوە بێ دەنگ و سەنگەکانیان دەکەن. وادەردەکەوێ، کە شوانەکانیش، لەم ناوچەیەدا هەستیان بەوە کردووە کە ساز و ئاواز کار لە دڵی گیانلەبەرەکانیان دەکەن و، ئاراستەیشیان دەکەن. کە تەماشا دەکەیت، شمشاڵەکانیان لێ دەدەن و، مەڕ و بزنەکانیان کۆ دەکەنەوە و ئاراستەیشیان دەکەن بۆ ئەو جێگایانەی خۆیان بەباشیان دەزانن. دانیشتوانی ناوچەکە، ئەمەندە ساز و ئاوازیان پێ خۆشە، هەرچەند گیروگرفتیان یاریدەیان بدات، گرامەفۆن و ڕادیۆ دەکڕن و دەست خۆیان دەخەن. هی وایشیان تێدایە بەکڕین و دەستکەوتنی ئەو ئامێرانە وازناهێنن، دەچن ئامێرانی بەزموڕەزمیش دەکڕن، وەک تار و کەمانچە و عوود و ئامێرانی تر. بەدوای مامۆستایانی ساز و ئاواز فێرکردنیشدا دەگەڕێن، فێری نۆتەکانی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییان بکەن. ئێستاکەیش لە ئاکرێدا، کۆمەڵێک ساز و ئاوازخوازان هەن کە (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ) لە ئەندامەکانی خۆی پێکی هێناون، سێ (عوود) و دوو (کەمانچی) و (جونبوش)ێک و (ئەکۆردیۆن)ێک یان کڕیوە، خاوەنەکانیان هەوڵی ئەوە دەدەن تا ئەندازەیەکی گەورە فێری ساز و ئاواز بن و هونەرمەندی تێدا بنوێنن.

## هەڵپەڕکێ

هەڵپەڕکێیش بەشێکە لە خۆش ڕابواردنی دانیشتوانی ناوچەی ئاکرێ و بەزموڕەزمیان. ئەمیش یان بەتەنیا دەکرێ، یان بەکۆمەڵە. هەرچی هەڵپەڕکێی کۆمەڵەیە، یان پیاو و ژن پێکەوە دەیکەن، کە ئێمە پێی دەڵێین: (ڕەشبەڵەک)، یان پیاوان بەجیا دەیکەن و، ئافرەتانیش بەجیا. هەرچی هەڵپەڕکێی تێکەڵە لەناو ئەو پیاو و ئافرەتانەدا دەکرێ کە خزمی یەکترین، یاخود لەو کەسانەبن کە پشت بەکردەوە و ڕەوشتی بڵندیان ببەسترێ. ئەگینا هەر ڕەگەزە بەجیا هەڵپڕەکێی خۆی دەکات. لە هەڵپڕەکێی تێکەڵیشدا هیچ جۆرە ئەنگییەک نییە. هەتا ئێستاکەیش هەرگیز لە هەڵپەڕکێی تێکەڵدا، شتی ئەنگ و ناپەسەند ڕوی نەداوە. چونکە هەر کەسێ پێچەوانەی دەستووری ڕەوشت و خووی بڵند جووڵابێتەوە بەکوشتن نەبێ وازی لێ نەهێنراوە!... کاتێکیش ئافرەتەکان هەست بەوە دەکەن کە کەسانی ناپیاو و نامەرد و بەدخوو بۆ ئەوە هاتوونەتە جێ هەڵپەڕکێکەیان، تا بەتەماشاکردنیان زاخاوی چاوی خۆیان بدەن، بەنیازی خراپەوە، دەم و دەست وازلە هەڵپەڕکێکەیان دەهێنن و دەچنە جێگایەکی دوور، لەوێ هەڵپەڕن، بۆ ئەمەی ئابڕووی خۆیان بپارێزن. هەڵپەڕکێیش لەو کاتانەدا دەردەکەوێ کە ڕۆژی خۆشی و شادمانی بێ، وەک ئاهەنگەکانی ژنهێنان و جەژنەکان و چووک بڕین[1] و نەورۆز و، سەیرانەکانی وەرزی بەهار، کە دانیشتوانی ناوچەکە لە ڕۆژانی چوارشەمموانی هەموو هەفتەیەکدا دەچنە سەیرانگاهەکان بۆ سەیران و گەشتوگوزار، تا هەوایەکی باڵی خۆیان بدەن و، چەند ساتی بەخۆشییەوە ڕابوێرن. هەرچی منداڵەکانن، هەر کاتێک، ئارەزوو بکەن و لەهەر شوێنێک کۆببنەوە، دەتوانن هەڵپەڕکێ بکەن. کەس بەربەستیان ناکات. هەڵپەڕکێی کوردیش لەم ناوچەیەدا، لەسەر چەند بنچینەیەکی وەرزشکاری دامەزراوە. بەکەڵکی لەش دێت، بەهێزی دەکات. بەکەڵکی دڵیش دێت پڕی لە شادی دەکات. ناوبانگی کەسیش بەخراپە نازڕێنێ. لە ڕاستیدا هەڵپەڕکێیەکی وایە کە پڕە لە ڕەوشت و خووی پاک و چاک و بێ گەرد. جوانی و، ڕێکوپێکی و، چێژکەی دروست و پەسەندی تێدا ڕادەگیرێ. یەکێک لە بەندەکانی دەستوورەکەی ئەوەیە، کە هەڵپەڕکێکەرەکان. یەکێک چ پیاوبن چ ژن، باشترین جلوبەرگی خۆیان بپۆشن لە پاک و خاوێنی و ڕێکوپێکی و جوانیدا: بۆنی خۆشیش بەکارهێنانی پەسەندە، بەربەست ناکرێ. بەندێکی تری دەستوورەکەیشی ئەوەیە کە لەگەڵ کەسانی وەهادا هەڵپەڕکێ دەکرێ کە لە ڕووی کردەوە و ڕەوشتی بەرز و پیرۆزەوە بەباش دابنرێن. بێجگە لەوە دەبێ هەڵپەڕکێکە لە جێگایانی ڕووناک و، بەر بەرەڵلا و، خاوەنی بای پاکژدا بکرێ و، هەر چوار لای جێگاکانیش پڕ بن لە چاوئەندازانی سروشتی جوان. هەروەها دەبێ لەو کاتانەیشدا بکرێن، کە بەڕۆژانی شادمانی دابنرێن. دەبێ ساز و ئاواز، یاخود گۆرانیبێژیشیان لەگەڵ بێ. دەبێ گۆرانییەکانیشی یان بابەتی دڵداری بن، یاخود پێکەنین. یەکێک لە نەریتەکانی هەڵپەڕکێیش ئەوەیە کە لەلایەن ئەوانەوە هەڵدەپەڕن، یاخود سەیری هەڵپەڕکێکە دەکەن، باربووی ساز و ئاواز لێدەرەکان، یاخود گۆرانیبێژەکان بکەن، چونکە بۆ دڵخۆشی کردنی ئەوان خۆیان ماندوو دەکەن...

---

(١) خەتەنە سوران. (چووک بڕین: خەتەنەکردن).

هەڵپەڕکێیش لەم ناوچەیەدا گەلێک جۆرە. گرنگەکانی ئەمانەن: (لەیزۆک، شێخانی، بردی باسا، ئایشۆک، دولوتی، سەمەدانی، سێ پێ، سوارک و مەمیان).

جاری وا هەیە ئەوانەی هەڵدەپەڕن، لە کاتی هەڵپەڕینەکەدا بەربەرەکانێی یەکتر دەکەن یان لە بابەت هونەرمەندییەوە لە هەڵپەڕینەکەدا، یاخود لە بابەت ماوەی هەڵپەڕینەکەوە. هەر کەسێ لەو نەبەردەدا سەربکەوێ و، گرەو بباتەوە، بەڕێوەبردنی کەمەرەی هەڵپەڕکێکە و سەرچۆپیکێشی هەڵپەڕکێکەی وەک پاداشتێک دەدرێتێ. ئەو کەسە لە کەمەرەی هەڵپەڕکێکەدا دەبێتە یەکەم کەس و سەرچۆپیکێش ، مافی هەیە دەسەسڕێکی جوان بگرێ بەدەستی ڕاستییەوە و، بەبەرزییەوە و، بەچست و چالاکییەکەوە هەڵی بسووڕێنێ، هەروەک بەنیشانەیەک دانرابێ، بۆ گرەو بردنەوە و سەرکەوتن و هونەرمەندی لەناو هەڵپەڕکێکەدا!...

## ڕاوکردن

ڕاوکردن بەلای دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێوە لە بەزمە هەرە گەورەکان دەژمێررێ. چونکە ڕاو بێجگە لەو کەلکانەی هەیەتی وەک خواردنی گۆشتی ئەو گیانلەبەرەی ڕاودەکرێ، یاخود دەفرۆشێ، یان کەوڵەکەی کە دەخرێتە بازاڕەوە بۆ فرۆشتن، هەروەها لەبەر ئەوەیش ڕاو دەکرێ کە مرۆڤ خۆی و، کشتوکاڵەکەی و، گیانلەبەرە ماڵییەکەی وەک ئاژەڵ و پەلەوەران، لە گیانلەبەرانی درندە بپارێزێ. هەروەها دەبێتە هۆی بەهێزکردنی لەش و هۆش و ڕەوشت و خوو و، دڵ و، دەروون. ڕاوکەر هەست بەوەیش دەکات کە خاوەنی هێز و هەڕەتە و، لەبەر ئەوە سەردەکەوێ و مەردایەتی خۆیشی دەنوێنێ. گۆرانی ژیان و بەزمی بێ گەرد و، گیانی یارمەتیدان و کۆبوونەوەیش کە لە ڕاوەکەوە پەیدا دەبن، خۆشی و کامەرانی دەخەنە دڵیەوە.

دانیشتوانی ناوچەکە کەروێشک و، پۆڕ و، کەو و، سوێسکە و، چێرگ و، قاز و، قولنگ و، مراوی و، چۆلەکە و، ڕیشۆڵە و، ماسی و، مەڕەکێوی و، بزنەکێوی و، ئاسک و، مامز و، فیلەگێژە و، ژیشک و، گورگ و، چەقەڵ و، بەراز و، ورچ و، کەمتیار و، مار و، دوویشک و، پڵنگ ڕاو دەکەن. شێوەی ڕاوکردنەکەیشیان بەپێی سروشتی زەوییەکە، یاخود سروشتی گیانلەبەرەکە دەگۆڕێ. کە ڕاوی دەکەن، یان بەپێوە دەیکەن، یان بەسوارییەوە، یان لەناو ئاودا، یان بەسەرداروە، یان خۆیان دەشارنەوە، چ بەتەنیابن، چ بەکۆمەڵ.

لە کاتی ڕاوکردنیاندا گەلێک جۆر ئامێر و دەرمان و گیانلەبەران و کەلوپەلی ڕاو بەکاردەهێنن وەک: دار و، تۆڕ و، خەنجەر و، تفەنگ و، ڕم و، بۆمبا و، ژەهر و، سەگ و، باز و، تەڵە و، تێلا. جاری وا هەیە چەند شەو و ڕۆژێک لەناو ئەشکەوت و، کەڵەبەرد و، دۆڵدا دەمێننەوە و، ناگەڕێنەوە ماڵی خۆیان، تا نێچیریان دەست دەکەوێ. نە گوێ دەدەنە سەرماوسۆڵە و بەفر و باران و ڕەشەبا و، نە گوێیش دەدەنە تەپوتۆز و گەرما. لەناو ئەشکەوتەکانیشدا بەبەزموڕەزم و ئاهەنگەوە ڕادەبوێرن. کە دەیش گەڕێنەوە ماڵی خۆیان، ئەو نێچیرانەی دەستیان کەوتوون، لە شێوەیەکی پیاوانە و، خۆشەویستانە و دادپەروەرانەدا لەناو خۆیاندا بەشیان دەکەن. ئینجا لەناو ئەندامانی خێزان و هاوڕێکانیشیاندا، کاتێکی ناوازە ڕادەبوێرن

بەگێڕانەوەی شێوەی ڕاوکردنەکەیان و، ئەو کارەساتە سەرسوڕهێنەرانەی لە کاتی ڕاوکردنەکەیاندا ڕوویانداوە. ئەوانەیش هەمووی بەدڵسۆزی و ڕاستگۆیی و دڵپاکییەوە، بێ پێچ و پەنا، هەر بۆ خۆش ڕابواردن و پێکەنین دەگێڕنەوە.

## قسەخۆش: عیسا دەلان

یەکێک لە پیاوە قسە خۆشەکانی ناوچەی ئاکرێ، کە ناوبانگی بەوێژەران و، قسەی نەستەق دەرچووە و، دەنگوباس و چیرۆک و گاڵتەوگەپی هەتا ئێستاکەیش لە ناوچەکەدا دەگێڕێتەوە: ناوی (عیسا دەلان)ە. ئەم پیاوە یەکێک بووە لە دانیشتوانی گوندی (دەلان) کە لەلادێی بیرەکەپرە دایە. عیسا بووبووە هاودەمی یەکێک لە فەرماندارەکانی (بادینان)، کە لە جیاتی میرەکانی (ئامێدی) فەرمانداری بەسەر ناوچەی ئاکرێدا دەکرد. (عیسا دەلان)، لە شێوەیەکی سەیردا، ژنێکی زیرەکی تێگەیشتووی وێژەوانی قسە خۆشی وەک خۆی مارە کرد. وا ڕێککەوت، لە پێش ژنهێنانەکەیدا، عیسا لەگەڵ باوکی ژنەکەیدا بەسەر شاخێکدا هەڵدەگەڕێن. لە باوکی ژنەکە دەپرسێ: مامە هەتا دەتوانین ئەم ڕێگایە ببڕین تۆ من هەڵدەگریت و دەمخەیتە سەر شانت، یان من تۆ هەڵبگرم و بتخەمە سەر شانم؟... باوکی ژنی دوا ڕۆژیشی وەرامی دەداتەوە دەڵێ: «ئەمە لە هۆشەوە دوورە کە من بتوانم تۆ بخەمە سەر شانم و بەسەر ئەم چیا سەختەدا هەڵبگەڕێم، یاخود تۆ بتوانیت من بخەیتە سەر شانت و بەسەریدا هەڵبگەڕێیت، چونکە هەرکامێکمان بگرێت، بەگران، بەتەنیا پێیدا هەڵدەگەڕێت، ئەی چۆن دەتوانێت یەکێکی تریش بخاتە سەر شانی و پێیدا هەڵبگەڕێت؟!» عیسایش دەستی کرد بەپێکەنین و بێ دەنگ بوو، کە گەیشتنە ناو گوند هەریەکەیان بۆ جێی خۆی جیابووەوە. عیسا کە ڕێبواربوو چووە مزگەوت. پیاوە پیرەکەیش چووە ماڵی خۆی. کە گفتوگۆی بۆ کچەکەی خۆی گێڕایەوە، کچەکە پێکەنی و بەباوکی گوت: «بابە! وا دیارە ئەو پیاوەی لە ڕێگادا لەگەڵتدا بووە، وێژەوانێکی قسە خۆش بووە. ئەو کە ئەو قسەیەی کردووە، مەبەسی ئەوە نەبووە، کە تۆ لەشی ئەو بخەیتە سەر شانت و هەڵی بگریت، یاخود ئەو لەشی تۆ بخاتە سەر شانی و هەڵت بگرێت. مەبەسی ئەوە بووە کە تۆ و ئەو قسەی خۆش و، قسەی نەستەق و، گاڵتەوگەپ و، چیرۆکی ناوازە و سەیر، لە ڕێگادا بۆیەکتر بگێڕنەوە و خۆتانی پێوە خەریک بکەن، تا ماندوویتی ڕێگاتان لەبیر بچێتەوە و بەئاسانی سەربکەونە سەر بڕیەی شاخەکە. کەواتە تکات لێ دەکەم بچۆ بانگی بکە بۆ ماڵەوە، تا بتوانین میوانداری بکەین، بۆ ئەمەی تیرێی بکەینە سەر وێژە و قسە خۆشەکەی. کە باوکیشی چوو بەدوای (عیسا دەلان)دا و هێنایە ماڵەوە، باوک و کچ هەردووکیان میوانداریییەکی جوانیان کرد. ئینجا لە ناوەند (عیسا دەلان) و (کچەکە)دا گەلێک گاڵتەوگەپ و قسەی نەستەق و قسەی خۆش هاتوچۆیان کرد، زۆری پێ نەچوو ئەنجام بەوە گەیشت کە هەردووکیان بوون بەژن و مێردێکی کامەران!... هەتا ئێستاکەیش گاڵتەوگەپ و قسەی نەستەق و قسەی خۆشی ئەو ژن و مێردە لەگەڵ فەرمانداری ئەوسای ناوچەی ئاکرێدا و، لەگەڵ کەسانی تردا، لە کۆڕە تایبەتییەکانی ناوچەکەدا بەدانسقە دەگێڕرێتەوە.

## لاسایی کەرەوەی پێکەنین هێنەر: دەروێش خەمۆ

لە کانگای نەتەوەوە و، یەکێک لەوانەی دەتوانن ئازار و ئاواتی نەتەوەی کورد بەتەواوەتی دەربڕن، لە شێوەی چیرۆکی لاسایی کردنەوەی وێژەیی و پێکەنین هێنەر و کورتدا، بەراستی و دروستییەکی تەواوەوە، پیاوێکی نەخوێندەواری کورتەبنەی لەش بچووک و، دڵ وریا و، دڵ ناسک و، خۆش وەرام و، روو بەپێکەنین و، سەربەرز و، هەست پیرۆز هەیە ناوی (دەروێش خەمۆ)یە، کە بریتییە لە جووتیارێکی وێژەوان و، پێنەچییەکی پیشەزان. (دەروێش خەمۆ) لە دانیشتووانی شاری ئاکرێیە. بەڵام جار جار ئەم گوند و ئەو گوند دەکات بۆ نان پەیداکردن. چاکەی ئەو سەرەک هۆزانەیشی لەبەرچاوە، کە لە منداڵیدا رێزیان لێ گرتووە و چاودێرییان کردووە. هەموو دەم بەهەژار دادەنرێ. بەڵام چیرۆکە پێکەنین هێنەرەکانی خۆی نەکردووە بەهۆیەک بۆ پارە دەستکەوتن. ئەوەندە هەیە گیان سووکە، حەز دەکات دۆست و ناسیاوە خۆشەویستەکانی خۆی، لە کۆڕەکانیاندا، بەلاسایی کردنەوە پێکەنین هێنەرەکانی خۆی دڵخۆش بکات، بێ ئەمەی داوای سوپاسێک یاخود پاداشتێکیان لێ بکا.

بێجگە لەوە زۆربەی چیرۆک و بەیتەکانی کوردی لەبەرە، کە پڕن لە وێژە و مێژوو و، دڵداری و، گۆرانی و، هەرچەند لە کۆڕەکاندا داوای لێ بکەن، بۆیان دەگێڕێتەوە. جاری وا هەیە بەگۆرانیشەوە بۆیان دەگێڕێتەوە. لاسایی کردنەوە هەرە گرنگەکانی، بەوردییەکەوە، لەو کەسانە دەدوێن کە خراپەکاریان لە دڵ و دەروونی کردووە. ئەویش بەتوانج و پلار و تیز پێکردنێکی پێکەنین هێنەر و کاریگەرەوە لاساییان دەکاتەوە. مەبەسیشی لە ڕەخنە لێ گرتنی ئەو کەسانە ئەوەیە، واز لە خراپەی خۆیان بهێنن و، روو بکەنە کردەوە و ڕەوشتی بەرز و پیرۆزی تەواو. ئەو بابەتانەیش کە لێیان دەدوێ، هەرە گرنگەکانیان ئەمانەن: (چاوبرسێتی، پوولپەرستی، توندوتیژی، بەرتیل خواردن، زۆرداری، لووت بەرزی، بەچاوی سووکەوە سەیرکردن، رێزنەگرتنی ئاوارە و نەناسیاو و، رێبوار، ترس و لەرز، ڕەگەزپەرستی، پەیوەندی خاوەن زەوییەکان بەسەر کارەکان و، بەهۆزەکانەوە، چەنابازی، تێ نەگەیشتوویی و نەخوێندەواری و خۆهەڵکێشان...) (دەروێش خەمۆ)، لاسایی کردنەوەکانی هەر خۆی بەتەنیا دەیانکات. دەم و چاوی خۆی ناگۆڕێ. هەروەها جلوبەرگ و چاوئەندازەیش ناگۆڕێ. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەوەندە هونەرمەندە، ئەو کەسەیش دەیەوێ لاسایی بکاتەوە، کارێکی وا دەکات، بەتەواوەتی بێتە بەرچاوت. هەروەها بیروباوەڕی ئەو کەسیش لەگەڵ ئامانجەکانیت بەتەواوەتی بۆ دەردەبڕێ و دەردەخات. تۆیش چارەت نامێنێ دەدەیتە قاقای پێکەنین. هەروەها سەریشت سوڕدەمێنێ کە (دەروێش خەمۆ) دەبینین ئەمەندە بلیمەت و شارەزایە لە پێشاندانی کارەسات و، نواندنی کەسایەتییەکاندا، لەگەڵ دەربڕینی ئەو بیروباوەڕە بەرز و پیرۆزانەیشدا کە کردوونی بەئامانجی خۆی.

جا ئەگەر (دەروێش خەمۆ)یش وەک (بەرناردشۆ) بۆی بلوایە خوێندن و رۆشنبیری تازەی دەست بکەوێ و، لە خاکێکی پێشکەوتووی وەک (بەریتانیا)دا بژی، لە هونەرەکەی خۆیدا لەو وێژەوانە گەورەیە کەمتر نەدەبوو. چونکە لە ڕاستیدا (دەروێش خەمۆ)، لە رووی بیروباوەڕ و کاکڵی

هونەرەکەیەوە، لەگەڵ (بەرناردشۆ)دا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە[1].

بەڵام لە رووی زانایی و، رۆشنبیری و، شێوەی دەربڕین و، ناوچە و، دەوروبەرەوە، زۆر جیاوازە. ئەگەر لەم مەیدانەیشدا رەخنەگرتن بگونجێ، ئەوە دەڵێم: «کە ئەگەر (دەروێش خەمۆ) وازی لەناوبردنی ئەو کەسانە بهێنایە کە لاسایییان دەکاتەوە، هونەرەکەی بەرزتر و پیرۆز دەبوو. هەروەها خۆیشی و هاوڕێکانیشی لە گەڕوگێچەڵێکی زۆر ڕزگاریان دەبوو!!».

جا (دەروێش خەمۆ) هەرچۆنێک بێ، ئەو لە راستیدا بە(وێژەوان) دادەنرێ و، بۆ کەڵک و چاکەی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی تێ دەکۆشێ. چونکە ئەو ژیانەکەیان هەڵدەسەنگێنێ و، چاکی و خراپییان دەردەخات و، بۆ ئەو بیروباوەڕە بەرزانەیش ئاراستەیان دەکات کە پێویستە پێی بگەن.

## رۆشنبیریی ناوچەی ئاکرێ

### رێژەی خوێندەواران

ژمێرکارییەکی ورد و پوختم لەم بابەتەوە دەست نەکەوت. بەڵام کە لە کەسانی شارەزا و ئاگادارم پرسی، گوتیان: ژمارەی خوێندەواران لە ناوچەی ئاکرێدا بەم جۆرە دێتە بەرچاو:

| ناوی لادێ | ژمارە سەر | ژمارەی خوێندەواران |
|---|---|---|
| بیرەکەپرە | ٨٨٥٥ | ٥٠ |
| سورچی | ١٠٦٣٠ | ٨٠ (لەگەڵ هەرکییە و کۆچەرەکاندا) |
| (عشائر السبعە) | ١٠٣٣٣ | ١٢٠ |
| شاری ئاکرێ | ٥٠٠٠ | ١٢٥٠ |
| کۆی | ٣٤٨١٨ | ١٥٠٠ |

کەواتە رێژەی نەخوێندەواری لە بنکەی ناوچەکەدا دەگاتە ٧٥٪. لە ناوچەکەیشدا بەگشتی دەگاتە نزیکەی ٩٦٪!...

### خوێندنگاکانی میری ئێستا

١- ئێستاکە لە شاری ئاکرێدا یەک خوێندنگای کورانی تەواو هەیە کە شەش پۆلی تێدایە لەگەڵ هەشت مامۆستا و (٢٦٠) شاگرددا. زۆرتر بیر بۆ ئەوە دەچێ کە لە ساڵی ١٩٠٨دا کرابێتەوە، لە سەردەمی

---

(١) جۆرج برنادشۆ: ١٨٥٦ - ١٨٥٠، رۆمان و شانۆنووسێکی ئێرلەندی بوو، لە (دبلن) لەدایکبووە، بەقۆشمەیی و رەشبینی ناوی دەرکردبوو. لە بەرهەمەکانی: پیاوی چارەنووس، قوتابی شەیتان چەک و پیاو. لە ١٩٢٥دا پاداشتی نۆبڵی لە ئەدەبدا دەستخست، یەکێکە لە فەیلەسوفە دەگمەنەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست.

فەرمانڕەوایی عوسمانیدا. ژمێرکاریی میری ئەوە دەر دەخات کە لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٢٢) و (١٩٥١)دا ژمارە سەری ئەوانەی لە شاگردان ناویان تۆمار کراوە دەگاتە (٩٢٩) شاگرد. لەو ماوەیەدا (١٤٠) شاگردیان لەم خوێندنگایە دەرچوون. زۆربەی ئەو شاگردانە ئێستا کار و پیشەی ئازادیان هەیە. چەند شاگردێکیشیان توانیمیان خوێندنی بالایان تەواو بکەن. یەکێکیان بوو بەپزیشک و چواریشیان بوون بەئەفسەر و، نۆ شاگردیشیان بوون بەمامۆستا. دوانیشیان لە خوێندنگای ئامادەیی دەرچوون و، یەکێکیشیان لە خوێندنگای پیشەسازی شاگردێکیان لە زانستگای ماف دەخوێنێ و، یەکێکیان لە زانستگای ئەندازە و، پێنج شاگردیان لە خانووی مامۆستایانی لادێ[1] و، یەکێکیان لە زانستگای کشتوکاڵ و، یەکێکیش لە زانستگای پیشەسازی لە شاری (لەندەن)دا دەخوێنێ.

٢- هەروەها لە شاری ئاکرێدا خوێندنگایەکی کچان هەیە کە بریتییە لە پێنج پۆل و سێ مامۆستای ئافرەت و، پەنجا شاگرد. لە ساڵی ١٩٣٦دا دامەزراوە.

٣- لە گوندی (بەردەڕەشی گەورە)دا کە بنکەی لادێی (عشائر السبعە) بەخوێندنگایەکی سەرەتایی هەیە کە شەش پۆل و دوو مامۆستا و (٣٢) شاگردی تێدایە. لە ساڵی ١٩٣٦دا (بۆ دووەم جار) دامەزراوەتەوە.

٤- لە گوندی (زەنگەنان)یشدا کە لە لادێی (عشائر السبعە) دایە، خوێندنگایەکی سەرەتایی شەش پۆلی هەیە دوو مامۆستا و (٣٠) شاگردی تێدایە. لە ساڵی ١٩٤٣دا دامەزراوە.

٥- لە گوندی (هۆکی)یشدا کە لە لادێی بیرەکەپرە دایە خوێندنگایەکی سەرەتایی هەیە کە تەنیا یەک پۆلی تێدایە و مامۆستایەک و (٣٠) شاگرد. لە ساڵی ١٩٥٠دا دامەزراوە.

## ئەو خوێندنگا میرییانەی داخراون

١- خوێندنگایەکی سەرەتایی لە دێی (شۆش)دا، لە لادێی سورچیدا لە ساڵی ١٩٤٣دا دامەزرابوو، لە ساڵی ١٩٤٨دا داخرابوو.

٢- خوێندنگایەکی سەرەتایی لە دێی (بجیل)، بنکەی لادێی سورچیدا، لە ساڵی ١٩٣٦دا دامەزرابوو، لە ساڵی ١٩٤٥دا داخرابوو.

٣- خوێندنگایەکی سەرەتایی لەناو هۆزی هەرکی کۆچەردا لە ساڵی ١٩٣٧دا دامەزرابوو، لە ساڵی ١٩٣٨دا داخرابوو.

٤- خوێندنگایەکی سەرەتایی لە دێی (دارەتوو)ی لادێی (عشائر السبعە)دا، لە ساڵی ١٩٣٦دا دامەزرابوو، لە ساڵی ١٩٤٤دا داخرابوو.

٥- خوێندنگایەکی سەرەتایی لە دێی (بیرەکەپرە)ی لادێی بیرەکەپرەدا لە ساڵی ١٩٢٥دا دامەزرابوو، لە ساڵی ١٩٤٥دا داخرابوو.

---

(١) دار المعلمين الريفية.

٦- خوێندنگایەکی ناوخۆیی (داخلی) بۆ بێ باوکان لە شاری ئاکرێدا، لە ساڵی ١٩٢٤دا کرابووەوە، لە ساڵی ١٩٢٥دا داخرابوو.

بەم پێیە ڕێژەی خوێندنگا داخراوەکان بۆ کۆمەڵەی خوێندنگا دامەزراوەکان دەگاتە (١١:٦)، واتا زۆرتر لە نیوەی ژمارەی خوێندنگاکان داخراون.

## نەهێشتنی نەخوێندەواری

لەناو هەموو تەمەنە درێژەکەی ناوچەی ئاکرێدا، بۆ یەکەم جار دوو پۆل بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری، لە ساڵی ١٩٤٦دا کرابووەوە. بەڵام لە پاش پێنج مانگ هەردوو پۆلەکە داخرابوون!.

لە ساڵی (١٩٥٠)یشدا، لە پشووی هاوینەدا، دوو پۆل، لەسەر خواستی جێنشینی ئاکرێ، لەلایەن سێ مامۆستاوە، بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری کرانەوە. مامۆستاکان لە ڕووی نیشتمانپەروەرییانەوە بەخۆڕایی وانەیان تێدا دەگوتەوە. کە لە پایزدا خوێندنگاکان کرانەوە، هەردوو پۆلەکە داخران. بەڵام بۆ جاری دووەم لە بڕانەوەی مانگی بەفرانبار (کانوونی یەکەم)ی ساڵی (١٩٥٠)دا، لەلایەن ئەو سێ مامۆستایانە خۆیانەوە، کرانەوە... (کارگێڕی زانستی) کە دەسگاکەی لە شاری (مووسڵ) دابوو، بڕیاری بۆ مامۆستاکاندا هەندێ پاداشتیان بداتێ بەناوی ئافەرینەوە.

## خوێندنگا ئایینییەکان

هەتا پەنجا ساڵێکیش لەمەوپێش تێکڕا لە هەموو گوندێکی ناوچەی ئاکرێدا مزگەوتێک هەبوو، لەسەر ئەرکی دانیشتوانی گوندەکە، پێشنوێژ (إمام)ێک کاروباری هەڵدەسووڕاند، ئامۆژگاریی ئایینیشی دەکرد و، منداڵانیشی فێری خوێندنەوە و نووسین دەکرد. بەڵام ڕۆژگار وای هێنا ئەو مزگەوت و خوێندنگا ئایینییانە بەرە بەرە لێیان کەم بووەوە، تا گەیشتنە ڕادەیەکی وەها کە لە شاری ئاکرێدا تەنیا سێ خوێندنگای ئایینی ماونەتەوە. لەم گوندانەیشدا هەر یەکەیان خوێندنگایەکی ئایینی ماوەتەوە: (باشقال ئاغا، هۆکی، هەرن، چاربۆت، بەردەڕەشی گەورە و شۆش). ئەمانە پەیوەندییان بەموسڵمانەکانەوە هەبوو. هەرچی مەسیحییەکانن تەنیا خوێندنگایەکی ئایینییان هەیە ئەویش لە شاری ئاکرێ دایە.

### هۆی داخستنی خوێندنگاکان

من لەو باوەڕە دام کە هۆی داخستنی ئەم خوێندنگایانە سیانە:

١- خوێندنگاکان لەگەڵ باری لادێییە هەژارەکاندا ناسازێن. چونکە ئەوان پێویستییان بەکوڕەکانیان هەیە بۆ یاریدەدانیان لە کار و فەرمانی ڕۆژانەیاندا.

٢- زۆربەی مامۆستاکان لە لاوانی شارەکانن کە ناتوانن لەناو ئەم گوندە دوورانەدا بژین، کە بەش براون لە شارستانێتی و ئاوەدانی و لە زۆر ڕوویشەوە بەدڵیان نین. لەبەر ئەوە ئارەزوو و، هێز و هەڕەتی تەواویان نییە ژمارەی شاگردەکانی خوێندنگاکانیان زۆر بکەن، یاخود هەر هیچ نەبێ وەک خۆیان بیانهێڵنەوە!...

٣- کارگێڕیی ناوخۆ، یاخود کارگێڕیی زانست، پەلەیان کردووە لە داخستنیاندا، بێ ئەمەی هەوڵێک بدەن چارەسەرێکی گیروگرفتەکانیان بکەن.

## چارەکردنی ئەم بارە

جا بەم پێیە چارە هەر ئەوەیە کە خوێندنگایانی ئەم جۆرە گوندانە بێجگە لە بنکەکانی لادێییەکان بکرێن بەخوێندنگایانی ئێواران. تەنانەت ئەگەر بکرێن بەخوێندنگایانی نەهێشتنی نەخوێندەواریش گەلێک چاکترە!... هەروەها دەبێ مامۆستاکانیش لە مامۆستایانی خۆجێ هەڵ ببژێررێن. جا ئەگەر لەو جۆرە مامۆستایانە دەست نەکەوتن، بام لە مامۆستا ئایینییەکان هەڵ ببژێررێن. چونکە ئەوانە لەبەر دەستکورتی و هەژارییان بەمانگانەیەکی کەمیش بێ ئەو فەرمانە بەجێ دەهێنن، بام لەچاو مانگانەی مامۆستاکانی تریشدا یەجگار کەم بێ!... چونکە ئەو پیاوە ئایینییانە، لە پاش ئەوەی چەند مانگێک لە خوێندنگایەکی تایبەتیدا خوێندیان و فێری شێوەی پێ خوێندنی تازە باپەت بوون، لە تواناییاندا هەیە، فەرمانەکانی پێ خوێندن و پەروەردەکردن، لە مەیدانی بەرەنگاریی کردنی نەخوێندەواریدا، باشتر لە مامۆستا تازە پێگەیشتووەکانی میری بەجێ بهێنن. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە لادێییەکان لەبەر پیشە ئایینییەکانیان رێزێکی زۆریان لێ دەگرن. بێجگە لەوە ئەو مەلایانە، لەبەر ئەوەی لەم جۆرە گوندانەدا بەسەختی ژیانەوە راهاتوون ئەو مامۆستاییەیان بەئاسانی بۆ رادەپەڕێنرێ. ئەمەیش پێویستە بڵێین، کە لە هەر گوندێکدا خوێندنگایەک کرایەوە، پێویستە (یاسای خوێندنی بەزۆر)ی تێدا بەکاربهێنرێ. چونکە دڵ و دەروونی گوندییەکان وەهایە، دەبێ بۆ ماوەیەک، تا رادێن بەخوێندنەکەوە، توندوتیژییان لەگەڵدا بنوێنرێ، ئەگینا پێ خوێندنەکە سەرناگرێ. من خۆیشم لە چەند ناوچەیەک ئەم جۆرە کردارەم تاقی کردەوە، تا ئەندازەیەکی گەورە تێیدا سەرکەوتم. بێجگە لەوە پاداشت دان بەشاگردە باشەکان، یاخود دیاری هێنان بۆ هەموو شاگردەکان، چەند هۆیەکی ترن بۆ تیژکردنی شاگردەکان بۆ سەر خوێندن.

## دانیشتوانی ناوچەکە حەز لە خوێندەواری دەکەن

ئەو کەسەی دەڵێ لادێییەکان حەز لە خوێندن ناکەن بەهەڵەدا دەچێ. منیش بۆیەکا ئەو هەموو ژمێرکارییانەم لە بابەت خوێندنگاکانەوە پێشاندا تا ئەوە بخەمە دڵی هەموانەوە کە گوندییەکان بەدانیشتوانی شاری ئاکرێیشەوە هەرچەند هەلێکیان بۆ هەڵکەوتبێ، بەکوڵی دڵەوە چوونەتە بەر خوێندن. بەڵام هەرچەند تەوژمی برسێتی و هەژاری و دەستکورتی کاسی کردبن، ناچاربوون واز لە خوێندنەکەیان بهێنن و خۆیان بکوتن بۆ نان پەیداکردن!... منیش کە ئێستا خەریکی نووسینی ئەم نووسراوەم هێشتا لە یادم دەرنەچووە و لەبەرچاومە کە لە سالی ١٩٥٠دا، زۆر کەس لە کەسایەتییە ناودارەکانی ناوچەی ئاکرێ هاتنە لام و داوای کردنەوەی خوێندنگایان لێ کردم لە گوندەکانیاندا. هەموویان خانوویشیان ئامادە کردبوو، چ بۆ خوێندنگاکان و، چ بۆ مامۆستاکان. (مەحموود ئاغا، شەوکەت ئاغا و سدیق ئاغا) لە زێبارییەکان و، (شێخ رەقیب، شێخ تەقیدین، شێخ سەدرەدین و شێخ کەبیر) لە سورچییەکان، لەو جۆرە پیاوانە بوون. هی وایشیان تێدابوو خۆی ئامادە کردبوو لە گیرفانی

خۆی مانگانەی ئەو لاوە خوێندەوارە بدات کە دێتە گوندەکەی و دەست دەکات بەنەهێشتنی نەخوێندەواری. (شێخ سەدرەدین و شێخ ڕەقیب) لەو جۆرە کەسانە بوون. هەروەها باوکانی زۆرتر لە بیست شاگردی خوێندنگای ئاکرێ هاتنە لام و بەڵێنیشیان دا کە هەر ساڵە لە دە دینار کەمتر نەدەن لە جیاتی هەر شاگردێک کە لە خوێندنگایەکی ناوەندیی ئێوارانـدا بخوێنێ، بەڵام بەمەرجێ فەرمانڕەوایی خوێندنگایەکی ناوەندی لە شاری ئاکرێدا بکاتەوە.

هیچ بەڵگەیەکیش لەوە گەورەتر نییە بۆ ئەوەی کە هۆزەکانی ناوچەی ئاکرێ لە کانگای دڵەوە حەز لە خوێندن دەکەن، کە (ئەحمەد ئاغای زێباری)، کە خوێندنگایەک لە گوندەکەیدا (هۆکی)، کرایەوە نەیهێشت مامۆستای خوێندنگاکە بۆ خواردن و نووستنی خۆی پارەی لە دەست بچێ، کردی بەمیوانی خۆی، هەتا ئێستاکەیش وەک یەکێک لە خێزانی خۆی تەماشای دەکات و بەکەڵکی دێت. ئەویش هەر بۆ ئەمەی هەموو هێز و توانایی خۆی تەرخان بکات بۆ پێگەیاندنی منداڵانی گوندەکەی!. جا ئەگەر هەژاری و دەستکورتی بەربەستی گوندییەکانیان نەکردایە لە خوێندن، ژمارەی ئەو شاگردانەی لە خوێندنگا باڵاکاندا چوونە بەر خوێندن، لە دەیەکی ژمارەی دەرچووانی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ کەمتر نەدەبوو!

### فەرمانی سەرشانی کاربەدەستی زانست

جا لەبەر ئەوە هیوا وا دەکرێ کە کاربەدەستان تەماشای ئەم جۆرە بابەتانە بەکوڵی دڵەوە بکەن. زوو بەزوویش دەست بکەن بەلێکۆڵینەوە لە بابەت هۆی سەرکەوتنی ئەو خوێندنگایانەوە کە دەیانەوێ لەم ناوچەیەدا بیانکەنەوە. هەروەها بەپێی ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانە باری ئێستای خوێندنگاکان چارەسەر بکەن. چونکەی باری ئێستای خوێندن لە ناوچەی ئاکرێدا زۆر خراپە، پیاو دڵتەنگ دەکات. باشیش نییە بەرەڵلا بکرێ، یاخود وازی لێ بهێنرێ. چارەسەرکردنی ئەم بارەیش خەم خواردنێکی گەورە و زووی دەوێ. جا ئەگەر ئەمە پێک نەیێت، دەبێ ئەو خوێندنگایانە بەکەڵکی چی بێن، کە لەگەڵ باری نەتەوەکەیدا نەسازێن، کە پێیانەوە ڕانەهاتووە؟!.

## هۆی دواکەوتنی ناوچەی ئاکرێ و چارەسەرکردنی

### ڕووەکانی دواکەوتن

ڕووەکانی دواکەوتنی ناوچەی ئاکرێ لەم سێ شتەیدا بەدی دەکرێن: (هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی). ئەم سێ دەردەیش لەوەوە پەیدا بوون کە فەرمانڕەواییەکانی پێشوو فەرمانی سەرشانی خۆیان بەجێ نەهێناوە بەرامبەر بەدانیشتوانی ناوچەکە. هەروەها لەوەیشەوە پەیدابوون کە لە ناوەند فەرمانڕەوایی و دانیشتوانی ناوچەکەدا (یارمەتیدان) و (لەیەکگەیشتن)، بۆ چارەسەرکردنی تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفتەکانی ناوچەکە و، بەجێ هێنانی پێویستییەکانی ناوچەکە، لە ئارادا نەبوون. ئەنجامی ئەم بارانەیش بەوە گەیشتووە کە بەرەڵلایی و ئاژاوە و زۆروستەم و کاوول بوون، لەناو ناوچەکەدا پەیدابوون تا ناوچەکەیان گەیاندووەتە ئەم دواکەوتنە بێ ئەندازەیە.

### هۆی هەژاری

هەرچی هەژارییە، هۆیەکانی ئەوەتان کە ڕێگای ئۆتۆمبیل لە ناوەند زۆربەی گوندەکان و بنکەکانی شارستانی و ئاوەدانیدا نییە. نە دەسگا و، نە ئامێری کشتوکاڵ و، نە هی پیشەسازی پیشکەوتووانە لە ئارادا نین، تا دەستگیرۆیی جووتیار و پیشەساز و کرێکاران بکەن و، ڕێگای فەرمانکردنێکی پیشکەوتووانەیان پیشان بدەن و، بەپارە و، بەتۆو و بەئامێر و مەکینە یارمەتیان بدەن، بەمەبەسی زۆرکردنی بەرهەم و، گەشەپێکردنی و، دابەشکردنی و فرۆشتنی لەسەر دەستووری دادپەروەریی کۆمەلایەتی.

### هۆی نەخوێندەواری

هەرچی نەخوێندەوارییە هۆیەکانی بریتین لە کەمی (خوێندنگایان) و (پەیمانگایانی زانیاری) و (خوێندنگایانی نەهێشتنی نەخوێندەواری) لە ناوچەکەدا، تا بتوانن دانیشتووانی ناوچەکە بۆ ژیانێکی پاک و پیرۆز و بلند ئاراستە بکەن.

### هۆی نەخۆشی

هەرچی نەخۆشیشە، هۆیەکانی بریتین لە کەمی ڕێکخراوان و دامەزراوانی تەندروستی، بۆ نەهێشتنی نەخۆشی و، خۆپاراستن لە نەخۆشی، یاخود بۆ ئاراستەکردنی دانیشتووانی ناوچەکە بۆ ژیانێکی تەندروستانەی پاک و پوختە کە شایستەی دلتەریی بێت.

## چارەسەرکردنی دواکەوتوویی

یەک و دووی پێ ناوێ، فەرمانڕەوایی ئێستا[1]، لە هەموو فەرمانڕەواییەکانی پێش خۆی زۆرتر بایەخی بەکاروباری ئەم ناوچەیە داوە و، چاودێریی کردووە. دوور نییە بیانووشی هەبێ، کە نەیتوانیوە لەمە زۆرتر کاروباری ناوچەی ئاکرێ بەرەو چاکی بەرێوە ببات. بەلام داخەکەم ئەو چاکەکارییانەی کراون، لەچاو پێویستییە جۆر بەجۆرەکانی ناوچەکەدا بەکەم دادەنرێن!... کەواتە پێویستە فەرمانڕەوایی خەمی ئەم لایەنە بخوات و بایەخێکی تەواویشی پێ بدات. هەروەها لەسەر دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێیش پێویستە کۆمەکی و یارمەتییەکی تەواوی فەرمانڕەوایی بدەن لە پرۆژەکانیدا کە بۆ کەلک و چاکەی ناوچەکەمان دایەزراندوون. لە پێش هەموو شتێکدا ناوچەی ئاکرێ پێویستی بەزۆرکردنی خوێندنگاکانی هەیە، کە دەبێ بەپێی پێویستییە جۆر بەجۆرەکانی بکرێنەوە. بەتایبەتی ئەو خوێندنگایانەی بەرەنگاریی نەخوێندەواری دەکەن. هەروەها کردنەوەی خوێندنگایەکی ناوەندیش لە پێویستییەکانی ناوچەی ئاکرێیە یەکێک لەو کار و فەرمانەیش کە پێویستە بکرێن، بەستنی بنکەی ناوچەکەیە بەبنکەی لادێکانەوە، بەرێگای قیرتاوکراو کە بۆ ئۆتۆمبیل لێ خورین بەکاربێت. ئەویش بەمەبەسی ئاسانکردنی بازرگانی و هاتوچۆ و خۆشکردنی گوزەرانی بەکرێیەکی کەم بدرێ بەجووتیاران بۆ ئەمەی لە دەست کرینی ئامێر و

---

(١) مەبەستی دەسەلاتی حوکمەتەکەی عیراقی ١٩٥٠ - ١٩٥١.

گیانلەبەران کە بۆ کێڵان بەکاردەهێنرێن، یاخود کرێکاران کە بۆ دروێنە کاریان پێ دەکرێ، رزگاریان بێ و، کاتێکی باشیشیان بۆ کۆببێتەوە بۆ بەرهەم زۆرکردن و خەمخۆری بۆ خۆیان. هەروەها چەند کێڵگەیەکی کشتوکاڵ و گیانلەبەران دابمەزرێنرێ بۆ ئاراستەکردنی جووتیارەکان و خاوەن کشتوکاڵەکان بۆ بەکارهێنانی شێوەی کشتوکاڵی نوێ و پەروەردەکردنی نوێی گیانلەبەران و پەلەوەران و ماسی، کە هەنگ و کرمی ئاوریشم دەگرنەوە. نابێ ئەوەیشمان لەبیربچێ کە چەند کارگەیەکیش پێویستن بۆ ناوچەی ئاکرێ بۆ دروستکردنی پەنیر و ماست و، کەرە و، سەرتوێ و، شیرێژ و، فرۆ و، رۆنە جۆربەجۆرەکان و، دۆشاو و، خۆشاو و، ترشیات و، وشکەمیوە، بەمەرجێ لەسەر شێوەی پیشەسازی نوێ بخرێنە ناو پاکەت و سندووق و شووشە و قوتووەوە. هەروەها بڕیاریش بدرێت شاری ئاکرێ بکرێ بەهاوینەهەوارێکی شەنگ و ناوازە و، لەلایەن فەرمانڕەواییەوە هەرچی دەسگا و، دوکان و، میوانخانە و، باخچە و سەیرانگا و بازاڕ و، سینەما و، بەزمگاە[1] و، نووسراوخانەی گشتی و، هۆڵی کۆبوونەوە و، ڕێگای قیرتاوکراو و، زێرابی سەرگیراوێکی پێویست بێ، بۆ ڕازانەوە و، ڕێکخستنی جێبەجێ بکرێ.

هەندێک لەو پرۆژانەیش ئەوەیە نەخۆشخانەکان زۆر بکرێن و، بەرەنگاری کردنی نەخۆشییە نیشتەجێکانیش بخرێتە شێوەیەکی هەمور دەمییەوە، کە نەخۆشی لەرزوتا لەسەروو هەموویانەوەیە. هەروەها خەستەخانەیەکی گەورەیش لە شاری ئاکرێدا دروست بکرێ، کە لەگەڵ پێویستی ناوچەکەدا ڕێککەوێ. هیچ بەڵگەیەکیش لەوە گەورەتر نییە بۆ پێویستی دەسگایانی تەندروستی بەناوچەی ئاکرێ، کە (مەحموود ئاغا) و (سدیق ئاغا)ی زێباری و (شێخ سەدرەدین)ی سورچی، هەریەکەیان چەند جارێک داوای کردنەوەی نەخۆشخانەیەکی کردووە لە گوندەکەی خۆیدا و، بەڵێنیشی داوە کە هەر ساختمانێکی پێویست بێ لەسەر ئەرکی خۆی بۆی ئامادە بکات.

هەرچی (دادپەروەریی کۆمەڵایەتی)یە، لەمەوپێش دوور و درێژ لێی دوواوم پێویست ناکات دووبارەی بکەمەوە.

ئەمانەی لێرەدا لێیان دووام بریتی بوون لە باری تایبەتی ناوچەی ئاکرێ. هەندێک باری گشتی هەن، نەمویست ناویان بەرم، چونکە ناوچەی ئاکرێ و ناوچەکانی تری کوردەواری تێیدا هاوبەشن. داواکردنی چارەسەرکردنی ئەوانە، دەبێ بەگشتی بێ بۆ هەموو لایەکی کوردەواری.

## کاربەدەستانی تازە کەوتوونەتە گەڕ

خۆشبەختانە کاربەدەستانی ئێستا دەستیان کردووە بەڕاستکردنەوەی هەڵەکانی فەرمانڕەواییەکانی پێشوو، خەریکن باری خاکەکە چاک دەکەن. هەر لە ئێستایشەوە دەستیان بەچاکەکاری[2] کردووە.

ناوچەی ئاکرێیش لەو جۆرە ئاواکردنەوە و ڕاستکردنەوە و چاکەکارییانە هەندێکیان پێ برا. دەستکرا بەکردنەوەی دوو ڕێگا: (ئاکرێ - بجێل) و، (شێوەرێ - بەردەڕەشی گەورە). هەروەها دەست کرا

---

(١) بەزمگا: شاری یاری (مدينة الألعاب).

(٢) چاکەکاری: چاکسازی (إصلاحات).

بەداپۆشینی ژێرابەکانی ئاکرێ و، فراوانکردنی پرۆژەی ئاوی ئاکرێ. کارگێڕیی ناوخۆ تا ئێستا (١٨٠٠) دیناری تێدا بەخت کردوون، هەروەها دەسگای کار و فەرمانیش ئەوەندەی تێدا بەخت کردوون. نامەکارییش لە ئارادایە بۆ کردنەوەی ڕێگای (ئاکرێ - بیرەکەپرە) و، تەواوکردنی ئەو کار و فەرمانانە و، ئەو پێویستییانەی لەمەوپێش ناویان برا. هیوایش وا دەکرێ کە فەرمانڕەوایی بڕیار لەسەریان بدات کە جێبەجێ بکرێن. ئەو کار و فەرمانانەی ئێستا لە ئارادان بۆ کەڵک و چاکەی ناوچەی ئاکرێ، هەرچەندە لەچاو پێویستییەکانیدا بەزۆر کەم دادەنرێن، بەڵام من دڵم ڕۆشنایی تێ کەوتووە، کە بزووتنەوەی ئاوەدانی و شارستانی لە ئارادایە. لە خودای پاکی بێ هاوتایشم دەوێ، یارمەتی پیاوانی چاکەخواز بدات لە تەواوکردنی پێویستییەکانی ناوچەی ئاکرێدا، بۆ ئەمەی ئەنجامی ئەو کردەوە و کارانە بەچاکە بگەڕێن بۆ هەردوولا: بۆ نەتەوەیش و بۆ فەرمانڕەواییش.

## پاشکۆ

### بیروباوەڕی ڕۆشنبیران دەربارەی نووسراوی ئاکرێ

لەلایەن پێشکەوتنخوازان و نیشتمانپەروەران و ڕۆشنبیرانی (کورد) و (عەرەب)ەوە، بەتایبەتی خاوەن ڕۆژنامەکانیان، گەلێک پیاوەتی و یارمەتیم دەستکەوت، لە پشتگیریی کردنی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان هەبوو بەپێشکەوتنی ناوچەی ئاکرێوە. وتارەکان و نامەکانی ئەو جۆرە پیاوە بەڕێز و خۆشەویستانەم لە ئاوازەگاهی نووسراودانەکەمدا پاراستووە، هەتا دەمێنم چاکەیانم لەبیر ناچێتەوە و، پڕ بەدڵیش هەمموو دەم سوپاسم کردوون و سوپاسیان دووبارە دەکەمەوە. بەڵام داخەکەم ماوە نەبوو، وتارەکانی هەموویان بنووسم، یاخود تەنانەت ناوی هەموویشیان بنووسم لەم نووسراوەدا. تەنیا ئەوەندەم لەدەست هات بۆ نموونە چەند پارچەیەک لەو وتارانەی کە لە ڕۆژنامەکانی مووسڵ و هەولێر و بەغدادا بلاوکراونەتەوە، لەگەڵ نامەکەی خوداڵێخۆشبوو (دکتۆر ناجی الأصیل)دا لێرەدا پێشکەشی خوێندەوارە بەڕێزەکان بکەم.

لەگەڵ ئەمانەیشدا سوپاسی بێ ئەندازەم بۆ ئەوانەی یارمەتییان دام لە کۆکردنەوەی زانیاریدا کە لە بابەت ناوچەی ئاکرێوە کرا، کە زۆربەیان لە ئەندامانی (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ) بوون، بەفەرمانبەر و کەسانی ترەوە.

مديرية الآثار القديمة العامة

بغداد

العدد: ٢٠٥٨/٢٥/١٤

التأريخ: ١٩٥١/٩/١٦

رئاسة المجمع العلمي العراقي

في أثناء زيارتي الأخيرة الى قضاء عقرة بلواء الموصل أطلعني قائمقامها السيد شاكر فتاح على كتاب له وضعه حديثاً عن (قضاء عقرة) وصف فيه أحوال هذا القضاء وتكلم على تأريخه وجغرافيته واقتصادياته وعاداته وتقاليده وعشائره وأشهر مواضعه معززاً ذلك بالأرقام والأمثلة. فأكبرت في الرجل همته ومبادرته الى تجشم مثل هذا العناء، وتمنيت لو أن زملاءه من رؤساء الوحدات الأدارية يحزون حزوه ويفعلون فعله، إذن لأجتمع من ذلك لدينا ثروة علمية ثمينة ولكان لنا من ذلك كله مصدر عميم النفع. وتراءى لي أن في تشجيع الموما إليه على طبع كتابه نكون قد كافأناه على خدمته وجعلنا منه قدوه طيبة لغيره من زملائه. ولهذا القصد أخذت منه كتابه المذكور الذي أبعثه إليكم للتفضل بعرضه على هيئة المجمع المحترمة لأبداء ما تراه في شأن مساعدة مؤلفه على طبعه. ومما يحسن أن أبينه أن مؤلفه قد افضى لي بأنه سيعيد النظر فيه وينقح لغته ويجيد تنسيقه وترتيبه. هذا الى أن بين موظفي مديريتنا من هو مستعد لمعاونته في العمل وفي كتابه تأريخ العصر من أصوله العلمية وإضافة ما عرف من مواقعها الأثارية الى أبحاثه. فأرجو أن يحقق المجمع هذه الرغبة بتقديم مساعدة مالية كافية الى مؤلفه لينجز طبعه. وتفضلوا بقبول فائق الأحترام.

ناجي الأصيل

المدير العام

المرفقات: مخطوط كتاب (قضاء عقرة) لشاكر فتاح.

صورة منه الى: قائمقام قضاء عقرة: وإشارة الى المحادثة الشفهية حول الموضوع وسنوافيكم بالنتيجة في حينه.

***

بريد الأيام

جهود قائمقام عقرة

تتوارد على إدارة هذه الجريدة سيل من الرسائل من قضاء عقرة وماجاورها كلها ثناء وتقدير وإعجاب على سعادة الأستاذ شاكر فتاح قائمقام قضاء عقرة للجهود التي يبذلها سعاتة في ميدان الأصلاح الأجتماعي والثقافي بين أبناء القضاء المذكور. ويستدل من هذه الرسائل مبلغ تعلق أهالي القضاء بهذا الرجل الفذ الذي يستبان من إجماع الناس مبلغ تمتعه بالخلق الرفيع وشدة تمسكه بما يؤول على القضاء من نتائج حسنة وثمرات طيبة. ونحن في الوقت الذي نكبر هذه الروح الأنسانية التي يتحلى بها سعادته نفخر بأن يكون بين ظهرانينا رجال أفذاذ كسعادته يؤمل فيهم كل خير لبلدنا

الحبيب. ولم تكتفى هذه الجريدة التي آلت على نفسها أن تعكس مرآة أعمال الشخص مهما كانت منزلته بروح مستقيمة دون محاباة أو تزلف. أجل لم تكتفى هذه الجريدة بتقييم هذا الشكر وانما ستعرض للقراء وصفا موجزاً عن هذا القضاء والأعمال التي قام بها سعادته منذ توليه المسؤولية لكي تودع التحكيم الى قرائها الكرام. فالى ذلك العدد نستودعكم الله.

صاحب جريدة الأيام في بغداد
المحامي فريق عقراوي

(من جريدة الأيام - بغداد - العدد: (٤) في ١٤/٤/١٩٥١)

***

«السيد شاكر فتاح قائمقام قضاء عقرة جمع بين الأدارة والأدب. وها هو يرسل لنا فصلاً من مولفه (قضاء عقرة) ننشر تباعاً ليطلع عليه القراء الكرام. ويا حبذا لو حذا حذوه بقية الموظفين الأداريين، فيكتبوا عن مناطقهم ماظهر منها ومابطن، ليطلع عليها المواطنون ويعرفوا عن بلادهم ما خبا عنهم».
-التحرير-

عن (جريدة الأيام - بغداد - العدد: (٥) في ٢١/٤/١٩٥١)

***

«بدأت طلائع الصيف متحفزة، وأخذ الأفراد يفكرون في المصائف التي سيرتا دونها تهرباً من القيظ الغائر. لذلك طلبنا من سعادة الصديق الأستاذ شاكر فتاح قائمقام قضاء عقرة أن يتحفنا بمقال عن المصائف العراقية. فاختار لنا هذا المقال القيم عن مصائف عقرة من كتابه الذي ألجزه حديثاً عن هذا القضاء. والمقال بمجموعة صورة وصفية رائعة للقضاء بأسلوب أدبي فيه سلاسة وطرافة وعذوبة، توفر لقارئه القراءة الماتعة وتشبع رغبته للأستطلاع واننا في الوقت الذي نقدم فيه هذا المقال للقراء، نوجه أنظارهم الى هذا المصيف الجميل. فالصيف على الأبواب».

(صاحب جريدة (المثال) عبدالباسط يونس)

عن جريدة المثال - الموصل - العدد: (٣)، في ١/٤/١٩٥١.

***

... « لوتنقلت في عقرة ونواحيها وجبالها ومسالكها لكان إسم شاكر فتاح يسعى الى سمعك أينما حللت وحيثما نزلت. فلقد ملك زمام الأمور وبسط أجنحة السلام على المناطق التي قلما كانت تتمتع بنعمة الراحة والأستقرار. فهو مؤمن كل الأيمان بعظمة الرسالة التي يعمل لتحقيقها. وهو واثق كل الثقة أن النجاح حليفة مازال العدل رائدة والحقيقة مبتغاه.

هذا شيخ من شيوخ الجبال الشماء كان في زمن مضى لا ينفك عن الثورة وبث الشقاق. إنه يحدثنا بلسان صادق فيه نغمة الأسي على ما أفرط في سبيل هذه الأرض المباركة فهو يقول: «كنت ثائراً، ولكني الآن أمنت بأني كنت على خطأ وبادرت للتكفير عن ما أقترفته نحو بلادي فأبديت رغبتي في

المساهمة بالخدمة العامة. وأنا اعترف أن نصائح القائمقام شاكر فتاح كانت الحافز الأهم في توجيهي نحو هذا الأتجاه الصائب». هذا هو الكلام الذي نطلق به مثير الثورات سابقاً، والمتعطش للأصلاح لاحقاً. فلقد عرف الأستاذ شاكر فتاح السبيل الى قلبه وقادة ال موطن الرشاد»...

- (عن مقال الأستاذ عبدالباسط يونس المنشور في جريدة (الفجر)- في الموصل - العدد: (٤٧) في ١٩٥١/١/١٩.

***

«الأستاذ الأديب السيد شاكر فتاح قائمقام قضاء عقرة من شبابنا المثقف الذي نعتز به ومن اصدقائنا الكرام. وقد كان لنا شرف الأعجاب والأكبار بأدبه وتآليفه في للغه الكردية. ويسرنا أن نقدمه إلى قراء جريدتنا في مقالة القيم عن التعليم والثقافة في قضاء عقرة، هذا القضاء الذي كان من حظه السعيد أن يتولي هذا الشاب الفاضل والأداري الحازم، إدارته إدارة سديدة».

(هيئة التحرير)

- عن (الجريدة -أربيل- الصادرة في أربيل من قبل نقابة المعلمين في أربيل العدد: (٢٢) في ١٩٥٢/٥/١٢).

***

**سەرچاوەی نووسراو**

١- دەسگاكانی میری لە ناوچەی ئاكرێدا.
٢- پرسیاركردنم لە ڕۆشنبیرانی ناوچەی ئاكرێ و زاناكانیان.
٣- گەڕان و بینین و پشكنینی خۆم لە ناوچەی ئاكرێدا.

## پرسە

پرسەگرتن لەم شێوەیەدا کە ئێستا هەیە بریتییە لە خوویەکی ڕزیوی کۆمەڵایەتی. کە پێویستە لە ڕەگ و ڕیشەوە دەری بهێنین!

### پرسەی جاران:

پرسەی جاران ساکار و سادە بوو. کە مردوویەک ئەمرد خزمان نەیان ئەهێشت ماڵە مردووەکە بەچێشت لێنان و ئەرکی پرسەکەوە خەریک ببن و پارە بەخت بکەن. تا حەوت ڕۆژی خشت نانیان بۆ ئەو ماڵە مردووە ئەنارد. ئەگەر لە مزگەوتێکا یاخود لە شوێنێکیشدا بۆ مردووەکە دابنیشتنایە لەهەر ماڵە گەورەیەکی خزمی مردووەکەوە نان و چێشت ئەهێنرایە ئەو جێگا پرسەیە، تا دەرخواردی ئەو کەسانە بدرێ کە بۆ پرسە لەوێدا کۆبوونەتەوە. بێجگە لەم یارمەتییە، دیارییان بۆ ماڵە مردووەکە ئەنارد. یاربوویشیان ئەکرد، بەهەموو جۆرێک دڵی مردووەکەیان ئەدایەوە. تا ئەو ئێش و ئازارەیان لە دڵ دەرئەکردن. بۆ منالی ساوا پرسە نەئەگیرا. بۆ سەرۆک و کەڵەکەکەی هۆزیش کە لە شەڕی هۆزایەتیدا ئەکوژران، هەروەها پرسە نەئەگیرا. نەوەک دوژمنەکانیان پێیان خۆش بێ. تەنانەت ئەیانکردە دەهۆڵ و زوڕنا لێدان و شاییش. هەر بۆ ئەمەی دڵی دوژمنەکانیان پێ تەنگ بکەن. ئەم ڕەوشتە کۆمەڵایەتییە کۆن و بەنرخەمان، کە بریتییە لە گیانی یارمەتی و خۆشەویستی ڕاستەقینە و هاوبەشی لەشیندا، کە بریتییە لە مەردایەتی، تا ئێستاکەیش لە هەندێ دێهات و باژێڕەکانی ناو کوردستاندا ماوە و ڕاگیراوە و ڕێزیشی لێ ئەگیرێ. چونکە لە ئەنجامدا ماڵە مردووەکە زامی دەروونییان ساڕێژ ئەبێ و، دڵیان بەهێز ئەبێ و، خەمیان ئەڕەوێتەوە و، هەستیش بەخۆشەویستی و یارمەتی و هاوبەشی کەسوکار و خزمانیان ئەکەن لە شیندا.

### پرسەی ئێستا:

بەڵام داخەکەم پرسەی ئێستاکە بەزۆری لە شارەکانمان و لەناو ماڵە گەورەکانماندا باوە، ماڵی مردووەکە کاول ئەکات، دڵیان تەنگ ئەکات، سەرگەردانیان ئەکات. چونکە ماڵە مردووەکە تووشی ئەرکێکی زۆر و پارە بەختکردنێکی زۆر و، بینینی دووڕوویی و ڕووالەتی و کەش و فشێکی زۆر دێن و هەست بەهیچ یارمەتی و دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینەیش ناکەن. ماڵە مردووەکە ماندوو ئەبن، نابووت ئەبن، برستیان ئەبڕێ، ئەوەندەی تریش کۆستمان ئەکەوێ!...

ماڵە گەورەی وام دیوە، کە ئەرکی پرسەکەیان خۆی داوە لە دوو هەزار و سێ هەزار دینار!... ئەرکی پرسەییش کە بەرچینی ناوەڕاست و خواروو ئەکەوێ هەر لە سەد دینارەوە هەتا شەش سەد دیناری تێ ئەچێ!...

### هۆی پرسەی ئێستا:

ئێمەیش کە لە هۆی ئەم پرسەی ئێستایە ورد ئەبینەوە و لێ کۆڵینەوەی تیا ئەکەین، بۆمان دەرئەکەوێ: کە ئەم دەردە لە خۆپەرستی دوو چینی کۆمەڵایەتیمانەوە پەیدا بووە:

١- لووت بەرزەکـان و کەشـوفش پەرسـتەکـان حەز بەم پرسـەیە ئەکـەن و بایەخی پێ ئەدەن. هەر لەبەر ئەوەی کە کەسانێکی زۆر بێنە پرسەکەیانەوە و، لەم و لەویش بکەن بەچاووڕاو کە کۆمەڵایەتییەکەمان بەگەورە و گرنگیان دائەنێ. بۆیەکـا بەپرسـەکەیانەوە دێ. کەچی لە ڕاستـیـدا زۆر کەسـی وا هەن لەبەر چاولێکەری، یاخود لە ترسی گلەیی، یان بۆ دڵخـۆش کـردنی خـۆیـان بەئازا و زیانی خـاوەن مـردوویان بۆ کات کـوشتن هاتوونەتە پرسەکەیانەوە. جا ئەو لووت بەرزانە بەلای خۆیانەوە وایە کـە بەم جـۆرە پرسـەیە پایەی کۆمەڵایەتییان بڵند ئەبێتەوە، لەناو نەتەوەدا ڕێز و سامیان زۆرتری لێ دێ.

ئەمـەیش شتێکی دیارە کـە ئەم جۆرە کـەسـانە لەبەر ئەوەی لە کانگای دڵی خۆیاندا هەست بەکـەم و کـوڕی خـۆیـان ئەکـەن و، خـۆیـان بەسـووک دێتـە پێش چاو، بەم جـۆرە ڕووکـەش و بابەتی ڕوواڵەت و کەشـوفشـەوە، تۆڵەی ئەو کـەم و کوڕییـەی خـۆیان ئەکەنەوە چونکە ئەوانە کە کـارێکی نەتەوەیی دێتـە پێشەوە، ئامادە نین (٥) دینار ببەخشن بۆ کەڵکی گشتی!...

خاوەنی ئەم نەخۆشییـە بەزۆری دەوڵەمەندەکانی جەنگ و تەنگانە و، هەلپەرستەکـان و ئەوانەن کە بەدووی کلاودا ئەگەڕێن. ئەم دەردەیش لەوانەوە بەچینەکانی ناوەڕاست و خواروو گەیشتووە!...

٢- چینی پیاوە ئایینییەکان: ئەم چینەیش خۆی هەرچەندە ئەوە باش ئەزانێ کە پرسە گرتنی بەم جۆرە پێچەوانەی یاسـای خواییـیە، بەڵام خـۆپەرستـییـەکـەی خـۆی پاڵی پێـوەئەنێ کـە لێی بێ دەنـگ بێ و بەرەنگاریش نەکات. نەوەک نانی خۆی ببڕێ!...

چونکە هەموو پرسەیەک کەڵکی بۆ پیاوە ئایینییەکان تیایە، بەگەورە و بچووکیانەوە. هەتا پرسەکەیش پارەی زۆرتری تیـا بەخت بـکرێ و زۆرتر بایەخی پێ بدرێ، کـەڵـکی ئەو پیـاوە ئایینیـیـانەی زۆرتـر تیـا ئەبێ. لەبەر ئەوە پیاوە ئایینیـیـەکان، خۆیشیان بەپێچەوانەی فەرمـانی کۆمەڵایەتی و ئایینی خۆیان، دەوڵەمەندەکان و خاوەن کەشوفشەکان، تەنانەت چینەکانی تریش تیژ ئەکەنە سەر بایەخدان بەپرسـەگرتن تا گەیاندیانە ئەم ڕادەیە کە لە هەمـوو مزگـەوتێکدا هۆڵێکی گـەورە و شـەنـگ و شـۆخی تـایبەتی دروست بکرێ بۆ پرسـەگرتن! ؟... بەتەخت و کـورسی و پەردە و ئاوێزە و کـەلوپەلانی تری ئایابەوە بڕازێنرێتـەوە تا شایانی پرسەگرتن بێ! لەگەڵ ئەمـەیشدا پێویستـە پێی لێ بنێین کە هەندێ پیاوانی ئایینی ڕاستەقـینە و سەربەرز و دەروون ئازاد هەن ئەوانیش وەک ئێمە بیر لەم ڕەفتاری پرسەگرتنەمان ئەکەنەوە.

ئەوانیـش وەک ئێـمـە حـەز ئەکەن ئەم بارە چەوت و پووچە ڕاست بکرێتـەوە. بەڵام داخـەکـەم ژمـارەیان کەمە، خەباتیان کزە، کەسیش گوێیان لێ ناگرێ!...(*)

---

(*) ئەو کـاتەی ئەم وتارە لە سـاڵی ١٩٦٨دا بۆ یەکـەم جـار لە گـۆڤـاری (سلێـمـانی)دا بڵاوکرایەوە، باری مـەلا بەڕێزکانمان وابوو... بەڵام بەسایەی کاربەدەستانی (شۆڕشی گەورەی کورد)ەوە، ئەم بارە لە مانگی بەختەبارانی سـاڵی ١٩٧٣دا بەتەواوەتی گۆڕا. چونکە (زانایانی ئایینی کوردستـان) هێرشێکی خواناسانە و مەردانەیان بردە سـەر ئەم پرسـەگـرتنە لە (سلێـمـانی)دا و بڕیارە مـێـژووییـیـە بەنرخـەکەی خـۆیشـیـان بەهەمـوو لایەکـدا بڵاوکـردەوە. نەتەوە ئەم بزووتنەوەیەی زۆر پێ خـۆش بوو. (پارتی دیموکـراتی کـوردسـتـان) و هەمـوو ڕێکخراوەکانیشی بەدڵ پشتگیرییـان کرد. ئەم بڕیارە کارێکی تەواوی کرد، سوپاس بۆ خوا پرسەگرتنەکانی ئێستا خەریکن بەتەواوەتی بەرەو چاکی و دروستی ئەڕۆن. (ش.ف)

لەمەدا ئەتەوە چەواشەکراوە. چونکە ماڵە مردووەکە بەم جۆرە پرسەگرتنە، دڵخۆش نابێ. هەروەها خوایش کە فەرموویەتی بەرامبەر بەسەرگەردانی و بەسەرهاتی دڵشکێن و سامناک ئارام بگرین و پشت بەمیهرەبانی خۆی ببەستین و، لە ڕۆژی تەنگانە و ناخۆشیدا دڵی خۆمان بەخۆی خۆش بکەین... هەروەها بەم جۆرە پرسەگرتنەمان دڵی خۆش نابێ!... هەرچی هۆشیشە، هەرگیز ئەوە پەسەند ناکات، کە ماڵە مردوو لەباتی ئەوەی یارمەتی بدرێ و باربوو بکرێ ئەرک و ماندوێتی بخرێتە بەر و باری نابووتی بخرێتە سەرا.

مردن بەلای خواوە، بەلای هۆشەوە کارەساتێکی سروشتییە. هەموو کەس تووشی ئەبێ. ئەبێ هەروەک بەلەدایکبوونی منداڵێک دڵخۆش ئەبین، کە خوا پێی بەخشیوین، هەروەها دڵتەنگ نەبین کە خوا خۆشەویستەکەمانی بردۆتەوە بۆ خۆی!...

بەڵێ مردن کارەساتێکی سروشتی و ساکارە. بەڵام کەڵک پەرستەکان لێیان کردووین بەخێوێکی دڕندە و زەندەقیان پێ بردووین!

ئەگەر مردن نەبوایە لە دەست پیاوخراپ ڕزگارمان نە ئەبوو. نە لەدەست نەخۆشی و دەردەداری چانەکراو و پەککەوتوو ڕزگارمان ئەبوو... نە لە دەست ئەرک و ئازاری دەرد و نەخۆشی هەندێ جاری ڕۆژگاریش ڕزگارمان ئەبوو!...

کەواتە مردن بەخشینێکی گرنگی خواییە پێویستە دڵی پێ خۆش بکەین. نەک پێی دڵتەنگ بین. پێویستە بەڕوویەکی خۆش و هەستێکی مەردانەوە بەپیرییەوە بچین نەک لێی بترسین.

پاش ئەوە، ئەگەر خۆپەرستی خۆمان لەئارادا نەبێ، لە مردن بۆ چ بترسین؟! ئەی ئەم شین و شەپۆرەی بۆچییە!

ئەم کەشوفشە و پرسەگرتنەی بۆ چییە!

ئەی ئەم بێزاری پێشاندانەی لە کاری خوا بۆچییە!

مردن کارەساتێکە سروشتی، خوایی. پێویستە بەدڵنیایی و ئارامێکی مەردانەوە بەڕێزگرتنێکەوە بەرامبەری بوەستین. تەنانەت پێویستە بەڕووخۆشی و دڵ خۆشییەکەوە بەپیریەوە بچین. (محەمەدی پێغەمبەر) (د.خ) وای کرد. (سوکرات)یش پێش ئەو بەهەزار ساڵ هەروای کرد. هەردووکیان مەردانە و سەر بڵندانە پێشوازی مەرگیان کرد.

ئێمە نابێ لە مردن وەڕس بین. نابێ لە مردن بترسین. چونکە لە بریتی مردوویەک دە منداڵ دێتە جیهانەوە. ئەگەر خۆشەویستێکیشمان بمرێ زۆری تر هەن لە جیهاندا کە جێگای ئەو بگرنەوە!... بێجگە لەوە جیهانی پاش مردنیشمان لە جیهانی پێش مردنمان خۆشتر و پایەدارترە! چونکە جیهانێک پڕەتی لە خۆشی و ئاسایش و ئاشتی و خۆشەویستی!

## تێکەیشتووانی کورد لەم پرسەیەمان وەڕس بوون

لە سەدان لە خوێندەواران و تێکەیشتووانی کوردم بیستووە کە گەلێک لە پیاوە ئایینییە

بلندەکانیشیان لەناودایە، کە ئەم پرسەیەی ئێمە ئێستە ئەیگرین - پێچەوانەی فەرمودەی خواییە، پێچەوانەی بیر و هۆشی مرۆڤە پێچەوانەی کەڵک و خۆشی خاوەن مردووە! هەموویشیان لە کانگای دڵیانەوە حەز ئەکەن- ئەم پرسەگرتنە بەتایبەتی لەم شێوەیەدا کە هەیە، نەبوایە. بەڵام هیچیان ناوێرن بەربەرستی ئەم خووە رزیوەی کۆمەڵایەتییەمان بکەن!

هیچیشیان ناوێرن بیروباوەڕەکەی خۆیان لە پرسەی خۆیاندا بەکاربهێنن. ئەوانە لەوە ئەترسن کە نەتەوە لێیان بووروژێ، ئەترسن لەوەی ئەم و ئەو پێیان بڵێن لەبەر پارە گێڕانەوە پرسە ناگرن! ڕژدی ئەکەن دڵیان نایە پارە لە پرسەدا بەخت بکەن.

ئەمەیش جێی داخە کە ئەو ڕۆشنبیرانە، بەتایبەتی پیاوە ئایینییەکانیان تا ئێستا هەوڵێکیان نەداوە کە (کۆگرە)یەک بگێڕن بۆ لێ کۆڵینەوە و بڕیاردان لەسەر هەڵگرتنی پرسە. یاخود هەر هیچ نەبێ پرسەگرتنێکی ساکار و پەسەند کە خوا و هۆش گلەییمان لێ نەکەن، کە زیان بەکەڵک و خۆشی خاوەن مردوویش نەگات.(*)

## پێشنیاز بۆ پرسە لابردن

لەبەرئەوە منیش بەپێویستم زانی کە ئەم پێشنیازانە پێشکەش بەکوردە تێگەیشتووەکان بکەم. تا چاکی مەردانە بکەن بەلادا و بێنە کۆڕی کۆمەڵایەتییەوە بۆ نەهێشتنی ئەم خووە رزیوەی کۆمەڵایەتییە کە پێی ئەڵێن پرسە:

---

(*) ئەم وتارە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦٨دا لە گۆڤاری (سلێمانی)دا بڵاوکرایەوە. دیسان لە ساڵی ١٩٧١دا لە کۆڕێکی گەورەی (یەکێتی نووسەرانی کورد)دا - لقی سلێمانی - خوێندرایەوە.
دیسان لە ١٩٧١/٤/٥دا لە کۆڕێکی گەورەی زانکۆی سلێمانیدا خوێندرایەوە. جا هەتا ئەم ڕۆژەیش باری ڕۆشنبیران وابوو. بەڵام لە مانگی پێنجەمی ١٩٧٣دا کۆمەڵی زانایانی ئایینی کوردستان هەروەکو لە دامێنی پێشوودا لێی دووا‌ین هووروژمیان بردە سەر پرسە و بڕیاریان بۆ دەرکرد، کە بەجۆرێکی تێکڕایی بیروباوەڕەکان و پێشنیازەکانی ناو ئەم وتارەی گرتۆتەوە، لەگەڵ جیاوازییەکی کەمدا.
بەڵام پێش (کۆمەڵی زانایانی ئایینی کوردستان) لە ساڵی ١٩٦٨دا لەلایەن مامۆستای بەڕێز و کوردپەروەر (کەریم زەند) و پانزە مامۆستای هاوڕێیەوە کە لە (خوێندنگای کوردی)دا فێرکاربوون بەنامەیەک کە نێررا بۆ گۆڤاری (سلێمانی) پشتگیری ئەم وتارە کرا هەروەها لەلایەن خوشکە (ملیحە مەلا کەریم)ی بەڕێز و پانزە فێرکاری (خوێندنگای نزاری کچان)ەوە پشتگیری ئەم وتارە کرا و نێررا بۆ گۆڤاری سلێمانی. زانای ئایینی بەڕێزیش مامۆستا شێخ مستەفا شێخ مارفی قەرەداغی بەوتارێکی جوان و نایاب پشتگیری ئەم وتارەی لە (گۆڤاری سلێمانی)دا کرد. بەم بۆنەیەوە نووسەری ئەم وتارە پڕ بەدڵ سوپاسی ئەم برا و خوشکە بەڕێزانە و کۆمەڵی زانایانی ئایینی کوردستان ئەکات. پایەداربن. شایانی دڵخۆشی و سوپاسە کە لەو کۆڕانەدا کە لەسەر ئەم پرسەیە وتارم ئەدا لە کۆڕی نووسەرانی کورد و کۆڕی زانکۆی سلێمانیدا زۆر لە نووسەرە ڕۆشنبیرەکان پشتگیرییان ئەکردم. مامۆستایانی خۆشەویست و بەڕێز (حوسێن ڕەشوانی) (تەها بابان)، (کەریم زەند)، (محەمەد سالح سەعید)، (مەلا ڕەئووف) چەند کەسێکن لەوان. (ش.ف)

١- لەبەرئەوەی خوا بۆ ڕێزگرتنی مردوو فەرمانی داوە، ئەوە هیچی تیا نییە کە کەسوکار و خزم و دۆست لەگەڵ لاشەی مردووەکەدا تا گۆڕستانەکە بچن. ئیتر لە پاش ناشتنی مردووەکە هەر لەوێدا، لە گۆڕستانەکەدا، بام سەرەخۆشییەک لە خاوەن مردووەکە بکەن و بلاوەی لێ بکەن. پاش ئەوە بام هەر کەسە بچێتەوە ماڵی خۆی.
٢- خاوەن مردوو نە لە مزگەوت، نە لە ماڵ، بام دانەنیشێ بۆ پرسەگرتن. هیچ کەسێکیش هەڵ نەکوتێتە سەر خاوەن مردووە بۆ دڵدانەوە و پرسە لێ کردن.
٣- خاوەن مردوو بەخۆی و خێزانەوە، لە پاش ناشتنی مردووەکە بۆ چەند ڕۆژێک بچێتە گەشتێک بۆ شارێکی تر، یان بۆ ماڵە خزمێک یان بۆ ماڵە دۆستێکی خۆی، تا خەم و ئازاری دڵی لە شێوەیەکی سروشتی ڕاستەقینەدا بڕەوێتەوە.
٤- هەر خزم و دۆستێک نەچووبووە سەر گۆڕستان لە کاتی ناشتنی مردووەکەدا، لە جیاتی سەرلێدان و پرسە لێ کردن، بام نامەیەکی دڵدانەوە بۆ خاوەن مردووەکە بنێرێ بەڵام پێویست ناکات خاوەن مردوو، یەک بەیەک وەرامی ئەو هەموو کەسانە بداتەوە. هەر ئەوەندەی بەسە کە وەرامێکی گشتی لە ڕۆژنامەیەکدا بداتەوە بۆ هەمووان.
٥- خاوەن مردوو ئەگەر خۆی ئارەزووی کرد و لە توانایدا بوو، بام هەندێ پارە ببەشێتەوە بەسەر کۆمەڵە چاکەخوازەکاندا وەک:
(خوێندنگای هەتیوان) یاخود (کۆمەڵی داماوان و پەککەوتووان)... تا بەو پارەیە دەستی هەژاران و هەتیوان و لێ قەوماوان بگیرێ و ئەو چاکە کردنە ببێتە هۆی سارێژبوونی زامی دڵی خاوەن مردووەکان. هەروەها ببێتە هۆی لێ خۆشبوونی خوا لە گوناهانی مردووەکە.
٦- دیاریی ناردن بۆ خاوەن مردوو یاخود یاربووکردنی یەجگار پەسەندە. پرسەی ڕاستەقینەیش هەر ئەمەیە.
٧- خۆ ئەگەر ئەمانەیشمان، جاری، لە دەست نەیەت، هەر هیچ نەبێ، بام چوونە پرسەکانمان بکەین بەیەک جار. کە چوویشین بۆ پرسە لێ کردن بام چارەکە کاتێک زۆرتر دانەنیشین. بام واز لە چوونە پرسەی دێ و شارێکی تر بهێنین. بام خاوەن پرسەکان تکا لە کەسانی تر بکەن کە بەپرسەیانەوە لە شاران یاخود دێهاتی دوورەوە نەیەن. بام دانیشتنی پرسەکە بکەین بەیەک ڕۆژ. بام ژنانیش لە شیوەن و گریان و قوڕپێوان و جلی ڕەش لەبەرکردن بەربەست بکرێن. بام دانیشتنی پرسەکەیش کورت بکەینەوە بۆ ماوەی دووکات.
٨- ئەمانە و هەر دەماری پیاوەتی و خواناسی بمانگرێ. لە تواناماندا هەیە کە بەگەلێک شێوەی تر لە ئەرک و ئاوازی پرسە و زیانی پرسە بۆ خاوەن مردوو و بۆ خزم و کەسوکارەکانی خاوەن مردوو کەم بکەینەوە.
٩- تکا لە مەلا بەڕێزە تێگەیشتووەکانمان ئەکەم، هەروەها لە هەموو سەرۆکێکی کۆمەڵ و دەستە (حزب)ەکان، هەروەها لە هەموو دەسەلاتدار و کاربەدەستەکان کە پەیتا پەیتا کۆگرە و کۆبوونەوە پێک

بهێنن بۆ ڕاوێژکردن و بڕیاردان لەسەر (پرسە هەڵگرتن) یاخود لەسەر سووککردنی پرسە، بەو جۆرەی کە لەسەرەوە پێشان دراوە، یاخود بەهەر جۆرێک کە لەمە باشتربێ. هەروەها تکا لە نووسەرە بەڕێزەکانمان ئەکەم کە برەو بەم بابەتی (پرسە هەڵگرتن)ە بدەن. تا بیروباوەڕی نەتەوە ڕۆشن بێتەوە و بکەوینە سەر هەڵگرتنی ئەم ڕەوشتەی ڕزیوەی کۆمەڵایەتییەمان کە پێی ئەڵێن (پرسە).

جا ئەگەر ڕاست ئەکەین و بۆ کەڵکی گشتی تێ ئەکۆشین، فەرموون ئەم کۆڕی نیشتمانپەروەرییە، بام تێ بکۆشین. بام هەموو کوردێکی دڵسۆز لە جێگەی خۆیەوە ببزوێ و تێ بکۆشێ بۆ (هەڵگرتنی پرسە) کە زیانێکی زۆر گەورە و گرنگی لە کۆمەڵایەتیمان داوە.

## خۆیشم بەرەنگاری پرسە ئەکەم

ئەوەندەی کەینەوبەینەی (پرسە هەڵگرتن) پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە، تکایە خوێندەوارانی بەڕێز باوەڕم پێ بکەن، کە زۆرم لەسەر گوتووە کە زۆریشم لەسەر نووسیوە، کە زۆریش بەرەنگاریم کردووە. وازیشی لێ ناهێنم تا سەر ئەنگری ئەکەم.

ئەوا هەر لە ئێستایشەوە بڵاوی ئەکەمەوە - کە مردم خێزانەکەم و خزم و کەسوکار یاخود دۆست و یار نە پرسەم بۆ بگرن، نە بش هێڵن کەس بەهۆی مردنی منەوە ماندووببێ. ئەوانە ئەگەر ئەیانەوێ گیانم شادببێ:

بام دڵی خۆیان شاد بکەن بەمردنەکەمەوە کە بۆ لای کەس ناچم، بۆ لای گەورە میهرەبانی خۆم (خوا) نەبێ. ئەوەندەی لە وزەی سامانەکەیشمدا هەیە، لێی ببەشنەوە بەسەر (کۆمەڵە چاکەکار)ەکاندا. بەسەر ئەو زانا و نووسەرانەدا کە لەبەر بێ پارەیی ناتوانن بەرهەمە بەنرخەکانی خۆیان لە چاپ بدەن. تا بتوانن نووسراوەکانیان لە چاپ بدەن. هەروەها بیبەشنەوە بەسەر ئەو شاگردە هەژارانەی کە بەدڵ دەستیان داوەتە خوێندەواری. هەروەها لە چاپکردنی پاشماوەی نووسراوەکانی خۆیشمدا بەختی بکەن کە هێشتا لە چاپ نەدراون. ئەمیش بۆ ئەمەیە تا ئەوەندەی لە وزەی خودایە لە گوناهەکانم خۆش بێ. کە هەندێک لەوانە پرسە گرتنەکانی پێشوومن، کە بەپێچەوانەی ئارەزووی دڵم پێم گیراون!...

جا هیوادارم بەخوا کە هاونیشتمانە بەڕێزەکانم ئەم ئاواتە گشتییە بهێننە دی.

# چۆن ڕابوێرین

لە گۆڤاری (بەیان) ژمارە (١٩) تشرینی دووەمی ١٩٧٤، ٢٦٧٤ی کوردی. ل ٩ -١١، بڵاوکراوەتەوە.

خۆشەویستترین کاتمان، کاتی بێ فەرمانیمانە. بەڵکو ئەم کاتەمان لە کاتی فەرمانمان گرنگترە!... چونکە لەم کاتەدا چالاکیمان دێنینەوە جێی خۆی. لە کۆڕی بیرکردنەوەیشدا، ئەتوانین ڕەنگی دوارۆژمان دارێژین. هەروەها ئەتوانین، لەم کاتەدا، خۆشی لە ژیانمان ببینین. ئینجا لەبەر ئەوەی کلیلی دەرگای بەختیاری و سەرگەردانیمان، هەمیشە بەدەست خۆمانەوەیە، ئەتوانین کاتی بێ فەرمانیمان بکەین بەکاتی شادی و کامەرانی، بەکاتی دامەزراندنی دوارۆژێکی ڕووناک و پاک، بەکاتی خۆ پێگەیاندن و بەرزبوونەوە گەورەیی. هەروەها ئەیش توانین ئەو کاتەمان، بکەین بەکاتی سەرگەردانی و دڵتەنگی و ماڵوێرانی!... بەکارهێنانی کاتی بێ فەرمانیشمان بەجۆرێکی خۆش و بەکەڵک بەندە بەتوانامانەوە لە گۆڕاندا، بەپێی کارەساتی ڕۆژگار و کات و جێگا. هەروەها بەندیشە بەپلەی خوێندەواری و پێگەیشتوویی و دڵ تەڕی و چاکەخوازی و ڕاستی پەرستی و حەزکردنمانەوە لە جوانی. کەواتە کامەرانی و سەرگەردانیمان بەندە بەچۆنێتی بەکارهێنانی کاتی بێ فەرمانیمانەوە.

***

داخەکەم، ٩٩٪مان، نازانێ چۆن کاتی بێ فەرمانی خۆی بەکاربهێنێ!... لەمەیشەوە تێ ئەگەین کە ٩٩٪مان خۆشی لە ژینی خۆی نابینێ. چونکە کاتی بێ فەرمانی خۆی باش بەکارناهێنێ!...

***

جێی داخە، کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، ئەم کاتە خۆشەویستانەمان، کورتن. چونکە ئەگەر لە ٢٤ کاتەکەی ڕۆژانەمان، ئەو کاتانە دەربکەین کە فەرمانیان تیا ئەبینین، تیایاندا ئەنووین، ئەخۆین، ئەپۆشین، خۆ ئەشۆین، کەلوپەل ئەکڕین، لای پزیشک ئەچین، فریای خێزان و دراوسێ و خزم و ناسیاو ئەکەوین... لە شەو و ڕۆژێکا هیچمان بۆ نامێنێتەوە، چوار کات، یاخود شەش یەکی نەبێ!... ئەمەیش ئەوە ئەگەیێنێ کە ئێمە، هەر شەش یەکی تەمەنمان، ئەتوانین بەخۆشی ڕاببوێرین، ئەویش بەمەرجێ باش بەکاری بهێنین!... هەمیشە کە بتوانێ لەمە زۆرتر بەخۆشی ڕاببوێرێ. هی وا هەیە، خۆشی لە فەرمانیش ئەبینێ، لە خواردن و نوستن و پۆشین و یاریدەدانیش ئەبینێ، جگە لە خۆشی بینین لە کاتی بێ فەرمانی. بەڵام داخەکەم ئەو جۆرە کەسانە کەمن!... لەبەر ئەوە پێویستە بەچاوێکی گرنگەوە سەیری کاتی بێ فەرمانیمان بکەین. بۆ ئەمەی هەر هیچ نەبێ، شەش یەکەکەی تەمەنمان بەخۆشییەوە ڕاببوێرین.

تا ئێرە، لە چۆنێتی کاتی بێ فەرمانی و، گرنگی کاتی بێ فەرمانی و، نرخی لە ژیاندا تێ گەیشتین. ئیتر بام لەوە بدوێین: کە چۆن کاتی بێ فەرمانیمان بەکاربهێنین.

***

هەرکەسەمان، لە ژیانی خۆیدا، جۆرە ئاوات و هیوایەکی هەیە. جۆرە بیروباوەڕ و دڵخواست و هەست و ئارەزوویەکی هەیە. جا ئەبێ، لە کاتی بێ فەرمانیماندا، ئەو ئاواتانەمان بهێنینە دی، بەو

ئامانجانەمان بگەین، ئەو بیروباوەڕانەمان دەربڕین، ئەو دڵخواستانەمان پێک بهێنین، بەکامی خۆمان بگەین، چەشەی ئەو هەست و ئارەزووانەمان بدەین، دڵی خۆمان دامرکێنینەوە. لەلایەکەوە: نووسراو و گۆڤار و ڕۆژنامەی خۆش و بەکەڵک هەن. لەلایەکی ترەوە: وەرزشی بەجۆش و فەڕ هەن، وەک گەڕان و بەشاخدا هەڵگەڕان و سواری و مەلەکردن و نیشانەنانەوە و یاری و گەمەکردن. لەلایەکی تریشەوە ماوە هەیە بۆ گوێ گرتن لە ساز و ئاواز و گۆرانی و هەواڵ و وتار؛ بۆ مەشقکردن لە وێنە کێشان و پەیکەر تاشین و نووسین و سازلێدان و گۆرانی گوتن و هەڵپەڕیندا. ماوە هەیە بۆ چاندن و ڕواندن و، ئاژەڵ و درندە بەخێوکردن. سینەما هەیە. جێگای لاسایی کردنەوە هەیە. کۆڕی زانست و هونەر و وێژە هەیە. سەرلێدانی خزم و کەسوکار و دۆست و یار هەیە... ئەمانە هەموویان، بابەتی ڕابواردنێکی خۆش و نایاب و بەکەڵکن. ئەتوانین لەکاتی بێ فەرمانیماندا پێیانەوە خەریک ببین... ئەوە هەیە، پێویستە، ئێمە لەسەر پێڕەوییەک بڕۆین بەڵام بەڕێکوپێکییەوە پێویستە کاتی بێ فەرمانیمان لەسەر ئەو پێڕەوییە بەخت بکەین. ئەتوانین پێڕەوییەک دابنێین بۆ ژیانی ڕۆژانەمان، بۆ ژیانی حەفتانە و مانگانە و ساڵانەیشمان. بۆ ئەمەی وەڕس نەبین و گلاراوی و دڵتەنگیش ڕوومان تێ نەکەن. چونکە لەم ژیانەدا، هەموو شتێک لەسەر یاسا ئەڕوات. ئەبێ، ئێمەیش لە بەکارهێنانی کاتی بێ فەرمانیماندا، بەڕێکوپێکی لەسەر یاسایەک بڕۆین. ئەگینا کامەرانیمان ئەبێ بەسەرگەردانی.

داخەکەم، زۆربەمان، ئەم کاتی بێ فەرمانییەی خۆی، خراپ بەکارئەهێنێ!... سەیری کۆبوونەوەکانمان کەن! چی ئەبینێ؟!... لە زۆربەیاندا کەم و کوڕی ئەم و ئەو ئەگێڕێتەوە. ئابڕووی کەسانی تیا ئەبرێ. بەدناو ئەکرێن بەخۆڕایی. دانیشتوان خۆشی لەوە ئەبینێ: پشم و قین و دوژمنایەتی و دووزمانی و بەدگۆیی خۆیان بنوێنن. یاخود جنێوفرۆشی بکەن. هی وایشمان تیایە، تەنانەت لەناو کۆڕی خێزان و خزمان و یارانیشدا، بەڵکو لەسەر خوانی نان خواردنیش، تا لە بابەت کارەسات و تاوان و کردەوە نەنگی و ڕەوشتی بێ فەڕانە و ناشیرینەوە، نەدوێ، دڵی ئۆخەی ناکات!...

هی وایشمان تیایە، هەرچی خەم و خەفەتی ناو سکی هەیە، لەگەڵ پشم و قین و شەڕوشۆڕ و سەرچڵی خۆی، لەبەر دەمی خێزان و خزم و دۆستەکانیدا نەبێ، هەڵی ناڕێژێ!... بیر بکەنەوە: چەند جاری وا هەبووە کە ئاهەنگی خۆشەویستانی خۆمان بەچەقە چەق و شاتە شاتی نەنگ و بێ کەڵکەوە تێکداوە، کە زۆر جاری وا هەبووە، گەیشتوونەتە شەڕە جوێن و لێدان و کوشتن و بڕین؟!...

هەڵبەت خوێندەوارانی بەڕێز، لەگەڵمدان، کە بڵێم: ئەم جۆرە ڕەوشت و کردەوانە لە بەکارهێنانی کاتی بێ فەرمانیدا، نیشانەی بەدخوویی و کردەوە نەنگێن! چونکە زۆرداریبیەکی ئاشکرا و دیارن، لە ئازادی و سەربەستی مرۆڤ و ڕێز و سرەوت و کامەرانییان ئەکرێن!... لە کۆمەڵە پێ گەیشتووە تێگەیشتووەکانی جیهاندا: کاتی بێ فەرمانی ڕێزی زۆری لێ ئەگیرێ. هەروەها ڕێزیش لە ئاهەنگ و کۆبوونەوە و سرەوت و سەربەستی و کامەرانی و سەربەرزی مرۆڤیش زۆر ئەگیرێ.

سەیر ئەکەیت، هەموو کەسێکیان، بەفەرمانی سەرشانی خۆی ئەزانێ: کە ڕق و پشم و قین و دوژمنایەتی لە کاتی ئاهەنگی و کۆبوونەوەکاندا لە دڵی خۆی فڕێ بدا. بەفەرمانی مرۆڤایەتی خۆی ئەزانێ: کە گەش و ڕووخۆش بێ لەگەڵ دانیشتووەکاندا، کە قسە شیرین و ڕەوشت ڕەندین بێ لەگەڵ

هەمـوویاندا. بەڵکو هی وایشـیـان تیـایە، کـە ئەو کـۆبوونەوە و ئاهەنگانە بەهەل ئەزانێ: لەبەر دڵی دانیشتوان، هەر دوژمنایەتییەکی کۆنی هەبێ لەگەڵ یەکێک لەو دانیشتوانە لەناوی ئەبا!...

***

ئەگـەر لە ڕەوشـتی باووباپیـرمـان وردببـینەوە: بۆمـان دەرئەکـەوێ، کـە ئەوان لە ئێـمـە خۆشـتـریان ڕابوواردووە لە ژیاندا. لە ئێمە زۆرتر ڕێزیان لە ئاهەنگ و کۆبوونەوە و کۆمەڵان گرتووە. هەروەها لە ئێمە زۆرتر فەرمانی سەرشانی خۆیان بەجێ هێناوە بەرامبەر دانیشتوانی ئەو کۆمەڵ و ئاهەنگ و کۆبوونەوانە.

***

ئەگـەر سەرنجێـک لە ئاییـنەکـەمـان بدەین، ئەگـەر وردببینەوە لە ڕەوشتی پێغـەمـبەران و پیـاوچاکـان ئەبینین: کە لە بەکارهێنانی کاتی بێ فەرمانیاندا لە دەستووری خوایی نەچوونەتە دەرەوە. لەگەڵ ئەوەیشا ئەو کـاتی بێ فـەرمـانیـیەی خـۆیان یەک جـار بەجـوانی و خـۆشی و فـەڕ بەخـشـیـیـەوە ڕابواردووە. لە کۆبوونەوەکـانیـاندا: مـێژووی ژیانی پیاوچاکـان و گەورە پیـاوان ئەخوێندرایەوە. گوێ لە دەنگی خۆش و ساز و ئاوازی شیرین ئەگیرا. چیرۆکی پڕ کەڵک و هۆنراوەی بڵند ئەخوێندرایەوە. بەقـسەی نەستەق و گاڵتەوگەپ ومەتەڵەوە ڕایان ئەبوارد. ڕاویان ئەکرد. سەیری چاوئەندازە جوانەکانی سروشتیان ئەکرد. ئەگەڕان. سەیرانیان ئەکرد. گەشتوگوزاریان ئەکرد.

بەڵام، قـسـەی پاش ملە و چەقـە چەق و شـاتە شـات. یاخـود هەواڵی ناخـۆش و بەدگـۆیی... لەناو کۆبوونەوەکانیاندا دەرنەئەکەوتن. نەیش ئەهێڵدرا دەرکەون!...

لەبەر ئەوە ژینێکی خـۆش ئەژیان کـە پڕ بووە لە سـەربەرزی و کـامـەرانی و تەندروسـتی. تەنانەت خۆشییان لە کار و فەرمانی ڕۆژانەیشیان ئەبینی. چونکە لە کار و فەرمانەکانیشیاندا هەر لەسەر ئەو ڕەوشتە ئەڕۆیشتن. کەچی، ئێمەیش، لەم سەدەی گەرد (دزە) و کارەبایەدا کە هەزاران شتی داهاتوو، هاتوونە مەیدانەوە، هەزاران شوێنی خۆش ڕابواردن و یارمەتی و گەمە و یاری پەیدابوون، نازانین چۆن لە ژین خۆشی وەر بگرین. نازانین چۆن بەکاتی بێ فەرمانیمانەوە دڵشاد و کامەران بین!؟...

چاری ئەمە ئەوەیە کە زۆرتر بەتەنگ ڕێکخستنی کاروباری ژیانمانەوە بین. کە زۆرتر، ڕێز لە خۆمان و لە مرۆڤ و لە ژین بگرین. پێویستە لە سەرمان، خۆمان دڵشاد بکەین. خۆمان کامەران بکەین.

هەروەها پێویسـتە لەسـەرمان، ئەم و ئەویش دڵشـاد و کـامـەران بکەین و، یارمـەتیـشـیـان بدەین لە دڵشادکردنی خۆیاندا. جا ئەگەر ئەم دوو فەرمانەمان بەجێ هێنا، بەرامبەر بەخۆمان و مرۆڤایەتی، ئەو ساکە، ئەتوانین کاتی بێ فەرمانیمان لە کاروباری خۆش و بەکەڵکا بەخت بکەین. ئەوساکە تەمەنمان درێژتریش ئەبێ. چونکە کامـەرانی هەمـوو ژیانمان ئەگرێتەوە، چ لەکـاتی بێ فەرمـانیـماندا، چ لە کـاتی فەرمان و ژیانی خێزانیمان و کۆمەڵایەتیماندا.

کە وای لێ هات، بام ژیانی خۆمان وا بەچاکی و جوانی و ڕازاوەیی، ڕێک بخەین، کە بتوانین کاتی بێ فەرمانیمان لە شتی خۆش و بەکەڵکدا بەخت بکەین. تا خۆیشمان و کۆمەڵیش هەمیشە کامەران و شادمان بین. ئەمیش ئامانجی ژیانە. یاخود ئامانجی یەزدان...

# یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی

**یەزیدییەکان خوا پەرستن، دێو پەرست نین**
**چونکە بنچینەی ئایینەکەیان زەردەشتییە**

**لە ڕیزە نووسراوانی ئایینی ژمارە: ٢**
**١٩٦٩**

## پێشەکی

ڕەنگە هەموو کوردێک ئەوە بزانێ کە (یەزیدی) و (ئایینی یەزیدی) هەن. بەڵام کەمیان شارەزای مێژووی پڕ کارەساتی گرنگ و سامناکی تیرەی[1] (یەزیدی) و چلۆنیی ئایینی (یەزیدی)ن. لە ڕاستیدا لە بابەت برا یەزیدییەکانمانەوە، بەزمانی کوردی، لە هەندێ وتار بەولاوە داخەکەم. هیچی تر نەنووسراوەتەوە، کەچی بەزمانانی بێگانان بەسەدان نووسراوان هەن. لەبەر ئەوە بەپێویستم زانی کە نووسراوێک لەسەر مێژووی یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی دابنێم و، پێشکەشی خوێندەوارانی کوردی بکەم هەرچەندە لەوە دڵنیانیم کە نووسراوەکەم لە هەڵە و کەم و کوڕییەوە دووربێ بەڵام هیوادارم بەخوا کە کەلێنێک لە نووسراوخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە و خوێندەوارانیش لە مێژووش ژیان و چلۆنیی ئایین و کردەوە و ڕەوشتیان و هیوا و ئاواتیان و خەباتیان ئاگادار بکات. هەروەها نووسەرانی کوردیش بخاتە سەر ئەوەی کەم و کوڕییەکانی نووسراوەکەی من تەواو بکەن.

برا یەزیدییەکانمان بەپاشماوەی کوردە زەردەشتییەکان دائەنرێن. نزیکەی نۆسەد ساڵێک لەمەوپێش لەسەر دەستی (شێخ عدی)دا بوون بەئیسلام. بەڵام پاش مردنی شێخ عدی بەسەد ساڵێک لە ئیسلامەتییەوە وەرگەڕانەوە سەر ئایینەکەی خۆیان. بەڵام لەو ماوەیەدا چەند بەشێکی ئەو ئایینەیان لێ ون بووبوو. لە چەند ئایینێک و چەند ڕاستی پەرستییەکەوە گەلێک بیروباوەڕ و ئاینکاریی بێگانە کە پێچەوانەی ئایینی زەردەشتێ هاتنە تەنیشت ئایینەکەیانەوە. لەم کۆمەڵە بەشە ئایێ و ڕاستی پەرستییانەیش (ئایینی یەزیدی) پەیدابوو. لە ڕاستیدا لە ئایینی یەزیدیدا، بەشێکی گەورە و گرنگی ئایینی زەردەشتی ماوەتەوە وەک باوەڕکردن بەخوایەکی پاک و تاک و تەنیا و، حەوت فریشتەکان و پێغەمبەران و، مردن و زیندووبوونەوە و، چەند و چوون کردنی خوا لەگەڵ مرۆڤدا و، پاداش و سزای خوایی و بەهەشت و دۆزەخ هەروەها ئەوەیشی تیا ماوەتەوە کە ڕێز لە گەورەی خۆیان بگرن و بەزەییان بەهەژار و داماو و لێ قەوماودا بێتەوە. ڕێز لە ئاو و ئاگر و با و چرا و گڵ بگرن ئازاری هیچ کەسێک و

---

(١) تیرە: قەبیلە، هۆز، عەشیرە دەگرێتەوە، دیارە ئێزدییەکان قەبارەیەکی وا بچووکیان نییە، کۆمەڵێکی گەورەی خاوەن باوەڕێکی تایبەتن لە گەلی کورد.
جا بەم پێیە ئەوان (طائفە)ی عەرەبیان پڕ بەپێستە، سەیر لەوەدایە وشەی (تایەفە) لە کوردیدا بۆ کۆمەڵێکی بچووکتر لە هۆز و عەشیرە و تیرە بەکاردێ؛ چەند خێزانێکی نێزیک.

هیچ گیانلەبەرێکیش نەدەن، دۆستایەتی بپارێزن و گفت و بەڵێنیش رابگرن. هەروەها یەک بن و کۆک بن و هۆگری یەکتریش بن... بەڵێ ئەمانە و گەلێکی تریش لە ئایینی زەردەشتی لە ئایینی یەزیدیدا ئەبینرێ. بەڵام شوێنەواری ئایینەکانی (سروشت پەرستی) و (بوراهمایی) و (مانی) و (بت پەرستی) و (ئیسلام)ی تیا پەیدا بووە، کە زۆربەی بیروباوەڕ و کردەوە ئایینییەکانیان لەگەڵ ئایینی زەردەشتیدا رێککەون و زیانیشیان گەیاندووە بەکۆمەڵایەتی و ژیانی تیرەی یەزیدی. جا برا یەزیدییە رۆشنبیرەکانمان کە ئەڵێن بنچینەی ئایینەکەمان زەردەشتییە. بێ گومان رۆژێک دێ ئەکەونە سەر ئەو خەباتەی کە ئایینی یەزیدی بەتەواوەتی پاک بکاتەوە لەو بیروباوەڕە بێگانە و ناسازانەی کە زیانێکی یەجگار گەورەیان گەیاندووە بەناوبانگی یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی و بەژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و خوێندەواریی برا یەزیدییەکانمان. هەر کاتێکیش ئەوەیان کرد و بۆیان چووە سەر ئایینە پاکە روونە بێ گەردەکەی زەردەشتییان لە شێوەیەکی شەنگ و شۆخ و تەواودا بۆ دێتەوە بەرهەم. کە ئەگەر پێڕەویی بکەن بێ گومان لە هەموو دەرد و ئازارێک رزگاریان ئەکات و رۆژ بەڕۆژیش بەرەو ئازادی و کامەرانی و پێشکەوتنیان ئەبات. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە ئایینی زەردەشتی. وەک لە نووسراوی (زەردەشت)دا پیشانم داوە، ئایینێکی خواییە و، بەسەرچاوەی هەموو ئایینە ئاسمانییەکانی پاش خۆی دائەنرێ هەروەها شوێنەواری ئەو لە گەلێک راستی پەرستی و وێژەکانی جیهانیشدا دیارە، بێجگە لە ئایینە ئاسمانییەکان.

ئیمرۆ ژمارە سەری برا یەزیدییەکانمان خۆی ئەدات لە سەد هەزار کەسێک. بریتین لە چەند هۆزێکی جوێ جوێ، کە ئایینی یەزیدی لەژێر سێبەری خۆیدا کۆی کردوونەتەوە. بەهەموو لایەکی کوردستانی گەورەیشدا بڵاوبوونەتەوە. یەزیدییەکان لە هەموو کوردێک پتر خوێنی خۆیان و، ئایینی باووباپیری خۆیان پاراستووە. لەسەر ئەم ئایینەیش کە ئێستا هەیانە، حەوت سەد ساڵی خشت لەناو دوژمنایەتی و تەنگانە و شەڕ و شۆڕ و کارەساتی سامناک و خوێنیندا ژیاون، بەهۆی زۆرداریی گەورەکانی خۆیان و ستەمکاریی دراوسێکانیانەوە. تەنیا لەم چەرخی بیستەمەدا پشوویەکیان داوە.

بەڵام یەزیدییەکان سەردەمێکی وایان بەخۆیانەوە دیوە کە ژمارە سەریان گەیشتۆتە ملیۆنە کەسێک کە خاوەنی چەند سەردارنشینییەکی بەهێز و هەرەت بوون، لە چەند جێیەکی کوردستاندا. ئەوەی لێیشیان کوژراوە لە ماوەی ئەم حەوت سەد ساڵەدا بەدوو ملیۆن کەس دائەنرێ. ئەمە بێجگە لە تاڵان و بڕۆ و سەرگەردانی و ماڵوێرانی و ریسواریش کە بەسەریانا هاتووە، کە لە ژمارە نایەن و لە هەموو روویەکیشەوە پاشی خستوون.

ئەمە لە بابەت دیوی دەرەوەی ژیانیانەوە.

بەڵام لە بابەت دیوی ناوەوەی ژیانیشیانەوە، بەهۆی نەخوێندەواریی و دەسکاریی ئایینەکەیانەوە لەلایەن هەندێ پیاوانی ئایینیی خراپی خۆیانەوە و، داونانەوە و تەڵەکەبازیی بێگانانەوە بەمەبەسی داگیرکردنی خاکەکەیان و پچڕینی بەروبوومیان، باری کۆمەڵایەتییان تەواو تێکچووە و، بارستایشی تەواو نزم بۆتەوە. بەواتایەکی رۆشنتر بەشی هەرە گەورەی تیرەکە چەوساوەتەوە و رووت کراوەتەوە بۆ

کەلکی ناپوختەی بەشی هەرە بچووکی تیرەکە و بۆ کەلکی ناپوختەی فەرمانداره بێگانەکان. بەکورتی هەر چوار دەردەکە\کە بریتییە لە زۆرداریی و هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی، بەتەواوەتی لەناو ئەم کلۆلانەدا ڕەگ و ڕیشەیان داکوتاوە و لە کەلکی خستوون، سەرەڕای ئەمەیش بێگانەی دڵ ڕەش و کردەوە نەنگ، هەرچی ناوونا تۆرە و قسەی ناشیرین و پڕوپووچ هەیە ئەوەی دواخستوون. داخەکەم هەندێ کوردەواریی خۆیشمان بەسەرکردەیی هەندێ لە دەسەلاتدارانی جیهانی و ئایینییەوە، لەو بێگانانە خراپتریان پێ گوتون، خراپتریشیان لێ کردوون!.

جا ئەم نووسراوەی منیش هەر بەتەنیا مێژوو نییە و ئاگادارکردن لە چارەڕەشی و ئازار و هاواری چەند ساڵەی ئەم برا کوردانەمان. هەروەها وێژەیشە و ئاراستەکردن. بۆ ئەمەی دەماری مەردایەتیی هەموو کوردێکی سەربەرز و دەروون ئازادیش ببزوێنم بۆ ئەوەی دەستی یارمەتی بۆ ئەم برا کلۆلانەمان، یەزیدییەکان، درێژ بکەن و چییشیان لەدەست بێ لەپێناو گوێزانەوەیاندا بۆ ژیانێکی باشتر و پاکتر و ڕۆشنتر درێغی نەکەن.

برا یەزیدییەکانمان، گوناهیان هەر ئەوەندە بووە کە ویستویانە ئازادیی بیروباوەڕی خۆیان بپارێزن و هەست بەمرۆڤایەتیی خۆیان بکەن و، ناوچەوان بەرزانە بژین. ئەمە ڕاستە کە خۆیشیان هەندێک هەڵە و تاوان و گوناهیان هەیە دەربارەی خۆیشیان و دەربارەی دراوسێکانیشیان. بەڵام ئازایەتی و مەردایەتییان، ئارام و بەرگەگرتنیان بەرامبەر دوژمنانی دڵ ڕەق و دڕندە و بەهێز، ورە بەرنەدان و کۆڵ نەدانیان بەرامبەر کارەساتی سامناک، یەکێتی و کۆکییان لەناو خۆیاندا. دڵسۆزی و خۆبەختکردنیان لەپێناو ئایین و ئامانجیاندا، لە مێژووی کوردەواریدا بەسەرکەفی زێڕ نووسراونەتەوە.

نزیکەی ساڵ و نیوێک لەناویاندا ژیام، لە چاکی و پاکی و مەردایەتی بەولاوە هیچی ترم لێ نەدین. دیسانەوە ئەیڵێمەوە: بنچینەی ئایینەکەیان (زەردەشتی)یە. خوای پاک و تاک و تەنیا ئەناسن، نەک دێو (شیطان) حەز بەچاکەکاریی ئەکەن، نەک خراپەکاریی، هەرچی کردەوە و ڕەوشتی گەورە و بڵند لە ئێمەدا هەیە لە وانیشدا هەیە. هەموو دەم ئامادەن بۆ دۆستایەتی. هەموو دەم ئامادەن بۆ برایەتی و چاکەخوازیی. هەموو دەم تینووی پێشکەوتنن بەڵام داخەکەم، وەک لەمەوپێش پێشانم دا، ئایینەکەیان دەستکاریی کراوە هەر هۆی ئەوەیشە کە باری کۆمەلایەتیان وا نزم بۆتەوە!. ئێمە چەند بتوانین ئەو برا نازدارانەمان پێش بخەین. ئەوەندە خۆمان پێش ئەخەین. جا ئەگەر ئەم نووسراوەم ببێتە هۆی ئەوەی ڕۆشنبیرانی کورد و برا یەزیدییە تێگەیشتووەکانمان دەست بدەنە دەست یەک و دەست بکەن. بەڕاستکردنەوەی باری کۆمەلایەتی و ئابووریی و خوێندەواریی و ئایینی ئەم بەشە گرنگ و بەنرخەی کوردەوارییە، خۆم بەبەختیار ئەزانم.

١٩٦٩/١٠/٨

شاکر فەتاح

## شێخ عدی[1]

بەپێی قسەی هەندێ لە مێژوونووسانی عەرەب:

لە سەدەی پێنجەمی کۆچی دا (شێخ عدی کوڕی مسافری ئەمەوی) کە زانایەکی دەروێشکار (متصوف) و خواناسێکی بلیمەت بوو، پەنای بردە بەر یەکێ لە شاخەکانی کوردستان و لەناو دێرێکی چۆڵی گاورەکاندا، کە کەوتبووە ناو شاخی (لاش)ە[2]وە لە ناوچەی شێخاندا ئارامی گرت و دەستی کرد بەگۆشەگیریی و خواناسیی خۆی هەروەها هەروەک هەندێ مێژوونووسانی عەرەب ئەڵێن: ئەم پیاوە بەچەند پشتێک ئەچێتەوە سەر (مەروان کوڕی حەکەم) کە چوارەم جنشین (خلیفە)ی (ئەمەوی)یەکان بوو لەوێدا، لەناو کوردەکانی هەکاریدا دەستی کردووە بەبڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامەتی و ژمارەیەکی زۆری لەو کوردانە خستووەتە سەر ڕێڕە و (طریقة)ەکەی خۆی کە پێی ئەڵێن (ڕێڕەوی عدوی) کوردەکان بەجگار خۆشیان ویستووە بەجگار فەرمانی میوانداری و جوامێریی کوردانەی خۆیان لەگەڵ نوواندووە و یارمەتی خۆی و کەسوکاریان داوە تا هێز و دەستەڵاتی ئەو خێزانی (ئەمەوی)یە گەیشتۆتە ڕادەیەکی وەها کە لە پاش سەدساڵێک، (شێخ حەسەن) ناوێکیان تیا پەیدا بووە، کەڵکەڵەی دامەزراندنەوەی فەرمانڕەوایی (ئەمەوی)ی کەوتووەتە کەللەوە و کۆششی بۆ کردووە.(*)

لە بابەت ڕێڕەوەکەی (شێخ عدی)یەوە. مێژوو هیچ توانج و پلارێکی نییە تێی بگرێ. بەڵکو بەپێچەوانەی ئەوە دڵسۆزی و دەسپاکیی (شێخ عدی) بەرامبەر ئیسلامەتی پێشان ئەدات. نە ناوی (یەزیدی) هەیە، لە سەردەمی ئەودا و نە ناوی بۆ (شیطان) پەرستی. هەتا ما بانگی دا بۆ کردەوە و ڕەوشتی جوان و دەروونی پاک. مێژوو تەنیا ئەوەندە لەسەر (شێخ عدی) ئەژمێرێ کە (ئەمەوی)یەکانی بنەماڵەی خۆی بەجگار خۆش ویستووە(**) هەموو دەم پیاهەڵداون و لەسەری کردوونەتەوە. تەنانەت (یەزیدی کوڕی معاویەی ئەمەوی)یشی پاک کردۆتەوە لە هەموو گوناهەکانی، کوردەکانی هەکارییش ئەمەندە بڕوایان بە(شێخ عدی) بووە. خۆشەویستی (یەزیدی کوڕی معاویە) بەجارێک چووەتە دڵیانەوە. بەڵام بەجۆرێکی وا کە لە پاش ماوەیەکی (١٠٠) ساڵی، پاش (شێخ عدی) ئەو (یەزید)ەیان گەیاندووەتە پایەی خوایی و پەرستویانە.

بەپێی سەرگوزشتەکانی ناو (یەزیدی)یەکانیش ئەم (شێخ عدی)یە وەک یەکێک لە دەروێشکارە

---

(١) عدی: عودەی، شێخ ئادی.

(٢) ڕاستتر: لالش.

(*) بەپێ نووسراوی (الیزیدیة)، صدیق الدملوجی، ساڵی ١٩٤٩ بەڵام (رامیشوع) و (مسیونو) ئەڵێن شێخ عدی کورد بووە و لەسەر ئایینی زەردەشتیش بووە (ش. ف.)

(**) دوامین جێنشینی ئەمەوی (مەروانی دووەم کوڕی محەممەد کوڕی مەروان کوڕی حەکەم)ە، دایکی کورد بووە و لە کوردستانیشدا لەدایک بووە و پێگەیشتووە. بەسایەی کوردەکانیشەوە پایەی جێنشینیی دەست کەوتووە، دوور نییە باپیرانی شێخ عدییش لە دۆستەکانی ئەو بووبن کە کورد بوون (ش.ف).

گەورەکان. ئامۆژگاریی کردوون کە جنێو بەکەس نەدەن، هەتا بەدێو (شیطان)یش بەڵام تاکو ئێستایش بەڵگەیەکی مێژوویی وامان دەست نەکەوتووە کە پشتی ئەم سەرگورشتەیە بگرێ. ئەمەیش لە پیاوێکی خواناسی وەک ئەوەوە دوورە سەیر ئەوەیە لە پاش شێخ عدی بەسەد ساڵ کە ئایینی یەزیدی لەسەر دەستی (شێخ حەسەن)دا دامەزرا، ئەم شێخ عدییە لەگەڵ (یەزیدی کوڕی معاویە) و (شێخ حەسەن)دا هەر یەکە وەک خوایەک لەلایەن یەزیدییەکانەوە ئەپەرستران![*] ئێستاکەیش یەزیدییەکان گۆڕی (شێخ عدی)یان کردووە بەمەڵبەندی پەرستگاهی خۆیان. هەموو ساڵێ سەری لێ ئەدەن و (حەج) لەوێ ئەکەن!.

مردنی (شێخ عدی) لە ساڵی (٥٥٥) کۆچیدا بووە.

## ئایینی کوردەکان لەو سەردەمەدا

پێش ئەمەی دەست بکەین بەمێژووی ژیانی (شێخ حەسەن کوڕی ئەبی ئەلفاخر شێخ عدیی دووەم) یاخود شێخ عدی کوردیی کە بەدامەزرێنەری (ئایینی یەزیدی) دائەنرێ، پێویستە سەرنجێک لە ئایینی کوردەکانی ئەو ناوچەیە بدەین کە (شێخ عدی) لەناویاندا ژیابوو. وەک لە ڕەوشتی یەزیدییەکانی ئیمڕۆوە بۆمان دەرئەکەوێ چ لە ڕووی ئایینەوە، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەروەها وەک لە ناوەڕۆکی هەردوو نووسراوە ئایینییەکانی یەزیدییەکانەوە بۆمان دەرئەکەوێ، (جیلوە) و (مصحفارەش)، ئەبێ کوردەکانی ئەو ناوچەیە ئەو سەردەمە، لەپێش ئیسلامەتییاندا لەسەر دەستی (شێخ عدی)دا لەسەر ئایینی زەردەشتی بووبن[**] بەڵام بەجۆرێکی وا کە تێکەڵ بووبێ بە(ئایینی مانی) و (ئایینی سروشت پەرستەکان)ی هیند و ئێرانی و هیند و ئەورووپایی بێجگە لەوە شوێنەواری گەلێک ئایینی تریشی تیایە وەک ئایینی (بوراهمایی) و (ئیسلام). ئایینی مانی و ئاینی سروشت پەرستیش، هیچیان لەگەڵ ئایینی زەردەشتیدا ڕێک ناکەون. چونکە لە ئایینی زەردەشتیدا هەر یەک خوا هەیە بەڵام لە دوو ئایینەکەی تردا لە خوایەک پتر هەیە. خوای چاکە هەیە و خوای خراپە. خواکانی هێزە سروشتییەکان هەن وەک: ڕۆژوو و مانگ و ئەستێرە و باو فەلەک و ئاسمان.

خوای ئاسمان لە ئایینی (سروشت پەرستەکان)دا لە هەموو خواکان گەورەتر بووە پێیان گوتووە. (دیاوس). بەپێی لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا (تۆفیق وەهبی)[***] ئەم وشەیە بەرە بەرە گۆڕاوە و تا بووە بە(تاووس) کە ئەمیش لەلای یەزیدییەکان پێی ئەڵێن: (تاووسی ملک). کە خوایەکی گەورەیانە[****]

هەرچی (زەردەشت) پێغەمبەر بوو، ئەوانەی (ئەهریمەن)، واتا خوای خراپەکاریان ئەپەرست، پێی

(*) ئەمە بەپێی قسەی نووسەرانی بێگانەیە بەڵام لە ڕاستیدا یەزیدییە ڕۆشنبیرەکان لە خوا خۆی بەولاوە کەسی تر بەخوا ناناسن. لەو سێ کەسە هەر ڕێز ئەگرن. (ش. ف).

(**) خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، محمد امين زكي. (ش. ف)

(***) تەماشای ژمارەکانی گەلاوێژ بکە، ساڵی ١٩٤٠، وتارەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی. (ش.ف)

(****) ئەمە بەپێی قسەی نووسەرانی بێگانە و ئەو جیلوەیەی لەبەر دەسماندایە بەڵام یەزیدییە ڕۆشنبیرەکان فریشتە تاووس هەر بەفریشتەیەکی خۆشەویستی خوا دائەنێن نەک خوا. (ش.ف)

ئەگــوتن دەنیـڤــەیسنە). کــە واتاکــەی بەکــوردیی ئــەیــرۆ (دێوپەرست) ئەگــرێتــەوە هەرچی هێــزە سروشتییەکانیشی ئەپەرست. بەلای (زەردەشت)ەوە هەر بە(دێوپەرست) دائەنران، کە (شیطان پەرست) ئەگرێتەوە. جا بەپێی لێکۆڵینەوەکانی مامۆستا (تۆفیق وەهبی) دوور نییە کە وشەی (دەئیڤەیسنە) بەرە بەرە گــۆڕابێ تا بووبێ بە(داسنی) بەواتایەکی تر ئەم (داسنی)یانەی کــە هەتا ئە مــاوەی دواییــەش کوردەواری بە(یەزیدی)یەکانیان ئەگوت، لەپێش ئیسلامەتییەکەیاندا لەسەر ئاییتی سروشت پەرستی بوون، ویەکا کوردەکان لەسەر زمانی (ئاوێستا) هەر بەناوی (داسنی)یەوە ناویان بردوون لە ڕاستیشدا یەزیدییەکان، بەلای پیاوانی ئایینە ئاسمانییەکانەوە بە(دێوپەرست) دائەنرێن بۆیەکا تا ئەم ماوەی دواییەش هەر پێیان ئەگوتن (داسنی). شاخی (داسن)یش هەر بەناوی ئەو داسنییانەوە ناو نراوە. کە کەوتۆتە ناوچەی دەسەلاتی (شێخ عدی)یەوە لەناو (هەکاری)دا.

بێجگە لەمە مێــژوویش ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە (دێوپەرستی) ئایینێک بووە، هەتا دەرکــەوتنی ئیسلامیش هەر بووە لە خاکی ئێراندا. بەلام ڕۆشنبیرانی یەزیدی، خۆیان ئەڵێن، ئایینی یەزیدی. لە بنچینەدا (ئایینی زەردەشتی)یە بەلام لەبەر ئەمەی خۆمان کەم تەرخەمیمان بەرامبەری نواندووە و زۆر لە نووسراوە ئایینییەکانی خۆمان نەنووسیوەتەوە و، بایەخمان نەداوە بەخوێندن، دەسکاریی تیا کراوە تا وای بەسەردا هاتووە کە هاتووە. لە ڕاستیشدا ئایینی زەردەشتی، لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە بنچینەدا بەئایینی فەرمانڕەوایی (میدیا) و (فارس) دانرابوو بەلام تووشی گەلێک کارەساتی گرنگ هات، کە بەهۆی ئەوەوە بەتەنیشت ئەویشەوە ئایینەکانی پێشووی کوردەواری وەک (سروشت پەرستی) و (دوو خوا پەرستی) دووبارە هاتنەوە کایەوە. لە سەردەمی ساسانییەکاندا (ئایینی مانی)یش هاتە ناوەوە. ئیتر لەناو گێژاوی کارەساتی سامناکی ڕۆژگاردا، ئەمانە هەموو بەتەنیشت یەکەوە لەناو کوردەوارییدا بلاوبوونەوە. زۆربەی ئایینی زەردەشتیان لەبیر چووبووەوە. جا هەر لەبەر ئەمەیشە کە زۆربەی نووسەرە بێگانەکان بەهەڵەدا چوون و نەیانزانیوە کە ئایینی زەردەشت جیایە و ئەو ئایینە کۆنانەیش جیاوازن[*].

هەرچی ئایینی زەردەشتییە، لە کۆنترین ئایینی یەکێتیی خوایە لە پایەدا وەک هەر سێ ئایینە ئاسمانییەکانی تر، واتا ئیسلام و مەسیحی و موسایی وایە جا قسەی یەزیدییەکان ڕاستە، کە ئەڵێن ئێمە ئایینەکەمان لە بنچینەدا زەردەشتییە واتا خوا ئەپەرستین و دێو (شیطان) ناپەرستین ئەوەندە هەیە پێویستە ئایینی یەزیدی ئێستایان لە بێژنگ بدەن. تا هەرچی بیروباوەڕێکی بێگانەی تیایە لێی بکەوێتە خوارەوە. هەر تەنیا ئایینە پاکە ڕوونە پیرۆزەکەی (زەردەشتی)ی تیا بمێنێتەوە کە ئایینێکی خواییە. ئەوساکەیش کە وایان لێ کرد، ئیتر کەس ناتوانێ گلەییان لێ بکات ئەگینا ئایینی یەزیدی، لە شێوەی ئێستادا کە هەیە لە زۆر ڕووەوە، پێچەوانەی ئایینی زەردەشتییە.

---

(*) نووسەرانی بێگانە لەمەدا زۆر بەهەڵەدا چوون: چونکە لە ڕاستیدا یەزیدییەکان دێو (شیطان) ناناسن و لە ئایینەکەیشیاندا نەماوە (فریشتە تاووس)یش سەرچاوەی کردەوە و ڕەوشتی چاکە و دادپەروەری نەک سەرچاوەی خراپە. (ش.ف)

کەواتە ئایینی یەزیدی ئیمڕۆ بریتییە لە پاشگەزبوونەوەیەک لە ئیسلامەتی، بۆ ئایینە کۆنەکەی باووباپیریان کە بریتییە لە زەردەشتی بێجگە لەوە لە ئاینییەکانی تریشەوە گەلێک بیروباوەڕی تری تێ کەوتووە وەک ئایینی مانی و (بوراهمایی) و سروشت پەرستی و (ئیسلامی) لەگەڵ ئەمانەیشدا هەمووی ئایینی یەزیدی، ئایینێکی سەربەخۆیە، لە شێوەی گشتیدا لەو ئایینانە، لە هەموویان جیاوازە.

## شێخ حەسەن

ئەم پیاوە یەزیدییەکان (شێخ شەمس)یشی پێ دەڵێن. لە نەوەی برازای (شێخ عدی)ی گەورەیە(*) لە ساڵی (٥٩١)ی کۆچیدا لەدایک بووە. پاشان کە خوێندنی تەواو کردووە و باوکی مردووە، لە جێی ئەو بووە بەشێخی (ڕێڕەوی عدوی) خاوەنی زیرەکی و بلیمەتییەکی تەواو بووە. زرنگ و مەند و زۆرزان بووە. زانا و وێژەوان و هونەرمەند بووە.

خاوەنی گەلێک نووسراویش بووە لە زانست و دەروێشکارییدا. شەش ساڵێک لەسەر یەک چووەتە پەناوە و خەریکی دانانی نووسراوێک بووە، کە ناوی ناوە (الجلوه لأهل الخلوه). هەرچی بیروباوەڕێکی خۆی هەبووە تێی فرێ داوە، کە پێچەوانەی ئیسلامەتییە: بەڵام ئەو نووسراوە تا ئێستایش و ونە و نەدۆزراوەتەوە.

«ئاینی یەزیدی» ئەم پیاوە دایناوە، کە لە زۆر ڕووەوە لە ئیسلامەتی و زەردەشتی تەواو جیاوازە. بەڵام دۆستەکانی «شێخ حەسەن» ئەم ئایینەیان بەلاوە خۆش بووە پەسەندیان کردووە باوەڕیان پێ هێناوە. پایەی خۆیشیان ئەمەندە بڵند کردبووەوە لە ژوور پایەی مرۆڤەوە دایاننابوو. دوایی کردیان بەیەکێک لەو حەوت خوایانەی کە ئەیانپەرستن. ناویان نا (دەردائیل) کە فریشتەیەک بوو لە فریشتەکانیان(**)!

مێژوونووسەکان ئەمەیان لەسەر (شێخ حەسەن) ژمار دووە. تەنانەت یەکێکیان توانجی تێ گرتووە. گوتوویەتی داوای خوایەتی ئەکات!. (شێخ حەسەن)یش کە خۆی بەو جۆرە هاتۆتە پێش چاو کە کۆمەڵێکی زۆری لەو دەروێشانە لێ کۆبووەتەوە کە باوەڕی پێ ئەهێنن، خوتوکەی پێ کەوتووە بۆ کلاوبازیی! ویستوێتی ئەو تاوانی چەند ساڵەیەی کە لە دڵیابوو بۆ دامەزراندنەوەی (تەختی ئەمەوی) دەست بکا بەهێنانەدی. ویستوێتی هەڵگەڕانەوەیەکی گەورە بهێنێتە گۆڕێ وە لە ئایین و باوەڕو و زرنگکاریی (سیاسەت) و هەموو شتێکا چونکە مەبەسی لە دانانی (ئایینی یەزیدی)یش هەر بەدیهێنانی ئەم ئاواتە بووە! بەڵێ.

(شێخ حەسەن) لەسەرێکەوە ئەیویست هەڵگەڕانەوەیەکی ئایینیی فراوان بەرپا بکا و شیعەیەتی لە

---

(*) باوکی ئەم (شێخ حەسەن)ە ناوی (شێخ عدیی دووەم)ە کە پێی ئەڵێن شێخ عدیی کوردی ڕەنگە ئەم بێ کە یەزدییە ڕۆشنبیرەکانی شێخان ئەڵێن یەزیدی بووە و زەردەشتییش بووە بۆیەکا خۆشمان ئەوی نەک شێخ عدیی یەکەم ڕەنگە هەر ئەمیش بێ کە (ڕامیشوع) ئەڵێ کوردە و زەردەشتییشە. (ش.ف)

(**) بێگانەکان بەلایانەوە وایە کە یەزیدییەکان حەوت خوایان هەیە. بەڵام لە ڕاستیدا هەر خوایەکی تاک و تەنیا ئەناسن و حەوت فریشتەکە ئەو خوایە دروستی کردوون. (ش.ف)

بنەڕەتەوە تێک و مەکان بدات. هەروەها ئەیویست فەرمانڕەوایی بخاتە ژێر چنگی خۆیەوە، «لە خاکی (جزیرە) و شاخەکانی (هەکاریی)دا شەنگ و شۆخیی فەرمانڕەوایی (ئەمەوی)یە[*]کانی باپیرانی خۆی زیندوو بکاتەوە و بەرە بەرە پەرەیش بەدەسەلاتی خۆی بدات» بەلام (شێخ حەسەن) ماوەی نەدا بەخۆی تا تەواو ئامادەبێ ئارامی نەگرت. زوو نیازی خۆی ئاشکرا کرد. (بدرالدين لؤلؤ)یش کە خاکی (موصل)ی لە ژێر چنگا بوو، بەهاریکاریی (دەستەی شیعەکان)ەوە کە دوژمنێکی خوێنینی (ئەمەوی)یەکان بوون، توانیی (شێخ حەسەن) لە تەکیەکەی موسلیا بگرێ و پاشان لەناو دژ (قەلا)ی موسلدا بیخنکێنێ و بزووتنەوەکەی لە بێشکەدا گۆڕ بکات ئەو دەمە سالی ٦٤٤ی کۆچی بوو. (بدرالدين) بەمەیش وازی نەهێنا، گەلێک هەلمەتی بردە سەر کەسوکار و پەیڕەوانی (شێخ حەسەن) لە (لالش)دا.

لە دوا هەلمەتیدا کە لە سالی (٦٥٢)ی کۆچیدا بوو، گەلێکی لێ کوشتن و گەلێکیشی لێ گرتن بەدیل سەد کەسی لێ کردن و بەدارا و سەد کەسیشی لێ سەربڕین. سەرۆکە کەیشیانی پارچە پارچە کرد و، بەسەر دەرگاکانی موسلەوە پارچەکانی هەلواسین گالیشیدا گۆڕی (شێخ عدی)یان هەلگێڕایەوە و ئێسکەکانیشیان سووتاند!.

(بدرالدين لؤلؤ)ی ئەرمەنی ڕەگەز و (شیعە) بازی نا ئیسلام، بەم کەتنە گەورانەی کە هیچ دڕندەیەک ئەوەندە سووکیی لە دەست نایەت بیکات دەرگای شەڕ و کوشتار و دوژمنایەتییەکی حەوت سەد سالەی لە نێوان یەزیدییەکان و ئیسلامەکاندا کردەوە. کە هەتا کوردەواریی ئەمێنێ ئەو مەرگە ساتانەیان لەبیر ناچێتەوە!

کەسوکاری (شێخ حەسەن)یش لەتاو گیانی خۆیان هەر یەکە بەلایەکی کوردستان و جێگایانی تردا بلاوبوونەوە هەندێکیان ئایینی یەزیدییان بلاوکردەوە. هەندێکیشیان هەر بەدوای کلاوی بابردووەوە بوون. لەژێر پەردەی ئاییندا بۆ دەسەلاتداریی خۆیان خەباتیان ئەکرد. بەلام ئەمەیان، بۆ کەسیان سەری نەگرت.

(شێخ حەسەن) ئەمەندە ڕێڕەوەکەی خۆی بەتەواویی دامەزراندبوو ئەمە حەوت سال پترى بەسەرا تێپەڕیوە، بەم هەموو کارەساتە سامناک و دڕندانەیشەوە کە بەسەر یەزیدییەکاندا هاتووە، هیچی بەسەر نەهاتووە!...

داخەکەم نووسراوە ڕاستەقینەکەی (الجلوه لارباب الخلوه)مان ناکەوێتە بەردەست. چونکە دوور نییە کە لەناو ئەو هەموو شەڕ و شۆڕ و کوشتار و تالانانەدا لەناو برابێ، بێ گومان پڕ بووە لە بیروباوەڕی بەهێز و ئامانجی گەورە گەورە ئەگینا ئەم جۆرە شۆڕشەی لەناو ئەم کوردانەدا بوو بەڕیا نەئەکرا، کێ ئەلێ نووسراوانی تریشی نەبووە و لەناو ئەو هەلمەت و پەلامارانەدا لەناو نەچوون؟!.

---

(*) ئەمە بەلای هەندێ لە نووسەرانی عەرەبەوە وایە بەلام لە ڕاستیدا (شێخ حەسەن) گیانێکی پاک و بەهێز و هەڕەتی کوردایەتی بووە نەک (ئەمەوی) خوازبێ. ئەمەیش لە (مصحفارەش)دا کە بەشێکە لە نووسراوە ئایینییەکەی ئەو بەئاشکرا دیارە. (ش.ف)

بەم ڕەنگە ئایینی (یەزیدی) لە (شێخ حەسەن)ەوە دەستی پێ کرد لە کوشتنی ئەویشەوە کارەساتی مێژوویی ئەم ئایینە دەستی پێ کرد(*).

## تۆ بڵێی شێخ عدی کورد بووبێ؟

- صدیق الدملوجی و هەندێک لە نووسەرانی عەرەب ئەڵێن شێخ عدی عەرەب بووە و ئەمەوی.

- مێژوونووسان (رامیشوع) و (مسیونو)یش ئەڵێن کورد بووە و زەردەشتی.

- شێخ سلێمانی یەزیدی کە خۆی لەبەرەی شێخ عدی دووەمە بەمنی گوت ئێمە کە یەزیدیین شێخ حەسەغان بۆیە خۆش ئەوێ چونکە یەزیدی بوون و زەردەشتی. نەتەوەی یەزیدییش سەرچاوەی کوردەوارین لام وایە قسەکەی شێخ سلێمان (شێخ عدی دووەم) ئەگرێتەوە.

- (مەروانی دووەم کوڕی محەمەد کوڕی مەروانی کوڕی حەکەم) کە دوامین جێنشینی ئەمەوی بووە، دایکی کورد بووە. لە کوردستاندا لە دایکبووە و پێگەیشتووە و سەرداریشی لە باوکیەوە بۆ ماوەتەوە لە کوردستاندا بەیارمەتیی لەشکری کوردیشەوە شامی گرتووە و جێنشینی ئەمەوی دەستکەوتووە دوور نییە باپیرانی شێخ عدییش لە دۆستە کوردەکانی ئەو بووبن کە لە پاش نەمانی فەرمانڕەوایی ئەمەوی گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان.

- (شێخ عدی دووەم کوردی) و (عزالدین یوسفی کوردی) و (شێخ محەمەدی کوردی) هەرسێکیان لە سەردارە گەورەکانی یەزیدین و لە نەوەی برازای شێخ عدی یەکەمن پاش ناوی کوردی بەناوەکانیانەوەیە.

- بەپێی مصحفارەش سەردارەکانی یەزیدی لە نەوەی شاپووری یەکەم و شاپووری دووەمن ئەم دوانەیش کوردن و لە شاهەکانی ساسانین بێجگە لەوە زەردەشتیشن.

- شێخ حەسەن کوڕی شێخ عدی دووەم، لە نووسراوەکەیا مصحفارەش گیانێکی کوردایەتیی پەتیی بەهێز و هەڕەت ئەبینرێ. مصحفارەشی بەزمانی کوردی نووسیوەتەوە.

- بەفەرمانی سەرداری شێخان (شێخ محەمەدی کوڕی ئەربیلی) ناوی شێخ حەسەن گۆڕا و کرا بە(حسن البصری) کەواتە ئەگونجێ کە شێخە یەزیدییەکان بۆ مەبەستێکی تایبەتی و خۆیان ناوی بنەماڵەکەی خۆیان گۆڕیبێ و کردبێتیان بە(ئەمەوی).

- لەبەر ئەمانە هەمووی من لەو باوەڕەدام کە بەرەی شێخ عدی کورد بوون و هیچی ترا!

---

(*) بەپێی قسەی لە خواترس (رامیشوع) کە لە سالی (٨٥٦)ی کۆچیدا نووسراوەکەی خۆی نووسیوەتەوە، (دیری لالش) بەدەست گاورەکانەوە بووە. گاورەکان مەڕەکانی خۆیان دابووە دەست (مسافر)ی باوکی (شێخ عدی) کە بەخێو بکات. بەڵام دوای ئەو شیخ عدی کوڕی دێرەکەیش و زەوییەکانی دێرەکەیشی لە گاورەکان داگیر کرد. سەرداری مەغۆڵەکان (باطو)یش لەسەر ئەمە (شێخ عدی کوڕی مسافر)ی گرت و کوشتی!... ئەو دەمە سالی (٦٢٠)ی کۆچی بوو... هەرچی (شێخ عدی یەکەم)ە لە سالی (٥٥٥)ی کۆچیدا مردووە، جا بەپێی قسەی مێژوونووسی کورد (محەمەد ئەمین زەکی بەگ) ڕەنگە ئەم (شێخ عدی)یەی کە کوژراوە (شێخ عدی دووەم) بێ کە باوکی (شێخ حەسەن)ە نەک شێخ عدی یەکەم. (ش.ف)

## ناوی یەزیدی

– یەزیدییەکان بەخۆیان ئەڵێن (ئێزدی)، نەک (یەزیدی). ڕەنگە مەبەسیشیان ئەوەبێ کە خۆیان خواپەرستن، نەک دێو پەرستن.

– پەندێکی پێشینانی یەزیدی هەیە، پشتی ئەو ڕاستییە ئەگرێ کە ئەڵێ: ئەم (ئێزدی) نە ئپ قەتێ نانی جەهی ئت ڕازی نە».

– نووسەری شۆڕشگێڕی کورد (ئیحسان نوری پاشا) لە نووسراوە بەنرخەکەیا: (تأریخ ریشە نژاد کورد) کە بەزمانی فارسی داینا‌وە ئەڵێ:

«ئێزدی تیرەیەکن لە کورد، کە لە هەموو تیرەکانی تری کورد زۆرتر هۆگری ئایینی خۆیان بوون و لەسەری ماونەتەوە. ناویان بەئێزدی دەرچووە. کوردەکان خۆیشیان بەناوی (ئێزدی)یەوە ناویان ئەبەن بەڵام نەتەوەکانی تر ئەو وشەیەیان گۆڕیوە و کردوویانە بە(یەزیدی).

شاە پووری دووەم لەسەر بەردێک کە لە (حاجی ئاباد)دا بەیادگار داینا‌وە، خۆی وا پێشان ئەدات.

«منم پەرستگاری (موزدا)، بەگی (هورمزد)، شاە پووری (ئێزدی) نەژاد، شاهەنشاهی (ئێران) و (ئەتیران)!»...

– شاە پووری دووەمیش وەک مێژوو پێشانی ئەدات شاهێکی ساسانییە و لە بنەماڵەیەکی کوردی ئێرانە. زەردەشتییش بووە.

– هەروەک لە نووسراوی (مصحفارەش)یشدا پێشان دراوە، ئەم شاە پووری دووەمە لە شاهەکانی (یەزیدی) بووە و سەردارەکانی ئێستای (یەزیدی) لە نەتەوەی ئەون. ئەمەیش ئەوە ئەگەیێنی کە یەزیدییەکانیش زەردەشتین.

– لە نووسراوی (مصحفارەش)دا ئەڵێ نەتەوەی یەزیدی لە (یەزدان) ناوێک کەوتۆتەوە، کە کوڕەزای (بابە ئادەم)ە.

– بەپێی لێکۆڵینەوەکانی (مامۆستا تۆفیق وەهبی): لە (ئاڤێستا)دا کە نووسراوی خوایە و بۆ (زەردەشت) پێغەمبەر هاتووەتە خوارەوە، وشەی (یەز) هەیە کە ماناکەی ڕێزگرتن و پەرستن ئەگرێتەوە. لە کۆڕی ئایینییشدا مانای پێشکەش کردنی سوپاس و کوشتنی، پیا هەڵدان ئەگرێتەوە بۆ خوا، لە ئایینی (مەزدەسنی) یاخود (زەردەشتیی تازە)یشدا وشەی (یەزەتە) بۆ گیانە ئاسمانییەکان دانراوە. ئەگونجێ ئەم وشەیە گۆڕابێ و بووبێ بە(یەزەت)، ئینجا بە(یەزەد) یاخود بە(ئێزەد) ئینجا بە(یەزد)، ئینجا بە(یەزدان) کە ڕێزگرتنێکی فرە ئەگرێتەوە کە بۆ پایە بڵند و گەورەیەکی وەک (خوا) شایستەبێ.

– لە زمانی کوردیدا چ (ئێزەد)، چ (یەزدان) هەردووکیان بەخوا ئەڵێن.

– جا لەبەر ئەم هەموو هۆیانەی سەرەوە من لەو باوەڕە دام کە یەزیدییەکان یان بەناوی (یەزدان)ی باپیرە گەورەیانەوە ناونراون (ئێزدی) یاخود (یەزیدی)، یاخود بەناوی ئەوەوە خۆیان ناو ناوە (ئێزدی) کە خواپەرستن، نەک دێوپەرستن.

- بەواتایەکی تر ناوی (یەزیدی) ناچێتەوە سەر ناوی (یەزید کوڕی معاویە)[*]

## نووسراوە ئایینییەکانی یەزیدی

یەزیدییەکان هەردوو نووسراوی ئایینییان هەیە[1]:

(جیلوە) و (مصحفارەش) هەردووکیشیان بەزمانی کوردی نووسراونەتەوە هەرچی نووسراوی (جیلوە)یە، بەشێوەیەکی ئاسمانی نووسراوە هەروەک پەرستراوی گەورەی یەزیدییەکان، لە شێوەی سروش (وحی)دا بۆ بەندەکانی خۆی کە یەزیدییەکانن قسەی کردبێ وایە. لێرەدا خوای یەزیدییەکان لە کۆنیی خۆی و نەمردنی خۆی و بەڵێن و هەڕەشەی ئەدوێ. هەروەها لە بابەت گواستنەوەی گیانەکانیشەوە (تناسخ) قسە ئەکات کە چۆن لە چەند کات و لە چەند جێگادا دەرئەکەون، هەندێ ئامۆژگاریی یەزیدییەکانیش ئەکات بۆ یەکگرتن و برایەتییان تا بتوانن بەرەنگاریی ئەوانە بکەن کە لەسەر ئایینی یەزیدی نین. هەروەها ئامۆژگارییان ئەکات کە لە نووسراوانی ئایینیی بێگانەکە پێچەوانەی ئایینی یەزیدین خۆیان دوور بخەنەوە، چونکە دەستکارییان کراوە و وەک خۆیان نەماونەتەوە. پێیان ئەڵێ نە ناوی خۆی بهێنن نە لە کردەوەکانیشی بدوێن. نووسراوە ئایینییەکانی خۆیشیان بەکەس نەدەن، نەوەک بیانگۆڕن. زۆربەی شتومەکیش وەک خۆی بهێڵنەوە. هەندێ لە مێژوونووسانی بێگانە وا تێگەیشتوون کە خاوەنی ئەم (جیلوە)یە ویستوویەتی یەزیدییەکان بەنەخوێندەوارییەوە بهێننەوە[2] بەڵام لە ڕاستیدا مەبەسی (شێخ حەسەن) ئەوە بووە کە ئایینی یەزیدی و یەزیدییەکان بپارێزێ لە تێکچوون. ئەگینا کەسی لە خوێندەواریی بەربەست نەکردووە.

هەرچی (مصحفارەش)یشە، بریتییە لە نووسراوێکی مێژوویی تیرەی یەزیدییەکان. ئەم بەپێچەوانەی (جیلوە) هەندێ بەسەرهاتی تیرەی یەزیدی پێشان ئەدات؛ لەگەڵ هەندێ ڕەوشت و خوویان کەواتە

---

(*) (بەناڕەوا ناوی -یەزیدی- بەسەر ئەم کوردانەدا سەپێنراوە، ئەمانە بەهیچ جۆرێک نەپەیوەندیان بەیەزیدی کوڕی معاویەوە هەیە وە نە بەهیچ یەزیدیێکی ترەوە، بەڵکو ناوەکەیان لە -یەزدانی-یەوە هاتووە کە وشەیەکی کوردی زۆر کۆنە بەهانای -خوا-. ئەم یەزدانییانە کوردن لە نەوەی مادەکان، وە هەر ئەوانن کە لەسەر ئایینی زەردەشتی -ئایینی کۆنی کورد- ماون، بەڵام کەمێک لە پەیڕەوی ئیسلام و مەسیحی تێکەڵ بووە). بڕوانە: ڕۆژی نوێ -گ- ژ (٢) ساڵی (٢) مایسی ١٩٦١ سلێمانی. یەزیدییەکان - بەبێ ناوی نووسەرەکەی - ل ٢١.

(١) من لەو باوەڕەدام کە ئەبێ لە سەرەتادا نووسراوی (مصحفارەش)، (جلیوە) بووبێ و (جیلوەش)، (مصحفارەش) چونکە ناوەڕۆکەکانیان پێچەوانەی ناوەکەیانە دوور نییە هەردووکیان دوو بەش بن لە نووسراوێکدا. (ش. ف).

(٢) دوور نییە یەزیدییەکان هەر یەک نووسراویان بووبێ کە ناوی جیلوەیە. بریتی بووبێ لە چەند بەشێک ئەم دوو نووسراوەی لەبەردەستماندان بریتی بووبێ لە دوو بەشی ئەو نووسراوە بەشەکانی تریشی لەناوچووبن. (ش. ف)

(جیلوه) له شێوەی نووسراوێکی ئاسمانیدا و (مصحفارەش)یش له شێوەی نووسراوێکی زەمینیدا نووسراوەتەوه. هەردووکیشیان خۆیان له (قرآن) نزیک خستۆتەوه. بەڵام له ئامانجدا یەک ناگرنەوه. کاتی دانانیشیان یەک نییه. دانەریشیان هەروەک یەک کەس نییه... وا دیاره دەسکارییان کراوه، بێ گومان ئەمانه (نووسراوه) ڕاستەقینەکان نین ڕەنگه سەد و پەنجا ساڵێک لەمەوپێشیش نووسرابنەوه وەک ئەڵێن گاورێکیش هەردووکیانی نووسیوەتەوه! له نووسراوی (مصحفارەش)دا ئەمانه نووسراوه: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویەکان و بەرزی شاخەکان و دار و درەختەکان که لەناویدان. دروستکردنی فریشتەکان و تەختی کردگار و ئادەم و حەوا، ناردنی (شێخ عدی کوڕی مسافر) له شامەوه بۆ (لالش) نیشتنەوەی فریشته تاووس بۆ سەر زەوی و دامەزراندنی خۆنکاران بۆ یەزیدییەکان و، بەرەنگاری کردنی جوولەکه و گاور و موسڵمان و عەجەمەکان بەرامبەر یەزیدییەکان. هەروەها وا ئەنوسێ که هەرچی نەتەوەکانی مرۆڤ هەیه له نەوەی بابه ئادەم و دایه حەوان. بەڵام باووباپیرانی پێشووی یەزیدییەکان تەنیا له نەوەی ئادەمن. یەزیدییەکانیش له بەرەی سکێک پەیدابوون که بریتی بووه له کوڕێک و کچێک، که له شێوەیەکی سەرسوڕهێنەردا له دایک بوون. له پاش لافاوەکەی (نوح) لافاوێکی تر یەزیدییەکانی گرتۆتەوه. تا ئێستا حەوت هەزار ساڵ بەسەر ئەو لافاوەدا تێپەڕبووه. هەر هەزار ساڵ جارێک خوایەکیان بۆ هاتۆتە خوارێ، دەستوور و ڕێڕەوی بۆ داناون. یەکێک لەو حەوت خوایانه ئەو (یەزید)ه‌یە که پەیڕەوی ئەکەن. هەرچی سەرۆکەکەیانە و یەکەم فریشتەیانە کەس نییە (فریشته تاووس) نەبێ[1] که (شیطان) ئەگرێتەوه. پایەی ئەو فریشتانەیش لەخوار پایەی خوای هەره گەورەیه، که تاک و تەنیا و بەزەبر و زەنگه و هەرچیشی بیەوێ ئەیکات».

وەک مل پەڕاندنی گایەکی سوور و سەربڕینی مەڕ و بزن و نان و چێشت بەشینەوه بەسەر هەژارەکان و سەردان له گۆڕەکان.[2]

## بیروباوەڕی هەندێ له ڕۆشنبیران دەربارەی ئەم نووسراوه

هەندێ له ڕۆشنبیران لەو باوەڕەدان، که ئەم دوو نووسراوەی لەبەر دەستماندان، ئەو نووسراوانه نین که له بنچینەی دامەزراندنی ئایینی یەزیدیدا نووسراونەتەوه. چونکه ئەو شەڕ و کوشتارانەی که (بدرالدین لۆلۆ) له یەزیدییەکانی کردووه، ئەو نووسراوانەیان لەناو بردووه بۆ یەکێکی وەک (شێخ حەسەن)یش که زۆر زانا و وێژەوان بووه: دووره بابەتی وا چرووک و ئەمەندەیش کەم و کورتی بنووسێ. گوایه ئەم چەند لاپەڕەیه بەری لەو شەش ساڵەیه که خۆی پێوه خەریک کردووه؟!

ئەو ڕۆشنبیرانه که (أحمد تیمور)ی میسری یەکێکه لەوان لەو باوەڕەدان که ئەم دوو نووسراوەی لەبەردەستماندان تازه نووسراونەتەوه که تەمەنیان ناگاته سەد و پەنجا ساڵ لەمەوپێش. (صدیق

(۱) خۆیان، یەزیدییەکان ناوی (شیطان) نابەن، پێی ئەڵێن (تاوسێ مەلەک) واتا تاووسی فریشتان (ش. ف).
(۲) بێگانەکان وا تێگەیشتوون که (یەزید کوڕی معاویه) خوایەکه له خواکانی یەزیدییەکان له ڕاستیدا (یەزید کوڕی معاویه) بەلای یەزیدییەکانەوه، پیاوێکی چاکه و ڕیزی لێ ئەگرن. (ش. ف).

الدملوجي) له نووسراوەکەیدا (الیزیدیة) ئەڵێ: «بیر زۆرتر بەلای ئەوەدا ئەچێ کە دانەرانی ئەم دوو نووسراوانە موسڵمان نەبێ، مەسیحی بن، لە گاورەکانی دی (بەحزانی) یاخود کەشیشەکانیان بن لە پاش ئەمەی هەندێ سەرچاوەیان لە شێخە یەزیدییەکان وەرگرتووە و ئەو زانیارییانەیان لێ هەڵهێناوە، نووسراوە کۆنەکانیان لەناو بردووە، تا هینەکانی دەس نووسی خۆیان بچێننەوە ئەمەیش بەوەدا دیارە کە بەنووسینێکی عەرەبیی خواروخێچ و هیچ و پووچ دایانناوە».[1]

(نوری بەگ) لە نووسراوەکەیدا (عبدة أبلیس) وا پیشان ئەدات کە دانەری (جیلوە) خواناس (راهب)ێکی (نسطوری) بووە. کە لە (دێری ئەلگوش) هەڕای کردووە بەدرۆ بووە بەموسڵمان. پاشان پەنای بردۆتە بەر (یەزیدییەکان).

(صدیق الدملوجی) دیسانەوە دەڵێ: «هەرچەندە یەزیدییەکان زۆر بەتەنگ شاردنەوەی بیروباوەڕەکانی خۆیانەوەن لەگەڵ نووسراوەکانیاندا لە کەسانی تر کە یەزیدی نین، کەچی ئێستاکە هیچ نووسراوێکیان لەو نووسراوانە لەلا نەماوە (جیلوە) و (مصحفارەش)یان لێ دەرباز کراوە خۆیشیان بەناستەم شتێکیان لێ ئەزانن!...».

لە بابەت دزینی ئەم دوو نووسراوەوە گەلێک سەرگوروشتە هەیە، کە بەڵگەمان بۆ ڕاستیی هیچیان لەلا نییە. بەلام بێ گومان لەگەلێک لاوە هەوڵ بۆ دزینیان دراوە، لەبەر گرنگییان.[2]

## چاپکراوانی (جیلوە) و (مصحفارەش)

ئەو کەسانەی کە لە بابەت ئەم دوو نووسراوەوە نووسراو یاخود وتاریان نووسیوە ئەمانەن:

١- میستەر - ئیف. فورس: وتارێکی لەسەر یەزیدییەکان داوە لە گۆڤاری جیۆگرافیای خونکاری[3]دا لە ساڵی ١٨٣٩دا.

٢- جی. ب. بادگەر: لە نووسراوەکەیدا (باوەڕی نەستوورییەکان) ساڵی ١٨٤٢.

٣- ئی. هـ. لایارد: لە نووسراوەکەیدا (نەینەوا و شوێنەوارەکان) ساڵی ١٨٤٩. هەروەها لە نووسراوەکەی تریشیا (نەینەوا و بابل) ساڵی ١٨٥٣.

٤- جی. جی. فرایزەر: لە نووسراوەکەیدا (چڵی زێڕین) ساڵی ١٩١١.

٥- ئی. بی. سۆن: لە نووسراوەکەیا (بومیزوپوتامیا و کوردستان بە خۆشاردنەوەوە) ساڵی ١٩١٢.

---

(١) نووسراوە ئایینییەکانی یەزیدی لە بنچینەدا بەزمانی کوردی نووسراونەتەوە مصحفارەش خۆیشی وا ئەڵێ. (ش. ف)

(٢) بەپێی قسەی (یەزیدخان کوری ئیسماعیل بەگ)ی یەزیدی (مصحفارەش)، بەهۆی پیاوێکی ماڵی سەرداری شێخانەوە لە ماڵی میری شێخان دزراوە بۆ کابرایەکی ئەڵمانی ئێستە ئەو نووسراوە لە ناوازە گاهی (کوپەر)دا دانراوە لە شاری (بەرلین)دا بەلام شێخ سلێمان ئەیگوت لە ماڵی پیاوێکی دزراوە کە لەناو چادردا ژیاوە. (ش.ف)

(٣) المجلة الجغرافیة الملکیة.

٦- واگرام له نووسراوەکەیدا (بێشکەی مرۆڤایەتی) ساڵی ١٩١٤.
٧- هـ. ر. درایور: له وتارەکەیا له نووسراوی (چاوپێخشاندنێک بەباوەڕیی یەزیدییە کوردەکاندا) ساڵی ١٩١٧.
٨- و. ب. وو. یی هود: له وتارەکەیا له گۆڤاری دامەزراوی زانستی سروشتی خونکاریی) ١٩١١.
٩- ئای. دیر: له نووسراوەکەیا (مرۆڤایەتی). ساڵی ١٩١٨.
١٠- ئای. جوزیف: له نووسراوەکەیا (باوەڕی دێو) ساڵی ١٩١٩.
١١- بی. هـ. سپرلکت: له نووسراوەکەیا (ڕاز و نهێنیی تیرەکانی سوریا و لبنان) ساڵی ١٩٢٢.
١٢- لەلایەن (براو)یشەوە هەردوو نووسراوەکان (جیلوە) و (مصحفارەش) گۆڕاونەتە سەر زمانی ئینگلیزی. پاش ئەو ڕۆژهەلاتناس (باری)یش دامێنێکی بۆ ئەو نووسراوانە نووسییەوە لە ساڵی ١٨٩٥دا له شاری لەندەن چاپی کردن.
١٣- ڕۆژهەلاتناس (ئەلیزیا جوزیف)یش نووسراوە ڕاستەقینەکانیانی له عەرەبییەوە گۆڕیە سەر ئینگلیزی و، نووسراوێکیشی لەسەردانان ناوی نا (نووسراوەی یەزیدییەکان)، پاشان له گۆڤاری (زمانە سامییەکان)ی ئەمریکادا چاپی کردن.
١٤- ڕۆژهەلاتناسی فەرەنسەیی (ف. نو)یش نووسراوی (جیلوە) و (مصحفارەش) و ئەو هەڵبەستەی کە ئەڵێن (شێخ عدی) گوتێتی، لەگەڵ نوێژەکانی یەزیدییەکان و ئەو سکالایەی کە یەزیدییەکان لە ساڵی ١٨٧٢دا دابوویان بەفەرمانڕەوایی (عوسمانی) تا له سەربازیی ڕەش بگیر بیان بەخشێ... ئەوانەی هەمـوو لەناو نووسراوێکا کۆکردەوە کە ناوی نابوو (کۆمەڵە نووسراو و بەڵگەکان بۆ پێشاندانی یەزیدییەکان)، پەراوێزی لەسەر نووسینەوە کە پیاوی لێکۆڵینەوە ناتوانێ وازی لێ بهێنێ.
١٥- (أب انستانس الکرملی)یش (مصحفارەش)ی گۆڕییە سەر زمانی فەرەنسەی و لەگەڵ نووسراوەکانی خۆیاندا چاپی کردن. له گۆڤاری (المشرق)ی بێروتی و گۆڤارەکانی ئەورووپایشدا وتارێکی زۆری له بابەت باوەڕیی یەزیدییەکان و ڕەوشت و خوویان و دەستووری ئایینەکەیانەوە بلاوکردەوە.
١٦- ئەمانەیش هەموو له بابەت ئایینی یەزیدییەوە لێکۆڵینەوەیان کردووە: (مسیۆ سیوفی) شابەندەری کۆنی فەرمانڕەوایی فەرەنسە له (موصل)دا. (مسیۆ پۆراۆکلیان). (سێرمارک سایکس). (مۆنسنیۆر سامۆئیل جمیل) (جۆزیە فەرلانی)ی ئیتاڵیایی، (میکائیل ئەنجلو)ی ئیتاڵی. (مامۆستا مەنزل). (ئەمبسن) نووسەری ئینگلیز. (عباس العزاوی)، (احمد تیمور پاشای مصری)، (صدیق الدملوجی)، (محمد امین زەکی)، (توفیق وەهبی)، (جلادەت بدرخان)، (مینوریسکی)، (باسیل نیکیتین)، (کامەران بدرخان).
١٧- (عیسی یوسف) ناوێک کە له شاری (نیویۆرک)دا دائەنیشت هەردوو نووسراوەکەی، (جیلوە) و (مصحفارەش)ی بەزمانی عەرەبی دۆزیوە و لەپاش ئەوەی گۆڕیبوونیە سەر زمانی ئینگلیزی له

گۆڤاری (زمان و ویژەی سامییەکان)دا کە لە ئەمریکا دەرئەچوو عەرەبی و ئینگلیزییەکەی هەردوو نووسراوەکەی چاپ کردبوو، بەلام وەک (احمد تیمور پاشا) لە نووسراوەکەیا (الیزیدیه ومنشأ نحلتهم) ئەلێ: لەگەل دانەی ڕاستەقینەی نووسراوەکاندا جیاوازییەکی زۆریان هەیە.

١٨- بەپێی قسەی (احمد تیمور پاشا) یەکێک لە زانا ڕۆژهەلاتناسەکانی (نەمسا)، دانەریەکی لە هەردوو نووسراوەکە بەزمانی کوردی و عەرەبی دۆزیبووەوە، هەردووکیانیشی بەخۆیان و بەگۆڕاوییەوە بۆ سەر زمانی خۆیان لە (ڤیەنا)دا چاپ کردبوو.

بێجگە لەمانە گەلێک کەسی.تریش لە ئایینی یەزیدییەکان دواون بەلام کەمیان لێکۆلینەوەی تەواویان تیا کردووە، یاخود تەنیا بەنیازی زانین و مێژووەوە لەسەریان نووسیوە، چونکە زۆربەیان لە نووسینەکانیان مەبەستێکی تریان بووە نەک ڕاستی و زانست. لەوانە لە هەموویان باشتر (عباس العزاوی) (احمد تیمور پاشا): (صدیق الدملوجی) (امین زکی)، (تۆفیق وەهبی) و (جەلادەت بەدرخان)، (کامەران بەدرخان)ە بەلای منیشەوە وایە کە زانینی تەواوی مێژووی ئایینی یەزیدی و ئایینی یەزیدی هەر ئەبێ لەسەردەستی ڕۆشنبیرانی کورددا پێک بێ، بەتایبەتی ڕۆشنبیرانی یەزیدی، کە هەر ئەوانن ئەتوانن چاک لەگەلیانا تێکەل بن و بچنە بنج و بناوانی ڕەوشت و خووی گەلەکەوە و، ناوەرۆکی ئایینەکەیانەوە و لەناو خاکەکەیاندا بژین و لێکۆلینەوە بکەن. ئەمەیش داخەکەم تا ئێستا بۆ کەسمان نەلواوە. مەگەر لە پاشەڕۆژێکی چاکتردا ئەمەمان بۆ بگونجێ. خۆیشم کە لە سالی (١٩٤٨)ەوە لە -شێخان- بووم و فەرمانم ئەکرد بۆ فەرمانڕەوایی. ئەوەندەی دەستم پەرژا لێکۆلینەوەم لە ئایینی یەزیدییەکاندا کرد و تێکەل بەیەزیدییەکان بووم بۆ پرسین و سەرنجدان، بەلام داخەکەم ڕۆژگار ماوەی نەدام کە بچمە -سنجار- و جێگاکانی تری (یەزیدییەکان)، تا بەکامی دلی خۆم پرس و پشکنین و لێکۆلینەوەکەم تەواو بکەم. لەبەر ئەوە خۆیشم دوور نابینم لە هەلەوە. جا ئەگەر هەلەم کردبوو تکای لێ بووردن ئەکەم.

جێی داخە کە نووسراوەکانی (جیلوە) و (مصحفارەش) وەک خۆیان هەبوون، دەسمان ناکەون. دوورنییە دانە ڕاستەقینەکانیان دەس ئەورووپاییەکان کەوتبێ. جا ئەم چەند لاپەڕەیەی کە لە هەردوو نووسراوەکە لە خوارەوە ئەینووسمەوە لە نووسراوی (الیزیدیة)کەی (صدیق الدملوجی)م وەرگرتووە، لە زمانی عەرەبییەوە گۆڕیوومەتە سەر زمانی کوردی. تا خوێندەوارانی بەڕێز لە بابەت هەردوو نووسراوەکەوە ڕۆشناییەک بچێتە مێشکیانەوە[1] بام نووسراوە ڕاستەقینەکانیش نەبن.

---

(١) ئەم (صدیق الدملوجی)یە زۆر لەناو یەزیدییەکاندا ژیاوە هەرچەندە کە زۆر لە بیروباوەڕەکانی بەدلی من نین بەلام نووسراوەکەی بەچاکترین نووسراوی عەرەبی دائەنرێ کە لە بابەت یەزیدییەکان نووسرابێ. (ش. ف)

## نووسراوی جیلوه

نووسراوی (جیلوه)، له پێش هەموو ئافەریدەکراوێکدا لای (تاووسی مەلەک) بووه. هەر ئەم (فریشته تاووس)ەیش بوو که (عبطاوس[1])ی نارده ناو ئەو جیهانەوه که بۆ نەتەوه تایبەتییەکەی خۆی چاک و خراپ له یەک جوێ بکاتەوه و ئەم ئایینەشیان تێ بگەیەنێ. ئەمیش له پێشەوه بەفێرکردنیان بەدەم، پاشە جاریش بەفێرکردنیان بەم (نووسراوانه) که له یەزیدییەکان بەولاوه نابێ کەسی تر ببینێ و بیخوێنێتەوه.

**بەشی یەکەم**

١- من بووم و ئێستاکەیش هەم، بۆ من نەمان نییه، بەسەر ئافەریدەکراوەکاندا زاڵم، هەرچی لەژێر چنگیشمایە کاروباریان بەدەست منەوه هەڵ ئەسووڕێ.

٢- ئەوانەی باوەڕیان پێم هەیه و هاوار بۆ من دێنن، زوو بەدەمیانەوه دێم.

٣- من له هەموو شوێنێکدا هەم.

٤- ئەو کارەساتانەیش که بێگانەکان پێی ئەڵێن خراپه چونکه بەدڵی ئەوان نین. من دەستم تیایاندایه.

٥- هەموو سەردەمێک، کارگێڕێکی هەیه، بەڵام ئەویش لەژێر سەرپەرشتیی مندایه.

٦- هەموو پشتێک گۆڕانی بەسەردادێ، تەنانەت سەرۆکی ئەم جیهانەیش ئەو گۆڕانەی بەسەردادێ. سەرۆکەکانیش هەریەکەیان له سەردەمی خۆیدا فەرمانی خۆی جێبەجێ ئەکات.

٧- هەر کەس بەپێی خۆی ماوەی ئەدەمێ کار بکات.

٨- هەر کەسێ بەرەنگاریم بکات، له خەفەت و پەشیمانی بەولاوه هیچی بۆ نامێنێتەوه، خواکان، هیچیان مافیان نییه پەنجه فڕێ بدەنه کاری منەوه، هیچیشیان مافیان نییه من بەربەست بکەن له هیچ کارێک که ویستبێتم بیکەم.

---

(١) له نووسراوی (الیزیدیة ماضیهم وحاضرهم)دا که هی (عبدالرزاق الحسنی)یه نووسراوه (عبد طاووس) بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوەکانی (مامۆستا تۆفیق وەهبی)، (عبطاووس) بریتییه له (ا.ب. طاووس) که واتاکەی (بابه تاووس) ئەگرێتەوه هەروەها (فریشته تاووس) و (عبطاووس)یش هەر یەک فریشتەن خۆیشم لەو باوەڕەدام که ئەم (جیلوه)یه دەستکارییەکی زۆری تیا کراوه چونکه هۆش ئەوه پەسەند ناکات که ئەم قسانه هی (تاووسی فریشتان)بن. ئەبێ له ڕاستیدا قسەی خوای هەره گەوره بووبن که ئەو فریشته تاووسی دروست کردووه. ئەبێ هەر ئەویش فریشته تاووسی ناردبێته سەر زەوی بۆ ئەم مەبەسه، لەبەر ئەوه من لەو باوەڕەدام که ئەبێ له ڕاستیدا (بابه تاووس) بۆ خوای هەره گەوره دانرابێ، (فریشته تاووس)یش (بابه تاووس) دروستی کردبێ ئەمیش هەر وەک باوکی گیانیی هەموو ئافەریدەکراوێکه، باوکی گیانیی ئەویشه. هۆشیش وای پەسەند ئەکات که (بابه تاووس) فەرمانی دابێ به(فریشته تاووس) که نووسراوی (جیلوه) لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێ و بچێته خوارەوه بۆ سەر زەوی؛ تا چاک و خراپ بۆ نەتەوەکەی خۆی که یەزیدییەکان له یەک جوێ بکاتەوه و ئەم ئایینەشیان تێ بگەیەنێ. (ش. ف)

٩- هەر نووسراوێک لای بێگانەکانە، بام پێغەمبەران و ڕاسپێرراوانی خوایش نووسیبێتیانەوە. گۆڕیویانن و دەستکاریشیان کردوون. هەریەکەیان کاری ئەوی تریانی پووچ کردۆتەوە.

١٠- ڕاستی و ناڕاستی لای من دیارن. ئەمەیش لە تاقی کردنەوەدا دەرئەکەوێ.

١١- ئەوانەی پشت بەمن ئەبەستن، بەڵێنی خۆمیان ئەدەمێ و بیروباوەڕێکی شارەزایانەیان پێ ئەبەخشم، چونکە من ئەوانەم بۆ چەند کاتێکی دیاری کراو داناوە، کە لە جیاتی من کار بکەن.

١٢- من لە کاتی پێویستا شتم بیر ئەکەوێتەوە و، کاروباری پێویستیش ڕائەپەڕێنم.

١٣- ئەوانەی پەیڕەویم ئەکەن سەرپەرشتییان ئەکەم و کاروباریان فێرئەکەم جا ئەگەر ئەو کەسانە گوێ دێرین و بەراوێژی من بکەن، خۆیان دڵ خۆش ئەن و خۆشی ئەچێژن و کەلک وەرئەگرن.

سەرنج: لە بەندی (٨)دا ناوی (خواکان) هاتووە. لام وایە نووسراوی جیلوە لێرەدا دەستکاریی کراوە. چونکە یەزیدییەکان هەر یەک خوایان هەیە. (نووسەر)

**بەشی دووەم**

١٤- من ئەوەی ئادەم بەچەند شێوەیەک کە خۆم ئەیزانم، سزا ئەدەم و پاداشیش ئەدەمەوە.

١٥- هێز و دەسەڵاتم هەیە بەسەر هەموو زەویدا: هەر لەسەریەوە تا خوارێ.

١٦- نامەوێ لەگەڵ هەندێ کەسا تێک بچم[1]

١٧- ئەوانەی بەدڵی من ئەجوولێنەوە لە چاکەیان بێ بەش ناکەم.

١٨- ئەوانەی دڵنیام لێیان و بەراوێژی من ئەکەن، بەهەموو جۆرێک خۆمیان پێشان ئەدەم.

١٩- بەپێی دەم و جێ و ڕێ وەرئەگرم و ئەبەخشم. دەوڵەمەند ئەکەم و هەژار ئەکەم، دڵ خۆش ئەکەم و دڵ تەنگ ئەکەم.

٢٠- کەس مافی ئەوەی نییە کە دەس بخاتە کاری منەوە.

٢١- ئەوانەی دوژمنایەتیم ئەکەن تووشی دەرد و ئازاریان ئەکەم.

٢٢- ئەو کەسەی سەر بەمنە وەک ئادەمیزادەکانی تر نامرێ.

٢٣- ناهێڵم کەس لەو ماوەیە زۆرتر بمێنێتەوە لەم جیهانەدا کە بۆم دیاردی کردووە. ئەگەر بەوێ بینێرمە ئەم جیهانە یاخود جیهانێکی تر گیانەکەی لە لەشێکی تردا دەرئەخەم.[2]

**بەشی سێهەم**

٢٤- من بەپێی نووسراو: ڕێ پێشان ئەدەم. هەرچی ئامۆژگارییەکم هەیە بەدەم بەتەواوی ئەیبەخشم بەدۆستەکانم و هاودەمەکانم.

---

(١) لێرەدا مەبەسی خوا تاک و تەنیایە. کە بێ ڕێدانی ئەو فریشتە تاووس هیچی پێ ناکرێ، لێرەدا وەک (فریشتە تاووس) قسە بکات وایە!؟ (ش. ف)

(٢) باوەڕی گواستنەوەی گیان لە لەشێکەوە بۆ لەشێکی تر، ئەگەڕێتەوە بۆ پێش ئایینەکانی ئاسمانی (تناسخ الارواح) بەمە ئەڵێن. (ش. ف)

٢٥- هەر کەسێ پێچەوانەی دەستوورەکانی من بجوولێتەوە، بەپێی پێویست لەو جیهانەدا جەزرەبەیان پێ ئەگەیێنم.
٢٦- هەرچی ئادەمیزادە، لە کاری جیهان شارەزانین، زۆر جاری وا هەیە بەهەڵە ئەچن.
٢٧- هەرچی گیانلەبەرێک هەیە لەسەر زەویدا و، هەرچی پەلەوەرێک هەیە لە ئاسماندا و، هەرچی ماسییەکیشی هەیە لەناو زرێدا هەموویان لەژێر چنگی منداں.
٢٨- هەموو گەنج و بابەتێک کە لە ژێر خاکدایە و شاراوەتەوە. لای من ئاشکران هەر کەسێ بەوێ بۆی بەجێ ئەهێڵم.
٢٩- هەر کەسێ، لە کاتی خۆیدا، داوای کاری سەرسوڕهێنەر و نەبینراوم لێ بکات و لێمی وەربگرێ. پێشانی ئەدەم.
٣٠- ئەوانەی بێگانەن و پێچەوانەی ئارەزووی من ئەجوولێنەوە. ئەوە ئازانن کە هەر خۆیان زیان ئەکەن، هەرچی گەورەیی و سامان و دەوڵەمەندیی هەیە لە چنگ منداں. هەر منیشم کە لە ئەوەی ئادەم ئەوانە هەڵ ئەبژێرم کە لەوانەیان پێ ببەخشم.
٣١- هەرچی دامەزراندنی جیهانەکانە و، هەڵگەڕانەوەی ئەتەوەکانە و، گۆڕانی کارگێڕەکانیانە، هەر لە کۆنەوە دانراوە.

**بەشی چوارەم**

٣٢- من مافی خۆم نادەم بەخواکانی تر.[١]
٣٣- من ڕێم داوە بەپەیدابوونی چوار گەوهەر و، چوار سەردەم و، چوار کەنار. ئەویش بۆ ئافرەیدەکراوەکان کە پێویستیانە.
٣٤- نووسراوانی بێگانەکان کە هی جوولەکە و ئیسلام و گاورەکانن هەرچییەکیان تیابوو کە لەگەڵ دەستوورەکانی مندا ڕێک بکەون وەری بگرن، بەڵام ئەوانەی پێچەوانەی دەستوورەکانی منن وەریان مەگرن چونکە گۆڕیویانن.
٣٥- سێ شت هەن دژی منن، منیش هەرسێکیانم خۆش ناوێ.
٣٦- ئەوانەی ڕازی من ئەپۆشن، بەڵێنەکانی خۆمیان بۆ ئەهێنمە جێ.
٣٧- ئەوانەی لەپێناوی مندا تووشی سەرگەردانی دێن، من لە جیهانێک لە جیهانەکانا تۆڵەیان بۆ ئەکەمەوە:
٣٨- ئەمەوێ پەیڕەوەکانم هەموو یەک بن، تا بێگانە تێکیان نەدەن و لە کەڵکیان نەخەن.
٣٩- ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەمن هێناوە، پەیڕەویی ئامۆژگارییەکانم و فەرمانەکانم بکەن، ئەو

---

(١) بەپێی قسەی مامۆستا (تۆفیق وەهبی) لە نووسراوەکەیدا: (The RemMantsr of Mithraism) لە ڕاستیدا یەزیدییەکان لە خوای گەورە بەولاوە هیچ خوایەکی تریان نییە. تەنیا ئەو حەوت فریشتانەیان هەیە کە (تاووسی فریشتان) یەکێکە لە وان بەهەموویشیان یەک کەسایەتی ئەگرنەوە.

قـسـانەی کـە لە دەم بێگانەکـان دێنە دەرەوە و من نایانزانم و لە هی من نین بەربەرچیـان بدەنەوە و کاریان پێ مەکەن.

٤٠- نە ناوم بهێنن، نە ناوی کـردەوەکـانیـشم، نەوەک گوناهبـاربن چونکە ئێـوە نازانن بێگانە چیـیـان لەدەست دێ.

٤١- ئەی ئەو کـەسـانەی کـە باوەڕتان پێ هێناوم، ڕێز لە وێنەکـەم و لە کـەسـایەتیـیەکـەم بگرن. چونکە ئەوانە منتان بیر ئەخەنەوە.[1]

٤٢- دەستوور و یاساکانی من بخەنە دڵتانەوە و بیانپارێزن.

٤٣- بەگوێی دەسوپێوەندەکانم بکەن، هەرچیتان پێ ئەڵێن گوێیان لێ بگرن، بەڵام نەکەن ئەو شتانەی کە پێتانی ئەڵێن لای بێگانەکان وەک جوولەکە و گاور و ئیسلامەکان ئاشکرایان بکەن. چونکە ئەوانە لە ئامۆژگارییەکـانی من هیـچ تێ ناگەن، لـە نووسراوەکـانی خۆیشـتـان هیـچیـان مـەخـەنە بەردەست نەوەک بیانگۆڕن و بەخۆتان نەزانن.

٤٤- زۆربەی شتومەک وەک خۆیان بهێڵنەوە لای خۆتان نەوەک سەرتان لێ تێک بچێ.

## چەند پارچەیەک لە مصحاڕەش

## (دروستبوونی جیهان بەلای یەزیدییەکانەوە)

ئەم ئاسـمـانە پان و فـراوانە بریتی بوو لە تاریکیـیـەکی چڕ و هۆڵ ئاو لەژێریا شـەپۆلی ئەدا. گێژەلوکەی تیا ئەگەڕا. کەسی تیا نەبوو خوای تاک و تەنیا نەبێ. کە خـوایش ویستی ئەم ئافەریدە کراوانە دروست بکات، لە ڕۆشناییـیە هەمـوو دەمـیـیەکەی خۆی دورێکی سپیی دروست کرد و خستیـیە سەر پشتی تـووتیـیـەک، چل هەزار سـاڵ لەسـەری دانیـشت. دوای ئەوە تـیـژاندی بەسـەر دوورەکـەدا. قڵیشایەوە. ئەم زەوییەی لێ هاتە دەرەوە کە لەوێش ڕووبارەکان و دەلیاکان هەڵ قوڵان.

ئەم جیهانەیش لەپێشدا ڕێکوپێک نەڕازابۆوە، بەڵام خوا (جبرائیل)ی لە شێوەی باڵندەیەکدا ناردە سەری. ئەویش بەباشی ڕێکی خست و ڕازاندیەوە هەر چوار لایشی بۆ دامەزراند.

«خوا کەشتییەکی دروست کرد، لەناو زرێکاندا سی هەزار ساڵ پێیی گەڕا: پاشان گەیشتە (لالش)[2] زەوی کەوتە لەرینەوە. خۆی پێ نەگیرایەوە تا خوا شاخەکانی دروست کرد و کردنی بەسنگ بۆ زەوی.

پاشـان خوا فـەرمـووی بە(جبـرائیـل) دوو پارچە دووڕی سـپی لە ئاسـمـاندا هەڵواسێ، یەکـێکیـان بوو بەڕۆژ، یەکـێکیـشـیـان بوو بەمـانگ، لەو کـەرتانەیش کە لـە پارچە دووڕەکان بەربوونەوە لەناو ئاسـمـاندا چرای دروست کرد کە (ئەستێرەکانن).

---

(١) ساهەر لەبەر ئەم فەرمانەیە کە یەزیدییەکان تاووسێکی لە مس دروست کراویان کردووە بەنیشانەی (تاووسی فریشتان) ئەمیش وەک بتپەرستی وایە کە پێچەوانەی ئایینی زەردەشتییە. (ش. ف)

(٢) لالش شاخێکی جوان و ڕەنگینە کەوتۆتە ناوچەی شێخانەوە لە خاکی کوردستانی عێراقدا.

هەروەها دار و درەخت و میوەهات و گژوگژیایشی دروست کرد و زەوی پێ ڕازاندنەوە، تەخت لەسەر تەخت داینا و سەرکەوتە سەرەوە لەوێوە ڕووی کردە فریشتەکان و پێی گوتن من ئادەم و حەوا دروست ئەکەم بۆ ئەمەی ببنە باپیر و نەنکی مرۆڤ، نەتەوەی (یەزیدی)یش لە وان ئەکەوێتەوە، کە پێی ئەگوترێ (نەتەوەی عەزازیل) یاخود نەتەوەی (تاووسی فریشتان).

خوا لە ڕۆژی یەک شەممەدا فریشتەیەکی ئافەڕاند ناوی نا (عەزازیل) کە ئەویش (تاووسی فریشتان)ە.

لە ڕۆژی دووشەممەیشدا فریشتەیەکی دروست کرد، ناوی نا (دەردائیل) کە ئەویش (شێخ شەمس)ە.

لە ڕۆژی سێشەممەدا فریشتەیەکی دروست کرد، ناوی نا (ئیسرافیل) کە ئەویش (شێخ حەسەن)ە.[1]

لە ڕۆژی چوارشەممەدا فریشتەیەکی دروست کرد، ناوی نا (میکائیل) کە ئەویش (شێخ ئەبوبەکر)ە.

لە ڕۆژی پێنجشەممەدا فریشتەیەکی دروست کرد، ناوی نا (جبرائیل) کە ئەویش (شێخ سجادین)ە.

لە ڕۆژی هەینیدا فریشتەیەکی دروست کرد، ناوی نا (شمنائیل) کە ئەویش (شێخ ناصرالدین)ە.

لە ڕۆژی شەممەیشدا فریشتەیەکی دروست کرد، ناوی نا (نورائیل) کە ئەویش (شێخ فخرالدین)ە.

خوا (تاووسی فریشتان)ی کرد بەسەرۆکی هەموویان دوای ئەوە خوا دابەزییە سەر زەوی پێنووسێکی گرت بەدەستەوە و دەستی کرد بەنووسینی ئافەراندرا و (مخلوقات)ەکان، ناوی شەش خوای نووسی، لە ڕووناکی خۆی و لە کەسایەتی خۆی[2] دروست کردنی ئەو خوایانە بەچەشنێکی وەهابوو هەروەک چرایەک بەچرایەکی تر دابگرسێنێ وابوو.

پاش ئەوە بەخواکانی گوت: ئاسمان من دروستم کرد. بام هەریەکێکیش لە ئێوە شتێک دروست بکا. خوای یەکەمیان ڕۆژی دروست کرد. خوای دووەمیان مانگ[3] خوای سێهەمیان گەردوون (فەلەک)؛ خوای چوارەمیان ئەستێرەی بەیان. خوای پێنجەمیان بەهەشت، خوای شەشەمیان دۆزەخی دروست کرد.

(تاووسی فریشتان) لەپێشدا فریشتەیەک بوو لە فریشتەکان بەڵام لە دواییدا خوا خستییە سەروو هەموو فریشتەکانەوە کردی بەیاریدەدەری خۆی بەفریشتەکانی تریشی گوت کە فەرموودەکانی ئەو بەجێ بێنن. بەڵام کە فریشتە تاووس لە خۆی بایی بوو سەرکێشی کرد لە خوا، خوا لێی توڕەبوو فڕێی دایە ناو ئاگری دۆزەخەوە (فریشتە تاووس) تا حەوت هەزار ساڵ لەناو ئاگری دۆزەخدا مایەوە. هەموو ئازار و ئێشێکی چێشت. هەر ئەگریا بەسەر خۆیدا. تا حەوت کۆجەڵەی پڕ کرد لە فرمێسکی خۆی. ئیتر خوا لە گوناهی خۆش بوو. گەڕاندیشیەوە بەهەشتی باڵا. بەڵام فریشتەکانی تر هەر لەسەر تیز و توانجی خۆیان مانەوە بەرامبەر (فریشتە تاووس)... تا ئەمیش لای خوای گەورە دادی کرد لە دەستیان. خوایش لەسەر

---

(١) شێخ شمس و شێخ حسن هەریەک کەسن، دیارە هەڵەی تیا کراوە. (ش. ف)

(٢) لە ڕاستیدا ئەم خوایانە کەس نین ئەو فریشتانە نەبن. لێرەدا دەستکاریی کراوە. (ش. ف)

(٣) سەیرە کە لێرەدا چ پێچەوانەیی یەک دەرئەکەوێ لە نووسراوی (مصحفارەش)دا. لێرەدا ئەڵێ خوایەک مانگی دروست کرد. کەچی لەوە پێش فریشتە جبرائیل ڕۆژیش و مانگیشی دروست کرد. (ش. ف)

ئەو سکاڵایە لە فریشتەکانی تر توڕەبوو دەستی کرد بەسەرزەنشت کردنیان. پایەی (فریشتە تاووس)یشی بڵند کردەوە بۆ بارستایی پیاوچاکان و دۆستان. خوا نزیکی خستەوە لە خۆی و کردی بەهاودەمی خۆی، هەروەها کردیشی بەهاوبەش لە سامانی خۆیدا. «خوا فەرمووی هەر حەوت کۆجەڵەکان کە پڕ بووبوون لە فرمێسکی (فریشتە تاووس) لە پەنایەکی دۆزەخدا دابنرێن، تا هەر کاتێ (شێخ عدی) لە زەوییەوە گەڕایەوە، بەو فرمێسکانە ئاگری دۆزەخ بکوژێنێتەوە و نەتەوەکەی خۆی لێ بپارێزێ.[1]

***

کاتێکیش خوا ویستی مرۆڤ دروست بکات و لەناو ئەو زەوییەدا کە بۆی ئامادە کردووە نیشتەجێی بکات، هاتە خوارەوە بۆ سەر زەویی (قودس). فەرمووی بە(جبرائیل) لە هەر چوار لای زەوییەوە گڵی بۆ بهێنێ. بەهۆی ئاو و با و ئاگرەوە شێلای و کردی بەهەویر. لەوە گیانێکی دروست کرد. ناوی نا (ئادەم). لە پەراسوی چەپی (ئادەم)یش (حەوا)ی دروست کرد. پاشان هەردووکیانی لەسەر زەویی دامەزراند. سک و زایان کرد و زۆر بوون. هەموو سەر زەوییان پڕ کرد لە خۆیان. پاشان خوا داینا کە لە پاش دە هەزار ساڵ هەموویان لەناو بەرێ. قەڵاچۆی تێ خستن. کەسی نەهێشتەوە خێوەکان[2] نەبن هەر ئەوان سوپاسیان ئەکرد و ئەیانپەرست.

پاش ئەوە تا پێنج پشتیش هەر دروستی ئەکردنەوە و، لەناوی ئەبردنەوە.

لە پشتی شەشەمدا (ئادەم)ی دروست کرد، کە باپیرە گەورەی ئەم مرۆڤانەی ئێستاکەیە. خوا ئەویش و (حەوا)یشی لە بەهەشتدا دامەزراند و ماوەیشی دانێ کە تێروپڕ خۆشیی تیا بچێژن و لەبەروبوومیشی بخۆن بەڵام خوا خواردنی گەنمی لێ بەربەست کردن.

خوا کە ئادەمی دروست کرد بە(فریشتە تاووس)ی گوت کڕنووشی بۆ بکێشێ بەڵام فریشتە تاووس لوت بەرزی نوواند و سەرکێشیی کرد. بیانووشی ئەوەبوو کە خۆی لە ڕۆشنایی دروست کراوە و (ئادەم) لە گڵ[1] لەبەر ئەوە کڕنووشی نەوازش بۆ یەکێک ناکێشێ کە لە خۆی کەمتربێ. خوایش قینی لێی هەڵسا و ویستی بۆ جاری دووەمیش دەری بکاتەوە.

بەڵام زوو هەستی بەکزیی و بێ دەسەڵاتی فریشتە تاووس کرد. چاوی لێ پۆشی و لە شوێنی خۆیدا هێشتیەوە. (فریشتە تاووس) ویستی لە (ئادەم) تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئادەمیش گەلێک خۆش باوەڕ و بەسەزمان بوو فریشتە تاووس. ئادەمی چەواشە کرد و لە خشتەی برد. هانی دا کە لەو درەختی گەنمە بخوات کە خوا پێی گوتووە لێی نەخوات. پێی گوت ئەوە داری زیندوێتییە. خستییە سەر ئەو باوەڕەی کە هەتا لێی نەخوات بەزیندوویی نامێنێتەوە. ئادەم کەوتە داوی فریشتە تاووسەوە. لەو درەختەی

---

(١) واتای ئەمەیش ئەوەیە کە (شێخ عدی)یش خوایەکە لە خواکانی یەزیدی!... بەڵام لە ڕاستیدا شێخ عدی وەک خواناسێکی گەورەی یەزیدییەکان ڕێزی لێ ئەگرن. (ش. ف)

(٢) خێو: جنۆکە.

(١) سەیرکە فریشتە تاووس، لێرەدا لە ڕۆشنایی دروست کراوە؛ نەک لە ئاگر وەک (ابلیس). (ش. ف)

خـوارد. بەڵام زۆری پێ نەچوو سکی بای کـرد. پاشـان باڵندەیەک هات و دندووکی لە لەشی دا هەتا کونکی تێ کرد. ئیتر ئادەم لەو سک ئاوسانە ڕزگاری بوو و لەشی سووک بوو.

ئادەم لەسەر ئەوەی کە فەرمانی خوای خۆی شکاندبوو تا سەد ساڵی خشت گریا و خەفەتی خوارد. بەڵام ئەو گریانە بەکاری نەهات. خوا فەرمانی دا لە بەهەشت دەریان کرد. بەخۆی و (حەوا)وە هێنایانە خوارەوە بۆ سەر زەوی وە ڕێی دا لەوێدا بژی و لە (حەوا)یش کەڵک وەربگرێ حەوا سەد و چل سکی کرد، هەموو جارێ جووتێکی ئەبوو.

کە بریتی بوو لە کوڕێک و کچێک، تەنیا (شەهید کوڕی جزە) بەتەنیایی لەدایکبوو. ئەمەیشی ڕازێکی خوایی بوو خوا بۆیە وای دروست کرد کە نەتەوەکەی خۆی کە (یەزیدییەکان)ە لە نەتەوەکانی تر جیا بکاتەوە هەر برایە خوشکی خۆی مارە کرد کە بەسکێک لەگەڵیا لەدایکبوو بوو، بەڵام (شەهید کوڕی جزە)، پەرییەکی مارە کرد: کە (فریشتە تاووس) لە بەهەشتەوە بۆی ناردبوو. کوڕێکی لەو پەرییە بوو: ناوی نا (یەزدان)[1] جا (یەزیدی)یەکان لەبەرەی ئەو (یەزدان)ەن (مرج میران) کوڕی (نوح) کوڕی (یەزدان)یش یەکێکە لە باپیرە گەورەکانی پێشوویان. وەک ئەڵێن لەسەر ئەو گۆڕە دەمەقاڵێیەک لە ناوەند ئادەم و حەوادا پەیدابووە ئاخۆ کوڕەکە لەکامیان پەیدابووبێ؟ (جبرائیل) لە ئاسمان هاتە خوارەوە. ئاوی هەردووکیانی، هەریەکە خستە ناو گۆزەیەکەوە و دەمەکانی گرتن و مۆری کردن. لەپاش نۆ مانگ هاتەوە، کە گۆزەکەی لەمەڕ (حەوا)ی کردەوەوە لە کرم و قالۆچە بەولاوە هیچی تری تیا نەدۆزییەوە بەڵام لە گۆزەکەی لەمەڕ (ئادەم)دا کوڕێک و کچێکی تیا دۆزییەوە جا لە سک و زای ئەو دوانە تیرەی یەزیدی پەیدابوون، خوا دوو مەمکی بۆ ئادەم دروست کرد بەسەر سنگیەوە بۆ ئەمەی ئەو دوو منداڵەی کە لە خۆی بوون و لە حەوا نەبوون. شیریان پێ بدات. جا جووتە مەمکی هەموو پیاوێک، کە هەیە ڕاز و نهێنییەکی ئەندامییەو، لەو ئافەراندنەی خواوە پەیدا بوون.

جا هەرچی پێغەمبەران ڕاسپێراوانی خوا و پیاوچاکان و خواناسان و زانایان و چاکەخوازان هەن لەبەرەی ئەو (شەهید کوڕی جەزە)یەن کە تیرەی (یەزیدی) لەو کەوتوونەتەوە (شێخ عدی کوڕی مسافر)، یەزیدی کوڕی معاویە[2] حسن البصري، شێخ عبدالقادری گەیلانی، شێخ محمد الحنفیە، شمس الدینی تبریزی، قضیب البان) و گەلێک کەسی تر لەو جۆرە پیاوانەن. بەڵام (محمد) کە پێغەمبەری ئیسلامەکانە، لە نەوەی کوڕەکانی تری ئادەمە کە هەریەکەیان خوشکی خۆی کردبوو بەژنی خۆی. جا کاتێ گەینە و بەینەی دروست کردنەکان تەواوبوو خوا لە فەرمانی خۆی بووەوە، گۆشەگیریی کرد بەپیشە بۆ خۆی.

---

(۱) سەیرکە وشەی (یەزیدی) یاخود (ئێزەدی) لە وشەی (یەزدان)ەوە چەند نزیکە. (ش. ف)

(۲) لێرەدا یەزیدی کوڕی معاویە بەپیاوچاک دانراوە، نەک بەخوا. جا ئەوانەی کە ئەڵێن (یەزیدی معاویە) بەلای یەزیدییەکانەوە بەخوایەک دانراوە. ئەم نووسینە بەدرۆیان ئەخاتەوە ئەم قسەیە لە ئاست شێخەکانی تریشدا ڕاستە. (ش. ف)

کاروباری هەمـوو جیهانیشی دایە دەست (فریشتـە تاووس) کە تا ئەو دەمە تەواو هێز و دەسەلاتی پەیدا کردبوو. هەرچی مرۆڤ هەبوو لێی ئەترسان، خۆیان لە هەڵمەت و تووڕەیی ئەو ئەپاراست.

(فریشتە تاووس)یش لەو ساکەوە دەستی کرد بەفەرمانی خۆی. پێغەمبەران و ڕاسپێرراوانی ئەنارد بۆ سەر زەوی. تا مرۆڤ فێری فەرموودەکانی ئەو بکەن و چاویشیان بترسێنن بەسزاکانی ئەگەر سەرکێشیان کرد لە جێبەجێ کردنی فەرموودەکانی. جا ئەوانەی کە باوەڕیان بەفریشتە تاووس هێنا و پەیڕەوییان کرد، خۆشەویستییەکی گەورەیان لێ دیَ. ئەوانەیش کە فەرموودەکانیان شکاند، هەتا ئێستاکەیش هەر بەوە سزایان ئەداتێ کە تووشی دەرد و نەخۆشییان ئەکات». [1]

## لافاو بەلای یەزیدییەکانەوە

یەزیدییـەکـان باوەڕیان وایە کـە دوو لافـاوی گـەورە لەسـەر زەویدا پەیدا بووە. [2] لافـاوێکیـان لە سـەردەمی (نوح) پێغـەمبـەردا ڕووی داوە خوا بەو لافاوە هەمـوو ڕەگـەزی ئادەمـیزادی سزا داوە لەسـەر بەدکارییـان لافاوەکە ئەو نەتەوانەی گـرتۆتەوە کە لە نـەوەی (ئادەم) و (حەوا)ن وەک مـوسـڵمـانەکان و گاورەکان و جوولەکەکان. بەڵام یەزیدییەکانی نەگرتۆتەوە کە لە ڕەگەزێکی جیاواز و تایبەتێن.

بەڵام لافاوەکەی دووەم یەزیدییەکانیش و نەتەوەکانی تریشی گرتۆتەوە. لافاوەکە لە کانییەکەوە پەیدا بووە کە لە گوندی (عین سفنی: شێخان)دا بووە، کە کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی شاری (موصل)ەوە. کەشتییەکە بەسـەر لافـاوی ئەو ئاوەوە سووڕاوەتەوە تـا گـەیشـتـۆتە شاخی (سنجار) لەویَ لە لوتکە شـاخـێکی بەرز کـەوتووە، کـونی تیَ بووە. ئەگـەر مـارێک پێـچی نەخـواردایـە و بەدەمی ئەو کـونەوە مـۆڵی نەخـواردایە، کەشتـییـەکە نوقـووم ئەبوو. دوایی کەشـتـییـەکە لەسەر شاخی (جودی) کە لەناو جەرگی کـوردسـتـاندایە نیشتـەوە. دوای ئەوە مارەکان زۆر بوون و پەرەیان سەند. دەستیان کرد بەئازاردانی مرۆڤ و گیانلەبەران. لەبەر ئەوە گـیـانلەبەران کـۆیان کـردنەوە و سـووتاندیـانن. لە خـۆڵەمـێشـەکـەیان کـێچ پەیدابووە! هەرچی یەزیدییەکانن لە نەوەی (نعمی)ن کە لە بەرەی (مەلەک میران)ە. بەڵام نەتەوەکانی تر لە بەرەی (حام)ن کە باوکی خۆی ڕیسوا کرد.

ئەمـە حەوت هەزار ساڵە ئەو لافـاوە قـەوماوە. هەر هەزار ساڵە جـارێک خـوایەک لە حـەوت خـواکـان ئەهاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی. کاروباری تێکچووی یەزیدییـەکانی ڕاست ئەکردەوە و گیروگرفـتەکانیـشی

---

(١) جا لێرەدا کەسایەتیی ڕاستەقینەی (فریشتە تاووس) دەرئەکەویَ کە خوا نییە، سەرۆکی فریشتەکانە، بەفەرموودەی خوا و لەسەر ڕێدانی خوایش کاروباری جیهان بەڕێوە ئەبات. یەکێک لەو فەرمانانەیش ناردنی پێغـەمبەران و ڕاسپێرراوانە بۆ سەر زەوی. پاداشدانەوە بەچاکان و سزادانیش بەخراپانە. جا ئەم فریشتە تاووسە، کە لێرەدا بووەتە سەرچاوەی چاکە بۆ مرۆڤ، ئەو دێوە نییە کە ئایینی زەردەشتی و ئیسلام و موسایی و عیسایی بەسەرچاوەی خراپە و شەڕ و ئاژاوەی دائەنێن، کەواتە نووسەرەکانی بێگانە بەهەڵەدا چوون کە ئەڵێن یەزیدییەکان دێو (شیطان) پەرستن. لە ڕاستیدا یەزیدییەکان خواپەرستن نەک دێو پەرست. (ش. ف)

(٢) اليزيدية: صديق الدملوجي. (ش. ف)

چارە ئەکردن. بێجگە لەوە دەستوورانی ئایینیشی بۆ دائەنان. بەڵام لەم هەزار ساڵەی دواییەدا. خوا زووتر ئەهاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی خوا بەزمانی (کوردی) قسەی ئەکرد. هەر بەزمانی (کوردی)یش یاساکان و دەستوورەکانی دائەنا.

## یەزیدی کوڕی معاویەی ئەمەوییان بەخوا داناوە

بەپێی قسەی (صدیق الدملوجی) یەزیدییەکان ئەڵێن: (یەزیدی کوڕی معاویەی ئەمەوی) خوای گەورەمانە. بروایان وایە کە وێنە و پەیکەری (یەزید) لە شێوەی کەلەشێر یاخود تاووسێک دایە کە لە مس دروست کراوە کە هەتا ئێستاکەیش لای خۆیان پاراستوویانە و ئەیپەرستن![1]

## فریشتە تاووس خونکاری بۆ داناون

بەپێی نووسراوی (مصحفارەش): کاتێ کە پشێویی و ئاژاوە بەناو مرۆڤدا بڵاوبووەوە، (فریشتە تاووس) لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و خونکارانی بۆ نەتەوەکانی خۆی کە (یەزیدی)ەکانن دامەزراند. بەڵام خونکارانی ئاسوورییەکانی کۆن لەو خونکارانە نین هەندێک لەو خونکارانە ئەمانەن: (ئەسروخ) کە بریتییە لە (ناصرالدین). (تاموش) کە بریتییە لە (فخرالدین). (ئەرتیمووس) کە بریتییە لە (شمس الدین). دوو خونکاری تریشی بۆ داناون کە ناویان (شاپووری یەکەم) و (شاپووری دووەم)ە[2]. ئەم دوو خونکارە تا سەد و پەنجا ساڵ فەرمانداریییان کرد. جا سەرکردەکانی یەزیدییەکانی ئیمڕۆ لە نەوەی ئەو دوو خونکارەن.

یەزیدییەکان خونکارێکیان لە (بابل)دا هەبووە، ناوی (بختنصر) بووە. لە ئێرانیشدا خونکارێکیان هەبووە، ناوی (حشوارش) بووە. خۆنکارەکەی (قسطنطنیە)یشیان ناوی (ئەغریقالوس) بووە.

جا لە پێش پەیدابوونی (مەسیح) پێغەمبەردا بەئایینی یەزیدییان گوتووە (ئایینی بتپەرستی). خونکارەکانی (ئاحاب) کە (بلعزبوب: پیربوب) لەوانە لەسەر ئایینی یەزیدی بوون.[3]

## دەسەڵاتی فریشتە تاووس

(قوال) یاخود گۆیندەکان سەرگوروشتەیەک ئەگێڕنەوە کە لە (مصحفارەش) یاخود (نووسراوە ڕەش)یشدا نووسراوەتەوە. گوایە خوای گەورە لە (عیسی) پێغەمبەر دڵی شکاوە لەناو زیندانێکا دایناوە. کەڵەبەردێکیشی خستۆتە سەر دەمی زیندانە قووڵەکە (عیسی) هەر هاوارێکی کردووە لەبەردەم

---

(١) کەواتە یەزیدی کوڕی معاویە، جێگای فریشتە تاووسی گرتۆتەوە!! بەڵام وا نییە: بەڵام لە ڕاستیدا یەزیدییەکان (یەزیدی کوڕی معاویە) بەخوا دانانێن تەنیا وەک پیاوێکی چاک ڕێزی لێ ئەگرن. ئەمەیش لە نووسراوی (مصحفارەش)دا بەئاشکرا پێشان دراوە. (ش. ف)

(٢) ئەم هەردوو (شاپوورە) لە شاهەکانی ساسانین، هەردووکیشیان کوردن و لەسەر ئایینی زەردەشتیش بوون. ئەمەیش بەڵگەیەکە بۆ ڕاستی قسەی یەزیدییەکان کە ئەڵێن ئێمە زەردەشتین. (ش. ف)

(٣) الیزیدیة: صدیق الدملوجي. (ش. ف)

پێغەمبەران و ڕاسپێرراوەکانی خوادا کەسیان بەدەنگیەوە نەهاتوون کە بۆی بپارێنەوە لە خوا و لەو زیندانە بیهێننە دەرەوە. پاشان ئاسیاوێکی هاتۆتە سەر دەرکی زیندانەکە و ئامۆژگاری کردووە کە پەنا بەرێتە بەر (فریشتە تاووس). کە (عیسی)یش هاواری بۆ (فریشتە تاووس) بردووە، دەست بەجێ بەدەنگیەوە هاتووە و کەڵەبەردەکەی لە دەرکی زیندانەکە لابردووە و (عیسی)ی بەرەڵلا کردووە!.

خوای گەورەیش کە لە ئاسماندا بە(عیسی) گەیشتووە، لێی پرسیوە کێ لە زیندانەکە دەری هێناوە؟ ئەویش پێی گوتووە: فریشتە تاووس، کاتێ کە خوای گەورە ئەو قسەیەی بەرگوێ کەوت، چاوی پۆشی و ورتەی نەکرد و ملی نا بەڕێگای خۆیەوە!.

## ئەستێرەی کاکێشان

لەناو یەزیدییەکاندا سەرگوزوشتەیەک بەسەر زمانەوەیە بەکورتی ئەڵێ: خوای گەورە ڕۆژێکیان (شێخ عدی) و دەروێشەکانی بانگ کردە سەر نان خواردنێک لە ئاسماندا. بەڵام کە زانییان. لە ئاسماندا کا دەست ناکەوێ، بۆ ئەسپەکانیان، (شێخ عدی) فەرمووی بەیەکێک لە دەروێشەکانی خۆی، بچێتە خوارێ بۆ سەر زەوی و لە خەرمانەکەی خۆی کا بهێنێ. دەروێشەکەش کاکەی هێنا، هەندێکی لێ کەوتە خوارەوە سەر ڕێگاکە. کە تاکو ئێستایش شوێنی ئەم کایانە بەئاسمانەوە دیارە جا لەبەر ئەمەیە کە پێی دەڵێن (ڕێگای کاکێشان)![1]

## تاووس

لەسەر ناوی (تاووس) مەقۆ مەقۆ زۆر کراوە. هەر کەسێ بەلای خۆی دا دائەتاشێ. بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوەکانی مامۆستای بەڕێز (تۆفیق وەهبی): ناوی (تاووس) ئەچێتەوە سەر (دیاوس) کە خوای ئاسمان بووە لای سروشت پەرستەکانی (هیند و ئێرانی)یەکان[2] کە نەتەوەی کوردیش بڕێکە لەوان. هەر وەک بەپێی نووسراوی جیلوە (فریشتە تاووس) خوای گەورەی (یەزیدی)یەکانە، (دیاوس)یش خوای گەورەی ئەو سروشت پەرستانەی باووباپیرانمان بووە کە لەپێش پەیدابوونی (زەردەشت)، پێغەمبەری کورددا. دوو جۆرە خوایان پەرستووە: (خوای چاکەکار) و (خوای خراپەکار). زەردەشت لە ئایینی خۆیدا هەر خوایەکی هێشتەوە کە ناوی ئاهورامازدا بوو. (دیاوس)ی لە خوایەتی خست لەگەڵ خواکانی تردا کردنی بەسەرچاوەی خراپەکاریی و ناوی نان (دەئیفە) یاخود دێو کە واتاکەی (شیطان) ئەگرێتەوە. ئیتر لەو ساکەوە زەردەشتییەکان بەسروشت پەرستەکانیان ئەگوت (دێو پەرستان) کە واتاکەی (شیطان پەرستان) ئەگرێتەوە، هەروەها ئەوانەیش ئەگرێتەوە کە لەسەر ئایینی زەردەشتی نین. هەروەها بەلای مامۆستا (تۆفیق وەهبی)یەوە وایە کە ڕەنگە وشەی (داسنی) کە تا ئێستاکەیش کوردەکانی خۆمان بەدێو پەرستەکانی ئەڵێن، لە وشەی (دەئیڤەیەسنە)وە هاتبێ کە (زەردەشت) بە(سروشت پەرست)ەکانی

---

(١) سەرچاوەی ئەم باوەڕە پڕوپووچانە نەخوێندەوارییە، نەک ئایینی یەزیدی. ئەم جۆرە باوەڕانەیش لەناو هەموو خاوەن کتێبێکدا هەن... (ش. ف)

(٢) وتارەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٠ی گۆڤاری گەلاوێژدا. (ش. ف)

گوتووه. لەم ئەنجامانەیشەوە مامۆستا (وەهبی) تێ ئەگات کە ڕەنگە ئایینی یەزیدیی ئێستا لە ئەنجامی تێکچوونی باوەڕیی ئیسلامەتی ئەو کوردانە وە پەیدابووبێ کە لە پێشدا پەیڕەویی (شێخ عدی)یان کردووە و پاشان لە ڕێڕەوەکەی ئەو لایان داوە لەگەڵ تێکەڵبوونیان بەو کوردانەی کە لەسەر ئایینی (داسنی) بوون و کاریان تێ کردووە بۆیەکا یەزیدییەکان لەسەرێکەوە دێو (شیطان) ئەپەرستن و لەسەرێکی تریشەوە (یەزید کوڕی معاویە ئەمەوی) بەخوا دائەنێن[1] منیش وام دێتە پێش چاو، کە هەرچەندە ئایینی یەزیدی لە هەندێ ڕووەوە لە ئایینی زەردەشتی و ئایینی ئیسلام ئەکات، بەڵام لە ڕاستیدا هەڵگەڕانەوەیەکە لە هەردوو ئایینەکە، لە زۆر ڕووەوە لە هەردوو ئایینەکە جیاوازە.

پەلەوەری تاووس، جوان و شەنگ و شۆخە. بەنازەوە ئەڕوات بەڕێگادا. فیزی هەیە و بەخۆی ئەنازێ، لە خۆبایی ئەبێ و لە خۆی ئەگۆڕێ. نەخش و نیگار و گوڵەکانی ناو پەڕەکانیشی، بەهەموو لایەکدا پرشنگێکی ڕەنگاوڕەنگ و دڵگیر ئەدەن، کە دڵی پیاو کێش ئەکات. ئەو خوا گەورەیەیش کە بەپێی قسەی بێگانە (یەزیدی)یەکان ئەیپەرستن و ناویان ناوە (فریشتە تاووس)، بۆیەکا وایان ناو ناوە چونکە خوای مەزن ئەمەندە جوان و شیرین و ڕەنگینی دروست کردبوو لە چاو فریشتەکانی تردا لە (تاووس) ئەچوو!... ئەوەبوو کردی بەسەرۆکی فریشتەکانی تر و دەسەڵاتێکی زۆریشی دایە. بەڵام کە خوای هەرە گەورە (ئادەم)ی دروست کرد، ئەم (فریشتە تاووس)ە قسەی خوای شکاندووە لە بەهەشت دەری کرد و دەستیشی لە فەرمان کێشایەوە و بەدناوی کرد. تا ئێرە ئایینی یەزیدیش وەک هەر چوار ئایینە ئاسمانییەکانی تر: زەردەشتی، موسایی، عیسایی، محەمەدی، بەم کەینە و بەینەیە بڕوای هەیە. بەڵام لەمە دواوە لێیان جیا ئەبێتەوە. چونکە بەلای یەزیدییەکانەوە خوا لە پاش حەوت هەزار ساڵ ئازاردانی (فریشتە تاووس) چاوی لە گوناهی پۆشی و سەرلەنوێ کاروباری جیهانی پێ سپاردەوە و خۆشەویستیی خۆی پێ بەخشییەوە. کەچی بەپێی ئایینە ئاسمانییەکان (دێو) تا جیهان دوایی دێت بەکەنەفت کراوەیی و بەدناوییەوە ئەمێنێتەوە. ئەوساکەیش سەر ئەنگرێ ئەکرێ و لەناو ئەچێ!.

جا یەزیدییەکان ئەم تاووسە لە مس دروست کراوەی کە کڕنۆشی نەوازشی بۆ ئەکێشن، بەنیشانەی خۆشەویستە گەورەکەیانی دائەنێن کە (فریشتە تاووس)ە، یەزیدییەکان حەوت تاووسی لە مس دروست کراویان هەیە ڕێزیان لێ ئەگرن بەڵام هەر حەوتیان نیشانەیەکن بۆ فریشتە تاووس. فریشتەکانیش چونکە هەریەکەیان بەشێکن لە ڕۆشنایی خوایی بەهەر حەوتیان لەگەڵ خوادا یەکایەتییەک دروست ئەکەن. یەزیدییەکان بەو تاووسانە ئەڵێن (سەنجەق). بەناوی ئەوەوە کە هەر تاووسەیان داناوە بۆ شوێنێک لەو حەوت شوێنانەی کە نەتەوەی یەزیدییان تیایە. یەزیدییەکان بڕوایان وایە کە خوا دروستی کردوون[2].

سەرۆکی ئایینیی یەزیدییەکان بۆ یەزیدییەکان ئەپارێزێ؟ ئەم سەرۆکە هەموو تاووسەکان لە ژوورێکدا

---

(١) هەروەک لەمەوپێش پێشانمان دا، یەزیدییەکان ئەدێو پەرستن. نە (یەزیدی معاویە)یشی بەخوا، نە هیچ شێخێکی خۆیشیان بەخوا ئەزانن. (ش. ف)

(٢) اليزيدية: صديق الدملوجي. (ش. ف)

دائەنێ و ئەیانپارێزێ، کە پێی ئەڵێن (خانەی تاووس). هەر ئەمیشە کە فەرمان ئەدات دەریان ئەهێننە دەرەوە لە ژوورەوە و ئەیان دەنە دەست گفتوگۆکار (قوال)ەکان تا بیانگێڕن بەناو یەزیدییەکاندا بۆ پارە کۆکردنەوە.

## تاووس گێڕان

لەپاش ئەمەی تاووسەکان بەناوی پیرۆز کە لە گۆڕستانی (شێخ عدی) دایە، پیرۆزکران و بەناوی ترش ژەنگیان لێ کرایەوە و بەرۆنی زەیتونیش چەورکران، گفتوگۆکار (قوال)ەکان لە هەندێ خوڵی نزیک گۆڕی شێخ عدی بەناوە پیرۆزەکەی ناو گۆڕستانەکە قوڕێک هەڵ ئەشێلن و تفەنگی بچکۆلە بچکۆلەی لێ دروست ئەکەن... تا هەر کاتێ یەزیدییەکان هاتنە سەردانی (تاووس) بەدیاریی بیاندەنێ. ئینجا گفتوگۆکارەکان تاووسەکە هەڵ ئەگرن لە ناو هەگبەیەکدا و ئەیدەن بەکۆڵیاندا و ڕووئەکەنە ئەو شوێنەی کە دیاریی کراوە بۆی بچن. ئاواییەکە بەپیاو و ژنیانەوە دێن بەپیریانەوە. چاکترین بەرگی خۆیان ئەپۆشن. گۆرانییە نەتەوەییەکان و ئایینییەکانی خۆیان ئەڵێن. ئافرەتەکانیش بۆیان ئەستێننەوە و تیلی لیلی ئەکەن. دەوڵەمەندەکانیان لەسەر ئاڵاکە ئەکەونە بەربەرەکانێ وە. کامیان پارە زۆرتر بدات تاووسەکە ئەبرێتە ماڵی ئەو کەسە. جا ئەگەر کەسی بێگانە لەوێ نەبوو، تاووسەکە لە خورجەکە دەرئەهێنن و لە شوێنی تایبەتیی خۆیدا دای ئەنێن ئینجا دانیشتوانی گوندەکە بەتاک تاک و بەکۆمەڵە کۆمەڵە دێنە بەردەم تاووسەکە و خۆیانی بۆ ئەنوشێننەوە و ماچی ئەکەن و هەرچییەکیان پێ بێ پێشکەشی ئەکەن پاشان لە تاووسەکە ئەپاڕێنەوە کە لە گوناهیان خۆش ببێ و خۆیان و منداڵەکانیان لە گەڕ و گێچەڵ و پشم و قینی خۆی بپارێزێ[1] دوای ئەوە گفتوگۆکارەکان ئەوەستن و دەست ئەکەن بەدەف و دووزەڵە لێدان لەسەر ئاوازێکی دڵگیر، ئەوانی تریش دەست ئەکەن بەجۆرە هەڵپەڕکێیەکی ئایینی. هەست و دەروونیان ئەجوشێ و لە ناوەند ترس و هیوادا شپرزە ئەبن. جاری وایش هەیە ئاگایان لە خۆیان نامێنێ (تاووس)ەکەیش هەڵ ئەگرن و لەگەڵ خۆیاندا هەڵی ئەپەڕێنن!...

یەزیدییەکان ئەمە بەڕۆژێکی پیرۆز دائەنێن، لە شەوا مۆم و چرایەکی زۆر دائەگیرسێنن، گیای بۆن خۆشیش زۆر ئەسوتێنن، ئێشک ئەگرن و بەدیار (تاووس)ەکەوە ئەوەستن، نەوەک بێگانەیەک بیدزێ. خاوەن ماڵەکە کە (تاووس) میوانییەتی. بەناوی ڕێزگرتن لەوەوە گا یاخود مانگایەک سەرئەبڕێ. دانیشتوانی گوندەکەیش نان و چێشتێکی زۆر بۆ خۆیان دروست ئەکەن ئەو ڕۆژە تێر و پڕ ئەخۆن و ئەخۆنەوە و بەزموڕەزم ئەکەن، کە ڕۆژی دوایی هات گفتوگۆکارەکان تاووسەکە ئەخەنەوە ناو توورەکەکەی خۆیانەوە[2] و ڕوو ئەکەنە گوندێکی تر.

---

(١) بەکارهێنانی تاووس لەم شێوەیەدا، نەک هەر پێچەوانەی ئایینی زەردەشتییە کە دژی بت پەرستییە، پێچەوانەی ئایینی یەزیدییە کە خۆیشییەتی بەڵام ئەمە سەرئەنجامی نەخوێندەوارییە. (ش. ف)

(٢) ئەوی هۆش پەسندی بکات ئەوەیە کە ئەم تاووسانە بریتین لە ئاڵایەک کە دەدرێتە دەست گێڕەرەکان کە بەڵگەبێ بۆ ئەوەی لەلایەن سەرداری شێخانەوە نێرراون بۆ پیتاک و باج کۆکردنەوە. ئاڵایش لەناو هەموو نەتەوەیەکدا ڕێزی لێ ئەگیرێ. (ش. ف)

## دزینی تاووسەکان

هەروەک لەمەوپێش دەرمان خست (تاووس) بەلای یەزیدییەکانەوە نیشانەیەکە بۆ فریشتە تاووس. هەروەها ئالایەکیشە. جا چونکە یەزیدییەکان بەپەرۆشەوە بوو بیپارێزن لە بینین و دزینی لەلایەن بێگانەکانەوە، گەلێک واتە وات کراوە لەسەر دزینی ئەو تاووسانە و بردنیان بۆ مالە دەولەمەندەکان، یاخود بۆ ناوازەگاە (متحف)ەکانی ئەوروپا. بەلام تا ئێستا ئەم وتووێژانە لە ڕاستییەوە دووربوون. ئەوەندە هەیە (فەریق عومەر وەهبی پاشا) کە سەرکردەیەکی تورکی (عوسمانی) بووە لە سالی ١٨٩٢دا بەخۆی و لەشکرەکەیەوە هەلی کوتاوەتە سەریان تا بەزۆر بیانکاتەوە بەئیسلام. بەلام بەگوێیان نەکردووە. ئەویش چوار (تاووس) لە تاووسەکانی داگیر کردووە و ناردونی بۆ (بەغدا). لەوێ لە کۆگای لەشکردا پارێزراون. بەلام لە سالی ١٩٠٨دا هەر چوار تاووسەکەیان داونەوە.

## شتە پیرۆزەکانی تری یەزیدییەکان

بەپێی نووسراوی (عەبدەی ئیبلیس) کە هی (نوری پاشا)ی سەرداری (موصل)ە، لە چاخی (عوسمانی)دا، یەزیدییەکان بێجگە لە (تاووس)ەکان، ئەم شتانەیشیان لا پیرۆزە؛ سەرەکی تیرەکەیان لای خۆی ئەیانپارێزێ:

١- بەرانی ئیسماعیل، کە لە مس دروست کراوە.
٢- دار دەستی مووسا، کە لە مس دروست کراوە.
٣- مار دەستی مووسا، کە لە مس دروست کراوە.
٤- ڕست (تەزبیح)ی شێخ ئەحمەدی بەدەوی.
٥- شانەی ڕیشی شێخ جنیدی بەغدادی.
٦- دار دەستی شێخ عەبدولقادری گەیلانی.
٧- تاسی سلێمان کە لە مس دروست کراوە.
٨- پشتێنی شێخ ئەحمەدی ڕەفاعی.

بەلام (صدیق الدملوجی) کە خاوەنی نووسراوی (الیزیدیە)یە ئەلێ: ئێستاکە ئەم شتانە نەماون و یەزیدییەکانیش هیچیان لێ نازانن و ناویشیان ناهێنن. ڕەنگە بووبن و لەناوچووبن.

٩- چرایەکی ڕەنگاوڕەنگیشی لای (ئیسماعیل بەگ کوڕی عەبدی بەگ) هەیە، کە خۆی لە خێزانی سەرۆکەکانە، ئەلێ ئەمە (شێخ عدی) بەکاری هێناوە. یەزیدییەکانیش ئەچنە سەیری و وەک موفەرک دەستی لێ ئەدەن.
١٠- چوارچێوەیەکی پەنجەرەیش لای (شێخ بریم کوڕی شێخ ڕەمەزان) لە گوندی بازانی (بحزانی) پارێزراوە. یەزیدییەکان ڕێزی زۆر لێ ئەگرن، باوەڕیان وایە کە (شێخ عدی) لەسەری دانیشتووە.
١١- لە بابەتە هەرە پیرۆزەکانیش (قالیچە)یەک هەیە، باوەڕیان وایە کە هی (شێخ عدی)یە، لەلای (بابە شێخ) ئەپارێزرێ ئەویش کاتی سەر لێ دانەکانی یەزیدییەکان دەری ئەهێنێ. یاخود کاتی، تەنگانەیان.

ئەم ڕایەخە لەناو یەغدانێکی کلیل و کلۆم کراودا هەڵ گیراوە. لە پارچە سیپاڵێکی ئەستوور پێچراوە، لە یەزیدییەکان بەولاوە ناهێڵن کەس بیبینێ. لە خورییەکی ڕەشی سووریاو دروست کراوە. مۆرانە هەردوو پەراوێزەکەی خواردووە. درێژی دە بست و پانیشی چوار بست و نیوە. هەرچەندە ڕایەخێکی کۆنە، بەڵام بەلای (صدیق دملوجی)یەوە وایە کە تەمەنی ناگاتە سەردەمی (شێخ عدی)، کە ئەمە هەشت سەد ساڵە مردووە. بێجگە لەوە ئەمەندە سەرگەردانی بەسەر یەزیدییەکاندا هاتووە بڕوا ناکرێ کە هیچیان لێ مابێتەوە!... لەگەڵ ئەمەیشا ئەم قسەیەی (صدیق الدملوجی) بەڵگەی ئەوێ تا بچەسپێتەوە دڵەوە. چونکە لە مێژوودا بەهەزاران شتی وا کۆنیش هەنە و نە کۆنی و نە سەرگەردانی نەیانتوانیوە لەناویان بەرن!...

## سکاڵای یەزیدییەکان

ئەم سکاڵایە لە ١٨٢٧/٢/٢٨دا دراوە بەفەرمانڕەوایی عوسمانی بۆ ئەمەی لە سەرباز لێ گرتنیان وازبهێنێ: «ئێمە کە ڕۆڵەی یەزیدیین، لەبەر ئەوەی ناتوانین سەرباز بەفەرمانڕەوایی بدەین، وامان پێ باشترە کە لە باتی ئەوە پارە پێشکەشی فەرمانڕەوایی بکەین، وەک مەسیحییەکان و جوولەکەکان هۆی ئەمەیش کە بۆمان دەست نادات سەرباز بدەین زۆرە لەوانە چواردە هۆ پێشان دەبن کە ئەمانەن:

١- پێویستە لەسەر هەموو یەزیدییەک، گەورە بێ یان بچووک، ژن بێ یان کچ، ساڵی سێ جار بچێتە پێش دەمی پەیکەری (فریشتە تاووس) واتە لە مانگەکانی گوڵان (نیسان) و مشتاخان (ایلول) و پەڵە (تشرین ثانی)دا، هەر کەسێ لەمەدا کەمتەرخەمی بکات بەیەزیدی دانانرێ.

٢- ئەگەر یەزیدییەک، بەلای کەمەوە ساڵێ جارێک گۆڕی (شێخ عدی کوڕی مسافر)، خوا ڕێز لە ڕازی بگرێ، سەر لێ نەدات؛ لە (١٥ - ٢٠ی مشتاخان)دا؛ بەلای ئێمەوە بەخوانەناس دائەنرێ.

٣- پێویستە لەسەر هەموو یەزیدییەک کە هەموو بەیانیانێک. لەکاتی گزنگی ڕۆژدا[1] جێگایەکی پەنا بۆ خۆی بدۆزێتەوە. ئەوەندەی کە هەتاوی لێوە ببینێ سەر بۆ ڕۆژ بچەمێنێتەوە. نابێ لەوێدا موسڵمان یاخود جوولەکە یان مەسیحی هەبێ؛ یان هیچ خواناسێک. ئەگەر ئەوەی نەکرد بەخوانەناس دائەنرێ.

٤- پێویستە لەسەر هەموو یەزیدییەک کە دەستی برای هەتا هەتایی خۆی. یاخود پیاوی (مهدی). دەستی شێخەکەی خۆی و پیرەکەی خۆی ماچ بکات. ئەگەر ئەوەی نەکرد بەخوانەناس دائەنرێ.

٥- ئەمەش کارێکە کە بەپێی ئایینی ئێمە دروست نییە: هەرچەند موسڵمانەکان بەیانیان نوێژ ئەکەن ئەڵێن «أعوذ بالله من...» جا ئەگەر یەکێک لە ئێمە ئەوەی گوێ لێ بێ. یان ئەبێ ئەو کەسە بکوژێ کە ئەوە بەدەمیا دێ یان ئەبێ خۆی پێ بەکوشت بدات هەر کەسێ ئەوە نەکات بەخواناس دائەنرێ.

٦- کە یەکێک لە ئێمە بمرێ پێویستە برای هەتا هەتاییەکەی و شێخەکەی و پیرەکەی بێنە سەر لاشەکەی. یەکێک لە گفتوگۆکار (قوال)ەکانیش ئەم واژەیەی ئەدات بەگوێدا: (ئەی ئەو کەسەی کە

---

(١) بێگانەکان ئەمە بەڕۆژ پەرستێ ئەژمێرن لەسەر یەزیدییەکان. بەڵام لە ڕاستیدا پەرستن نییە. ڕێزگرتنە: کە پێویستە هەموو زەردەشتییەک ڕێز لە ئاو و با و ئاگر و چرا و گڵ بگرێ. (ش. ف)

کڕنووش بۆ فریشتە تاووس) ئەکێشێت، تۆ بەو ئایینە ئەمریت کە ئەوی ئەیپەرستێت لەسەریەتی. مەبەسم ئایینی ئەو خوا گەورەیەیە کە پێی ئەڵێن (فریشتە تاووس)[1] نەک ئاینێکی تر جا ئەگەر یەکێک هاتە سەرت و پێی گوتیت ببێت بەئیسلام؛ یان بەمەسیحی یاخود بەجولەکە. یان بەئایینێکی تر. باوەڕی پێ نەکەیت و پەیڕەویی. نەکەیت. چونکە ئەگەر تۆ لە ئایینی (تاووسی فریشتان) بەولاوە کە خۆتی بۆ ئەچەمێنیتەوە ئایینێکی تر بناسیت و پەیڕەویی بکەیت؛ بەخوانەناس دائەنرێیت.

٧- ئێمە شتێکمان هەیە پێی ئەڵێن (موفەرکی شێخ عدی). کە ئەویش بریتییە لەو گڵەی کە لە گۆڕی شێخ عدی ئەیهێنین. جا هەر یەزیدییەک هەندێکی لەو گڵە لەگەڵ خۆی هەڵنەگرتبێ و هەموو بەیانییەکیش تۆزێک لەو گڵە نەخوات بەخوانەناس دائەنرێ. هەر کامێکیشمان مرد و ئەو گڵە پیرۆزەی پێ نەبێ بەخوانەناسییەوە ئەمرێ.

٨- پێویستە لەسەر ئەوانەی کە ڕۆژوو ئەگرن. تا لە نیشتمانەکەی خۆیاندا نەبێ ڕۆژوو نەگرن. چونکە پێویستە لەسەریان لە هەموو بەیانییەکی ڕۆژانی ڕۆژووگرتندا بچنە ماڵی شێخ یاخود پیرەکەیان و لەوێدا دەست بکەن بەڕۆژووگرتنەکەیان. هەروەها ئێوارە لە ماڵی یەکێک لەو دووانەدا ڕۆژووەکەیان بشکێنن. کە لەوێدا مەیە پیرۆزەکەی شێخ یاخود پیرەکەیان ئەخۆنەوە[2] هەرکەسێکیان جامێ دوو جام لەو مەیە نەخواتەوە ڕۆژووەکەی بەجێ ناگات ئەو کەسەش بەخوانەناس دائەنرێ.

٩- ئەگەر یەزیدییەک کۆچی کرد بۆ شارێکی بێگانە و بەلای کەمەوە ساڵێک لەوێدا مایەوە ئینجا گەڕایەوە نیشتمانەکەی خۆی ناتوانێ جارێکی تر لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا بژیتەوە. کەسیش لە ئێمە ژنی ناداتێ مارەی بکات. هەرکەسێکیش لە ئێمە ئەوەی کرد بەخواناس دائەنرێ.

١٠- ئەمە لە بابەت پۆشاکەوەیە. هەروەک لە بەندی چوارەمدا گوتمان هەر یەزیدییە برایەکی هەتا هەتایی هەیە هەروەها خوشکێکی هەتا هەتایشی هەیە. کە یەکێکیشمان کراسەکەی خۆی ئەدروێ، لە خوشکی هەتا هەتایی بەولاوە نابێ کەسی تر ملیوانەکەی ببڕێ. جا ئەگەر خوشکە هەتا هەتاییەکەی ئەو ملیوانەی بۆ نەبڕێ، نابێ کراسەکەی لەبەر بکات. ئەگەر هاتوو ئەو کراسەی لەبەر کرد بەخوانەناس دائەنرێ.

١١- ئەگەر یەزیدییەک کراسێک یاخود شتێکی تازەی دروست کرد و لە ئاوە پیرۆزەکەی ناو قسنەکەی (شێخ عدی) دانەیشت نابێ لەبەری بکات. هەر کەسێ وا بکات بەخواناس دائەنرێ.

١٢- نابێ ئێمە بەرگی شین لەبەر بکەین. نایشتوانین بەشانەی موسڵمان یاخود گاور یان جوولەکە

---

(١) بەلام من لە ڕۆشنبیرانی یەزیدییەکانم بیستووە کە (تاووسی فریشتان) بەسەرۆکی فریشتەکان و خۆشەویستی خوای تاک و تەنیا دائەنێن نەک بەخوا، واتا (تاووسی فریشتان) هەرچییەک بکات بەناوی خوای خۆیەوە ئەیکات نەک بەناوی خۆیەوە کە ئافەریدەکراوێکی ئەوە. (ش. ف)

(٢) مەی خواردنەوە لە ئایینی زەردەشتیدا بەگوناە دائەنرێ. ئەم ڕەوشتە ئەچێتەوە سەر ئایینی پێش زەردەشتی؛ کە بریتییە لە سروشت پەرستی. (ش. ف)

سەرمان دابهێنین. نایشتوانین سەرمان بەگوێزانی خوانەناسێک بتاشین تا بەناوی پیرۆزی (شێخ عدی) نەیشۆین جا هەرکەسێکمان ئەوەی کرد بەخوانەناس دائەنرێ.

١٣- نابێ هیچ یەزیدییەک بچێتە پێشاو یاخود گەرماو (حمام) نایشبێ کەوچک یاخود کاسەیەکی وا بەکاربهێنێ کە موسڵمانێک، یاخود بێ ئایینێک بەکاری هێنابێ.

١٤- هەرچی لە بابەت خواردەمەنیشەوەیە؛ لە ناوەند ئێمە و خاوەن ئایینەکانی تردا جیاوازییەکی زۆر هەیە. چونکە ئێمە نەماسیمان پێ ئەخورێ؛ نە ئاروو (خەیار)، نە بامێ؛ نە کولەکە، نە فاسولیا، نە کەلەرم، نە کاهوو.

| | |
|---|---|
| سەرۆکی تیرەی یەزیدی | سەرۆکی ئایینیی تیرەی یەزیدی |
| سەرکردەی شێخان | لە ناوچەی شێخاندا |
| حوسێن | شێخ ناسر |
| سەرۆکی گوندی مام ڕەشان | سەرۆکی گوندی بیبان |
| سلێمان | حوسێن |
| سەرۆکی گوندی خەتارە | سەرۆکی گوندی موسەکان |
| ئەیوب | مراد |
| سەرۆکی گوندی دەهکان | سەرۆکی گوندی خورزا |
| حوسێن | نەرمو |
| سەرۆکی گوندی باقەسرە | سەرۆکی گوندی خۆشابا |
| علی | الیاس |
| سەرۆکی گوندی بعشیقە | سەرۆکی گوندی کابارە |
| علو | کوچک کسو |
| سەرۆکی گوندی سینا | سەرۆکی گوندی عین سفنی |
| عبدو | کرکو |
| سەرۆکی گوندی کەبەرتوو | سەرۆکی گوندی قصر یزدین |
| طاهر | شێخ خێرۆ[1] |

لێرەدا یەزیدییەکان قسەکانیان زۆر لە ڕاستییەوە دوورن. چونکە باوەڕییەکانیان ناگاتە ئەو ئەندازانەی کە ئەوان پێشانیان داوە. ئەوان مەبەسیان ئەوە بووە کە لە سەربازیی ڕزگاربن. بەڵام فەرمانڕەوایی تورک هەر بەئیسلامی دانان؛ ئەو بیانووەی لێ پەسەند نەکردن. دوایی بوو بەگیروگرفتێکی زۆر گرنگ و گەورە لەبەردەم فەرمانڕەواییدا؛ ئەوانیش پێی کەوتنە تەنگانەیەکی هەرە گەورەوە.

(١) ئەم سکاڵایە لە نووسراوەکەی (موسیو ف. نو)وە گۆڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، منیش لە نووسراوەکەی (صدیق الدملوجی)م وەرگرتووە کەناوی (الیزیدیە)یە. بەڵام لەوە بێ گومانم کە دەستکارییەکی زۆری تیا کراوە. بەتایبەتی لە سەرچاوەی دوژمنە موسڵمانەکانیانەوە وەرگیراوە کە تورکەکانی عوسمانین. (ش. ف)

## ڕەوشت و خووی یەزیدییەکان

### ئاهەنگ و زەماوەند

بەبۆنەی جەژنە ئایینییەکانیانەوە، کە یەجگار زۆرن، بەتایبەتی لە کاتی سەردان لە گۆڕی شێخ و پیرەکانیاندا؛ هەروەها لە کاتی ژنهێناندا یەزیدییەکان ئاهەنگ و زەماوەند ئەگێڕن. لە ئاهەنگی ژنهێناندا دانیشتوانی گوندەکانی دراوسێیشیان لەگەڵ هی گوندە دوورەکاندا کۆ ئەبنەوە و تا سێ شەو و سێ ڕۆژ ئەدەن لە دەهۆڵ و زوڕنا. کە شاییش گەرم بوو کوڕان و کچان دەست ئەکەن بەڕەشبەڵەک و هەڵپەڕین: یەزیدییەکان چ بەمەی خواردنەوە، چ بەشاییەکە ئەکەونە خۆشی و کامەرانییەوە؛ سەرخۆش ئەبن بێجگە لەوە دەست ئەکەن بەگرەوی ئەسپ تاودان؛ کە موسڵمانەکانیش لەمەدا هاوبەشییان ئەکەن.

هەڵپەڕکێ و سەماکردن پڕ بەدڵی ئافرەتەکانیانن. چ بەتاک تاکی چ بەکۆمەڵە سەما ئەکەن، هی وایشیان تیا هەیە کە لەسەماکردندا زۆر شارەزان لە گفتوگۆکارەکانیانەوە کە لە هونەری هەڵپەڕکێ و سەمادا دەستیان هەیە فێری ڕەشبەڵەک و هەڵپەڕین و سەماکردن ئەبن. چەند کچێکیان کۆ ئەبنەوە و بەکۆمەڵە؛ بەدەنگێکی کاریگەر و ناسکەوە گۆرانی نەتەوەیی ئەڵێن؛ کار لە دڵ و دەروون و مێشکی پیاوان ئەکەن. بەڵام نابێ هیچ موسڵمانێک لەوێ بێ و گوێیان لێ بگرێ.

کاتێ کە تاووسەکانیش ئەگەنە ناو دێ؛ لادێییەکان دەست ئەکەن بەبەزم و شایی. لە کۆڕێکی پان و فراواندا بەکۆمەڵە و بەتەنیا دەست ئەکەن بەسەما و هەڵپەڕین. شاییەکان بەزۆریی لەو ساڵانەدا ئەکرێن، بەبۆنەی ژنهێنانەوە، کە دەغڵ و دانیان بڕشتی باش بێ. چونکە ئەگەر وانەبێ یەزیدییەکان دەرەقەتی ئەو پارە بەخت کردنە نایەن.

### هیوای دوارۆژ

یەزیدییەکان بەهیوای ئەو ڕۆژەن کە لە دەست زۆرداریی و بەدکرداریی موسڵمانەکان ڕزگاریان ببێ و بکەونە سرەوت و ئاسایش و کامەرانییەوە. ژیانێکی سەربەرزانە و پوختە ڕاببوێرن. باوەڕیان وایە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دێ ڕۆژگار بەدەمیانەوە پێ ئەکەنێ، (یەزید کوڕی معاویە) لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆ سەری زەوی و کاروباری جیهان ڕاست ئەکاتەوە و سەریشیان بەرز ئەکاتەوە.[1] هەر کەسێ پەیڕەویی بکات سەری ئەخات، هەر کەسێکیش سەرکێشی بکات لەناوی ئەبات.

سەردار، ئەبێتە فەرمانداری دەست بەرەڵڵای بەچنگ بەسەر خاکی یەزیدیی چاوەڕوان کراوەوە. هەرچی نەتەوەیەک هەیە لەسەر زەویدا ئەکەونە ژێر دەستیانەوە یەزیدییەکانیش تۆڵەی خۆیان لە دوژمنە موسڵمانەکانیان ئەکەنەوە، هەروەک (بەخت نەسر)ی باپیریان تۆڵەی لە جوولەکەکان کردبووەوە. پس سەردارەکان ئەبنە کاردەبەستی سەرداری (أمیر). (پیر)ەکان و شێخەکانیش ئەبنە سەرکاری. گفتوگۆکارەکانیش ئەبنە پیاوانی ڕاسپێرراوی (کۆچەر)ەکانیش ئەبنە پارە کۆکەرەوەی. هەژار

---

(١) الیزیدیة: صدیق الدملوجي. (ش. ف)

(فەقیر)ەکانیش ئەبنە سەربازی. (باعذرە)یش ئەبێتە پایتەختی ئەو فەرمانڕەواییە شاری (شام)یش ئەبێتە شاری هەرە گەورەی خاکی یەزیدی. دیارە ئەم باوەڕانەیان لەتاو زۆروستەمی موسڵمانەکان هاتووەتە مێشکەوە. هەر بەو تاواتەیشەوە ئەژین کە سەرلەنوێ پایەی گەورەیی (ئەمەوی)یەکان زیندوو بکەنەوە.[1]

## کریف چییە؟!

(کریف) بەدۆست و برادەر ئەڵێن. یەزیدییەکان کریفێتییان زۆر بەگرنگ گرتووە. هەروەکو یەزیدییەک و یەزیدییەک ئەبن بەکریف. ئەگونجێ یەزیدییەک و سوڵمانێکیش ببن بەکریف ئەویش ئەوە پێک دێ کە یەکێکیان منداڵی ئەوی تریان بخاتە باوەشی خۆیەوە لە کاتی چووک بڕینیا ئەوان بەوە ئەڵێن «کریف خونی» واتا دۆستی خوێنی. یەزیدییە کە پڕ بەدڵ ئەم دۆستایەتییە ئەپارێزێ و خۆیشی لەپێناویا بەخت ئەکات. ئەگەر کریفێتییەکە کەوتە ناوەند دوو یەزیدییەوە، هەتا پێنج پشتیش نەوەیان وەک برای شیریی دائەنرێن.

لە (شێخان)دا کریفیتی ناوەند موسڵمانەکان و یەزیدییەکان کزبوو وەک خۆی نەمایەوە. تاوانیش ئۆباڵی بەئەستۆی موسڵمانەکانە. نەک یەزیدییەکان. بەڵام لە (سنجار)دا پێچەوانەی ئەوێ هەردوولایان ڕێز لە دۆستایەتییەکەیان ئەگرن و یارمەتیی یەکتر ئەدەن و سەر و سامانی یەکتریش ئەپارێزن.

## کەنەفت کردن

مەبەس لەم کەنەفت کردنە، پاراستنی ئایینی یەزیدییە، لە دەستکاریی کردن و شکاندنی فەرموودەکانی و ترساندنی نەتەوەی یەزیدییە لە شکاندنی بەندەکانی ئایینەکەیان. هەر سەردار (ئەمیر)ەکان ئەتوانن ئەم دەسەڵاتە بەکاربهێنن، سەردار لە کەس کۆ بکاتەوە هەر کەسێکی کەنەفت کرد، لە هەموو مافێکی شارستانێتی و ئایینیی خۆی بەش بڕاو ئەمێنێتەوە. بەچاوی سووک سەیری ئەکەن. تەنانەت ژن و منداڵی خۆیشی خۆیانی لێ دوور ئەخەنەوە. هەتا ئەمرێ، یاخود سەرداری یەزیدییەکان نەیبەخشێ لە دەست ئەو سزایە ڕزگاری نابێ. سەردارەکان لە پاش کزبوونیان ئەم فێڵەیان دۆزییەوە ئەویش بۆ گێڕانەوەی هێز و دەسەڵاتی خۆیان.

## موفەڕک

ئەم موفەڕکە ئەوەندەی مورووێک ئەبێ؛ گفتوگۆکارەکان لە گڵکەی سەر گۆڕی (شێخ عدی) دروستی ئەکەن. پاشان لە کاتی هاتنی یەزیدییەکاندا بۆ ڕێزگرتنی تاووسەکان، بەدیاریی ئەیاندەنێ. پێویستە هەموو یەزیدییەک یەکێک لەم موفەڕکانەی پێ بێ، تا لە تەنگانەدا خۆی پێ بپارێزێ.

---

(١) ڕەنگە (صدیق الدملوجی) ئەم سەرگوروشتەی لە نووسەرانی بێگانە یاخود لە بۆرە پیاوانی نەخوێندەوارەوە وەرگرتبێ. ئەگینا ڕۆشنبیرانی یەزیدی هەر خەو بەکوردایەتیی خۆیانەوە ئەبینن. (شێخ حەسەن)یش هەر وای کردووە. (ش. ف)

پێویستە بەیانیان و ئێواران ماچی بکات. جاری وا هەیە بەهۆی ئەم موفەرکەوە دوو هۆزی بەگژیەکدا چوو، شەڕ ئەوەستێنن و ئەو شەڕ وەستاندنەی خۆیان ئەپارێزن. ئەمەیش بەوە جێبەجێ ئەبێ، هەر هۆزە (موفەرک)ەکەی خۆی ئەدا بەوی تر. بۆ ئەمەی لەوە دڵنیابن کە جارێکی تر بەگژیا ناچێتەوە، جاری وایش هەیە (موفەرک)ەکە، پێچەوانەی ئەم مەبەسە کار ئەکات، وا ئەبێتە نیشانەی کوشتار دەست پێ کردنەوە. ئەمەیش کاتێک ڕوودەدات کە هەر هۆزە موفەرکی خۆی لەوی تر بسێنێتەوە.

ئەگەر دوژمنێک بەسەر دوژمنێکی خۆیدا سەرکەوت، و زانی دوژمنەکەی خۆی ئەو موفەرکەی هەڵگرتووە، لەوانەیە هیچ ئازارێکی نەدات، لەبەر ڕێزگرتن لە موفەرکەکە؛ ئەگەر باوک و برا و کوڕیشی کوشتبێ، هیچی لێ ناکات. ئەم ڕەوشتە زۆتر لەلای یەزیدییەکانی (سنجار) باوە.

بەم ڕەنگە (موفەرەک) ئەبێتە هۆی پاراستنی ئارام و ئاسایش و ئاشتی و بەهێزکردنی کۆکی و برایەتی کە هیچ هێزێکی تر ئەوەی لە دەست نایەت.

یەزیدییەکان ئەو ڕەوشتەیان لا باو نییە کە لە باتی کەسێکی کوژراویان پارە وەربگرن. ئەوان ئەوە بەترسنۆکی و بێ دەسەڵاتی دائەنێن. باوەڕیان وایە کە (شێخ عدی) بەربەستی کردووە. گۆڕینەوەی موفەرک لەلایەن هەموو یەزیدییەکەوە ئەکرێ.

## ئاوی پیرۆز

یەزیدییەکان کە منالیان ئەبێ حەوت ڕۆژ لەو ئاوە پیرۆزەی کە لە گۆڕستانی (شێخ عدی) دایە ئەیشۆن، بۆ ئەمەی لە پیسیی منداڵدان پاک ببێتەوە. هەروەها هەر شتێکیش کە دەستی موسڵمانەکانی لێ کەوتبێ لەو ئاوە پیرۆزەدا ئەیشۆن و پاکی ئەکەنەوە. بەڵام ئێستا ئەم ڕەوشتە کزبووە، لە ترسی ئەوەی منالەکان بەو ئاوە ساردە بمرن.

## چووک برین

لە پاش لە دایکبوون بەحەوت ڕۆژ چووکی کوڕەکانیان ئەبڕن[1] هەندێ جاریش لە پاش دوو ساڵ وایان لێ ئەکەن. بەپێی قسەی (صديق الدملوجي) خاوەنی نووسراوی (اليزيديه)، یەزیدییەکان ئەم ڕەوشتەیان لە ئیسلامەوە وەرگرتووە.

## ژن زۆر هێنان و بەرەڵلاکردن

بەپێی ئایینی یەزیدی پیاو ئەتوانێ تا چوار ژن بهێنێ. هەرکاتێکیش ویستی ئەتوانێ بەرەڵلایان بکا. هەرچی سەرداری یەزیدییەکانە، ئەویش ئەتوانێ، چەند ژنی بوێ، لە سنووری ئایینیدا مارەی بکات. بەڵام ناتوانێ هیچیان بەرەڵلا بکات. چونکە ناشێ کەس لە پاش ئەو مارەیان بکات. پێویستە ئەو ژنانە، هەر لەناو ماڵی سەرداردا بمێننەوە تا ئەمرن. تەنانەت لە پاش مردنی مێردەکانیشیان ناتوانن شوو بەسەرداری تازە بکەن، یەزیدییەکان ئەو ژنە سەردارانە بەدایکی خۆیان دائەنێن. وەک دایکی

(١) چووک بڕین: (خەتەنەکردن)

خۆشیان بانگیان ئەکەن، بام لە تەمەنیشدا لەوان بچووکترین.

جا هەر ئەوەندە پیاوەکە بەژنەکەی بڵێ: بەرەڵڵام کردیت[1]. یاخود پێی بڵێ تۆ شێخی منی، تۆ پیری منی. ژنەکە بەبەرەڵڵاکراو دائەنرانێ. لەگەڵ ئەوەیشا هەر کاتێ رێککەوتنەوە، ئەتوانێ مارەی بکاتەوە، بام لە سێ جار پتریش بەرەڵڵای کردبێ. بەڵام چینی ئایینی، کە خۆشیان بەچینێکی ناوازە و جیاواز دائەنێن؛ رێز لەو بڕیاری بەرەڵڵاکردنە ئەگرن ئەگەر سێ جار لەسەریەک بەسەر زمانی مێردەکەدا هاتبێ مارەی ناکاتەوە. ئەوەیش لای یەزیدییەکان باو نییە کە پیاوێ ژنەکەی خۆی بەرەڵڵا کردبوو، پەنا بەرێتە بەر پیاوە ئایینییەکان، بۆ ئەمەی بڕیاری گێڕانەوەی ژنەکەی بۆ بدەن تا مارەی بکاتەوە. لەمەدا یەزیدییەکان پێچەوانەی ئیسلامن. یەزیدییەکان گوێ نادەنە، مارەی بەرەڵڵایی. ژن و مێرد وەک یەک لە جیابوونەوەدا ئازادن... پیاو لەوە دڵنیا نییە کە دەستێکی ناپاک بکەوێتە ناوەند خۆی و ژنەکەیەوە و ژیانی ژن و مێردییان لێ تێک بدات. ئەمەیش لەوەوە پەیدا بووە کە شێوەیەکی ئایینی و فەرمانداریيان نەداوە بەژن مارەکردن؛ تا ژن لە جیابوونەوە لە مێردەکەی خۆی بەربەست بکات. بەواتایەکی تر رێز لە سەربەستی زۆرتر ئەگرن.

ئەوەندە هەیە ئەم بارە لە (شێخان)دا گۆڕاوە و بەرەو چاکی ئەچێت. چونکە زۆر جاری وا هەیە پیاو و ژنەکە دێنە کن دادگەریی ئایینی و لەسەر دەستی ئەوا یەکتری مارە ئەکەن، نەوەک ژیانی خێزانی یان لەوە دواتێک بچێ یان تێک بدرێ. دیارە ئەمەیش هەنگاوێکی تازەیە بەرەو پێشکەوتن ئەنرێ لە ئایینی یەزیدیدا، کە هەموو دەم ئامادەیە بۆ گۆڕان و گەشەکردن.[2]

## خۆشتن

هەموو یەزیدییەک، پێویستە لەسەری، لە دوای جووت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا، خۆی بشوات، یەزیدییەکان خۆیان لە خۆیاندا حەز لە پاکی و خاوێنی ئەکەن. هەر هیچ نەبێ حەفتەی جارێک خۆیان ئەشۆن بەبۆنەی جەژنەکان و پەیدابوونی کەشەکان و، سەرلێدان لە گۆڕی (شێخ عدی)یەوە هەروەها بەبۆنەی کۆچ کردنیانەوە بۆ جێگایەکی دوور، بەتایبەتی لە رۆژانی رۆژووگرتنیاندا یەزیدییەکان هەموویان خۆیان ئەشۆن. هەرچی ئافرەتەکانیشیانە، ئەم رەوشتە جوانە زۆرتر ئەپارێزن.

کە ژن لە کاتی منداڵبوونیابێ، یاخود نۆرەی خوێن پژانی بێ یا منداڵدانی هاتبێ، پیاو نابێ توخنی بکەوێ، بەنیازی جووت بوون. ماوەی پاش مناڵبوونەکەیشی چل رۆژە، کە تەواوبوو و ژنەکەیش خۆی شت، ئەوساکە رێ بەپیاوەکە دراوە بەنیازی جووتبوونەوە توخنی بکەوێ.

---

(١) واتە: تەڵاقمدایت.

(٢) شیربایی وەرگرتن وەک لەناو کوردە موسڵمانەکانی لادێدا باوە لەلای یەزیدییەکانیش باوە. بەڵام لەم دواییەدا نرخی شیربایییان کەم کردەوە. (ش. ف)

## برایەتیی تا سەر بۆ ڕۆژی پاش مردن

ڕەوشتی یەزیدییەکان وایە، هەموو یەزیدییەک ئەبێ، برایەک و خوشکێک لە چینی ئایینی بۆ خۆی دیاریی بکات، کاری خۆی بەرەو ڕووی ئەوان بکاتەوە، لە ڕۆژی پاش مردنیشدا ئەو دوانە بۆی بپاڕێنەوە لە خوا کە بیبەخشێ لە گوناهەکانی و بەنیازی خۆیشی بگەیەنێ. پێویستە هەموو بەیانیانێک دەستی ئەو خوشک و برایەی خۆی بگوشێ و خۆشەویستیشیان لەگەڵدا بنوێنێ. هەر کاتێک کراسێکی بۆ خۆی دووری، ئەبێ خوشکە تا سەرەکەی ملیوانەکەی بۆ هەڵ بدڕێ. لە کاتی مردنیشیا پێویستە خوشک و برا تا سەرەکانی لەسەری ڕاوەستن و یارمەتیی (شێخ) و (پیرە)ەکەیشی بدەن لە لەش شتن و پێچانەوەی لەشیا بەسیپاڵ. ئەمەیش لای یەزیدییەکان باوە: کە میلوانی کراسەکانیان ئەبێ خڕبێ چ ژن بێ چ پیاو لەمەیشدا ئەچنەوە سەر ڕەوشتی زەردەشتییەکان.

## مردوو شتن

یەزیدییەکان لاشەی مردووەکانیان ئەشۆن، هەندێ جار بەئاوی گەرم و سابوون. ئەوان لەمەدا لە ئیسلامەکان ئەکەن بەڵام لە دەست نوێژ پێشتنا لە ئیسلامەکان ناکەن.

ئەوی مردووەکە ئەشوات (شێخ)ەکەی و (پیر)ەکەیەتی. خوشک و برا تا سەرەکەیشی یارمەتییان ئەدەن (شێخ)ەکەیشی هەندێ پاڕانەوەی بۆ ئەکات، لە کاتی شتنیا.

### مردوو ناشتن

کە لە شتنی مردووەکە ئەبنەوە، هەموو کونێکی لەشی بەلۆکە ئەگرن. توزێ لە خۆڵی گۆڕی (شێخ عدی)یش لەسەر ناوچەوان و چاوەکانی دائەنێن. بەرەو ڕۆژهەڵاتیش ئەینێژن[1] لە ڕۆژی یەکەم و دووەم و سێیەم و چل و حەوتەمی پاش مردنیشیا لەبەر گیانی ئەو پارە و خواردەمەنی و بابەتانی تر ئەبەشنەوە بەسەر هەژاراندا. ژمارەیەکی زۆر مەڕ و مانگایش سەرئەبڕن و ئەیدەن بەهەژاران و داماوان.

وا باوە لای یەزیدییەکان کە مردووەکە بەسیپاڵێکی دەستکردی خۆماڵی بپێچنەوە. نابێ هیچ سیپاڵێکی تر بۆ ئەم مەبەسە بەکاربهێنرێ. بەڵام ئێستاکە ئەو ڕەوشتەیان بەرداوە. چونکە هەموو دەم ئەو سیپاڵە خۆکردەیان دەست ناکەوێ، کە کەم دروست ئەکرێن و کەمیش بەکارئەهێنرێن.

ڕەوشتی یەزیدییەکانی (سنجار) وایە، ژن بێ یان پیاو، کە مرد، قژ و پرچی ئەبڕن و بەکێڵی گۆڕەکەیەوە هەڵی ئەواسن تا ئەڕزێ و لەناو ئەچێ. هەر کچێ لە هەڕەتی شووکردندابێ؛ یاخود تازە شووی کردبێ، جوانترین بەرگی خۆی لەبەر ئەکەن، ئینجا ئەینێژن. هەندێکیان بەخشڵیش ئەی ڕازێننەوە، ئینجا تفەنگی بۆ ئاگر ئەدەن.

هەنێکیشیان ڕەوشتیان وایە، کە مردووەکە مرد جلوبەرگەکانی لەبەر ئەکەن؛ ئینجا ئەینێژن. کە ناشتیشیان ئەیخەنە ناو پێخەفێکەوە کە لەناو گۆڕەکەدا دایانناوە.

---

(١) لەم ڕەوشتەیاندا چوونەتە سەر ئایینی ڕۆژپەرستیی هەرەکۆنیان. (ش. ف)

## ڕەوشتیان لە پاش نەشتن

خۆ ئەگەر مردووەکە خاوەن سایە و پایەبێ و پیاوێکی گەورەبێ، لە دار پەیکەرێکی بۆ ئەکەن، کام جلوبەرگی باش و ناوازەیە ئەوەی لەبەر ئەکەن، پاشان ئەو پەیکەرە لە شوێنێکی بەرز دائەنێن و لەم لا و لای کۆئەبنەوە. گفتوگۆکارەکان گۆرانییەکانی خۆیان لەبەردەمیا ئەڵێن. ئافرەتەکانیش لە خۆیان ئەدەن و شینی بۆ ئەکەن. بەئاوازێکی شیرین و کاریگەرەوە بۆی ئەلاوێننەوە. هەتا سێ ڕۆژ لەسەریەک هەر کردەوە چاکەکانی ئەو مردووە ئەگێڕنەوە. بەڵام ئەگەر مردووەکە هەژار و دەسکورت بوو، گفتوگۆکارەکان هەر ئەوەندە کارە ئایینیەکان دەربارەی جێبەجێ ئەکەن تا ئەنێژرێ. کەسوکاری مردووەکە ناو بەناو دێنە سەر گۆڕەکەی و بەسەریا ئەگرین.

مردوو لای یەزیدییەکان ڕێزی زۆر لێ ئەگیرێ، بەڵام کە پرسەکەی تەواوبوو زۆر بۆی ناگرین. هەرچەندە ناویشی ئەهێنن؛ لە خوا ئەپاڕێنەوە کە لە گوناهەکانی خۆش بێ. لە شەوە جەژنەکان و کەشەکانداناندا و چێشتی بۆ دروست ئەکەن و ئەیبەنە سەر گۆڕەکەی، لە وێی دائەنێن و ئەگەڕێنەوە بۆ مالەوە. کە سەرلەبەیانی هاتنەوە بۆ ئامانی چێشتەکان بیبەنەوە مالێ، بۆیان دەرئەکەوێ کە هیچ خواردەمەنییەکیان تیا نەماوە. بەم جۆرە یەزیدییەکان لە ڕێگای ڕێزگرتنی مردووەکانیانەوە، دەستی هەژاران ئەگرن و یارمەتییان ئەدەن.

## گۆڕی پێشەوا و شێخەکانیان

«یەزیدییەکانیش وەک هەموو خاوەن ئایینەکانی تر، هێشتا لە دەست ڕێزگرتن و پەرستنی پیاوە گەورەکانیان ڕزگاریان نەبوو بەپێی بەقسەی هەندێ بێگانە کە ئەچنە سەر گۆڕی ئەو پێشەوا و شێخانەیاتن، بروایان وایە کە خوایەتی لە ناویاندایە[1]، لەبەر ئەوە لێیان ئەپاڕێنەوە کە لای (فریشتە تاووس) بۆیان بپاڕێتەوە تا لێیان خۆشبێ و لە دەرد و سەرگەردانی بیانپارێزێ». ئەبێ هەموو یەزیدییەک، گۆڕێک لەو گۆڕانە بۆ خۆی دیاردیی بکات، کە ئێواران و بەیانیان سەری لێ بدات و بەهەر چوار لایدا بسوورێتەوە و لێی بپاڕێتەوە کە خۆشی بوێ و یارمەتیی بدات و بۆی بپاڕێتەوە لە خوای گەورە کە بیبەخشێ و بیپارێزێ لە دەرد و سەرگەردانی[2] لەبەر ئەوە هەموو نیشتەجێیەکی یەزیدی لەو گۆڕانەی تیایە. ئەم گۆڕانە زۆرن؛ لە ژمارە نایەن، سەیر ئەوەیە هەندێکیان لەسەر ئایینی یەزیدی نین. بێجگە لەوە یەزیدییەکان ڕێز لە هەندێ دار و پەردوویش ئەگرن. جێگا گرنگەکانی ئەم گۆڕانە (لالش) و (عین سفنی) و (بعشیقە) و (بحزانی) و (گوندەکانی سەرشاخی سنجار)ن. ئەم گۆڕانە هەندێکیان وەک خەستەخانە بەکاری چاککردنەوەی هەندێ نەخۆشیش دێن!...

لەم شوێنەواری گۆڕانە لە هەموویان گرنگتر بەلای یەزیدییەکانەوە پەرستگای (شێخ عدی)یە. ئەم

---

(١) بەڵام لە ڕاستیدا یەزیدییەکان شێخەکانیان ناپەرستن بەخوایشیان نازانن. تەنیا ڕێزیان لێ ئەگرن. (ش. ف)

(٢) ئەم ڕەوشتە لەناو کوردە ئیسلامەکانیشدا هەیە. بەڵام پێچەوانەی ئایینی پاکی ئیسلامە. هەروەها پێچەوانەی ئایینی پاکی زەردەشتییە. (ش. ف)

پەرستگایە کەوتۆتە ناو چیای (لالش)ەوە کە بەهەشتێکە لە بەهەشتەکانی کوردستان. جێگایەکی پڕ لە دار و درەخت و چیمەن و لالەزار و کانیاوی سارد و سازگار و کزەبای فێنکە لە هاویناندا هەر کە پیاو گەیشتە سەر (پری سیرانێ) ئەبێ پێلاوەکانی خۆی داکەنێ چونکە گەیشتۆتە ناو جێگای پیرۆز. لەوێوە بەناو دارستان و چروچنووردا ئەڕوات: تا ئەگاتە سەر گۆڕی (شێخ عدی). یەزیدییەکان هەموو ساڵێک ئەچنە سەردانی ئەم گۆڕە بەناوی (حج)ەوە. بەپێلاوەوە بەناو ئەم شوێنەدا ناڕۆن. توخنی ژنەکانی خۆیان ناکەون. مەی ناخۆنەوە هیچ دارێکیش نابڕنەوە. تەنیا بەشی چێشتخانەی (شێخ عدی) نەبێ. پەلەوەر و ئاسکە کێویش ناکوژن بەجۆرێکی تێکرایی هەرچی کەوتبێتە ناو (لالش)ەوە بەلایانەوە بەرز و پیرۆزە. ئاوی پیرۆزیش لەناو ژوورێکدا هەڵ ئەقوڵێ، کە لەوێ چووە دەرەوە بەپیرۆز دائەنرێ، هەموو شتێکی تیا ئەشۆرێ.

هەموو شەوێک مجێورەکان چرا لە بارەگای (شێخ عدی)دا و لە گۆڕستانەکانی ناو لالش و ڕێگاکانی ڕووەو گۆڕی (شێخ عدی)دا و لەسەر کەڵەبەردەکان و ساختمانەکان دا ئەگیرسێنن. شەوانی جەژنەکان و کەشەکان ئەم چراخانە زۆرتری لێ دێ... ئێرەیش بەلای یەزیدییەکانەوە (کعبە)یەکە بۆ خۆی، کە نەک هەر گۆڕی (شێخ عدی) بارەگای گەلێک لە شێخە گەورەکانی ئیسلام و یەزیدیشی تیایە، وەک (شێخ عبدالقادری گەیلانی) و (شێخ حسنی بصری) و (شێخ شمس الدینی تبریزی) و (منصور الحلاج) و (قضیب البان)، واتا ئەوانەی کە هاوچەرخ و هاڕێی (شێخ عدی) بوون.[1]

## جەژنەکان و کەشەکان

یەزیدییەکان جەژنیان زۆرە. (جەژنی مانگی ڕۆژوو) و (جەژنی مانگی کوشتی) و (ئاهەنگی لیلە القدر)یان هەیە، وەک موسڵمانەکان ڕێزیان لێ ئەگرن. هەروەها جەژنی (بیلندە)یان هەیە، کە هەر لە هی (مەگوس)ەکان ئەکات وەک مەسیحییەکان و موسڵمانەکانیش (جەژنی خضر الیاس)یان هەیە (ڕۆژی هەینی)یش بەڕۆژێکی پیرۆز ئەزانن فەرمانی تیا ناکەن ئەمانەیش هەندێک لە جەژنەکانیانن.

## جەژنی ڕۆژووان

ڕۆژووی یەزیدییەکان سێ ڕۆژە، نەک سی ڕۆژ، لە سەرەتای مانگی دوانزە هەمی ڕۆژهەڵاتیدا (کانوونی اول) سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبن، دوای ئەوە ئەیکەن بەجەژن. ئاهەنگێکی گەورەی بۆ ئەکەن و وەک جەژنە هەرە گرنگەکانی خۆیانی دائەنێن. لەم جەژنەدا سەر لەیەکتر ئەدەن. گەردەن ئازادیی ئەکەن. خۆشەویستیی خۆیان بۆ یەکتر تازە ئەکەنەوە. سەر لە گۆڕی مردووەکانی خۆیان ئەدەن. بۆیشیان ئەپاڕێنەوە لە خوا کە لە گوناهیان خۆش ببێ. دەستگیرۆیییەکی زۆریش لەگەڵ داماوان و هەژاراندا ئەکەن.

---

(١) ڕۆشنبیرانی یەزیدی هەر ڕێز لەو گۆڕانە ئەگرن؛ نایانپەرستن. (ش. ف)

## جەژنی بیلندە

ئەمە جەژنی لەدایکبوونی خونکار (یزید)ە. شێوەی جەژنەکە ئەچێتەوە سەر جەژنی مەگوسەکان. لە شێوەی کەلوپەلی جووت کردندا؛ نان دروست ئەکەن. ئەیبەشنەوە بەسەر هەژاراندا دەرخواردی گاجووتەکانی خۆیانیشی ئەدەن. ئاگری نێڵە نێڵ لەناو خانووەکان و یانەکانیان و چشتیرەکانیاندا ئەکەنەوە و، بەم لا و بەولایدا ئەسووڕێنەوە.

## جەژنی مردووان

ئەم جەژنە بەر ڕۆژی دەهەمی دوانزەهەمی ڕۆژهەلاتی ئەکەوێ. جۆرە کولیچەیەکی تیا دروست ئەکەن و ئەیبەشنەوە بەسەر هەژاراندا. جۆرە ئەستوورکێکی گەورەیش دروست ئەکەن و دەنکە مێوژێکی تێ ئەخەن لەپاش حەوت ڕۆژ ئەنێرن بەشوێن پیاوێکی بێگانەدا.

ئەستوورکەکە ئەخەنە سەر پشتی یەکێک لە کوڕەکانیان. ئەو کابرایە، ئەبێ ئەستوورکەکە هەڵگرێ و پارچە پارچەی بکات و بیبەشێتەوە بەسەر خاووخێزانی ماڵەکەدا. هەر کەسێ دەنکە مێوژەکەی بەرکەوت، بەختی یار ئەبێ و دوارۆژێکی پڕ کامەرانی تووش دێ.

## جەژنی خضر الیاس

بەر یەکەم پێنج شەممەی مانگی ڕەشەمێی ڕۆژهەلاتی ئەکەوێ. هەندێ جار سێ ڕۆژ، هەندێ جاریش ڕۆژێکی تیا بەڕۆژوو ئەبن.

## جەژنی چلە

کە چل ڕۆژ لە زستان ڕۆیشت ئەو جەژنە ئەکەن. بۆ چلەی هاوینیش جەژن هەیە. ئەم دوو جەژنە لە شێخ عدییەوە داهاتوون کە هەر جارە چل ڕۆژ بەڕۆژوو بووە.

## جەژنی سەر ساڵ

بەر یەکەم ڕۆژی چوارشەممەی مانگی گوڵان (نیسان)ی ڕۆژهەلاتی ئەکەوێ. واتا ١٤ی مانگی گوڵانی ڕۆژئاوایی. ئەم جەژنە وەک جەژنی سەری ساڵی کوردی وایە. جەژنی بەهارە، جەژنی نەورۆزە. لەم جەژنەدا کوڕان و کچان گوڵاڵەکە سووری ناودەشت ئەچننەوە و ئەیکەن بەدەسکە گوڵ و هەڵی ئەواسن بەسەر دەرگای خانووەکانیانەوە. مەبەسیان لەمە ئەوەیە کە لەگەڵ خوای خۆیاندا ڕێککەون، لەم جەژنەدا خواردەمەنییەکی زۆر بەسەر هەژاراندا ئەبەشنەوە. بەجلی ئاڵووالا و ڕەنگاوڕەنگەوە کوڕان و کچان ئەگەڕێن و سەیران ئەکەن و هەڵپەڕکێ ئەکەن و گۆرانی ئەڵێن. ئەم مانگی گوڵانە سەرتاپا بەجەژنانی تریشەوە ڕائەبوێرن. میوانداریی تیا ئەکەن و دیاریشی تیا پێشکەش بەیەکتری ئەکەن.

## جەژنی کوشتی

یەزیدییەکان بەم جەژنە ئەڵێن (جەژنی حاجیان). کە لە جەژنی (قوربان)ی موسڵمانەکان ئەکات. لە

ڕۆژانی حەوتەم و هەشتەمی مانگی (قوربان: ذي الحجة)دا یەزیدییەکان کۆمەڵ، کۆمەڵ دێنە سەر گۆڕی (شێخ عدی) لە ئێوارەی ڕۆژی نۆهەمدا سەر ئەکەونە سەر شاخی (عرفات) کە پێی ئەڵێن (شاخی حج). ئەم شاخە کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی گۆڕەکەوە سەرۆکی پێشەوا (پێش ئیمام) و هەموو پیاوە ئایینییەکان پێشیان ئەکەون هەموویان لە (شێخ عدی) ئەپاڕێنەوە کە (حج)ەکەیان پەسەند بکات و لە گوناه و هەڵەکانیشیان خۆش ببێ، لە کاتی ڕۆژئاوابووندا لە شاخەکە دێنەخوارەوە. سەرێک لەبەردە ڕەش (حجر الأسود) ئەدەن و ماچی ئەکەن. پاش ئەوە دێنە ناو هەوارگەی پیرۆزی (شێخ عدی)یەوە دەست و دەموچاویان بەئاوی (زمزم)ی پیرۆز ئەشۆن[1] لە دوای ئەم فەرمانانە، دەست ئەکەن بەبەزمورەزمی خۆیان تا بەیانی. لەبەرە بەیانەوە دەست ئەکەن بەجەژنە پیرۆزێ لەیەکتری و دەست گوشین و گەردن ئازادیی. دەستی پیاوە ئایینییەکانی خۆیان ماچ ئەکەن. هەندێ پارەیشیان پێشکەش ئەکەن. پاشان ئەچنەوە ماڵی خۆیان.

## جەژنی کۆمەڵ

ئەمە لە جەژنە گەورەکانیانە[2] بەر سەرەتای کەشی پایز ئەکەوێ لە (١٥) وە تا (٢٠)ی مشتاخان (ایول)ی ڕۆژهەڵاتی لە هەموو ناوچەکانی یەزیدییەکانەوە، دێن و لە گۆڕستانی (شێخ عدی)دا کۆ ئەبنەوە تا پێنج ڕۆژی خشت بەبەزمورەزمەوە ڕائەبوێرن. شەو و ڕۆژ بەگۆرانی گوتن و هەڵپەڕکێ و سەماوە خەریک ئەبن تا لە پەلوپۆ ئەکەون. هەر کۆمەڵە یاخود دانیشتوانی هەر گوندێک، هەموو ساڵێ لە جێی تایبەتیی خۆیاندا جێگیر ئەبن. کەس جێگا گۆڕکێ ناکات، هەر کۆمەڵێک گەیشتە نزیک گۆڕەکەوە؛ تفەنگ ئاگر ئەدات. ئەوانی پێشوو ئەچن بەپیریانەوە. (بەری شەباکێ) کە بڕوایان وایە (شێخ عدی) لەسەر ئەو تەختە دانیشتووە، لە شێوەیەکی شۆخ و شەنگدا ئەهێننە دەرەوە و بەپیریەوە ئەچن و ئەیخەنە شوێنی دیاریی کراوی خۆی.

(بابە شێخ) کە گەورەی شێخەکانیانە، لەناو ماڵێکی تەنیشت گۆڕەکەدا دائەنیشێ، یەزیدییەکان دێن و دەستی ماچ ئەکەن و دیاریی خۆیانی پێشکەش ئەکەن.

سەرلێدان لە (بابە شێخ) بەهۆی چەند کەسێکی دیاریی کراوەوە پێک دێ، کە لە یەزیدییەکان پارە وەرئەگرن، هەر کەسێ لە دڵی خۆیدا نیازێکی دانابێ، پارچە سپیاڵێک ئەدات بەو پیاوەی کە مام ناوەندیی ئەکات؛ ئەویش لەناوی (زەمزەم)ی[3] پیرۆزی هەڵ ئەکێشێ و ئەیبەستێ بەسەریەوە.

ئەم (لالش)ە جێگایەکی پیرۆزە. نابێ کەس بەپێڵاوەوە بەناویا بگەڕێ. هەروەها لەوێدا کەس لەگەڵ ژنی خۆیدا نانوێ، مەی ناخۆنەوە. بەڵام ئازادیی بۆ هەموو کەس ڕاگیراوە. لایان باوە: ئەگەر یەکێک

---

(١) ناوی ڕاستەقینەی ئەو کانییەی ئەم ئاوەی لێ هەڵ ئەقوڵێ (کانیا سپی)یە. (ش. ف)

(٢) ئەم جەژنە ئەچێتە سەر جەژنی (میهرەگان) کە زەردەشتییەکان بەبۆنەی کەشی پاییزەوە ئەیکەن. ڕۆژ پەرستەکانیش ئەم جەژنەیان هەبووە. (ش. ف)

(٣) کانیا سپی، لەوێ هەڵ ئەقوڵێ. یەزیدییەکان لە جێگای ناوی (زمزم) دایاننناوە. (ش. ف)

کچێکی فڕاند سزا نادرێ چونکە فڕاندنەکە لە ئەنجامی ڕێککەتنەوەیە، بۆ مەبەسی ژن ومێردییە، نەک بۆ داوێن پیسی. ئێرەیش لەو کاتەدا جێگای ئاشنایەتی و یەک ناسینە کە لە جێگایانی تردا سەر ناگرێ.

جاران نانی ئەو هەموو کەسانە لەسەر چێشتخانەی (شێخ عدی) بوو. بەڵام ئێستاکە هەر کەسێ بیەوێ نان بۆ خۆی لەوێ دروست ئەکات. لە چوارەم ڕۆژی ئەم جەژنەدا مەڕێک ئەکڕن و سەری ئەبڕن و ئەیکەن بەچێشت. چەند کەسێک لە دانیشتوانی (عین سفنی) کوتە گۆشتەکان لە مەنجەڵەکە دەرئەهێنێ و ئەیخەنە بەردەمی سەردار (ئەمیری شێخان). ئەویش هەندێکی لێ ئەخوات و ئەوانی تریش میوانەکان ئەیخۆن.

یەزیدییە (قائد)یەکان سەر ئەکەونە سەر پۆپەی شاخەکە. چالاکانە وەک تیزکەی تفەنگ سەرئەکەون. هەروەها بەو ڕەنگەیش ئەگەڕێنەوە خوارەوە تفەنگەکانیشیان ئاگر ئەدەن، ئەوسا مجێوری گۆڕەکە گایەکیان ئەخاتە بەردەم. ئەوانیش توند گایەکە ئەگرن و جارێکی تریش بەوەوە، سەر ئەکەونەوە بەسەر شاخەکەدا، لە ڕێگادا بەزەبری تێلا ئەیبەن بەڕێوە. پاشان دای ئەگێڕنە خوارەوە و پێشکەشی سەردار (ئەمیر)ی ئەکەن. سەرداریش پاڵتۆ یاخود جامانەیان بالاپۆش (عبا)یێکیان پێ ئەبەخشێ. میوانەکان لە هەموو لایەکەوە هێرشیان ئەبەنە سەر. مەبەسیان ئەوەیە دیارییەکەی سەردارەیان لە دەست بسێنن. ئەوانیش بەتێلاکانیان خۆیان لە دەستیان ئەپارێزن و بەهەڵەداوان ئەڕۆن تا ئەگەنە بەردەرگای گۆڕی (شێخ عدی). ئیتر لەوە بەولاوە میوانەکان وازیان لێ ئەهێنن.

ئەگونجێ مجێورەکە گایەکەیان لێ وەرگرێ و بۆیان بکات بەشێو تا میوانەکان لێی بخۆن.

یەزیدییەکان ڕەوشتیان وایە، هەر کەسێ لەو جەژنەدا و لەو شوێنەدا، لەلایەن یەکێک لەو هۆزی (قائیدی)یانەوە بریندار بکرێ، یاخود بکوژرێ، خوێنی داوا ناکەن. (کۆچەک)ەکانیش هەموو ڕۆژێک ئەچنە سەر ئەو شاخە و بەگوریسە ڕەنگاوڕەنگەکانی خۆیان کۆڵەدار لەسەر پشتی خۆیان ئەهێنن بۆ سووتەمەنیی چێشتخانەی (شێخ عدی). هەموو ئێوارانێکیش دەس و پێوەندەکان چرا هەڵ ئەگیرسێنن و بلاویان ئەکەنەوە بەناو (لالش)ی پیرۆزدا، بەسەر گومەزەکانەوە و بەسەر کەلاوەکانەوە و لەسەر چەقی ڕێگاکان دایان ئەنێن، ئەو ناوە ئەکەن بەچرا خان.

کە ڕۆژی شەشەم هات و میوانەکان ئەگەڕێنەوە بۆ گوندەکانی خۆیان. (تازی)یەکانیش کە بریتین لە دانیشتوانی گوندەکانی (باشیک) و (بازان) دەست ئەکەن بەپاککردنەوەی گۆڕستانەکە لە پووش و پەلاش و گڵیشی ئەو چەند ڕۆژە کە لە میوانەکانەوە داکەوتوون. جا ئەمانە، هەموو، ئایینین، نابێ هیچ کامێکیان بەجێ نەهێنرێ.[1]

---

(١) لەم جەژنی کۆمەڵیدا؛ گەلێک ڕەوشتی ئایینی ئەنوێنرێ، کە لە بنچینەدا ئەچێتەوە سەر (ئایینی سروشت پەرستی)ی پێشوویان. (ش. ف)

### سەمای ئایینی

هەر لەم جەژنەدا هەندێ کاروباری ئایینیی تر هەن، بەڵام بەنهێنییەکی زۆرەوە ئەکرێن. نابێ هیچ بێگانەیەک ئاگای لێ بێ. خۆیان بەمە ئەڵێن (سەماین). بەڵام ئەم سەمایە، جۆرە کارێکی ئایینییە، بەو مەبەسە ڕائەپەڕێنرێ کە لە ئاسمانەوە خوا نیازی خۆی بخاتە دڵیانەوە و ڕێگای ڕاستیان پیشان بدات و یارمەتیشیان بدات لە چارەکردنی گیروگرفتەکانیاندا و ڕزگاربوون لە تەنگانەکانیان.

یەزیدییەکان لەو کۆڕەدا کۆئەبنەوە کە بەرامبەر گۆڕستانی (شێخ عدی)یە. مۆمدانێک دائەنێن، کە پێی ئەڵێن (چقڵتوو) ئامانێکیان لەسەر داناوە، پڕیەتی لە ڕۆنی زەیتوون.

لەم لا و لەولای مۆمدانەکەوە حەوت شاپڵیتە دائەنێن. کە لە ناوەڕاستیاندا لە شێوەی گوڵێکی گەورەدا شاپڵیتەیەک دانراوە.[1] یەزیدییەکان ئەم شاپڵیتانە دائەگیرسێنن. لە شێوەی کەمەرەیەکدا لە هەر چوار لای ئەو شاپڵیتانەوە ئەوەستن. یەکەم کەسیان ئەو پیاوەیە کە کاروباری گۆڕی (شێخ عدی)ی پێ سپێرراوە. ئەم پیاوە بەتەنیا ئەوەستێ. جلوبەرگە ئایینییەکانی ئەو ڕۆژەی خۆی لەبەر ئەکات. شاە کلاوەکەی (شێخ عدی) ئەکاتە سەری و پاڵتۆکەی (شێخ ئەبوبەکر)یش ئەکاتە بەری. دوای ئەو پێشەوای باڵا (پێش ئیمام) دێ. ئینجا (میر حەج) واتا سەرکردەی حەج کە (سەرداری شێخان) دایناوە بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری کارگێڕیی و ئاسایش لە گۆڕستانەکەدا؛ لە ڕۆژانی کۆبوونەوەی یەزیدییەکاندا. پێویستە ئەم (میر حەج)ە لە خێزانی سەردارەکان بێ یەکەمیان لە تەنیشتی ڕاستەوە، دووەمیشیان لە تەنیشتی چەپەوە ڕائەوەستێ. لە دوای ئەو دووانەیشەوە (بابە شێخ) ڕائەوەستێ، لەگەڵ پێشەوا (ئیمام)کەیدا؛ کە ئەبێ لە خێزانی «شێخ شرف الدین»بێ. لە دوای ئەمانیشەوە (کۆچەک)ەکان جووت، جووت ئەوەستن، دوای ئەوانیش (بابە کۆچەک) بەتەنیا ئەوەستێ. ئەمانە هەموویان ئەگەنە بیست کەس، بەهێواشییەکەوە، لەسەر خۆ؛ لە شێوەیەکی ملکەچانە و خواناسانەدا، بەهەرچوار لای مۆمدانەکەدا ئەسووڕێنەوە. بەهەمووی سێ جار ئەسووڕێنەوە بەڵام ماوەی سووڕانەوەکە چوار کاتی تەواو ئەکێشێ، گفتوگۆکارەکانیش کە لەبەردەم دەرگانەی شێخ عدیدا دائەنیشن. دەست ئەکەن بەگۆرانی گوتن و دەف لێ دانێکی نەرم و شمشاڵ لێ دانێکی شیرین و ناسک و کاریگەر، ئەم جۆرە خواپەرستنە، وا پەسەندە، کە هەتا دوای نیوەی شەو بخایێنێ، چونکە هەر ئەو دەمەیە کە خوا نزای مرۆڤ گیرا بکات و نیازی پیرۆزی خۆیشی بخاتە دڵی ئەوانەوە کە ڕووی تێ ئەکەن و لێی ئەپاڕێنەوە.

لە بەرەبەیانی هەموو ڕۆژێکی ئەم جەژنەدا، پێشوازی باڵا (پێش ئیمام) و سەرداری حەج (میر حەج) لە نزیک دەرگای سەردار (دەری میر)ەوە دائەنیشن، یەکەمیان لەلای ڕاستەوە دائەنیشێ، دووەمیشیان لەلای چەپەوە. لە چێشتخانەی (شێخ عدی)یەوە چێشتیان بۆ دێ. چێشتەکەیش بریتییە لە شلە (شۆربا)یەک کە لەناو دوو کاسەی داردا کە بۆ پێشەوای باڵا (پێش ئیمام)ی دائەنێن کولێرەیەکی

---

(١) پیاو وای دێتە پێش چاو کە شاپڵیتە گەورەکەی ناوەڕاستیان نوێنەری ڕۆژبێ، حەوت شاپڵیتەکەی تریش نوێنەرانی حەوت ئەستێرەکەبێ. (ش. ف)

لەگەڵدایە. ئەویش پارچەیەک لە کولێرەکە ئەکاتەوە و ئەیداتە دەست سەرداری حەج. ئەمیش یەک دوو پارووی لێ ئەخوات، پاشان کۆچەکەکان دێن، هەردوو کاسەکە هەڵ ئەگرن ئیتر کۆچەکەکان و گفتوگۆکارەکان هەموویان هورووژم ئەبەنە سە ئەو دوو کاسەیە، هیچیان تیا ناهێڵنەوە، هەموو چێشتەکە ئەخۆن، جا هەر کەسێ هەندێکی لەو چێشتە بەرکەوتبێ خۆی بەکامەران ئەزانێ.

## جەژنی ليلة القدر

ئەم جەژنە بەر شەوی پانزەهەمی مانگی (شعبان) ئەکەوێ، پێی ئەڵێن (ليلة القدر)، لەو شەوەدا یەزیدییەکان لە گۆڕستانی (شێخ عدی)دا کۆئەبنەوە. (سەرداری شێخان) و کۆمەڵێک لە پیاوانی ئایینی لە پێشەوەیە، نوێژەکەی خۆیان ئەکەن. سەرداری پێشەواکان (پێش ئیمام) ئەبێتە پێشەوا یان ڕوو ئەکاتە ڕووگە (قیبلە) شەش تاک (رکعات) نوێژیان لەگەڵدا ئەکات. نوێژەکەیان نوشتانەوە (رکوع)ی تیا نییە. تەنیا یەک جاریش سەریان لە زەوی ئەدەن. لە هەموو تاکە نوێژ (رکعە)تێکا سەد جار (سورة الاخلاص) ئەخوێننەوە. پاش ئەمەی نوێژکەرەکان وچانێک ئەدەن و چێشت و میوەیان ئەدرێتێ و ئەیخۆن، دەست ئەکەنەوە بەنوێژ. بەچەشنی پێشوو شەش تاک نوێژ (رکعات)ی تر ئەکەن. بەم ڕەنگە نوێژەکەیان ئەکەن. یەزیدییەکان باوەڕیان وایە کە ئەم نوێژە جێگای نوێژی ساڵێکی تەواویان بۆ ئەگرێتەوە. لە بەیانیی دووەم ڕۆژدا ئەگەڕێنەوە ماڵی خۆیان.

یەزیدییەکان ئەم شەوە بەشەوێکی پیرۆز دائەنێن و ڕێزیشی زۆر لێ ئەگرن. لەو شەوەدا بەگەورە و بچووک و ژن و پیاویانەوە لەم لا و لەولا کۆئەبنەوە، بەگفتوگۆی خۆش و ئاهەنگەوە ڕائەبوێرن، گفتوگۆکارەکان گۆرانییە ئایینییەکانیان بۆ ئەخوێننەوە، لە بابەت دروست کردنی جیهان و ئافەریدە کراوانەوە، هەروەها لە بابەت کارەساتە سەرسوڕهێرەکانی شێخەکانی خۆیانەوە قسەیان بۆ ئەگێڕنەوە. تا بەرەبەیان بەو جۆرە ڕائەبوێرن خاوەن ماڵەکەیش کە لەماڵیا کۆئەبنەوە نان و چێشتیان پێشکەش ئەکات، ئەیخۆن. پاشان بڵاوەی لێ ئەکەن.

ئەمە ڕەوشتی یەزیدییەکانە لە (شێخان)دا، بەڵام لە (سنجار)دا نوێژکردنی تیا نییە، (پێشەوای باڵا) لە ماڵی خۆیدا، هەندێ کەس لە دەروێشەکان و خاوەن ئایینەکان، کۆ ئەکاتەوە، پەیکەری (تاووسی فریشتان) لەبەردەمیاندا دائەنێن. گۆرانی ئەڵێن. شمشاڵ لێ ئەدەن، کە بەیانی گزنگی دا دەست و دەموچاویان ئەشۆن. (پێشەوای باڵا) نان و چێشتیان ئەداتێ، پاش نان خواردن هەریەکە هەندێ پارە یاخود دیاریی ئەدات بەپێشەوای باڵا، ئیتر هەر کەسە ئەگەڕێتەوە ماڵی خۆی، ئەو ڕۆژە هەموویان بەڕۆژوو ئەبن. جا هەروەک لێرەدا دەرئەکەوێ دامەزرێنەری ئایینی یەزیدی ویستوویەتی باری ئایینی یەزیدییەکان سووک بکات، هەروەها بەجۆرێکی وایش ئەو کاروبارە ئایینییانە دابمەزرێنێ، کە کەڵکی بۆ یەزیدییەکان تیابێ و، دڵیان پێی خۆش ببێ.[1]

---

(1) لێرەدا شوێنەواری (ئایینی ئیسلامی) بەتەواوەتی دیارە؛ بەڵام هەروەها شوێنەواری (بت پەرستی) و (سروشت پەرستی)یش تیا دیارە. (ش. ف)

## ئاهەنگ لەسەر گۆڕەکان

یەزیدییەکان بۆ هەریەکێک لە شێخە گەورەکان یاخود پیاوچاکەکانیان، لە شێوەیەکی گرنگدا گۆڕستانێکیان دروست کردووە، بەناوبانگەکانیان حەوتن کە لەم شوێنانەدان: (باشیک)، (بازان)، (جەروانە)، (دوغات)، (باعەذرە)، (خەتارە)، هەموو ساڵێک لە ڕۆژێکی دیاریی کراودا لەو گۆڕستانانەدا کۆئەبنەوە؛ بەهەر چوارلایاندا ئەسووڕێنەوە سەریان لێ ئەدەن، هەروەک بچن بۆ (حەج)ێک وەهایە، بۆ وێنە ئاهەنگی گۆڕستانی (شێخ مەحەممەدی حەنیفە) کە لە (باشیک) دایە لە یەکەم ڕۆژی هەینیی پاش سەری ساڵی یەزیدیدا دەست پێ ئەکات، کە بەر ڕۆژی هەینیی پاش یەکەم چوارشەممەی مانگی گوڵان (نیسان)ی ڕۆژهەلاتی ئەکەوێ یەزیدییەکان هەستی ڕێزگرتنی خۆیان بەرامبەر ئەم پیاوە چاکەیان دەرئەبڕن لەو شەوە گفتوگۆکارەکان شمشاڵ لێ ئەدەن. لە دەف ئەدەن. یەزیدییەکانیش بەژن و پیاو و گەورە و بچووکەوە ئەسووڕێنەوە بەهەر چوارلای گۆڕستانەکەی (شێخ محەممەدی حەنیفە)دا. تا بەرەبەیان کە ڕۆژ گزنگ ئەدات. (باشیک) لەو ڕۆژەدا پڕ ئەبێ لە ژنان و کچان کە هەموویان بەرگی سپیی بێ گەردیان لەبەر کردووە و بەملوانکەی مووروو و زنجیری زیو خۆیان ڕازاندۆتەوە. لەوێدا (سەرداری شێخان) و هاودەمەکانی و ڕیش سپی و پیاوە گەورەکانی یەزیدییەکان بەناویاندا دێن و دەچن. پرشنگی کامەرانی لە دەموچاوی هەموو لایەکیاندا دیارە. لێرەدا گرەوی (گۆڤەند) یاخود گۆبەند دەست پێ ئەکات. ئەوانەی یەزیدیش نەبن ئەتوانن لەم بەزمەدا هاوبەشبن. بەڵام لە یەزیدییەکانی گوندی (باشیک) بەولاوە نابێ کەس گرەوەکە بباتەوە. جا هەر کەسێ گرەوەکەی بردەوە، کە بریتییە لە بەخشینی پارەیەکی هەرە زۆر لەوێدا؛ مافی هەیە دەستی بۆ هەر کچێک کێشا، لەگەڵ ئەو کچەدا هەڵپەڕەکێ بکات. کچەکە ناتوانێ بێ دڵیی بکات. بەمجێوری کوڕەکە، ئەو پارەیە ئەدرێ. لە گرنگترین کاری ئەم ئاهەنگە ئەوەیە کە ڕەشبەڵەک بکرێ. یەزیدییەکان حەز لە هەڵپەڕکێ زۆر ئەکەن. بەتایبەتی کچەکانیان، کە ئەتوانن بەم بۆنەیەوە هەستی دڵداریی خۆیان بەرامبەر خۆشەویستەکانیان دەرببڕن. گفتوگۆکارەکان کاری ئەم ڕەشبەڵەکە ئەبەن بەڕێوە. دەهۆڵ و زوڕنایان بۆ لێ ئەدەن. یەزیدییەکانیش وەک برا کوردەکانیان بەجگار دڵیان بەم هەڵپەرکێیانە ئەکرێتەوە، زۆریش تیایاندا شارەزان. ئەمەندە هەڵ ئەپەڕن لە پەلوپۆ ئەکەون. یەزیدییەکان لەم ئاهەنگەدا نان و چێشتێکی زۆر و ناوازە پێشکەش بەمیوانەکان ئەکەن، کە جاری وا هەیە لە ئەندازەی دەست بڵاویی تێ ئەپەڕێ.

لە (سنجار)یشدا ئاهەنگی کوڕی (شێخ شرف الدین) لە هەموویان گرنگترە. هۆزەکانی (جوانا) و (خورکان) و زۆریش لە موسڵمانەکان تیا بەشدار ئەبن. ئەوانیش بەچەشنی (شێخان)ییەکان کاروباری ئاهەنگەکە ئەبەن بەڕێوە. سەیر ئەوەیە، لەم هەموو ئاهەنگە چڕوپڕانەدا، تا ئێستا ئاژاوە و پشێوی یەک ڕووی نەداوە. هیچ کارەساتێکی ناخۆش و تەنگ نەقەوماوە. بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆر جاری وا هەیە یەزیدییەکان ئەم ئاهەنگە ئەکەن بەهۆیەک بۆ ئاشبوونەوەی دوژمنان و بەستنەوەی دۆستایەتی و برایەتی، ئەویش بەناوی ڕێزگرتنیانەوە لە خاوەن گۆڕەکان. منیش لە دوژمنەکانی یەزیدییەکان ئەپرسم ئەڵێم: ئەگەر نەتەوەیەک دێو پەرستبێ کاری وا چاک ئەکات؟!.

## چینە ئایینییەکان

### سەرداری شێخان

سەرداری شێخان (میر شێخان)، لە خێزانێکە زۆر خانەدانە؛ کە ئەگاتەوە سەر (شێخ عدیی ئەمەوی)[1].

دەسەلاتێکی بێ ئەندازەی هەیە بەرامبەر یەزیدییەکان. سەرکردەی ئایینی و جیهانییانە. بەهەڵبژاردەی خێزانەکەی خۆی دێتە سەر تەخت. نە نەتەوە، نە پیاوە ئایینییەکان دەستیان لەم هەڵبژاردنەدا نییە. لە جێگای (شێخ عدی) دائەنیشێ. لەبەر ئەوە هەموو یەزیدییەک ملکەچە لە بەردەمیا. سەردارەکە گۆڕستانی (شێخ عدی) ئەپارێزێ و کاروبارەکانی هەڵ ئەسووڕێنێ. هەر ئەوەیشە کە تاووسەکان ئەپارێزێ و ئەنێرێ بۆ ناوچە یەزیدییەکان. زەوییەکانی سەردار نوشینییەکە ئەو بەرهەمیان ئەهێنێ. هەرچی پارەیەکیش لە یەزیدییەکان کۆ ئەکرێتەوە ئەدرێتە دەست ئەو کەس هاوبەشیی ناکات، کە چەندوچوونیشی لەگەڵدا ناکات. لە بەرامبەر ئەم هەموو نیاز و جیازەدا؛ پێویستە لەسەر سەردار بۆ خزم و کەسوکارەکانی بەرەی خۆی دەستی یارمەتی درێژ بکات و بیان بووژێنێتەوە و بکەوێتە فریایان لە ڕۆژی تەنگانەدا.

هەروەها هەر کارەساتێکیش ڕووبدات لەناو یەزیدییەکاندا ئەو ئەی بڕێنێتەوە. ئەتوانێ بەدخووەکان، یاخود ئەوانەی یاسای ئایینەکە ئەشکێنن. کە نەفتیان بکات، یاخود جەریمەیان بکات. کە سەرداری شێخان مرد، هەر سەردارێک هاتە جێگای، سامانەکەی سەرداری مردوو بەرەو ڕووی ئەو ئەکرێتەوە. بەلام جلوبەرگەکانی سەردار ئەدرێن بە(بابە شێخ). تا چەرخێکیش لەمە پێش هێز و دەسەلاتی ئەمانە گەیشتبووە ئەندازەیەکی وەها کە مەگەر لە خونکارەکان وەشابێتەوە، سەر هۆزەکان لێیان ئەترسان، دڵیان ڕائەگرتن. ئەگەر ئەم سەردارانە لە دوژمنایەتییاندا بەرامبەر موسلمانەکان، ئەمەندە لە ئەندازە نەیانترازاندایە، نە تووشی تەنگانە ئەبوون، نە هێز و نە دەسەلاتیشیان لە دەست ئەچوو... سەردارێکی شێخان سەد و چەند ساڵێک لەمەوپێش؛ سەرەک هۆزێکی کوردی موسلمانی بەناڕەوا کوشت.

موسلمانەکانیش تۆڵەیان لێ سەندنەوە. ئەمە بووە سەرەتای سەرگەردانیی سەرداری شێخان. ئێستاکە ئەمەندە دەسەلاتیان نەماوە. هەتا یەزیدییەکانیش بەرەو پێشکەوتن بچن، ئەو سەردارانە، تووشی بەرەنگاریی و گیروگرفت زۆرتر دێن. بەلام ئەگەر بەپێی چەرخ هەڵبسووڕێن و لەگەڵ نەتەوەی هێز و دەسەلاتەکەی خۆیان بپارێزن.

ئێمە کە تەماشای مێژووی ژیانی ئەم سەردارانی شێخانە ئەکەین. کەسی وایان تیا نابینین کە بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتنی نەتەوەی یەزیدی تێکۆشابێ واتا بەرەنگاریی نەخوێندەواریی و هەژاریی و

---

(١) نووسەرانی عەرەب وا ئەڵێن. کەچی بەپێی نووسراوی (مصحفارەش) سەردارەکانی شێخان لە نەوەی شاپووری یەکەم و شاپووری دووەمی کوردی ساسانین. (ش. ف)

دەردەداریی کردبێ لەناو نەتەوەکەی خۆیدا. هەر تەنیا بایەخیان بەژیانی تایبەتیی خۆیان داوە. خۆیشیان زۆر جار بەکوشتن لەناوچوون. تێکڕا زۆربەی ژیانی خۆیشیان و نەتەوەی یەزیدیش پڕ بووە لە شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە، چ لەناو خۆیاندا. چ لەگەڵ بێگانانندا. لەگەڵ ئەمەیشدا پیاوی بەچنگ و گەورە گەورەیان تیا هەڵ کەوتووە. بەڵام لە کۆڕی جەنگا. نەک لە کۆڕی شارستانێتی و پێشکەوتندا. یەکێک لەوانە (سەرداری عەلی بەگ)ە. کە هەرچەندی (فەریق عومەر وەهبی پاشا)ی تورکی عوسمانی زۆری بۆ هێنا، نەیتوانی (عەلی بەگ) بکات بەئیسلام. گوتی بمکوژن لە ئایینی خۆم لانادەم. تا سێ ساڵ دوور خرایەوە بۆ شاری (سیواس). دوایی بەسەر بەرزییەوە هاتەوە خاکی خۆی. دەستی کرد بەچاککردنەوە و ڕاست کردنەوەی ئەو کاروبارانەی کە (فەریق عومەر وەهبی پاشا) تێکی دابوون. لە ماوەیەکی کەمدا گۆڕەکانی سەرلەنوێ دروست کردەوە گۆڕی (شێخ عدی)یشی لە فەرمانڕەوایی سەندەوە و خستنیەوە ژێر چنگی یەزیدییەکان. بەڵام داخەکەم دوایی کوژرا. هەر وەها (میان خاتوون)یش یەکێکە لە ئافرەتە گەورەکانی خێزانی سەرداریی تا ئەم دوایییەش مابوو. ئافرەتێکی زرنگ و وریا و بەچنگ بوو سامێکی هەبوو لە دڵی یەزیدییەکاندا. یەزیدییەکان ڕێزیان زۆر لێ ئەگرت هەر لە سەردەمی (عەلی بەگ)ی مێردییەوە نیشانەی بلیمەتیی دەرکەوت و کاروباری سەردارییەکەی لەگەڵ مێردەکەیدا ئەبرد بەڕێوە لەکاتی دەربەدەریی مێردەکەیدا لە (سیواس)دا میان خاتوون، دڵی مێردەکەی خۆی ئەدایەوە یارمەتیشی ئەدا.

تا سێ ساڵیش لەوێدا لەگەڵیا مایەوە. نیشانەی بیر دروستی و کارامەیی و دوور ئەندێشیی تیا دیاربوو. گەورەیی لێ ئەوەشایەوە سەری لە هەموو کاروباری دەرئەچوو. بێ نامان بوو. هەرچی لەبەردەمیا بووەستایە بەرەنگاریی بکردایە لەناوی ئەبرد. تا ماوەیەکی درێژیش سەرداریتیی شێخان بەدەست خۆیەوەبوو. چونکە سەردەمێک (سەعید بەگ)ی کوڕی سەردەمێکیش (تەحسین بەگ)ی کوڕەزای کە هەردووکیان سەرداری شێخان بوون و بەتەمەن بچووک بوون و هێشتا پێ نەگەیشتبوون، هەتا گەورە بوون و پێ گەیشتن کاروباری سەردارییەکە بەدەست (میان خاتوون)ەوە هەڵ ئەسووڕا. تاما؛ هۆش و زرنگییەکەی لە دەستاما. بەڵام لەم دوایییەدا جوانییەکەی و تەندروستییەکەی شێوابوون و لە نەماندا بوون. ئەم سەردارەی ئێستایشیان کە ناوی (تەحسین بەگ)ە، تا بڵێی سەردارێکی ئێسک سووک و ڕووخۆش و زیرەک و ڕەوشت جوانە. بێجگە لەوە نەرم و نیانیشە. لەوانەیە کە هیوای لێ بکرێ، لەگەڵ کارەساتی ڕۆژگاردا بسازێ و لەسەر بنچینەیەکی نوێیش ماوە بدات بەهۆزەکەی خۆی بۆ پێشکەوتن و ژیانێکی باشتر. سەرداری شێخان، هەر لە جێگای خۆیدا ئەمێنێنەوە، نە هەڵ ئەگیرێ، نە لائەبرێ. دانانیشی بەهەڵبژاردنی نەتەوە نییە. سا لەبەر ئەمەیە، کە گۆڕانی سەرداری ناشیی و خراپ، هیچ چارێک نەماوەتەوە کوشتنی نەبێ کە ئەمەیش بەگران ئەکەوێتە سەر یەزیدییەکان!.

(پس سەردارەکان) یاخود (پسمیرەکان) لە هێز و دەسەڵاتدا لە دوای سەردارەکانەوە دێن. ئەوان و سەردارەکان لە بەرەبابێکن، کە ئەچنەوە سەر (شێخ ئەبوبەکر). جاران وەکو ڕاوێژکار و کاربەدەست وا بوون بۆ سەردارەکان. سەردارەکان ئەیانخستنە کار بۆ پاراستنی کەلک و کاری خۆیان بۆ هەر گوندێک یەکێکیان لەو پس سەردارانە دائەمەزراند بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری گوندەکە و پاراستنی ئاسایشی. ڕەوشتیان وابوو؛ هەموو ڕۆژێکی هەینی لە گوندی پایتەخت (باعذرە)دا کۆ ئەبنەوە لەگەڵ سەردارا بۆ

راوێژکردن لە بابەت ئەو کاروبارە گرنگانەوە کە پەیوەندییان بەنەتەوەی یەزیدییەوە هەبوو. بڕیاری خۆیان لەسەر نەدا. ناشێ کەس لەم پس سەردارانە ببێتە سەردار. کەچی سەردارەکان ژن و ژنخوازییان لەگەڵدا ئەکەن. پس سەردارەکان لەچاو پیاوەکانی تردا دەست کورتن. لەم ساڵانەی دواییدا بەتەواوی کزبووبوون. پەرت و بڵاوبوونەوە. هەندێکیان گەیشتنە کوردستانی ڕووسیا. لەم دواییەدا (یوسف بەگ)ێکیان تیا پەیدابوو، لە زانستگۆ (جامعە)ی (ئەجمازین) خوێندنی تەواو کرد بێجگە لە زمانی کوردی، زمانی (ئەرمەنی) و (چەرکەسی) و (ڕووسی)یشی ئەزانی. لە (کۆماری ئەرمەنستان)دا بوو بەنوێنەری کوردەکانی ئەوێ لە کۆڕی نەتەوە (پارلەمان)دا.

## پێشەوای باڵا

ئەم پێشەوای باڵایە؛ ئەبێ لەبەرەی (شێخ حەسەن کوڕی شێخ عدی دووەم)بێ، لە پێشا سەرداریی (ئەمارات) و خوێندەواریی، هەردووکیان بوو ئەم بەرەیە تەرخان کرابوون. کە لەبەرەی (شێخ حەسەن) بەولاوە هیچ یەزیدییەک مافی ئەوەی نەبوو ببێتە سەرداری شێخان؛ یاخود دەست بداتە خوێندەواریی. بەڵام لەبەرەی (شێخ ئەبوبەکر)، یەکێک پەیدابوو، ناوی (شێخ محەمەدی کوردیی ئەربیلی) بوو. چو بەگژ بەرەی (شێخ حەسەن)دا و گەلێکی لێ کوشتن و گەلێکیشی لێ تەفروتونا کردن. بۆ خۆیان تەختی سەردارییان داگیر کرد. تەنانەت گفتوگۆکارەکانیشیان ناچار کردن کە ناوی (شێخ حەسەن) نەهێنن، یەزیدییەکانیتریشیان وا لێ کرد کە بەناوی (شێخ حسن البصری)یەوە ناوی بهێنن، تا ناوی ڕاستەقینەی (شێخ حەسەن)یان لەبیر بچێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەمەیشدا بەرەی (شێخ حەسەن) هەتا ئێستاکەیش ئەو فەرمانەی دامەزرێنەری ئایینی یەزیدی بۆی تەرخان کردوون لە بابەت کاروباری ئایینییەوە، نەک سەرداریی، هەر بەدەستیانەوە ماوە؛ وەک: خوێندنەوە و فێربوونی خوێندەواریی، پاراستنی نووسراوە ئایینییەکان، مارەکردن، پێشەوایی لە نوێژی (لیلة القدر)دا لە گۆڕستانی (شێخ عدی)دا!...

## بابە شێخ

بابە شێخ نموونەیەک بۆ شێخەکان، سەرۆکێکە بۆ پێشەوا (إمام)ەکان. بڕیاری ئەو بەهی دادپەروەرانە ئەژمێررێ. بەربەرچ نادرێتەوە. گوێ لە قسەی ئەگرن. فەرمانی بەجێ ئەهێنن. تیرەکەیش. هەموو چاوی لێ ئەکەن. ئەبێ لەبەرەی (شێخ فخر الدین)بێ، کە برا بچووکی (شێخ حەسەن) بووە. ئەم بەرەیە بەخواناس بەناوبانگن، هەرگیز دەستووری ئایینی یەزیدی ناشکێنن. ئەم جێگایە هەر لەلایەن تاک و تەرای ئەم بەرەیەوە پڕ ئەکرێتەوە. بەڵام (سەرداری شێخان) پەسەندی نەکات سەرناگرێ. (سەرداری شێخان) ڕاوێژ بە(بابەشێخ) ئەکات. لە کاروباری ئایینیدا، بەقسەی ئەجووڵێتەوە (بابەشێخ) بەپێچەوانەی یەزیدییەکان مەی خۆریی لە خۆی بەربەست ئەکات. نایخواتەوە، لە چلەکانی هاوین و زستاندا ڕۆژوو ئەگرێ. خۆی دوور ڕائەگرێ لە تێکەڵی و گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسانی تردا. بەڵام بۆی هەیە لای یەکێک لە دەوڵەمەندەکان ڕۆژووەکەی بشکێنێ، هەر بەو باوەوە کە نانەکە بەناوی (شێخ عدی)یەوە کراوە.

بەرماڵی (شێخ عدی) هەر بەو سپێرراوە بیپارێزێ. ئەویش تەنیا لە چەند ڕۆژێکی دیاریی کراودا نەبێ دەری ناخات.

بووینە لە (جەژنی کۆمەڵی)دا دەری ئەخات، کە لە گۆڕستانی شێخ عدیدا ئاهەنگی بۆ ئەکرێ. یەزیدییەکان خۆیان ئەکوتن بۆ بینینی ئەو بەرماڵە و باربووکردنی (بابەشێخ).

ئەگەر (کوچەک)ێکیش توانی بۆ (بابەشێخ) ئەوە دەربخات کە دەستی هەیە لە فڕین بەئاسماندا و لە ڕۆیشتن بەسەر ئاودا یاخود لە شاکارانی تردا، ناچار ئەبێ ئەو بەرماڵەی بداتە دەست و لایشی بمێنێتەوە تا نۆرەی خۆی تەواو ئەکات. فەرمانێکی تریشی ئەوەیە کە سەرپەرشتیی کووچەی (شێخ عدی) بکات و هەر شوێنێکی لێ ڕووخا دروستی بکاتەوە. هەروەها کار و فەرمانی (کووچەک)ەکانیش دائەمەزرێنێ و ئاراستەیشیان ئەکات بۆ ئەو فەرمانانەی کە پێیان سپێرراوە. بابەشێخ پرسینەوەیان لێ ئەکات.

شێخەکانی بەرەی (شێخ فخرالدین) دەروێشی خۆیان هەیە. کە لەوان ساڵ بەساڵ پیتاکی خۆیان کۆ ئەکەنەوە. ئەمانە، بێجگە لە شێخەکانی بەرەی شێخ حەسەن پێش هەموو شێخەکانی تر ئەکەون.

## شێخەکان

«شێخەکانی ناو یەزیدییەکان بەبنەچە ئەچنەوە سەر (شێخ عدیی دووەم) کوڕی (شێخ ابو البرکات صخر) کە بەپێنج پشت ئەکاتەوە سەر (مەروان کوڕی حەکەم). چوارەم خۆنکاری (ئەمەوی). شێخەکان بڕوایان وایە کە لە (یەزید کوڕی معاویە) کەوتوونەوە؛ کە بەخوای خۆیان دائەنێن و، لەوێشەوە بەشێک لە خوایی کەوتووەتە لەشیانەوە[1] لەبەر ئەوە لە توانایاندا هەیە ڕێ بەژین بگۆڕن و دەستکاریی کاروباری جیهانیش بکەن»... ئەم شێخانە لە چەند خێزانێکدا کۆبوونەتەوە هەر خێزانەیان، جۆرە توانایەکی هەیە، دامەزرێنەری ئایینی یەزیدی پێی بەخشیوە. ئەم خێزانە؛ هەموویان ڕاز هەڵگری ئەون پارێزەری دەستوورەکانی ئەون. پێشەوای تیرەکەی ئەون. ڕێ پیشانی یەزیدییەکان ئەدەن. کار لە هۆش و گیانیان ئەکەن. هەرچی ئارەزووە بکەن ڕێیان ئەدەنێ بیکەن. هەرچی ئارەزوو نەکەن ڕێیان لێ ئەگرن نەیکەن پەیڕەویی و یاسایان بۆ دائەنێن و بانگیان ئەکەن بۆ پەیڕەوی کردن و کارپێکردنیان. هێز و دەسەڵاتی خوای خۆیشیان تێ ئەگەیەنن کە تا چ ڕادەیەک فەرمانڕەوایە بەسەر گشت مرۆڤدا. (بەپێشکەشکردنی پارە و خواردەمەنی و کەلوپەلیش نەبێ لەسەر دەستی ئەو شێخانەدا بۆ خواکەیان؛ لە دەست ئازار و زیانبەخشی ئەو خوایە ڕزگاریان نابێ[2] هەروەها شێخەکان چیرۆکی دروستکردنی جیهان و ئاسمان و نەتەوەکان یەزیدییەکان ئەگێڕنەوە، وایش ئەخەنە مێشکی یەزیدییەکانەوە، کە (تیرەی یەزیدی)، وەک نەتەوەکانی تر پەیدا نەبووە. کردەوە و کاری یەزیدییەکان لە هی نەتەوەکانی تر بەهێزتر و بڵندترن، هەرچی شەڕ و ئاشتی و، بەرهەم زۆریی و بێ بەرهەمیی زەوی و، کامەرانی و هەناسە ساردیی و، ژین و

---

(١) نووسەرانی عەرەب وا ئەڵێن. کەچی لە نووسەراوی (مصحفارەش)یشدا ئەڵێ؛ سەردارەکانی یەزیدی لە نەتەوەی (شاپووری یەکەم) و (شاپووری دووەم)ی ساسانین. (ش. ف)

(٢) ئەم ڕەوشتەیان پێچەوانەی ئایینی زەردەشتییە. (ش. ف)

مردن هەیە... هەرچی شتێک لە ژیانی یەکەمی مرۆڤدا تووشی دێ... ئەمانە هەموویان دەستکردی خوای یەزیدین... «هەر شێخەکان خۆیان ئەتوانن ئەو بارانە بگۆڕن» ؟... بۆ هەر بەرهەمێکی هۆشیی مرۆڤیش بگەڕێیت، لەوانەی تا ئێستا شارستانێتی دۆزیویەتەوە یاخود لەلایەن زانایانەوە داهێنراوە؛ نووسراوەکانی (جیلوە) و (مصحفارەش) ناوی بردوون و لێیان دواوە. ئەگەر ئەم دوو نووسراوەیش نەبوونایە ڕۆژئاواییەکان ئەمەندە پێش نەئەکەوتن! ؟...[1]

شێخەکان بریتین لە چەند خێزانێک، ئەمانە، ناویان: ١- خێزانی شێخ حەسەن. ٢- خێزانی شێخ فەخرەدین. ٣- خێزانی شێخ شەریفەدین. ٤- خێزانی شێخ سجادین. ٥- خێزانی شێخ ئامادین. ٦- خێزانی شێخ ناسرەدین. ٧- خێزانی شێخ شەمسا. ٨- خێزانی شێخ ئەبوبەکر. ٩- خێزانی شێخ مەند.

بەڵام بەپێی ڕەوشتی یەزیدییەکان ئەوانە هەموویان ئەچنەوە سەر سێ بنەچە: ١- ئادانی. ٢- شەمسانی. ٣- قانانی.

هەرچی سەردارەکانی شێخان و پس سەردارەکان، لەگەڵ خێزانی (شێخ ئەبوبەکر)دا لە (قانانی)یەکان ئەژمێررێن.

بەپێی ئایینی یەزیدی ئەم سێ بنەچەیە نابێ ژن و ژنخوازیی لەگەڵ یەکتردا بکەن.

وەک زانراوە گەلێک کەس لە خێزانەکانی (شێخ حەسەن) و (شێخ ئەبوبەکر) و (شێخ فەخر) و (شێخ سجادین) لە شارەکانی (تفلیس) و (باطوم) و (ئەلیکستاندە ایال)دا دائەنیشن؛ لە ژن و ژن خوازیشدا پەیڕەویی ئایینی خۆیان ئەکەن.

ڕەوشتی یەزیدییەکان وایە کە هەر یەزیدییەک ئەبێ شێخێکی هەبێ، تا ببێ بەدەروێشی و لەوەوە نیازی چاک و گیانی پاک و هەستی خاوێن بێنە دڵ و گیان و هۆشیەوە شێخەکەیش پێویستە دەروێشەکەی خۆی خۆش بوێ و یارمەتیی بدات لە دڵخۆش کردنی خوای خۆیدا و، لە خۆپاراستن لە تووڕەکردنی ئەو خوایەدا. بەخششی دەروێشەکەیش بۆ شێخەکەی بەپێی ئەوەیە کە هەر ساڵە لە سایەی شێخەکەیەوە چەندی دەست کەوتووە و چەندیش لە سەرگەردانی دوورکەوتووەتەوە. هەر کاتێ دەروێشەکەیش لە مردندابێ شێخەکەیدێتە سەری؛ پێی ئەڵێ کە پەیڕەویی ئایینی (تاووسی فریشتان) بکات لە ئایینی خۆیشی لانەدات، هەر شێخەکەیشە کە ئەو دەروێشە ئەشوات و سپیاڵی تێ ئەپێچێ و ئەینێژێ.

## پیر

پیر بەلای دەروێشکارەکانەوە بەو کەسە ئەڵێن کە نەتەوە پێ ئەگەیێنێ و ڕێگای باش پێشانی نەتەوە ئەدات. پایەی ئایینی ئەمانەیش بریتین لە چەند خێزانێک کە بەچەند پشتێک ئەچنەوە سەر پیاوە گەورە و چاکەکانی ئیسلام. ئەوانەی کە یارمەتیی (شێخ عدی)یان داوە بەکەسوکارەکانیەوە، لە کاتێکا کە

(١) قسەی وا پڕوپوچ لەناو هەموو نەتەوەیەکدا هەیە تەنانەت لە ڕۆژئاوایشدا نییە. (ش. ف)

هێشتا ئایینەکەیان بریتی بووە لە ئیسلامەتیەکی پەتی. خێزانێک لەو پیرانە ئەچێتەوە سەر (شێخ قضیب البان) کە لە نەتەوەی پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ە. (پیر محەمەد رەشان) و (پیر هاجیال) و (پیر مام شڤان) و (پیر جەروانە) و (پیر حاجی محەمەد) و (پیر قضیب البان) لەو پیرانەن.

هەموو شێخێک پیرێکی هەیە؛ ئەبێتە دەروێشی. هەموو پیرێکیش شێخێکی هەیە ئەبێتە دەروێشی.

یەزیدییەکیش، ئەبێ شێخێک و پیرێکی هەبێ و، ببێتە دەروێشیان تا کاروباری ئایینیی خۆی بەوان بسپێرێ و لە ڕۆژی پاش مرنیشدا، واتا لەوە جیهاندا، تکایان لێ بکات بۆی بپارێنەوە لە خوا تا لە گوناهەکانی خۆشبێ.

پیرەکان دەسەلاتێکی زۆریان هەیە لە هەڵسووڕاندنی کاروباری ژیانی یەزیدییەکاندا. دەسەلاتێکی زۆریشیان هەیە بەسەر گیان و دەروونیاندا. جاری وا هەیە نەخۆش و شێت بەنوشتە و نزا خوێندن چاک ئەکەنەوە، دەرد و پەککەوتەیی ئەندامەکانیش بەو گڵانە چاک ئەکەنەوە کە لەسەر گۆڕی پیاو چاکەکانیانەوە ئەیهێنن. یارمەتی شێخەکانیش ئەدەن لە شتنی مردووان و ناشتنیاندا. هەروەها ئەچنە سەر گۆڕی ئەو مردووانەیش لە ڕۆژانی جەژنەکانیاندا تا لە خوای گەورەیان بۆیان بپارێنەوە بۆ ئەمەی لە گوناهیان خۆش ببێ. ئەم پیرانەیش بەهەموو لایەکی خاکی یەزیدیدا بڵاوبوونەتەوە.

## هەژار

چینێکیش هەن هەژار (فەقیر)یان پێ ئەڵێن، بەزۆریی لە سنجار دان. وازیان لە جیهان هێناوە پەلاسێکی ڕەشی خوریی لەبەر ئەکەن بالاپۆش (عەبا)ێک و کەوڵێکیشی لە زستاندا، بەسەردا لەبەر ئەکەن چ لە خواردندا، چ لە نوستندا، بەدوای خۆشیدا ناگەڕێن. هەموو کاتێکی خۆیشیان بۆ پەرستنی خوا بەخت ئەکەن. هەموو کەس بەزەیی پیایاندا دێتەوە. لەبەر ئەوە یەزیدییەکان هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕە کە هەرچی هەژار (فەقیر)ێک لەو هەژارانە ئازار بدات تاوانێکی وا گەورە ئەکات کە هەرگیز خوا لێی خۆش نابێ. هەتا ئەم چەندانەیش هەژار وا ناسرابوو. کەچی لەم ساڵانەی دواییدا هەژارەکان بوون بەکۆمەڵێکی بەچنگ و زەبر بەدەست. یەزیدییەکان لێیان ئەترسان (حەمۆ شێرۆ) کە هەژارێک بوو لەو هەژارانە و لە گوندی (خانک وقیغ)ە وە کە لە ناوچەی (شێخان) دایە، کۆچی کردبوو هاتبووە ناوچەی سنجار، کاتێک زانرا. سەری بەرز کردەوە و هەموو ناوچەی سەرداری گرتە ژێر دەست خۆی و بوو بەسەرداری ناوچەی سنجار. ئەمە لە سەردەمی داگیرکەریی ئینگلیزەکاندا ڕووی دا. هەموو یەزیدییەک مافی هەیە ببێتە هەژار، بەمەرجێ سەرداری شێخان پێی خۆش بێ و بەدەستی خۆیشی پەلاسی هەژاریی لەبەر بکات. هەر کەسێکیش پێچەوانەی فەرمانی هەژاریی ببزوێتەوە؛ سەرداری شێخان پەلاسی هەژاریی لێ ئەسێنێتەوە و سزایشی ئەدا.

هەژارەکە بەسەر سیپاڵە پەلاسەکەی خۆیدا پشتێنێکی سووری خوریی ئەبەستێ، کە پێی ئەڵێن (محەک). ئەلقەیەکی زەردی پێوەیە، کە پێی ئەڵێن (خادم). ئەم دووانەیش بەڕێزن وەک سیپاڵە

پەلاسەکە. پەتێکی باریکیش ئەکاتە گەردنی خۆی. پێی ئەڵێن (تەوقی یزید)، تەقیلەیەکیش ئەکاتە سەری. پێی ئەڵێن (کوللیک) ئەم کڵاوە بەنموونەی شاە کڵاو (تاج)ەکەی (شێخ عدی) دائەنێن. یەزیدییەکانیش کڵاوەکە ماچ بکەن یاخود سیپاڵە پەلاسەکە، وەک یەک فەڕی پێوەیە.

ئەوەندە هەیە ئەم کوللیکە، هەر تایبەتی نییە بۆ پیاوە هەژارەکان. پیاوە ئایینییەکانیش، بەڵکو گفتوگۆکارەکانیش ئەتوانن لەسەری بنێن، کە سیپاڵە پەلاسەکە و کوللیکەکە لە کەڵک ئەکەون. ئەیخەنە ژوورێکەوە، ئەپارێزرێن، پێی ئەڵێن (خانەی خەرقێ) واتا ژووری سیپاڵی پەڵاس. کە ئەویش شوێنەکەی لە گۆڕستانی (شێخ عدی) دایە، لە ناوچەی سنجاریشدا لە شوێنێکی نزیک بە(کانی پیر ئاخایی)ی دائەنێن کە لە گوندی (کوللیکان) دایە. لە پەنایەکدا دانراوە و کەڵەبەردێکیش بەسەردا نوخون کراوەتەوە ئەو پارچە پەلاسانە لەوێدا ئەمێننەوە تا ئەڕزێن و ئەبن بەخۆڵ.

یەزیدییەکان ئەمەندە ڕێز لەم بەرگە پەلاسە ئەگرن، ماچی ئەکەن و سوێندیش بەسەری ئەخۆن، ئەگەر هەژارێک لە یەزیدییەک تووڕەبوو، تەنانەت ئەگەر لە پیاوانی ئایینیش بێ، نابێ بەرامبەری بکات، تەنانەت ئەگەر لێیشی بدات. ئەگەر لێی ڕاست بووەوە بەهیچ کلوجێک چاوی لێ ناپۆشرێ[1] یەزیدیی تەواویش بەو کەسە ئەڵێن کە پەیڕەویی سێ شت بکات. ١- ئایینی یەزیدی. ٢- ڕێڕەو. ٣- ڕێزگرتن لە پەلاسی هەژار. هەرچی ئایینی یەزیدییە. ئەوەیە کە نابێ یەزیدییەکە ببێتە هاودەم و هاوڕێی یەکێکیتر کە لەسەر ئایینی یەزیدی نییە ئەبێ بەتەواوەتی خۆی لێ بپارێزێ.

لە ڕێڕەویش مەبەس ئەوەیە، کە دەروێشەکە لە سنووری فەرمانی دەروێشیی خۆی دەرباز نەبێ. فەرمانی خۆی بکات و دەس و پەنجە نەخاتە فەرمانی کەسانی ترەوە.

گوێرانەیش فەرمانی شێخ و پیرەکەی خۆی بەجێ بهێنێ! مەبەس لە ڕێزگرتنی پەلاسەکەیش ئەوەیە، کە زۆر بەتەنگ ئەو پەلاسی هەژارییەوەبێ و ڕێزیشی لێ بگرێ.

بەپێی ئایینی یەزیدی، هەر هەژارێک بمرێ، ئەبێ بەپەلاسەکەی بەری خۆیەوە بنێژرێ. کوڕەکانیشی بام بچووکیش بێ، کە باوکی مرد، ئەبێ لە پەلاسێکی هەژارانەوە بپێچرێ.

ئەبێ هەژار ڕیشی خۆی شۆڕ نەکاتەوە نابێ بڕنگ و گوێزانیش بەکاربهێنێ بۆ ڕیشی. هەر موویەکیش لە ڕیشی کەوتە خوارەوە، ئەبێ بیخاتە درزی دیوارێکەوە، یاخود شوێنێکی واوە کە دەستی لێ نەدرێ و نەیشکەوێتە بەرپێ.

هەروەها بەکارهێنانی گوێزان و بڕنگ لە هەموو پیاوە ئایینییەکانی یەزیدیی بەربەست کراوە. تەنیا ئەو چینی (پس سەردار) و (سەردارانە) ئەتوانن بەکاریان بهێنن، کە خۆیان بۆ (سەرداری شێخان) ناونووس ئەکردووە.[2]

---

(١) ئەم ڕەوشتەیش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە یەزیدییەکان. خواپەرستن نەک دێوپەرستن. چونکە ڕێزگرتن لە هەژار فەرموودەی خوایە، نەک دێو. (ش. ف)

(٢) کەریم بەگ کوڕی ئیسماعیل بەگ، لەبەرەی سەرداری شێخان بوو، بەڵام چونکە ڕۆشنبیر بوو، کە ئامۆژگارییم کرد ڕیشی خۆیشی تاشی و جلوبەرگی ڕۆژئاواییشی پۆشی. (ش. ف)

زۆربەی هەژارەکان لە دەروێشەکان. لە پیاوە ئایینییەکانیش هی وا هەن کە بووبن بەهەژار و بوون بەپەلاس پۆش لەبەر خواپەرستی و گۆشەگیریی و خۆدوورخستنەوە لە خۆشیی ژیان. جا لەبەر ئەوە، کە هەژارەکان ژنیان هێنا، ئەبێ لەپێش هەموو شتێکا تەماشای پایەی ئایینیی خۆیان بکەن و لەو سنووری کە ئایین بۆی داناون نەچنە دەرەوە.

لە پێش ئیسلامەتیدا هەر کەسێ دەستی بدایەتە خواپەرستی و گۆشەگیریی بەرگێکی خوریی زبری لەبەر ئەکرد. کە ئیسلامەتییش داهات ئەم ڕەوشتە لەناو گۆشەگیر و خواناسەکانیاندا بوو بەباو، یەزیدیش بەو بۆنەیەوە کە لە پەیڕەوانی (شێخ عدی)ن کە خاوەنی ڕێڕەوێکی دەروێشکاریی (تصوف) بووە، ئەم باوەڕیان لەوەوە وەرگرتووە. ئەم ڕەوشتەیش زۆر کۆنە لە جیهاندا، لە هەموو چەرخێکیشدا هەبووە لە کوردستاندا(*).

## گفتوگۆکار

گۆیندە یاخود گفتوگۆکار (قوال)، لە ئاهەنگە ئایینییەکاندا گۆرانی ئەڵێن، هەروەها لە کاتی کۆبوونەوەکاندا لەسەر گۆڕی پیاوە گەورەکان، یاخود لە کاتی ناشتنی مردوواندا. لەگەڵ (سنجەق) یاخود (تاووس)ەکانیشدا ئەچن بەم لا و بەولادا. هەواڵی پیاوە گەورەکانی یەزیدی و مێژووی ژیانیان لەدەم گفتوگۆکارەکانەوە ئەگاتە بەرگوێی یەزیدییەکان. ئەمانە شارەزان، زیرەک و زمان لووسن. حەز بکەن «جۆ بەدیواردا هەڵ ئەگێڕن»!. ئەزانن چۆن پارە لە گیرفانی یەزیدییەکان دەربهێنن!... (سەردارەکانی شێخان) ئەمانەیان کردووە بەڕاسپێرراوی خۆیان لای یەزیدییە دوورەکان، پشت بەمانە ئەبەستن، ئەمانە بەدەمان (مزایدە) تاووسەکە لە سەرداری شێخان وەرئەگرن. ئینجا دەست ئەکەن بەکۆکردنەوەی پیتاک لە نەتەوەکە، کە زۆر جاری وا هەیە ئەبێتە ئەرک بەسەریانەوە.

ئەم گفتوگۆکارانە لە بنەچەدا عەرەبن[1] لە شاری شامەوە هاتوون، لەگەڵ (شێخ عدی)دا. پیاوی بوون. ئەمانە بەبۆرە پیاو دائەنرێن. لە چینی ئایینی دانانرێن. کوردەکان پێیان ئەڵێن «تازی[2]».

لە سەرەتادا بریتی بوون لە دوو خێزان، لە چینی خۆیان نەبوایە ژنخوازییان نەئەکرد. بەڵام کە خەریک بوون لەناوبچن، (بابەشێخ) بڕیاری دا کە بتوانن ژن لە چینی دەروێش (مرید)ەکان بهێنن، ئەمانە لە کاتی کۆبوونەوەکاندا فەرمانیان ئەوەیە چڵکاو و خۆڵ و گڵێش فڕێ بدەن.

## دەروێش

هەر کەسێ لە بۆرە پیاوان بێ و لە چینی ئایینی بەدەربێ؛ یەزیدییەکان پێی ئەڵێن دەرویش یاخود (مرید). ئەمانە زۆرتر لە کەنەفت کراوەکانی هیندستان ئەکەن کە پێیان ئەڵێن (کەنەفت کراو)، ئایینی یەزیدی لە هەموو چینێکی کەمتر داناون، پێوەندی گرانی خستۆتە پێیانەوە. لە زۆر مافیش بەش بڕاوی

---

(*) سۆفیگەری لە ئایینی مەسیحی و جوولەکە و ئیسلام و زۆر باوەڕەکانی تردا هەیە.

(١) الیزیدیة: صدیق الدملوجي. (ش. ف)

(٢) تازی: عەرەب. (ش. ف)

کردوون. پیاوە ئایینییەکان بەچاوی سووکەوە سەیریان ئەکەن. ژن و ژنخوازییان لەگەڵ ناکەن. ملکەچی و کەساسییان بڕیوە بەسەریاندا. نە ئەهێڵن لە بارەی ئایینەکەوە قسە بکەن، نە ئەیش هێڵن بیری لێ بکەنەوە.[1] خستوویانەتە مێشکیانەوە کە هەتا دڵی ئەوان لە خۆیان خۆش نەکەن بەتیرەی (یەزیدی) ناژمێررێن بەم ڕەنگە ئەو کلۆڵانەیان کردەوە بەداردەستی خۆیان، چۆن خۆیان ئارەزوو بکەن وا بەکاریان ئەهێنن. تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر ئەو دەروێشانە لەم بارەدا بوون، بەڵام ئێستاکە وا نەماون. سەرکێشی ئەکەن. دڵی شێخ و پیرەکەی خۆیان ڕائەگرن. ژنیش بەچینی خۆیان نەبێ نادەن. بەڵام لەوە بەولاوە گوێ نادەنە هیچ فەرمانێکی ئایینیی تریان. بەم ڕەنگە چاوچنۆکی و چاوبرسێتیی شێخەکان بوونە هۆی سەرکێشیی دەروێشەکان. شێخ ئەتوانێ بەروبوومی دەروێشەکەی خۆی بفرۆشی بەشێخێکی تر. ئیتر لەوە بەولاوە بەروبوومی دەروێشەکە بەرەو ڕووی ئەو کەسە ئەبێتەوە کە بەروبوومی دەروێشەکەی کڕیوە. ئەگەر دەروێشەکە شێخەکەی مرد و کەسێک نەبوو لە کوڕانی ئەو شێخە یاخود لە کەسوکاری ئەو کە بیکات بەشێخی خۆی، تا یارمەتیی بدات لە دڵخۆش کردنی خوادا و لە تەنگانەکانی ڕزگاری بکات، پەنا ئەباتە بەر (سەرداری شێخان)، ئەویش شێخێکی بۆ ئەدۆزێتەوە و لە باتی ئەوە شتێکی بۆ خۆی لێ ئەپچڕێ! جا هەر کاتێک ڕۆشنبیرانی یەزیدی کەوتنە سەر ئەوەی کە ئایینەکەی خۆیان بژار بکەن و ڕاست بکەنەوە؛ پێویستە لەپێش هەموو شتێکا باری کۆمەڵایەتی ئەمانە ڕاست بکەنەوە و بیخەنەوە جێی خۆی. واتا وایان لێ بکەن کە مافەکانیان وەک مافەکانی چینەکانی تری لێ بێ.

## کۆچەک

کۆچەک لە بۆرە پیاوان ئەژمێررێ[*]. بۆ بەجێ هێنانی کاروباری (شێخ عدی) دانراوە. لە ژێر دەستی (بابەشێخ)دا کارو و فەرمانی ئایینی بەجێ ئەهێنێ بابەشێخ کە یەکێکی هەڵبژارد بۆ فەرمانی کۆچەکایەتی و دایەزراند. پشتێنێک ئەبەستێتە پشتی کە ئەلقەیەکی مسی پێوەیە. هەرچی تیرەکەیشە ناچارە هەرچی کۆچەک بیڵێ باوەڕی پێ بکات. چونکە ئەو بەدەم (شێخ عدی) و (خوای گەورە) و پیاوچاکانەوە قسە ئەکات کە گوایا خەوی بینیوە پێیانەوە و قسەیان پیا ڕاسپاردووە بیکات. کە گرانییەک داکەوێ، یاخود دەردێک پەیدابێ، بابەشێخ کۆچەکەکان لە جێگایەکدا کۆ ئەکاتەوە. پێیان ئەڵێ نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە لە خوا. جاری وا هەیە تا سێ کات، جاری وایش هەیە تا بەرەبەیان بەو جۆرە ئەمێننەوە. سەر ئەنووسێنن بەزەوییەوە بۆ ئەمەی بەهۆی گیانەوە بکەن بەخوای باڵا و ڕازی ئەو گرانی و دەردەیان پێ بگوترێ. ئینجا ئەوانیش بابەشێخ لە ئەنجام تێ ئەگەیێنن. تا ئەویش بەشی خۆی چارەی ئەو گرانی و دەردە بکات. یەکێکیش لە کاری ئەو کۆچەکانە ئەوەیە چارەی ئەو گرانی و دەردە بکات. یەکێکیش لە کاری ئەو کۆچەکانە ئەوەیە کە بەهۆی گیانەوە بزانن مردووەکان چییان بەسەردێ.

---

(١) ئەم ڕەوشتی چینایەتییەیان پێچەوانەی ئایینی زەردەشتییە. شوێنەواری ئایینی بوراهمایییە. (ش. ف)

(*) لە نێزیک هەڵەبجەوە دێیەک بەناوی (باوە کۆچەک)ەوە هەیە، دەبێ ئەم ناوە لە چیەوە و هاتبێ لەم دڤەرەدا؟!

گیانەکانیان بۆ کوێ ئەچن. لە خۆشی و ناخۆشی چییان تووش دێ. ئینجا ئەنجامی ئەوە بەکەسوکارییان ئەڵێن. کۆچەک تا شتێک نەقەومێ و فەرمانی پێ نەدرێ، ناتوانێ ئەم کارە لە خۆیەوە یاخود لە هەموو کاتێکا بکات. بەڵام جاری وا هەیە. کۆچەک کاروباری خراپ لە دەستی ئەوەشێتەوە، دەست ئەداتە فروفێڵ و چەواشەکردنی تیرەکە بۆ کەڵکی ناپوختەیی خۆی و کەسانی ترا. لەمەیشەوە ئاژاوە پەیدائەبێ، جوێن و خوێن پەیدا ئەبن. لە ساڵی (١٩٢٠)دا (کۆچەک سلێمان)ێک پەیدابوو؛ دەستی دایە جادووگەریی و چاووڕاوکردن و خۆی کرد بەپێغەمبەرێک. لە کار و کردەوەکانییەوە گەلێک سەرگێژیی پەیدابوو بۆ (بابەشێخ ئیسماعیل) و (سەرداری شێخان سەعید بەگ) بابەشێخ بەداخی ئەو کۆچەکەوە سەری نایەوە. کۆچەکیش لە هاوینی ١٩٢٣دا کوژرا!. نەتەوەیش بەهۆی دەست برینی ئەوەوە، گەلێک ئەرک و ماندوێتی و پارە بەخت کردنی تووش بووا...

ئەمە جاران شتی وا ڕووی ئەدا. بەڵام ئێستا کە وا نییە. یەزیدییەکان زۆریان چاویان کردۆتەوە و ناهێڵن شتی وا سەر بگرێ!...

## هەندێ لە ڕەوشتی چاکیان

* نابێ یەزیدی سەیری دەموچاوی ژنێک بکات کە لەسەر ئایینی یەزیدی نەبێ. نابێت دەست بازیی لەگەڵ ژنێکیش بکات کە یەزیدیی نەبێ و پێی ڕەوا نەبێ بەڵام ژن و مێردییان لەسەر بنچینەی خۆشەویستی دائەمەزرێ.
* نابێ تف لە ناوچەوانی هیچ مرۆڤێک و هیچ گیانلەبەرێک بکات.
* نابێ بچێتە بەزمگاهەکانەوە؛ وەک تیاترۆ و جێ سەمای ناو شارەکان.
* باوەڕیان وایە هەموو شتێک لە سەرەتادا پاکە. هەر دڵ پاک بێ، هەموو شتێک پاک دەرئەچێ.
* بەرامبەر هەژار (فەقیر)ەکان خەنجەر هەڵناکێشرێ.
* تا کارەساتێکی ئاشکرای لێ نەبینێ کە نەنگ و ناپەسەندبێ. پیاو نابێ لە هیچ ڕوویەکەوە دڵ لە ژنەکەی خۆی پیس بکات.
* کە بووک ئەگوێزنەوە ماڵی زاوا. بەسەر سەریەوە نانێک ئەشکێنن، تا هەژار و بەش براوی لا خۆشەویست بێ.
* نابێ یەزیدی بەرامبەر هاودەمەکەی خۆی پێ ڕابکێشێ، نابێ تفیش بکاتە سەر زەوی. نابێ تف لە چرا و ئاگریش بکات.
* ئەبێ یەزیدی خۆی لە جوێندان و زمانپیسی بپارێزێ.
* دوژمنیشی بێ کەوتبێتە بەردەستی؛ کەمووڕووە گڵەکەی سەر گۆڕی شێخ عدی پێ بوو، یەزیدییەکە وازی لێ ئەهێنێ.
* یەکیەتی و برایەتی و هۆگری و ڕێزگرتن بەئاشکرا لەناویاندا دیارە.

## هەندێ لە ڕەوشتی خراپیان

* ناشێ یەزیدییەکی بۆرەپیاو ژن لە خێزانە ئایینییەکان بهێنێ. هەروەها نابێ ئەمانیش لە وان ژن بهێنن.

* سەرداری شێخان هەر چۆنێک بێ، هەرچی بکات، بام خراپیش بێ نابێ یەزیدی توانجیی تێ بگرێ و قسەی پێ بڵێ و دڵی خراپ بکات. هەتا مێردەکە کەسێکی نێرینەی مابێ هیچ ئافرەتێک، لە پاش مردنی ئەو هیچ کەلەپوورێکی بەرناکەوێ. هەروەها هیچ ژنێکیش لە مێردەکەیەوە کەلەپووری بۆ نامێنێتەوە. ژنیش خۆی وەک کەلەپوور دێتە ژمارەوە.

* یەزیدییەکان کراون بەچین چینەوە هیچ چینێک ناتوانێ بگۆڕێ بۆ چینێکی تر. پشت بەپشت ئەو چینایەتییانە ئەپارێزن.

* نابێ یەزیدی بچێتە سەر پێشاو (ئاودەستخانە)، یاخود بچێتە ناو گەرماو (حمام)ەوە. یان مزگەوت و خوێندنگای ئیسلامەوە کە قورئانی تیا بخوێنرێ. نابێ بەئاو ناو گەڵی خۆی بشوات.

* نابێ هیچ یەزیدییەک کاهو و کەلەرم بخوات. نابێ هەندێکیشیان گۆشتی کەلەشێر و کۆتر و ئاسک و کەروێشک و ماسی و فاسولیا و لۆبیا بخۆن!

* جاران لە خێزانی (شێخ حەسەن) بەولاوە کەس فێری خوێندەواری نەئەبوو هیچ یەزیدییەکیش ئایینەکەی خۆی لای بێگانە ئاشکرا نەئەکرد بەڵام ئەمە سی ساڵ پترە دەرگای خوێندەواریی بۆ هەموو یەزیدییەک کراوەتەوە. یەزیدییەکانیش تا ئەندازەیەک ئایینەکەی خۆیان لای کەسانی باش ئاشکرا ئەکەن.

* نابێ ئافرەتی یەزیدی جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ یاخود هی ئاوریشم لەبەر بکات. ئەبێ جلوبەرگیان لە خامی سپی بێ. ئەبێ لەچکیش بکات. کەچی ئافرەتانی خێزانی (سەرداری شێخان) ئەتوانن هەموو جۆرە جلوبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ لەبەر بکەن تەنانەت ئاوریشمیش.

* نەتەوەی یەزیدی مافی ئەوەی نییە (سەرداری شێخان) هەڵ بژێرێ، یاخود ئەگەر خراپ بوو چەندوچوونی لەگەڵدا بکات. یان لای ببات. دەروێش (مرید) کە زۆربەی نەتەوەی یەزیدی لەوانە بەزۆربوومی بۆ شێخەکەیەتی کە تا سەر پشاوپشت هەروا ئەمێنێتەوە. شێخ ئەتوانێ بەروبوومەکەی بفرۆشێ بەشێخێکی ترا...

تیرەی یەزیدی لەلایەن چینە ئایینییەکانەوە ئەچەوسێنرێتەوە کەچی لە بەرامبەر ئەوەدا چینە ئایینییەکان خەمێکیان ناخۆن ژینێکی باشتریان بۆ پێک بهێنن!...

## سەرنجێک لە ئایینی یەزیدی

ئەبێ لە پێش هەموو شتێکا ئەوە بزانین کە ئایینی یەزیدی لە شێوەی ئێستایدا کە هەیە ئایینێکی ئاسمانی نییە. ئایینێکە لەلایەن کەسێکەوە دانراوە، نەک خوا. وەک (صدیق الدملوجی) ئەڵێ: بەم مەبەسەیش دانراە، کە هێزێکی گەورە لە کوردەواریی دروست بکات و بەهۆی ئەو هێزەوە فەرمانڕەوایی (ئەمەوی) زیندوو بکاتەوە. پایتەختەکەی (باعذرە)بێ و سنوورەکەیشی شاری (شام) بگرێتەوە. پەرەیش بسێنێ بەهەموو لایەکدا تا ئەگاتەوە ئەو سنوورەی کە (فەرمانڕەوایی ئەمەوی) هەیبووە...

هەروەها وەک دەملوجی ئەڵێ: خێزانی (سەرداری شێخان) و (شێخەکان)، هەرچەندە ئیمڕۆکە خۆیان بە کورد دائەنێن و بەکوردایەتیی خۆیشیانەوە ئەنازن، بەڵام کە لێیان بپرسیت، ڕاستەوڕاست پێت ئەڵێن: ئێمە بەچەند پشتێک ئەچینەوە سەر (شێخ عدیی ئەمەوی) بێجگە لەوە (یەزیدی کوڕی معاویەی ئەمەوی) کە دووەم جێنشین (خلیفە)ی (ئەمەوی)یەکان بووە، یەزیدییەکان وەک خوایەک لە حەوت خواکەی خۆیان ئەیپەرستن. هەر بەهۆی ئەم (یەزید) پەرستنەیشیانەوەیە کە بێگانە ناویان ناون (یەزیدی)[1] ئەگینا خۆیان لە ڕاستیدا (داسنی)ن ئێمەیش کە کوردەوارین هەر بەناوی (داسنی)یەوە بانگمان کردوون.

ئەم ئایینی (یەزیدی)یە، لە هەندێ ڕووەوە، وەک هەر چوار ئایینە ئاسمانییەکان وایە. ئایینی یەزیدیش وەک ئایینەکانی (زەردەشتی) و (موسایی) و (عیسایی) و (محەمەد). دان بەوە دائەنێ کە خوایەکی تاک و پاک و گەورە و بەتوانا هەیە و، ئەم هەموو جیهان و ئاسمان و مرۆڤ و گیانلەبەرانە و، گژوگیا و دارودرەختانە، ئەو دروستی کردوون. هەروەها هەر حەوت فریشتەکەیش، لەگەڵ بەهەشت و دۆزەخ و چەندوچوونکردنی ڕۆژی پاش مردن و، بابە ئادەم و دایە حەوا و ناردنی پێغەمبەران و لافاوە جیهانییە گەورەکە و، پاداشدانەوەی خوا، سزا دانیشی؛ وەک هەر چوار ئایینە ئاسمانییەکە تیا پێشان دراوە.

بەڵام ئایینی یەزیدی لەوەدا لەو ئایینە ئاسمانییانە جوێ ئەبێتەوە کە سەرۆکی فریشتەکان (عزازیل)، لەپاش ئەوەی قسەی خوای شکاند و کڕنووشی نەوازشی نەکێشا بۆ (ئادەم)، خوا لە بەهەشت دەری کرد و تا حەوت هەزار ساڵ لە دۆزەخدا ئازاری دا. بەڵام لەپاش ئەوەی (عزازیل)، پەشیمان بووەوە لە کاری خۆی و هاوار و فەریادی کرد؛ خوالێی خۆشبوو. سەرلەنوێ هێز و دەسەلات و پایەکەی پێشووی پێ بەخشییەوە. خوای گەورە خۆی لە پەنایەکدا کرد بەگۆشەگیر و کاروبار هەڵسووڕاندنی هەموو جیهان و ئاسمانەکانیشی بەو سپارد. کە هەتا ئێستایش هەر لە کاردایە. بەواتایەکی تر ئەم (عزازیل)ە کە یەزیدییەکان خۆیان پێی ئەڵێن (تاووسی فریشتان) جێنشینی خوایە و لەجیاتی ئەو و، بەفەرمانی ئەو کاروباری هەموو جیهان و ئاسمانەکان هەڵ ئەسووڕێنێ. بەڵێ یەزیدییەکان لە (مصحفارەش)دا تاووسی

---

(١) بەڵێ نووسراوی الیزیدی (صدیق الدملوجی) وا ئەڵێ بەڵام بۆ زانینی ڕاستیی ئەمە تەماشای دامێنەکانی پێشوو بکە. (ش. ف)

فریشتان وا پیشان نەدەن. کەچی لە نووسراوی (جیلوە)دا وەک خوایەکی تەواو و سەربەخۆ و خاوەن هێز و توانا و دەسەڵاتدار خۆی پیشان ئەدات، نەک وەک (سەرۆکی فریشتە)یەک کە خوا دروستی کردووە. هەروەها لە (جیلوە)دا، ددان ئەنێ بەچەند خوایەکی تریشدا کە هەن[1] لە یەزدییەکانیش داوا ئەکات کە ناوی خۆی نەهێنن نەوەک بێگانەکان وەک (موسایی و مەسیحی و محەمەدی) بەدکارییان لەگەڵ بنوێنن!، بەڵێ یەزیدییەکان (عزازیل)، یاخود (تاووسی فریشتان) وا ئەناسن کەچی هەر چوار ئایینە ئاسمانییەکان ئەم (عزازیل)ە بەسەرچاوەی خراپی دائەنێن و پێی ئەڵێن دێو یاخود (شیطان) کە تاکو ئێستاکەیش لەلایەن خواوە کەنەفت کراوە و لە برانەوەی جیهاندا خوا لەناوی ئەبات.

بەواتایەکی تر (تاووسی فریشتان)ی یەزیدییەکان کە بەهەرە خۆشەویستی خوای گەورەی خۆیانی دائەنێن، لای خاوەن ئایینە ئاسمانییەکان لە پەستترین پایەدا دانراوە و وەک دوژمنێکی خوا و دوژمنێکی هەرە گەورەی خواناسان دانراوە.

هەرچی ئایینە ئاسمانییەکانە، هەر خوایەک ئەناسن کە تاک و تەنیا و توانایە. هەرچی ئایینی یەزیدییە خوایەکی گەورەی هەیە و حەوت فریشتە کە یاریدەی ئەدەن، فریشتە تاووسیش یەکێکە لەوان. هەمووشیان هەر خۆی دروستی کردون. بەڵام دێو یاخود (شیطان) نییە و نەماوە (تاووسی فریشتان) بەپێی نووسراوی (مصحفارەش) سەرۆکی فریشتەکانە. بەپێی نووسراوی (جیلوە) خوایەکی گەورە و سەربەخۆیە و هەموو ئافەریدە کراوێکیش لەژێر چنگی ئەو دایە[2] کەچی ناوی فریشتەیش هەر بەتەنیشت ناوەکەیەوە نووسراوەتەوە پێی ئەڵێن: (تاووسی فریشتان) بەڵام لە ئایینە ئاسمانییەکاندا دێو (شیطان) ماوە و هەر ئەمێنێ تا برانەوەی جیهان کە ئەوساکە خوا لەناوی ئەبات. کەواتە ئەو کردەوە و هێز و توانا و دەسەڵاتانەی کە لە نووسراوی جیلوەدا دراوەتە پاڵ (تاووسی فریشتان) کە بەخوایەکی گەورە دانراوە هیچ لەگەڵ ئەو کردەوە و هێز و توانایی و دەسەڵاتانەی کە لە نووسراوی جیلوەدا دراوەتە پاڵ (تاووسی فریشتان) کە بەخوایەکی گەورە دانراوە هیچ لەگەڵ ئەو کردەوە و هێز و توانایی و دەسەڵاتانە جیاوازی نییە کە ئایینە ئاسمانییەکان داویانەتە پاڵ خوای گەورە و پاک و بێ هاوتا، دروستکردنی ئافەریدەکراوەکان نەبێ. ئەوەندە هەیە لە ئایینە ئاسمانییەکاندا تەنیا یەک خوا هەیە. بەڵام لە ئایینی یەزیدیدا خوایەکی گەورە هەیە و حەوت فریشتەکە تاووسی فریشتان یەکێکە لەوان. شوێنەواری (ئایینی زەردەشتی) لە ئایینی یەزیدیدا دیارە: وەک پەرستنی حەوت فریشتەکان و، جەژنی (نەورۆز) و جەژنی (میهرەگان) و، کراسی سپیی بێ بەرۆک لەبەرکردن. شوێنەواری (ئایینی ئیسلام)یش لەناو ئایینی یەزیدیدا ئەمەیە کە (جەژنی مانگی ڕۆژوو) و (جەژنی کوشتی) یاخود (جەژنی قوربانی) و جەژنی (لیلة القدر) و (حەج) کردنیان هەیە، بام لە شێوەیەکی تایبەتی کوردانەی خۆیشیاندا بکرێن. وشەی

---

(١) لە ڕاستیدا ئەو شەش خوایە ئەبێ حەوت خوابن. چونکە بریتێن لە هەر حەوت فریشتەکان کە خوای هەرە گەورە دروستی کردوون. لێرەدا (نووسراوی جیلوە) دەستکاریی کراوە. (ش. ف)

(٢) لە ڕاستیدا یەزیدییەکان هەر خوایەکی تاک و تەنیا ئەپەرستن لە حەوت فریشتەکانیش بەولاوە هیچی تریان نییە. (ش. ف)

(ملک)یش کە ناویانەتە پێش (تاووس)ەوە و بووەتە (ملک تاووس)؛ دیسانەوە وشەیەکی ئیسلامییە. هەمیسان ناوی شێخەکانیان ناوی ئیسلامین.

شوێنەواری ئایینی (بوراهمایی)یش لە ئایینی یەزیدیدا ئەوەیە کە یەزیدییەکان کراون بەچین چینەوە، هەرچینەیش پێوەندی کران و توندی خۆی کراوەتە پێ. بەلام بەچینی شێخ و پیرەکان جۆرە نازوجیازێک بەخشراوە کە بەشێکە لەهی خوا کە پاشماوەی یەزیدییەکانی تری کردووە بەبەندە بۆ ئەوان!... ئەم یاسایە ئەمەندە بەگران کەوتووەتە سەر یەزیدییە کلۆلەکان (مەبەسم بەشی ئەتەوەیە)؛ ئەمەندە سەخت و سەهندەیە یەزیدییەکانی لە کەلکی مرۆڤایەتی خستووە!... ئەم یاسایە ئەمەندە دوورە لە دادپەروەرییەوە، منی خستووەتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئایینی یەزیدی دەستکردی مرۆڤە. نەک دەستکردی خوا. چونکە زۆرداری وا و چەوساندنەوەی وا لە کردەوەی خواوە دوورن، لە خوا ناوەشێتەوە!...

شوێنەواری (ئایینی مانی)یش لە ئایینی یەزیدیدا ئەوەیە کە یەزیدییەکان خۆیان لە جلوبەرگی جوان و ڕەنگاوڕەنگ لەبەرکردن و، لە خواردەمەنیی خۆش و پوختە خواردن ئەپارێزن. ژیانێکی دەروێشانەی هەناسە ساردانە ئەژین. خۆیان لە خۆشیی ژیان بێ بەش ئەکەن. لە چاویلکەیەکی ڕەشەوە سەیری جیهان ئەکەن. بەلایانەوە وایە کە جیهان پڕە لە ئازار و هاوار و سەرگەردانی. چەند خۆیشیان لە خۆشیی ژیان دوور بخەنەوە، ئەوەندە باشە بۆ جیهانی پاش مردنیان کە خوای هەرە گەورەیان لێیان خۆش ئەبێ و کامەرانیشیان پێ ئەبەخشێ.

ئەم ژیانەیشیان لەگەڵ ژیانە دەروێشکاری (الصوف)یەکەی کە (شێخ عدی)ی گەورەیان بۆی دامەزراندبێ بەتەواوەتی گونجاوە. هەر ڕەنگە تف نەکردنیشیان لە دێو (شیطان) و ڕیسوا نەکردنیشی، هەروەها تف نەکردن و جنێو نەدانیشیان بەکەس و بەهیچ گیانلەبەرێک، لە ڕووی کارتێکردنی ڕێڕەوی دەروێشکارییەوە بووبێ کە پێشبینی هەندێک لە زاناکانیان وایە مام دێو یاخود (شیطان)، هەڵناگرێ ڕیسوا بکرێ، هەر لەبەر ئەوەی کە لە هەموو کەس زۆرتر ڕێزی لە خوای گەورە گرتووە و بەتاک و تەنیایی ناسیوە، بۆیەکا لە خۆی بەولاوە کڕنووشی نەوازشی بۆ (ئادەم) نەکێشاوە!...

شوێنەواری (ئایینی سروشت پەرستی)یش لە ئایینی یەزیدا ئەوەیە، کە یەزیدییەکان بەپێی مصحفارەش خوایەکی هەرە گەورەیان هەیە و چەند فریشتە یاخود چەند خوایەکی بچووک.[1] ڕێز لە مانگ و ڕۆژ و با و ئاسمان و فەلەک و ئەستێرەی گەلاوێژ ئەگرن و ئەیانپەرستن. (تاووس)یش کە بەپێی نووسراوی جیلوە خوایەکی گەورەیانە بریتییە لە (دیاوس) کە خوای هەرە گەورەی سروشت پەرستەکان بووە. (زەردەشت) بەخواکانی سروشت پەرستەکانی گوتووە (دەئیڤە). یاخود دێو. دێویش بەزمانی (ئاوێستا) واتای (بریسکانەوە)یە (شێخ حەسەن)ی دامەزرێنەری ئایینی یەزیدیش ناوی نووسراوەکەی (جیلوە)یە، کە واتاکەی بریسکانەوەیە... (زەردەشت)، ئەوانەی ئەو دێوانەیان پەرستووە، پێی گوتون (دەئیڤە یەسنە) واتا (دێو پەرست)، یاخود (شیطان) پەرست چونکە لە خوایەکیان زۆرتر ناسیوە، کە

---

(١) هەرچەند وا ناوبراون بەلام لە ڕاستیدا یەزیدییەکان هەر حەوت فریشتەیان هەیە و خوایەکی گەورە. هەر بەتەنیا خوایش ئەپەرستن. (ش. ف)

ئەوەیش ئەبێتە سەرچاوەیەکی خراپەکاریی. ئەم وشەی (دەئیڤە یەسنە)؛ لە پاش تێپەڕاندنی هەزاران ساڵان بەسەریا؛ وردە وردە گۆڕاوە و بووە بە(داسنی). جا ئەم داسنییانە بوون، لام وایە، کە تێکەڵ بەپەیڕەوەکانی (شێخ عدی) بوون و لە سەردەمی (شێخ حەسەن)دا بەهەردوولایان ئەم ئایینەیان پێکهێناوە کە بێگانە ناوی ناون (یەزیدی). وشەی یەزیدی نە لە سەردەمی شێخ عدی دا هەبوو، نە لە پێش سەردەمی ئەودا. نووسەرانی ئیسلام لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی کۆچیدا بەسەریاندا سەپاندووە[1] ئەگینا خۆیان ناوی کوردەوارییەکەیان (داسنی)یە. شاخی (داسن)یش هەر بەناوی ئەوانەوە ناونراوە. جا ئەم داسنییانە خۆیان بەخواپەرست دائەنێن، نەک بەدێو (پەرست)، بەو واتایەی کە ئێمە پێیان ئەڵێین. نووسراوانی (جیلوە) و (مصحفارەش)، کە لەبەر دەستماندان، لە هەندێ ڕووەوە پێچەوانەی یەکترن. منیش هەر زوو گوتومە کە نووسراوە ڕاستەقینەکان ڕەنگە لە دەست چووبن و نەمابن، ئەمانیش کە نووسراونەتەوە، وەک خۆیان نەماونەتەوە، دوور نییە دەستکارییان زۆر تیا کرابێ. چونکە واژە و ڕستەی وایان تیایە لە پیاوێکی زانا و تێگەیشتووی وەک (شێخ حەسەن) ناوەشێتەوە کە نووسیبێتی، ڕۆژگار تا ماوەی حەوت سەد ساڵ بەرەنگاریی نەتەوەی یەزیدیی کردووە. لە کوشتن و تاڵان و سەرگەردانی بەولاوە، لە هەموو شتێکی تر بەش بڕاو بوون ئەم نووسینەوەیەیش لە دەمی شێخەکانیانەوە وەرگیراوە. ڕەنگە بێگانەیش نووسیبیەتەوە، نەک خۆیان. نەخوێندەواریش باو بووە لە ناویاندا، لە خێزانی شێخ حەسەن بەولاوە، باو وا بووە لایان، کە کەس فێری خوێندن و نووسین نەبێ. یاخود بهێڵن کەس لە ئایینی یەزیدی شارەزا بێ... لەبەر ئەم هەموو هۆیانە لە نووسراوەکانی (جیلوە) و (مصحفارەش)ی ئێستادا ئەم هەموو پێچەوانەیی و ناڕێک و پێکی و هەڵەیە ئەبینین[2] لەگەڵ ئەمەیشدا پێویستە پێی لێ بنێین کە ئایینی یەزیدی ئەگەر لە سەرەتادا، گرنگ و پەسەند نەبووبێ و، دروست و ڕەوا نەبووبێ؛ نە ئەیتوانی بەم جۆرە پەرە بسێنێ، نە ئەیشی توانی ئەم حەوت سەد ساڵە وا بەرگەی دوژمنایەتی موسڵمان و جوولەکە و گاورەکان بگرێ، کە هەرچی پیاوی دەروون پاک و ئازاد بێژی لێ بکاتەوە، بەسەر ئەم نەتەوە کڵۆڵەیان داهێناوە!...

یەکێتی و خەبات و هۆگریی یەزیدییەکان، خۆپاراستن و ئایین پاراستنەکەیان، لەگەڵ ئارام و ئازار هەڵگرتنی ناخۆشیی ژیانەکەیان ئازایەتی و دڵسۆزیی و مەردایەتی و سەربڵندی بۆ یەزیدییەکان لە مێژوودا تۆمار کردووە!... هەروەها شەرمەزاریی و پەشیمان بوونەوەیشی بۆ دوژمنەکانیان تۆمار کردووە!. هەر ئایینێک. ماوەیەکی زۆری پێ چوو، ساڵانی دوور و درێژی بەسەرا تێپەڕیی؛ بیروباوەڕی پڕوپووچی تێکەڵ ئەبێ. پەنجەی خوای گەورەیش لە ئارادایە، لە هەموو دەمێکا، یەکێک ئەرەخسێنێ بۆ تازەکردنەوەی بیروباوەڕ و ئایین، تا مرۆڤ لە دەست ژیانی چەوت و ناپوختە ڕزگار بکات. منیش هیوادارم بەخوا کە لە زوویەکی زوودا لەناو برا یەزیدییەکانماندا، پیاوانی زرنگ و ڕۆشنبیری وا پەیدا

(١) لە نووسراوی (مصحفارەش)دا، وشەی (یەزدان) هەیە کە باپیرە گەورەی یەزیدییەکانە. هەندێک ئەڵێن وشەی (یەزیدی) لە وشەی (یەزدان)ەوە وەرگیراوە. (ش. ف)

(٢) جا هەر لەبەر ئەمەیشە کە نووسەرانی بێگانە دەربارەی ئایینی یەزیدی وا بەهەڵەداچوون. (ش. ف)

بین، کە بەشینەیی و ڕێکوپێکی ژەنگ و ژازی چەند ساڵە لەم ئایینە بکەنەوە کە تەپوتۆزی جەنگ و دوژمنایەتی چەند ساڵەی لێ بسڕنەوە. هەر چەوتییەکی تیا پەیدا بووە، بەهۆی دەسکاریی پیاوانی ئایینیی خراپ و بێگانەی ناپاکەوە ڕاستی بکەنەوە. بەزەییەکیان بەنەتەوەکەی خۆیاندا بێتەوە و لەسەر ڕێگایەکی ڕاست و ڕەوان ئاراستەی بکەن؛ کە لەم ژیانە تەنگە ناخۆشەیەوە بگوێزرێتەوە بۆ ژیانێکی پڕ کامەرانی و تەندروستی و خوێندەواریی و دەوڵەمەندیی و ئازادیی. ئێمەیش کە برا کوردی ئەو یەزیدییانەین پێویستە هەر یارمەتییەکیان پێویست بێ پێشکەشیان بکەین. هەر شەرمەزارییەکی مێژوویشمان هەیە بەرامبەر ئەوان، بەکردەوەی کوردانە و مەردانەی گەورە گەورە بیسڕینەوە. یەزیدییەکانیش کوردێکن وەک ئێمە. بگرە لە ئێمە باشتر خۆیان پاراستووە و لە ئێمەیش زۆرتر بەکوردایەتیی خۆیانەوە ئەنازن. خۆیان بەسەرچاوەی مرۆڤایەتی دائەنێن. خۆیان بەسەرچاوەی ئایینەکان دائەنێن. لەناو ئایینەکەیاندا کە بەزمانی کوردی دانراوە ناوی زمانی کوردییش هەیە کە خوا لەگەڵ کوردەکاندا قسەی پێ کردووە. هەروەها ناوی (لالش) و (جودی) هەیە، کە دوو بەهەشتن لە کوردستاندا. بێجگە لەوە هەستی نیشتمانپەروەریی وای لێ کردوون کە (حەج کردن) لە (مەکە)وە بگوێزنەوە بۆ (لالش). تا هەموو ساڵێک هۆگری و یەکێتیی یەزیدییەکان تازە ببێتەوە و، بەروبوومی یەزیدییەکانیش نەچێتە دەرەوە، هەر بۆ خۆیان بمێنێتەوە. بێجگە لەمە ڕێز لە هەژار و داماو و لێ قەوماو، ڕێز لە خواناس زۆر ئەگرن. ژن و مێردیشیان لەسەر بنچینەی خۆشەویستیی دوولایی دائەمەزرێن. ئازاردانی کەس ڕەوا نابینن؛ تەنانەت تفکردنیش لە مرۆڤ و لەگیانلەبەر و لە چرا و لە ئاگر و ئاو؛ هەروەها جنێو پێدانیان بەگوناه و بەدکاریی دائەنێن. هەروەها خەو بەئازادییشەوە ئەبینن. ساڵ و نیوێک لەناو یەزیدییەکانی شێخاندا ژیام، لە چاکی و دڵپاکی و جوامێریی و دۆستایەتی و مەردایەتی بەولاوە هیچم لێ نەدین کەواتە هەرچەندی یارمەتیی ئەم برایانەمان بدەین، یارمەتیی خۆمان نەدەین. هەرچەندی ئەم یەزیدییانە لە کڵۆڵی و سەرگەردانی؛ لە نەخوێندەواریی و هەژاریی و نەخۆشی و زۆرداریی ڕزگار بکەین، ئەمەندە خۆمان پێش ئەخەین. باوباپیرمان، داخەکەم بەهۆی فەرمانڕەوایانی خراپەوە، هەروەها بەهۆی هەندێ پیاوانی ئایینیی خراپەوە، دەماری ناشێتییان بزووتبوو و کەوتبوونە کوشتاری ئەم کڵۆڵانە ئەویش بەبیانووی پاراستنی ئایینی ئیسلام، یاخود بەبیانووی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامەوە کە لە ڕاستیدا ئایینی ئیسلام لەو کردەوانەمان بێز ئەکاتەوە!... بەڵام ئێمە کە ڕۆڵەی ئەو باوباپیرانەین و لە چەرخی بیستەمدا ئەژین، پێویستە تۆڵەی ئەو خراپییانە بۆ یەزیدییەکانی برامان بکەینەوە، چەند چاکەمان لەدەست دێ، چەند یارمەتیمان لە دەست دێ؛ دەربارەیان بکەین. چونکە یەزیدییەکان مەردن، مەردیش هەڵئەگرێ کە هەموو یارمەتییەکی بدرێ. ڕۆشنبیرانی خۆیشیان، کە ئەڵێن بنچینەی ئایینەکەمان، ئایینی زەردەشتییە ئەتوانن سەرلەنوێ ئایینەکەیان پاک بکەنەوە لەو بیروباوەڕە ناپەسەندانە کە بەهۆی تێکەڵبوونیان بەبێگانە و زۆرداریی بێگانەوە تێکەڵی بوون. ئەتوانن بەیارمەتیی برا زەردەشتییەکانیانەوە دووبارە بیخەنەوە سەر ئایینی پاکی زەردەشتی، کە ئەویش ئایینێکە وەک ئایینی ئیسلام.

## مێژووی یەزیدییەکان لە شێخاندا

لە ژێر سێبەری فەرمانداریی هێزە داگیرکەرەکانی ڕۆژهەڵاتدا کە پەیتا پەیتا هێرشیان ئەبردە سەر کوردستان. وەک (مەغۆلە ئیلخانییەکان) و (جەلایرییەکان) و (تەیموری لەنگ) و (قەرەقوویونلییەکان) و (ئاق قۆیۆنلییەکان) و (سەفەوییەکان) و (عوسمانییەکان)، نیشتمانەکەمان کاول و وێران بووبوو، نەتەوەکەمان شپرزە و کەساس و بێچارەبووبوو، نە ئاسایش مابوو نە ئارام، بارستایی ڕەوشت و کردار و سەربەرزیی بەجارێ هاتبووە خوارەوە. سەردەمێکی تاریک و نووتەک بوو. نە ڕێز لە خوێندەواریی ئەگیرا و نە لە ماف و دادپەروەریی.

هەرچی بەهێز بووایە و خاوەن کوتەک، چاوی ئەبڕییە کڵاوی فەرمانداریی نەک بۆ کەڵکی نەتەوە بۆ کەڵکی تایبەتیی ناپوختەی خۆی، هەموو هێز و دەسەڵات و زیرەکی خۆی بەکارئەهێنا. تا بگاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. نەتەوەی کوردیش کە لەوپەڕی سەرگەردانی و پەرێشانی دابوو. لەبەر دڵپاکی و خۆش باوەڕی خۆی، داماویی لەسەر پێشەوایەکی دڵسۆز و نیشتمان پەرست، ئەمەندە وەڕس بووبوو لە گیانی خۆی هەر کەسێ بهاتایە پێشەوە و خۆی وا پێشان بدایە کە ڕزگاری ئەکات لە دەست ئەو سەرگەردانییە، بێ ئەمەی لێکی بداتەوە و لێکۆڵینەوەی تیا بکات؛ وەک هەموو دەمێکی خۆی، دەمودەست بڕوای پێ ئەکرد و دوای ئەکەوت و خۆیشی لە پێناویا بەخت ئەکرد. کەچی لە پاشەجاردا هەر بەو ئەنجامە ناخۆشە ئەگەیشت کە هەزاران جاران لەوە پێش پێی گەیشتبوو! کوردستان تا سەدەی نۆهەمی کۆچیش هەر لەو ناخۆشییەدا بوو!. (خێزانی عەدەوی)یش کە بەپێ قسەی نووسەرانی عەرەب[1] عەرەب بوون و ئەچوونەوە سەر (ئەمەوییەکان)ی شام، تەنگەتاو بووبوون بەدەست کرداری (عەباسی)یەکان و (عەلەوی)یەکانی دوژمنیانەوە. بێ هیوا مابوونەوە لە یارمەتی و پشتگرتنی نەتەوەی عەرەب، لەتاو کەساسی و بێ دەسەڵاتی و سەرگەردانیی خۆیان، پەنایان بردە بەر کوردەواریی و لە (لالش)دا کە ئەکەوێتە ڕۆژئاوای شاخی (هەکاری)یەوە لەناو جەرگی کوردستاندا جێگیر بوون. (شێخ عدی) کە سەرۆکی ئەو خێزانە بوو، پیاوێکی خواناس و زرنگ و زانا بوو، چوو بەدڵی کوردەکاندا. کوردەکان وەک هەموو دەم کە دەستی یارمەتییان بۆ پیاوی بێچارە و ئاوارە و بەسەزمان درێژ کردووە ئەمجارەیش ئەم ڕەوشتە بڵندەیان بەرامبەر بەشێخ عدی نوواند.

لە ڕاستیدا (شێخ عدی)یش هەڵی ئەگرت کە ئەو ڕێزەی لێ بگیرێ. چونکە لە ڕێگای ئایینی ئیسلام و ڕێڕەوەکەی خۆیەوە بەکەڵکی ئەو کوردانە ئەهات. زۆری پێ ئەچوو، کوردەکان خۆشیان ویست. لێی کۆبوونەوە. دوای قسەکانی کەوتن. هەموو یارمەتییەکیشیان دا، تا ساڵی (٥٥٥)ی کۆچی گیانی پاکی خۆی سپارد بەخوا.

---

(١) تەماشای بابەتی (تۆ بڵێی شێخ عدی کورد بووبێ) بکە، لەم نووسراوەدا بێجگە لەوە کە ئەو خێزانە لەناو کوردەوارییدا تووانەتەوە، لە بنچینەدا کورد بووبێ یان عەرەب؛ هەر لە (شێخ عدی دووەم)ەوە تاکو ئێستا هەر بەکورد ناویان دەرکردووە. (سەرداری شێخان سەعید بەگ) ئەیگوت ئەگەر کوردی ڕاستەقینە هەبێ ئێمەین!... (ش. ف)

بەلام لە نەوەی برای (شێخ عدی)، یەکێک پەیدابوو ناوی (شێخ حەسەن) بوو. کە تەماشای کرد هێز و دەسەلاتی هەیە و جێگای گەرم بووە کەلکەلەی فەرمانداریی کەوتە سەریەوە، «ویستی گەورەیی (ئەمەوییەکان) بگێڕێتەوە بۆ خۆی. هات ئەم (ئایینی یەزیدی)یەی دانا و کردی بەداردەستی خۆی بۆ گەیشتن بەم مەبەسە. بەلام پێش ئەمەی خۆی تەواو ئامادە بکات، مەبەسی خۆی ئاشکرا کرد. موسلمانەکانیش کە ئەم ئایینەیان بەسەرگەردانییەکی گەورە دائەنا بۆ ئایینی ئیسلام و موسلمانەکان؛ بەرەنگارییان کرد. ئەوەبوو (شیعەکانی موسل) کاریان کردە سەر (بدرالدین لؤلؤی فەرمانداری موسل) و (شێخ حەسەن) گیرا و خنکێنرا و بزووتنەوەکەیان لە بنەڕەتدا تێک دا... کوشتار و تالان و بڕو لە تیرەی یەزیدی دەست پێ کرا... ئەو دەمە سالی (٦٤٤)ی کۆچی بوو. (شێخ شرف الدین محمد) لە پاش شێخ حەسەنی باوکی چووەوە (لالش) کە مەلبەندی بانگکردنە ئایینییەکەیان بوو. پاشان ئەویی بەجێهێشت. چووە بن دەستی (عزالدین کیکاوسی سەلجوقی)یەوە. بەلام مەغۆلەکان لە سالی (٦٥٥)ی کۆچیدا کوشتیان. (شێخ زین الدین یوسف)ی کوڕیشی چووە شام، ڕێزی زۆر لێ گیرا. تەنانەت فەرمانڕەوایی پایەیەکی سەرداریی گەورەی دایە، بەلام وازی لێ هێنا. چووەوە گوندی (بیت فار) کە مەلبەندی کۆنی خێزانەکەیان بوو لە ناوچەی (بعلبک)دا خونکارانە ئەژیا. بەلام ترسا و چووە (قاهیرە). گوتیان بۆ تەختی فەرمانداریی تێ ئەکۆشێ. گرتیان، لە پاش سێ سال بەردرا. لە سالی (٦٩٧)ی کۆچیدا مرد. بەلام (عزالدین)ی کوڕی کرا بەسەرداری (دیمەشق)، پاشان بەسەرداری (صفد). دوایی وازی هێنا و چووە (مزە). کوردەکان هەموو دەم یارمەتییان ئەدا. دەنگ بلاوبووەوە کە بۆ تەختی شاهی تێ ئەکۆشێ. گرتیان. لە بەندیخانەدا مایەوە تا مرد. بەم ڕەنگە ڕەنجێ کە ئەم خانەدانە بۆ سەندنەوەی تەختی فەرمانداریی دای بەبا چوو. بەلام بۆ بلاوکردنەوەی ئایینەکەیان لە دەست نەکەوتن. لە شامدا بلاویان کردەوە هەروەها لە قاهیرەیشدا. چەند کەسێکی تریشیان کۆچیان کرد بۆ خاکی (حەلەب). پەرەیان دا بەئایینەکەیان لەناو هۆزە کوردەکاندا؛ کە زۆر دلسۆزییان بۆ ئەنوواندن. تا گەیشتە (انطاکیە) یەکێک لە شێخەکانیان کە ناوی (عزالدین یوسفی کوردی) بوو (میرنیشینی قەسیر)ی گرتە دەست خۆی لە برانەوەی فەرمانداریی (چەرکەس)ەکان و سەرەتای فەرمانداریی (عوسمانی)یەکاندا بوو بە(سەرداری خاکی حەلەب). لە سالی (٩٤٨)ی کۆچیدا مرد. ئەم (عزالدین)ە لە مالی (شێخ مەند)ە کە لە گەورەکانی خێزانی (عەدەوی)یە. نەوەکەیان ئێستاکەیش لە (شێخان) و (سنجار)دا ماون. بەم ڕەنگە بەرەی خێزانی (عەدەوی) ماوەیەک بەناخۆشییەوە ژیان. بەلام پەرەیان بەئایینەکەی خۆیان دا، لەناو کوردستاندا. دووبارە دەرکەوتنەوە. ئایینەکە لەناو شاخەکانی (جزیر) و (دیاربەکر) و (سعرد) و دۆلی (بۆتان)دا جێگیر بوو. لە (حەلەب)یشەوە پەرەی سەند تا گەیشتە (ویران شەهر) و (ماردین) و (نەسیبین) و گەیشتەوە (جەزیر) و ئینجا (شێخان) کە سەرچاوەکەیەتی.[1]

بەم ڕەنگە گەورەی ئەم مالە کە سەردەمێک پێیان ئەگوت (شێخ) و سەردەمێکیش پێیان ئەگوت

---

(١) لە کاتێکا کە نووسەرانی ئیسلام ئەلێن بنەمالەی شێخ عدی عەرەبن و ئەمەوین کەچی ناوی (کوردی) بەناوی (شێخ محەممەد)ەوەیە! (ش. ف)

(سەردار) بوو بەخاوەن هێز و دەسەلاتێکی وەها کە هەر لە شاهێک ئەچوو، لە هەموو لایەکەوە یەزیدییەکان دیاریی و دەرامەتی خۆیان بۆ ئەهێنا. بلاوبوونەوەی ئەم ئایینە هەتا نزیکەی سەد و پەنجا سالێک وەستابوو. بەلام لە پڕ، لە شێوەیەکی وا پان و فرەواندا بلاوبووەوە؛ کە پیاو ئەهێنێتە سەرسوڕمان، کۆچەرەکان، کە هێشتا ئایینی ئیسلامیان بەتەواوەتی تیا بلاونەبووەوە، زوو هۆگری ئەم ئایینە بوون. هەر بەهۆی ئەوانیشەوە وا گورج بلاوبووەوە. هۆزەکانی (دونبەلی) و (محەمەد) کە نیشتەجێی خاکی (بۆتان) بوون و زۆر بەناوبانگن لە مێژووی کوردەوارییدا زۆر چوونە سەر ئەم ئایینە. بەپێی نووسراوی (شەرەفنامە) کە دانەرەکەی (شەرەفخانی بیدلیسی)ی کوردە، هۆزی (دونبەلی) کە بەناچاریی کۆچیان کرد بۆ (ئازربایجان) لە (خۆی) و (سەگمەن)دا بوون بەنیشتەجێ، لە سەردەمی شاهەکانی (سەفەوی)دا بوون بەسەرداری گەلێک بەندەر و باژێڕ لەو ناوەدا. هۆزی (مەحموودی)یش چەشنی ئەو گەیشتە (ئازەربایجان) و لەگەڵ سەرکردەکانی (شاه ئیسماعیلی سەفەوی)دا ڕێککەوت و گەلێک دژ و مەڵبەندی پێ درا. لە سەردەمی (عوسمانی)یەکانیشدا زۆر لەڕوودا بوون. بەم ڕەنگە بەهۆی ئەم دوو هۆزە گەورەیە هۆزەکانی تریش ئایینی یەزیدییەکان تیا بلاوبووەوە، تا گەیشتە ناو خاکی (ئێران) و (قەفقاس)ەوە. سەردار نشینییەکی یەزیدی، لەم چەرخی نۆهەمی کۆچییەدا، بەناوی (قلب وبطمان)ەوە بەگرنگی، لەسەر کەناری ڕووباری (بۆتان) دامەزرا، ئەم شوێنە گرنگ بوو بەبنکەیەکی گەورە لە ناوەڕاستی یەزیدییەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باکور و باشووری کوردستاندا. هەر لە سەرچاوەی ڕووباری (بۆتان)ە وە کەوتە ژێر چنگیەوە تا ئەگاتە (دیاربەکر) و (جزیرە)، لەوێیشەوە هێز و دەسەلاتی ئایینەکە کشا تا گەیشتە شاری (زاخۆ) و (موسڵ).

لە خاکی (سۆران) و (هەولێر)یشدا. بەگورجی ئایینی زەردەشتی بلاوبووەوە. ئەو دەمە ڕەنگە چەرخی دەهەمی کۆچی بووبێ. هێز و دەسەلاتیشی ئەمەندە پەرەی سەند، یەکێک لە سەردارانی یەزیدی لە یەک کاتدا سێ سەردارنشینیی ئەبرد بەڕێوە.

لە پێشدا ئیسلامەکان و یەزیدییەکان ڕێک بوون. بەلام کە یەزیدییەکان هێز و دەسەلاتیان زۆر بوو لەگەڵ ئیسلامەکاندا تێک چوون. هۆی ئەمەیش وەک دەرئەکەوێ ئەوەبوو کە یەزیدییەکان ئیتر لەوە بەولاوە ملیان نەئەدا بۆ سەرداره زەویداره گەورەکانی کورد کە ئەیانویست بیانچەوسێننەوە بۆ کەڵکی ناڕەوای خۆیان و بیانکەن بەکۆ دوژمنەکانی دراوسێیاندا. ئەم ناکۆکییە بوو بەدوژمنایەتی و شەڕوشۆڕ لەناو هەردوولادا. موسڵمانەکان بەوەوە بەدناویان ئەکردن کە خوانەناس و هەڵگەڕاوەن لە ئایینی ئیسلام. هەندێ لە مەلاکانیش بڕیاری کوشتنیان دەرکردن لەگەڵ تالان کردن و ئافرەت داگیرکردنیاندا. یەزیدییەکانیش دوژمنایەتیی خۆیان بەرامبەر ئیسلامەکان ئاشکرا کرد. بەبۆنەی کوشتنی (شێخ حەسەن)ی سەرۆکیانەوە لەلایەن (بدرالدین لؤلؤ)ەوە. شەڕ و کوشتارێکی زۆر بەرپابوو لە (شێخان) و (سنجار) و (طور عابدین) و (جزیرە) و (ماردین) و (دۆڵی بۆتان)دا. سەرگەردانییەکی زۆریان هێنا بەسەر یەزیدییە کڵۆڵەکاندا. تەنانەت تا سێ جاریش گۆڕی (شێخ عدی)ی بێ تاوان هەڵدرایەوە و تێکومەکان درا و ئێسکەکانی سووتێنرا!...

بەڕاستی جێی دڵشکان و دڵسووتانە، کە پیاوانی ئایینیی کورد و موسڵمان و پیاوانی فەرمانداریی

کورد بکەونەوە یەک بۆ لەناوبردنی برا کوردەکانی خۆیان کە یەزیدییەکانن!... بێ گومان مێژوو چەندوچوون لەگەڵ (مەلا جەلالەدین محەمەدی عزەدین یوسف) و کوردی ئێران و سەرداری (جزیر)، (عزالدین بەختی) و سەرداری (شەرانش) و، سەردار (توکلی کوردی) و، (سەرداری حصنکیفا) و، (شمس الدینی جەردەقلی)دا ئەکات کە ئەو کوشتارە گەورەیەیان لە یەزیدییەکانی شاخی (هەکاری) کرد و تالانیشیان کردن و گۆڕی شێخ عدیشیان تێک دا... کەی ئایینی پاکی ئیسلام ئەم کەتنەی ڕەوا بینیووە کە ئەمانە کردوویانە؟!. جا ئەم کارەساتە نەنگ و ناپەسندانە بوو کە یەزیدییەکانی لە ئیسلامەکان و ئیسلامەتی ئەکرد بەدوژمن!... ئەوانیش کەوتنە خۆیان و، بەچەندان تۆڵەی خۆیان لە ئیسلامەکان سەندەوە!... دڵیان لە کۆمەڵایەتی ڕەش بوو. جیهانیان لەبەرچاو تاریک بوو!... ئاوات و هاواری هەموو دەمێکیان بووە ئەوەی کە لەسەر ئایینەکەی خۆیان شێرگیرترین و تۆڵەی خۆیشیان بسێنن.

بەم ڕەنگە لە چەرخی نۆهەم و دەهەمی کۆچیدا هێز و دەسەلاتی یەزیدییەکان گەیشتە ئەوپەڕی. هەموو لایەک لێیان ئەترسان. لە (سنجار)دا هەرچی ئایین و ڕێڕەوێک هەبوو لەناویان برد و ئایینی یەزیدییان لەجێ دانا. وەک لەوەپێش پێشانمان دا گەلێک سەردارنشینییان لە گەلێک شوێنانی کوردستانی گەورەدا دامەزراند. بەڵام لەمە بەدواوە کارەساتی گرنگ و سامناک ڕوویان دا، یەزیدییەکانیان خستە نوشوستییەوە. لەم چەرخی دەهەمی کۆچییەدا چەند کوشتارێک کرا لە یەزیدییەکان لە چەند جێیەکدا کە کەوتبوونە (جزیر) و (بۆتان) و (دیاربەکر)ەوە. ئەمە سەرەتای نوشوستیی یەزیدییەکان بوو بەڵام ناوچەی (شێخان) هێشتا هەر لە هێز و گوڕی خۆیدا مابووەوە و پەرەی ئەسەند. بەشێکی گەورەی (خاکی بادینان)ی گرتەوە. (سەرداری شێخان)یش هەردوو دەسەلاتی جیهانی و ئایینیی لە چنگ خۆیدا کۆکردبووەوە. فەرمانڕەوایی (عوسمانی) هیچ دەسەلاتێکی بەسەریاندا نەبوو. تەنانەت لە سالی (١٢٠٠)ی کۆچیدا سەرداری موسڵ (حاجی عبدالباقی پاشای جلیلی) بەلەشکرێکی هەزار کەسییەوە هورووژمی بردە سەر چل ماڵی یەزیدی لە هۆزی (دەنادیە). کەچی (تەمرئاغای یەزیدی) لەگەڵ پێنج سواردا لە پەنایەکدا خۆی بۆ بۆ سەدان، لە ناکاوێکا کە ئەوان خەریکی ڕاووڕووت بوون پەلاماری دان سەرداری مووسڵ و براکەی و سەد سەربازی لێ کوشتن و ئەو لەشکرە گەورەیەیشی شکاند و کەلوپەلی جەنگ و خواردەمەنیشی لێ داگیرکردن! سەیر ئەوەیە، پیاوخراپەکانی شاری مووسڵیش پڕیان دایە ئەو لەشکرە شکاوەی موسڵمانانە؛ لێیان کوشتن و لێیان ڕووت کردنەوە و تالانی دیهانە موسڵمانەکانیشیان کرد و بەندییەکانیشیان لە زیندانی مووسڵ بەردا!...

لە سالی (١٢٠٥)ی کۆچیدا بەیارمەتی و داو نانەوەی ئەم (تەمر ئاغا)یەوە، سەرداری بادینان (ئیسماعیل پاشا) لە پایتەختەکەی خۆیەوە؛ کە (ئامێد)ی بۆ هاتە خوارەوە و لە ماڵی (ئەمر ئاغا)دا سەرداری شێخان (چۆلۆ بەگ) و چەند خزمێکی بەفێڵ کوشت. (خەنجەر بەگ)ی لە جێی ئەو کرد بەسەرداری شێخان. پاش سالێک ئەمیشی لابرد و (حەسەن بەگ کوڕی چولو بەگ)ی کرد بەسەرداری (شێخان). جا ئەم (حەسەن بەگ)ە پیاوێکی فڕوفێڵ باز بوو، لە سەردەمی ئەودا نێوانی یەزیدییەکان و کوردەکانی ناوچەی (مزووری) تێک چوو. کوردەکانی بەریەست کرد کە نەیەنە ناو دەشتەوە، بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانیان. لەسەر ئەوە هۆزی (ئەلکوشی) کە ئەو ساکە زۆر بەهێز بوو، هورووژمی بردە سەر

یەزیدییەکان لە گوندی (کابارە)دا و سەد کەسێکی لێ کوشتن و گۆڕی شێخ (عدی)یشی لێ داگیرکردن و ڕێی بەست لە هەموو کەسێک کە بێنە سەر ئەم گۆڕە. لە پاش هەشت مانگ یەزیدییەکان و موسڵمانە کوردەکان ئاشتبوونەوە و گۆڕەکەیان لێ سەندنەوە.

لە ساڵی (١٢١٤)ی کۆچیدا فەرمانڕەوایی عوسمانی کەوتە جووڵە جووڵ. بەلەشکرێکی گەورە و چەند هۆزێکی عەرەبەوە هورووژمی بردە سەر یەزیدییەکان. سەرداری شێخان (حەسەن بەگ) بەخۆی و خێزانەوە ڕای کرد بۆ ناو شاخ. لەشکری موسڵمانەکان پانزە دێیەکیان تاڵان کرد؛ ئافرەت و منداڵەکانیان بردن بۆ فرۆشتن بەموسڵییەکان چل و پێنج کەسیشیان لێ کوشتن و سەرەکانیان ناردن بۆ (بەغداد)!.

لە ساڵی (١٢٢٢)ی کۆچیدا سەرداری مووسڵ (نوعمان پاشای جەلیلی) کوشتاری لە یەزیدییەکان کرد و سەرکێشییەکەیانی دامرکاندەوە!. سەیر ئەمەیە (سەرداری بەغدا)، لەژێرەوە هانەی (سەرداری شێخان)ی ئەدا کە ئاژاوە بنێتەوە لە خاکی (مووسڵ)دا، بۆ ئەوەی (سەرداری مووسڵ)ی پێ پیاو خراپ بێ!. بەڵام (سەرداری شێخان) بەگوێی نەکرد. کە (عەبدی بەگ)ی برای دەستی دایە پیاوخراپی دەری کرد. کەچی (زوبێر پاشا)ی سەرداری (ئامێدی) ئەو (عەبدی بەگ)ە دز و تاڵانکەرەی بانگ کردە لای خۆی و پەنای دایە. هەر بۆ ئەمەی (سەرداری مووسڵ) تەنگەتاو بکات!...

تا بەم ڕەنگەیش بوو، کارگێڕیی ئەو سەردار و سەرکردە موسڵمانانە کە کەتنەکە خۆیان ئەیانکرد و کەچی ئەو یەزیدییە کڵۆڵانەیان پێ پیاو خراپ ئەکرد و بەکوشت ئەدا! هەر ئەمانەیش بوون کە خۆیان وا ئەنواند ئایینی ئیسلام ئەپارێزن، بۆیەکا کوشتار لە یەزیدییەکان ئەکەن! کەچی لە ڕاستیدا بۆ تاڵانی سامان و فڕاندنی کچان و ژنانی جوان ئەو شەڕانەیان هەڵ ئەگیرساند!. لە ناوەڕاستی چەرخی سیانزەهەمی کۆچیدا کارەساتی گەورە و سامناک بەسەر یەزیدییەکاندا هات. (محەمەد ڕەشی پاشا) و (حافظ پاشا) کە لە کاربەدەستانی (عوسمانی) بوون، کوشتارێکیان کرد لە یەزیدییەکانی ناوچەی (شنگار)، نزیکەی سێ بەشی ژمارە سەریان لێ کوشتن. (محەمەد پاشای ڕەواندزی)یش کە سەرداری فەرمانڕەوایی (سۆران) بوو کوشتارێکی یەجگار گەورەی لە یەزیدییەکانی ناوچەی (شێخان) کرد. لەم شەڕەیشدا دیسان دەستی پیاوانی ئایینیی خراپی تیا بوو. (مەلا یەحیا مزوری) لەسەر کوشتنی (عەلی ئاغای باڵتە) کە سەرۆکی ئەلکوشییەکان بوو لەلایەن سەرداری شێخان (عەلی بەگ)ەوە بەنامەردیی کوژرا و بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئامۆزاکەی خۆی پەنای بردە بەر (سەرداری بەغدا) ئینجا بەر (سەرداری ڕەواندز). هانەی دان کە هەڵکوتنە سەر یەزیدییەکان. (مەلا محەمەدی خەتێی ڕەواندزی)یش بڕیاری دەرکرد بۆ کوشتنی یەزیدییەکان. (محەمەد پاشای گەورە) دڵ ڕەقانە لە سەد هەزار یەزیدی لە ئافرەت و منداڵ بەولاوە تێکڕا کەسی لێ نەهێشتنەوە نەیانکوژێ. ئەمە بێجگە لە تاڵانکردن و بەدیلگرتنی ئافرەت و منداڵانیان بۆ فرۆشتنیان لە بازێڕەکانی خاکی سۆراندا. ئەم کەتنە گەورەیەی کە (محەمەد پاشای ڕەواندزی) کردی بەرامبەر بەیەزیدییەکان لە ساڵی (١٨٣٢)ی پاش زاییندا، ئازار و ئێشی لە دڵی هیچ کوردێکی دڵسۆز دەرناچێ. ئەو کە ئەم جەنگە سامناکەی بەناوی ئایینی ئیسلامەوە کرد، لە ڕاستیدا نەبۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی (عەلی ئاغای ئەلکوشی) بوو، نەبۆ پاراستنی ئایینی ئیسلام بوو، (مەلا یەحیا مزوری) لە پاش ئەمەی پەنای بردە بەر (ئیسماعیل پاشا)ی سەرداری

(ئامێدی) و ئەمیش دەستی نا بەڕوویەوە کە بەباشی نازانی کوشتار لە یەزیدییەکان بکات، توانی دەمی (محەمەد پاشا ڕەواندزی) چەوور بکات کە ئەگەر لەم کارەیدا سەرکەوت ئەتوانێ خاکی بادینانیش لە (ئیسماعیل پاشا) داگیر بکات... جا پەلامارە دڵ ڕەقانەکەی (محەمەد پاشا) بۆ سەر یەزیدییەکان هۆیەکەی چاوبرسێتی و گیانی داگیرکاریی بوو، نەک ئیسلامەتی و دادپەروەریی!. پاش ئەم کەتنە هەڵیکوتایە سەر (ئامێدی)یش داگیری کرد بەڵام خوایش کە هەرگیز لە زۆرداریی بێ دەنگ نابێ نەیهێشت زۆر بەکامەرانییەوە بمێنێتەوە، تۆڵەی خوێنی ئەم هەموو کوردە بێ تاوانانەی لێ کردەوە کە لە کوردی موسڵمان و لە کوردی یەزیدی بوون. تووشی جەنگ و هێرشبردن و داونانەوە و ناپاکیی تورکەکانی عوسمانی بوو، دیسانەوە بەتەڵەکەبازییەکی (مەلا محەمەدی خەتی)وە فریبوی خوارد و خۆی دا بەدەست لەشکری تورکەوە و، نێرڕایە ئەستەمۆڵ و گەڕایەوە بۆ جێی خۆی، بەڵام لە ڕێدا تورکەکان بەنامەردیی کوشتیان. بەم ڕەنگە هەروەک سەردارنشینییەکی لە (ئامێدی)دا سەرەنگرێ کرد، سەردارنشینییەکەی خۆیشی سەرنگرێ کرا. (عەلی بەگ)ی سەرداری یەزیدییەکانیش سزای نامەردیی و ناپاکیی خۆی لە خوا وەرگرت، خاوەن تۆڵەکان لە شاخەکاندا دۆزییانەوە بەفەرمانی سەرداری مووسڵ (ئینجە بایر قدار محەمەد پاشا) کوژرا. یەزیدییەکانیش کە ئەم کارەساتە پڕ ئازار و هاوارەیان بەسەر هات، لە ڕووی زۆرداریی و ناشێتی و لەخۆبایی بوونی خۆیانەوە بوو. ئەگینا ئەوان کە ئەیانزانی موسڵمانەکان بەعەرەب و تورک و کوردیانەوە بەسەردار و مەلایانەوە لە شوێن سەریان ئەگەڕێن، چۆن بەڕەوایان زانی بەنامەردیی سەرەک هۆزێکی موسڵمان کە میوانی خۆیان بوو، بەو شێوە ناشیرینە بیکوژن؟!.

دوای ماوەیەک کە چەند جەنگاوەرێکیان لە دەست (محەمەد پاشا) ڕزگاریان بووبوو گەڕانەوە نیشتمانەکەی خۆیان. تازە پەییان بەم ڕاستییە بردبوو کە لە سەرەوە دەرمانخست. بەڵام لە پاش چی؟! لە پاش ئەوەی کە کۆستیان کەوتبوو، برستیان بڕابوو، ماڵیان کاول بووبوو، لە تەوقەسەری گەورەیشیانەوە کەوتبوونە خوارەوە بۆ بنی نوشوستی. بەپێی ئەو پێڕەوییەی کە فەرمانڕەوایی (عوسمانی) لە سەری ئەڕۆیشت سەردار نوشینییەکانی کوردستان یەک لە دوای یەک لەناو بران. بەڵام لە دوای ماوەیەک سەردەمێکی ئاسایش و ئارام و بیروباوەڕێکی دادپەروەریی و دیموکراتی هاتە ناوەوە. بەفەرمانی (سوڵتان عەبدولحەمید)ی (عوسمانی) بوو کە ئەم بارە گۆڕرا بوو جا لەم سەردەمەدا یەزیدییەکان پشوویەکیان دا. ئەو (عەلی بەگ)ەی کە کوشتیان کوڕێکی هەبوو ناوی (حوسێن بەگ) بوو. (جاسم بەگ)ی خزمی؛ سەردارنشینییەکەی لێ داگیر کرد. بەڵام ئەمیش کە گەورەبوو، لە (جاسم بەگ) هەڵگەڕایەوە و کوشتی، (شێخ گوندور)ی پیاویشی کە یارمەتیی دابوو لە کوشتنی (جاسم بەگ)دا لەجیاتی ئەوەی چاکەی بداتەوە، کوشتی!... سەردارەکانی شێخان هێز و دەسەڵاتەکەیان بۆ گەڕایەوە. لە سەردەمی ئەم (حوسێن بەگ)ەدا ئاژاوە کەوتە ناو شێخانەوە، هەرچەندە کە چووبووە (ئەستەمۆڵ)، خونکاری تورک (سلطان عبدالعزیز) ڕووی دابوو بەو و خۆشەویستی خۆی بەرامبەری پیشان دابوو، بەڵام کە گەڕایەوە شێخان گیرا و سێ ساڵ خرایە زیندانەوە حوسێن بەگ پیر بووبوو. گرتنەکەیشی درێژەی زۆر کێشابوو. مناڵەکانی لە نەهاتنە دەرەوەی لە بەندیخانە وەڕس بووبوون. کاتێک

زانرا کوڕه گەورەکەیش (هادی بەگ) لەگەڵ (حوسێن بەگ)ی برای دا ڕێککەوت و سەردارێتیی خۆی ئاشکرا کرد. سەنجەقەکان و شوێنە ئایینییەکانی گرتە دەست خۆی. پاش ئەوە دەستی کرد بەباریوو کۆکردنەوە. خێزانی سەردارێتییەکە ئەمەیان پێ ناخۆش بوو. (عەبدی بەگ)ی مامی بۆ هاتە مەیدان. هەروەها (سلێمان بەگ) و (عەلی بەگ) کە هەردووکیان کوڕی (حوسێن بەگ) بوون و برای خۆی بوون لێی ڕاپەڕین. (هادی بەگ) و (حوسێن بەگ) و چەند دەس و پێوەندێکیان لە گوندی (خەتارە)دا کوژران. شوێنە ئایینییەکان و سەنجەقەکانیان لێ سێنرایەوە.

ئەم کارەساتە ناخۆشانەیش ئەوەمان بۆ دەرئەخەن کە ئەم سەردارە یەزیدییانە، لەبەر گیانی زۆرداریی خۆیان و خۆپەرستیی خۆیان، بەم هەموو سەرگەردانییەوە کە بەسەریاندا هاتووە ژێر نەبوون و هۆشیان نەهاتۆتەوە بەر خۆیان. تا لە دەستیان هاتووە، خراپەیان کردووە، تەنانەت لە خێزانی خۆیشیان نەپەرمووەتەوە!. لە ڕاستیدا ئەم دەردە هەر هی یەزیدییەکانی برامان نییە. ئەم دەردە، دەردی هەموو کوردەوارییە لەبەر ئەوە تا خوێندنەوارییەکی ڕاستەقینە لەناوماندا جێ گیر نەبێ و، خوا ناسییەکی تەواو لە دڵماندا بنج بەست نەبێ، نیشتمان پەروەریی ڕاستەقینە لە ئێمە ناوەشێتەوە و هەروا بەسەرگەردانی و ماڵوێرانییەوە هەروا بەکزیی و کەساسییەوە ئەمێنێتەوە!... ئەمە تا دەردی هۆزایەتی و ناشێتی!. سەردارێتیی (حوسێن بەگ) چڵ ساڵێکی خایاند. بەسایەی زرنگی و دووربینی و کاردروستی و کارامەیی خۆیەوە توانی نەتەوەکەی خۆی کۆ بکاتەوە و سەرلەنوێ بیانهێنێتەوە کایەوە.

دوای مردنی (حوسێن بەگ)، کوڕەکەی چووە سەر تەخت ناوی (میرزا بەگ) بوو. لە سەردەمی ئەمدا (فەریق عومەر وەهبی پاشا)ی تورکی (عوسمانی) سەرگەردانییەکی گەورەی بەسەر یەزیدییەکاندا هێنا چ لە شنگاردا چ لە (شێخان)دا کوشتارێکی زۆری لێ کردن. ئەیویست بەزۆر بیانکات بەئیسلام!... (میرزا بەگ) و (بەدیع بەگ)ی برای بەناچاریی ئیسلام بوون!... بەڵام ئیسلامەتییەکەیان لە سێ هەفتە زۆرتری نەخایاند!. پاشگەزبوونەوە بۆ سەر ئایینەکەی خۆیان!. (میرزا بەگ) لە ساڵی (١٨٩٤)ی پا. ز.دا مرد (عەلی بەگ)ی برای چووە جێگای. حەڤدە ساڵی خشت بەسەرداریی مایەوە. بەڵام سەردەمێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ خۆی و بۆ یەزیدییەکان. پڕ بوو لە تەنگانە و سەرگەردانی. پڕ بوو لە ئازار و هاوار. نەتەوەکە دەستیان کورت بووبوو. بەرهەمیان کەم بووبوو. بێ دەسەڵات بووبوون کەچی فەرمانڕەوایی (عوسمانی)یش گەڕیان پێ ئەکردن و تەنگەتاویان ئەکردن و ڕیسوایان ئەکردن. هەر بۆ ئەمەی پووڵ و پارەیان لە دەست بپچڕن. بێجگە لەوە (فەرمانڕەوایی عوسمانی) پێی لێ نابوونە کەوش، ئەیگوت ئەبێ سەربازم بدەنێ. نەتەوەی یەزیدیش ئەمەی بۆ دەست نەئەدا بەپێچەوانەی ئایینەکەی خۆی دائەنا. سەرداری یەزیدیش ویستی بەبەرتیلی گەورە گەورە سەرکردە تورکەکان دەمکوت بکات. بەڵام بۆی نەچووە سەر. لە ساڵی (١٩١٣)ی پا. ز.دا ئەم سەردارە یەزیدییەش کوژرا. لەو کاتەدا لە پێخەفدابوو. (میان خاتوون)ی ژنیشی لە پاڵیدا نوستبوو، (سەعید بەگ)ی کوڕی هاتە سەر تەخت کە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو. (میان خاتوون) چاودێریی ئەکرد بەڵام لە ڕەوشتا بەدڵی یەزیدییەکان نەبوو. خووی دابووە بەزموڕەزم تیرەی یەزیدی چەند جارێک لە (شنگار) و لە (شێخان)دا لێی ڕاست بوونەوە. ویستیان لە تەخت بیهێننە خوارەوە، بەڵام نەیانتوانی. لە ساڵی (١٩٤٤)ی پا. ز.دا مرد. (تەحسین بەگ)ی کوڕی هاتە

سەر تەخت. تەمەنی سیانزە ساڵ بوو. بەڵام ئەمیش لەژێر سەرپەرشتیی (میان خاتوون)دا کاری ئەبرد بەڕێوە. ئێستاکەیش ماوە. لاوێکی نەرم و نیان و لەسەرخۆیە. چونکە لاوە هیوای چاکیی زۆر لێ ئەکرێ.

## مێژووی یەزیدییەکان لە شنگاردا

شنگار یاخود (سنجار)، شارێکی گەورە و زۆر کۆنی کوردە. چ لە ڕووی مێژووەوە؛ چ لە ڕووی سەختیی جێگاوە، چ لە ڕووی ئاو و بای سازگار و چاوئەندازی جوان و مێرگ و مێرغوازەوە، چ لە ڕووی پیت و بەرهەمی زەوییەکەیەوە. شاری شنگاریش و شاخی شنگاریش بایەخ و نرخ و گرنگییەکی تەواوی هەیە. گەلێک پیاوی گەورە گەورەی لە کوڕی زرنگکاریی و زانست و وێژە و جەنگدا تیا پەیدا بووە. هەروەها گەلێک کارەساتی خوێنینیشی تیا ڕوویداوە. گەلێک جار گەشەیان کردووە و ئاوەدانی و پێشکەوتنیان تیا دەرکەوتووە؛ گەلێک جاریش تووشی سەرگەردانی و کاولبوون هاتوون.

کاتێ کە (تەیووری لەنگ) بەخۆی و لەشکرە بێ شومارەکەیەوە هورووژمی هێنایە سەر خاکەکانی ئیسلام؛ خاکی کوردستانیش یەکێک بوو لەو خاکانەی کە لە ژێر پێی لەشکرە زۆرداره خوێنڕێژەکەی ئەودا پلیشایەوە. لەگەڵ ئەوەیشا کوردەکان تا دوا هەناسەیان بەرەنگاریی لەشکرەکەی (تەیووری لەنگ)یان کرد و لە زۆر شەڕیشدا سەریان پێ دانەواند. ئەوانیش کە بۆیان نەئەکرا بەرەنگاریی بکەن، لە دەستی هەڵاتن، تا بتوانن لە شوێنێکی سەخت تردا خۆیان بپارێزن و بەرەنگاریی بکەن. شاری شنگاریش کە ئەو ساکە (٣٥٠٠٠) ماڵی تیابوو، بەسایەی زۆرداریی و دڵڕەقیی لەشکرەکەی (تەیووری لەنگ)ەوە سەرەوژێر بوو، کاول بوو، کەسی تیا نەما...!

جا لەم کاتەدا کە ساڵی (٦٩٧)ی کۆچی بوو، بەپێی سەرگوروشتەی دەمی ئەم و ئەو. چوارسەد خێزانێک لە یەزیدییەکانی (شێخان) پەنایان بردە بەر شاخی شنگار. لە (جزیر) و (دیاربەکر) و (بیدلیس) و دەشتی (دەجلە) و جێگایانی تریشەوە گەلێک لە یەزیدییەکانیان دواکەوت. تا هەموویان لەو شاخە سەختە پوختە و ڕەنگینەدا جێ گیربوون. بەم ڕەنگە بارێ شنگار لە پڕ گۆڕا و زۆریشی نەخایاند بۆ ئەمەی کە نیشتەنییەکانی شاخی شنگار بەگاور و موسڵمانەکانیانەوە، بەزۆریی و بەخواهیش بچنە سەر ئایینی یەزیدی. فەرمانڕەوایی (عوسمانی)یش هەر بەناو گەورەی ئەم شاخە بوو. هیچ ئاگای لە خۆی نەبوو. کە وریای ئەم کارساتە گرنگەبێ، ڕوو نەدا. تا وریابووەوە ئەمان کاری خۆیان تەواو کردبوو. یەزیدییەکان هەر کەسێکیان لە شاخەکەدا ئەدیی ئەیان کرد بەیەزیدی. هەچی نەبوایە بەیەزیدی دەریان ئەپەڕاند. بەڵام بەمەیش وازیان نەهێنا. پەلیان هاوێشت بۆ موسڵمانەکانی دراوسێی خۆیان. تەنگەتاویان کردن و کوشتاریان لێ کردن تا بەسەر زۆربەیاندا زاڵ بوون. زۆر لەم هۆزانە عەرەب نەژاد بوون. کاریان تێ کردن و بوون بەیەزیدی. هەرچی نەیشی توانی بەرگەیان بگرێ، یاخود ببێ بەیەزیدی ڕەوی کرد لە دەستیان. تا یەک دوو ڕۆژ ڕێگایش بەبێ دوور لە شاخی شنگار دەسەڵاتیان وەشاند. دێهاتیان وێران کرد. دانیشتووەکانیان تەفروتونا کرد. هێرش بردن و پەلاماردانیان گەیشتە (دەجلە) و (خابوور). کاروانەکانیان ڕووت ئەکردەوە و ئاسایشیان تێک ئەدا.

ئەمەیش بۆ هۆزە موسڵمانەکان دەستی نەئەدا، ئارامیان لەوە بەولاوە نەگرت. سەردارە کوردە بەهێزەکانی نەیانتوانی لەم کارە بێ دەنگ بێننەوە، بەلەشکری گەورە گەورە هورووژمیان بردە سەریان. کوشتارێکی زۆریان لێ کردن.

یەکێک لەو سەردارە کوردانە (عەلی سەیدی بەگ) بوو کە لە خاکی (بۆتان)ەوە هاتبووە سەریان. ئەوساکە ساڵی (٩٩٣)ی کۆچی بوو. شەش کەسی لێ کوشتن، ژمارەیەکی زۆریشی لە ئافرەت و کوڕان لێ بەدیل گرتن و بردنی بۆ فرۆشتن ئەم کردەوە نەنگە بەباهۆی بڕیاردانی مەلاکانەوە بوو. ئەگینا لە هۆزایەتیدا ئافرەت و کوڕ بردن و فرۆشتن لە کوردەواریی ناوەشێتەوە. یەزیدییەکان هەرگیز لە تۆڵەسەندنەوەی خۆیان وازیان لە موسڵمانەکان نەئەهێنا لە ڕووی ئەم ئافرەت بردن و فرۆشتنەوە بوو، کە برینێک بوو ئاسۆری لە دڵیان هەرگیز دەرنەئەچوو. کەچی لە هەموو مێژووی یەزیدیدا شتی وا ڕووی نەداوە کە دڕندەییەکی وا بکەن دەربارەی ئافرەتانی موسڵمانەکان!.

لە ساڵی (١٠٤٨)ی کۆچیدا (مەلیک ئەحمەد پاشا)ی تورکی (عوسمانی)یش هێرشی بردە سەریان. لە (دیاربەکر)ەوە هات سیانزە هەزار کەسی لە یەزیدییەکان کوشت. دوانزە هەزار ئافرەت و کوڕیشی لێ گرتن بەدیل و بردنی بۆ فرۆشتن. دیارە ئەمەیش لە زاوای (سوڵتان مرادی چوارەم) و نەوەی (جەنگیز خان) و (هۆلاکۆ)وە دوور نەبوو کەشتی وا دڕندانە و نەنگ و ناپەسەندی لێ بوەشێتەوە.

لە ساڵی (١١١٩)ی کۆچیدا: سەرکردە کوردەکانی ڕەواندز بەکۆمەڵێکی گەورەوە لە هۆزەکانی خۆیان و زێبار هێرشیان بردە سەر یەزیدییەکانی (شنگار)، کوشتاریان کرد و دێهاتیان سووتاند و بەخۆیان و سامانی تالانیشەوە گەڕانەوە!. ئەمەیش دیسانەوە لە هاندانی پیاوانی ئایینەوە ڕووی دا. ئەگینا ئەم کوردانەی ڕەواندز چ پەیوەندییەکیان هەبوو بەم یەزیدییە کلۆلانەوە!.

لە ساڵی (١١٢٧)ی کۆچیدا. (حەسەن پاشا)ی سەرکردەی (بەغدا) هێرشی بردە سەریان. کوشتارێکی زۆری لێ کردن، تالانێکی زۆری لێ بردن ژمارەیەکی زۆریشی لە ئافرەت و منداڵانیان گرت بەدیل و بردنی بۆ فرۆشتن. تەنانەت لەشکرەکەی (حەسەن پاشا) داوێن پیسیشیان کرد لەگەڵ ئافرەتە دیلەکاندا!... سەیر ئەوەیە نووسەران و بوێژانی موسڵ و بەغداد بەم سەرکەوتنە نەنگ و ناپەسەندەیانەدا هەڵ ئەدا. ئافەرینیان لەگەڵ هەندێ پیاوانی ئایینیدا لە (حەسەن پاشا) ئەکرد!...

جار ئەگەر ئەمە دەروونی موسڵمانەکان بێ و ڕەوای شتی وا نەنگ و ناپەسەند بدات، ئیتر گلەیی لە یەزیدییەکان بۆ چ بکرێ کە خۆیان بەدێو پەرستیان دائەنێن؟!.

ژیریی و تێگەشتوویی فەرمانڕەوایی (عوسمانی)یش بەم ڕەنگە بوو، لە پاش ئەم هەموو کەتن و کوشتارە گەورەیە، لەجیاتی چارەکردنی گیروگرفتەکە و ڕاست کردنەوەی باری زرنگکاریی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی نەتەوەی یەزیدی، لە جیاتی هەموو چاکە و فەرێک کە دەربارەیان بکات کاروباری خاکی شنگاری دا بەدەست سەرەک هۆزێکی عەرەبی (طی)، کە خۆی لە هەموو کەس پتر پێویستی بەخۆ پاراستن بوو؟!. ئا ئەمەیش بوو کردەوەی (خاقان البرین و البحرین).

لە ساڵی (١١٦٧)ی کۆچیدا، سەرداری بەغدا (سلێمان پاشا) هورووژمی هێنا بەسەر یەزیدییەکان

یەزیدییەکان کە لەسەر بەڵێنی ئەو خۆیان دا بەدەستەوە نامەردانە دەستی لێ کردنەوە. هەزار پیاوی لێ کوشتن و ئافرەتە جوانەکانیشی برد بۆ فرۆشتن. (خاقان البرین والبحرین)یش ئەم کردەوەیەی (سلێمان پاشا)ی ئەمەندە پێ جوان بوو کەوڵێکی ناوازەی بەدیاریی بۆ ناردا... یەزیدییەکان لە گۆرانییە نەتەوەکانیاندا ئێستەیش ئەم مەرگەساتە نەنگ و ناڕەوایەی تورکەکانی (عوسمانی) ئەگێڕنەوە... سەرداری مووسڵ (ئەمین پاشای جەلیلی)یش لەم هەڵمەتەدا یارمەتیی تورکەکانی دا!...

هەروەها لە ساڵی (١١٨١)ی کۆچیدا، لەلایەن (سلێمان پاشا)ی سەرداری مووسڵەوە هێرش برایە سەریان. لە پاش کوشتن و تالان و بەدیلگرتنی یەزیدییەکان گەڕانەوە.

لە ساڵی (١١٨٧)ی کۆچیدا، سەرداری مووسڵ (سلێمان پاشا) هەڵیکوتایەوە سەریان، مەڕەکانی تالان کردن، سێ کەسی لێ گرتن سێ کوڕیشی لێ داگیر کردن!.

لە ساڵی (١١٩٣)ی کۆچیدا (محەمەد پاشا)ی سەرکردەی لەشکری مووسڵ هەڵیکوتایە سەریان، شینایییەکانی خواردن و پێنج کەسی لێ گرتن و گەڕایەوە لای سلێمان پاشای جەلیلی برای! ئەمانە چەند نموونەیەکی ئەو هەڵمەتانە بوون کە برانە سەر یەزیدییەکان. لە ساڵەکانی (١٢٠٦) و (١٢٠٧) و (١٢٠٨) و (١٢٠٩) و (١٢١٥) و (١٢١٧) و (١٢١٨) و (١٢٢٤) و (١٢٥١) و (١٢٥٢) و (١٢٥٤) و (١٢٦٠) و (١٢٦٣)ی کۆچیشدا لە (بەغدا) یان لە (مووسڵ)ەوە یان لە شوێنانی ترەوە هەڵمەت ئەبرایە سەر یەزیدییەکان و ئەوپەڕی دڕندەییان لەگەڵدا ئەنوێنرا. لەم شەڕەی دواییەیاندا (طیار پاشا)ی تورک بەخۆی و هەزار سەربازەکەیەوە هەڵیکوتایە سەر یەزیدییەکانی شەنگار. بەڵام کە زانیی هەزار یەزیدییەکان لە دەربەندی (پیرنی)دا دووسەد سەربازی لێ کوشتن؛ لە ترسی شکان و ئابڕووچوون، دادی بردە بە یەزیدییەکان، کە داڵای بدەن و شەڕ بوەستێنن تا سەربازەکانی ئەنێژێ و ئەگەڕێتەوە (مووسڵ). ئەوانیش ڕێیان دا!. ئیتر تا پەنجا ساڵی تر شەڕ هەڵنەگیرسایەوە بەم ڕەنگە لەگەڵ ئەم هەموو کارەساتە سامناک و گرنگانەدا کە بەسەریاندا هات، یەزیدییەکان کۆڵیان نەدا و، ورەیان بەرنەدا. بەڵام فەرمانڕەوایی (عوسمانی) کۆڵی دا و هۆشی هاتەوە سەرخۆی. ئیتر ئەیویست بەشێوەیەکی زرنگانە و دادپەروەرانە لەگەڵ یەزیدییەکاندا بجووڵێتەوە!. لەمەدا دەستی ئینگلیزەکانی تیا هەبوو ئەوان بەزەییبیان بەیەزیدییەکاندا ئەهاتەوە. لای (سوڵتانی عوسمانی) تکایان بۆ ئەکردن کە ئیتر کردەوەی ناڕەوا و نامەردانەیان لەگەڵ نەکرێ!. ئەو دەمە سەردەمی (سوڵتان عەبدولحەمید) بوو کە ئەیویست لەگەڵ خاوەن دەسەڵات و هێزدارە سەرکێشەکاندا هۆش بەکار بهێنرێ، نەک هێزا... بەم ڕەنگە یەزیدییەکان کەوتنە سرەوت و ئارامەوە؛ کەوتنە ئاسایشەوە ئەمە لەلایەن فەرمانڕەواییەوە. بەڵام لە تۆڵەسەندنی خۆیان وازیان نەئەهێنا. بەڵام لەو هۆزە موسڵمانانەی، کە هەرچەندە لەگەڵیاندا سوێند خوار بوون کە دەست لەیەکتری نەوەشێنن، کەچی هەرچەند فەرمانڕەوایی هەڵی ئەکوتایە سەریان ئەوان گفتوگۆ و بەڵێنی خۆیان ئەشکاند، یارمەتیی فەرمانڕەواییان ئەدا بۆ شپرزەکردنی یەزیدییەکان. شەڕ و شۆڕەکانی ئەم هۆزانە لەگەڵ یەزیدییەکاندا؛ دڕندەییبیان زۆر تیا ئەنوێنرا. بەڵام هیچ لایەکیان دەستیان بۆ ئافرەت نەئەبرد وەک سەرکردە و سەردارەکانی فەرمانڕەوایی یاخود سەردارنشینە کوردەکان. یەزیدییەکان

لە تۆڵەسەندنەوەدا، یەجگار دڵ ڕەقییان ئەنواند. جاری وا هەبوو دڕندەیییەکی لە ئەندازە بەدەریان ئەنواند بەرامبەر دوژمنەکانیان. ئەم ڕەوشتەیان، ترس و لەرزێکی زۆری خستبووە دڵی هۆزە ئیسلامییەکانی دراوسێیانەوە. فەرمانبەرانی فەرمانڕەوایی عوسمانی لە ترساندا، هەزار کارەساتی سەرکێشی و ئاژاوە لە یەزیدییەکانەوە ڕووی بدایە خۆیان تێ نەئەگەیاند. بەڕاستی ئەو ناوچەیە تەواو ناخۆش بووبوو. گوزەرانیش تەواو تیا سەخت بووبوو. ئەوانیش ئۆباڵی بەئەستۆی فەرمانڕەوایی عوسمانی بوو. چونکە فەرمانبەرەکانی زۆبەیان دز و درۆزن و زۆردار بوون. بۆ کەڵکی گشتی تێ ئەکۆشان. بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان تێ ئەکۆشان. ئەم هەرا و کوشتارانەیش کە پەیدا ئەبوون هەمووی لە ڕووی بەدکاریی ئەو فەرمانبەرانەوە بوو.

پێش ئەمەی عێراق لە دەست فەرمانڕەوایی (عوسمانی) دەربچێت لە ١٠/٩/١٩١٨دا هێرشێکی تری بردەوە سەر یەزیدییەکان. هەرچی کاری خراپ بوو دەربارەی یەزیدییەکان کردیان. بەڵام کاتێک زانرا لە ١٣/١١/١٩١٨دا فەرمانڕەوایی (عوسمانی)، کۆچی کرد بۆ گۆڕی تا سەری خۆی. چونکە شاری (مووسڵ) کەوتە دەست ئینگلیزەکان، کە نەک هەر عێراقیان لە چنگ دەرهێنا هەموو خاکە ئیسلامییەکانی تریشیان لە دەست دەرهێنا. بەڵێ یاسای خوایی کاری خۆی کرد. هەر فەرمانڕەواییەک ناپاک بێ لەگەڵ نەتەوەدا، کەمتەرخەم بێ لەگەڵ گەلدا، توانای پاراستنی دادپەروەری نەمێنێ لە خاکەکەی خۆیدا، سروشت ماوەی نادا بمێنێتەوە، پەتۆ نابات، زوو ئەتۆپێ!... ئیتر لێرە بەدواوە لە چاو جارانیاندا، یەزیدییەکان یەجگار ماندوویان حەسایەوە. هەرچەندە ناو بەناو شەڕ و ئاژاوە لە شەنگاردا ڕووی ئەدایەوە، بەڵام هیچ جارێک نە لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا نە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عێراقدا ئەو جۆرە کەتن و تاوانانەی پێشوو ڕوویان نەئەدایەوە. لە ساڵەکانی (١٩٥٠ - ١٩٥٨)دا فەرمانڕەوایی عێراق بەتەواوەتی خەمی پێشکەوتنی یەزیدییەکانی ئەخوارد چ لە (شێخان)دا، چ لە (شەنگار)دا. یەزیدییەکانیش بەرامبەر بەو ڕەوشتە نەرم و شیرینەی فەرمانڕەواییە، زۆرتر ئەسازان لەگەڵ فەرمانڕەواییدا زۆرتریش چاک ئەبوون لەگەڵ دراوسێکانیاندا. کاشکی ئەم بارە تا سەر هەر لە پێشکەوتندا بوایە!.

## دواڕۆژی ئاییینی یەزیدی

کەس بەتەواوەتی ئەوە نازانێ کە نووسراوەکانی (جیلوە) و (مصحف ڕەش) لە بنچینەدا چ ناوەڕۆکێکی ناوازە و نایابیان هەبووە. کە بەو ڕەنگە لە ماوەیەکی کەمدا ژمارە سەری پەیڕەوەکانی ئاییینی یەزیدی گەیشتووەتە نزیکەی ملیۆنێک. لەگەڵ ئەم هەموو کوشتار و تاڵان و ڕیسواکردنەیشدا کە بەسەر یەزیدییەکاندا هاتووە لە ماوەی ئەم حەوت سەد ساڵەدا. کەچی هێشتا ئاییینەکەی خۆیان بەرنەداوە و تا یەت پتر لە جاران خۆشیان ئەوێ و نازیشی ئەکێشن و لە پێناویشیا خۆیان بەخت ئەکەن!... ژمارە سەری یەزیدییەکانی ئیمڕۆ هەر بەسەد هەزار کەس دائەنرێ کە لە هەموو لایەکی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە. بەڕاستی جێی داخە کە ئەم نەتەوە کڵۆڵە حەوت سەد ساڵی خشت بێ، خۆشیی ژیانی بەخۆیەوە نەدیبێ، هەموو هاوڕەگەز و هاونیشتمانێکی خۆیشی لەم ماوە درێژەدا دوژمنی بووبێ. لە شەڕ

و کوشتار و تالان و برۆیشدا نەبێ، لە هیچ شتێکی تردا هونەری نەنواندبێ!...

پیاو کە نیشتمانی یەزیدییەکان ئەبینێ، کە کوردستانە، سەری سوڕئەمێنێ کە ئەم خاکە بەهەشتە، بۆ چ وا زۆرداریی و هەژاریی و نەخوێندەواریی و نەخۆشیی تیا بەرجەستەبێ!؟.

چوار سەد ساڵی خشت (تورکەکانی عوسمانی) و (سەردانشینییەکانی کورد) هورووژمیان بردە سەر یەزیدییەکان و لێیان کوشتن و لێیان تالان کردن و کچ و کوڕیان لێ بەدیل گرتن بۆ فرۆشتن، نەیانتوانی یەزیدییەکان لە ئایینی خۆیان وەربگێڕن، نەیانتوانی سەر بەیەزیدییەکان دابنەوێنن، ئەوان کۆڵیان دا، بەڵام یەزیدییەکان کۆڵیان نەدا و لە فاک و فیکی خۆیشیان نەکەوتن!. بەڵام ئەمە پەڵەیەکی ڕیسواییە بەسەر شانی ئەو فەرمانڕەواییانەوە. کە لە باتی ئەمەی چارەی گیروگرفتەکەیان بکەن و کۆمەکییان بکەن لە ڕاستکردنەوەی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و خوێندەوارییان، لە جیاتی ئەمەی گوێ لە سکاڵایان بگرن و دادیان بپرسن، ویستویانە بەزەبری کوتەک و بەزۆری ئاگر و ئاسن بیانهێننە سەر ڕێ، لە کاتێکدا ئەو فەرماندارانە ئەوەیان ئەکرد بەبیانوو کە یەزیدییەکان بێ ئایینن و پێویستە بکرێن و بەئیسلام، خۆیان هەرچی پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە لە دزیی و درۆزنی و زۆرداریی و لە داوێن پیسی، ئەوەیان دەربارەی ئیسلامەکان ئەکرد!. تا باری تەنگانە و سەرگەردانی و ناخۆشی گەیشتە ڕادەیەکی وەها؛ کە بەکلوور لەو یەزیدییە کلۆڵانە کوژرا و بەکلووریش لە موسڵمانەکانی هاوڕەگەز و هاونیشتمانیان کوژرا!...

بەڵێ هۆش و تێگەیشتنی ئەو فەرماندارانە لەم ئەندازەیەدابوو. بۆیەکا گیروگرفتی یەزیدییەکان مایەوە تا ئیمڕۆ هەرچارە نەکرا... بەڵام پێویستە پێیش لەوە بنێین، کە یەزیدییەکان خۆیشیان لە ڕووداوی ئەم مەرگەساتانەدا دەستیان هەیە و تاوانباریشن. هەرچەند دەستیان بووە، تۆڵەی خۆیان بەچەندان لە ئیسلامەکان کردۆتەوە. هەرچەند دەسەڵاتیان بووە، زۆرداریان لە دراوسێکانی خۆیان کردووە. ئەوانیش وەک فەرمانڕەواییەکان. ئەوانیش وەک هۆزەکانی دراوسێیان زۆرداریان کردەوە و، ناشێتیان لە چارەکردنی گیروگرفتەکانیاندا نوواندووە. ئەو سەردەمەیش نە دڵسۆزێک هەبووە، بکەوێتە ناویانەوە و لەسەر شێوەیەکی زانستی و خواناسی و دادپەروەرانە گیروگرفتی ناوەندیان چارە بکات، نە سەرۆکەکانی هیچ لایەکیشیان ئەو هۆشەیان بووە کە بەزەییان بەنەتەوەکانی خۆیاندا بێتەوە و بەربەستێکی ئەو خراپییە بکەن، نە نەتەوەیش ئەوەندە هۆشیار و کارامە بووە کە ڕاست بێتەوە لە هەردوولایان و هەردوولایش ناچار بکات کە سنوورێک بۆ ئاژاوە و شەڕوشۆڕ و کەتن و کوشتنی تالان دابنێن!.

داخەکەم سەردەمێکی تاریک و نووتەک بووە، هەر کەسە خەریکی دامرکاندنەوەی ئالۆشی خۆپەرستیی خۆی بووە، نە لە خوا ترساون و نە خەمی کەسیشیان خواردووە!... ئەنجامی بەوەیش گەیشت کە هەموو خاکەکەمان کاوول و وێران بێ و، ئەو فەرمانڕەوایی و سەردارنشینانەیش یەک لەدوای یەک سەرئەنگری بێن و نەتەوەیش کز و شپرزە و داماو و هەژار و ڕیسوا بێ!.

ئێمەیش ناتوانین ئەوە بزانین کە ئایینی یەزیدی لە دوارۆژدا چۆنی لێ دێ؟ یاخود چی بەسەر دێ؟. هەر ئەوەندە ئەتوانین بڵێین کە پێویستە فەرمانڕەواییەکان، هەریەکەیان یاسایەکی تایبەتی دابنێ بۆ پێشخستنی یەزیدییەکان، بۆ ڕاستکردنەوەی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و خوێندەواریی و

تەندروستییان. بێ ئەمەی دەست لە ئایینەکەیان بدات، یاخود لەسەر ئایینەکەیان چەندوچوونیان لەگەڵدا بکات. ئایین خۆی بەپێی باری زرنگکاریی و ئابووری و خوێندەواریی و مرۆڤ ئەگۆڕێ، یەزیدییەکان زۆربەیان هێشتا لە ژیانێکی کۆچەرایەتی و نیوە نیشتەنیدا ئەژین. یاسای زەویداریی (اقطاعی) تا ئێستا فەرمانڕەوایی بووە بەسەریاندا. نە هونەر و نە پیشەسازیی و نە خوێندەواریی، نە بازاڕ و بازرگانی لە ناویاندا پەیدا نەبووە. هەروا بەساکاریی ماونەتەوە لە ژیاندا، ئەڵێی نموونەی کوردەکانی پێش مێژوون!. جا بۆ ئەمانە لەپێش هەموو شتێکا خوێندنگا پێویستە لەگەڵ پشتگرتنی خوێندەواراندا، بەڵام لە شێوەیەکی وادا کە لە ماوەیەکی چەند ساڵێدا نەخوێندەوارییان تیا نەهێڵرێ. هەروەها کردنەوەی کارگە و کارخانە پێویستە، بۆ ئەمەی بکەونە کارەوە و نانی خۆیان بەجوانی و باشی پەیدا بکەن و وریا ببنەوە. کردنەوەی ڕێگای تەختکراو و، نەخۆشخانە و، دامەزراندنی پرۆژەی ئاو و ئەلەکتریک و کردنەوەی بازاڕ و، دامەزراندنی هاوینەهەوارانیش چاکترین هۆن بۆ پێخستنی ژیانی یەزیدییەکان هەروەها پێویستە دەستگیرۆییش بکرێن لە کشتوکاڵدا. چەند یەزیدییەکان هەست بەدڵ پێ سووتاندن و خۆشەویستی و یارمەتیی فەرمانڕەوایی بکەن ئەوەندە ئامادە ئەبن بۆ دۆستایەتی و چاکەخوازیی لەگەڵ فەرمانڕەوایی و نەتەوەدا. یەزیدییەکانی (قەفقاسیا) ئێستاکە نەخوێندەوارییان تیا نەماوە[1].

بێ کار و فەرمانیان تیا نەماوە، تەنانەت پیاوانی گەورە گەورەیشیان تیا هەڵکەوتوون، کە لەناو دەزگای فەرمانڕەوایی ئەوێدا پایەی بڵندیان هەیە. نە پیر و سەردار و شێخ دەسەڵاتیان ماوە بەسەر نەتەوەدا و نە کۆچەک و گفتوگۆکار. هەر کەسە بەڕەنجی شانی خۆی ئەژی و کەس کەس ناچەوسێنێتەوە و کەسیش خوێنی کەس نامژێ. ئەمیش هۆی ئەوەیە کە فەرمانڕەوایانی ئەو شوێنانە لەسەر بنچینەیەکی زانستی و مرۆڤایەتی و گیروگرفتەکانی ئەو یەزیدییانەیان چارە کردووە. کاشکی فەرمانڕەواییەکانی تریش کە یەزیدییەکان لە خاکیاندان بەم جۆرە ڕەفتاریان لەگەڵ یەزیدییەکاندا بکردایە، ئەوساکە دڵنیا ئەبووین لە دوارۆژی خۆمان کە جارێکی تر ئەو سەرگەردانییانە لە نیشتمانەکەماندا ڕوو نەدەنەوە.

ئایینی ئێستای یەزیدییەکان وەک هی حەوت سەد ساڵ لەمەوپێشیان لەگەڵ ژیانی کۆچەرایەتی و هۆزایەتی و ڕۆژگاری ناهەمواریاندا گونجاوە. بەڵام ئەگەر بێتو هۆی پێشکەوتنیان بۆ ئامادە بکرێ، بەو جۆرەی کە لە سەرەوە پێشمانمان دا؛ ئایینەکەیان خۆی لە خۆیەوە ئەگۆڕێ و ڕاست ئەبێتەوە و ئەسازێ لەگەڵ ژیانێکی پێشکەوتووانەدا. ئیمڕۆ سەردەمی ڕۆشناییە. سەردەمی زانست و هونەر و پیشەسازییە پێویستە گیروگرفتی یەزیدییەکانی برایشمان لەسەر ئەو بنچینە چارە بکەین. ئەگەر بەو ڕەنگەیش چارەمان کرد؛ هەر یەزیدییەکان کەڵکی لێ وەرناگرن. خۆیشمان کەڵکی لێ وەرئەگرین. چونکە یەزیدییەکان ڕەگەزێکی ئازا و توانا و مەردن و ناوچەوان بەرزن. بێ گومان کەڵەکەڵەی وایان تیا هەڵ ئەکەوێ، کە ئەمەندە کەڵکمان پێ ببەخشن؛ سەرمان پێی بەرزبێتەوە!.

---

(١) یەزیدییەکانی قەفقاسیا ژمارە سەریان ئەگاتە ٢٥,٠٠٠ کەس لە ناوچەکانی (تفلیس) و (ئەریڤان) و (ئەلیکساندراپول) و (باکۆ) و (باتوم)دا ئەژین. (ش. ف)

## شۆڕشێک بۆ پێشکەوتن

کە (سەعید بەگی عەلی بەگ) هاتە سەر تەختی سەردایی، تەمەنی دوانزە ساڵ بوو، (میان خاتوون)ی دایکی سەرپەرشتیی کاروباری ئەکرد، جاران کە سەرداری شێخان بمردایە، کێ لە بنەماڵەی سەرداریی بەهێز و توانا بوایە ئەو کەسە بەزۆر خۆی ئەچەسپاند و ئەبوو بەسەردار[1] بەڵام (میان خاتوون) ئەم دەستوورەی تێک دا، بەیارمەتیی فەرمانڕەواییەوە، توانی وا لە سەرداریی بکات، کە لە باوکەوە بمێنێتەوە بۆ کوڕا. ئەمەیش هەموو جارێ بەگران ئەکەوتە سەر (میان خاتوون). ڕەنج و تەقەللایەکی زۆری ئەدا، ئینجا ئەمەی بۆ ئەچووە سەرا... جا لەم کاتەدا چ لە (شێخان)دا چ لە (شنگار)دا، (حوسێن بەگ) و (ئیسماعیل بەگ) کە هەردووکیان لە خێزانی سەردارن، لەسەردار (سەعید بەگ) ڕاستبوونەوە، گەلێک سەرەک هۆز چووە پاڵیانەوە، هەرە گەورەیان (حمۆشرۆ) بوو؛ کە سەرۆکی هۆزی هەژاران (فەقیران) بوو. ئەو ساکە ساڵی ١٩٣١ بوو، فەرمانڕەوایی تەواو بەم هەرا و ئاژاوەیەوە گێژ بووبوو. دوایی لەسەر خواستی شۆڕشگێڕەکان فەرمانڕەوایی ناچارما، لە دەزگای (متصریفی لوای موصل)دا ئەنجوومەنێکی ئایینی لە سەرەکی (بنەماڵە ئایینییەکانی یەزیدی) کە شەش کەس بوون کۆ بکاتەوە (حمۆشرو)یش کە سەرەک هۆزی (فەقیران) بوو، بەناوی نەتەوەوە لەگەڵیاندا کۆ بێتەوە. مەبەسی فەرمانڕەوایی ئەمە بوو کە بەهۆی ئەم (کۆڕە ئایینی)یەوە هەم گیروگرفتی سەردارێتیی (سەعید بەگ) چارە بکات، هەم یاسایەکیشی دابمەزرێنێ بۆ ئەم جۆرە کارانە. کە فەرمانڕەواییش بتوانێ بەپێی ئەو یاسایە بڕیار لەسەر دامەزراندنی سەرداری یەزیدی بدات؛ هەروەها بۆ لەوە دوایش هەرچی کاروبارێکی ئایینی و هۆزایەتیی یەزیدییەکان بێتە کایەوە، بەپێی ئەو یاسایە بەڕێوەببرێ و گیروگرفتەکانیشی چارە بکرێن. ئەمیش بۆ ئەمەی لەمەوپاش لەسەر (تەختی سەرداریی) گەڕ و گێچەڵ پەیدا نەبێتەوە و سەری فەرمانڕەوایشی پێوە گێژ نەبێتەوە، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا بۆم دەرکەوت کە (متصرفی موصل) لە ساڵی ١٩٣١دا کۆبوونەوەیەکی پێک هێناوە. هەموو سەرەک ئایینی و سەرەک هۆزەکانی یەزیدیی تیا بووە. هەموو بیروباوەڕێکی ئایینی ڕەوشت و کردارێکی کۆمەڵایەتیی لێ پرسیون. پاشان لەسەر بنچینەی ئەو زانیارییە، لەگەڵ (قایمقامەکانی مووسڵ و شێخان و سنجار)دا، لە ساڵی ١٩٣٣دا گەلاڵەی (قانوونی تیرەی یەزیدی) و (یاسای تیرەی یەزیدی)یان ڕێکخستووە ناردوویانە بۆ کاربەدەستیی ناوخۆ (وەزارەتی داخلیە). تا ئەویش پەسەندی بکات.

بەڵام وەرامی کاربەدەستیی ناوخۆمان تا ئێستا بۆ دەرنەکەوتووە. لە گەلاڵەکەی (قانوون) و (یاسا)ی تیرەی یەزیدیدا گیانێکی دیموکراتی ئەبینرێ. چونکە چوار شێوەی دیموکراتیی تیایە، کە لەسەر دەستووری دیموکراتی لەگەڵ یەکا ئەجوولێتەوە. تیاشیاندا ماوە دراوە کە زۆرداریی لە کەس نەکرێ. ئەگەر (سەرداری شێخان) خراپ بزووتەوە چەندوچوونی لەگەڵدا بکرێ، پاشان سزایش بدرێ؛ یان بەدەرچوون یاخود بەدەرکردن. لێرەدا بەپێچەوانەی جاران؛ دامەزراندنی (سەرداری شێخان) بەدەست گەلی یەزیدییەوەیە.

---

(١) ئەمە لە سەردەمی (شێخ محەممەدی کوردیی ئەربیلی)یەوە وای لێ هات ئەگینا لەوە پێش سەرداریی شێخان لەلایەن خێزانی سەرداریەوە هەڵ ئەبژێررا. (ش. ف)

(کۆڕە گشتی)یەکەی، نیوەی ئەندامەکانی تیرەی یەزیدی هەڵیان ئەبژێررێ. (کۆڕە ئایینی)یەکەیش، ئەندامەکانی لەلایەن (کۆڕە گشتی)یەکەیەوە هەڵی ئەبژێررێ. جا (کۆڕە گشتی)یەکەیە، کە ئەتوانێ (سەرداری شێخان) هەڵ بژێرێ و دابمەزرێنێ، یاخود چەندوچوونی لەگەڵدا بکات و لە (سەرداریتی) دەری بکات. ئەندامەکانی (کۆمەڵی ئایینی)یش لەلایەن (کۆڕە ئایینی)یەکانەوە ئەپاڵێورێن و لەلایەن (کۆڕە گشتی)یەکەوە ئەو پاڵاوتنە پەسەند ئەکرێ.

کەواتە چوارچێوەی هەڵسووڕاندنی کاروباری ئایینی و جیهانیی یەزیدییەکان بەدەست ئەم کەسانەوەیە:

١- سەرداری یەزیدییەکان (أمیر الشیخان).

٢- کۆڕی ئایینی (مجلس روحانی) کە سێ کەسە، یەکێکی سەرداری شێخان. دوانیشی لە سەرۆکی بنەماڵە ئایینییەکان هەڵ ئەبژێررێن.

بەڵام دوو ئەندامی تریش لە سەرۆکی بنەماڵە ئایینییەکان دائەنرێ، بەناوی پێویستییەکی ناکاوەوە. کە لە دوارۆژدا ڕوو بدات. پێویستە ئەم ئەندامانە هەموویان لە سەرۆکی بنەماڵە ئایینییەکان بن.

٣- کۆڕی گشتی (مجلس العموم)، کە بریتییە لە شانزە کەس. یەکێکی سەرداری شێخانە. حەوت کەسی لە سەرۆکەکانی بنەماڵە ئایینییەکانە هەشت کەسیشی گەلی یەزیدی هەڵیان ئەبژێرێ.

٤- کۆمەڵە ئایینییەکان (الجمعیات الروحیە)، کە ئەبێ لە (قەزاکانی مووسڵ و دهۆک و زاخۆ) دابن. واتا بۆ هەر ناوچەیەک لەو سێ ناوچەیە (کۆمەڵێکی ئایینی) دائەمەزرێنرێت. ئەمیش لە سێ کەس دێتە بوون. پێویستە هەرسێکیان لە سەرۆکە ئایینییەکانی ئەو ناوچەیەبن.

***

(سەرداری شێخان) کاربەدەستی هەموو یەزیدییەکانە. بەڵام نابێ خۆی فەرمانی کەسانی تر ببڕێنێتەوە. پێویستە هەر فەرمانە بهاوێژێتە سەر (کۆڕ) یاخود (کۆمەڵ)ی خۆی. ئینجا بەپێی بڕیارەکانی ئەو کۆڕ و کۆمەڵانە فەرمان دەرکات بۆ جێبەجێ کردنیان.

لە ڕاستیدا ئەم قانوون و یاسایە، فەرمانڕەواییەکی دیموکراتی بۆ سەردارنشینیی شێخان دروست ئەکات. ئەوەندە هەیە ئەمانە هەموویان، یان زۆریان لەژێر سەرپەرشتیی فەرمانڕەواییدا ئەکرێن. بۆ وێنە سەرداری شێخان ئەبێ لە پاش هەموو شتێک لە سەرۆکی فەرمانڕەواییەوە فەرمانی پەسەندکردنی هەڵبژاردنەکەی بۆ دەربکرێ. ئەگینا ئەوەی لێ دەربکەیت، (سەرداری شێخان)، لە شاهێکی دەستووری ئەکات، (کۆڕی گشتی)یش لە کۆڕی بۆرەپیاوان و گەورەپیاوان ئەکات، (کۆڕی ئایینی)یش لە کاربەدەستی داد ئەکات بەخۆی و دادگاکانیەوە. (کۆمەڵی ئایینی)یش شتێکە وەک (کۆڕی ئایینی) بەڵام دەسەڵاتی بچووکترە و کۆمەڵێکی تایبەتیشە بۆ ناوچەیەکی تایبەتی. لێرەدا وەک دەستوور و یاسای هەموو فەرمانڕەواییەکی دیموکراتی گەلێک کورتی و ناتەواویی هەیە. بەڵام هەرچی چۆنێک بێ یەزیدییەکان ئەخاتە سەر ڕێ و شوێنێکی ناسراو و زانراو، جڵەوی کاریشیان ئەداتە دەست فەرمانڕەوایی. کە ئەمیش ئەگەر هەست بەفەرمانی سەرشانی خۆی بکات و بییەوێ دڵسۆزییان لەگەڵدا

بنوێنێ، بەزوویەکی زوو ئەیانخاتە سەر ڕێگای پێشکەوتن. بەڵام ئایا ئەم قانوون و یاسایە لەناو یەزیدییەکاندا سەرئەگرێ؟! بەلای منەوە وایە کە سەر بگرێ، بەو مەرجەی فەرمانڕەوایی تا چەند ساڵێک و تا ئەندازەیەک خۆی پێوە ماندوو بکات. چونکە یەزیدییەکان خوێندەواریان کەمە پیاوی گەل پەروەر و نیشتمان پەروەریشیان ئەوەندە نییە کە ڕاست و ڕەوان ئەم دەستوور و یاسایە بۆ کەڵکی گشتی ببات بەڕێوە. بەڕاستی خۆپەرستی و پوولپەرستی و نەخوێندەواریی بەرهەڵستێکی گەورەن لەم ڕێیەدا... ئەشێ فەرمانڕەواییەکی دادپەروەر بەتەواوەتی بەتەنگیانەوەبێ، ئینجا بەم دەستوور و یاسایەوە ڕائەهێنرێن!... ئەم دەستوور و یاسایە شێوەی کاروباری یەزیدییەکانی پاراستووە بەڵام خستوشیەتە شێوەیەکی دیموکراتییەوە. بەکورتی تەنیا لایەنی کارگێڕی (إدارە)ی گرتووە. خەمی پێشکەوتنی تری یەزیدییەکانی نەخواردووە. چونکە هەموو مافێکی بۆ سەرداری شێخان و بۆ کەسوکاری سەرداری شێخان و، بۆ گۆڕی شێخ عەدی پاراستووە. بەڵام نەیکردووە بەبار بەسەر سەرداری شێخانەوە کە لەو پارانەی کە لە یەزیدییەکانی کۆی ئەکاتەوە؛ هەندێکی بۆ کەڵکی گشتیی یەزیدییەکان بەخت بکات. وەک خوێندەواریی و تەختکردنی ڕێگا و بەرەنگاری کردنی نەخۆشی و خەمخواردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵ!... هەروەکو گوێمان بەکارهێنانی ئەم دەستوور و یاسایە بۆ ئەمڕۆی یەزیدییەکان زۆر بەکەڵکە. بەڵام ئەو دەستوور و یاسایە ئەوپەڕی مەبەس نییە. پێویستە بەپێی پێویست هەر چەند ساڵ جارێک بژاری تیا بکرێت و ڕاست بکرێتەوە، تا پێشکەوتنی یەزیدییەکان هەموو دەم هەر لەبرەودابێ.

***

ئەوەندە نەمابوو، شۆڕشە بێ خوێنەکەی (حوسێن بەگ) و (ئیسماعیل بەگ) و (حمۆشرۆ) لە ساڵی ١٩٣٣دا سەربگرێ و دەستوورێکی ڕێکوپێک بۆ تەختی سەردارنشینیی یەزیدییان دابنرێ؛ تا بەئارەزووی دڵی نەتەوەی یەزیدی (سەرداری نوێ) لە هەموو دەمێکا دابنرێ. بەڵام داخەکەم چاوچنۆکیی ناوخۆیان نەیهێشت تا سەر بەیەکەوە بمێننەوە. سەرۆکەکان لەناو خۆیاندا تێکچوون. هەر کەسە لەژێرەوە بۆ کەڵکی خۆی تێ ئەکۆشا. (سەعید بەگ)یش لەژێر سەرپەرشتیی (میان خاتوون)دا، ئەم هەلەی لە دەست نەدا. هێنای لەگەڵ دوژمنی هەرە گەورەیا کە (حوسێن بەگ) بوو خۆی ڕێکخست. (حوسێن بەگ) بەئاشکرا وازی لە سەرداریی هێنا. چونکە (حمۆشرۆ) و هۆزەکەی پشتی بەردابوو. سەرەک هۆزەکانی تریش لێی تەکیبوونەوە. بێجگە لەوە بەناخۆشیش لەگەڵیا ئەبزووتنەوە. (ئیسماعیل بەگ)یش: کەوتە ناوەند (میان خاتوون) و (فەرمانڕەوایی)یەوە، ئەوانە هەردوولایان یارمەتیی (سەعید بەگ)یان ئەدا. (ئیسماعیل بەگ) دەرەقەتیان نەهات. داخەکەم شۆڕشەکە کوژایەوە. بەمەیش سەردارنشینیی یەزیدییەکان کەوتە کزیی و بێ هێزییەوە. ئەم ئەنجامەیش بەدڵی نیشتمانپەروەرانی یەزیدی نەبوو. ئێستاکەیش بەداخەوە ئەیگێڕنەوە؛ چونکە گەل ئەم هەلەی لە دەست چوو!.

ئەم (سەعید بەگ)ە پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو. شۆڕشێکی تریشی بەرپا کرد کە ئەویش پێگەیاندنی کوڕەکانی و کچەکانی بوو لە خوێندنگاکانی ئیسلام و گاوردا. ئەمەیش بەندێکی ڕەوشتی کۆمەڵایەتیی یەزیدی بوو شکاندی و بەم کارەیش دەرگایەکی لە یەزیدییەکان کردەوە بۆ خوێندەواری!.

دوای ئەوە فەرمانڕەوایی چەند خوێندنگایەکی بۆ یەزیدییەکان کردەوە. هەرچەندە لەپێشا ئەم کارە سەری نەگرت و فەرمانڕەوایی ناچاربوو زۆریانی داخست. بەڵام لە ساڵی ١٩٤٩ بەدواوە بەرە بەرە کرانەوە و خوێندنگایانی باشتر و گەورەتریشیان بۆ کرایەوە. ئەمەیش؛ ئەتوانم بڵێم، بەرێکی ئەو شۆڕشە بێ خوێنە بوو کە (ئیسماعیل بەگ) و هاوڕێکانی بەرپایان کرد، کە پێویستە سوپاس بکرێن. خۆش بەختانە کە لە ساڵی ١٩٤٨دا گەیشتمە (شێخان) کە کاروباری ئەوێ هەڵ بسووڕێنم، کوڕێکی ئەو (ئیسماعیل بەگ)ەم دیی، کە ناوی (کەریم بەگ) بوو، لە خوێندنگای (عین سفنی)دا وانەی بەمناڵە یەزیدییەکان ئەگوتەوە. (کەریم بەگ)یش وەک باوکی خۆی دڵسۆزی یەزیدییەکان بوو، پیاوێکی گیان سووک و ڕۆشنبیر بوو، گیانێکی پاکی کوردایەتیی هەبوو. لەبەر ئەوە زۆر ڕێزم لێ ئەگرت، بەهۆی ئەمیشەوە، لە بارەی یەزیدییەکانەوە گەلێک زانیاریم دەست کەوت. کە پێویستە لەسەرم سوپاسی بکەم.

## لە هەر چلە گوڵێک

«ئێمە خوا پەرستین نەک دێو پەرست»

(شێخ سلێمان) لە ڕیش سپییە تێگەیشتووەکانی یەزیدیی شێخان بوو. لە بنەماڵەی (شێخ فخرالدین) بوو، کە یەکێکە لە شەش بنەماڵە ئاینییەکانی یەزیدی. پایەی (باباشێخ)ی بەم بنەماڵەیە دراوە. بەڵام لە مێژەوە لەگەڵ بنەماڵەی سەرداری شێخاندا ناکۆکیی پەیدا کردبوو. گلەیی ئەو لەوان ئەوەبوو، کە هەرخەمی خۆیان ئەخۆن، خەمی یەزیدییەکان ناخۆن. لە گفتوگۆیەکا کە لەگەڵما کرد بەم جۆرە وەرامی دامەوە، گوتی:

«ئێمە کە یەزیدیین، بنچینەی کوردین، ئاینی ڕاستەقینەی ئێمە (زەردەشتی)یە. پاشان کە زڵلەی ڕۆژگار بەر ئێمە کەوتووە، بەرە بەرە، سەرمان لێ شێواوە. بنچینەی ئاینەکەی خۆمان لەبیر چۆتەوە. وەک ئیمڕۆمان لێ هاتووە، کە لێمان هاتووە.[١]

هۆلاکۆ، تەیمووری لەنگ، لەشکری عەباسییەکان لەشکری عوسمانییەکان، لەشکری محەمەد پاشای ڕەواندز، ئەمانە هەموویان هاتوون، لە یەزیدییەکان کوشتووە و تەفروتونایان کردوون. هەروەها بەزۆر ئاینیان پێ گۆڕیون، خۆ زۆرداریی (فەریق عومەر وەهبی) پاشای تورک ئێستایش لەبیر نەچۆتەوە. (شێخ عدی)یش بۆیەکا یەزیدییەکان ئەمەندەیان خۆشویستووە؛ چونکە خۆی بەیەزیدی و زەردەشتی داناوە. (شێخ حەسەنی بەسری)[٢]یش خۆی یەزیدی و زەردەشتی بووە. زەردەشتی ئاینی کۆنی هەموو کوردە. ئێمە دێو ناپەرستین خوا دەپەرستین. خوا گەورەی هەموانە تاک و پاک و بێ هاوتایە. بەڵام (تاووسی فریشتان) خۆشەویستی خوا بووە گەورەی هەموو فریشتەکانیش بووە. ئێمە بڕوامان وایە کە

---

(١) نووسراوە ئاینییەکانی زەردەشتی، دوو جار سووتێنراون، جارێکیان لەلایەن (ئەسکەندەری گەورە) وە، جارێکیشیان لەلایەن لەشکری ئیسلامەوە. (ش. ف)

(٢) ناوی ڕاستەقینەی ئەم (شێخ حسن البصری)یە (شێخ حەسەن کوڕی شێخ عدیی دووەم)ە. لە دامێنێکی تریشا ئەمەمان پێشان داوە. (ش. ف)

بەهەشت و دۆزەخ هەیە. لە پاش مردنیش خوا زیندوومان ئەکاتەوە. پاش چەندوچوون کردنیش لەگەڵماندا چاکمان ئەنێرێتە بەهەشت و خراپیشمان ئەنێرێتە دۆزەخ... بەڵام خۆیشمان گوناهمان زۆرە... خەمی خۆمان نەخواردووە... ئەمان هێشتووە (مصحفارەش) و (جیلوە) لەبەریان بنووسرێتەوە. تا بنچینەی ئایینەکەمان لەبیر نەچێتەوە... پێشکەوتنمان و چاکبوونەوەمان بەندە بەو ڕۆژەوە کە بۆ خۆمان تێ بکۆشین و لەگەڵ کوردەکانی تریشدا جیاوازیی نەکەین... ئەوانیش یارمەتیمان بدەن و هەموویشمان پێکەوە بۆ هەموو کورد هەوڵ بدەین».

## نوێژی ڕۆژهەڵات

گۆڤاری (هاوار) لە ساڵی ١٩٣٣دا نووسراوێکی چاپ کردبوو بەناوی (نڤیژین ایزیدییان)ەوە. ئەمە یەکێکە لەو نوێژانە کە لە دەمی (ئیسماعیل بەگ چاوا)ی یەزیدییەوە وەرگیراوە. گۆڕیومانەتە سەر شێوەی سۆرانی[١]: «خوایە! تۆ هەیت و من نیم. تۆ میهرەبانی. من گوناهبارم تۆ خاوەن مافیت، منیش ئەتپەرستم و بەقسەت ئەکەم. کەس بەتەواوەتی لە گەورەیی تۆ تێ ناگات تۆ بڵندی. تۆ هەی. ناوی تۆ هەموو شتێک ئەگرێتەوە.

هەموو شتێکت گرتۆتەوە. تۆی جیهانت ئافەریدە کردووە. تۆی ئادەم پێغەمبەرت ئافەریدە کردووە. بەڵام تۆ لێت ناپرسرێتەوە. خوایە! تۆ خوای نوێژ و پاڕانەوەیت. تۆی کە گیان لە لەش جوێ ئەکەیتەوە. هەموو شتێک ئەبینیت. تۆی کە گیان ئەخەیتەوە لەش.

خوایە! تۆ خوای منیت. خوای هەموو جیهانیت. هی هەموو شاهانیت. تۆی کە کەس گوێی لە دەنگت نابێ و نابینرێیت تۆ خاوەن ماڵیت. تۆ خاوەن پەردەیت. لە هەموو شوێنێکدا هەیت، تۆ خوای منیت. خۆشی لەو کەسەی بەگەورەت ئەگرێ تۆی شایستەی ستایش. کەس نازانێ تۆ چۆنی. تۆی هەموو کەس چاک ئەکەیتەوە لە نەخۆشی. تۆی گەورەی شاه و گەدا.

خوایە! توبی ناوی خۆت ئاگات لە کوردستان بێ. ئاگات لە یەزیدییەکان بێ هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژئاوا».

## قسەی پێشینان

(شێخ حاجی) یەکێک بوو لە پیاوە نەرم و نیانە تێگەیشتووەکانی یەزیدییەکانی شێخان. ئەم پەندانە کە لەناو یەزیدییەکاندا باون، لەوم وەرگرتوون:

١- صبر و عقڵ حصارن؛ خودا بۆ وێت هەنارن
بێت خەبەرێ نزانا دخوازن[٢]

٢- هەردەمەک بدەمێ ڕا، هەر وەخت بخودێ ڕا

---

(١) ئەمەیش خەباتێکی تری (ئیسماعیل بەگ)ە. کە پێچەوانەی فەرمانی ئایینی یەزیدی، ئایینی یەزیدی لە کەسانی تر ئاشکرا ئەکات. (ش. ف)

(٢) لەم پەندەدا گیانی زەردەشتی بەئاشکرا دیارە.

٣- هەژدەی ئاداریّ، مەلەکەزین هاتە خواریّ
دەنگ کرن بەهاریّ، هەتا بیست و چواریّ
سەریّ داری خەملّی، بنی داریّ کەملّی.

## قسەی ئەستەق

لە لاویّکی یەزیدیی شیّخانیشەوە ئەم قسە ئەستەقانەم دەست کەوت، ئەمانە هەموو دەم، بەدەم یەزیدییەکانەوەن:

١- ژنا جوان دەردی بیّ دەرمان، نتیّ کوشتن، نتیّ بەردان.
٢- جیناری خراپ توژیّ خەلاس نابیّ، بیّ قەهر ئو بیّ عەزاب.
٣- مرۆڤ نەبیّ نانی سیّلیّ، ئل هەڤالیّ خۆ بقولپیّ.
٤- ئەم ئیّزدینە، ئیڤەتیّ نانی جەهی نت ڕازینە[1]

## استرانا دەرویّشیّ عەڤدی

(بشارەشۆ) بالّبازیّکی یەزیدی بوو، پیاویّکی شەنگ و جوامیّر و دەنگ خۆش بوو، چاکەی زۆر لەبەرچاو و، زۆر دلّسۆز و فەرمانپەروەر بوو، تا ماوەی بیست سالّیش پتر، لە پاش جیابوونەوەمان، نامەکاریی لەگەلّدا ئەکردم ئەم گۆرانییەم لەدەم ئەوەوە وەرگرتووە کە لە بابەت دلّدارییەکەوە ئەدویّ:

(١)

لۆلۆ دەرویّشو بەرکی[2] سواریّت مەدیرانیّ[3]
سواریت جوانیّ[4] چلی دڤانیّ[5]
عدلانا زۆر تەمر پاشا[6]
دەرکەفتی دەری کونیّ[7] کوچکانیّ[8]
قیرکا[9] عەردی ئەکی عەزمانا[10]

---

(١) لیّرەدا شویّنەواری ئایینی (مانی) دیارە.
(٢) بەرکی: پیّشەنگ، پیّشرەو.
(٣) دیّرانیّ: بەسەزمان.
(٤) جوانی: جوانوو.
(٥) دڤانی: دڤان ناوی دەشتیّکە.
(٦) عدلانا زور تەمر پشا: عدلەی کچی زور تەمر پاشا.
(٧) کونی: ڕەشمالّ.
(٨) کوچکانی: دیوەخانە.
(٩) قیرکا: بانگ کە.
(١٠) ئەکی عەزمانا: هەتا ئاسمان.

هانا خۆ ئەگەهێنم ملکی عزمانا
بری دەروێشی عەڤدی کەفش سپی[٣] جردی جردی گرانا[٤]
ئێکی فتحایا[٥] ئێکی ملانا[٦]
یادی تریا زگی روێتی[٧] ملک[٨] وێرانا[٩]
خودێ بکم دەروێشی عەڤدی
ژێ بفکێنت[١٠] ترشی ئو تالانا
ترسا من ژ کیژانە[١١]
ترسامن ئژ پیرەکی[١٢] ملانە
ئیرۆسە ژ نویکا[١٣]
زگێ من لێ بخینێ
ژی ئدبێژن عەدلانە زور تەمر پاشا
دەروێشی عەڤدی ڕیڤینگە[١٤] خوازگینی[١٥] دلانە
شەبەت[١٦] هەڤالە: ژ شەڕێ هاتە مالە».

---

(٣) کەفش سپی: سەرپێچی سپی.
(٤) جردی جردی گرنا: ؟
(٥) ئیکی فتحانە: یەکێکی شەڕ و شۆڕە.
(٦) ئیکی ملانە: یەکێکی لە هۆزی ملانە.
(٧) یادی تر یازگی ڕویتی: ئەوی تر زگی ڕووتە.
(٨) مالک: ماڵ.
(٩) وێرانا: وێران.
(١٠) بفکینت: دوور بخاتەوە.
(١١) کیژان: کچان.
(١٢) پیرەکی: ژن
(١٣) سەرژنوێکا: سەرلەنوێ.
(١٤) ڕیڤینگە: ڕێبوارە، خوێرییە.
(١٥) خۆزگیتی: خوازبێنی.
(١٦) شەبەت: هەروەکو.

(٢)

«لۆلۆ دەروێشۆ بەرکی سواریت مە
دیراتی سواربوون بجو تکا
بەری ڤان سوارا کەفتیە گەڤزی[١] کیکا[٢] خاپووری دگەڕیا[٣]
ئل بەحرا خاتوونی دەرباز بوونە
ڤان سوارا هەسپێ خو ئاڤدانە بەردێ بکومکا ، بجوتکا ،[٤] بتاتکا ،[٥]
عەدلانە زور تەمر پاشا ئب سێ دەنگا گازی دکر[٦]
دەروێشۆ سەری من ئیچرانۆ[٧] ئەڤی چەند جارە
ئدبیژمە تەبابێ من زور تەمر پاشا ئل گەل تە ئێ خاینە
عمری فندی چلبی ابراهیم اغا شێخ العجیل
هەزار و هەفسەد سواری کیکا ئوملا[٨]
کمینکا[٩] گران ئل ملا قوچی[١٠] دانینە
«تۆ کەرەمکە دەروێشۆ کونی چاردە ئەستونێ بەرێ خۆن دەملا قوچی ژنیڤانی[١١] شەڤێ[١٢] بقولپە[١٣] تاخمێ[١٤] دیما[١٥] گۆلی سۆر دووچاڤی ڕەش ئو بەلەک دا خو شبەت شەڕی سمبیل[١٦] صور سوسەنی تێکڤەدانا[١٧] جوتی زەر مەمکا»

---

(١) گەڤزی: گەوزا.
(٢) کیکا: هۆزێکی یەزیدییە.
(٣) گەریا: ئەگەڕایەوە.
(٤) بجوتکا: بەجووت جووت.
(٥) بتاتکا: بەتاک تاک.
(٦) گازی دکر: بانگی ئەکرد.
(٧) ئیچرانۆ: قژ ڕووتاندنەوە.
(٨) ملا: هۆزە.
(٩) کمینکا: بۆسە.
(١٠) ملاقوچی: جێگایەکە.
(١١) نیڤانی: نیوەی.
(١٢) شەڤێ: شەو.
(١٣) بقولپە: وەرگەڕێ.
(١٤) تاخمێ: تاقمێ.
(١٥) دیما: دەموچاو.
(١٦) سمبیل: سمێڵ.
(١٧)تیکڤەدانا: تێکدان.

(٣)

«لۆلۆ دەروێشۆ صوبەیا[١] بەینا بەینێ[٢]
م خەیالا[٣] خودا بیست دەنگێ
«قاش» ئو بەر قاش[٤] ئیت
گوستیلکا[٥] دەروێشی عەڤدی
ئل گەل ڤرێ کە[٦] بای غەربی[٧] سەردارا حوری چینێ[٨]
عەدلانە زورتەمر پاشا ئب سێ دەنگا گازی دکر
دەروێشۆ! سەری من ئب حەیرانێ تو وەرە[٩] بقولیە تاخمی دیا
گولی صور دوو چاڤی ڕەش و بەلەک
قیامەتا[١٠] دورە[١١] مرن[١٢] پیرا کێی تێ[١٣]»

## شێخ کەلەشێر!...

(محمد خضر عثمان) لاوێکی یەزیدیی خوێندەوار و وریا بوو. فەرمانبەر بوو لە شێخان، دەزگای سەرنووسین (دائیرەی نفووس)ی بەدەستەوەبوو. جارێکیان ویستم تاقی بکەمەوە، داوام لێ کرد چەند لاپەڕەیەکم لە نووسراوی (تأریخ الموصل) بۆ بنووسێتەوە، کە لە یەزیدییەکان ئەدوا. هەرچەندە گەلێک جار ناوی (شیطان)یشی تیا نووسرابوو، بەڵام (محمد خضر) ئەمەندە ڕۆشنبیر بوو، بەدەستی خۆی بۆی نووسیمەوە، جا لەم لاوە هۆشیارەوە گەلێک زانیاریم دەست کەوت لە بابەت یەزیدییەکانەوە: ئەمەیش بەشێکە لەوانە: (پیر دیکل) یاخود (شێخ کەلەشێر)؛ لە بنەماڵەی (پیری جەروانە)یە کە خۆی لە (عین

---

(١) صوبەیا: بەری بەیان.
(٢) بەینا بەینێ: لەبەرەبەیاندا.
(٣) م خەیالا: لە خەیاڵی خۆما.
(٤) قاش ئوبەرقاش: جار بەجار.
(٥) گوستیلکا: ئەموستیلە.
(٦) ڤرێ کە: بینێرە.
(٧) بای غەربی: شەماڵ.
(٨) حوری چینی: فریشتەی چینی.
(٩) دورە: دوورە.
(١٠) قیامەتا: ڕۆژی زیندووبوونەوە.
(١١) دورە: دوورە
(١٢) مرن: مردن.
(١٣) بیرا کێتتێ: بەبیری کێدادێ.

سفنی) دائەنیشێ. هەمووساڵێ ئەگەڕێ بەناو یەزیدییەکاندا. کێ لە بنەماڵەی (شێخ ئامادین) بێ، کەڵەشێرێکی لێ ئەسێنێ!... لەم کەڵەشێرانە چەند کەڵەشێرێکی لێ ئەدا بە(سەرداری شێخان). ئەوانی تریشی ئەهێنێتەوە بۆ خۆی ئەیان فرۆشێ. یەزیدییەکانی بنەماڵەی (شێخ ئامادین) و دەرویشەکانیان گۆشتی کەڵەشێر ناخۆن!... ئینجا ئەوانە ئەو کەڵەشێرانە ئەدەن بە(پیر دیکل). (دیکل)یش. بەزمانی یەزیدی بەکەڵەشێر ئەڵێن: «پیر دیکل)یش (شێخ کەڵەشێر) ئەگرێتەوە!؟...

## باج لەناو یەزیدیدا

(محمد خضر عثمان). بەدڵێکی سووتاوەوە، چەوساندنەوەی یەزیدییەکانی بۆ ئەگێڕامەوە لەلایەن چینە ئایینییەکانەوە، کە لە ساڵێکا چەند جار باجیان لێ ئەسێنن. گوتی:

لە هەر یەزیدییەک: پێویستە چوار کەسی هەبێ کە ئەمانەن:

١- شێخ؛ کە ئەبێ یەکێک بێ لە بنەماڵە ئایینییەکان.

٢- پیر. کە ئەبێ یەکێک بێ لە بنەماڵەی یەکێک لە چل پیرەکانی ناو یەزیدی. وەک بنەماڵەی (پیری هاجیال)، (پیری بوال)، (پیری فاد)، (پیری جەروانە)، (پیری هەسەن مەمان). سەرۆکی هەر چل پیرەکە (هەسەن مەمان)ە.

٣- پەروەردەکار (مربی). ئەمیشیان ئەبێ لە شێخەکان بێ یاخود لە پیرەکان.

٤- برای ئەوە جیهان. ئەمیش ئەبێ یان لە شێخەکان بێ، یان لە پیرەکان.

فەرمانی شێخ و پیر و پەروەردەکار ئەوەیە کە یەزیدییەکان لە کارەسات و کاروباری ئایینیدا راوێژیان پێ ئەکەن، پرسیاریان لێ ئەکەن، پرسیان پێ ئەکەن تا تێیان بگەیەنن، واتا ئەمانە، مامۆستای ئایینیی یەزیدییەکانن. بەڵام فەرمانی برای ئەوە جیهان ئەوەیە، لە کاتی زەماوەندی ژنهێناندا بەتەنیشت زاواوەبێ تا زاوا ئەچێتە پەردەوە. پێویستە هەموو یەزیدییەک ساڵی یەک جار بەم چوار کەسە پیتاک بدات.

لە کاتی هاوین یاخود پایزدا ئەم چوار کەسە؛ خۆیان ئەگەڕێن بەناو دەرویش -مرید-ەکانیاندا و ئەم پیتاکانەیان لێ کۆ ئەکەنەوە.

خاوەن خێزان لەباتی هەموو خێزان ئەو چوار پیتاکەیان ئەداتێ. بەڵام تەنیا ژنی خاوەن ماڵ (خوشکی ئەوە جیهان)ی هەیە؛ لەجیاتی (برای ئەوە جیهان)، بەو پیتاک ئەدات.

(برای ئەوە جیهان) بۆ ئەوەیە کە لە ڕۆژی زیندووبوونەوە (قیامەت)دا باپیرە گەورەی ئەو یارمەتیی ئەو دەرویشە بدات.

هەروەها (شێخ) و (پیر) و (پەروەردەکار)یش لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا یارمەتیی ئەو دەرویشە ئەدەن.

بەڵام بێجگە لەم چوار باجە ئەبێ هەرچی یەزیدییەک هەیە ئەم باجانەی تریش بدات:

١- ئەبێ ساڵێ سێ جار باج بدات بە(سەرداری شێخان)، لەو کاتانەدا کە (تاووس) ئەنێرێتە ناویان،

لە بەهار و هاوین و پایزادا. سەردار لەمە بەشی (چێشتکەری شێخ عدی) و (پیر) و (سەرکردەی گۆیندەکان) و گۆیندەکان (قوال) ئەدات.

٢- ئەبێ سالێ سێ جار باج بداتِ بە(بابەشێخ) لە بەهار و هاوین و پایزادا. بابەشێخ لەمە بەشی پێشەوای (پێش إمام)ی خۆی ئەدات.

٣- ئەبێ سالێ سێ جار باج بدات بەپێشەوای بالای سەرداری شێخان. لە بەهار و ئاوین و پایزدا.

٤- ئەبێ سالێ سێ جار باج بدات بە(شێخ وەزیر)، کە یەکێک لە دەمان (مزایدە)ی گۆڕی (شێخ شمس)دا کە لە گۆڕستانی (شێخ عدی)دا نێژراوە، سەرکەوتووە بۆ ماوەی سالێک، ئەمیش لە بەهار و هاوین و پایزدا.

٥- ئەگەر شێخێک یاخود پیرێک یان هەژار (فەقیر)ێک دەستی تەنگ بوو، ئەتوانێ دێ بەدێ بگەڕێ و ئەبێ هەموو یەزیدییەک بەوانیش شتێک بدات.

٦- هەر سالە جارێک، لە کاتی دروێنەدا؛ بۆ مالی سەرداری شێخان -تەنیا لە ناوچەی شێخاندا- هەر مالێک تیا چنگ کەوێ، پێویستە (٢٥٠) فلس بدات بەناوی ئەزیارە (بێگار)ەوە. بەلام ئەم باجە بەباجێکی هۆزایەتی دائەنرێ. نەک ئایینی.

٧- ئەگەر یەزیدییەک لە جەژنەکاندا چووە گۆڕستانی شێخ عدی پێویستە باجێک بەچێشتکەر (مطبخچی)ی شێخ عدی بدات.

٨- هەروەها چێشتکەری شێخ عدی، بەسەربەخۆیی سالی دوو جار بەناو یەزیدییەکانی ناوچەی شێخاندا ئەگەڕێ و مال بەمال باجیان لێ ئەسێنێ. ئەویش لە پێش جەژنی (چلەی هاوین) و (جەژنی کۆمەلی)دا...»

ئینجا یەزیدییەک هەموو سالێک ئەم هەموو باجانە بدات؛ ئەبێ چیی بۆ بمێنێتەوە بۆ دەمی مال و مندالی خۆی؟! ئەبێ چۆن دەولەمەند ببێ؟ یەزیدییەکان زۆر وەڕسن لە دەست ئەم باجانە، گەلێک جاریش بۆلە بۆل ئەکەن لە بەخت و ناوچەوانی خۆیان!.

## بنچینەی ئایینی یەزیدی زەردەشتییە

نووسەری گەورەی کورد خوالێخۆشبوو (جلادت بەگ بەدرخان) لە پێشەکییەکەی نووسراوی (نڤیژین ئیزیدیان)دا دەلێ:[1]

ئێمە چاپ کردنی ئەم نووسراوەمان کرد بەبیانوو، تا بتوانین چەند قسەیەک لە بارەی ئیزیدییەکانەوە بکەین. لە بابەت ئەم کوردە نەژاد و سەر ڕاستانەوە، تا ئێستا گەلێک قسەی خراپ و ناشیرین کراوە کە لە ڕاستییەوە دوورن.

---

(١) سەیرکە (جلادت بدرخان) لێرەدا بە(یزیدییان) نەلێ (ئێزیدیان) یەزیدییەکان خۆیشیان هەر ئەلێن (ئێزدی) نەک (یەزیدی) مەبەسیان ئەوەیە کە خواپەرستن. (ش. ف)

«ئێزیدییەکان نە بت پەرستن، نە هەروەکو کەسانی تر ئەڵێن شتێکی تر ئەپەرستن.
ئێزیدییش وەک هەمـوو نەتەوەکـانی تر خـاوەن نووسـراون و خـواپەرستن و باوەڕییـشـیـان بەوە هەیە کـە خوایەکە و تەنیایە. لە ڕاستیدا ئێزیدییەکان لە خواپەرستن؛ لە هەموو نەتەوەکانی تر کۆنترن، چونکە (ئاینی ئێزیدی) پاشماوەیەکی (ئایینی زەردەشتی)یە. ئایینی زەردەشتیش لە پەرستنی خوای تاک و تەنیادا لە هەموو ئایینەکانی تر کۆن ترە... ئێزیدییەکانیش هەتا ئێستاکە هەر لەسەر ئەو ئایینی زەردەشتییـە ماونەتەوە و بەریان نەداوە. ئەوەندە هەیە، ئەوان لە سەردەمی (بابلی)یەکانەوە و ناوی خۆیان بەناچاریی گۆڕیوە. جا لەو گۆڕانانەیشەوەیە کە ئایینی ئێزیدی وای بەسەر هاتووە!...».

## یەزیدییەکان کوردیان خۆش دەوێ

لە نووسراوی (ژینی من)دا، کە بریتییە لە یادنامەیەکی خۆم و هێشتا چاپ نەکراوە، کە دێتە سەر بابەتی (ناوچەی شێخـان) ئەمەی تیـا نووسـراوە: «یەزیدییـەکـان بەئاشکرا ئەیانگوت: ئێـمـە حەز لە فەرمانبەرانی کورد ئەکەین. چونکە هەر ئەوان کە بەزەییان پیاماندا بێتەوە و ڕێزیشمان لێ بگرن(*)»!

## یەزیدییەکان دێو پەرست نین

مامۆستای زانا و وێژەوانی بەڕێز (تۆفیق وەهبی بەگ) لە نووسراوە بەنرخەکەیا کە بەئینگلیزی چاپی کردووە و ناوی ناوە: (پاشماوەی ڕۆژپەرستی) ئەڵێ: «لە ڕاستیـدا یەزیدییـەکان، ناتوانن بەوە باوەڕ بکەن کە دێو (شیطان) هەیە.
سەرەکی گۆێندەکان (قوالەکان) لە وەرامی (لێدی دراوە)دا کە گوتبووی (تاووسی فریشتـان) بریتییە لە دێو (شیطان)، گوتبووی: «ئەو نیازە خراپەی کە لەناو پیاواندا هەیە لە تاووسی فریشتـانەوە پەیدا نەبووە و نەکەوتوەتە دڵیانەوە، هەر لە خراپی خۆیانەوە پەیدا بووە».
لە ڕاستیدا یەزیدییەکان دێو پەرست نین، ڕۆژ پەرستێکی نهێنین!».

## (خوێنەواریی لە یەزیدییەکان بەربەست نەکراوە)

(صدیق الدملوجی) لە نووسراوەکـەیدا (الیزیدیە)، (شێخ دامەزرێنەری ئایینی وا بەدناو ئەکـات کە گوایا خوێندەواری بەربەست کردووە لە یەزیدییەکان و هەر بۆ خێزانەکەی خۆی هێشتۆتەوە. لە ڕاستیدا نە لە نووسراوی (جیلوە)دا، نە لە نووسراوی (مصحفارەش)دا فەرمـانێکی وا نییـە کە خوێندەواریی لە یەزیدییەکان بەربەست بکات. ئەوەندە هەیە پاراستنی ئەو نووسراوانە و خوێندەواریی بەزۆری خستۆتە ئەستۆی، خێزانەکەی خۆی و یەزیدییەکانیشی بەربەست کردووە لەوەی کە نووسراوەکانی خۆیان بخەنە بەردەست بێگانەکان. نەوەک دەسکارییـان بکەن. ئەمـیش بۆ کەڵکی یەزیدییەکان و پاراستنی ئایینی یەزیدی بووە. کە هەموو خاوەن ئایینێک ئەمەی کردووە. نەخوێندەوارییش هەر لەناو یەزیدییەکاندا باو

---

(*) یەزیدییـەکـان، وەک لە نووسـراوی (مـصـحـفـارەش)یشـدا دیارە، هێـزێکی نەتەوایەتی تەواو لە دڵ و دەروونیاندایە. (ش. ف)

نەبووە. لەناو ئیسلامەکان و گاور و جوولەکانیشدا هەر باوبووە چ لە کوردستان و چ لە خاکە ئیسلامەکاندا. سەرەتای بلاوکردنەوەی خوێندەوارییش لەم سەدەی بیستەمەدا دەرکەوتووە، کە یەزیدییەکانیش ئارام و ئاسایشیان پێ برا، ئەوانیش وەک برا ئیسلامەکان و گاور و جوولەکەکان دەستیان دایە خوێندن، ئەگینا ئەگەر ئایینی یەزیدی بەربەستی بکردنایە لە نووسین و خوێندن، هەرگیز پێچەوانەی ئەو فەرمانانە نەئەجوولانەوە.

## یەزیدییەکان ڕۆژ پەرست نین

نووسەری گەورە و خەباتکاری کوردیش (دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان) ئەڵێ: یەزیدییەکان ڕۆژ پەرست نین. تەنیا پیاوە خوا ناسەکانیان کە ڕۆژ ئەکەوێ لە دار و درەخت ماچی ئەکەن.[1]

## بەیادی شێخانەوە لەگەڵ سەرداری شێخاندا

کە لە ١٣/١١/١٩٤٨دا گەیشتمە شێخان، بۆ ئەوەی کاری ئەوێ ببەم بەڕێوە، (تەحسین بەگی سەعید بەگ)، سەرداری شێخان تازەکرا بوو بەسەردار. تازە تەمەنی گەیشتبووە هەژدە ساڵی... بەڵام دوو کەسی ژیر و زۆرزان و کارامە لە پشتیەوە بوون، ئامۆژگارییان ئەکرد و سەرپەرشتیی کاروباریان ئەکرد! یەکێکیان (میان خاتوون)ی نەنکی بوو، یەکێکیشیان (دەروێش مجێور) بوو کە یەکە پیاو و یەکە کاربەدەستی (میان خاتوو) بوو.

لە پاش چەند مانگێک کە برا یەزیدییەکان، شارەزای دڵ و دەروونم بوون، زۆریان بوون بەدۆستم. وەک یەکێک لە دڵسۆزانی خۆیان دایان ئەنام. هەموو ڕازێکی دڵی خۆیان بۆ ئەگێرامەوە. هەر یارمەتییەکیشم پێویست بوایە بۆ کەڵکی گشتی یارمەتییان ئەدام. ماوەی ساڵ و نیوێ کە لەوێ بووم لە چاکی و پیاوەتی و پاکی بەولاوە هیچم لێ نەدین. تا ئێستاکەیش هەر بەدۆست و برای خۆمیان ئەزانم. لام وایە ئەوانیش بەرامبەر من هەر وەهان. مەبەستیشم لەم پێش وتارە ئەوەیە، کە لە فەرمانبەرانی فەرمانڕەوایی بگەیێنم کە ئەگەر پیاو لەگەڵ یەزیدییەکاندا دڵسۆزانە بجووڵێتەوە و ڕێزیان لێ بگرێ و کەڵکیان پێ ببەخشێ، ئەتوانێ بەئاسانی بیانخاتە سەر ڕێ و هەموو گیروگرفتێکیش بەسایەی خۆیانەوە چارە بکات.

فەرمانڕەوایی خەریک بوو (خوێندنگای باعذرە) دابخات. چونکە شاگردی کەم تیا مابووەوە، (گوندی باعذرە)یش پایتەختی یەزیدییەکانە. سەرداری شێخان لەوێ دائەنیشێ. کە ڕووم لە سەرداری شێخان نا، نەک هەر هێشتنەوەی خوێندنگاکەی پەسەند کرد، بیست دیناریشی بۆ پیتاکی شاگردە هەژارەکان بەخشی لەگەڵ خانوویەکی خۆیدا کە خوێندنگاکەی تیا دابمەزرێنرێ. بێجگە لەوە، لەوەیشا پشتی گرتم کە هەرچی نەهاتە بەرخوێندن؛ بەجەریمە کردن بێ، یاخود بەبەندەیی کردن، باوکی سزا بدەم تەنانەت لەبەر چاوی دانیشتوانی گوندەکەیش براکەی خۆی دایە دەستم؛ گوتی: ئەگەر نەهاتە بەرخوێندن ئەم لەپێش هەموو منداڵێکدا بخەرە بەندیخانەوە!

---

(١) تەماشای نووسراوی (الاکراد) بکە، هی (باسیل نیکیتین). (ش. ف)

خواوراستان، منیش کاربەدەستانی مووسڵ و بەغدام بۆ خرایە سەر ئەوەی کە خوێندنگاکە هەڵنەگرن و دەسەڵاتی سزا دانیشم بدەنێ بۆ ئەو کەسانەی کە کوڕیان نانێرنە بەرخوێندن. خوێندنگا سەرلەنوێ دامەزرایەوە. ژمارەی شاگردەکانی لە پەنجا کەس تێپەڕی کرد وەک خوێندنگایەکی سەرکەوتوویش تا لەوێ مام، ژیا... کاتێ کە (صدیق الدملوجی) نووسراوەکەی خۆی (الیزیدیة)ی لە ساڵی ١٩٤٩دا چاپ کرد و بڵاو کردەوە؛ یەزیدییەکان، بەتایبەتی سەرداری شێخان و چینی ئایینیی زۆر پێی وروژان خەریک بوون بەهەموویان، ئازاری (صدیق الدملوجی) بدەن و کەتنی خراپی دەربارە بکەن. بەڵام کە رووم لە (سەرداری شێخان) ناو ئامۆژگاریم کرد و ئەنجامی خراپی ئەو نیازەیانم تێ گەیاند؛ وازی لە تۆڵەسەندنەوەی توندوتیژ هێنا. تەنیا لەلای کاربەدەستە گەورەکانی بەغدا سکاڵای لەدەست کرد، ئەوانیش دەست بەجێ بڵاوکردنەوەی نووسراوەکەیان وەستاند و فەرمانییان دا دەستی بەسەرا بگرن... بەم رەنگە، ئاگرەکە کوژایەوە... (صدیق الدملوجی)یش بەرامبەر ئەو ڕزگاربوونەوەی نامەیەکی پڕ سوپاسی بۆ من نارد.

(کە جەژنی کۆمەڵی)ی یەزیدییەکان لە ساڵی ١٩٤٩دا نزیک بووەوە، (تەحسین بەگ) خۆی و هەندێ لە کاربەدەستە ئایینییەکانی هاتنە لام، بانگیان کردم کە هاوبەشییان بکەم لەو جەژنەدا... منیش بەگاڵتەوە پێم گوتن. «بەمەرجێک دێم؛ لەجیاتی ئەو بەرگە بێگانەیەی لەبەرتاندایە، جلکی کوردەواریی خۆمان. شەلوشەپک. لەبەر بکەن... هەروەها ڕیشەکانیشتان بتاشن».

(تەحسین بەگ)یش گوتی: «هەرچی گۆڕینی بەرگە کەیە بەسەر چاو ئەیگۆڕین... بەڵام تاشینی ڕیشکەمان بۆ نالوێ چونکە ئەوە پێچەوانەی ئایینەکەمانە!». قسە هەر ئەمەندە بوو، دەستمان کرد بەپێکەنین و بڕایەوە...

کەچی لە پاش چەند شەوێک کاتێکم زانی لە خەوتناندا لە دەرگایان دا گوتیان (تەحسین بەگ) بەخۆی و چەند تفەنگچییەکەوە هاتووە بۆ لات... منیش دڵم داخورپا؛ ترسام لەوەی شتێکی گەورە قەومابێ ئەگینا سەرداری شێخان بەو شەوە درەنگە بۆ چ دێ. لە جێگاکەم هاتمە دەرەوە و، تا جلم گۆڕی، ئەوان لەناو باخچەکەدا دامەزران. کاتێک کە چووم پێشوازیم کردن، گوتیان: «ئەوا ئێمە لەسەر قسەی تۆ هەموومان جلکی کرمانجیمان لەبەر کردووە، تۆیش ئەبێ وەک ئێمە جلکی کرمانجی بگۆڕیت و بەیانی لەگەڵماندا بێیت بۆ جەژنی کۆمەڵی، بۆ سەر گۆڕی شێخ عدی...»[1]

تومەز ئەو ڕۆژە چووبوونە (ئەلکوش)، بەپارەیەکی زۆر چەند دەستێک ڕانکوچۆغە و سەرپێچی کوردییان کڕیبوو، هەر بۆ ئەمەی دڵی من خۆش بکەن و ئەو جەژنەشیان بەشادییەوە بکەن. منیش تا بەیانی بەهەرچی چۆنێک بوو دەستێ جلی کوردیم پەیدا کرد و تفەنگ و فیشەکدانم لە خۆمدا و پێکەوە چووینە (لالش) تا هاوبەشییان لەو جەژنە خۆشە، پڕ بەزمووڕەزمەدا بکەم و لەو شوێنە شەنگ و

(١) سەرداری شێخان هەروەها بۆ چەند جەژنێکی تریش بانگی کردبووم و بەچاوی خۆم شێوەی جەژنەکانیانم دیبوو. (ش. ف)

شۆخەیشدا کە هەر ئەڵێی بەهەشتە چەند کاتێکی پڕ شادمانی و کامەرانی ڕابیوێرم... بەڕاستی دڵپاکی و مەردایەتی و دۆستایەتیی ئەو یەزیدییانەم لەو ڕۆژەدا بۆ دەرکەوت، کە پڕ بوو لە خۆشەویستی و یەکێتی و کامەرانی... کە هەرگیز خۆشییەکەیم لەبیر ناچێتەوە...

## لەگەڵ میان خاتووندا

(میان خاتوون) لە مێژووی ئافرەتی کورددا؛ پایەیەکی بڵندی هەیە. کە دیم لە تەمەنی حەفتاوپێنج ساڵی دابوو. لە لەشا کزبووبوو. بەڵام نیشانەی جوانیی کۆنی هێشتا پێوە دیاربوو. لە هۆش و چالاکییشدا هێشتا هەر سام و گەورەییەکەی جارانی مابوو. بەڕاستی سەرداریتیی لێ ئەوەشایەوە. ئەم ئافرەتە دوو جار ئاگر لە جەرگی بەردرا: (عەلی بەگ)ی مێردی کوژرا. (سەعید بەگ)ی کوڕی کوژرا. ئاوی سوێر و تاڵ و دەربەدەریی و ئاوارەیی چێشت. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کۆڵی نەدا و ورەی بەرنەدا نزیکەی پەنجا ساڵی خشت لە پشت مێرد و کوڕەکەی و کوڕە زاکەیەوە بوو. لە هەڵسووڕاندنی کاروباری یەزیدییەکان و، پاراستنی سەردارنشینیی شێخان و، چارەکردنی گیروگرفتی یەزیدییەکاندا بێ پشوو و بێ وچان یارمەتیی ئەدا و کارگوزاریی ئەنواند. لەبەر ئەوە (میان خاتوون) جێی ڕێزگرتنی هەمووان بوو، چ لەلایەن فەرمانداارانەوە، چ لەلایەن سەرەک هۆزەکان و نەتەوەی یەزیدییەوە.

هەرچەند باو وابوو کە ژنە یەزیدیی مالی هیچ فەرمانبارێکی فەرمانڕەوایی نەچن، بەڵام بەبۆنەی نەخۆشیی خێزانەکەمەوە چل ڕۆژ بوو لە نەخۆشخانەی مووسڵدا کەوتبوو. هەروەها لە ماڵیشەوە لە (شێخان) دوو جار؛ وەک دایکێکی دڵسۆز و میهرەبان بۆ سەرلێدان هاتەلامان.

کاتێکیش کە لە شێخانەوە گوێزرامەوە بۆ (ئاکرێ)، دەمودەست نامەیەکی دایکانەی بۆ ڕەوانە کردم. زۆر بەجوانی ئەزانم، کە وەک بەڵگەیەکی مێژوویی بۆ چاکی و پاکی یەزیدییەکان، هەروەها بۆ نوواندنی گەورەیی و لێ هاتوویی (میان خاتوون)[٢].

ئەو نامەیە لە زمانی عەرەبییەوە بگۆڕمە سەر زمانی کوردی و لە خوارەوە وەک خۆی بینووسم:

باعزرە: ١٩٥٠/٦/٦

«خاوەنی ڕێز باوکی شێرکۆ

لە پاش چاک و چلۆنییەکی گەرم. هیوادارم کە تەندروستیتان لە جێی خۆیدابێ. لە خوایشم ئەوێ کە بتان هێڵێ بۆ خۆمان و خۆتان.

باوکی شێرکۆ! ڕۆژی یەکشەممەی ١٩٥٠/٦/٥ بیستم ئێوەیان لێرە گوێزاوەتەوە. خوا ئاگادارە، ئەوەتی ئەمەم بیستووە وەک نەخۆشم لێ هاتووە. جا نازانم ئەم دەنگە ڕاستە یان نا.

خۆشەویستی خۆم! تۆ ئەگەر ئارەزوو ناکەیت کە لە ئێمە جیابیتەوە لە (ناوچەی شێخان)ەکەی خۆیشت جیابیتەوە. هەر لە ئێستاوە ئامادەم کە لەبەر تۆ. بچمە (مووسڵ) و بۆ جارێکی تریش وا بکەم کە لێرە بتهێڵنەوە.

---

(٢) وەک لە پاشدا زانیم (میان خاتوون) لە ساڵی ١٩٥٦دا گیانی پاکی بەخاک سپاردووە. (ش. ف)

خۆشەویستەکەم! ئێمە هەموومان بەبیستنی ئەم دەنگە دڵتەنگین. تکات لێ ئەکەم بەهەڵگری نامەدا وەرامم بدەرەوە. لە کەینەوبەینەی ئەم جیابوونەوەیەیشت ئاگادارم بکە. حەز ئەکەم ئەوەیش بزانیت کە (تەحسین)ی هاوڕێت ئێستا لەماڵ نییە.

سڵاوی من بەدایکی شێرکۆ بگەیینە. چاوەکانی شێرکۆ ماچ ئەکەم. ئیتر بژین تا سەر بەگەورەیی و سەربەرزییەوە.

چاکەخوازتان:

میان خاتوون: (دایکی سەرداری شێخان)».

(میان خاتوون)ی ڕووسوور و سەربڵند بەمەیش وازی نەهێنا لە پاش وەرامدانەوەکەم هاتە سەردانمان، (تەحسین بەگ)یش بەخۆی و سەرۆکە ئایینییەکانی شێخانەوە هاتنە سەردانم.

ڕۆژی جیابوونەوەم لە شێخان، بەدڵێکی تەنگەوە ئاوڕێکم لە ناوچەکە دایەوە. بەدڵێکی پڕ لە هیواوە لە خوا پاڕامەوە، کە ڕۆشنایی زانست و هونەروپیشە سازییش بخاتە ناوچەی یەزیدییەکانەوە و لەسەر دەستی ڕۆشنبیرەکانی خۆیاندا چارەی هەموو گیروگرفتێکی زرنگکاریی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و خوێندەوارییان بکات.

**سەرچاوەی نووسراو**


١- اليزيدية - صديق الدملوجي.
٢- اليزيدية ومنشأ نحلتهم - احمد تيمور باشا.
٣- تأريخ اليزيدية واصل عقيدتهم - عباس العزاوي.
٤- الأكراد - مينوريسكي.
٥- الأكراد - باسيل نيكيتين.
٦- خلاصة تأريخ الكرد وكردستان - محمد امين زكي.
٧- اليزيدية ماضيهم وحاضرهم - عبدالرزاق الحسني.
٨- ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی ١٩٤٠ - وتارەکانی تۆفیق وەهبی.
٩- The Remnants of Mithraism Tewflq Wehbi.
١٠- زەردەشت - احمد الشنتاوي - گۆڕینی شاکر فەتاح.
١١- لێکۆڵینەوەکانی خۆم لەناو یەزیدییەکاندا - (دەست نووس).
١٢- یادنامەی خۆم لە شێخاندا - (دەست نووس).
١٣- تأريخ الموصل - سليمان الصائغ.
١٤- تاريخ ريشه ء نژاد كرد - احسان نوري پاشا.
١٥- Pecok Angel - Lady Drower.

# چیرۆکی مەم و زین لە تەرازوودا

نووسراوێکە: مێژووی ژیانی (ئەحمەدی خانی) و، مێژووی چیرۆکی (مەم و زین) و، لێکۆڵینەوە و، شیکردنەوە و، نرخی وێژەیی چیرۆکەکە پێشان ئەدات

## ئەم نووسراوە

لەم کاتەدا کە خاکی کوردستان رووی کردۆتە وێرانی و سەرگەردانی و کەرت کەرتیش کراوە لە ناوەند پێنج فەرمانڕەوایییدا. لەم دەمەدا کە ئاژاوە و ناکۆکیی ناو خۆمان، زۆرداریی ناو خۆمان کەمتەرخەمی و رقبەریی و دوژمنایەتیی ناوخۆمان، هەلا هەلای کردووین. بەڵێ لەم کاتەدا هیچ نووسراوێک لە لێکۆڵینەوەی چیرۆکی (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) باشتر نادۆزمەوە کە پێشکەشی نەتەوەی بەڕێزی کوردی بکەم.

داخەکەم هەروەک سێ سەد ساڵ لەمەوپێش (ئەحمەد خانی) بەزەیی بەشپرزەیی و سەرگەردانی و ماڵوێرانیی کوردەوارییدا هاتۆتەوە و، ئاوازی بڵند کردووە بۆ یەکێتیی و کۆکی و برایەتی و ئاشتی و ئازادیی لە ناوماندا. ئیمڕۆکەیش هیچ لەوساکە پێش نەکەوتوین. هێشتا هەر پێویستیمان بەو ئاوازە شیرین و پاکەی (ئەحمەدی خانی)یە هەیە، کە لە گوێماندا بزرنگێتەوە و، مێشکمان ڕۆشن بکاتەوە و، دەروونمان زیندوو بکاتەوە و، دەست و بازوو و دەماری مەردایە تیمان ببزوێنێ و دڵیشمان پڕ لە ئاوات و هیوا بکات، بۆ دوا ڕۆژێکی پرشنگدار، کە لە پاش ڕەنج و تەقەللایەکی زرنگانە و مەردانە نەبێ و، لەسەر بنچینەیەکی زانست و هونەر و پیشەسازیی نەبێ و، لەسەر ڕێگای خواناسیی نەبێ دەستمان ناکەوێ!.

مامۆستای بەڕێز (محەممەد سەعید ڕەمەزانی بۆتی)، کە کوردێکی ڕۆشنبیری کوردستانی سوریەیە، لە ساڵی ١٩٥٧دا چیرۆکە بەنرخەکەی (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) کە بەهۆنراوە دانراوە بەشێوەی بۆتانی لە شێوەی پەخشاندا کردووە بەعەرەبی لە بەرگ و شێوەیەکی جوان و باوی ئەو چەرخەدا ڕازاندوێتییەوە. من کە بەراوردم کرد لەگەڵ چیرۆکەکەی (خانی)، خۆیدا، بۆم دەرکەوت کە مامۆستا (محەممەد سەعید) تا ئەندازەیەکی گەورە لە گۆڕینەکەیدا سەرکەوتووە... هەروەک خۆی ئەڵێ ناچار بووە، لەبەر ئەوەی کە هونەری چیرۆک نووسین بەپەخشان وای پێ ئەوێ، ئەو چاڵ و چۆڵ و بۆشایییانەی کە بەهۆی هۆنراوەوە کەوتوونەتە ناوەند واتاکانی ناوەرۆکی چیرۆکەکەوە، پڕ بکاتەوە و، هەندێ بابەتی ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی وایشی بخاتە سەر بەڵام وریای ئەوەیش بووە کە زیان بەڕاستیی گیان و بیروباوەڕ و ناوەرۆکی چیرۆکەکە نەگەیێنێ. بەڵکو بەپێچەوانەوە باشتر ڕۆشنی بکاتەوە، لە ڕاستیدا هەندێ دەستکاریی لە چیرۆکەکەدا کردووە. دایەنەکەی (زین) و (ستی) کە ناوی خۆی (حەیزەبوون)ە ئەو ناوی ناوە (هێلانە). لەجیاتی (گورگین) کە کوڕی (زین الدین)ی خونکاری بۆتانە. ئەڵێ: (کرکون). ئەو پیاهەڵدانانەی کە (ئەحمەدی خانی) دەربارەی (زین الدین) و (گۆرگین) و (مەم)ی گوتووە، زۆری لێ کەم کردوونەتەوە. هەروەها ناوی (ئەسکەندەر)یشی نەهێناوە کە باوکی هەر سێ

پاڵەوانەکەی (زین الدین) شاهە و باوکی (تاژدین و عارف و چەکۆ)یە.

بێجگە لەوە نووسراوەکەی مامۆستا (محەمەد سەعید) لە پێشەکی چیرۆکەکە کە لە چیرۆکەکە خۆی گرنگ ترە بێ بەش مابووەوە. دەربارەی ژیانی بوێژی مەزن (ئەحمەدی خانی) و بەسەرهاتی تەواوی (چیرۆکی مەم و زین)یش، لەگەڵ ئامانجی خانی لە دانانی چیرۆکەکەیدا هیچی وای نەنووسیوە.

لەبەر ئەوە بەپێویستم زانی کە ئەوەندەی لە دەستم بێ، لێکۆڵینەوەیەکی کورت بکەم لە بابەت ئەحمەدی خانی و چیرۆکەکەیەوە. تا خوێندەوارانی بەڕێز باشتر کەڵک لە چیرۆکەکەوە وەربگرن.

لەگەڵ ئەمەیشدا، بەپێویستی ئەزانم کە بڵێم؛ چیرۆکەکە لەم شێوەی پەخشانەیدا، چاکترین شێوەیە، کە تا ئێستا پێی نووسرابێ. چونکە خوێندەوار لە هەموو شێوەکانی تری، باشتر تێی ئەگات. بێجگە لەوە پارچەیەکیشە لە پەخشانی وێژەیی و پڕ هونەری کوردی، کە ئەبێ بەم بۆنەیەوە دەستخۆشی لە مامۆستا (محەمەد سەعید) بکەین.

## کوردستان لە سەردەمی ئەحمەدی خانیدا

کە (ئەحمەدی خانی) چاوی کردەوە نزیکەی سەد و سی ساڵ پتر بوو کوردستان لە ناوەند فەرمانڕەوایی (ئێران) و فەرمانڕەوایی (عوسمانی)دا کرابوو بەدوو کەرتەوە...[1] لە هەردوو کەرتەکەیشدا هێشتا سەردارنشینان (امارات)، یاخود زەوی دارانی خاوەن سامان و دەسەڵاتی کورد هەر مابوون فەرمانداریان ئەکرد بەسەر کوردەواریدا. بەڵام ئەم سەرکردە کوردانە لەناو خۆیاندا کۆک نەبوون هەمیشە لە شەڕ و ئاژاوە دابوون.

لەپێناو ڕزگارکردنی کوردستاندا لەدەست زۆرداران هەرگیز یەکیان نەئەگرت بەدەم زۆرداریی داگیرکەرانی بێگانە و زۆرداریی فەرماندارانی ناوخۆوە بەدەم شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی و ناوخۆوە کوردەوارییەکە ئەینالاند هەژاریی و نەخوێندەواریی و نەخۆشی بەجۆرێکی خراپ بەناو نیشتمانەکەیدا بڵاوبووبوونەوە.

کەسێ نەبوو بەزەییەکی بەنەتەوەکەیدا بێتەوە و چاکی دامێنی مەردانەی لێ بکا بەلادا و ڕاپەڕێ و نەتەوەکە یەک بخات و خەبات بکات بۆ ڕزگارکردنی کورد و کوردستان لە دەست ئەو سەرگەردانی و ماڵوێرانییە. لە دەست ئەو دیلێتی و چەوساندنەوەیە. لە دەست ئەو دەردە گەورانەی کە بەرەنگاری سەروسامان و گیانمان بووبوون...

(خانی)یش کە لە سروشتی خودا بوێژانە و بلیمەتانە هەڵکەوتبوو خاوەنی دەروونێکی ئازاد و دڵێکی مەردانەبوو، خاوەنی هەست و هۆشێکی تەواو و دروست بوو، لە کانگای جەرگەوە هەستی بەئازار و هاواری نەتەوەکەی خۆی کرد، بەزەیی پیا هاتەوە و پڕ بەدڵ سەربەستانە و ئازایانە ئاواتی نەتەوەکەی

(١) ئەمەش لە ئەنجامی هێرشەکەی سولتان سەلیم یاوز بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی فارس و بەرپابوونی شەڕی چالدێران -١٥١٤ کە ڕووداوە خوێناوییەکانی ئەو شەڕە هەمووی لەسەر خاکی کوردستان بوون و ئەنجامیش کوردستان لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا دابەشبوو.

خۆی ئاشکرا کرد و دەنگی بڵند کردەوە بۆ بانگکردنی گەورە و کاربەدەستانی کورد بۆ یەکێتیی و بۆ خەبات کردن لەپێناو ڕزگارکردنی کوردستاندا لەو تەنگ و چەڵەمەیە و بۆ دامەزراندنی فەرمانڕەواییەکی گەورەی یەکگرتوو لە کوردستانی گەورەدا تا خوێندەواریی بەزمانی کوردیی بڵاو بکاتەوە و بایەخ بەزانا و وێژەوانان و تێگەیشتووانی کورد بدات و دەسەڵاتیان بداتێ و یارمەتیشیان بدات لە ڕزگارکردنی کوردستاندا لە هەرسێ دوژمنە گەورەکەی: لە هەژاریی و لە نەخۆشی و لە نەخوێندەواریی...

جا لەم هەستە و بیروباوەڕە بەرز و پیرۆزانەوە لەم گیانی نیشتمانپەروەرییە پاکەی (ئەحمەدی خانی)یەوە ئەم چیرۆکی (مەم و زین)ە پەیدا بووە. (ئەحمەدی خانی) نەتەوەی کورد لە شێوەی (مەم و زین)دا پیشان داوە، ئاواتی پێگەیشتنی هەردووکیشیان کە بریتی بوو لە ئاواتی دەست کەوتنەوەی سەربەستی و ئازادیی و سەندنەوەی مافی خوراو لەجیاتی ئاواتی کورد و کوردستان بۆ ئازادیی و کامەرانی و سەربەستی پێشان داوە.

سا هەر لەبەر ئەم نرخی وێژەیی و کۆمەڵایەتی و زرنگکاریەیەتی کە (چیرۆکی مەم و زین) ئیمڕۆ لەلایەن زانایانی جیهانەوە شان بەشانی (شاهنامەی فیردەوسی) و (ئیلیادەی هۆمیرۆس) دائەنرێ لەلایەن ڕۆشنبیرانی کوردیشەوە لەو دوانە لە هەردووکیان بڵندتر دائەنرێ.

## هۆی دانانی ئەم چیرۆکە

چیرۆکی (مەم و زین) هەرچەندە چیرۆکێکی دڵدارییە، بەڵام (ئەحمەدی خانی)، هەروەک خۆی ئەڵێ، کردی بەبیانوویەک بۆ ئەمەی دەردی دڵی خۆی پێ بڕێژێ. کە ئەویش وریاکردنەوەی نەتەوەی کوردە بۆ خەباتکردن لەپێناو ڕزگارکردنی خۆی و کوردستاندا هەروەها ئەم چیرۆکەیشی بۆیەکا دانا: کە وێژە و زمانی کوردیی پێ بڵند بکاتەوە، کە دوژمنانی کوردیش ڕایەیان نەکەوێ و بڵێن: کورد دوورە لە خوێندەواریی و شارستانێتییەوە، بەزمانی خۆی نووسراوانی نییە، هەروەها نەڵێن کورد لە ڕاستی و دڵدارییەوە دوورە!.

## خوێندنگایەک ئەکاتەوە بۆ منداڵانی کورد

ئەحمەدی خانی نرخ و بایەخێکی زۆری ئەدا بەزمان و وێژەی کوردیی هەروەها بەخوێندەواریی. واتا بەزانیاریی ڕاستەقینە و بەڕەوشت و خووی باش و، بەکردەوەی مەردانە. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ڕزگارکردنی کورد بەندە بەوەوە کە هەموو کوردێک لە زمانی خۆی دا، بەتەواوەتی شارەزا بێ و بەم زمانە چیرۆک و بەیت و هۆنراوە و مێژووی خۆی بخوێنێت و شارەزای زانستە پێویستییەکان و کاروباری نیشتمانەکەی خۆی و جیهانیش بێ. هەروەها خەباتی مەردانەیش بکات بۆ یەکگرتن و بۆ بەرەنگاریی کردنی دوژمنانی کورد کە بریتین لە زۆرداریی و هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی.

جا بۆ گەیشتن بەم مەبەسە پیرۆزەی، لەسەر ئەرکی خۆی خوێندنگایەکی کردەوە. لەو خوێندنگایەدا زمان و وێژەی کوردیی فێری منداڵانی کورد ئەکرد. بەڕەوشت و خووی بڵندیشەوە منداڵانی کوردی پێ ئەگەیاند.

هەروەها بۆ گەیشتن بەم مەبەستە فەرهەنگۆکێکیشی دانا بۆ زمانی (کوردی) و (عەرەبی) ناوی نا (نۆبار) یاخود (نەوبەهار) ئەم فەرهەنگۆکەیش بۆ ئەوەبوو کە منالەکان لە پاش فێربوونی زمانەکەی خۆیان فێری زمانی عەرەبیش بن کە زۆربەی زانستەکانی ئەودەمە بەو زمانە نووسرابوونەوە.

## پێگەیشتنی ئەحمەدی خانی

(ئەحمەدی خانی) کوڕی (شێخ الیاس)ە لە هۆزی خانیانە کە لە نزیک شاری (بایەزید)ەوە مەڵبەندی دابوو لەناو جەرگی کوردستانی تورکیادا (شێخ الیاس) لە پێش لەدایکبوونی (ئەحمەدی خانی)دا هاتبووە شاری (بایەزیدی) بەڵام پەیوەندیی خۆی لە هۆزەکەی خۆی نەپچڕی بوو ئەم ماڵە بنەماڵەیەکی گەورەبوو خانەدان بوو خاوەن میوانخانە و دیواخان بوو لەبەرئەوە ئەحمەدی خانی کە نازدار و تاقانەی باوک و دایکی خۆی بوو بەجوانی پەروەردە ئەکرا لە منداڵیدا کە خوێندنە سەرەتاییەکانی تەواو کرد نێررایە مزگەوت خوێندنە ئایینییەکانیشی تەواو کرد لەگەڵ زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکیدا هەروەها بۆ خوێندن چووە (ئورفە) و (ئەخلات) و (بتلیس) سەری لە (سوریە) و (میسر)یش داوە لەدوای تەواوکردنی خوێندنەکەی لە مزگەوتی (مردایە) لە شاری (بایەزید)دا دەستی کردووە بە وانە گوتنەوە. وەک ئەڵێن لەسەر فەرمانی خونکاری (عوسمانی) چووبووە (ئەستەمبۆڵ)یش.

(ئەحمەدی خانی) زانایەکی تەواو بووە هەروەها وێژەوان و بوویژێکی تەواویش بووە شارەزاییەکی زۆری لە بەرهەمەکانی (نظامی) و (جامی)دا هەبووە بێجگە لەوە بەرهەمەکانی (مەلای باتی) و (مەلای جزیری) و (عەلی حەریری) و (فەقێ تەیران)یش کارێکی تەواویان کردۆتە سەر دڵ و دەروونی.

خانی خاوەنی گەلێک بەرهەمە بەزمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی.

## ڕەوشت و سروشتی ئەحمەدی خانی

ئەحمەدی خانی پیاوێکی دەستە و کەللەزل بووە چاوەکانی جوان و توروسکەدار بوون ڕیشێکی تۆیشی پێوە بووە پیاوێکی مەنگ و لەسەرخۆ بووە کەم تووڕە بووە دڵتەڕ و تەرپۆش بووە بەرگەکانی لە هی دەست کردی خاکەکەی خۆی بوون شۆڕەسوار و لاوچاک بووە خاوەنی دەس و بازوو بووە پڕ بەدڵ وەرزشکار و ڕاوکەربووە کە چووەتە ڕاو بەرگی ڕاوی پۆشیوە پیاوێکی ڕووخۆش و قسە شیرین و بەڕێز و خاوەن دەسەڵات بووە دەنگێکی نێر و بەرزیشی پێوە بووە.

خانی لە دوو سەرەوە جێگای بەرز بووە یەکێکی هی زانستی. یەکێکیشی هی بنەماڵەیی. لە گفتوگۆدا لە کۆڕی خواناسیدا قسەکانی کاریگەربوون.

هەروەک لە هۆنراوەکانی خۆیدا ئەڵێ ئەبێ لە ساڵی (١٦٥٠)ی پا.ز[٢]دا لەدایک بووبێ بەڵام ڕۆژی مردنی هێشتا بەتەواوەتی دەرنەکەوتووە هەر کەسە جۆرە قسەیەکی لێوە ئەکات ئەو لێکۆڵینەوانەی تا ئێستا کراون تەمەنی خانی ئەگەیێنە (٥٦) ساڵ بەڵام ئەم ئەنجامە هێشتا بەڵگەی تری ئەوێ، بەم پێیە

---

(٢) پا.ز.: پاش زایینی، واتە (زایینی).

ئەگەر ڕاست دەرچێ ئەبێ خانی لە ساڵی (١٧٠٦)ی پا. ز.دا گیانی پاکی بەخاک سپاردبێ.

خانی هەر لەو مزگەوتەدا مردووە و نێژراوە کە لە شاری (بایەزید)دا بۆی دروست کرابوو.

## بەرهەمەکانی خانی

خانی سێ بەرهەمی کوردی بۆ بەجێ هێشتووین:

١- فەرهەنگۆکی (نۆبار) کە لە ساڵی (١٦٨٣)ی پا. ز.دا تەواوی کردووە ئەمە بۆ زمانی عەرەبی و کوردییە. بەهۆنراوە دایناوە تا ئێستا دوو جار چاپ کراوە.

٢- نووسراوی (عقیدا ایمانی)، کە بریتییە لە (٧١) هۆنراوە تا ئێستا دوو جار چاپ کراوە.

٣- (چیرۆکی مەم و زین): لە ساڵی ١٦٩٤ی پا. ز.دا تەواوی کردووە. ئەمیش بەهی بێگانە و ڕۆشنبیرانی کوردەوە (١٨) جار هەمووی یان هەندێکی چاپ کراوە. ئەم چیرۆکە بەزمانەکانی ئەڵمانی فەرەنسزی، تورکی، عەرەبی، فارسی، ئەرمەنی، بەشێوەی موکریانی چاپ کراوە.

## هۆی بوێژێتیی خانی

خانی خۆی لە نەژاددا پیاوێکی خاوەن هەست و تاسە بووە. پیاوێکی دڵتەڕ بووە و دەستی بوێژیشی بووە. بەڵام سێ شت کاری تێ کردووە؛ تا بووەتە ئەو بوێژە گەورەیەی کە هەیە.

١- سروشتە جوانەکەی کوردستان.

٢- زۆرداریی تورکەکانی (عوسمانی) لە کوردەکانی ناوچەکەی خانی.

٣- خوێندنەوەی هۆنراوەکانی (عەلی حەریری) و (مەلا جزیری) و (مەلای باتی) و (فەقێ تەیران). کە پڕ بوون لە ڕاستی پەرستی و پەند و نیشتمانپەروەریی و دڵداریی و خواناسی.

## چیرۆکی مەم و زین

چیرۆکی (مەم و زین) زۆر لە پێش (ئەحمەدی خانی)دا بووە. بەڵام ئەم چیرۆکە خاوەنی دیار نەبووە. نەنووسرابووەوە. لە زمانی چیرۆک بێژەکانەوە ئەگێڕایەوە. لەم دەمەوە بۆ ئەو دەم، لەم پشتەوە بۆ ئەو پشت ئەگێڕایەوە.

چیرۆکەکە هەرچەندە بەزمانی بۆرە پیاوان دانراوە. هەرچەندە پڕە لە ئەفسانە و قسەی هیچ و پووچ، بەڵام ئەمەندە چیرۆکێکی خۆشەویست و نازدار بووە لەلای کوردەوارییی تێکڕا هیچ شێوەیەکی زمانی کوردی نەماوە، ئەم چیرۆکەی پێ نەگوترابێ. هەر لە خاکی جزیر و بۆتانەوە تا ئەگاتە خاکی موکری و لوڕ و کەلووڕەکان، ئەم چیرۆکی مەموزینەیان تیا بڵاو بۆتەوە. چیرۆکەکە بەشێوە زمانەکانی بۆتانی، هەکاری، زازایی، بادینانی، موکریانی، لوڕی، کەلووڕی، گۆرانی ئەخوێدرێتەوە.

بەڵام وا دەرئەکەوێ لە سەردەمی (ئەحمەدی خانی)دا، چیرۆکەکە لە شێوە و ناوەرۆکدا لە واتا و بیروباوەڕ و ئامانجدا، زۆر گۆڕان و تێکچوونی بەسەردا هاتبێ.

(خانی)یش کە مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر و دڵتەڕ بووە، ئەمەی پێ ناخۆش بووە. هەستی بزووتووە و دڵی هاتۆتە جۆش لەسەر شێوەیەکی نوێ و بیروباوەڕ و گیانێکی تازە؛ سەرلەنوێ چیرۆکەکەی داڕشتۆتەوە بۆ ئەمەی چیڕۆکی (مەمی ئالانی و زینی بۆتانێ) ببوژێتەوە. (خانی) خۆی ئەمەی لە هۆنراوەکانیا دەربڕیوە.

(مەم و زین)ی خانی بریتییە لە (٢٦٧٣) بەیت کە دابەشکراوە بەسەر (٩٥) بەنددا. هەر بەندەیش لە (١٠) هۆنراوە کەمتر نییە، لە (٩٧) هۆنراوەیش پتر نییە.

چوار بەندی یەکەمی بەستایشی خوا و پێغەمبەرەوە براندۆتەوە لەگەڵ پاڕانەوەدا.

دوو بەندەکەی دوای ئەویشی بەپێشاندانی ڕەوشت و کردەوە و باری زرنگکاریی و کۆمەڵایەتی و سەرگەردانیی نەتەوەی کوردەوە براندۆتەوە لێرەدا بێ کەسی و داماویی کوردەواریی پێشان ئەدات. هۆی پاشکەوتن و هۆی سەرکەوتنیان پێشان ئەدات. هەروەها ئاواتی گەورە گەورەی نیشتمانییان دەرئەخات وەک پێکهێنانی فەرمانڕەواییەکی گەورە بۆ کوردستانی ئازاد و یەکگرتوو. وە بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی و دادپەروەریی و سەرئەفرازیی. وەک ڕێزگرتن لە زانا و بوێژان و تێگەیشتووان و دەسەڵات پێ دانیان بۆ کەڵکی گشتی.

بەندەکانی تریشی لە چیرۆکە دڵدارییەکە، (مەم و زین)، خۆی ئەدوێن (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) لەسەر بنچینەی ڕووداوی ژیانی کوردەواریی دامەزراوە.

وەک ئەڵێن کارەساتەکە لە ساڵی ١٣٩٣ی پا. ز.دا ڕووی داوە.

وەک سینەما پەردە بەپەردە؛ هەموو ژیانی کوردەواریی پێشان ئەدات هەموو سروشت و ڕەوشت و کرداری کوردان پێشان ئەدات لەگەڵ خاکی کوردستاندا.

## جیاوازی هەردوو چیرۆک

لە ڕاستیدا چیرۆکی (مەم و زینی ئەحمەدی خانی) و (چیرۆکی مەم زینی بۆ پیاوان) زۆر لەیەک جیاوازن. جیاوازن لەوێنە و شێوە و ئامانج و بیروباوەڕ و هەندێک ناوەرۆکدا. کێش (وزن) و سەروا (قافیە)ی مەم و زینی خانی ئەچنەوە سەر دەستووری هۆنینەوەی هۆنراوەی (دە بڕگەیی کوردی)، لە شێوەی جووت جووتدا. بەڵام کێش و سەروای (مەم و زینە ڕەمەکی یەکە) بەرەڵڵایە، سەربەستە، هەندێ جار پەخشانێکی ڕووتە؛ بێ کێش و سەروا، پاش ئەوە ئەبێتە هۆنراوەیەکی بەپەخشان، هەر جارەی چەند تاکێکە، خۆی بەهیچ دەستوورێکەوە نابەستێ، مەگەر سەروای هەرچەند تاکەیان چەشنێک بگرێتەوە. تەنانەت ژمارەی تاکەکانیش وەک یەک نین. ئەمەیش بابەتی کوردەوارییە، جۆرە شێوەیەکی چیرۆک نووسینی کوردیی پەتییە. زۆرتر لە چێشکەی وێژەیی کوردەواریی نزیک ئەبێتەوە لە (مەم و زینەکەی خانی)دا ئامانجێکی گشتیی کوردایەتی و نیشتمان پەروەریی هەیە. ئەمەیش لە پێشەکییەکەیدا باشتر دیارە. بەڵام لە مەم و زینە ڕەمەکییەکەدا ئەو ئامانجە نییە. لە هەندێ جێگایشدا پێچەوانەی ئاواتی نیشتمانییە، بەند و باوە و هەڵبەستراوە، دوورە لە ڕووداوەوە.

لە (مەم و زینەکەی خانی)دا گەلێک وشەی عەرەبی و فارسی هەیە واژەکانیان زۆر ڕەقن دوورن لە تێ گەیشتنی زۆربەی کوردەوارییەوە بەڵام لە (مەم و زینە کۆنەکەی)دا وشەی بێگانە زۆر کەم هەیە ئەوەی تیاشیایەتی سەروگوێلاکی شکێنراوە ئەوەی تری کوردیی پەتییە لە تێ گەیشتنی بۆرە پیاوانەوە زۆرتر نزیکە.

بێ گومان لە ڕووی هونەری وێژەیی و بیروباوەڕی پەسند و بەهێزەوە لە ڕووی پاراویی زمان و واتای گرنگ و بایەخدارەوە لە ڕووی ڕووداوەوە لە ڕووی نزیکییەوە بەژیانی کوردەواریی لە ڕووی واژەی پڕ لە ڕاستی پەرستی و تێگەیشتووییەوە (مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی) گەلێک بەهێزتر و جوانتر و دڵکێشکەرترە لە (مەم و زینە کۆن)ەکە.

هۆی ئەمەش ئەوەیە بێجگە لەوەی کە نازانین (مەم و زینە ڕەمەکی)یەکە لە بنج و بناواندا چۆن دانراوە کەی دانراوە و کێ دایناوە ئەمەندە سەرزاری چیرۆک بێژی نەخوێندەوار کەوتووە و گێڕاوەتەوە. گەلێک دەستکاریی کراوە گەلێک واتا و ناوەڕۆک و وشەیشی لێ گۆڕاوە تا بەجۆرێکی وای لێ هاتووە لە هەندێ جاردا پاڵەوانەکانی چیرۆکەکە بەپێچەوانەی ڕەوشت و کرداری خۆیان خۆیان پێشان ئەدەن واتا بەخۆڕایی خۆیان کزوناشی و لاواز ئەنوێنن!.

لە (چیرۆکی کۆن)دا ناوی ئەم پاڵەوانانەدێ:

برایم ئاغای یەمەن پەریی، مەلەک، ڕێحان، بەنگینە. (سەگ) کە ئەمانە هیچیان لە چیرۆکی تازە دانین.

هەروەها ئەم پاڵەوانانەیش لە چیرۆکە تازەکەدا ناویان دێ (چاوبەست کاری لم گەر، گورگین، حەیزەبون) کە لە (چیرۆکە کۆن)ەکە دانین. لە چیرۆکی تازەدا خاکی جزیر و بۆتان خاکێکی سەربەخۆیە، کەچی لە چیرۆکە کۆنەکەدا بەخاکێکی داگیرکراوی (پادشای یەمەن) دانراوە! ؟ ئەم کەموکوریی و هەڵانەیش بەئاشکرا لە (چریکەی مەم و زین)ە ڕەمەکییەکەی (ئاورەحمان بەکر)دا دەردەکەوێ کە خۆی گۆرانیبێژێکی نەخوێندەوار و چیرۆکبێژێکی ناشی بووە بەڵام دەستی بوێژی هەبووە چووە گەلێک وشەی ناشیرین و واتا و ڕستەی نارەوا و ناپەسەندی فرێ داوەتە ناو چیرۆکەکەوە و بەو ڕەنگە بۆ (اوسکارمان)ی ئەڵمانی گێڕاوەتەوە کە ئەویش لە پاش نووسینەوی لە ساڵی ١٩٠٥دا لە شاری (بەرلین)دا لە چاپی داوە.

دوور نییە ئەم چیرۆکە ڕەمەکییەیش لە بنجوبناواندا زۆر دروست و ڕێکوپێک بووبێ دوور نییە ئەمیش وێژەوانێکی زانای کورد دایناب‌ێ بەڵام گێژەلووکەی ڕۆژگار نووسراوی چیرۆکەکەی لەناوبردنی ئینجا بەهۆی دەستاودەست یاخود دەماودەمی چیرۆکبێژە نەخوێندەوارەکانەوە چیرۆکەکە وای بەسەرهاتبێ مێژوو دەری ئەخات کە هەندێک لە ئایینە بەناوبانگەکانیش یاخود فەرمودەی پێغەمبەرانیش بەدەست نەخوێندەوارانەوە یاخود بەدەست دڵ ڕەشانەوە وایان بەسەر هاتووە.

وا بۆ نموونە چەند بەیتێک لە (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) و لە (مەم و زین)ی دەم ئاورەحمان بەکر پیشان ئەدەین. تا خوێندەواری خۆشەویست خۆی بەجۆرێکی تێکڕایی لە هێزی وێژەیی هەردوولا تێ

بکات و نرخیش بۆ هەر دوولا دابنێت.

ئەوەندە هەیە لەگەڵ ئەمەیشدا کە تا ئێستا نزیکەی سێ سەد ساڵە بەسەر (مەم و زین)ەکەی (ئەحمەدی خانی)دا تێپەڕیوە لەگەڵ ئەو هەموو پایە بڵندەییەیشدا کە لە کۆڕی وێژەی جیهاندا هەیەتی کەچی هێشتا جێگەی بە(مەم و زینە ڕەمەکییەکە) چۆڵ نەکردووە هێشتا جێگای ئەوی پڕ نەکردۆتەوە لەناو بۆرەپیاوانی کورددا.

لام وایە هۆی ئەمەیش هەر ئەوەیە کە تا ئێستا هەر نەخوێندەواریی باو بووە لەناو کوردستاندا هۆی ئەمەیش زەبروزەنگی چەرخی کە چ ڕەفتار بووە بۆیەکا هۆنراوەکانی خانی لەبەر نەکراون و بڵاونەکراونەتەوە لە شێوەیەکی پێویست و تەواودا لەسەر زمانی چیرۆکبێژە نەخوێندەوارەکاندا.

چونکە لە ڕاستیدا (مەم و زینە ڕەمەکییەکە) چ پەخشانەکەی چ هۆنراوەکەی بۆ کوردێکی ئاسایی یاخود نەخوێندەوار ئاسانترە تێی بگات لە (مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی) کە بەشێکی زۆری وشەکانی عەرەبی و فارسین و ڕەقیشن بێجگە لەوە زۆر بیری ورد و وردەکاریی وێژەیی و واتای ڕاستی پەرستیشی تیایە کە نەخوێندەوارانی کورد تێیان ناگەن و بۆیشیان لەبەر ناکرێن کە زۆربەی چیرۆکبێژەکان خۆیشیان لەو نەخوێندەوارانەن تەنانەت ئەتوانم بڵێم کە هەندێ ڕستە و واژەی وایشی تیایە کە بۆ پیاوی خوێندەواریش ستەمە تێیان بگات مەگەر بۆی ڕۆشن بکرێتەوە یاخود بۆی لێک بدرێتەوە.

هۆی هەرە گرنگی ئەمەیش کە من ئەم چیرۆکەم گۆڕییە سەر پەخشانی کوردی ئەمەبوو کە چیرۆکەکە لە واتا و ئامانج و ناوەرۆکدا لە چیرۆکەکەی (ئەحمەدی خانی) بکات لە ئاسانی و سووکی و ڕەوانییشدا لە چیرۆکەکەی دەم (ئاوڕەحمان بەکر) بکات تا هەموو کوردێک بەخوێندەوار و نەخوێندەوارەوە بەئاسانی تێی بگات.

## وێنەیەک لە ناوەڕۆکی مەم و زینەکەی خانی

- خانی ئەڵێ: بۆیەکا ئەم (مەم و زین)ەم بەکوردی نووسییەوە:

دا خلق نەبیــــژتن کــــو اکــــراد
بی مــعــــرفتن بی اصل و بنیـــاد
انواعی ملل خـــودان کـــتــــیبن
کـــرمـــانج تەنی دبی حــــسـیبن

- بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەتا کە:

کـــرمـــانج نەپر دبی کـــمــــالن
امـــاد یتـــیم و بی مــــجـــالن
فی الجـــملە نەجـــاهل و نەزانن
بلکی دســـفـــیل و بی خـــدانن

- خانی ئەڵێ: لەبەر ئەوە بڕیارم دا کە:

نەغـــــمێ وەژ پەردەی دەرێنـم
(زینا و مـــــەمێ) ژ نوێ وەژینـم

- ئەڵێ: بەڵام لە ڕاستیدا ئامانجی من ئەمە بوو کە:

شـرحـا غـەمی دڵ بکەم فـســانە
(زینی و مـــــەمی) بـکەم بەهانە

- خانی بەلایەوە کورد وایە:

جـوامـیـری و همت و سـخـاوت
مـێـرینی و عـیـزەت و جـلادت
ئەو خـتـمـە ژ بو قـبـیلی اکـراد
وان دانە بەشـــیـــر همت و داد
هێندی ژ شـجـاعـتێ غـیـورن
ئەو چەنـد ژ منتێ نـفـــــورن
ئەڤ غـیـرت و ئەڤ علوی همت
بو مـــانعی حـمـلی باری منت
لەو پێکڤـە هەمیـشـە بێ تفـاقن
دائـم بە تمرد و شـــــقـــــاقن؟!

- خانی سەری لە کاری خوا سوڕئەمێنێ کە ئەڵێ:

آیا بە چ وجـــه مـانە مـحـروم؟
بالجـمـلە ژ بۆچی بونە مـحکوم؟

- خانی تۆباڵی سەرگەردانیمان ئەخاتە ئەستۆی گەورەکانمان ئەڵێ:

امـــا ژ ازل خـــودێ وەســـاکـــر
ئەڤ ڕۆم و عـجم لەسـەر مـەڕاکـر
تبـعـیـتـی وان ئەگـەرچی عـارە
ئەو عـــارە لە خلقی نامـــدارە
نامـوسـە لە حـاکم و امـیـران
تاوان چیە شـاعـر و فـقـیـران؟!

- خانی تۆباڵی ماڵ وێرانیمان ئەخاتە ئەستۆی داگیرکەرانی ئێران و تورکیش، کە ئەڵێ:

هەردوو طرفـان قـبـیلی کـرمـانج
بۆ تیـری قـضـا کـرینە ئامـانج!

- ئینجا بەدوو دڵییەکەوە دوا ڕۆژی کورد لە خۆی ئەپرسێ ئەڵێ:

قـەت ممکنە ئەڤ ژ چەرخی لولب
طالع ببـیتن ژ بۆمـە کـوکب؟
بەختی مـە ژ بو مـەرابـبیت یار؟
چارەک ببیتن ژ خـواب هوشـیـار
شـیـری هونەرامـە بێتـە دانین؟
قـدری قلمـا مـەبێتـە زانین؟
دەردی مـە ببـینتن عـلاجی؟
علمی مـە ببـینتن ڕەواجی؟

- دوای ئەوە خانی چارە ئەدۆزێتەوە بۆ دەرەکانمان ئەفەرموێ:

گـەردی هەبوا مـە اتیـفـاقـەک
ڤـیکرا بکرا مـە انقـیـادەک
روم و عـرب و عـجم تەمـامی
هەمـیـان ژ مـەرا دکـر غـلامی[*]
تکمـیل دکـر مـەدین و دولت
تحـصیل دکـر مـەعلم و حکمت
تمیـیـز دبون ژ هەڤ مـقـالات
ممتـاز دبون خـودان کـمـالات

## نموونەی چیرۆکی مەم و زینە ڕەمەکییەکە

(برایم پاشا)ی یەمەنی هیچ کوڕێکی نەبوو دەگەڵ وەزیری خۆی هەڵستان ڕۆین بۆ ماڵە خۆلای دوازدە مەنزلان ڕۆین خولا ڕحمی کر وەیسەڵ قەرەنیی ماهی دەشتی نارده کن ئەوان.

بگەڕێنەوە و سێوێکی بەهەشتی پێدا نارد نووستبوون لە پشت سەری وانی دانا ئەوان بگەڕێنەوە نەیەنە بەیتولڵایە ئەوانە بۆ کـوڕێ هاتوون بچنەوە ماڵە خـۆیان ژنی وان زگـیان پڕ دەبێ ایشـالڵایەکی کوڕێکیان دەبێ کوڕی (برایم پاشا) دەبێ نێوی (کاکە مەم) بێ کوڕی وەزیری نێوی (بەنگین) بێ نێویان لێ نان (آغا) و (نۆکەر)!.

خالەق هەر ئەتوێ لەسەر هەمووانە
دێتە ڕووی زەمینێ سێ پەری دەتەرلانە

---

(*) دەروون ئازادێکی وەک (ئەحمەدی خانی)، دوورە لەوەوە کە بەندەیەتیی بوێ بۆ هیچ نەتەوەیەک. لێرەدا تەنیا مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر کوردەواریی یەک بن نەتەوەکانی ڕۆم و عەرەب و عەجەم ناچار ئەبن ڕێزیان لێ بگرن!. (ش. ف)

لەسەر کۆشکی کاکە مەمی کوڕی برایم پاشای یەمەنی دەیاندا سەیرانە.

***

خوشکی چکۆڵە گوتی: بەخوشکانە
ئەمن ببم بەقوربانە!
ئەمەبا (یای زین)یّ هەڵگرین ببەینە یەمەنیّ گەورە و گرانە.
بزانین (کاکە مەم) زەریفە یان (یای زین) زێدە جوانە.

***

«یارەبی (ڕەحمان بکر) نەمریّ!»
بەچوار ڕۆژان ئەو بەندەی بۆ ساحێبی ئەڵمانی کردە تەواوە.
عیسا روح الله لەسەر ساحێبی ئەڵمانی ڕاوەستاوە!
آغای ساحێب بەساغ و سلامتی لە هەموو دەریایان (ب) پەڕیوە.
لە دایک و خوشکی خۆت بکەی سلاوە!

**سەرنج:**

هەروەک لێرەدا دەرئەکەویّ تەنیا نەخوێندەوارەکان لەم جۆرە چیرۆکە خۆشی ئەچێژن خوێندەواران هیچ خۆشییەکی لیّ وەرناگرن.

کەچی بەپێچەوانەی ئەمەوە چیرۆکی (مەم و زینی خانی) خوێندەواران پێی دڵخۆش ئەبن نەخوێندەوارانیش بەمەرجیّ تێی بگەن هەر پێی دڵخۆش ئەبن...

## مەم و زینی بەدەست نووسراوە

کۆنترین و تەواوترین نووسراو کە لەبەر (مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی) کە بەپێنووس خۆی نووسراوەتەوە نووسراونەتەوە ئەمانەن:

١- (مەم و زینی ئەحمەدی خانی)ی بەدەست نووسراوە کە بەپێنووس و خەمخۆرایی (عەزیز کوڕی شیر مام زیدی) لە ساڵی ١١٦٥ی کۆچیی مانگیدا نووسراوە.

٢- «مەم و زینی ئەحمەدی خانی)ی بەدەست نووسراوەکە لە نووسراوخانەکەی خوالێخۆشبوو (سەید حوسێن حزنی موکریانی) و (گیوی موکریانی) دایە ئەم نووسراوە هێشتا دەرنەکەوتووە کە بەدەستی کیّ نووسراوەتەوە لە ساڵی (١١٧٣)ی کۆچیی مانگیدا نووسراوەتەوە.

٣- (مەم و زینی ئەحمەدی خانی)ی بەدەست نووسراوە.

بەڵام نازانین بەدەستی کیّ نووسراوەتەوە وەک ئەڵێن ئەم دانەیە زۆر ناوازەیە لە هەموو دانەکانی تریشی کۆنترە و ڕاستترە دەست زانای پایە بڵند (مەلا عەبدلهادی محەمەد)ی دانیشتووی گوندی (دریاسیە)ی کوردستانی (سوریە) کەوتووە ئەم زانایە ئەم دانەیە بەیارمەتیی (میرانی هەمزە بەگ)ەوە ڕاست نەکاتەوە پاشان ئەیگۆڕێتە سەر زمانی عەرەبی وشەی گران و واژەی نادیاری ناوەرۆکەکەیشی

لێک ئەداتەوە. زانای ناوبراو نووسراوەکەی خۆی و دانە گۆڕاوەکەی وە لێکدانەوەکەیشی (کە بەزمانی کوردییە) بەدیاریی ناردوویە بۆ (گیوی موکریانی) لە (هەولێر) ئێستاکە ئەم دانەیە لە نووسراوخانە تایبەتییەکەی مامۆستای وێژەوان و خەباتکار (گیوی موکریانی) دایە.

٤- (مەم و زینی ئەحمەدی خانی)ی بەدەست نووسراوە نازانین کێ نووسیویەتەوە ئەم دانەیە لە ساڵی (١٣٢٣)ی کۆچیی ڕۆژیدا لە شاری (مەهاباد) لەلایەن مامۆستای بەڕێز (عبدالله ایوبیان) خاوەنی نووسراوی (چریکەی مەم و زین)ەوە بەدەست (مەلا عەبدوڵڵای داودی)یەوە بینراوە ئەم دانەیە زۆر جوان و ڕازاوە نووسراوەتەوە داخەکەم لاپەڕەکانی سەرەتا و دوایی نووسراوەکە ڕزیون.

## مەم و زینی چاپ کراو

١- لە ناوەند ساڵەکانی (١٨٥٥ - ١٨٦٠)ی پاش ز.دا شابەندەری[1] ڕووسیا (ئەلیکساندەر ژاپا) لە شاری (ئەرزڕۆم)ی کوردستانی تورکیادا دائەنیشت. بەیارمەتی زاناکانی کوردی شاری (بایەزید)ەوە گەلێک نووسراوانی بەدەست نووسراوی کوردیی کۆکردەوە ئەو نووسراوانەی برد بۆ باژێڕی (پەترسبورگ)، کە هەندێک لەوانە چیرۆکی (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) بوو. لە گۆڤاری... (Melange Asiatique)دا، بەرگی ٣، ناوەرۆکی (مەم و زینی ئەحمەدی خانی) بەکورتی بەزمانی فەرەنسزیی چاپ کراو بڵاو کرایەوە.

٢- لە ساڵی ١٨٩٠دا لەلایەن (ئوژەن پریم) و (ئەلبەرت سوسان)ی ئەڵمانییەوە گۆڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی و چاپ کراوە.

٣- لە ساڵی ١٩٠٣دا لەلایەن .ئا. ڤون لی کوک)ەوە چاپ کراوە.

٤- لە ساڵی ١٩٠٥دا لەلایەن ڕۆژهەڵاتناس و کورد شوناس (ئۆسکارمان)ەوە بەزمانی کوردی چاپ کراوە و گۆڕاویشەتە سەر زمانی ئەڵمانی. ئەم (مەم و زینە)ی لە دەمی ئاوڕەحمان بەکر وەرگرتووە کە بریتییە لە وێژەیەکی نەتەوەیی (فۆلکلۆر).

٥- لە ساڵی ١٩٢٦دا لەلایەن (هوگو ماکاس)ەوە بەکورتی چاپ کراوە.

٦- لەلایەن (ماکلەر) ناوێکیشەوە چاپ کراوە.

٧- لە ساڵی ١٩٣٦دا هەندێ هۆنراوەی چیرۆکی (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) لە (یەرەوان)[2]دا چاپ کراوە.

٨- لە ساڵی ١٩٤٢دا لەلایەن (ڕۆژەلیسکو)ی فەرەنسزییەوە چاپ کراوە و گۆڕاویشەتە سەر زمانی فەرەنسزی. ئەم ڕۆژهەڵاتناسە زانایە لێکۆڵینەوەیەکی فراوان و قووڵی لە بابەت هەردوو چیرۆکی مەم و زینەوە کردووە کە بەنایابترین بەرهەم گەیشتوتە. وێژەی فەرەنسزیی ئەم بەرهەمەی گرتە باوەش.

٩- لە ساڵی ١٩٦٢دا لەلایەن (م. ب. رودینکو)وە چاپ کراوە و گۆڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی.

---

(١) شابەندەر: کۆنسوڵ.

(٢) یەرەوان: یێریڤان، پایتەختی کۆماری ئەرمینیا -ئەرمەنستان-ی ئێستا.

پێشەکی ئەم نووسراوە لەلایەن مامۆستای خەباتکار و بەڕێز (قانات کوردۆ) وە نووسراوە، کە خۆی لە کوردستانی ڕووسیا لەدایک بووە و لە زانستکۆی لینینگراددا وێژەی کوردی ئەڵێتەوە.

١٠- لە ساڵی ١٩٢٠دا لە ئەستەمۆڵ لەلایەن (میرانی حمزە بەگ)ەوە چاپ کراوە. ئەم چاپە لەسەر (مەم و زین)ە بەدەست نووسراوەکەی (مەلا عەزیز کوڕی شیرمام زیدی) چاپ کراوە.

١١- لە ساڵی ١٩٤٧دا لە شاری (حلب) لەسەر ئەرکی (بشیری شێخ حەسەنی هاشمی) چاپ کراوە.

١٢- لە ساڵی ١٩٥٤دا لەسەر ئەرکی (گیوی موکریانی) چاپ کراوە، لە شاری (هەولێر)دا.

١٣- لە ساڵی ١٩٦٠دا لەلایەن بوێژی بەناوبانگی کوردستانی ئێران مامۆستا (هەژار)ەوە گۆڕاوەتە سەر شێوەی موکریانی، بەهۆنراوە و، لە (بەغدا)دا بەوێنە و نیگارەوە چاپێکی جوان کراوە.

١٤- لە ساڵی ١٩٦٣دا لەلایەن مامۆستای بەڕێز و هۆشیار (عبدللە ایوبیان)ەوە کە لە کوردستانی ئێراندایە بەناوی (چریکەی مەم و زین)ەوە، مەم و زینە نەتەوەییەکە چاپ کراوە و گۆڕاویشەتە سەر زمانی فارسی. ئەم نووسراوە لە (تەورێز)دا چاپ کراوە. لێکۆڵینەوەیەکی نایابی تیا کراوە.

١٥- لە ساڵی ١٩٥٧دا لەلایەن مامۆستای بەڕێز و هونەرمەندەوە (محەممەد سەعید ڕەمەزانی بۆتی) کە یەکێکە لە ڕۆشنبیرانی کوردی (سوریە) لە شێوەی پەخشانێکی جوان و ڕەنگیندا گۆڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. خۆیشم ئەوەم بەپەخشان گۆڕییە سەر زمانی کوردی.

١٦- نیشتمان پەروەر و وێژەوانی بەناوبانگ (جەلادەت بەدرخان)یش لە گۆڤارە نایابەکەی خۆیدا (هاوار) هەندێ لە چیرۆکی مەم و زین بەکوردیی لاتینی لە چاپ داوە. تەنانەت ئەم مامۆستا مەزنە وانەی زمانی کوردیی بەرۆژهەلاتناس (ڕۆژەلیسکۆ) گوتۆتەوە و لەم ڕووەیشەوە کەڵکی بەو گەیاندووە، ئەم گۆڤارە لە ساڵی (١٩٣٢)دا دەرکەوتووە لە (شام)یشدا بەپیتی لاتینی کوردی و پیتی عەرەبی لە چاپ دراوە.

١٧- لە ساڵی ١٩٣٥دا پیرەمێرد بەدەسکارییەکەوە (مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی)ی لە شێوەی چیرۆکێکی کورتدا بەپەخشان بەشێوەی زمانی ناوچەی سلێمانی لە چاپ دراوە هۆنراوەیشی تیایە.

١٨- بێجگە لەو نووسەرانەی کە لەسەرەوە ناومان بردوون ئەم نووسەرانەیش دەربارەی (مەم و زین) و (ئەحمەدی خانی) وتاریان داوە: (ضیاء الدین خالدی، ئەمین زەکی بەگ، دکتور بلەچ شیرکوە، کامەران بەدرخان؛ علاء الدین سجادی، پ. نرخ، ئی. ئا. اوربلی ف. نیکیتین).

١٩- مامۆستا (عبدالله ایوبیان)، خاوەنی نووسراوی (چریکەی مەم و زینی) ئەفەرموێ: [شاکر فەتاح کە نووسەرێکی ئەم چەرخەیە، پارچە هۆنراوە پەخشانەکەی کە ناوی (فرمێسکی کاکە مەم)ە و، لە بەرزترین بەرهەمی وێژەیی ئەو ئەژمێررێ، سروش (الهام)ەکەی لە (چیرۆکی مەم و زین)ەوە وەرگرتووە].[1]

---

(١) بەدوای ئەمەدا مامۆستا (فرمێسکی کاکە مەم)ی دووبارە نووسیوەتەوە، جا لەبەر ئەوەی هەر ئەو پارچە پەخشانە لە جێیەکی تری ئەم کتێبەدا دانراوە بەباشمان زانی لێرەدا هەڵی بگرین.

## پرشنگێ بەرامبەر چیرۆکی مەم و زین

(مەم و زینی خانی) چیرۆکێکی نەتەوەییە (خانی) گیانی نیشتمانپەروەری و خواناسی و مرۆڤ پەروەریی پاڵی پێوە ناوە کە گیروگرفتی کۆمەڵایەتییمان تەنگوچەڵەمەی زرنگکاریی (سیاسەت)مان ئازار و ئاواتی نەتەوەکەمان لە شێوەی ئەم چیرۆکەدا دەربخات.

هەروەها چاوئەندازە جوانەکانی کوردستان و جوانی و شەنگوشۆخیی کچ و لاوە کوردەکان و ژیانی پڕ شادیی چینی باڵا و ژیانی پڕ ئەرک و ئازاری چینی خوارووی لەگەڵ کردەوە و ڕەوشتە شیرینەکانمان و کردەوە و ڕەوشتە ناتەواوەکانمانی بەبەرجەستەیی پێشان داوە.

(مەم) و (زین) کە کوڕ و کچێکی جوان و کردەوە شیرینن. کە خاوەنی دەروونی ئازاد و بیری سەربەستی نەتەوەی کورد پێشان ئەدەن لە جوانی و ئازایەتی و مەردایەتیدا لە ئەڤین و خۆشەویستی و دۆستایەتیدا لە چاکەدانەوە و خۆبەخت کردندا هەروەها لە هیوا و خەباتیاندا بۆ ئازادیی و کامەرانی.

هەروەکە (مەم) و (زین) تووشی نەخۆشی و سەرگەردانی و ماڵوێرانی بوون بەدەست زۆرداریی خونکاری (جزیر و بۆتان)، (زین الدین)ەوە کە سەربەستیی بۆ نەهێشتبوونەوە دڵدارییەکەیان ببەنە سەر و بنە ژن و مێردی یەکتری و هەردووکیانی بەو داخەوە لەناو برد هەروەها نەتەوەی کوردیش لە سەردەمی (ئەحمەدی خانی)دا بێگانەی داگیرکەر و سەرکردە ستەمکارەکانی ناوخۆ سەربەستییان بۆ نەهێشتبووەوە تا بەکامی خۆی بگات و ژینێکی پڕ لە ئازادیی و کامەرانی بژی.

جا ئەو هەژاریی و نەخوێندەواریی و نەخۆشییەی کە تووشی کوردەواریی ئەوساکە هاتبوون (خانی) پەیی پێ بردبوون کە هەرسێکیان بەهۆی زۆرداریی ئەو داگیرکەرانە و ئەو سەرکردە خۆییانەوە پەیدابوو بوون، لەبەر ئەوە (خانی) لە شێوەیەکی تەواو ڕۆشن و ئاشکرادا ئەو زۆردارییە دەردەخات زۆرداریی و دڵ ڕەقی و تێ نەگەیشتوویی و خۆپەرستی و ترسنۆکیی خونکار (زین الدین) لە ئازاردان و دڵ ڕەنجاندنی (زین و مەم)دا بەتەواوەتی دەرئەخات هەروەها بەتەووژم و تیژییەکیشەوە خەباتی یەکگرتن و کۆکی خۆشەویستی و یارمەتی، بەرەنگاریی کردنی ئەو زۆردارییە، لەسەر دەستی پاڵەوانە جەنگاوەرەکاندا: (تاژدین) و (عارف) و (چەکۆ) و دۆستە دڵسۆزەکانیاندا: (مەم) و (زین) و (ستی) و (حەیزەبون) و (گورگین) و، پشتیوانەکانیاندا کە چاکەخوازانی نەتەوە بوون پێشان ئەدات.

ئەو (زین الدین)ەی کە گوێی لە پیاوی جوامێر و مەرد و ئازا و تێ گەیشتووی وەک (تاژدین)ی سەرکردە و زاوای خۆی نەئەگرت و، ئەچو گوێی لە بەدگۆ و نیاز خراپ و ناپاکێکی خۆپەرستی وەک (بەکر مەرگەوەڕ) ئەگرت، کە خۆشیی هەر لەوە وەرئەگرت کە شەڕ و ئاژاوە بنێتەوە و، زیان بەکەسانی تر بگەیێنێ.

ئەو (زین الدین)ەی کە ئەمەندە دڵ ڕەق و خوانەناس بوو، ئەوەندە دوور بوو لە دادپەروەریی و ڕەوشتی زانایانەوە، لە کەینە و بەینەکەی خۆی و (مەم و زین)دا، لە کەینەوبەینەکەی ناوەند خۆی و (تاژدین)دا... نە پرسێکی کرد لە کەس، نە ڕاوێژێکی کرد بەکەس، بەبێ چەندوچوون کردن و لێکۆڵینەوە و پرسیار،

(مەم)ی کڵۆڵی خستە ناو زیندانەوە، (زین)ی بەسەزمانیشی کەنەفت کرد، لە ژوورەکەی خۆیدا، تا ساڵێک لێی نەپرسییەوە. هەردووکیان بەئاهو ناڵە و ڕەنجەڕۆیی و پێ نەگەیشتنەوە کوشت.

بەڵێ ئەو (زین الدین)ە، بەزەبری شۆڕشی نەتەوە کە لەژێر سەرکردەیی (تاژدین)دا سەری گرت ناچار ئەبێ: ملکەچ ئەکات بۆ ڕاستی و دروستی، بۆ دادپەروەریی. ناچار ئەبێ: سەربەستی و ئازادیی ئەبەخشێتەوە بە(مەم) و (زین). ناچار ئەبێ: پێ لە گوناهی خۆی بنێ و داوای لێ خۆش بونیش لە (مەم) و (زین) بکات. ناچار ئەبێ. ئەو گوناهەی خۆیشی بەدەستی خۆی بشواتەوە، بەمارەکردنی (زین) لە (مەم) لە دوا هەناسەی سەرەمەرگیاندا ناچار ئەبێ: بەپێی ئارەزووی (زین)، لە دوای مردنیان. لاشەکەی (زین) بەدەستی خۆی بخاتە ناو گۆڕی (مەم)ەوە. ناچار ئەبێ: حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ئاهەنگ و زەماوەند بۆ ئەو ژن و مێردییەی (مەم) و (زین)ە بگێڕێ. ناچار ئەبێ: تا ساڵێکیش لەگەڵ هەژار و داماو و لێ قەوماو و دڵ بریندار و بەندییەکاندا چاکە و پیاوەتی و دڵدانەوە و بەخشندەیی بکات. تا خواستەکانی (زین) بهێنێتە دی!

(زین الدین) هەرچەندە لە خۆیدا پیاوێکی گەورە و زرنگ و ئازا و نان بدە و بەخشندە و دڵپاک هەڵکەوتبوو، بەڵام لەبەر سەرگەرمی و تێ نەگەیشتوویی و خۆپەرستیی خۆی، جاروبار هەڵەی ئەکرد: فەرمانبەریی خراپی دائەمەزراند. کە یەکێک لەوانە (بەکر ئاغا) بوو، کە کردبووی بەپەردەداری خۆی. بیانوویشی ئەوەبوو، کە فەرمانداریی، جاروبار فەرمانەکانی بەم جۆرە پیاوە خراپانە ئەبێ هەڵ ئاسووڕێ!؟

ڕاستییەکەیشی ئەمەیە کە فەرمانبەری خراپ، بۆ هیچ فەرمانڕەوایی یەک دەست نادات و کەڵکیشی نابێ. بەڵکو بەپێچەوانە زیانی لێ ئەوەشێتەوەو، خراپەیش بەکۆمەڵایەتی ئەگەیێنێ. ئەم دەردەیش نەک هەر لەناو ئێمەدا هەیە، لەناو هەموو جیهانیشدا هەیە.

جا خونکاری (بۆتان) کە (بەکر ئاغا)ی کردبوو بەدەست نێژی خۆی لە کۆشکی شاهانیدا، ئەنجامی خراپ و سزای ئەم هەڵەیەی خۆی هاتەوەڕێ. بەواتایەکی تر: ئەوەی چاندبووی هەر ئەوەی ئەچنییەوە!. لە ئەنجامدا خوشکە نازەنینە بێ وێنەکەی خۆی، (زین) و، ڕازنووسە لاوچاکە دڵسۆزەکەی خۆی، (مەم)ی لە دەست چوو!.

هەروەها خۆشەویستی و ڕێزگرتن سەرکردە (تاژەدین) و براکان و کەسوکار و دۆست و یاری (تاژدین)یشی لە دەست چوو لەگەڵ هی نەتەوەدا!.

تەنانەت کە هاتیشەوە هۆش خۆی، لە دەست ڕیسواکردن و سووککردنی (مەم) و (تاژدین) و توانج و پلاری (زین) و (ستی)ی خوشکەکانیشی ڕزگاری نەبوو!.

ئەنجامی (بەکر مەرگەوەڕ)یش بەوە گەیشت کە لەلایەن (تاژدین)ەوە کوژرا!.

زۆریشی نەمابوو کە ژیان و دواڕۆژی خونکار (زین الدین) خۆیشی بکەوێتە تەنگ و چەڵەمەوە!.

جا (ئەحمەدی خانی) لەم چیرۆکەدا ئەم پەندەمان پێ ئەبەخشێ کە تا سەردار و سەرکردەکانی خۆمان

وا خۆپەرست بن، دەرگـای ناکـۆکی و شـەڕ و ئاژاوەمـان، هەمـوو دەم لێ ئەکـرێتـەوە. کـە بەرەنگـاریی یەکـتریش بووین، بێگـانەی داگـیرکـەر، بەیارمـەتی سـتـەمکارانی ناو خـۆمـانەوە بەئاسـانی دێنە ناو خاکەکەمانەوە و داگیری ئەکەن. چنگیش ئەهاوێژنە کاروبارمانەوە و سەرگەردانمان ئەکەن. کە بێگانە و ستەمکارانی ناوخۆیش داگیری کردین، هەرسێ دەردەکە، وەک: هەژاریی و نەخۆشی و نەخوێندەوایی، لە خۆیانەوە لەناوماندا بڵاوئەبنەوە و، لەناویشمان ئەبەن!.

جا بۆ ئەمەی کوردستان لە دەست ئەم سەرگەردانی و وێرانییە ڕزگار بکەین و ژیانێکی پڕ لە ئازادیی و کـامەرانی بۆ کوردەواریی پێک بهێنین، پێـویسـتـە لە پێش هەمـوو شـتـێکدا خـەریکی چارەسـەرکـردنی فەرمانداریی ناوخۆیین و لەسەر بنچینەیەکی دادپەروەریی دایمەزرێنین. دوای ئەوەیش خەریکی یەکگرتن و کۆکی و خۆشەویستی و یارمەتی بین لە ناوەند هێزەکانی نەتەوەی کورددا، بەجۆرێکی وا کە هەمومـان ملکەچ بکەین بۆ یاسایەکی دادگەرانە و، بۆ پێشەوایەکی نیشـتـمـان پەروەر و خواناس و تێگەیشـتـوو و دادپەرست. دوای ئەوە بەرەنگاریی دوژمنەکانی گشتیمـان بکەین و کوردسـتان لە دەست زۆرداریی ڕزگـار بکەین هەر کاتێ گەیشتین بەم ئامانجەیش ئینجا دەست بکەین بەبەرەنگاریی کردنی هەژاریی و نەخۆشی و نەخـوێندەواریی. تا نەتەوەی کـورد ژیـانێکی پڕ لە کـامـەرانی و ئازادیی بژی و کـوردسـتـانیش ئاوەدان ببێتەوە.

(بەکر مـەرگـەوەڕ) نیـشـانەی ئەو ناپاکی و پوول پەرسـتی و خـۆپەرسـتـییـەیە کـە لەناو نەتەوەکـەماندا بڵاوبوونەتەوە و نەتەوەکـانی تووشی سـەرگـەردانی و ڕیسـوایی کـردووە. نیـشـانەی فـڕوفـێـڵـبـازیی و تەڵەکەبازیی و داونانەوەی دوژمنانی نەتەوەکەیە بریتین لە داگـیرکـەران و لە سـەرکـردە خـراپەکـانی ناو خۆمان.

کـوشـتـنی (بەکر مـەرگـەوەڕ)یش لەلایەن سـەرکردەی شـۆڕشـەوە کـە (تاژدین)ە نیـشـانەی سـەرکـەوتنی دەروون ئازادانی نەتەوەی کوردە بەسەر خراپەکاراندا. نیشـانەی زاڵ بوونی دادپەروەرییە بەسـەر زۆرداریی و نیشانەی دەستکەوتنی ئازادیی و کامەرانیی گشتییە بۆ هەموو کوردەواریی.

ئەمەیش هیـوایەک ئەبەخشێ بەنەتەوەکەمان، کە ئەگەر: «تێ بکۆشێ چەشنی مەرد، زوو ئەگاتە تەخت و بەخت!»، پەشیمـانبوونەوەی خونکار (زین الدین)یش لە کردەوەکـانی خۆی، بەزەیی هاتنەوەی بە(مەم و زین)دا و، دەسـتکردنی بەبەدیی هێنانی ئاواتەکـانی ئەو دوو جوانەمـەرگـە، نیشـانەی ئەوەیە، کە ئەگەر ڕەنج و تەقـەللای مـەردانەی نەتەوە لە ئارادا هەبێ، سـروشـتی دەسـەڵاتداران و کـاربەدەسـتـانیش، ناچار ئەبێ، بەپێی خواست و پێویستی نەتەوە، بگۆڕێ و بێتە سەر باری چاکی.

بەم ڕەنگە چیرۆکی (مەم و زین)ی (ئەحمەدی خانی) چ لە کۆڕی زرنگکارییدا چ لە کۆڕی وێژەیی و خوێندەوارییدا، چ لە کۆڕی کۆمەڵایەتیدا، نرخ و بایەخ و گرنگیمان بۆ دەرئەکەوێ.

چیـرۆکێکە هەمـوو دەم چەشنی گـوڵی هەمیـشـە بەهـار چاومـان ئەگـەشێنێـتـەوە، دڵمـان ئەبووژێنێـتـەوە. چیرۆکێکە تا سـەر ئەتوانین کەڵک و چاکەی لێ وەربگرین. کردەوەی شـیـرین و ڕەوشـتی جوان و گـیـانی نیشتمان پەروەریی و خواناسی و مرۆڤایەتیشی لێوە فێر ببین.

## دواڕۆژی چیرۆکی مەم و زین

چیرۆکی (مەم و زینی ئەحمەدی خانی) لە ڕوویەکەوە چیرۆکێکی ناوازە و نایاب و بەهێزە مەرگەساتێکی کاریگەرە و هەستی پیاویش ئەبزوێنێ لەلایەکی تریشەوە ڕوویەکی نیشتمانی و نەتەوەیی کورد و کوردستان پێشان ئەدات ئازار و ئاواتی نەتەوەی کورد دەرئەخات. ئەمەیش هەمووی لە شێوەیەکی ڕاست و دروست و تەڕ و تازە و پڕ سۆزدا دەرئەبڕێ کە دڵی پیاو کێش ئەکات و، کاریش ئەکاتە سەر هۆش و دەروونی.

(خانی) بەدانانی (چیرۆکی مەم و زین) لەم شێوەیەدا کە هەیەتی خوێندنگایەکی تازەی نەتەوەیی کردۆتەوە بوێژەی کوردی.

کە لە دوای ئەوەوە گەلێک بوێژان و وێژەوانان لەسەر ڕێگای ئەو ڕۆیشتوون... (حاجی قادری کۆیی، پرتەوبەگی هەکاری، زیوەر، فائق بێکەس، ئەحمەد موختار، هەژار، جلادەت بەدرخان، جگەرخوێن، کامەران بەدرخان، کامیل بەسیر، کامەران ئەحمەد)... ئەمانە هەموویان لەسەر ڕێڕەوی ئەو ڕۆیشتوون.

جا هەر لەبەرئەوەیە کە ئەم چیرۆکە ئەمەندە دڵکێش کەرە و ئەمەندە کوردەواریی بەدڵیاندا چووە کە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا کوردەکان ناوی پاڵەوانانی چیرۆکەکە لەکاتی گفتوگۆدا بەوێنە ئەهێننەوە.

لە ئاهەنگە گەورەکانیشدا کاتی هەرە خۆشیان ئەمەیە کە گوێ لە چیرۆکبێژێک بگرن و بەئاهەنگ و گۆرانییەوە (چیرۆکی مەم و زین)یان بۆ بخوێنێتەوە.

بێجگە لەوە چیرۆکەکە کاری لە دڵی جیهانیش کردووە.

هەروەها لەناو چیرۆکە هەرە گەورە و گرنگەکانی جیهانیشدا جێگای بڵندی بۆ خۆی کردۆتەوە، ئەوەیشی خستۆتە مێشکی ڕۆشنبیرانی جیهانەوە کە نەتەوەی کورد خاوەنی گەنجینەیەکی گەورەیە کە پڕیەتی لە گەوهەرانی وێژەی کوردی.

چیرۆکی (مەم و زین)ی خانی لە ڕیزی (ئیلیادەی هومیرۆس)ی یۆنانی و (شاهنامە فیردەوسی)ی ئێرانی و (ڕمیانا)ی هیندستانیدا دانراوە. چیرۆکی (مەم و زین) بۆ سەر گەلێک زمانی گەورە و زیندووی جیهانی گۆڕاوە وەک زمانی: فەرەنسزی و ئەڵمانی و ڕووسی، تورکی و ئەرمەنی و عەرەبی و فارسی. هەروەها چ بەهۆنراوە چ بەپەخشان، چەند جارێکیش گۆڕاوەتە سەر شێوەی موکریانی. بێجگە لەوە (چیرۆکی مەم و زین) کاری کردۆتە دڵ و دەروونی بوێژ و نووسەرەکانیش. کە بەهانەدانی ئەوەوە گەلێک هۆنراوە و پەخشانیان لەسەر (مەم و زین) بەرهەم هێناوە.

ئەم چیرۆکە چەند جارێک لەلایەن هونەرمەندانی کوردەوە لەسەر تەختی لاساییکردنەوە لە شارەکانی کوردستاندا وەک (سلێمانی) و (ئاکرێ) لاساییکراوەتەوە. بەڵام لە شێوەیەکی ساکاردا، نەک لە شێوەی چیرۆکەکەی خانیدا. چیرۆکی (مەم و زین) دواڕۆژێکی گەورەی لە پێشەوەیە

ڕۆژێک دێ: لە شێوەیەکی یەجگار ناوازە و جواندا بەوێنە و نیگاری ڕەنگاوڕەنگەوە پەڕە پەڕەی ئەم چیرۆکە لە چاپ بدرێ.

ڕۆژێک دێ: چیرۆکی (مەم و زین) لە زانستگۆکانی جیهاندا ئەخوێندرێ و لێکۆڵینەوەی قووڵتری تیا ئەکرێ.

ڕۆژێک دێ: لە شێوەی زۆر ورد و شەنگ و شۆخدا، لەلایەن هونەرمەندانەوە ئەم چیرۆکە ئەخرێتە شێوەی چیرۆکی لاسایی کردنەوە و هی سینەماوە. لەسەر تەختی لاساییکردنەوە یاخود لەسەر پەردەی سینەما لاسایی ئەکرێتەوە.

تا هەموو ژیانێکی کوردەواریی سەردەمی چیرۆکەکە، بەهەموو شیرینی و تاڵییەکیەوە بەهەموو جلوبەرگ و خواردەمەنی و ئاهەنگ و بەزمێکیەوە بەهەموو ژیانێکی ساکارانەی نەتەوە و ژیانێکی دەوڵەمەندانەی چینی باڵاوە بەهەموو هەڵپەڕکێ و گۆرانی و ساز و ئاوازێکیەوە، بەهەموو چاوئەندازە جوانەکانی (جزیر و بۆتان)ەوە بخرێتە ناو فیلمی سینەمای ڕەنگاوڕەنگەوە، ئەوساکە فلیمەکە ئەبێتە گەورەترین هۆی بەرزکردنەوەی پایەی نەتەوەی کورد لەناو نەتەوەکانی جیهاندا لە کۆڕی نیشتمانی و وێژە و مێژوو و شارستانێتی دڵتەڕیی و کردەوەی بڵند و جواندا.

هەروەها ڕۆژێکیش دێ: کە وێژەوانەکانمان لە شێوەیەکی تەڕ و تازەدا و لە کۆڕێکی گەورە و فراواندا، دەست ئەدەنە زیندووکردنەوەی چیرۆکە نەتەوەییەکانی ترمان کە لە ژمارە نایەن و، بەهەزاران ساڵ نیشان بەسەردا تێپەڕیوە، کەچی هێشتا هەر لەناو سنگی چیرۆکبێژەکانی نەتەوەی کورددا ماونەتەوە.

وا بۆ نموونە ناوی هەندێ لەو چیرۆکانە و لەو چیرۆکبێژانە پێشکەش بەوێژەوانە بەڕێزەکانمان ئەکەم هیواداریشم بەخوا کە ئەوانیش پەیڕەویی مامۆستای مەزنمان (ئەحمەدی خانی) بکەن و ئەم چیرۆکانەیش لە شێوەیەکی ناوازە و نایاب و باودا سەرلەنوێ دابڕێژنەوە و، پێشکەش بەنەتەوەی کوردی خۆشەویستی بکەن.

## ناوی چیرۆکە بەناوبانگەکانی کورد

ئاسکۆڵە، ئاگری، ئاغای بەمێزەریان، ئایشەگوڵ، ئەحمەد شەنگ، ئەوداڵ ئۆمەر ئەوسانە، عەلی هەریری، عەوداڵی، عەزیز داسنی، بابکو، باپیرە، باوانم، بارام و گوڵندام، باشوی زوزانان، بەهارە بەیتا بولبول، بەیتی عەلی بەردەشانی، بەیتی ساڵی قاوەچی، بلە برایمۆک، بۆڕی میرسیڤدینی، مەلا زێندینان، بوهاری کوردی بۆزبەگ، بێڵندانە، بێماڵە، بەدرخان پاشا، جانۆ، جەعفەر ئاغا، جمبالی، جمجمە سوڵتان، جوانمێر و دایکی، جولندی، عەبدولڕەحمان بابان، عوسمان پاشای بەبە، خەج و سیامەند، ماڵە فارس ئاغا، دادوەرە، دەلایلو، دمدم، دوانزە سواری مەریوان، ڕۆنۆ مایۆ، فەرهاد و شیرین، فەرهەت ئاغا، فریشتە، گۆران گاسمۆ، گەڵباغی، گەنجۆ، گەنج خەلیل پاشا، گەلۆ، گولان گولان، گۆرانی، گۆرانشا، گوڵناز و کەلاش، گوڵەزەرد، گوڵێ و کابەنگەرۆ، گوڵێ گوڵێ، هاوینە، هەڵپەڕینەوەی کورمانجەتی.

هەڵۆی کوردەواریی، هەسپی ڕەش، هەورامانی، حەمەتەیار، حەنیفە، حەوت دەروێش، حەتەم، حەوسەت.

عەزەدین شێر، ئیمامی حەمزە، کاکۆ، کاکەسوار، کاک هەمزە، کاکە میر و کاک پیر، کاک سەلیمی ئازاد خانی، کاک باپیری مەنگوڕ، کاک هەمزەی مەنگوڕ، کاک برایم دەشتی، کاک سەعید کوڕی قۆچ، عوسمان بەگی بەبە، کانەبی، کانەبی و خوازی کانەبی و نوعمان، کورمانجی، کەڵ و شێر، کەڵە ئەسپ، کەویار، کوێستانی کوردستان، کورد و گۆران، کورکەماڵی (بەختیار)، کوڕە کەچەڵە، کولینگۆ، لاس و کمژاڵ، لایلای، لەشکری، لەیلە و مەجنون، لاوی سوربەش، لوڕ و سۆران، ماینی شێ، مەلای گورەمەڕێ (مەلا خەلیل) مەم و زین، مەمی ئالان، محەمەد خان، مێرامە، میهر و وەفا، میری ڕەوەندی، میری موکریان، نادر شا، ناسر و ماڵماڵ، پیر فەرخ و یای ئەستی پیرۆزو، پیری ژیر، پیرێژن و سەی بۆد، پیرەوبایز، قەبری، قوچی وەتمان قڕ و گوڵەزەرد، ڕاوە پڵنگ، ڕەشەراو، ڕۆژڕۆی یای گوڵێ، بۆ هۆزی بریندار، ڕۆستەم، ڕۆستەم بەگ، ڕۆستەم و زۆراو، ڕۆڵەی دایکی ڕۆڵەی ڕەوادی، ڕۆڵەی نەبەز، ڕیوێڵ (کرمانج)، سایل، سترانا جاسمۆ، سترانا فەرخۆ، سەگی کورمانجەتی، سەیدەوان، سمکۆی مەزن، سنوور، سوارۆ، سوارە، سواری جوانڕۆ، سورەگوڵ، سیاپۆش، سیاچەمانە، شاریار، شابازی موکری، شاکەومەسور، شاربازێ، شازادەی شادی، شاهەڵۆی ڕەوەندی، شامەیون، شەڕەتۆڵە، شەڕە های شەڕە، شەڕی نوسەزارێ، شەریفە، شەنگە، شەم و شەمزین، شەمێ، شەوونیوەشەو، شۆڕەلاو، شێت و ژیر، شینی جوانمێرێ، شێرۆ (سەید تەهای شەمزینانێ)، شێر و شەپاڵ، شێری نەبەز، شێخ عەبدوللای غازی (شەمزینان)، شێخ عەبدولقادر، شێرکۆ، شای زەند، شۆڕەلاوی زەند شوانە، سەلاحەدین، تاقەسوارە، ترکانە، تیری گەروماری، خانی بەقەیغان، خالید ئاغا، خەزال، خەزیم خەیاڵ، خوازێ، خورشید و خاوەر، یارێ یای ئەستی، یوسف بازاڕی، یوسف و سەلیم، یوسف و زولەیخا، زازایی، زاڵم زەردەهەنگ، زەردوشتی، زەمبیل فرۆش، زەینەڵ، زستانە زۆزانا کورمانجی».

## ناوی چیرۆکبێژەکانی کورد

لە سنگی ئەم چیرۆکبێژانەدا زۆربەی گەنجینەی وێژەی کوردی پارێزراوە: «عەلی بەردەشانی، برایمە گۆچ، عەبدوللا دەروێشی، فەقێی تەیران، عەبدوللا ڕەشی گەنجالی، هەڵکەتی، حەمزە بەگ، ئەحمەد حەڵوا، عەلی حەریری، مەلای جزیری، ڕاوکەوان، ڕەحمان بەکر، کاک ڕۆستەم سەید عەبدوللای بوڕهانی، خرناڵ.

پوور، پەریزادەی لەشکری، بای کابان، بای ناز، پوورزلەخا، زلەخانەستی.

کاک مەلا، گللیر عەلی، برایمی بایز گولاوی، کاک هەباس خرەی مەربۆکران و کوێخا ساڵح، میرزا قاسم قازی، میشۆ، سەبری، سورە محەمەد ئامانی، زاڵە.

**سەرنج:**

ئەم چیرۆکبێژانە هەندێکیان خوێندەوار و زانا بوون. وەک (فەقێی تەیران) و (مەلا جەزیری)... خاوەنی بەرهەمی بەناوبانگن.

## وتەی ڕۆشنبیرانی جیهان

## دەربارەی چیرۆکی مەم و زین و ئەحمەدی خانی و وێژەی کوردی

* لە ساڵی ١٨٤٠دا (ف. دیتتل) کە زانایەکی رووس بووە، بەناو ڕۆژهەڵاتی نزیکدا گەشتێکی کردووە، لە کوردستان گەلێک نموونەی وێژەی کوردی چاوپێکەوتووە. لە نووسراوەکەی خۆیدا ئەڵێ:

«من هەرگیز ئەوە بەمێشکما نەئەهات کە هۆزەکانی کورد؛ کە خوێندەوارییان لەناودا کەمە، ئەمەندە زۆر و بێ شومار بەرهەمی وێژەیی دەستنووسیان هەبووبێ بەزمانەکەی خۆیانش».

***

* (ئی. ئا. نوربلی) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسە ئەڵێ:

«(ئەحمەدی خانی)، لە ڕیزی (روستاولی)ی گورجستان و (فیردەوسی)ی ئێران دایە. ئەم بوێژانە هەرسێکیان دۆست و دڵسۆزی نەتەوەی خۆیان بوون».

***

* دیسانەوە (ئی. ئا. نوربلی) ئەڵێ:

«ئەحمەدی خانی لەناو هەموو کوردستاندا ناوبانگی بڵاوبووتەوە. تێکرا هەموو کوردێکیش ئەحمەدی خانی بەبوێژ و وێژەوان و دۆستی نەتەوەی کورد دائەنێ».

* خاوەن لێکۆڵینەوەی ئەورووپایی (پۆل ئابێ بەیدار) ئەڵێ:

«زمانی کوردی، لە بنچینەدا زمانێکی بوێژانەیە. کوردەکانیش بەجۆرێکی تێکڕایی خاوەن هەست و تەرزوو تاسەن، هۆنراوە خوازن. هەر کە لە دایک ئەبن ئارەزووی چیرۆک خوانی ئەکەن. گۆرانی ئەڵێن پەیوەندییەکی زۆریشیان بەهۆنراوە و ساز و ئاواز و هەڵپەڕکێوە هەیە. چیرۆکبێژەکانیان خۆش ئەوێ و ڕێزیشیان لێ ئەگرن».

* (قانات کوردۆ) کە مامۆستایەکی وێژەی کوردییە لە زانستگۆی (لینینگراد)دا، لە پێشەکیی نووسراوی (مەم و زین)دا کە لەلایەن (م. ب. رودینکو)وە چاپ کراوە و کراوە بەزمانی رووسی، ئەڵێ:

«لە ساڵی ١٩٣٣دا لە (یەریڤان)دا کۆگرەیەکی کوردناسان گیرا و بڕیاریان دا کە چیرۆکی (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی بەتیپی لاتینی بۆ کوردەکانی سۆڤییێت لە چاپ بدەن».

* (دوکتور بلەچ شێرکۆ)، لە نووسراوە بەنرخەکەیدا، (القضیە الکردیە) ساڵی ١٩٣٠ ئەڵێ:

«ئەحمەدی خانی، زانایەکی گەورە و بوێژێکی دڵدار بووە. بێجگە لە هۆنینەوەی هۆنراوە، هۆگرییەکی تەواویشی بەهونەرە جوانەکانەوە بووە چیرۆکی (مەم و زین)یش کە زۆر بەناوبانگە و بێ وێنەیە لە بابەتی خۆیدا، مەگەر (ئیلیادەی هومیروس)ی بگاتێ، هی ئەوە».

## برانەوەی وتار

جا ئەگەر گیانی بوێژی مەزن و مامۆستای وێژەوانی بەڕێز، (ئەحمەدی خانی) بەم وتارەی من شادمان بێ، خۆم بەکامەران ئەزانم. ئەمەندە و بەئاواتەوەم لە دەرفەتێکی تردا دەست بکەم بەچاپ کردنی چیرۆکە گرنگ و بەنرخەکەی (مەم و زین)، کە گەوهەرێکە لە گەنجینەی کوردەواریی و هیواداریشم بەخوا کە چاپ کرا لە شێوەی تازەیدا نەتەوەی کوردی بەڕێز تەواو کەلکی لێ وەربگرێ(*).

سلێمانی: شاکر فەتاح

١٩٦٩

(*) کەرستەی ئەم وتارەم لەم نووسراوانە و لە گەلێک لێ کۆڵینەوەی ترەوە وەرگرتووە.

١- چریکەی مەم و زین - عبیداللە ایوبیان.

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی - علاءالدین سجادی.

٣- مەم و زین - گیوی موکریانی.

٤- مەم و زینی خانی - هەژار.

٥- مەم و زین - م. ب. رودینکۆ. پێشەکی قانات کوردۆ.

٦- القضیە الکردیە - دوکتۆر بلەچ شێرکۆ.

٧- دیاریی لاوان - لاوانی کورد.

٨- مەم و زین - محمد سعید رمضان البوطی.

# داماوی موکریانی

نووسراوێکه:

چیرۆکی ژیانی زانا و مێژوونووس وێژەوان و نیشتمان پەروەرێکی گەورەی کورد (سەید حوسێن حوزنی موکریانی) پێشان ئەدات

## پێشەکی

(داماو) یاخود (سەید حوسێن حوزنی موکریانی). وەک ئەستێرەیەکی گەش لە (سابلاخ)ەوە بەسەر شاخەکانی کوردستانی گەورەدا کشا و گەیشتە ئاسمانی شارە بەناوبانگە جوانکیلانەکەی (ڕەواندز). ئەو ناوچەیە کە گەلێک ساڵ بوو شەوەزەنگی نەخوێندەواری و بەدکاری تاریکی کردبوو، (داماو) بەبیروباوەڕە پڕشنگدارەکانی و، نووسراوە کوردییە نرخدارەکانی و، چاپخانە خنجیلانەکەی خۆی ڕۆشنی کردەوە. بیروباوەڕی پڕ و پووچ و خواروخێچی بێگانە پەرستیی لە مێشکی هەزاران کوردی (ڕەواندز) کردە دەرەوە و، لە جێی ئەو بیروباوەڕی پیرۆز و بەرزی (کوردایەتی)ی دامەزراند. ئەو کاتە ساڵی ١٩٢٦ بوو. (داماو) کە لە شاری (حەلەب)دا بەنهێنی هاوکاریی شۆڕشگێڕەکانی (کوردستانی ژووروو)ی ئەکرد لە دژی (تورکە کەمالییەکان)، کە لە بەڵێنی خۆیان پەشیمان بووبوونەوە و مافی کوردییان خستبووە ژێر پێوە، لەلایەن ئەوان و فەرەنسزەکانی دۆستیانەوە تەنگەتاو کرابوو، تووشی بەندیخانە کرابوو، ئازار و زیانی پێ گەیێندرابوو، کاتێ کە لە بەندیخانە ڕزگاری بوو، نەوەستا دەمودەست بەخۆی و چاپخانەکەیەوە دەربازبوو و خۆی گەیاندە (ڕەواندز). تا ساڵی ١٩٤٣ لەوێ مایەوە. پاشان لەلایەن هەندێ کەسانی خراپ و فەرمانبەرانی ناپاکەوە ئازاردراو خرایە تەنگانەوە. دەربازبوو و، پەرەوازە بوو، بۆ (بەغدا) تا ساڵی ١٩٤٧یش هەر بەنووسین و چاپ کردنەوە خەریک بوو، تا گیانی پاکی بەخاک سپارد.

(داماو) لە بنەماڵەیێکی خوێندەواری هەژاری شاری (سابلاخ)دا لەدایک بوو. ئەوساکە ساڵی (١٣١١)ی کۆچی بوو. هەر کە چاوی کردەوە، نیشتمانەکەی خۆی لەژێر چنگی زۆرداریدا دی، وێرانی کردبوو. لە باوکی و نەنکی و خاڵە خوێندەوارەکانیەوە ئازار و هاوار و ئاواتی (کوردستان) تێ گەیشت. بەوە گیانی (کوردایەتی)ی کرا بەبەردا. هەندێکی خوێند و لە تەمەنی دوانزە ساڵییەوە لە نیشتمانەکەی خۆی جیا بووەوە و، کەوتە دوای خوێندن و فێربوون و پیشەسازی، لەناو کوردستانی گەورە و خاکە دراوسێکانیدا. دوایی بەکامی خۆی گەیشت و بوو بە(زانایەکی نیشتمان پەروەر) و (وێژەوانێکی ڕێ پێشاندەر) و (پیشەسازێکی دەست ڕەنگین) و مێژوونووسێکی هونەرمەند. ژیانێکی ساکارانەی

هەژارانە ژیا، پڕ لە کولەمەرگی. جاریەجاریکیش ئەحەسایەوە و ئەبووژایەوە. بەڵام سامانێکی گەورەی نرخداری لە نووسراوانی خۆی و کەسانی تر پێشکەشی (گەنجینەی زانست و هونەر و وێژەی کوردی) کرد. (داماو) ئەوەندەی بۆم دەرکەوتووە: (٤٧) نووسراوی کوردیی داناوە. لەمە (١٧) نووسراوی چاپ کردووە. (١٠) گۆڤار و ڕۆژنامەشی دەرهێناوە. (١٢) نووسراوی کەسانی تریشی لەسەر ئەرکی خۆی چاپ کردووە. وەک مامۆستا گیوی برای ئەڵێ نووسراوانی تریشی هەبوون، نەماون، لەبیر چوونەتەوە. ئەمانە و وەک بۆم دەرکەوتووە، (داماو) یارمەتی دەری کۆمەڵە شۆڕشگێڕەکانی کورد بووە. دەستی داماو و لێ قەوماوانی کوردی گرتووە، چ بەپارە، چ بەکار.

داخەکەم (حوزنی) تاما ژیانێکی تاڵی ڕابووارد، نرخی خۆی پێ نەدرا. ڕێزی تەواوی لێ نەگیرا. بەپێچەوانەوە ئازار درا. زیانی پێ گەیێنرا. بەڵام لە هەموو دەمێکا نموونەی زرنگی و مەردایەتی و شۆڕشگێڕی و نیشتمانپەروەری بوو. بۆ بیروباوەڕی (کوردایەتی) ئەژیا، نەک بۆ خۆی.

(داماو) توانی بەژیانی خۆی، ژیانی هەزاران کورد بگۆڕێ و ئاراستەیشی بکات بۆ سەر ڕێگای نیشتمان پەروەری. پیاوی وا شایستەی ئەوەیە (پەیکەر)ی بۆ بکرێ. (پاشماوەی نووسراوە دەستنووسەکان)ی بۆ لە چاپ بدرێ. خانوو و باخچە و نووسراوخانە و کەلوپەلەکانیشی بکرێن بەناوازەگاهێک بۆ ئەوانەی دێنە (ڕەواندز) و (داماو) و (کورد)یان خۆش ئەوێ. ئێمەیش ئەگەر ئەمەمان لە دەست بێ بۆ (حوزنی)ی بکەین، گیانی شاد ئەکەین، هانەی هەموو نووسەر و زانا و هونەرمەندێکی کوردیش ئەدەین کە وەک ئەو خۆی بەخت بکات لەپێناو (کورد) و (کوردستان)دا.

دروود بۆ گیانی پاکی (حوزنی) کە سەری خۆی و ئێمەیشی بەرزکردەوە.

سلێمانی: ١٩٧٢/١/٦

شاکر فەتاح

## پێگەیشتنی داماو

ناوی خۆی (حسێن کوڕی سەید عەبدوللەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ لەتیف)ی خەزاییبیە. گەلێک نازناویشی بۆ خۆی بەکارهێنا، وەک: (حوزنی)، (خدۆک)، (داماو) (بێژەن). بەڵام لەم دواییەیدا، (داماو)ەکەی لە هەموویان زۆرتر بەکارئەهێنا.

لە ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٢ی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (١٣١١)[1]ی کۆچیدا، لە شاری (ساباڵخ)، لە گەڕەکی (حاجی حەسەن)دا لەدایک بووە.

هەر لە منداڵییەوە نیشانەی وت و وریایی و زیرەکی و ژیری و گورج و گۆڵیی پێوە دیاربوو. تەنیا لای باوکی و خاڵەکانی خۆی خوێندنە سەرەتاییەکانی بەفارسی و بەکوردی و بەعەرەبی خوێندووە. لە تەمەنی دوانزە ساڵییەوە لە ماڵی باوکی دوور کەوتۆتەوە و ئاوارە بووە. بەناو گەلێک شار و دێهاتی

(١) ١٣١١ک: ١٨٩٠.

کوردستانی گەورە و خاکانی تردا گەڕاوە. لەهەر شوێنە شتێک فێربووە. لە زۆر کاتیشدا خۆی خۆی فێرکردووە. تا وای لێ هاتبوو، لەم دواییەدا، بەتەواوەتی لە زانستەکانی ئایین و مێژوو وێژەی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیدا قاڵ بووبوو. هەروەها لە زمانەکانی ڕووسی و فەرەنسزییشدا شارەزا بووبوو. بێجگە لەوە فێری گەلێک پیشەسازیی بەنرخیش بووبوو، وەک: (چاپگەری) و (مۆرهەڵکەندن) و (خۆش نووسی) و (نووسین لەسەر مس و زەرد و شووشە و بەردی نرخدار و دار) و (مۆری لاستیک) و (زینکۆغراف) و (وێنەگری) و (کلێشە هەڵکەندن).

ئەرک و ئازاری ئاوارەیی و، ناخۆشی ژیان و گوزەرانی ناو کوردستان، بەهۆی زۆرداریی داگیرکەران و زۆر و ستەمی ناو کوردەوارییەکە، خۆیەوە، (داماو)ی تەواو پێ گەیاندبوو. کە لە ساڵی ١٩٣٤دا دییم، (داماو) پیاوێکی زرنگ و مەند و نەرم و نیان و تێگەیشتوو و ژیرم هاتە پێش چاو. دڵی پڕ بوو لە خەم و خەفەت بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی، دڵی پڕ بووبوو لە گلاراوی بۆ کەساسی و ڕەنجەڕۆیی خۆی بەدەست ناشێتی و بەدخوویی هەندێک لە هاونیشتمانەکانی خۆیەوە. هەندێ جاریش ڕۆژگار لایەکی ئەکردەوە، لە دەستکورتی و نوشوستی و بەندیخانە و ئاوارەکردن ڕزگاری ئەبوو، پشوویەکی ئەدا و ئەحەسایەوە، بەڵام هەرگیز نیشتمان و نەتەوەکەی خۆی لەبیر نەئەچووەوە. بەو پارانەی دەستی ئەکەوتن و بەو ناز و جیازەی ئەهاتە بەردەمی، بەکەڵک کوردە لێقەوماو و بێچارە و هەژارەکان ئەهات، وەک لە (سوریە) و (لوبنان)دا کردی. هەموو دەمێکیش تا دەستی ڕۆیشتبێ بەنهێنی فەرمانی گرنگ گرنگی ئەبینی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانی کوردستاندا. لە (حەلەب) و (ڕەواندز) و (هەولێر) و (سلێمانی) و (بەغدا)یشدا، بێ ووچان خەریکی نووسین و چاپکردن و بڵاوکردنەوەی نووسراوانی کوردی بوو.

## ڕەوشت و سروشتی داماو

(داماو) ئۆقرەی بەخۆی نەئەگرت. پیاوێکی ڕەهەندەبوو. بەدوای زانیاری و کۆکردنەوەی نووسراوانی کوردی و ئەو نووسراوانەدا ئەگەڕا کە لە (کورد) و (کوردستان) ئەدوان. بێجگە لە کوردستان بەخاکی (ڕووسیا) و (تورکیا) و (ئێران) و (ئەفغان) و (سوریە) و (لوبنان) و (میسر) و (حیجاز) و (فەرەنسە)یشدا گەڕا و گەشتی کرد[1]. وەک هەنگ کە لە هەر گوڵەمژێک ئەکات و لەو گوڵ ئاوانە هەنگوین دروست ئەکات، (داماو)یش لە هەر خاکە هونەرێک و بەهرەیەک فێر ئەبوو و، زانستێکی وەدەست خۆی ئەخست. پاشان کە هاتەوە کوردستان ئەو هەموو کۆمەڵە زانست و هونەر و وێژانەی لە شێوەی وتار و نووسراو و گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا. وەک چەپکە گوڵێک پێشکەشی کوردەواری کرد.

(داماو) پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەی قژ زەردی خورمایی دەم و چاو سوور و سپی بوو. ڕیشێکی تۆپی پێوەبوو. لە چاوە گەشە جوانەکانیەوە پرشنگی زانیین و شارەزایی ئەهاتە دەرەوە. ڕووخۆش بوو. قسە شیرین بوو. هەرگیز پیاو لە هاودەمی تێری نەئەخوارد. کانێک بوو بۆ شارەزایی و هونەرمەندی و

---

(١) جێگای گومانە ئەم شوێنانە چووبێ، د. کوردستان موکریانیش لە (ڕووناکی)دا تەنیا باس لە (ڕوسیا و ئەستەمبوڵ) دەکات کە سەری لێ داون.

ڕەوشت و خـووی بڵـند. دڵ فـراوان بوو. دەست بڵاو بوو. دڵـتـەڕ و دەست ڕەنگین بوو. لە هەر کـۆڕێکا بتدیبایە کەڵکی لێ وەرئەگیرا. ئەو هەستە نیشتمان پەروەرییەی ئەمەندە کڵپە دار و بەتین بوو، لە ماوەی چەند ساڵێکا توانی ناوچەی ڕەواندز لە بێگانە پەرستییەوە وەربگێڕێ بۆ کورد پەرستی. (داماو) هەمـوو ئامـانجێکی ژیانی: (پێشخستنی کـورد) و (ئاواکردنەوەی کوردستـان) بوو. جا بەو زۆرزانی و شـارەزاییـیـەوە کـە هەیبـوو لە کـاروباری ژیانـدا توانی گـەلێک پیـاوی گـەورە گـەورە و نـاودار، چ لەناو کوردەواریدا، چ لەناو بێگانەکاندا بکات بەدۆستی خۆی، هەر بۆ ئەو ئامانجەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو دۆستایەتییەی ناوەند خۆی و ئەوان بەکار بهێنێ بۆ کەڵکی کوردەواری. لەمەیشا زۆر سەرکەوت.

(داماو) پیاوێکی بەئارام بوو. بەرگەی کارەساتی ناخۆشی جیهانی بەسنگێکی فراوانەوە ئەگرت. جا چونکە سەربڵند و خاوەن ئایین بوو، لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا ساکار و هەژارانە گوزەرانی ئەکرد. بەڵام لە بەرامـبـەر ئەرک و ئازاردا؛ کـۆڵی نەئەدا ورەی بەرنەئەدا، تـا نەگـەیشـتـایە ئامـانجـەکـانی خـۆیشی وازی نەئەهێنا.

## گەر و گێچەڵ لە کۆڵی نەئەبووەوە!

(داماو) بلیمەتێک بوو بۆ خۆی. بەهەموو هێز و تەووژمێکیەوە خەباتی ئەکرد. ئەو لەگەڵ ئەمەیشدا کە بەتەنگ خۆشگوزەرانیی خۆیەوە نەبوو. ژیانێکی کوڵەمەرگی ئەژیا و پێیشـیەوە ئارامی گرتبوو، بەڵام لەسەرێکەوە دوژمنانی کورد لەسەر ئەو خەباتانەی کە ئەی کرد، گەڕیان پێ ئەکرد و تووشی مەینەتییـان ئەکـرد. لە سـەرێکی تریشـەوە ئەوانەی بەبەرزبوونەوە و ڕێزگـرتن لەوەوە، چاویان بەرایی نـەئەدا بیـبـینن، هەموو جۆرە تەڵەکەبازییەکیان لەگەڵدا ئەکرد و تووشی سەرگەردانییان ئەکرد. جاری وایش هەبوو هەردوو جـۆرە دوژمنەکـانی لە دژی ئەو یەکـیـان ئەگـرت و تووشی بەندیخـانـە و ئاوارەکـردن و هەژاری و ئازار و ڕیسـوایـیـان ئەکـرد. هەندێ جـار فـەرمـانـدارەکـانی (ئێـران) و (تورکـیـا) و (عـێـراق) و (سـوریە) و دەسەڵاتدارەکانی (فەرەنسز) و (ئینگلیز) و نۆکەرەکانیـان لە فەرمانبەران و مەلاکان و سەرەک هۆزەکان، لە پێ شوێنی سەری ئەگەڕان، هەریەکەیان لە شوێنێکا و لـە شێوەیەکا و لە تافێکا ئازاری ئەدا و زیانی پێ ئەبەخشی. (داماو) جاروبار ئەو تەنگ و چەڵەمانەی خۆی بەدڵێکی پڕ لە ئاگرەوە ئەگێڕایەوە. دڵی پیاوی ئەسووتاند. وەک چەرە دووکەڵ هەناسەیەکی سارد و ڕەنجەڕۆیی لە دڵ و دەروونی و دەمی ئەهاتە دەرەوە. کـەچی ئەوەندەی پێ نەئەچوو، دەسـتی ئەدایەوە خـەباتە بەنرخـەکـانی خـۆی، وەک: (دانانی نووسراو) و (گـۆڕینی نووسراو بەزمـانی کوردی) و (چاپکردنی گـۆڤار و ڕۆژنامە و نووسـراوان بەزمـانی کـوردی) و (بڵاوکردنەوە)یان بەکـوردسـتـان و هەمـوو جیـهـاندا، لەگـەڵ (یاریدەدانی هەمـوو خەباتێکی شۆڕشگێڕانە لە کوردستاندا). هەر بەو خەباتانەیش خۆی لەبیر ئەچووەوە!.

## داماوی بوێژ

(داماو) جار بەجارێ داخی دڵی خۆی لە شێوەی هۆنراوەدا هەڵ دەڕشت. ئەمە چەند دێڕێکە لەو چامە (قصیدە)یەی کە لەناو بەندیخانەی (موصل)دا هەڵی بەستووە، لە ١٩٤١/٥/٢١دا:

«أدیب و زانای قـوومی بەختـەوەر
ئازاد ئەژین و ناکـێشن کـەدەر
هەمـوو خـاوەندی ناو و نیـشـانن
بەمـڵک و ثروت، بەڕێز و شـانن
چۆن هەڵ بسـووڕێن بۆیان ثنایە
قـسـەیان فـەنە و پەندە و دوعـایە
ئەمن کـە تأریخ نویسی کـوردم
بەبرسی و ڕووتی و رذیلی مـردم
خـەو و خـۆراکم ئاه و حـسـرتە
ڕۆژی دڵشـادییم حـپـسی و ذلـتـە
بەدناو و ریسـوا، بێ پشت و پەنا
بێ یار و هاودەم بێ ڕێز و دڵخـوا
لەبەر بێ کـەسی دائم ملکەچم
ئامـانجی بەلا و فـتنەی بێ وەجم
من بێـجگە لەوەی أدیبی کـوردم
تأریخ نویسی زەمـانی کـوردم
تاوانم چییـە؟ کـوانێ گـوناهم؟
مـاکـینەی گـەڕت بشکێنێ ئاهم!
(داماو)وەکو کورد بێ سووچە و تاوان
لە خـوا بەولاوە نیـەتی خـاوان».

***

هەندێ لە مەلاکانی ڕەواندزیش کە ئەوپەڕی ئازاریان ئەدا، (داماو) لەم شێوەیەدا داخی دڵی خۆی بەرامبەر شارەکەیان دەردەبڕێ:

«خـراپێکی کـە تۆ لە منی دەبینی
دوو پیـتـە پێت بڵـێم با دانەمـێنێ
یەکێ کـوردم، دوورەم ڕاسـتـە وتارم
لەوەم زیاتر نیـیـە سووچی نهێنی

لەوێ ڕۆژێ وە بەدبەخت و کەنەفتم
کە هاتمە شارێکی وا؛ مەرگە ژینی
گرفتاری خەم و دەردێکی وا بووم
نییە ڕزگاری تۆ مەرگم ببینی
لە دەست (کوردان) برا ژینم بەلایە
خۆراکم تاڵە، کارم دڵ برینی
خەم و دەرد و بەلا و گێچەڵ و شەڕ
بەرێژەن دێ بەسەرما دەم کەوێنی
وەها (داماو)ی دەستی جەهلی کوردم
کەنەفتی و ناهومێدیم کەس نەبینی»

***

هەروەها (داماو) دادی بوو لە دەست کاربەدەستە نەزانەکان، ئەیگوت:

«ئەگەر ڕووت و نەدار و بێ کەوابم
وە گەر برسی و گرفتاری هەوابم
لە خوێش و نیشتمان ئاوارە مابم
لە دەست یار و نەیارا سەر شێوابم
لەژێر جەور و جەفا و توهمەت ڕزابم
لەنێو تاریکی کونجی غەم خزابم
وەکو (مەم) بەندی زنجیری بەلابم
وەکو (بێژەن) لە چاڵاوی قوڵابم
أسیری ظلم و إستبدادی وایم
لە خاکی خۆم غەریب و بێ نەوابم
لەنێو بێگانە داماوی قضابم
بەبێ خزم و کەس و باب و برابم
ئەوەم پێ چاترە، نەک سەر نەوی کەم
لەپێش گەورەی نەزان گەردن کەچێ کەم!»

***

کەچی لە ساڵی ۱۹۵۳دا، بەرامبەر بەوێنەیەکی خۆی گوتوویەتی:[۱]

«وێنەی وقـــار و عـــزم و ثبـــاتم
ڕاوەســــتــــە هەتا هاتی وڵاتم!»

لەم وێنەیەدا (حسێن حزنی موکریانی)، کە لە نووسراوی (وێنەگەری و کۆڵێن)دا چاپی کردووە،[۲] بەجلوبەرگی کـوردییـەوە، لە شـێـوەیەکی شـەنـگ و شـۆخـدا، گـۆچانەکـەی گـرتـووە بەدەسـتـەوە و، ڕەپ ڕاوەستاوە، ڕووی کردۆتە ئاسۆ، چاوەڕوانیی دواڕۆژێکی پڕشنگدار ئەکات بۆ (کورد) و (کوردستان).

## شاکارەکانی داماو

ئەم نووسراوانەی (سەید حوسێن حوزنی) یاخود (داماو) دایناون و لە چاپی داون ئەمانەن:

١- غونچەی بەهارستان.

٢- پێشەوای ئایین.

٣- دێرێکی پێشکەوتن. مێژووی دوو بنەماڵەی کوردە کە لە ئاووربایەگان و دیاربەکردا فەرمان ڕەوابوون.

٤- مێژووی دەوری ئەمارەت لە کوردستان ساڵی ٢٥هـ - ٦٥٦هـ.

٥- ئاوڕێکی پاشەوە حکوومەتی بەرزەکانی لە حلوان و دینەوەر.

٦- ئاوڕێکی پاشەوە حکمدارانی کورد لە هەولێر.

٧- ئاوڕێکی پاشەوە پادشای چەند بنەماڵەیەکی کورد.

٨- ئاوڕێکی پاشەوە حکمدارانی بابان.

٩- خۆشی و ترشی (بزنۆکە و مەڕۆکە).

١٠- ناودارانی کورد لە (١٢٠٠هـ) هەتا (١٣٠٠هـ).

١١- مێژووی شاهەنشاهانی کوردی زەند لە خاکی ئێراندا.

١٢- مێژووی کورد و نادرشاە.

١٣- وێنەگری و کۆڵێن (زەنگۆغراف).

١٤- بەکورتی مێژووی (میرانی سۆران).

١٥- مێژووی کوردستانی موکریان/١

١٦- گەوهەری یەگانە (بەشێکی پچکۆلەی لە حەلەب چاپ کراوە).

---

(١) حوزنی موکریانی بەپێی کورتەیەک لە ژیانی، کە د. کوردستان موکریانی نووسیویە، لە ١٩٤٧/٩/٢٠دا کۆچی دوایی کردووە، دەبێ ئەم پارچە شیعرەی پێشتر وتبێ. بڕوانە: کوردستان موکریانی، ڕووناکی یەکەمین گۆڤاری کوردی هەولێر - دەزگەی ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠١، ل ٢١.

(٢) نامیلکەی (وێنەگەری و کۆڵێن) لە ساڵی ١٩٣٤ لە ڕەواندز چاپ کراوە.

١٧- مێرگەی دڵان (مێژووە لە حەلەب چاپ کراوە).
١٨- دەستەگوڵی بوێژان (لە ڕەواندز چاپ کراوە).
١٩- بەکورتی هەڵکەوتی دێرێکی (مێژووە لە بەغدا لە ساڵی ١٩٤٧دا چاپ کراوە).

***

ئەم نووسراوانەیش، هی کەسانی ترن، بەڵام (داماو) لەسەر ئەرکی خۆی چاپی کردوون:
١- مەم و زین - ئەحمەدی خانی.
٢- عەقیدا ئیمانی - شێخ عەبدوڵڵا نەهری.
٣- دیوانی أدب - مصباح الدیوان.
٤- دیاریی مەلا محەممەدی کۆیی.
٥- کەڵەپاب - عیسا.
٦- دیاری بۆ پچووکا کوردان - فەهمی زرگلی.
٧- ترازن - سەید تەها شەمزینی.
٨- باوەڕی ئایین - شێخ سەمیعی بانەیی.
٩- ئەحمەدی - شێخ مەعروفی نۆ دێیی.
١٠- سەما و زەمین.
١١- شیرین و بەفەرهاد.
١٢- مسئلەی کوردەکان - عەبدولقادر حشمت.
١٣- دەستووری خوو بۆ کچ و کوڕ - چەند خوێندەوارێک.

***

ئەو نووسراووانەیش کە (سەید حوسێن حوزنی) دایناون و هێشتا چاپ نەکراون ئەمانەن:(*)
١- ناودارانی کورد/ ١
٢- مێژووی بارامی چۆبین.
٣- مێژووی کوردستان/ ١ و ٢ و ٣.
٤- مێژووی سلێمانی و شاعیرەکانی.
٥- ڕووناکی دەری دڵ و دەروون.
٦- جغرافیای دێرێکی کوردستان (موکریان و ئەردەلان و لوڕستان).
٧- ددانسازی.
٨- مێژووی دزەییان

(*) لای مامۆستا گیوی موکریانی برای پارێزراون. (ش. ف)

٩- مێژووی کۆیە
١٠- مێژووی سمکۆ و سەید تەهای شەمزینی
١١- مێژووی هەولێر
١٢- مێژووی کوردستانی باکوور و بەهەشتی شێخ عەبدولقادر و شێخ سەعیدی شەهید.
١٣- مێژووی کەرکووک
١٤- مێژووی ئیمرادانی کوردی عێراق لە (١٢٠٠) هەتا (١٢٢٥)هـ.
١٥- مێژووی ئامێدی و بادینان و یەزیدی و بابان.
١٦- مێژووی کورد و سەفەوی.
١٧- مێژووی ئیعلاتی سەفەر بەر واستبدادی تورک و بێگانان لە کوردستاندا.
١٨- دوو ساڵەی کوردستانی جنوبی لە پەرتووکی (أ. ج. ولسن) وەرگیراوە.
١٩- سابڵاخ و هێز و توانای شێخ عەبدوڵلای نەهری.
٢٠- مێژووی ئەفسەری شاهان (مێژووی بنەماڵەی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی)یە.
٢١- میللەتی کورد.
٢٢- ڕزگاری لە نەزانین (کۆمەڵایەتی)یە.
٢٣- ئاوێنەی باڵانوێن (مێژووی شارەزوور و ناودارەکانیان)ە.
٢٤- پەردەی سینەمای ئایین.
٢٥- بارزان و مەلا مستەفای بارزانی.
٢٦- مێژووی ئاسوورییان و شەڕی بارزان و عێراق.
٢٧- مێژووی ئێران لە ئەردەشێری پاپەکانەوە تا ڕەزا شای پەهلەوی.
٢٨- خەوانینی هەورامان و مەریوان.
٢٩- مێژووی ڕەواندز.
٣٠- پادشایانی ئەیوبیان و هەزبانیان.
٣١- مێژووی جاف و دزەیی و خۆشناو.

## ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی داماو

١- گۆڤاری کوردستان: ئەم گۆڤارەی لە ئەستەموولدا لەگەڵ (محەمەد مهری)دا دەرهێناوە. (٣٧) ژمارەی لێ دەرچوو. زرنگ کاری (سیاسی) و کۆمەڵایەتی و وێژەیی و زانستی بووە. حەفتەی جارێک دەرچووە. بەزمانی تورکی و کوردی بووە. لە ساڵی ١٩١٧دا دەستی پێ کراوە. لە ساڵی ١٩١٨دا داخراوە.
٢- گۆڤاری ئارارات
٣- گۆڤاری کوردستان
٤- گۆڤاری بۆتان

٥- گۆڤاری چیا کرمانج
٦- گۆڤاری دیاربەکر
٧- گۆڤاری سۆران

ئەمانە لە شاری (حەلەب)دا دەرئەهێنران، بەنهێنی لە دژی تورکەکان و فەرەنسزەکان، کە ئەو دەمە دژی شۆڕشی شێخ سەعید وەستابوون. لە هەریەکەیان چەند ژمارەیەک دەرچوو پێیان زانرا. داخران. وا دیارە لە ساڵی ١٩٢٥دا دەرهێنرابن.

٨- گۆڤاری زاری کرمانجی: لە ساڵی ١٩٢٦دا لە ڕەواندزدا دەری ئەهێنا. تا ساڵی ١٩٣٢ ما. (٢٤) ژمارەی لێ دەرچوو.[1]

٩- ڕۆژنامەی ژیان: ئەم ڕۆژنامەیە هی (پیرەمێرد) بوو. لەسەر خواستی خۆی (سەید حوسێن حوزنی) لە ساڵی ١٩٣٤دا هاتە سلێمانی، دەستی کرد بەیارمەتی دانی. تا گەشەی پێ دا. لە (١٩٣٤/٧/٢٣)ەوە هەتا ١٩٣٤/١١/١٥) پێکەوە بوون. پاشان (داماو) بەدڵشکاوییەوە لێی جیابووەوە و لە سلێمانییەوە چووەوە ڕەواندز.

١٠- گۆڤاری ڕووناکی: گۆڤاری وێژەیی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی بوو. لە هەولێردا مانگێ جارێک دەرئەچوو. لە ناوەند ساڵەکانی ١٩٣٥ و ١٩٣٦دا ژیا (١١) ژمارەی لێ دەرچوو. (شیت مستەفا) هەر بەناو خاوەنی گۆڤارەکە بوو. ئەرکەکە، هەمووی بەسەر شانی (سەید حوسێن حوزنی)یەوە بوو.[2]

١١- دەنگی گێتیی تازە: گۆڤارێکی زرنگ کاری و مێژوویی و وێژەیی بوو. لە (بەغدا) لە ناوەند ساڵەکانی ١٩٤٣ و ١٩٤٥دا (٢٤) ژمارەی لێ دەرچوو. هەر مانگێ جارێک دەرئەچوو. دوایی کە بوو بەهەفتەیی لە ناوەند ساڵەکانی ١٩٤٥ و ١٩٤٦دا (٣٦) ژمارەی تری لێ دەرچوو. ئینجا بوو بەڕۆژنامەیەکی هەفتەیی. لە ناوەند ساڵەکانی ١٩٤٦ و ١٩٤٧دا (٣٤) ژمارەی تری لێ دەرچوو. باڵوێزخانەی بەریتانیا ئەرکی دەرهێنانی ئەم گۆڤارەی خستبووە سەر ئەستۆی خۆی. بەڵام لەژێر سەرپەرشتیی (داماو) دابوو. (مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ)یش یارمەتیی ئەدا[3].

***

لە ڕاستیدا شاکارەکانی (داماو)، هەر ئەمەندە نەبوون. گەلێک شاکاری نهێنیشی لە دەست وەشابووەوە. بەڵام زانیارییەکی تەواوم لەو ڕووەوە دەست نەکەوت. بۆیەکا جارێ بەمەندە وازم هێنا.

---

(١) بۆ زیاتر بڕوانە: د. کوردستان موکریانی؛ زاری کرمانجی یەکەمین گۆڤاری کوردی ڕواندز - دەزگەی موکریانی - هەولێر ٢٠٠٢ چاپی یەکەم.

(٢) بۆ زیاتر بڕوانە: د. کوردستان موکریانی؛ ڕووناکی یەکەمین گۆڤاری کوردی هەولێر - دەزگەی ئاراس - هەولێر، چاپی یەکەم ٢٠٠١.

(٣) بۆ زیاتر بڕوانە: د. شوکریە ڕەسوڵ، گۆڤاری دەنگی گێتی تازە... سەدرهەڵدان و دەوری... هەولێر ٢٠٠٣ چاپی یەکەم.

## کەسایەتیی داماو

ئەوەندە هەیە لەناو شاکارەکانی حوزنیدا:

(پێگەیاندنی خۆی) و (دامەزراندنی چاپخانەکەی) لە (حەلەب) و (ڕەواندز)دا، لە هەموویان گرنگ ترن. چونکە (حوزنی) بەهۆی ئەو دوو شتەوە توانی بیروباوەڕی کوردەواری بگۆڕێ و بیخاتە سەر ئەوەی کە هەر چەندێ مرۆڤ هەژار و بێ دەسەلات و بێ کەس و ئاوارەبێ، لە توانایدا هەیە چارەنووس و ژیانی خۆی سەرتاپا بگۆڕێ و بیشی گەیێنێتە پۆپەی هەرە بەرزی مرۆڤایەتی و نیشتمان پەروەری و سەربلندی. لە ڕاستیدا (حوزنی) هەرچەندە هەندێ هەڵەی ئەکرد، هەرچەندە خۆی هەموو دەمی لە بەخت و چارەنووسی خۆی بەگلەیی بوو، بەلام بەپیاوێکی گەورە و، بەنیشتمان پەروەرێکی چاک و پاک و کارگوزار و، بەزانا و وێژەوانێکی بەنرخ دائەنرێ، کە پێویستە نەک هەر خۆی بەخۆیەوە گیانی کامەران بێ، بەڵکو نەتەوەی کوردیش پێیەوە سەربەرز و کامەران بێ.

## ئایا ڕاستە داماو ناپاک و دز بوو؟!

کەچی داخەکەم لەلایەن دوژمنانی کورد و دوژمنانی خۆیەوە گەلێک بەند و باوی بۆ ڕێک خرا. گەلێک توانج و پلاری تێ گیرا گەلێک داویشی بۆ نرایەوە. کە لە ئەنجامی ئەو شتانەدا زۆر ئازار و زیان و سەرگەردانی و بەندیخانە و ئاوارەیی و هەژاری و دەردەداری چێشت. پێیان ئەگوت: ناپاکە و بۆ کەلکی ئینگلیزەکان ئەجووڵێتەوە. پێیان ئەگوت: خۆفرۆشە و بۆ کەلکی ناپوختەی خۆی کەلکی گشتی ئەخاتە ژێر پێیەوە. پێیان ئەگوت: بەلێشاو پارە لە ئینگلیز وەرئەگرێ و نۆکەرێکە لە نۆکەرە گرنگەکانی ئینگلیزا...

جارێکیان هەندێ لە مەلاکانی ڕەواندز بڕیاری خوانەناسی و کوشتنیان دا. جارێکیان مەرسەربڕێکیان لێ هان دا تیر و پڕ جنێو و قسەی ناشیرینی پێ ئەگوت. جارێکیشیان کردیان بەدز و تۆندیان کرد لە بەندیخانە و دایشیان بەدادگا و دووریشیان خستەوە لە ڕەواندز!... تا ماوەیەک (سەید تەها)ی سەرداری ڕەواندز ئەیپاراست. بەلام داخەکەم زۆری پێ نەچوو، لە دەستی چوو.

ئینگلیزەکان لەو سەردەمەدا دەسەلاتیان زۆر بوو بەسەر عێراقدا. بەلێشاویش پارەیان ئەدا بەپیاوەکانی خۆیان. جا ئەگەر (حوزنی) پیاوی ئەوان بووایە، بۆ چ لەم هەموو ساڵانەدا بەهەژاری و دەستکورتی و نابووتییەوە ئەژیا؟... یاخود چۆن فەرمانبەرانی عێراق ئەیان وێرا بەو جۆرە تەنگەتاو و ڕیسوا و سەرگەردانی بکەن؟!... پیاوێک ئەگەر خەریکی کار و فەرمانی داگیرکەرانی ئینگلیزبێ، بۆ چ خۆی بەنووسین و چاپ کردن و بلاوکردنەوەی نووسراوانە وە خەریک ئەکات، کە تا ئێستاکەیش هیچ نووسەرێک، بەو بابەتانەوە، ژیان و گوزەرانی بۆ بەڕێوە ناچێ؟!.

لەسەرێکی تریشەوە ئەگەر (حوزنی) بۆ کەلکی تایبەتیی خۆی بگەڕایە و، بەتەنگ چاکەی خۆیەوە بووایە، ئەیتوانی زۆر بەئاسانی ببێتە فەرمانبەرێکی شایستەی خۆی، کە بتوانێ بەمووچەیەکی شایستەوە، خۆی و خێزانەکەی لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بژی. چونکە ئەو سەردەمە خوێندەوار و تێ

گەیشتوو و جیهان دیدەی وەک ئەو کەم هەبوو. فەرمانڕەوایی عێراق خوا خوای بوو، یەکێکی وەک ئەو ببێ بەفەرمانبەر، تا کەڵکی لێ ببینێ. ئەو لە ساڵی ١٩٢٦دا گەیشتە ڕەواندز. گەلێک پیاوی گەورەی ئەناسی، لەناو کورد و لەناو بێگانەدا، کە ئەیانتوانی بۆی تێ بکۆشن و دایەزرێنن لە دەزگایەکی نایابی میریدا. بەڵام (حوزنی) خۆی لە فەرمانبەریی نەگەیاند. چونکە ئاواتی هەرە نازداری ئەو ئەوەبوو کە لە ڕێگای نووسراو دانان و نووسراو چاپ کردن و نووسراو بڵاوکردنەوە، هەروەها لە ڕێگای وتار دانەوە، لەناو کۆڕە نەتەوەییەکاندا، کوردەوارییەکەی لە خەو ڕاپەڕێنێ و زیندووی بکاتەوە و، بیریشی ڕۆشن بکاتەوە و ڕێگای سەربەستی و کامەرانی و سەربەرزیشی پێشان بدات، تا ڕوو بکاتە پێشکەوتن و ئەویش وەک هەموو گەلێک بەسەربەرزییەوە بژی. بەواتایەکی تر (حوزنی) بۆ بیروباوەڕەکانی ئەژیا، بۆ خۆی ئەژیا. گوێی نەئەدایە پێویستییەکانی کامەرانی و خۆشگوزەرانی خۆی، گوێی نەدایە ئامانجە گشتییەکانی خۆی کە بریتی بوون لە ڕزگاربوونی کورد لە دەست هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و ژێردەستی. جا پیاوێک: ئەمانە ئاوات و ئامانجی بووبن و، ئەمانە ڕێگای خەباتی بووبن، ئەچێ ئەبێ بەپیاوی ئینگلیز یاخود داگیرکەرانی نیشتمانەکەی خۆی؟!.

لە ڕاستیدا (حوزنی) وەک هەموو ڕۆشنبیرێکی شۆڕشگێڕ، بەئاشکرا و بەنهێنی تێ ئەکۆشا بۆ ئەوەی دۆست پەیدا بکات بۆ نەتەوەکەی خۆی، لە گەورە پیاوانی خۆ و بێگانە، تا لە کاتی پێویستا بۆ کەڵک و چاکەی نیشتمانەکەی خۆی، ئەو دۆستایەتییەیان بەکاربهێنێ. لەناو ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمەیشدا هەندێ دۆستی پەیدا کردبوو، وەک (ئەدمۆندس) کە ئەوساکە ڕاوێژکاری کاربەدەستی ناوەوە، واتا (مستەشاری وەزارەتی داخلیە) بوو. ئەمانە کە ئەهاتنە ڕەواندز (حوزنی)یان وەک پیاوێکی کوردی زانا و ڕۆشنبیر ئەهاتە پێش چاو. ئەهاتنە سەردانی چاپخانەکەی و باخچە جوانەکەی لە ڕەواندزدا و، ئەبوون بەئاشنای. لە شارەزاییەکەی لە وێژە و مێژوو و کۆمەڵایەتیی کورددا، کەڵکیان وەرئەگرت، جا (داماو) کە فەرمانبەرەکانی عێراق تەنگەتاویان ئەکرد، بەناچاری پەنای ئەبردە بەر ئەو دۆستە ئینگلیزانەی تا ڕزگاری بکەن. ئەوانیش لە سنووری دەست ڕۆیشتنی خۆیان و یاسادا یارمەتییان ئەدا. چونکە خۆیشیان لە فەرمانداڕانی عێراق بوون!.

(حوزنی) لەناو ڕووسەکانیشدا گەلێک ڕۆژهەڵاتناسی گەورە گەورەی ئەناسی و نامەکاریشی لەگەڵدا ئەکردن. وەک؛ (ف. مینۆریسکی) و (ب. نیکیتین). هەروەها ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانیشی ئەناسی. ناوی (کارڵ هەدەنگ) بوو. نامەکاریی لەگەڵدا ئەکرد. لەناو کوردەکانیشدا (جلادەت بەدرخان، کامەران بەدرخان، فەرەجوڵڵا زەکی کوردی، محەممەد ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی، ڕەفیق حلمی، مەلا گچکەی هەولێر، مەلا محەممەدی کۆیە، شێخ محەممەدی مەزن، شێخ ئەحمەدی بارزانی، مەلا مستەفای بارزانی، سەید تەهای شەمزینانی، قازی محەممەدی سابڵاخ)، کە هەموویان پیاوی کەڵە کەڵە و ڕۆشنبیربوون، داماویان خۆش ئەویست و ڕێزیان لێ ئەگرت و، ئەگەر کارێکیشی بکەوتایە لایان یارمەتییان ئەدا.

بێجگە لەمە من وام دێتە پێش چاو کە (داماو) تێکەڵیی لەگەڵ زۆربەی بزووتنەوە نهێنییەکانی کورددا هەبوو. دوور نییە کە ئەندامیش بووبێ لەناو هەندێ لەو کۆمەڵە نهێنییانەدا. جا پیاوێکی وەک

ئەو ئەگەر پەیوەندیی لەگەڵ گەورە پیاوان و دەسەڵاتدارانی کورد و بێگانەدا پەیدا نەکات، چۆن کار و فەرمانە گشتییەکانی خۆی و کۆمەڵەکانی خۆی پێ جێبەجێ ئەکرێ؟!

جا لە پێش شەڕی یەکەمی جیهانی و پاش شەڕەکەیشدا هەتا ئەم چەند ساڵەی دواییە ڕۆشنبیرەکانمان لەو باوەڕەدا بوون کە لە تواناندا هەیە کەڵک لە فەرمانڕەواییە بێگانەکان وەربگیرێ بۆ کاروبارە گشتییەکانی کورد و کوردستان. لەبەر ئەمە نەک (حوزنی)، زۆربەی ڕۆشنبیرەکانی تریش تێکەڵییان لەگەڵ ئینگلیزەکان و فەرەنسزەکان و ڕووسەکان و ئەمریکاییەکاندا ئەکرد بۆ مەبەستی گشتیی کوردەواری. جا لەبەر ئەم هۆیانە، هەموویان، من لەو باوەڕەدام کە (داماو) هەر تێکەڵییەکی لەگەڵ ئینگلیز یاخود بێگاندا کردبێ، بەنیازی پاک بووە، نەک خراپ. واتا بۆ کەڵکی کوردەواری بووە، نەک بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆی!... یانە پڕ ئەرک و ئازار و هاوارەکەی و، بەرهەمە گەورە و گرنگەکانیشی بەڵگەن بۆ ئەوەی کە (حوزنی) یەکێک بووە لە نیشتمانپەروەرە گەورەکانی کورد، کە بلیمەتییەکەی خۆی و وێژەوانی و زاناییەکەی خۆی، تا ما، بۆ کەڵکی کوردەواری و کوردستان تەرخان کرد.

جیا پیاوێک کە وابێ، دوورە لەوەی کە دزبێ، یاخود ناپاک و تا ئێستاکەیش بەڵگەیەکم دەست نەکەوتووە کە ئەو تاوانانەی خستبوویانە پاڵی ڕاست دەرچن.

## مردنی حزنی

حوزنی لەتاو تەنگەتاوکردنی دوژمنەکانی کورد وخۆی نەیتوانی لە ڕەواندزدا بمێنێتەوە. چونکە داویان بۆ نایەوە و بەدزێتیی سێ کەللە شەکر و دوو گوریس و سێ باقمان خورییەوە بەدناویان کرد وخستیانە بەندیخانەوە!...

لەبەردەم دادگاشدا بڕیاری بەسەردا درا!... لەمەدا هەندێ لە مەلاکانی ڕەواندز بەنارەوا لە ڕووی دادگادا تاوانەکەیان خستە ئەستۆی. کەچی لە پاش برانەوەی چەندوچوونکردنی دادگە بەماوەیەک، هەر ئەو مەلایانە خۆیان هاتنە لای بۆ ماڵەوە و پەشیمانبوونەوە و داوای چاوپۆشی و لێ خۆش بوونیشیان لێ کردا... گوتیان: «بمان بەخشە بەزۆر پێمان کرا؟!» (حوزنی)یش لەسەر ئەو کەتن و ڕیسواییە، دڵی لە ڕواندز هەڵکەندرا و لەسەر ئامۆژکاری دۆستەکانی گواستییەوە بۆ بەغدا. ئەو کاتە ۱۹٤۳/۱۱/۱۸ بوو. ئەم کارەساتە کارێکی زۆری لە (حزنی) کرد. بەسەزمانە، هەموو دەم لێکی ئەدایەوە و خەفەتی پێ ئەخوارد. هەستی بەسپڵەیی و دڵڕەقی و ناهەموارییی کۆمەڵایەتییە ڕزیوەکەمان ئەکرد. هەر بەجارێک ژیان و جیهانی لەبەرچاو کەوت. دوایی ئەمە کاری کردە سەر تەندروستیی لەش و هۆشی و لە ۱۹٤۷/۹/۲۰دا لە شەودا کوتوپڕ کەوت بەدەما و مرد.

لەسەر مردنی (حوزنی) گەلێک مقۆ مقۆ کرا. هەندێک ئەیانگوت: ژنەکەی دەرمانخواری کردووە بەپەنجەی ئینگلیزەکان. هەندێکیش ئەیانگوت لە داخانا مردووە. ئەمەیش بۆ ئێمە بەتەواوەتی ڕاستیی دەرنەکەوتووە. بەڵام ڕاستییەکەی هەرچۆنێک بێ، نەتەوەی کورد بەمردنی (سەید حسێن حزنی) زانایەکی گەورە و نیشتمان پەروەرێکی سەربڵند و وێژەوانێکی خاوەن بەرهەمی گەورەی لە دەست چوو، کە پێویستە لەسەر هەموومان چاکەکانی بدەینەوە. با لە دوای مردنیشی بێ، تا گیانی شاد بکەین. ئەویش

بەم جۆرە کە کاربەدەستانی کورد بخەینە سەر ئەوەی (پەیکەر)ێک بۆ (حوزنی) دروست بکرێ و لەسەر چەقی ڕێگای شاری (ڕەواندز)دا دابنرێ - بەمەرجێ شێوەی کۆمەڵە نووسراوێکی گەورە و چاپخانەیەکیش لە پەیکەرەکەدا دیاربێ. هەروەها پێویستە نووسراوە چاپ نەکراوەکانیشی چاپ بکەین.

بێجگە لەمە خانووەکەی (حوزنی) -ئەگەر مابێ- بپارێزرێ و هەر نووسراو و کەلوپەلێکیشی لێ بەجێ ماوە، لەو خانووەدا دابنرێ. بۆ ئەمەی هەر دۆستێکی کورد و خوێندەوارێ ڕووی کردە شاری (ڕەواندز) سەرێک لە خانووەکەی (حوزنی) و نووسراوەکانی و کەلوپەلەکانی بدات و چاوی خۆی پێ ڕۆشن بکاتەوە. تا هەر هیچ نەبێ داماو کە لە هەموو ژیانی خۆیدا خۆشییەکی وای نەدی، لە پاش مردنی گیانی بەم ڕێزگرتن و کار پەسەندکردنەمان شادبێ.

(داماو) کە گیانی پاکی بەخاک سپارد، هەر ژنێکی لێ بەجێما، بەسەزمانە منالی نەبوو جێی بگرێتەوە. ئەیگوت: «منالەکانم نووسراوە کوردییەکانمە. بەوان چاوی خۆم ڕۆشن ئەکەمەوە».

برایەکیشی لە پاش بەجێ ماوە، ناوی (مامۆستا گیوی)ە. کە ئەمیش چەشنی کاکی هەر لەسەر ئەو ڕێگایە ئەڕوات کە ئەو پیارۆیی بوو. بێجگە لەوە برایەکی دڵسۆزی بووە. لە تەنگانە و خۆشیدا لەگەڵیابوو. ئێستاکەیش شەو و ڕۆژ شادی ئەکات. هەر بەچەشنی ئەویش ڕاژەی گرنگ گرنگ پێشکەشی نەتەوەکەی خۆی ئەکات. بێ گومان (مامۆستا گیو)یش کە چەشنی خوالێخۆش بووی کاکی خەبات ئەکات، شایستەی هەموو ڕێزگرتن و یارمەتی و خۆشەویستییەکی هەموومانە. لە دانانی ئەم نووسراوەدا، بەشی هەرە گەورەی زانیارییم لەو وەرگرت. لەبەرئەوە پڕ بەدڵ سوپاسی ئەکەم و لە خوام ئەوێ لەم کۆششە پیرۆز و بەرزەیدا کە بەدرێژایی تەمەنی خۆی خەریکێتی سەرکەوێ و بەخۆشی و کامەرانییەوە بژی.

دروود بۆ گیانی پاکی (داماو) و خۆشی لە کەسوکارە بەڕێزەکانی و نەتەوەی کوردیش کە پیاوی وایان تیا هەڵکەوتووە.

سلێمانی: ١٩٧٢/١/٦

شاکر فەتاح

### دەربارەی داماو

«ئەم فاضلە بەهمنە -مەبەسی سەید حسێن حزنییە- بەغیری دوام کردن لەسەر نشری (زاری کرمانجی) لەژێر انواعی عنواندا گەلێ مباحثی بەقیمت و نەزانراوی تأریخی کوردی نشر کرد و بۆ تنویر و تشویقی لاوانی کوردی عێراق همت غیرتێکی زۆر گەورەی صرف کرد و ئەیکا».

(محەممەد ئەمین زەکی)

خاوەنی نووسراوی (خلاصییەکی تأریخی کورد و کوردستان) جلدی أول، جزمی دووەم، لاپەڕە (٣١٨) ساڵی ١٩٣١.

(تەواو)

# مەلا کاکە حەمە

چیرۆکی ژیانی زانا و وێژەوان و نیشتمان پەروەرێکی هەرە گەورەی کوردستان

## پێشەکی

(مەلا کاکە حەمە) لە ساڵی ١٨٨٤دا لە سلێمانیدا لەدایک بووە لە ساڵی ١٩٦١دا، لە سلێمانیدا گیانی پاکی بەخاک سپاردووە، بەڵام بەژیانی خۆی شۆرشێکی لە کۆری خوێندەواریدا نایەوە، بۆ کەلکی کوردەواری کە لە پێش ئەوەوە کەس ئەوەی نەکردبوو ئەویش ئەوەبوو: لە (خوێندەواری کۆن) و لە (خوێندەواری نوێ)، جۆرە خوێندەوارییەکی داتاشی و دروست کرد، کە لە ماوەی چوار پێنج ساڵێکدا شاگردەکانی لە خوێندەواریدا ئەگەیشتە بارستایی شاگردە هەرە باشەکانی ناومزگەوتەکان. جا بۆ پێکهێنانی ئەم مەبەستە دەستی کرد بەگۆڕینی و، بەکورت کردنەوە و، بەدانان: (٤٤) نووسراو بۆ شاگردەکانی خۆی بەزمانی کوردی ئامادە ئەکرد. پێنج زمان و هەموو جۆرە زانست و هونەر و وێژەیەکی پێویستی فێر ئەکردن. بێجگە لە وەرزش و ساز و ئاواز و یاری و یاساکانی فەرمانڕەوایی. هەروەها بەژیانێکی وایشەوە ئامادەی ئەکردن، کە پشت بەخۆیان ببەستن و مەردانە بژین و سەریش بۆ هیچ کەسێک و هیچ گیروگرفتێک دانەنوێنن.

ئەمە و کەچی هەر چوار پێنج ساڵە و لە گوندێکدا ئەمایەوە. سنووری خەبات کردنیشی بۆ وریاکردنەوەی کوردەواری و ڕۆشنکردنەوەی بیریان هەر لە (باقووبە)وە ئەکشا بەناو ناوچەکانی سیروان و کەرکووک و سلێمانی و موکریاندا تا ئەگەیشتە (سەقز) واتا هۆزەکانی ئەو ناوچانەی هەموو ئەگرتەوە. ئەم خەباتەیشی بۆ ئەوەبوو، کە پیاوانی دوارۆژ دروست بکات بۆ نیشتمانەکەی، کە ئەوانیش وەک خۆی، سەر و سامانی خۆیان بەخت بکەن بۆ ڕزگارکردنی کورد لە دەست هەر چوار دەردەکەی: (زۆرداری و هەژاری و نەخوێندەواری و دەردەداری). کوردستانیش ئاوەدان بکەنەوە بەکشتوکاڵ و پیشەسازی و شارستانێتی ڕاستەقینەوە.

شاگردەکانی خۆی ڕائەهێنا بەخوا ناسین و سەربەرزی و نیشتمانپەروەری و مرۆڤ دۆستییەوە. بەرەنجی شانی خۆیان نانی خۆیان پەیدا ئەکرد، بەدەستی خۆیشیان خواردن و هەموو جۆرە پێویستییەکی ژیانیان بۆ خۆیان ئامادە ئەکرد وەک: جل شتن و جێ ڕاخستن و گەسک لێدان، هەروەها وایشی ڕائەهێنان کە هەرچییەک ئەکەن بۆ کەسانی تر، چاو نەبڕنە پاداش و ناوبانگ و پایە و سامان. بۆ خوای بکەن. بێجگە لەوە (مەلا کاکە حەمە) گەنجینەیەکی وێژەیی و زانستی وای بۆ بەجێ هێشتین، لەگەڵ جۆرە خوێندنگایەکی تاقانە و پێی ڕەوییەکی ئاوازەی وەها، کە ئەویەڕی توانای زانستی (پەروەردەکردن)

و (فێرکردن)ی ئەم ڕۆژە ئینجا ئەیگاتێ. بێجگە لەوە (ئەلف و بێ)یەکی کوردی وایشی بۆ داهێنایین کە ئەمەندە ئاسان و ڕەوانە، هەمـوو نەخوێندەوارێک بەزوویەکی زوو فـێـری ئەبێ، نزیکەی (٣٦) ساڵی خـشـت (مـەلا کـاکـە حـەمـە) ڕەنجی دا و خـەباتی کـرد بۆ ڕۆشنکردنەوەی بیـروباوەڕی کـوردەواری و ئاراستەکردنیان بۆ ژیانێکی بەرزتر و باشتر و خۆشتر. بەرەنگاریی (نەخوێندەواری و زۆرداری و هەژاری و دەردەداری)ی کرد لەناویاندا ئەو بەم ژیانەی دەستوورێکی بەنرخ و گرنگی دامەزراند بۆ کوردەواری کە شایستەی ئەوەیە هەموو خوێندەوارێکی ڕۆشنبیری کورد لە سەری بڕوات. کەچی لەگەڵ ئەوەیشا خەمی ژیانی خۆی نەبووا. ئەو کامەرانی لەو خەبات و تێکۆشانە ئەچێشت کە نەتەوەکەی خۆی پێ پێش بخات و دڵی خوای خۆی پێ خۆش بکات، ئەو حەزی لە (بەخشین) ئەکرد، نەک (پچڕین)!. جا خۆشی لە خۆی کەوا سەربڵند ژیا. خۆشی لە خۆیشمان کە پیاوی وا سەربڵند و گەورەمان تیا پەیدا بووە.

پیاوێکی وەک (مەلا کاکە حەمە) شایستەی ئەوەیە کاربەدەستە بەڕێزەکانی کوردستان نووسراوەکانی لە چاپ بدەن. بەنووسراوەکـانیـشی ئاوازەگـاهەکـانمان برازێننەوە. پەیکەرێکیـشی بۆ بکەن، لە گـەڕەکی (دەرگەزێن)دا دای بمەزرێنن، لە شارەکەی خۆیدا، کە لەژێریا بنووسرێ:

«لە نەتەوەی کوردەوە ڕێز و خۆشەویستی پێشکەشی (مەلا کاکە حەمە)بێ، ئەو کەسەی کە تا ژیا، بەکردەوە و ڕەوشتە بڵندەکانی سەرمانی بڵند کردەوە».

***

پێش ئەمەی وتارەکـەم تەواو بکەم پڕ بەدڵ سوپاسی خـوالێـخۆشـبـوو (مەلا جەلال کوڕی مـەلا کاکـە حەمە) و کوڕەکانی (مەلا جەلال) کاک (ئەوزاد) و کاک (بەختیار) و کاک (شاسوار) و بە(بەهی خانی کچی مەلا کاکە حەمە) ئەکەم کە یارمەتییەکی زۆریان دام لە کۆکردنەوەی ئەم زانیارییانەدا.

درود بۆ گیانی پاکی (مەلا کاکە حەمە) و، ڕێز و خۆشەویستی بۆ کوڕ و کچ و نەوەکانی.

شاکر فەتاح

(خاوەنی پڕۆژەی خوێندەواری کورد)

سلێمانی: ١٩٧٢/١/١١

## پێگەیشتنی مەلا کاکە حەمە

(مەلا کاکە حەمە کوڕی حاجی سەیفوڵلا کوڕی حاجی حەبیبوڵلا کوڕی مەلا میرمەلیک)ە. لە ساڵی ١٨٨٤دا لە سلێمانی لە گەڕەکی (دەرگەزێن) لەدایک بووە. (حاجی حەبیبوڵلا) سەرەکی هۆزی (تاڵشی دۆلابین) بووە لە کـوردسـتـانی ئێـراندا. بۆ ئەمـەی گـەلەکـەی خۆی ڕزگـار بکات لەدەست زۆروستـەمی فەرمـانڕەوایی ئێران، چووە بەگژ لەشکری ئێراندا. لە پاش شـەڕێکی خوێنین شکاوە. خۆی و کـوڕەکـەی (سـەیفـوڵلا) کـە ئەوسـاکـە لە تەمـەنی پانزە سـاڵیـدا بووە، بەپارەیەکی زۆرەوە خۆیان دەرباز کردووە. (سـەیفـوڵلا)ی لە (سابڵاخ)دا شـاردۆتەوە. خۆیشی چووە بۆ (حەج). بەڵام لەوێ گـیـانی پاکی بەخـاک سپـاردووە. (سـەیفـوڵلا)یش کـە بەوەی زانیـوە کـۆچی کـردووە بۆ شـاری (سلێـمـانی). لەوێ (موفـتی

چاومار) برازای خۆی لێ مارە کردووە کە کچی (مەلا محەمەدی چاومار) بووە. ئەم ئافرەتەیش وەک مێردەکەی زانا بوو، ناوی (مەلا فاتم) بوو. بەهەردووکیان بە(مەلا کاکە حەمە)ی کوڕیان خوێندووە. (مەلا کاکە حەمە) نووسراوە ئایینییەکان و زمانی فارسی و عەرەبی لەسەر دەستی مەلاکانی (سلێمانی) و (سنە) و (سابلاخ) و (سەقز) و (سەردەشت) و (کۆیە)دا تەواو کردووە. کاتێ کە (سەیفوڵڵا)ی باوکی مردووە، تەمەنی سیانزە ساڵ بووە. جێگەی ئەوی گرتۆتەوە و وەک ئەویش دەستی کردووە بەبازرگانی. لە تەمەنی پانزە ساڵیدا دایکی بەزۆر ژنی بۆ هێناوە. بەڵام (کاکە حەمە) لە پاش پێنج ساڵێک خۆی لە دەست بازرگانی و ماڵ و ژن و مناڵ و دایک و خوشک و برا ڕزگار کردووە و چۆتە دەرەوە بۆ کوردستانی ئێران و، هاتۆتە ناو کوردستانی عێراق بۆ خوێندن. لە (کۆیە)دا لەسەر دەستی (مەلا بەهائەدین)دا کراوە بە(مەلا). شایی بۆ کراوە و پاداشیشی بۆ بەخشراوە. ئینجا گەڕاوەتەوە (سلێمانی) بۆ ناو ماڵ و مناڵی خۆی.

بەم ڕەنگە (مەلا کاکە حەمە) لە خێزانێکی خوێندەوار و دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار، بەڵام کۆست کەوتوو و ئاوارە کەوتۆتەوە و، لەناو ئەوان و مزگەوتەکانی کوردستاندا گەورە بوو و پێ گەیشتووە. ئەو کاتەی بووە بە(مەلا) تەمەنی نزیکەی بیست و پێنج ساڵان بووە.

## ڕەوشت و ژیان و سروشتی مەلا کاکە حەمە

(مەلا کاکە حەمە) لە هەرزەکاریدا لاوێکی باڵا ناوەنجی داڕێژراوی توندوتۆڵی شۆخ و شەنگ بووە. لەسەر ڕاستی توندوتیژ بووە. کۆی نەکردۆتەوە لە کەس. لە چاوەکانیا تروسکەی ڕاستی پەرستی و کاردروستی خواناسی پرشنگی ئەدا. کە بەتیلایی چاوی تەماشای پیاوی ئەکرد وەک پڵنگێکی بەچنگ سامی ئەخستە دڵی دانیشتووانەوە. بەڵام پڵنگێکی دڕندە نا، پڵنگێکی خوێندەوار. پڵنگێکی خواناس و نیشتمانپەروەر، کە لەسەر مافی گشتی باکی نەبوو یەخەی هەموو کەس بگرێ. لە ڕاستیدا (مەلا کاکە حەمە) تا ژیا وەک پڵنگێک هورووژمی ئەبردە سەر زۆرداری و نەخوێندەواری و هەژاری و نەخۆشی. لەپێناو ئازادکردنی کورددا، لەو چوار دەردە، هەموو سەر و سامان و سروەت و کامەرانی و گیانی خۆی بەخت کرد. لە ژین نامەیەکی خۆیدا کە لە ١٩٥٨/١/١١دا نووسیویە، ئەڵێ:

«... جا من لە حەوت ساڵییەوە هەموو کاتێ میکرۆبی باپیرم لە مێشکابوو... بەو ماخولیایەوە نەمتوانی لە شاردا بژیم، ڕام کردە لادێ، کە کەمتر هێزی بەسەرەوە بوو. دووبارە هەمووانم بەجێ هێشتەوە. کە ئەو وەختە عومرم (٢٥) ساڵ بوو. لە پاش بەینێ گیرام بۆ عەسکەری. لە (بێرووت) و (وان) و (باشقەڵا) و شەڕەکانی (سەلمان پاک) و (بەغدا) و(سامەڕا)دا تا (هودنە)[1] دەوامم کرد. دووبارە نەچوومەوە شار. هاتمەوە لادێ...».

---

(١) ئەو کاتەی سەربازی لەشکری عوسمانی بووە، لەو شوێنانە، مەبەستیشی لە (هودنە) ئاگربەست و شەڕوستانی جەنگی جیهانی یەکەم بووە لە ١١ نۆڤامبەری ١٩١٨، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی لە ٣١ ئەکتۆبەردا شکا و چەکی فڕێدا.

(مەلا کاکە حەمە) گیانێکی شۆڕشگێڕانەی هەبوو. ئەو ئەم گیانەی لە باپیریەوە وەرگرتبوو. بێ گومانم لەوەی کە باوکی چیرۆکی سامناکی ئەو شەڕوشۆڕ و دەربەدەری و ئاوارەییەی (حاجی حەبیبوڵلا)ی باوکی و خۆی بۆ گێڕاوەتەوە. بۆیەکا هەر لە منالییەوە، تۆوی نیشتمانپەروەری چۆتە دڵیەوە. هەروەها ئارەزووی خوێندەواری و خۆ پەروەردەکردنیشی هەر لە دایکی و باوکی و گیانی باپیرانیەوە وەرگرتووە. لە ڕاستیدا ئەم بنەماڵەیە هەر لەسەردەمی (مەلا میرمەلیک)ەوە تا ئێستا هەر بەخوێندەواری و خانەدانی و ڕەوشت و سروشتی بڵندەوە ناویان دەرکردووە.

(حاجی سەیفولڵا)ی باوکی (مەلا کاکە حەمە) وەک دەوڵەمەندێکی مەلای بازرگانی، سەر ڕاست و چاکەخواز و مەرد ناوبانگی ڕۆیشتووە. (مەلا فاتم)ی دایکیشی وەک ئافرەتێکی خوێندەواری زانا و سەربڵند، خوێندنی فێری سەدان کوڕان و کچانی سلێمانی کردووە.

جا (مەلا کاکە حەمە) ئەو ڕەوشت و خووە سەربڵندانەی کە هەیبوو، لە بنەماڵەکەی خۆی و خێزانەکەی خۆیەوە وەرگرتبوو.

(مەلا کاکە حەمە) پیاوێکی دەروون ئازاد بوو. ئازا و بێ باک بوو، چاکەخواز و خواناس و کارگوزار بوو. خۆبەختکەر بوو. لێ بوردە و دڵ فراوان و سەڕاست و دڵسۆز بوو،[1] نە لە خواردندا، نە لە پۆشیندا، نە لە سایەومایەدا بەتەنگ خۆیەوە نەبوو. چ بۆ دادگەریی سلێمانی، چ بۆ مفتێتی سلێمانی، دوو جار ویستیان دای بمەزرێنن، بەربەرچی دانەوە، چونکە ئەو تەنیا یەک ئامانجی هەبوو کە ئەویش هەروەک خۆی ئەڵێ: «خزمەتی زانیاریی کەساس و هیچ دەست نەکەوتووەکان و هیچ نەزانەکان بوو». ئەمیش (مەلا کاکە حەمە)یە کە ئەڵێ:

«ئامۆژگارییم، جگە لە واجباتی دینی ئەوەیە؛ بەخوێندن إنسان لە باقی ڕۆح لەبەر جیا ئەکرێتەوە. وە نابێ خوێندن بۆ ئەمە لای ببێ کە خۆی بەخەڵق بژێنێ، یان ببێتە مأمور، حوڕییەیەتکەی بفەوتێ، ئەبێ بۆ ئەوە خەریک بێ:

«فێری زانیاری و سەنعەت ببێ، تا ئەتوانێ. ئەوسایە خزمەتی قەومەکەی بکات». هەروەها (مەلا کاکە حەمە)یە کە ئەڵێ: «کەسم خۆش ناوێ ئەوانە ئەبن کە لەسەر فکری من بن. ئەوانەی خزمەتی بیرەکەم بکەن ڕۆحم فیدایانە... ئەمەوێ خزمەتەکەم دوای مردنم لاسایی بکرێتەوە. ئەگەر بیکەن ئامەوێ بناسرێم... یا بۆنی بۆ خۆ هەوڵدانی لێ نەیێ!».

---

(١) شێخ محەمەدی حاسڵی بۆی گێڕامەوە: لە پاش شکستەکەی ئاوباریک ١٩٣١، شێخ لە ئاوایی (بانی مورد)ەوە فەرمانی گرتنی مەلا کاکە حەمە دەردەکات، بەوەی کە دەستی هەبووە لە زانیاری دان دەربارەی شێخ بەحوکمەت. مەلا لە دێی کرپچنە دەبێ، کە ئەمە دەبیستێ بڕیاردەدا خۆی بچێ بۆ لای شێخ، هەرچەندە موچیاری دەکەن کەڵکی نابێ، لەتەک شێخ حسێنی شێخ قادر، برای شێخ عەبدولکەریم، دەچنە لای شێخ و بێ تاوانی خۆی ڕوون دەکاتەوە و شێخ دەهێنێتەوە سەر خۆی و لێی دەبوورێ و ڕێزێکی زۆریشیان دەگرێ... مەبەست لێرەدا پاکی و ڕاستی و نەترسی مەلا کاکە حەمەیە و خراپی و نالەباری ناحەزانی بووە کە ویستویانە داوی بۆ بنێنەوە.

کەواتە ئامانجی (مەلا کاکە حەمە) کوردایەتییەک بووە کە لەسەر بنچینەی (زانست) و (هونەر) و (پیشەسازی) و (خواناسین) دابمەزرێ.[1]

جا هەر ئەم ئامانجە بوو کە پاڵی پێوەنا تێکەڵ بەشێخەکانی (کریچنە) و (کۆپ تەپە) ببێ... تا هێز و دەسەڵاتیان بەکاربهێنێ بۆ کەڵکی کوردەواری... ماوەیەک لای (شێخ قادری شێخ کەریمی کەس نەزان) و (شێخ حسێن)ی کوڕی مایەوە. لە سەردەمی فەرمانداریی (شێخ مەحموودی گەورە)دا کرا بەدادگەر واتا (قازی)ی (سەنگاو). کاروباری لادێکەی بۆ کارگێڕی لادێی سەنگاو (شێخ قادری گۆپ تەپە) هەڵ ئەسووڕاند. پاش تێکچوونی (شێخ مەحموودی گەورە)یش لەگەڵ ئینگیزدا کرا بەدادگەری ناوچەی (قەرەداغ). هەمیسان کاروباری هەموو ناوچەکە (مەلا کاکە حەمە) سەرپەرشتیی بۆ (شێخ قادری گۆپ تەپە) ئەکرد. بەڵام لە ساڵی ١٩٢٥دا (شێخ عەبدولقادر) گیرا و دەربەدەر کرا. (مەلا کاکە حەمە)یش تا چوار مانگ لە سلێمانیدا خرایە ژێر گیر و گاز و لێ پرسینەوەو دەس بەسەرییەوە. تا بارمتەی (٣٠,٠٠٠) ڕوپیەی بەفەرمانڕەوایی نەدا، بەرەڵلا نەکرا... (مەلا کاکە حەمە) لە شار دەرباز بووەوە. ئەم جارە چووە ناو تیرەی هۆزەکانی جافەوە. تا دوو ساڵی خشت لەگەڵ ئەواندا گەرمیان و کوێستانی کرد. هەر لە نزیک (باقووبە)وە تا نزیک (سەقز) لەگەڵیاندا گەڕا. (مەلا کاکە حەمە) لەم ڕووەوە ئەڵێ: «جا بەهەموو جۆرێ خەریک بووم... بەنفوذی ئەوانیش هیچ نەکرا. جا قراری ئاخری و باوەڕم هاتە سەر ئەوە کە قەومەکەمان تا لە سەد شەستی خوێندەواری تەواو نەبێ، کەوابێ: زانینەکەیان لە خۆش ڕابواردن و خۆپێشاندانا خەرج نەکەن، بەهیچ نابێن... جا مەجبوور بووم کە ژیانم بەدەرس وتنەوە خەرج بکەم، بەوانەی کە لە دەرەوەن و دەرسیان دەس ناکەوێ... لەو وەختەوە خەریکی ئەوەم. ئەویش بۆ حریت فرۆشتن بەمعاش و، خۆ بەمەلا مەشهوور کردن و، خۆ ژیاندن بەخلق نا... بەڵێ ئاخ، سەد ئاخ! وتم نامرم... ئەمما ئەم مردنێ!». پاش ئەوە (مەلا کاکە حەمە) ئەڵێ: «علمە دینییەکان هەموو فێربووم و خوێندوومن. بەو هێزەوە لە مدنییەکانیش ئەوانە فێربووم کە کتێبم تیا دروست کردوون. وەکو لە دواوە نووسراوە».

لە ڕاستیدا ئەمە هەر لە پیاوێکی ڕاستی پەرستی خواناسی زانای وەک (مەلا کاکە حەمە) ئەوەشێتەوە، کە لە هەرەتی هەرزەکارییدا، خۆی لە ژن و مناڵ و دایک و خوشک و برا دووکانی بازرگانی و سامان، دوور بخاتەوە، هەر بۆ ئەوەی خوێندنەکەی خۆی تەواو بکات و خۆی بکات بە(مرۆڤ). ئەو خوێندەوارییەی خۆیشی بکات بەچەکێک بۆ ڕزگارکردنی کورد و کوردستان لە دەست هەر چوار دەردەکەی، کە بریتین لە (زۆرداری و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری).

لێرەدا (مەلا کاکە حەمە) پەنجە بۆ ژیانی خۆی ئەکێشێ لە شاری (سلێمانی)دا کە ئەڵێن: «دونیام لا

---

(١) مەلا کاکە حەمە لە نامەیەکیدا بۆ مامۆستا شێخ محەممەد حاسڵی کە یەکێک بووە لە قوتابییەکانی، ئاوا دەڵێ: «... ئیتر لە بیرت نەچێ هەر کەس خزمەتی قەوم و بەشەری بێ مقابەلەی ئارەزووی شەخسی لا واجب نەبێ داوای بەشەری کردنی غەڵەتە! ئیستیحقاقی کابرا بۆ خزمەتکردن شەرت نییە، ئەگەر فرۆتن و کرێکاریە، شەرت بەزەیی پیاهاتنی خراپەکانە و ئەوان موستەحەقتری خزمەتن». (سەردانی مامۆستا شێخ محەممەد حاسڵی - سەرچنار، دووشەممە ٢٠٠٢/٩/١٦).

بووبووه زیندان... لەو زیندانە فرارم کرد، بەناوی فەقێیەتییەوە بۆ ناو کوردستانی ئێران».

کاتێکیش کە (مەلا کاکە حەمە) ئەڵێ: «بیری کەس ناکەم. سەر لە کەس نادەم. کەس سەرم لێ نادات. لای زۆرتری خلق وایە هیچ کەسم نییە. هەروایان دیووم!». بیر بەلای ئەوەدا ئەچێ کە پیاوێکی دڵ ڕەق بووە و، خێزان و کەس و کاری خۆی کەنەفت کردووە... کەچی کە چاوێکم خشاند بەنامەکانیا کە لە ناوەند خۆی و کوڕە گەورەکەیا (مەلا جەلال) هاتوون و چوون، ئەوپەڕی نازگرتن و خۆشەویستی و ڕێزگرتنیان تیا هەست ئەکرێ. (مەلا کاکە حەمە) چاک و چلۆنی بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکەی خۆی نووسیوە. وێنەی لەگەڵدا گرتوون، قسەی خۆشی بۆ نووسیون. دڵی داونەتەوە کە لێی نەڕەنجێن لەبەر لێ پرسینەوەی و کەمتەرخەمی لەگەڵیاندا... داوای بەخشینی لێ کردوون.

جاری وایش بووە هاتۆتەوە لایان بۆ لای خوێندنگا و شاگردەکانی بۆ لای نووسین و نووسراوەکانی.

سالانی وایش بووە، خێزانەکەی بردووە بۆ لای خۆی، یاخود هەندێکیانی بردووە بۆ لای خۆی.

(مەلا کاکە حەمە) سێ ژنی هێناوە. لە هی یەکەمیان دوو کوڕ و دوو کچی بووە. لە هی دووەمیان دوو کوڕی بووە. لە هی سێ هەمیان سێ منالی بووە. بەڵام لەمانە هەموویان هەر کوڕێک و کچێکی ماوە، لەگەڵ نەوەکانی. (مەلا کاکە حەمە) کە ژنی یەکەمی دەمرێ تا چەند ساڵێکی دوور و درێژ بێ ژن ئەمێنێتەوە ئینجا ژنی دووەمی لە (قەرەداغ)دا پێ ئەهێنن!

کە ئەمیش ئەمرێ ئینجا ژنی براکەی خۆی، خوالێخۆشبوو (مەلا نوری) مارە ئەکات، هەر لەبەر ئەمەی کە پاداشی براکەی و براژنەکەی بداتەوە، کە کاتی خۆی چاودێری منالەکانی ئەویان کردبوو. ئەیویست چاودێری ژنەکە و هەر سێ کچەکەی (مەلا نوری)ی برای بکات.

بێجگە لەمە ( مەلا کاکە حەمە) ئەگەر پشت ئەستوور نەبووایە بەدایکی و خوشکی و براکانی و ئەو سامانەی کە بۆی بەجێ هێشتبوون چۆنی ئەتوانی ئەو منالانەی خۆی وا بەرەڵلا بکات و لێیان نەپرسێتەوە؟!.

لەگەڵ ئەمەیشدا ئەو ئامانجە پیرۆزەی (مەلا کاکە حەمە) بۆ خۆی دانابوو، کە (پەروەردە کردن) و (فێرکردن)ی منالانی بێ خاوەنی نەتەوەکەی خۆی بوو، نەک ئەو، هەر زانا و ڕاستی پەرست و خواناسێکی تریش لە جێی ئەو بوایە، هەر ئەوەندەی ئەوی لە دەس ئەهات، کە بیکات بۆ خێزانەکەی خۆی، پیاوی وا کە خۆی لە بیربچێتەوە و خۆی لە هەموو خورشتێکی نایاب و جلوبەرگێکی جوان و سایە و پایە و مایەیەک، لە هەموو ناوبانگێک بێ بەش بهێڵێتەوە، چۆن ئەبێ کەسێکی تر گلەیی لێ بکات، لەسەر کەم تەرخەمی، بام خێزانیشی بێ. لە ڕاستیدا (مەلا کاکە حەمە) هەموو هێز و توانا و بیر و هۆشێکی خۆی خستبووە سەر خوێندنگاکانی و نووسراوەکانی کە (٣٦) ساڵێکیان پێوە خەریک بووبوو. لەبەر ئەوە نە ماوەی بۆ مابووەوە، نە دەستیشی ئەپەرژا خەریکی هیچی تربێ. وەک لەمەودوا ڕۆشنی ئەکەمەوە.

## مەلایەکی شۆڕشگێڕ

لە ساڵی (١٩٢٥)ەوە تا ساڵی (١٩٦١)، واتا نزیکەی سی و شەش ساڵی خشت، (مەلا کاکە حەمە) ڕەنجی دا و، کۆششی کرد و، خەباتی کرد لەناو هۆزەکانی (جاف) و (داوودە) و (زەنگەنە) و دێهاتەکانی تری کوردستانی عێراق و ئێراندا، هەر بۆ ئەمەی (خوێندەواری) بەناو (کوردەواری)دا بڵاو بکاتەوە و نەتەوەکەی خۆی، هەروەکو خۆی لە هەموو شوێنێکا ئەیگوت: «لە ڕێزی گیانلەبەرییەوە بگوێزێتەوە بۆ ڕێزی مرۆڤایەتی، تا بەپیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانییەوە، کە لەسەر بنچینەی زانست و هونەر دامەزرابێ، ژیانێکی مرۆڤانە بژین». جا بۆ پێکهێنانی ئەم مەبەسە (مەلا کاکە حەمە) دوو ڕێگای شۆڕشگێڕانەی گرت. یەکەم: (٤٤) نووسراوی بۆ شاگردەکانی خۆی بەزمانی کوردی ئامادە کرد. ئەمانە هەندێکیانی لە زمانی عەرەبییەوە گۆڕیبووە سەر زمانی کوردی. هەندێکیشیان خۆی داینابوون. هەندێکیان هی خوێندنی ناو مزگەوت بوون، هەندێکیشیان هی خوێندنگاکانی فەرمانڕەوایی بوون. جا هونەری (مەلا کاکە حەمە) لەوەدابوو، کە ساڵانی خوێندنی لە دە پانزە ساڵەوە کەم کردبووەوە و گەیاندبوویە چوار پێنج ساڵ بەمەرجێ، بارستایی خوێندەواری شاگردەکانی. لە بارستایی شاگردێکی خوێندنگای (ئامادەیی)، بەڵکو بەرەو ژوورتریش کەمتر نەبێ. لە ڕاستیدا بارستایی خوێندەواری شاگردەکانی خوێندنگاکانی (مەلا کاکە حەمە) لە بارستایی خوێندەواریی هەردوو جۆرە خوێندنگاکانی (کۆن) و (نوێ) باشتربوو. چونکە ئەم خۆی بەهەموو شاگردێکیەوە ماندوو ئەکرد. نەک هەر ئەمە، کە زانیارییان بخاتە مێشکەوە، بەڕەوشت و خوویەکی خواناسانە و نیشتمانپەروەرانە و مەردانەیشەوە ڕای ئەهێنان. خەمی خواردن و جلوبەرگ و تەندروستی و خۆش ڕابووارد و سەروەت و ڕێکوپێکی و پاک و خاوێنی نوستنی ئەخواردن و، لەسەر پاسایەکی ڕاست و دروست ژیانیانی ئەبرد بەڕێوە.

لە هاویناندا کە کاتی پشوودانیان بوو، (مەلا کاکە حەمە) کشتوکاڵی بەشاگردەکانی خۆی ئەکرد، ئاژەڵی پێ بەخێو ئەکردن، بەرهەمی ئەو ڕەنجانەیشی بۆ خۆی و شاگردەکانی خۆی بەکارئەهێنا، جێگای نوستنیانی بەخۆیان ڕائەخست، چێشتی خۆیانی بەخۆیان لێ ئەنا، جلی خۆیانی بەخۆیان ئەشوشت، پاک و خاوێنیی خۆیانی بەخۆیان پێک ئەهێنا. هەر ڕۆژە یەکێکیان بانگی ئەدا هەر ڕۆژە یەکێکیان پێش نوێژی بۆ هەموو شاگردەکان ئەکرد گۆرانی و بەزموڕەزم و ئاهەنگیان هەبوو. گەشت و سەیران و وەرزش و یاری و مەلەکردنیان هەبوو. خوێندنەوەی وتاری دروست و سەربەستیان هەبوو. بەکورتی خوێندنگاکانی (مەلا کاکە حەمە) شاگردیان ئەکرد بەپیاوێکی ڕۆشنبیری کوردپەروەری وریا و چست و چالاک، کە هەر پشت بەخۆی ببەستێ. کە سەری بەندەییش بۆ هیچ کەسێک و بۆ هیچ زۆردارێک و بۆ هیچ گروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیەک دانەنوێنێ!. کە ژیانێکی پڕ لە پاکی و چاکی و کامەرانیش بژی.[1]

---

(١) هەر لەم ڕووەوە مامۆستا (شێخ محەممەد حاسلی) کە قوتابییەکی خۆیبووە بۆی گێڕامەوە: «هەر قوتابییە پلەکانی خوێندنی تەواو کردایە دەبوو لاپەڕەیەک لە شێوەی فۆڕمدا پڕ بکاتەوە بەوەی پەیمان بدا کە لەمەودوا درێغی نەکات لە گەیاندنی ئەو زانیارییانەی وەری گرتوون بەمناڵانی کوردی نەخوێندەوار و کۆشش بکات قوتابخانە بکاتەوە» هەروەها وتی: «ساڵی ١٩٤٩ - ١٩٥٠ چوومە دێی حاسڵ لە شارەزوور، لەو ناحیەی =

جا ئەم خوێندنگایانەیش ڕێگای دووەمی شۆڕشگێرانەی (مەلا کاکە حەمە) بوون. پێویستە ئەمەیش بڵێین، کە (مەلا کاکە حەمە) لەپێناو گەیشتن بەم ئامانجە پیرۆز و بەرزەیدا گەلێک کۆسپ و بەرهەڵستی ئەهاتە بەردەم. گەلێک ئەرک و ئازاری ئەچێشت، گەلێک زیانی لێ ئەکەوت، بەڵام ئەو هەرگیز ورەی بەرنەئەدا، کۆڵی نەئەدا، تا ئەهات زۆرتر خەباتی ئەکرد. زۆرتر گەشەی ئەدا بە(نووسراوەکان)ی و بە(خوێندنگاکان)ی.

ڕەوشتی وابوو، هەرچەند ساڵە لە گوندێکدا ئەمایەوە، جاری وا هەبوو، ژمارەی شاگردەکانی ئەگەیشتە پەنجا، شەست شاگرد، کە فەرمانی لەو گوندەدا تەواو ئەبوو، ئینجا ڕووی ئەکردە گوندێکی تر کە بەشبراوبووبێ لە خوێندنگای فەرمانڕەوایی یاخود مزگەوت.

(مەلا کاکە حەمە) لە بەرامبەر ئەم هەموو ڕەنجەدا سەری خۆی بەرز ڕائەگرت، پاداشی لە کەس داوا نەئەکرد. خۆی و شاگردەکانی خۆی بەو نانە ئەژیاند کە بەرەنجی شان و خوهی[1] ناوچەوانی خۆیان پەیدایان ئەکرد، یاخود بەو یارمەتییەی کە گوندییەکان، بەئارەزووی خۆیان ساڵە و ساڵ لە بەرهەمەکانی خۆیان ئەیاندانێ. ئەو ئەیویست شاگردەکانی خۆی وا ڕابهێنێ کە وەک خۆی دەربچن. وەک خۆی خۆبەختکەر و دڵسۆز و نیشتمانپەروەر و خواناس بن. ئەیویست ئەوانیش خۆیان بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەوارییەکی ڕاستەقینە تەرخان بکەن، بۆ کەڵکی کوردەواری و ئاواکردنەوەی کوردستان.

بێجگە لە خوێندنگا بەڕێوەبردن و نووسراو دانان و نووسراو گۆڕین (مەلا کاکە حەمە) چالاکییەکی تریشی ئەنواند. ئەویش ئاراستەکردنی دانیشتوانی گوندەکان و گەورەکانیان بوو، بۆ کاروباری چاک و پاک بۆ کەڵکی هەمووان. هەروەها تا ئەندازەیەکی گەورەیش لە کاری خراپ و زیانبەخش پەشیمانی ئەکردنەوە. بەم ڕەنگە (مەلا کاکە حەمە) شۆڕشگێرانە ئەبزووتەوە. وەک چرایەکی پرشنگدار مایەوە،

---

= وارماوەیەدا قوتابخانە لە هیچ دێیەکدا نەبوو، بەپێی ئەو تەعەهودەی دابووم بەمامۆستا مەلا کاکە حەمە پێویستی کردنەوەی قوتابخانەیەکم ئامادە کرد، حاجی حەمە ئاغاش دیوەخانەکەی خۆی کردە جێگای خوێندن، قوتابی لە گوندەکانی تریشەوە دەهاتن... ناحەزان گومانیان لەم کارە کرد و گەیاندیانە لای حکوومەت کە ئەمە قوتابخانەیەکی سیاسییە، حکوومەت کەوتە لێکۆڵینەوەی ئەمە، حەمە ئاغا ناوێک قایقامی هەڵەبجە بوو، هاتە لامان تا بزانێ ئەم قوتابخانەیە چییە و چۆنە، بەڵام کە ڕاستی کارەکەی بۆ دەرکەوت پێشنیاری کرد - بەنووسراوی ژمارە ٤/٤٢٨ لە ١٢/٣/١٩٥٠ کە ئەم قوتابخانەیە بکرێتە ڕەسمی و منیش ببمە مامۆستا تیایدا-. موتەسەڕیفی سلێمانی بەنووسراوی ٢١٦٨ لە ١٣/٣/١٩٥٠دا بڕیاری دا و پەروەردەی سلێمانی مامۆستا ساڵح سەعیدی موفەتیشی نارد و قوتابییەکانی تاقی کردەوە تا ڕادەی خوێندنیان دیاری بکات. ئەویش بڕیاری دا کە ئاستیان زۆرباشە و پۆلی چواری بۆ دیاریکردن و یەکەم مامۆستاش کە نێررا بۆ حاسڵ مەجید ئەفەندی حاجی مەلا ڕەشید بوو وە ژمارەی قوتابییەکان گەیشتە ٧٠ قوتابی لە گوندەکانی: قەڵبەزە، ئالان، تەپەکەل، مالوان، کانی کەوە، میرەدێ، چنار، قلیجە، ناو جاف. خۆیشم لە پەنا زرعاتکردندا ڕۆژی چوار دەرسم دەوتەوە بەبێ پارە» - لە سەردانی ڕۆژی دووشەممە ١٦/٩/٢٠٠٢ لە سەرچنار-.

(١) خوهـ: ئارەقی لەش. (ش. ف)

لەناو دێهاتەکانی کوردستاندا مێشک و دڵ و دەروونی (ڕەش) و (ڕووت) و (دەسەڵاتدار) و (هەژار) و (دەوڵەمەند)ی نەتەوەکەمانی ڕۆشن ئەکردەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا نەی ئەویست بناسرێ، یاخود ناوبانگی بۆ دەربکرێ. یاخود بۆ سایە و پایە و مایە بگەڕێ. چونکە (مەلا کاکە حەمە) نیشتمانپەروەرییەکەی لە خواناسییەکەیەوە وەرگرتبوو. هەرچییەکی ئەکرد، بۆ خوای ئەکرد، پاداشی لە کەس نەئەویست. لە خوای ئەویست. کە لە پێناو ئەم کردەوە ڕەنگینانەیشدا گیروگرفتێکی ئەهاتە بەر و، دەرد و ئازارێکی تووش ئەبوو، ڕووی ئەکردەوە خوا و داوای ڕێگا پێشاندانی لێ ئەکرد، بۆ ئەمەی ئەو فەرمانە گەورەیەی خستبوویە سەر شانی خۆی باشتر بەڕێیەوە ببات.

جارێکیان لە دێیەک لە دێهاتەکانی (داوودە) ڕەنجی چوار ساڵ و سێ مانگی بەبا چوو! شاگردەکانی لێی تەکینەوە و بڵاوەیان لێ کردا. (مەلا کاکە حەمە) لە پاش سکاڵایەکی دوور و درێژ کە بەهەناسەیەکی ساردەوە نووسیویە، لە ژێن نامەکەیا، ئەڵێ: «لەبەر ئەوەی زانرا ئەمانە نایەنە ئەوەی معاشیان دەس کەوێ زەکات و سەرفترەیان بدرێتێ، سەرقەڵەمانە وەرگرن، تێکیاندا. منیشیان لە غایەکەم محروم کرد! سەرگەردانیان کردم!. پەنا بەخوا...».

ئەمە لە ساڵی ١٩٤٤دا ڕووی دا. کەچی (مەلا کاکە حەمە) زۆری پێ نەچوو، چووە گوندێکی تر، سەرلەنوێ خوێندنگایەکی تری دامەزراندەوە!.

## شاکارەکانی مەلا کاکە حەمە

(مەلا کاکە حەمە) بۆ شاگردەکانی ئەم نووسراوە کوردییانەی ئامادە کردووە. هەندێکی کردووە بەکوردی. هەندێکیشی بەکورتکراوەیی و پوختەیی گۆڕیوە و داڕشتووە بەکوردی. هەندێکیشیانی داناوە و داهێناوە بەکوردی[1].

١- تفسیری قورئان بەکورتی هەر سێ جزئەکە.

٢- منهاج لەسەر وتەی ئیمامی (نووی)[*] بەتەحقیقاتی پێویستی (إبن الحجر)ەوە و هی تر لە مەزهەبی (شافعی)دا. ئەمە (٨٠٠) لاپەڕەی گەورەیە.

٣- نحوی عربی

٤- صرفی

٥- وضع

٦- إستعارە لە علمی منطقدا

٧- إیساغوجی

---

(١) ئەمە لە نووسراوێکی خۆی وەرگیراوە. خۆیشم زۆربەی ئەم نووسراوانەم لای کوڕەکەی (مەلا جەلال) دیوە. (ش. ف).

(*) نووی: نەوەوی: یەحیای کوڕی شەرەف، لە ١٢٧٧ز کۆچی کردووە، لە نەوای حۆران لە شام لەدایکبووە و مردووە، گەلێ دانراوی لە حەدیسا هەیە: (ریاض الصالحین، الأربعون النوویە، تهذیب واللغات...).

٨- شمسيه

٩- گلنبوی برهان

١٠- گلنبوی آداب

١١- شرحی عقائدی مەلا سەعید

١٢- جمع الجوامع

١٣- مختصر لە علمی بلاغت

١٤- تلخیص تهذیب الکلام

١٥- تشریح الأفلاک

١٦- رسالە حساب[1]

١٧- جغرافیای عمومی[2]

١٨- تأریخی عومومی

١٩- قواعدی کوردی

٢٠- معلوماتی مدنیه

٢١- خوو و ڕەوشت

٢٢- تەندروستی (صحه)

٢٣- علمی دین

٢٤- مبادئی هندسه

٢٥- کیمیاء

٢٦- قانونی عقوبات

٢٧- قانونی اصول محاکمات

٢٨- قانونی عشائر

---

(٢,١) ئەم دوو بابەتەم لەلای مامۆستا شێخ محەمەد حاسڵی خەرپانی دیوە، بەسوپاسەوە چەند ڕۆژێ لەلام بوو، حساب)ەکە بەکوردییەکی پوخت و خەتێکی جوان ڕاڤەکراوە و بابەتەکانی شیکراونەتەوە و دەیان نموونەیان لەسەر هێنراونەتەوە و حەل کراون. باسەکانی: جەزری ژمارەی ساغ، کەسر، دۆزینەوەی نامەعلوم بەئەربەعەی موتەناسیبە... بەداخەوە دەفتەرەکە پەڕەی لێ فەوتاوە.

(جوغرافیای عمومی) (٤٦) لاپەڕەیە، کوردییەکی ڕەوان، باسەکانی: پێناسەی جوغرافیا، بەشەکانی، هەسارەکان، چوار لایەکە، گەڕانی زەوی -ڕۆژی و ساڵی- ئوفوق، جیهانی ئەساسی، خطی طول و عرض، مەنطیقە، مانگ و ڕۆژگیران، ریاح -با-، ئاورەنگ، تەم، باران، بەفر و تەرزە، گۆڕانی سطحی ارض، تیاراتی بحری، استلاحاتی جغرافی، قارەکان، ئەوروپا: سطحی، حاصلاتی ڕێگەی، ولاتەکانی، جزیرەی بەریتانیا.

٢٩- قانونی أساسی
٣٠- قانونی تسویه
٣١- قانونی زراعت
٣٢- قانونی عقر
٣٣- قانوونی لزمه
٣٤- ئەلف و بێی کوردی... ئەم ئەلف و بێیە زۆر سەیرە. زۆر ئاسانیش فێر ئەکرێ. خۆی دایهێناوە. لەسەر بنچینەی (دە) ژمارە، کە لە (یەک)ەوە دەست پێ ئەکات هەتا (دە) لەگەڵ (سەر) و (بۆر) و (ژێر) و (زەنە)دا. (مەلا کاکە حەمە)، (٣٨) پیتی بۆ فێربوونی (ئەلف و بێی زمانی کوردی) داناوە، کە لەمانە (٢٨) پیتیان لە زمانی کوردی و عەرەبیدا وەک یەکن. (١٠) پیتیشیان تایبەتێن بۆ زمانی کوردی. (ئەلف و بێ)یەکە لە ڕاستەوە بۆ چەپ ئەنووسرێ. ئەویش پیتە بزوێنەرەکانی (ە) و (و) و (ی)ی خۆی بەکارئەهێنێ، لە جیاتی (سەر) و (بۆر) و (ژێر)ی عەرەبی.

***

ئەمانە و هەروەک لە یادنامەیەکی تری خۆیدا دەرئەکەوێ چەند نووسراوێکی تریشی بەکوردی داناوە، وەک: (ئەلفبای فەرەنسزی) (لغتی فەرەنسزی)، (نصیحتی زمانی کوردی)، (تأریخ کورد)، (ریاضتی بدنیە، وازی، یاری)، (گۆرانی)، فیزیاء)، (مبادئی طبیعت)، (تاریخی طبیعی)، (جغرافیای عێراق)، کە ئەمانەیشی بەوانە (درس) بەشاگردەکانی خۆی گوتۆتەوە، بەم پێیە نووسراوەکانی (مەلا کاکە حەمە) خۆیان ئەدەن لە (٤٤) نووسراو.

***

ئەمانە بەشی زۆریان کە بریتییە لە (٣٠) سی نووسراو، لای کوڕەکانی (مەلا جەلالی کوڕی مەلا کاکە حەمە) پارێزراون[1]. وەک خۆی ئەڵێ: «بێجگە لەوانە نووسراوانی تریش هەن». بەڵام هەتا ئێستا بۆ ئێمە دەرنەکەوتوون.

## خوێندنگایەکی تاقانە

هەروەکو لەوەپێش گوتمان: سنووری خەباتکردنی (مەلا کاکە حەمە) هەر لە نزیک (باقووبەرە) بوو ئەکشا بەناو کوردستانی عێراق و ئێراندا تا ئەگەیشتە نزیک شاری (سەقز). ئەمانە ناوی چەند گوندێکن لەو گوندانەی کە (مەلا کاکە حەمە) خوێندنگا تاقانەکانی خۆی تیا کردوونەتەوە و لەناویشیاندا منالانی کوردی فێری خوێندەواری و ڕەوشت و خووی بڵند کردووە:

(گریچنە، فقی مصطفی، مەلا هۆمەر، کۆییک، مەسوەیی، خان إبراهیم خانچی، دار بەڕوو، قەرەداغ، قزرابات، چەوری، دوڕاجی، نەپەسی، غەرە، سیامنصور، چیا ڕەزا، باقووبەرە) لە یادنامەیەکیا کە لەناو

(١) خوالێخۆشبوو (مەلا جەلال کوڕی مەلا کاکە حەمە) سێ کوڕی هەیە: کاک نەوزاد و کاک بەختیار و کاک شاسوار. (ش. ف).

نووسراوەکانیا دۆزییەوە و بریتی بوو لە چوار لاپەڕە، (مەلا کاکە حەمە)، لە بابەت خوێندنگایەکیەوە کە لەناو هۆزی (داوودە)دا لە سالّی (١٩٤٠)دا کردویێتییەوە بەم جۆرە هەست و بیروباوەڕی خۆی دەربڕیوە:

«لە (١٩٤٠/٨/١)ەوە تا (١٩٤٤/١١/١) یەعنی چوار ساڵ و سێ مانگ لە (داوودە) دەرسەکانی خوارەوەم بە(٢٤) قوتابی گوت، کە کوڕی ئاغا و مسکێن بوون، لە هی ئەم ئاواییانە: (دوراجی، چەوری، غەرە، قەلا، پەلکانە، قوری چای، زنانە، قەلخانو، هۆمەر صوفی، ئاوایی لفتی ئاغا). بەخۆڕایی دەرسم ئەگوتەوە. خدمتم ئەکرد. چونکە هیچ قومێکی نەزان بەهیچ نابێ، نە بۆ دین، نە بۆ دنیا. غایەم ئەوەبوو کە ئەمانە لە زانینی دینی و مەدەنی بەقەد تاقەت و توانا شتێ وەرگرن. ئەوسا بەڕۆح خەریکی مکافحەی نەزانی قەومەکە بن. ببنە بناغە بۆ ئەوەی طاقمێکی گەورە ببنە زانیار. تا بەزانینەوە، بەصنعت و زراعەت و کاسبی، ژیانێکی بەشەرییان دەسکەوێ».

ئینجا (مەلا کاکە حەمە) لە پێڕەویی خوێندنگا ئەفلاتوونییەکەی خۆی ئەدوێ. ئەڵێ: «منهجی درس وابوو:

١- هیچ وەختێ تێکەڵی غەیری خۆیان نەبن.

٢- خەو، خواردن، إستراحەت، پاکی، عبادت، دەرسیان دائما لەژێر مراقەبەیەکی فنیابێ.

٣- بەش کردنی شەو و ڕۆژیان بەسێ بەشی وەک یەک بێ؛ یەکەم بۆ خەو. دووەم بۆ خوێندن. سێیەم بۆ ڕەحەتی و عیبادەت و خواردن و وازی و یاری.

٤- غایەیان تەنها دەسکەوتنی زانین بێ، کە بتوانن مکافحەی نەزانیی قەوم بکەن و هیچی تر.

٥- شەو و ڕۆژ پێنج نوێژە فەرزە کە بەجەماعەت بکەن. کە بەنۆبە بانگ بدەن. ئیمامەتی بکەن.

٦- لە ڕەحەتیا حوڕبن. نەوعە ڕابواردنێکی وا خۆشیان ببێ کە فکری هیچی تر نەکەنەوە.

٧- لە زراعەتدا، لە شتی تریشدا، بەقەد توانا ئەوی ئەیخوێنن بیشیکەن.

٨- هەموو ڕۆژێ بەقەد توانا ڕیازەی بەدەنییەیان ببێ.

٩- لباسیان هەموو یەک نەوع بێ.

١٠- لایان وابێ و وابن کە لەیەک باوک و دایکن.

١١- بەنۆبە دائما خوتبەی مەعقوول بخوێنن بەسەربەستی.

١٢- هەموو ڕۆژێ ئیمتیحان ببێ.

١٣- وەخت و مقدار و نەوعی خواردن و خواردنەوە و خەویان مەعلوم بێ.

١٤- هەموو وەختێ مقدارێ پێش بەیانی لەخەو هەڵسن.

١٥- لەشەویشدا دەرسیان ببێ.

١٦- زۆر بەدقەت لە تۆز و پیسی خۆیان بپارێزن».

***

ئینجا (مەلا کاکە حەمە) ئەڵێ:

«بەم نەوعە (٥١) مانگ سەعی کرا. بەقەد توانا خەریکی سەرکەوتن و پێشکەوتن بوون».

## شاگردەکان ئەم وانایانەیان[1] ئەخوێند

پاشان (مەلا کاکە حەمە) ناوی ئەو وانایانە ئەنووسێ کە لەو خوێندنگایەدا بەشاگردەکانی خۆی گوتۆتەوە. بەم جۆرەیە کە لە خوارەوە نووسراون:

١- ئەلفبا هەموو نەوعەکانی.

٢- نووسین؛ کوردی، عەرەبی، تورکی، فارسی، فەڕەنسزی.

٣- حساب بەکوردی.

٤- قورئان

٥- جغرافیای عێراق بەکوردی.

٦- جغرافیای عمومی بەعەرەبی.

٧- جغرافیای عمومی بەکوردی.

٨- تأریخێ عمومی بەکوردی.

٩- تأریخی کورد بەکوردی.

١٠- تأریخی إسلام بەتورکی.

١١- تاریخی عەرەب بەعەرەبی.

١٢- میادئی طبیعەت بەکوردی.

١٣- تأریخی طبیعەت بەکوردی.

١٤- هەندەسە طبیعی بەکوردی.

١٥-أشیاء طبیعی بەکوردی.

١٦- أشیاء طبیعی بەعەرەبی.

١٧- علمی کیمیاء بەکوردی.

١٨- علمی فیزیاء بەکوردی.

١٩- علمی صحە بەکوردی.

٢٠- قانونی عقوباتی بغدادی بەکوردی.

٢١- قانونی اصولی محاکمات بەکوردی.

٢٢- معلوماتی مدنیە بەکوردی.

٢٣- علمی أخلاق بەکوردی.

٢٤- ئەلفبای فەرەنسزی بەکوردی.

٢٥- ألفبای خصوصیی تازەی خۆمان (هی کوردی).

---

(١) راستتر: ئەم وانانەیان...

٢٦- علمی هیئت ونجوم بەکوردی.

٢٧- نشید (گۆرانی) بەکوردی.

٢٨- ریاضتی بدنیە، وازی، یاری بەکوردی.

٢٩- علمی طلاق و نکاح بەکوردی.

٣٠- باسی طلاق و نکاح بەکوردی.

٣١- نحوی عربی بەکوردی.

٣٢- صرفی عربی بەکوردی.

٣٣- قواعدی کوردی بەکوردی.

٣٤- لغتی عربی بەکوردی.

٣٥- لغتی فەرەنسزی بەکوردی.

٣٦- علمی فرائض، بەشکردنی ماڵە مردوو، بەکوردی.

٣٧- علمی منطق بەکوردی.

٣٨- علمی عقائد بەکوردی.

٣٩- علمی مباحثە بەکوردی.

٤٠- عملی بیان وإستعارە بەکوردی.

٤١- علمی وفق بەکوردی.

٤٢- نصیحتی زمانی کوردی بەکوردی.

٤٣- تفسیری قرآن بەکوردی.

## نموونەیەک لە ئەلفاباکەی مەلا کاکە حەمە

پاش ئەوە (مەلا کاکە حەمە) (بۆ نموونە چەند دێرێکی بە(ئەلفا)کەی خۆی نووسیوە، بۆ مەشق، کە بەشاگردەکانی خۆی بکات. ئەمە چەند دێرێکیتی:

« ئەی بۆ بەرچێ نە کرین

بە دەشتە کی بەکان کە لە

سەد نەوەدی قەدەمەکە مانن

هەر سی و هەشت پیتەکەی (ئەلف و بێ)یەکەی (مەلا کاکە حەمە)یش ئاوهایە:

| د | خ | ح | ج | / | ث | ت | ب | أ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | / | ١ | ١ | ١ | ١ |
| ط | ض | ص | ش | / | س | ز | ر | ذ |
| ٤ | ٤ | ٤ | ٤ | / | ٣ | ٣ | ٣ | ٣ |
| م | ل | ك | ق | / | ف | غ | ع | ظ |
| ٦ | ٦ | ٦ | ٦ | / | ٥ | ٥ | ٥ | ٥ |
| ڤ | ژ | چ | پ | / | ی | ه | و | ن |
| ٨ | ٨ | ٨ | ٨ | / | ٧ | ٧ | ٧ | ٧ |
|  | نگ | ڎ |  | / | ێ | ۆ | ڵ | گ |
|  | ١٠ | ١٠ |  | / | ٩ | ٩ | ٩ | ٩ |

بەپێی ئەم جۆرە (ئەلف و بێ)یە، ناوی خۆی وەها نووسیوە:

[ مەلا  کاکە  حەمە ]
١٦٧٩  ٧٦آ٦  ٧٩٦٧٤

## کۆچی دوایی

(مەلا کاکە حەمە)، ئەو ئەستێرە گەشەی کە نزیکەی سی و شەش ساڵی خشت لە بەشێکی گەورەی خاکی کوردستاندا پرشنگی زانست و هونەر و خواناسی و نیشتمانپەروەری بلاو کردەوە، لەبەر نەخۆشی لە گوندی (باقوبەرە)[1] وە کە لە لادێی (هۆرێن و شێخان) دایە، هێنایانەوە (سلێمانی). لە ڕۆژی ١٩٦١/٥/١٠دا لە (سلێمانی)، لەتاو ئازاری نەخۆشییەکەی گیانی پاکی بەخاک سپارد. بەمردنەکەی ئەو کسپە لە جەرگی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆزەوە هات، بەتایبەتی لە هی شاگردەکانییەوە کە هەتا ئەمێنن ئەویان لەبیر ناچێتەوە. نەتەوە بۆی کەوتە شینەوە و، لەوپەڕی ڕێزدا بەرێی کرد بۆ لای خوای خۆی. لەسەر خواستی (مەلا کاکە حەمە)، خۆی، هەرچی کەلوپەل و نووسراوێکی لێ بەجێ مابوو - بێجگە لە نووسراوە کوردییەکانی- هەموو بەرەو ڕووی مزگەوتی (باقوبەوە) کرایەوە. تا شاگردەکانی ئەوێی کەلکیان لێ ببینن.

(مەلا کاکە حەمە) هەتا ما، وەک ڕاستی پەرست و خواناس و زانا و نیشتمانپەروەرێک ژیا. دڵ و

---

(١) باقوبەرە: گوندێکە لە ناحیەی مەیدان.

زمان و دەستی یەک بوو. بەشێوەی ژیانی و بەنووسراوە نایابەکانی و، بەخوێندنگا ئەفلاتوونییەکانی، سەری نەتەوەکەمانی بڵند کردەوە.

ئێستا زۆربەی نووسراوەکانی کە بریتین لە سی نووسراو، چوونەتە گەنجینەی وێژە و زانست و هونەری کوردییەوە. لە خانووی خوالێخۆشبوو (مەلا جەلال)ی کوڕیا پارێزراوە، لای خێزانەکەی(*).

جا هیوادارم کە خوا ئەو ڕۆژەمان پێشان بدات، کە ئەو نووسراوانە لەلایەن کاربەدەستانی کوردستانەوە، بەچاپ کراوی ببینین هەروەها پەیکەرێکیشی بۆ دروست بکرێ و دابمەزرێنرێ، لە گەڕەکی (دەرگەزێن)دا.

خۆشی لە گیانی پاکی (مەلا کاکە حەمە)، کەوا بەسەربەرزی و ڕووسوورییەوە گەلەکەی خۆی بەجێ هێشت و، چوو بۆ لای خوای خۆی.

هەروەها خۆشی لە نەتەوەی (کورد)یش کە پیاوی وا گەورەی تیا هەڵکەوتووە، کە سەری بڵند کردۆتەوە.(**)

---

(*) (مەلا جەلال) کە چووەوە لای خوای خۆی، ژنەکەی و کچێک و سێ کوڕی هەبوو. ناوی کوڕەکانیمان لەمەوپێش نووسیوە. کچەکەیشی ناوی (بێ گەرد). (ش. ف).

(**) بەشی زۆری ئەم نووسراوەم لە ١٦/١١/١٩٧٠دا بەناوی (یەکێتیی نووسەرانی کورد)ەوە، (لقی سلێمانی) لەسەر (تەلەفزیۆنی کەرکووک) خوێندەوە. (ش. ف)

# زێوەر

(چیرۆکی ژیانی وێژەوان و بوێژ و نیشتمانپەروەری هەرە بەناوبانگی کوردستان
مامۆستا زێوەر پێشان ئەدات)

## پێشەکی

پیاو کە تەماشای مێژووی ژیانی کوردەواری ئەکات، زوو بەزوو بۆی دەرئەکەوێ: کە ئەوانەی زانای بەکار و وێژەوانی لێهاتوو بوون، هەمووده‌م لە ئازار و هاواردا بوون، لە تەنگوچەڵەمەدا بوون. لە گیروگرفتا بوون. (نەتەوە)یان کەمتەرخەمی نواندووە بەرامبەریان، یاخود بەرەنگاری کردوون. لەم کارە ناهەموارەیشەوە ئەوە پەیدابووە کە بەشێکی زۆر لەو زانا و وێژەوان و ڕۆشنبیرانەیشمان کوژراون و لەناوچوون، یاخود تەفروتوونا بوون بۆ خاکە بێگانەکان!. هەر کەسێکیشیان ماوەتەوە، چرای هیوای کوژاوەتەوە و، دەستەونەژنۆ دانیشتووە و، وازی لە هەموو جۆرە خەباتێکی نیشتمانی هێناوە!

سەیر ئەوەیە ئەو زانا و وێژەوانانەمان کە گەیشتوونەتە خاکە بێگانەکان، بەپێچەوانەی ئێمە، نرخیان دراوەتێ و ڕێزیان لێ گیراوە و، بایەخیان پێ دراوە، تا گەیشتۆتە ڕادەیەکی وەها کورد و کوردستانەکەی خۆیان لەبیر چۆتەوە و خۆیان لەپێناو پێشکەوتن و سەرکەوتنی ئەو خاکە بێگانانەدا بەخت کردووە!...

کەواتە لە باری ناهەمواری ئێمە و بەدکرداریانەوە بووە، کە هەرچی زانا و وێژەوان و ڕۆشنبیرێکمان هەبووە، یان لەناوچوون یان سارد بوونەتەوە لە خەبات، یاخود بوون بەپیاوی بێگانە و بەوان کەڵکیان بەخشیووە!... کە ئەمەیش، داخەکەم، ئەوپەڕی باری نابووتییە لە پێشکەوتن و شارستانێتیدا! کە لەسەر گەلەکەمان تۆمار کراوە!... جا لەبەر ئەمە بوو کە تاریکییەکی شەوەزەنگ، ئاودامان کوردستانی داگیر کرد بوو، تا ئەم چەرخی بیستەمەش کوردەوارییەکە، خۆی بەدەست خۆیەوە ئەینالاند. کە ئەتوانم بڵێم تا ئێستاکەیش، تا ئەندازەیەکی گەورە، ئەم بارە ناهەموارە لە زۆربەی شوێنەکانی کوردستاندا فەرمانڕەوایە!...

لەمەیشەوە ئەمە پەیدا بوو بوو، کە هەمووده‌م -مەگەر بەدەگمەن- کاروباری گشتی ئەکەوتە دەست پیاوی بێ کارە و ناهەموارەوە!... نەتەوەکەیشمان تا ئەهات نوقمی زۆرداری و هەژاری و دەردەداری و نەخوێندەواری ئەبوو!...

ئەوەندە هەیە لەم چەرخەدا، جۆرە کەسانێک پەیدا بوون بەرگەیان گرت و خۆیان ڕاگرت لەبەر کرداری چەوتی چەرخی کەچڕەفتاردا، نیشتمانەکەی خۆیان بەجێ نەهێشت کۆڵیان نەدا و، ورەیان بەرنەدا... هەزار زۆروستەم و ناخۆشییان هاتە بەردەم. بەڵام لە خەباتی گشتی نەکەوتن. ئەوانە زانا و وێژەوانی تەواو، خواناسی تەواو، نیشتمانپەروەری تەواو بوون... کە پێویستە چیرۆکی ژیانیان بەسەر کەفی زێڕ بنووسرێتەوە...

یەکێک لەو جۆرە کەسانە (مامۆستا زێوەر) بوو.

***

(مـامـۆسـتــا زێوەر) لە سـالّی ١٨٧٥دا، لە سلێمـانیـدا، لە دایک بووە. لە سـالّی ١٩٤٨دا، لە سلێمانیدا، گیانی پاکی بەخاک سپاردووە، لە شارەکانی کوردستاندا خوێندنی تەواو کردووە و بووە بەمەلایەکی تەواو، چوار سالّێکیش لە ئەستەمولّدا گیرساوەتەوە. بەهۆی ئەو گەشتانەیەوە کە بۆ خوێندن کردوویەتی، تێکەلّ بەوێژەوانان و کاربەدەستان بووە و شارستانێتی ئەو ناوچانەیشی چێشتووە. لە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسیدا تەواو شارەزا بووە. لە کاروباری زرنگکاری کوردستان و جـیـهـانیـشـدا ئاشنایەتیـیـەکی تەواوی پەیدا کـردووە. بووە بەبوێژ و بووە بەنووسـەر و بووە بەنیشتمانپەروەرێکی کارگوزار و بەنرخ. بێجگە لە هۆنراوە پڕ واتا و بەهێزەکانی کە کۆمەلّەیەکی گەورەیان لێ پێکهاتووە، نۆ نووسراوی نایابی تریشی پێشکەشی گەنجینەی زانست و هونەر و وێژەی کوردی کردووە.

(زێوەر) مامۆستایەتی کرد بوو بەپیشە بۆ خۆی. نزیکەی ٣٠ سی سالّی خشت منالآنی خاکەکەی خۆی پێگەیاند لە خوێندنگاکانی کوردستاندا... بۆ وریاکردنەوەی نەتەوەیش و ڕۆشنکردنەوەی بیریشیان تێکۆشا، بەرەنگاری نەخوێندەواری و ڕیژگاوی کرد. چوو بەگژ زۆرداران و بەدکرداراندا... لە ژیانی خۆیشیا بووە نموونەیەکی خواناسیی و نیشتمانپەروەری و کردەوە و ڕەوشتی بلّند و ڕۆشنبیری.

(زێوەر) ژیانێکی کولەمەرگی ژیا. ژیان بۆ ئەو سەخت بوو. لەگەلّ ئەمەیشا سەربەرزانە ژیا. سەری بۆ هیچ کەسێک و بۆ هیچ گیروگرفتێک دانەنەواند. کەمتەرخەمی نەتەوە دلّی سارد نەکردەوە. تا مایش لە خەباتی خۆی وازی نەهێنا.

پیاوێکی وەک مامۆستا (زێوەر)، شایستەی ئەوەیە، کە لەلایەن کاربەدەستانی کوردستانەوە، نووسراوە دەسنووسەکانی بۆ لە چاپ بدرێ. پەیکەرێکی نایابیشی لە گەڕەکەکەی خۆیدا، (کانێسکان)، بۆ دابمەزرێنرێ. تا ئەو ڕێز و خۆشەویستییە شایستەیەی کە لە سەردەمی ژیانیا لێی بێ بەش بوو، لەپاش مردنی تۆلّەی بۆ بکرێتەوە و گیانی پێ شاد بکرێ...

ئەمەندە و چیرۆکی ژیانی ئەم بوێژ و وێژەوان و نیشتمانپەروەرە گەورەیە، لە لاپەڕەکانی دواییدا پێشکەشی خوێندەوارە بەڕێزەکانمان ئەکەم. هیوادارم بەدلّیان بێ و کەلّکیشی لێ وەربگرن.(*)

سلێمانی: ١٩٧٢

شاکر فتاح

(*): بەشی زۆری ئەم نووسراوەم، لە ڕۆژی ٨/١١/١٩٧٠دا، لە تەلەفیزیۆنی کەرکوکدا خوێندەوە. (ش. ف).

## پێگەیشتنی زێوەر

(زێوەر)، ناوی خۆی (مەلا عەبدوڵلای کوڕی محەمەد ئەفندی کوڕی مەلا ڕەسول)ە. لە ساڵی ١٨٧٥دا لە سلێمانیدا لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩٤٨دا لە سلێمانیدا گیانی پاکی بەخاک سپاردووە.

لە مزگەوتەکانی سلێمانیدا، هەروەها لە مزگەوتەکانی (مەریوان) و (بانە) و (موکریان) و (ساباڵاخ) و (ڕەواندز) و (هەولێر) و (کەرکووک)دا خوێندنی تەواو کردووە. چوار ساڵێکیش لە (ئەستەموول)دا ژیاوە و بەهرەی لە تێکەڵی بەوێژەوانان و کاربەدەستان و شارستانێتی ئەو ناوچانە وەرگرتووە. کاتێ کە ئەگەینە ساڵی (١٣٢٤)ی ڕوومیی، (زێوەر) ئەبینین بووەتە (مەلا)یەکی تەواو. قاڵ بووە لە هەر چوار زمانەکاندا: کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی. شارەزاییەکی تەواویشی هەیە لە بابەت باری کورد و کوردستانەوە. هەروەها لە بابەت ئیسلامەتی و جیهانەوە. بووەتە پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانە. دوو چاوی گەشی پێوەیە، لە تیشکەکانیانەوە وریایی و ئاگاداری و زانین و مەندی و زرنگی تێئەگەین. لە قسە شیرینەکان و ڕووە خۆشەکەیشییەوە، ئەوە دێتە دڵمانەوە کە (زێوەر) خاوەنی هەستێکی نیشتمانپەروەرانە و بیر و هۆشێکی ڕۆشنبیرانەیە، کە خەبات ئەکات بۆ کوردەواری، بەو هیوایەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان نەتەوەکەی خۆی بەئازادی و کامەرانییەوە ببینێ.

لە ناوچەوانە پانە بەرزەکەیشییەوە، ئەوە ئەخاتە مێشکمانەوە، کە پیاوێکی خواناس و پڕ باوەڕ بەئەنجامی چاکی (مەردایەتی) و (مرۆڤایەتی) و (کوردایەتی) و (ڕەوشت و خووی جوان) و (کردەوەی بڵند).

## کار و فرمانی زێوەر

جا لەم دەمەدا بوو کە زێوەر کرا بەمامۆستایەک لە خوێندنگای (رشدیەی عسکریە)دا لە سەردەمی تورکدا. لە سەردەمی عێراقیشدا کرا بەمامۆستایەک لە خوێندنگای (دەرێ سعادت)دا. لە سەردەمی خونکاریی (شێخ مەحموودی مەزن)یشدا کرا بەمامۆستایەک لە (اعدادی ملکی)دا. پاش ئەوەیش هەر مامۆستایی کردووە لە خوێندنگاکانی سلێمانی و دێهاتەکانی ناوچەی سلێمانیدا. تا لەپاش وانە گوتنەوەیەکی ٣٠ سی ساڵی لە مامۆستایی وازی هێناوە و بووە بەخانەنشین لە ماڵی خۆیدا. ئەودەمە ساڵی ١٩٤٢ بوو.

## ڕەوشت و سروشتی زێوەر

ئەم مەلا کوردە، لە گەلێک ڕووەوە لە زۆربەی مەلاکانی سەردەمی خۆی نەئەکرد. جاری وایش هەبوو هێرشی ئەبردە سەریان لەسەر ئەوەی کە خۆیان دوور ڕائەگرت لە خەباتی گشتییەوە بۆ گەلی کوردەواری. یاخود بەواتایەکی ڕۆشنتر لەبەر ئەوەی کە ئایینی پاکی ئیسلامیان بەکار نەئەهێنا لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بۆ کەڵکی نەتەوەکەی خۆیان. ئەو ئەیویست مەلاکان یەک بگرن و ببنە هێزێکی گەورە بۆ بەرەنگاری کردنی زۆرروستەم. بۆ ڕۆشنکردنەوەی مێشکی نەخوێندەوارەکان لە ڕێگای وتاردان و نووسین و فێرکردن و پەروەردەکردنەوە. زێوەر ڕقی لە ساز و سەودای نوشتە نووسین و زەرگ لەخۆدان و های و

هوویی دەروێشان ئەبووەوە. حەزی ئەکرد نەتەوە ئازاد بێ لە دەست چەوساندنەوەی شێخە درۆزنەکان و، بازرگانە دەست بڕەکان و، فەرمانبەرە دزەکان، هەروەها بەرەنگاری ئەو کۆلکە ئەفەندییانەیش ئەبوو کە بەدرۆ ناوی خۆیان نابوو (منور) یاخود ڕۆشنبیر. کەچی هەر خەریکی خومار و قومار و داوێن پیسی و شەڕە جوێن و خوانەناسی بوون! بەدرۆ لاف و گەزافی نیشتمانپەروەرییان لێ ئەدا، کەچی کارێکی وایان نەئەتواند کە نەتەوەکەیان کەلکێکی لێی دەست کەوێ... لە سەرێکی تریشەوە (زێوەر) خەمی هەژار و جووتیار و لادێیی ئەخوارد. بەتەنگیانەوە بوو کە ڕزگار کرێن لە دەست زۆر و ستەمی نەخوێندەواری و نوستوویی. تا هەتا سەر لە دەست هەژاری و نەخوێندەواری و نالەباری و نەخۆشی لەش و دڵ و دەروون ڕزگاریان بێ و خاکەکەمان ئاوەدان بێتەوە و، نەتەوەکەیشمان بەدەوڵەمەندی و کامەرانییەوە بژی.

تەنانەت، زێوەر، خەمی ئەوەیشی ئەخوارد کە سامانی گشتیمان بەرهەم بهێنین و خۆمان لە دەست داگیرکەری سەرمایەداری بێگانان ڕزگار بکەین.

هەروەها زێوەر بەتەنگ ئەوەیشەوە بوو، کە شاگردەکانی خوێندنگاکانمان، گۆرانییەکانیان بەزمانی کوردی بێ. هەروەها بەگیانی کوردایەتیشەوە پەروەردە بکرێن. زۆربەی گۆرانییەکانی ئەو ٣٠ سی ساڵە کە زێوەر مامۆستا بوو لە خوێندنگاکاندا، هی زێوەرە. تەنانەت هەندێ لە زانستەکان و چیرۆکەکان و پەند و ئامۆژگاری و ڕاستی پەرستییەکانیشی بۆ ئەو شاگردانە کرد بوو بەهۆنراوە. تا لە ڕێگایەکی خۆش و ئاسانەوە کار لە دڵ و دەروونیان بکات و گیانیان پەروەردە بکات، بۆ کەڵکی نەتەوە و نیشتمانەکەمان.

بەکورتی (زێوەر) هەر مامۆستایەک نەبوو لە خوێندنگایەکدا مامۆستایەک بوو، بۆ هەموو خوێندنگاکانی کوردستان. مامۆستایەک بوو، بۆ هەموو خاکی کوردستان، چ لە سەردەمی خۆیدا، چ لە سەردەمانی پاش خۆیدا. لە سەرێکەوە ئامانجی (زێوەر) ڕۆشنکردنەوەی بیری کوردەواری بوو. زیندووکردنەوەی دەروونیان بوو. هەروەها پاڵ پێوەنان و ئاراستەکردنیشیان بوو، بۆ خەباتکردن لەپێناو پێشکەوتن و ئازادیی و سەربەرزی کورد و کوردستاندا. لە سەرێکی تریشەوە ئامانجی: پەروەردەکردنی دڵ و دەروون و گیانی کوردەواری بوو، بۆ ئەمەی مەردانە و سەربەرزانە بژین و ڕاپەڕین و، ئازادی و سەربەستی خۆیشیان بەکردەوەی بڵند و، ڕەووشت و خووی جوانی خۆیان دەست خۆیان بخەن.

گەلێک جار کە هۆنراوە بەناوبانگەکەی (زێوەر)، (ئەی شەماڵ) ئەخوێنمەوە، مامۆستا زێوەرم وا دێتە پێش چاو، کە لەسەر پۆپە شاخێکی بڵندی کوردستان بەباڵا کەڵەگەت و شەنگوشۆخەکەیەوە و، بەدەموچاوە گەش و ڕووە خۆشەکەیەوە، هەروەها بەناوچەوانە بەرزەکەیەوە، گەورە و بەرجەستە بەپێوە وەستاوە و، ئاڵای خوێندەواری و خواناسی بەدەستەوەیە، کزە با فێنکە خۆشەکەی چیاکانی کوردستانیش ئەیشەکێنێتەوە. زێوەریش چاوی بڕیوەتە ئاسۆیەکی دوور، بەهیوای دەرکەوتنی (ڕۆژی ئازادی)یەوە بۆ کوردستان، چاوەڕوانی ئەکات، کە کورد ڕزگاری بێ لە دەست (زۆرداری) و (نەخوێندەواری) و (هەژاری) و (نەخۆشی).

(زێوەر)، هەر وەک پیاوێکی بوێژ و هونەرمەند بوو، ژیانەکەیشی هونەرمەندانە بوو. لەپێناو سەرکەوتنی بیروباوەڕەکانی خۆیدا، تاڵیی هەژاری و ئاوارەیی و ڕەو و سەرگەردانی زۆر چێشت. بەڵام نە سەری دانەواند بۆ زۆردار و، نە کۆڵی دا بۆ چەرخی کەچڕەفتار... تا ما وازی لە خواناسی خۆی نەهێنا. نە قوماری هەبوو، نە خومار. نە داوێن پیسی و نە دزی و درۆزنی و دووڕوویی. نە بۆ کڵاو هەوڵی دا و، نە بۆ دراو. نە خۆی لە دەسەڵاتداران هەڵسوو، نە خۆیشی لە داگیرکەران بردە پێشەوە. ئەمە ڕاستە دەستکورت بوو. بەڵام پیاوێکی دڵکراوە و ڕەند بوو. پیاوێکی هۆشمەند و سەربڵند بوو، وریا و چالاک و کردەوە پەسەند بوو. هەمیشە وەک هەمیشە بەهار گەش و ڕوو خۆش بوو. سەر و زمانی شیرین و دڵی بەجۆش بوو. دڵتەڕ بوو. حەزی لە پێکەنین و سەیران و گەشتوگوزار ئەکرد. سوارچاک بوو. لە جلوبەرگا ساکار بوو. حەزی لە خواردەمەنی و جگەرە و چایی ئەکرد، لە یاری دامە و شەترەنجیشا شارەزا بوو.

## جوانی سروشت و جوانی کچە کورد

(زێوەر)، هەروەک کوژراوی جوانی سوروشتی کوردستان بوو، کوژراوی جوانی کیژە کوردیش بوو. بەڵام دڵدارییەکەی (زێوەر) پاک بوو، بێ گەرد بوو. دوور بوو لە داوێن پیسییەوە. جارێکیان گرفتاری ئەڤینی یارێکی وا بوو، کە هەرچی ڕۆشنبیری و زمان پاراوی و وردەکاری وێژەوانانەی خۆی هەیە لە چامەیەکدا بۆی بەکار هێنا. چامەکەی ناو نا (تکاندی ئابڕووی چەمەن). وا دیارە (زێوەر) لە کاتێکا ئەم چامەیەی نووسیوە، کە لە هەڕەتی هەرزەکاریدا بووە. چامەکە ئەمەندە پڕە لە ساز و ئاواز، پیاو کە ئەیخوێنێتەوە، هەست و هۆشی پێی دێتە جۆش. ئەمە چامەکەیە:

تکاندی ئابڕووی چەمەن بەڕووی ئابدارەوە
شکاندی نرخی نەسترەن بەزوڵفی موشکبارەوە
چمە لە مەی، لە نەی، لە جام. ئەگەر بەڵەنجە بێتە لام
بەڕووی ئابدارەوە، بەچاوی پڕ خومارەوە
عەرەق نییە لە عالەما، کە لابەرێ لە دڵ غەما
جگە لە قطرە نارەقێ لە ڕووت کە دێتە خوارەوە
نیشانی من جمالی تۆ، بەراتی من وصالی تۆ
خەیاڵی من لە خاڵی تۆ، بەعیشوە لێم مەشارەوە
عزیزەکەی حبیبی من، نیگارەکەی طبیبی من
با شەق بەرێ ڕەقیبی من، وەرە بەسەد وقارەوە
فیدای خد و قدی[1] تۆ چەمەن بەفەوجێ گوڵیەوە
بەبلبل و بەچڵیەوە، بەقومری و هۆزارەوە
فەڕەنگ ڕوو و زەنگ موو، عەجەم سیاق و ڕووس خوو
ئەناسرێ کە کوردە زوو، بەپێچی لار و خوارەوە

(١) خد و قد: خەدد و قەدد.

فـدای زولفی عنبـری، هەمـوو ولاتی گـوڵ عـومـەر
بەعـــەرد و بەرد و دارەوە، بەئاوی ســـەرچنارەوە
ئەمن گـەیاندمـە (انوری)، فنونی شـعـر و شـاعـری
ئەتۆش گـەیاندتە (سـامـری)، بەچاوی سـحـرکـارەوە

## زێوەر و نیشتمانپەروەری

کەچی کە (زێوەر) تەمەنی ئەگاتە نزیکەی چل ساڵی گرفتاری ئەڤینی کورد و کوردستان ئەبێ. سەیر کە لەم هۆنراوەیەیدا چۆن لە دەست چەرخی کەچرەفتاری سەردەمی (تورک)دا ئەناڵێنێ و بێزاری خۆیشی دەرئەبڕێ بەرامبەر فەرمانڕەوایی و کۆمەڵایەتی ئەودەمە:

ئەم وەختە کـە پڕ فتنە و ڕێ بەستنە ئێستـا
خۆشی کـە ببێ مـردنە، یا نووسـتنە ئێسـتـا
دوو یاری وەفـادار و بەبێ غش نییە هەرگـیز
هەرچی کـە تەمـاشای ئەکـەم دوژمنە ئێسـتـا
ئاشـووب و بەڵا و فـتنە وەکـو تەرزە ئەبارێ
هەر جەردەیی و هەر دزی و کـوشـتنە ئێسـتـا!

## زێوەر دژی زۆردار بوو

ئنجا بام گوێ لە مامۆستا زێوەر بگرین کە چی بەزۆردارەکانی سەردەمی خۆی ئەکات:

ظاهر فـــقـــیـــر و ســـالم، بەڕەنگ و بەرگ عـــالـم
أمـــــا لەنـاو دەروونـدا، مـــــارێـکـی زەهرداری!
چۆن پێت بڵێم موسوڵمان، یا فەردی نوعی انسان؟!...
دووری لە خێـر و إحسان، مەستی مـەی و قـوماری!.
ئەی تاجـــرانی صـــادق، وەی کـــاســـبـــانی لایق
ڕەحـــمێ لەگـــەڵ خـــلائق، دە بەدوازدە تجـــاری؟!...
هەر مـــشـــتـــری کـــە دێتـــە بەردەم دوکـــانی ئێـــوە
صـابون مـەدەن لەژێر پێی، ئەشـتـەر لە شـادەمـاری!

## کوردەوارییەکەمان سەرزەنشت ئەکات

ئنجـا سـەیر کـەن (مـامـۆسـتـا زێوەر) چۆن وەڕس بووە لە دەسـت کوردەواری و، چۆنیش سـەرزەنشـتـمـان ئەکات لەسەر خراپیمان و، چۆنیش هانمان ئەدات بۆ خوێندەواری:

(أقــوامی زەمین صــاحــبی ئاڵتــوون و قــصــورن
ئەم کـــوردە لەبەر زۆری قـــصـــور مـــالکی توونن

سـەر ڕای ئەوە دوژمن بەیەکن جـملە عـشـیـرت
حـقـیـانە ئەڵێن کـورد هەمـوو مـحکومی جنونن!
(ئەم حـاڵە دوامـێکی طبـیـعی هەیە بۆ کـورد
تـا غـافـڵ و بێ بەهرە لە علـم و لە فنونن!)[1]

## هانمان ئەداتە سەر زانست و کردەوەی بڵند و پیشەسازی

ئنجا مامۆستا زێوەر، ڕوومان تێ ئەکا و ئامۆژگاریان ئەکات بۆ خۆ پێگەیاندن لەسەر بنچینەیەکی زانست و هونەر و پیشەسازی و ڕەوشت و کردەوەی بلند ئەڵێ:

مـعـارفـە کـە بلندی ئەدا بەقـومی هەژار
جهـالـتـە کـە دەکـا مـحـوی سلسلەی تاتار
فنون و علمـە کـەوا بۆتە باعـثی إقـبـال
جـهـالـت و حـسـدە بۆتە منشـأی إدبار
برادەران و رفـیـقـانی خـۆم مـەبن غـافـل
لە تەربیە و ئەدەب و علم و صنعتێکی بەکار

## زێوەر دەروونمان زیندوو ئەکاتەوە

ئنجا زێوەر ڕوو ئەکاتە دەوڵەمەند و پیاوە گەورەکانمان، دەروونیان زیندوو ئەکاتەوە بۆ کەڵکی کوردەواری ئەڵێ:

وطن وطن وەکـو کـوو کـووی کـۆترە باریکە
ببـێـتـە ویردی زبان و دڵت بەلیل و نهـار
بەمـاڵ و دەوڵەتی دنیـا مـەنازە ئەی (حـاجی)
بنای مکتب و پردێ حـسـابە ڕۆژی شـومـار
حـیـاتی ئێـمـە حـواڵەی سـخـای أشـرافـە
کـە گەورە لطفی نەبێ قوڕ بەسـەر سفیل و صغار!

## هونەرمەندی زێوەر

چاو! لە هونەرمەندی و تێگەیشتوویی مامۆستا زێوەر. هەر بۆ ئەمەی کەڵکی زانست و هونەر و پیشەسازیان تێبگەیەنێ، لە چ شێوەیەکی جوان و ڕەنگین و سەرسوڕهێنەردا لە فرۆکە ئەدوێ:

(دێوێکە گیـانی تیـا نیـیـە ئەکـشێ بەچەشنی مـار
بێ دەست و قـاچ و خـوێنە بەبێ گۆشت و بێ دەمـار

---

(١) ئەم هەڵبەستە لە دیوانەکەیدا - بەشی یەکەم - بەناوی - ئەم کوردە! -وەیە؛ بڕوانە (سۆزی نیشتمان چاپخانەی معارف ١٩٥٨ بەغدا. ل ١٠٦.

(ناوجەرگی پڕ لە ئاگرە هەردەم کە دێتە ئیش
خۆراکی ئاوە بێ دەم و دان و سمێڵ و ڕیش
هەرچەندە بێ پەڕە کە لەگەڵ کەوتە ئاسمان
چەند ڕۆژە ڕێگە زوو دەبڕێ ناگرێ وچان
ناڵین و گرمە گرمییە لە هەستان و ڕۆینا
هەور و بروسکەیەکە بەسەر گیانی دوژمنا
ئەم دێوە گەورەیە بەچکەی زانینە ئەی هەژار
زانینە دێو لە ئاسن ئەکا باڵەکەی لە دار
زانینە گیان ئەخاتە لەشی دار و بەردەوە
زانینە زێڕ و زیو کە دەرێنێ لە هەردەوە
زانینە شاخی گەورە وەکو لۆکە شر ئەکا
زانینە جەرگی شەو کە لە ڕووناکی پڕ ئەکا
دەریا کە بوو بەڕێگەی ڕۆژ و شەوی هەموو
زانین نەبێ کە هێزی ئەوەی بێ مەگەر چ بوو؟
زانستییە چرایە وەکو زێڕی باخەڵە
گیانی ولاتە بۆ سەر و گوێی دوشمنی پەڵە!...)

لێرەدا بۆ یەکەم جار مامۆستا زێوەر ئەبینین هەوڵ ئەدات کە بە(کوردی پەتی) بنووسێ، کەچی لە بەشی زۆری هۆنراوە و پەخشانەکانیا لەم ڕووەوە کەمتەرخەمی نوواندووە. کە ئەگەر وای نەکردایە، واتا وشەی ڕەقوتەقی بێگانەی زۆر بەکار نەهێنایە هۆنراوە و پەخشانەکانی ناسکتر و پڕ ئاوازتر و خۆشتر دەرئەچوون. لەگەڵ ئەمەیشا قووڵی واتای نووسینەکانی و هێز و هەڕەتی دارشتنیان ئەو خەوشەی شاردۆتەوە.

***

چاوت لەم دەست ڕەنگینییە بێ کە زێوەر چۆن هونەرمەندی لە دارشتنی ئەم هۆنراوەیەدا نوواندووە:

(کێیە تا سەر لە فضای دەرد و غەما بێ، مابێ؟
ئەوە هەر کوردە کە چاوی لە هەوا بێ، وابێ
هەر سلێمانییە عفریتی حسد سواری بووە
هدهدی خۆش خبرم گەر لە (سبا)[1] بێ، با بێ

(١) سبا: ولاتی (سەبەء) لە یەمەن. نیشانە بۆ باڵندەی هودهود کە لەوێوە هەواڵەکەی بۆ حەزرەتی سلێمان هێنا، وەک لە قورئاندایە.

راستی ڕێگەی ڕاستت (أدب) و (أخلاق)ە
ئەمدی هەرگیز لە کەسێ ڕووی لە کەچا بێ، چا بێ
مارە بۆ گەردن و ماڵت چ قومار و چ خومار
گەرچی باوە، ئەوە پیاوە، بەشەڕابێ، ڕابێ
(ئەی وطن پەروەری تەن پەروەری پڕ لاف و گەزاف
أثری خذمتی تۆ چین؟ بەحسابێ، سابێ!).

## ڕاستیپەرستی زێوەر

لەم هۆنراوەیەی خوارەوەیشدا، ڕاستی پەرستی زێوەرمان بۆ دەرئەکەوێ لە بابەت پیری و جوانییەوە:

دقتم کردە حادثاتی فلک
هاتوچۆی فصلی مانگەکان یەک یەک
لێم عیان بوو کە جنت و دۆزەخ
عهدی جوانی و پیرییە بێ شەک

***

هەروەها ئەڵێ:

پیرێ بچێتە مجلسی جوانانەوە کەرە
جوانێ بچێتە مجلسی پیران منورە

***

لە بابەت هەژارییشەوە کە ئەدوێ ئەمە ڕاستیپەرستییەکەیەتی:

حیزی و دزی و خیانت، محکومی و أسیری
هیچیان دەماغ شکێن نین وەک عیللتی فقیری

## هۆنراوەی پێکەنین

لەم هۆنراوەیەیشیا کە (زێوەر) لە وزەی دەرکردووە لە هەست دەربڕیندا، خوتوکەی پێکەنینمان دێ:(١)

سەری مێروولەیەک گەر بێی بتاشی
لە سەد جێ ئەیبڕێ دەللاکی ناشی!

***

هەروەها لەم هۆنراوەیەیشیا کە باسی خەرقەکەی خۆی ئەکات، زێوەر هونەرمەندییەکی وا ئەنوێنێ کە ئەمانهێنێتە سەرسوڕمان و پێکەنین، ئەمە سەرەتاکەیەتی:

---

(١) دێ: ڕاستتر (دەدات).

خـەرقـەیێکم هەیە ڕەفـیـقی سـفـر
مـاوەتی خـاصی شـاری مـانچـسـتـەر

***

ئەمیش تاکە هۆنراوەیەکە لەو چامە پێکەنین هێنەرەی کە (زێوەر) هەڵی بەستبوو بەبۆنەی سەیرانێکی نەتەوەیی پڕ بەزموڕەزمەوە لە (سەرچناردا) کە بەسەر سەرەک کۆماری سەرچنار (حەمەی میرخان)دا هەڵیدا بوو:

بەلووتا سەلکە ترخێنە ملی پانە حەمەی میرخان

## هورووژمێک بۆ سەر مەلاکان

پاش ئەمە، بەبۆنەی ناوبردنی (خەرقەکەی زێوەر)ەوە بام سەرنج لەم ڕاستی پەرستییە جوانەی تری بدەین کە لە ڕاستیدا هورووژمێکی ئاشکرایە بۆ سەر مەلاکانی هاوڕێی خۆی. زێوەر ئەڵێ:

ئەی مـدرس: (علمی دین) و (فنی دنیـا)م پێ بڵێ
تا ڕەواجی بێ لە لای ئەم خەڵکە (جبە) و (مێزەرت)
ڕێگەیێکم پێ نیـشـان دە پێی بژیم لەم (عـصـر)ەدا
وەرنە من باوەڕ ئەکـەم (زاهد) بەڕۆژی (مـحـشـر)ت
پێی دەڵێن ئەم عـصـرە (عـصـری إنتـبـاهە و إرتقـا)
تۆیش کـەچی هەر نووسـتنە، هەر ڕاکـشـانە جـوهرت!

## ئاراستەکردنێک بۆ پێشکەوتن

(زێوەر) کە خەمخۆری پێشکەوتنی کورد بووە، سەیر کە چۆن ڕوو ئەکاتە جووتیار و ڕەنجبەر و خاوەن زەویوزارەکانی کوردستان لە لادێکانماندا و، چۆن هوشیاریان ئەکاتەوە و، چۆنیش ڕێگای پێشخستنی خۆیان و کوردستانیان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە:

مـامـە هۆمـەر سـەد شکر تۆ قـووەت و چاوت هەیە
هەر لە دێیـەک چەند ڕەز و عـەرد و زەوی و ئاوت هەیە
تووتنەکەت قـیـمت نەکـات سـەد ئیشی تر بۆت قـابلە
دێیـەرت زرعی پەمـووکـەی ئاوەڕێس جـاوت هەیە
تووتنەکەت قیمت نەکا مازوو و گەزۆ و پێستە و خوری
شـاڵی زۆر جـوان و نجـیـبی دەشـتی خـۆشناوت هەیە
قۆڵ لە پەسـتەک هەڵ بکێشە و بچووە کێـوێ بۆ شکار
بۆ تجـارت وەک دەڵەک، وەک ڕێوی سـەگـلاوت هەیە

مــصــرفت گــەر زۆرە چایی لێ مــەنێ بۆ داعــیــە
باســوق و سنجــووق و گــوێز و مــێــوژە خــۆلاوت هەیە
هەرچی مــیــوەی ناو بەهەشــتــە تۆ لە بەردەســتــا هەیە
کــالەک و هەرمێ و بەهێ و هەنجــیــری ڕێژاوت هەیە
عــادت و چاولێکەری وا چای بەحــرمت کــردووە
فــضــڵــەیە بیــخــۆیتــەوە، دۆشــاو و خــۆشــاوت هەیە
قــۆندەرە و پۆتین نەبێ کــەوشی سلێــمــانی و کــەڵاش
وەخــتی بەفــریش کــالەی گــا زەرد و پێــتــاوت هەیە
تووتنەکــەت قــیــمت بکا ئەو پارەیەش بۆ تۆ نیــیــە
قــرضی کــووتاڵ و شــەکــر تۆیش ڕەنجی ناو ناوت هەیە

## نرخ دانانێک بۆ وێژەکەی

(زێوەر)ی خــوا لێــخــۆشــبــوو، هەرچەندە لە ڕووی کــێش و ســەرواوە، لە ڕووی بەکــارهێنانی وشــەی بێگانەوە، بەیەکــێــک دائەنرێ لە بوێژەکــانی کــۆن، واتا بوێژە (کــلاســیــکی)یەکــان، بەڵام لە هەست و بیــروباوەڕدا، لە ئامــانج و ئاوات و خــەباتدا، زۆر لە زۆربەی ئەو بوێژانە جیــاوازە. بابەتی تەڕ و تازەی کــردووە بەبا و لەناو وێژەی کــوردیدا، کــە ئەتوانم بڵــێم وێژەی کــوردی تازە کــردووەتەوە و، گــەنجــیــکی تەواویشی خســتۆتە ناو گەنجینەی وێژەی کوردییەوە، سامــانی وێژەیی نەتەواویەتیمــانی فرە کردووە و، گەشەی پێ کردووە و، پەرەی پێداوە. بەواتایەکی تر بەمامۆستایەکی پێشەوای وێژەی کوردی دائەنرێ لەم چەرخی بیستــەمەدا. (زێوەر) هەر وەک لە دڵداری و کۆمەلایەتی و ڕاستی پەرستی و زانست و هونەر و پیشەسازی و ئابووری دوواوە، هەروەها لە زرنگکاری (سیاسەت)یش دوواوە بێجگە لەوە ژیانی خۆیشی بریتی بوو لە هونەرمــەندی. کــە بەجــۆرێکی وا بوو ســەرمــانی بەرز کــردەوە... (زێوەر) هەڵ ئەگــرێ بکرێ بەنموونەیەک بۆ بوێژانی هەمــوو چەرخێکمــان... چونکە ئەو هونەری ژیانەکەی و، مرۆڤ دۆستــییــەکەی و، نیشتــمانپەروەرییەکەی و، گەلپەروەرییەکەی، لە سەرچاوەی (ئایینی پاکی ئیسلام)ەوە وەرگرتبوو، کە پشتی (ئایینی باو و باپیرانمان) ئەگرێت کە (ئایینی زەردەشتی)یە.

## چامەیەکی شۆڕشگێڕانە

جا لەپێش ئەمــەدا کە وتارەکەم تەواو بکەم، چامەیەک لە جوانترین چامەکانی (زێوەر)تان پێشــکەش ئەکــەم، کە هەر مــەگــەر لە خــۆی بووەشێــتــەوە، کــە بەمجــۆرە ڕەنگین و ئاگرینە لە (شۆڕشی کــوردســتــانی ژووروی ســاڵی ١٩٢٥) بدوێ:

ئەی شەماڵ، ئەی شەمــاڵی شاخی شمال
ئەی فــدای ســروەکــە و شنەت ســەرومــاڵ

حـرمت و حـسـرتی منی بەد حـاڵ
بگەیێنە بەشـاخی باغ مـشـاڵ
جـارێ ایفـای رەسـمی تعظیم کـە!
بۆسـەیی لا تناهی تقـدیم کـە!

***

(چونکە ئەو شـاخـە ذوقی ملیت
عـشق و سـودا و خـەیاڵی حـریت
تیـا دەژی فکری بەرزی کـوردیت
لە بەهەشت زیاترە بەقـدسـیت
چونکە ئەو شـاخـە بەرزە گـوڵگونە
مـعـدنی ڕوحـە شـاخی ئاڵتـوونە

***

تورک ئەڵێ: قـبری کـوردە ئەو شـاخـە
بام بڵێ، چونکـە باطنا باخـە
باخی مـەردانی چوست و گـوسـتـاخـە
جـێی وطن پەروەری جگەر داخـە
تورکـەکـان نشـئـەیان دەر اغـوش کـرد
بۆچی تأریخـیـان فـەرامـۆش کـرد؟!...

***

(هەر فـیـدایێ لە إنقـلابا چوو
پێی مـەڵێ مـردووە بڵێ زیندوو
چونکە بێ شـبـهـە مـدتێکی زوو
شـێـری غـران لە نسلی پەیدا بوو
قـهـرەمـان و دلاوەرانی پەسێن
وطن احـیـا ئەکـەن بەعـزمی مـتێن.

***

گـوڵ و بەرد و درەخـتی خـوون الورد
ملتـێکی جـسـیم ئەخـاتە وجـود
ناصـری کـورد و حـضـرتی مـعـبـود
کـورد و مظلومی دەسـتی تورکی عنود؟!

مـــاڵ و منداڵی کـــوردی بێ چاره
بام پەرێشـــــان کـــرێن و ئاواره!...

***

ئەی شـەمـاڵ پێی بڵێ لە بعـدی سـلام
بەرزتری تۆ لە عـرش و کـورسی لە لام
لائـقـی تـۆیـه حـــــرمت و إکـــــرام
نـوری تـۆ نـوری مـــــانگ و ڕۆژه تمام
مـأمنی خـاصی قـومی کـوردانی
ابـدی منزلـی شـــــهـــــیـــــدانی

***

(افـقت ئەرغـەوانیـیـه کـه بەهار
ڕەنگی سـوورت شـفق ئەکـا إظهـار
إنـعـکـاسـی تـصــــــادمـی أنـوار
تاجی قـوس و قـزح ئەکـا بەنـثـار
لاله زارت کــــه ســــوور و ڕەنگینه
عکسی خـوێنی شـهـیـدی ڕێی دینه

***

ئەو مـقـــامـــه مـقـــامی لاهوته
سـورمـەی چاوی قـومی مـبـهـوته
جـــێی زیـاراتی أهلی نـاســـوته
ئەو گـڵــه بۆ حـیـاتی دڵ قـوته
کـــورد ئەرەنجێ لە خــوێنی ڕێژراوی
نقـشی سـەر ڕوحـه بەردی خـوێناوی!...

***

قـومی صـاحب مـتـانت و بەثبـات
چونکه بێ قـدره لای هوایه حـیـات
حـرمت و غـیـرەتی ئەکـا إثبـات
باقـیـیـه عـزمی تاکـو ڕۆژی ممات
عـاقـبت شـاخی بەرزی کـوردسـتـان
(علمی کـورد)ی تیـا ئەکـا جـولان!.)

## ژیانی تایبەتی زێوەر

(زێوەر) دوو ژنی هێناوە. لە ژنی یەکەمیان کوڕێک و دوو کچی بووە. کە ئەو ژنەی مردووە، ژنی دووەمیان هێناوە. لەمیش دوو کوڕ و سێ کچی بووە. لە منالەکانی هەر (فائق)یان مردووە. هەمیشە لەگەڵ ژن و منالەکانیا بەجوانی و دادپەروەرانەوە ڕەفتاری کردووە، بەڵام لەبەر دەست تەنگی و خێزان زۆری هیچ دەمێک نەیتوانیوە گوزەرانێکی خۆش ڕابوێرێ: بەکولەمەرگی ژیاوە مووچەکەی لە هەرە پۆپەکەیا گەیشتە نۆ دینار. لە خانەنشینییەکەیشیا کە بێ فرمان مایەوە، مووچەکەی هاتە خوارەوە بۆ سەر چوار دینار و نیو[1]. لەگەڵ ئەوەیشا کە کەسێ نەبوو، خەمی دەستکورتی بخوات، نە لە چینی دەوڵەمەندان و نە لە چینی دەسەلاتدارانیشدا، کەسێ دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەکرد، (زێوەر) هەر بەسەر بڵندییەوە ژیا تا مرد. جارێکیان یەکێک لە ئینگلیزەکان کە خاوەن دەستەڵاتێک بوو لە سلێمانیدا، ناردی بەشوێنیا مووچەیەکی بۆ ببڕێتەوە زمانی کوردی پێ بخوێنێ. بەڵام هەرچەندی کرد دڵی بڕوایی نەدا ئەو یارمەتییە پەسەند بکات. بەخێزانەکەی خۆی گوت: (ڕاستە دەستم کورتە. بەڵام نامەوێ بۆ پارە ناوی خۆم خراپ بکەم و پێم بڵێن بووە بەنۆکەری ئینگلیز!...)... (زێوەر) نەچووە لای ئینگلیزەکە. بەسوپاسێکەوە دەستی نا بەڕوویەوە و خۆی لێ ڕزگار کرد!...

ڕابواردنی (زێوەر)، ساکارانە و دەروێشانە بوو. حەزی لە خواردن زۆر نەکرد. کە دەستی بپەرژایە لەگەڵ هاوڕێکانی بەباسی وێژە و زانست، یاخود بەدامە و شەترەنج کردن، کاتی بەسەر ئەبرد.

(شێخ محمودی مەزن) هاوڕێی منالی بوو. یەکتریان زۆر خۆش ئەویست. لەگەڵ یەکا هاوبیروباوەڕی کوردایەتی بوون. کاتێ کە (شێخ محمود) گیرا، (زێوەر) بوو کە لەگەڵ خێزانەکەی ئەودا خۆی دەرباز کرد بۆ ناو خاکی کوردستانی ئێران. (شێخ محمود) جارێکیان ڕەزێکی بەرەو ڕوو کردەوە لە دێی (خەمزە) کە کەلکی لێ ببینێ. بەڵام ئەو دەرامەتەی لەو ڕەزە ئەهاتە دەرەوە دادێکی خێزانە گەورەکەی (زێوەر)ی نەدا. هەر ئەوەندە بەکەلکی (زێوەر) هات کە نیشانەیەکی خۆشەویستی و ڕێزگرتن بوو لە پیاوێکی گەورەی وەک (شێخ محمود)ەوە بۆ ئەو. کاتێ کە لە بەرزنجە بوو، خانوویەکی بچووکی دەروێشانەی لەوێ دوروست کرد. لەپاش دەرچوونی لە فرمانی فەرمانڕەوایی، هاوینان ئەچووەوە ناو ئەو خانووە. لەوێدا ڕای ئەبوارد.

---

(١) لەم ڕووەوە زێوەر دەڵێ:

مووەزەف گەورە و بچووک ئەدەن ڕەنج
هەموو ئەجوڵێن وەک بەردی شەترەنج
با (ئیسراف) نەکرێ، (ئینساف) بێتە پێش
(پەنجایی) چل بێ (چوار دیناریش) پێنج!

مامۆستا مەلا نەجمەدین لە پەراوێزیدا دەڵێ:

مەرامی ئەوەبوو ئەوانەی مانگانەکەیان زۆرە لێی کەم بکرێتەوە بدرێ بەوانەی مانگانەیان کەمە. بڕوانە: (سۆزی نیشتمان؛ ل ٩٩).

## کاره گەورەکانی زێوەر

١- بەشی یەکەمی کۆمەڵە هۆنراوەکانی، لەپاش مردنی خۆی، لە ساڵی ١٩٥٧دا چاپ کرا.

٢- بەشی دووەمی هۆنراوەکانی. هێشتا چاپ نەکراوە.

٣- (خێوی ناو مزگەوت). ئەم چیرۆکە لە ساڵی ١٩٤٦دا چاپ کرا.

٤- (لە عمانەوە بۆ عمادیە). ئەم پەرچڤە (ترجمە)یە دەستنووسە.

٥- (زێوەری). فەرهەنگێکی گەورەیە. لە زمانی عەرەبییەوە بۆ کوردییە. دەستنووسە. لە ساڵی ١٩٤١دا تەواو بووە.

٦- (گەنجینەی مەردان). لە بابەت گەورە پیاوانی کورد و جیهانەوە نووسیویە... دەستنووسە.

٧- (دەستە گوڵی لاوان). سرووده. لە ساڵی ١٩٣٧دا چاپ کراوە.

٨- (دانانی حکومەتێکی خەیاڵی). پەیوەندی بەکوردستانەوە هەیە. دەستنووسە.

٩- (داستان سوزناک کربلا). لە بابەت کوشتنی (حسن و حسین)ەوە بەهۆنراوە، بەزمانی فارسی دایناوە. دەستنووسە. هێشتا چاپ نەکراوە.

***

بێجگە لەمانە گەلێک وتار و بابەتی تریشی هەیە. کە لە یەکێکیاندا لە ساڵی ١٩٢٣دا، لە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان)دا، ژمارە (٩)، بەئاشکرا گوتوویەتی:

کوردستان ماڵی کوردانە، حەرامە لە بێگانە!

## ئەنجامی وتار

ئا بەم ڕەنگە (مامۆستا زێوەر)ی زانا و وێژەوان و ڕاستی پەرست و نیشتمانپەروەر. ڕەنجی داوە و تێکۆشاوە و خەباتی کردووە. بۆ پێشکەوتنی کورد و ئاوەدانبوونەوەی کوردستان. بێ ئەمەی لە بەرامبەر ئەم هەموو کار و کردەوە گەورە و گرنگ و جوانانەیدا، داوای پاداشتێک لە نەتەوەکەمان بکات. بەڵام جێی داخە، کە ئەم پیاوە گەورەیە لە لایەن ئێمەی کوردەوارییەوە کەمتەرخەمی لەگەڵدا بکرێ. نەخوێنرێتەوە و، دەستی نەگیرێ. پاداشی نەدرێتەوە و یارمەتی نەدرێ. (زێوەر) ئەگەر لەناو جێگایەکی وەک ئەورووپادا بژیایە، بەکلوور پارەی چنگ نەکەوت. وەک شازادەیەکیش ئەژیا. بەڵام داخی بەجەرگم لەناو ئێمەدا بەهەناسە ساردی و هەژارییەوە ژیا. ئەگەر گەورەکانمانە و ئەگەر دەوڵەمەندەکانمان، بەهەزاران دیناریان، بەفیڕۆ لە شتی پڕوپووچدا بەخت کرد، هەر بۆ ئەمەی دڵی بێگانە و زۆردار خۆش بکەن و خۆیانی لێ بەرنە پێشەوە. کەچی پیاوێکی وەک (مامۆستا زێوەر)، کە خۆی لە پێناوی نەتەوەکەیاندا بەخت ئەکرد، ئەیانخستە پشتگوێوە!.

(زێوەر) بەهەژارییەوە ژیا. بەڵام گەنجینەیەکی گەورەی لە وێژە و زانست و هونەر بەئێمە بەخشی. بێجگە لەوە بەسەر بڵندی خۆی سەری ئێمەیشی بەرز کردەوە...

(مامۆستا زێوەر) تا ئەمێنین یادی لەناو دەروونماندا ئەژی... درووود بۆ گیانی پاکی. کە هیوادارم بەم قسانەم کە لە دڵی شاگردێکی دڵسۆزی خۆیەوە دێتە دەرەوە شادمان ببێ... سوپاسێکی زۆریش بۆ کاک محموود زێوەر و خوشکە ئامینە زێوەر کە لە بابەت مامۆستا زێوەرەوە گەلێک زانیاریان پێ بەبەخشیم و زۆربەی نووسراوەکانیشیان پێشان دام.

هیواداریشم بەخوا کە کاربەدەستانی کوردستان ڕۆژێک لە ڕۆژان پاداشی (مامۆستا زێوەر) بدەنەوە: نووسراوە دەسنووسەکانی بۆ لە چاپ بدەن[1] و، پەیکەرێکیشی لە گەڕەکی کانێسکاندا بۆ دابمەزرێنن، تا ئەوەی بەزیندوویێتی نەیدی، هەر هیچ نەبێ گیانی پاکی، لەپاش مردنی ببینێ...

تەواو بوو

سەرچاوەی نووسراو:

١- مێژووی ئەدەبی کوردی (مامۆستا علاءالدین سجادی).

٢- پرس و لێکۆڵینەوەی خۆم لە خێزانی مامۆستا زێوەر و دۆست و ئاشناکانی. سەرنجدانی خۆم لە کەسایەتی خۆی، کاتێ کە مامۆستا بووە لە خوێندنگاکەماندا لە سلێمانی.

٣- دیوانی زێوەر - نووسراوخانەی زێوەر.

٤- کۆمەڵە ڕۆژنامەی: پێشکەوتن، بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، امیدی استقلال، ژیانەوە، ژین، گۆڤاری گەلاوێژ.

٥- شعر و ادبیاتی کوردی/ بەرگی دووەم - مامۆستا رفیق حلمی.

---

(١) جێگای باسە کە ئێستا سەرجەمی دیوانەکەی مامۆستا زێوەر کە گشت بەرهەمە شیعرییەکانی گرتۆتە خۆی و نووسینەکانی تری لە (دەزگەی ئاراس) لە هەولێر کاری تیا دەکرێ و لە بەرگێکی شیاودا دەخرێتە بەردەستی خوێنەران... کارەکە لە ئامادەکردنی کاک مەحمود زێوەرە. وە هەروەها دیوانەکەی بەختیار زێوەری کوڕی.

# بێکەس

میژووی ژیانی بوێژی بەناوبانگی کوردستان

فائق بێکەس و هۆنراوەکانی بەشیکردنەوە و ڕوونکردنەوەیانەوە

## پێشەکی:

(بێکەس)، ناوی (فائق کوڕی عبدالله بەگ کوڕی کاکەحەمە کوڕی ئەلیاسە قووچە)یە. لە دێی (سیتەک) کە بنکەی ناوچەی (شارباژێر) بووە لە خاکی (سلێمانی)دا لە ساڵی ١٩٠٥دا لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩٤٨دا لە (هەڵەبجە)دا مردووە. لە سلێمانیدا بەڕێزێکی زۆرەوە نێژراوە. لە ساڵی ١٩٥٨دا، لە سلێمانیدا ئاهەنگێکی گەورە بۆ یادکردنەوەی دە ساڵەی مردنی کراوە. هەروەها لە ساڵی ١٩٧٠یشدا ئاهەنگێکی تری بۆ کراوە.[1]

باوکی ئەفسەرێکی گەورە بووە لە لەشکری تورکا. خێزانی باپیرانی لە (قەڵاچوالان)ەوە هاتووەتە سلێمانی. دایکیشی لە ئاغاکانی سلێمانییە. بەم پێیە (بێکەس) لە خێزانێکی خانەدان و دەوڵەمەند و دەسەڵاتداردا لە دایک بووە و گەورە بووە. بەڵام هەر ئەوەندە (بێکەس) دوو ساڵەی تەواو کرد لە (سیتەک)دا، ناز و جیازەکەی دەستی کرد بەکزبوون. کاتێ کە گەیشتە تەمەنی نۆ ساڵی سێ جار کۆچی پێ کرا بوو، ئاوڵە چاوێکی کوێر کرد بوو، باوکی تا سەر لێی دوور کەوتبووەوە، برا گەورەکەی و دایکی و لالۆکەی یەک لەدوای یەک مردبوون. بەسەرگەردانی و مالوێرانییەوە کەوتبووە دەست ئافرەتێکی بێگانە. بەبەجێ ماوەی[2] سامانەکەی باوکیان (فائق) و (طاهر)ی برای بەخێو ئەکرد![3].

(بێکەس) خوێندنێکی سەرەتایی لە سلێمانی و بەغدا و کەرکوکدا تەواو کرد. بەڵام وازی لێ هێنا. لەجیاتی ئەوە خۆی خۆی پێ گەیاند. لە هەموو جۆرە نووسراوێکی بەدڵی خۆی ئەخوێندەوە. هەروەها دەرد و ئازاری هەتیوی و بێکەسی و هەژاری و خەم و خەفەتی کزی و بێ دەسەڵاتی (بێکەس)ی پێ گەیاندووە. لە زمانی کوردی و عەرەبیدا باش شارەزا بوو. لە فارسی و تورکیشدا ئاشنا بووە.

(بێکەس) ژیانێکی کولەمەرگی ژیاوە. بووە بەدوکاندار و بەوردە فرۆش و بەسەرکاری[4] کرێکار و، بەفێرکار (معلم)ی منداڵ و، بەمامۆستای خوێندنگای زانستی و، خوێندنگاکانی میری. ناو بەناوێکیش بەر زیندان و ئازاردان و تەفروتووناکردن کەوتووە. بەڵام لە چاو سەرگەردانی نەتەوەکەی خۆیدا، (بێکەس) سەرگەردانی خۆی لەبیر چۆتەوە. هەموودەم بیری لە هۆی پاشکەوتن و ڕێگای پێشکەوتنی کورد کردۆتەوە.

---

(١): نووسەری ئەم نووسراوە بەناوی نووسەرانی کوردەوە لەم ئاهەنگەدا بەشدار بووە. (ش. ف)

(٢) واتە: میراتی (ترکە).

(٣) دەربارەی (کاک تایەر بێکەس)ی برای، بڕوانە یەکەم (ئاوێنەی ژینم) لاپەڕە (٥٨٠) پەراوێزی ژمارە (١)

(٤) (مراقب عمل).

بەلای (بێکەس)ەوە هۆی پاشکەوتنی کوردەواری بریتییە لە (نەخوێندەواری) و (بەدخوویی). وەک (خۆپەرستی)، (ناکۆکی) و (خەبات نەکردن)، بۆ پێشکەوتن. کەی ئەمانە چارە کران کورد ئازادی و سەربەخۆیی خۆی دەست ئەکەوێتەوە.

(بێکەس) بەهۆنراوەکانی، نەتەوەی وریا ئەکردەوە. هورووژمی ئەبردە سەر داگیرکەرانی بێگانە. بەرەنگاری ستەمکارانی ناوخۆ ئەبوو: وەک خراپانی سەردارەکان و دەوڵەمەندەکان و شێخ و مەلا و کۆلکە ئەفەندییەکامان، کە هەر خەریکی چەپ و گوپی خۆیان ئەبوون و خۆشگوزەرانی خۆیان، نەتەوەکەی خۆیان بیر نەئەکەوتەوە. داوای چاکبوون و خۆ ڕاستکردنەوەی لێ ئەکردن و خەباتکردنیش بۆ کەڵکی نیشتمان.

لە هۆنراوەکانی (بێکەس)دا بابەتی زرنگکاری (سیاسەت) و کۆمەڵایەتییەکانیان زۆر گرنگ و کاریگەرن. شاکارەکانی (بێکەس) ئەمانەن:

(ئەی وطن مفتونی تۆم)، (بیست و حەوت ساڵە)، (هەردوو گوێم پڕ بوو)، (داری ئازادی)، (قومی کورد إثباتی کرد)، (ئەی مانگ)، (شاخی ڕەنگاوڕەنگی گوێژە). ئەم دوو بابەتەی دوایی ڕاستی پەرستی (فەلسەفە)ن.

(بێکەس) لە بزووتنەوە نیشتمانییەکاندا دەستی هەبووە. یارمەتیی کۆمەڵەی (ژ. ک) و (پارتی دیموکراتی کوردستان)ی داوە. لەسەر کوردایەتی چەرمەسەریی بەسەر هاتووە.

(بێکەس) پیاوێکی کرمۆڵی ناشیرینی زەلام و قەڵەو بوو. لە خواردن و خواردنەوە و کردندا بێ ئەندازە بوو. بەلام لەشێکی بەتینی هەبوو، بەرگەی نەخۆشیی زۆر ئەگرت. لە جلوبەرگا پنتی بوو. بەلام قسە خۆش و لەناو یارانیا پڕ بەزموڕەزم بوو. لای تێگەیشتووان خۆشەویست بوو. یارمەتییشیان زۆر ئەدا. لە هەردوو ژنهێنانەکەیدا دەستیان گرت و باربوویان کرد. لەگەڵ خێزانەکانیا خۆشی ڕائەبوارد. کە ژنەکەی مرد بەهۆنراوە شینی بۆ کرد. کە کوڕەکەی بوو، بەهۆنراوە (لای لایە)ی بۆ دانا.

(بێکەس)، ٤٣ ساڵ ژیا. بەهەژاری مرد. بەلام گەنجینەکی بەنرخی لە هۆنراوەکانی پێشکەشی نەتەوەی کورد کرد. ژیانەکەی مەردانە و هونەرمەندانە بوو. هەتا ما نموونەی سەربڵندی و ئازایی بێ باکی و نیشتمانپەروەری بوو. بەهۆنراوەکانی ئابڕووی دوژمنانی کوردی برد، ڕێگای ئازادییشی بۆ کورد ڕۆشن کردەوە و ئاراستەیشی کردن بۆ خەباتی گشتی، بۆ کەڵکی کوردەواری. چەند جارێک کۆمەڵە هۆنراوەکانی چاپ کراون.

خوا بەگەورەیی خۆی لە (بێکەس) خۆش بێ. چونکە سەرمانی بڵند کردەوە. (بێکەس) شایستەی ئەوەیە پەیکەرێکی بۆ بکرێ و لە گەڕەکی گۆیژەدا بۆی دابمەزرێنرێ.

سلێمانی ١٩٧٢
شاکر فتاح

## خێزانێکی سەرگەردان

کاتێ کە (فائق) لە دێی (سیتەک)، لە ناوچەی (شارباژێر)، لە ساڵی (١٩٠٥) دا لە دایک بوو، خێزانەکەی لەوپەڕی خۆشیدا بوو. چونکە (عبدالله بەگ)ی باوکی، ئەفسەرێکی ناودار بوو لە لەشکری (تورک)دا، گوزەرانێکی خۆشیشی بۆ خێزانەکەی خۆی پێکهێنا بوو. بەڵام هەر ئەوەندە (عبدالله بەگ) گوێزرایەوە بۆ (بەغدا)، زۆری پێ نەچوو، دوای فەرمانی لەشکری تورک کەوت و گەیشتە ناو جەرگی (ئەنادۆڵ)، ناچار ما خێزانەکەی لە (بەغدا) بەجێ هێشت، کە ئیتر هەتا مرد نەیتوانی چاوی پێیان بکەوێتەوە!... (ئاوڵە) چاوێکی فائقی کوێر کرد... برایەکی فائق لە ئاوی (دیجلە)دا خنکا... دایکیشی بەسوێی ئەو ئازارەوە تلایەوە و مرد... لالۆیشی پاش ئەو بەچوار مانگ لەناو چوو!... (فائق) و (طاهر)ی برای بێ کەس مانەوە... چونکە نە باوک و، نە دایک و، نە برا و، نە لالۆ و، نە گوزەرانی خۆش، نە سایە و، نە مایە و، نە پایە، هیچیان بۆ نەمان نەمانەوە!... جا لام وایە هەروەک لەم و لەویشم بیستووە، هەر لەبەرئەمەیە کە (فائق) ناوی خۆی ناوە (بێ کەس)!...[1]

ئەم هەموو سەرگەردانییە بەسەر خێزانی (فائق)دا هات. کەچی هێشتا ئەو مناڵ بوو. تەمەنی لە نۆ ساڵی تێپەڕی نەکرد بوو!...

بەم ڕەنگە ئەو خێزانە کامەرانە، لە ماوەی چەند ساڵێکا سەرگەردان بوون و، کڵۆڵی و تەنگانە و هەژاری و بێ خاوەنی سەری تێکردن.

## یاخی ئەبێ لە مامەکانی

ئەمە ڕاستە کە مامەکانی (فائق) تا ئەندازەیەکی باش خەمی ئەو و براکەیان نەخوارد، چ لە پاراستن و، چ لە گوزەران و، چ لە خوێندندا... بەڵام دڵ و دەروونی (فائق) بەو جۆرە یارمەتییانە شاد نەئەبوون. زۆری پێ نەچوو (فائق) هەموو پێوەند و کۆتەیەکی خزمایەتی و کۆمەڵایەتیی پچڕاند و ئازادی خۆی لە دەستیان ڕزگار کرد. نە لە ماڵی مامەکانیا مایەوە و نە لە خوێندنگاکانی ئایینیی (کەرکووک) و (بەغدا) داگیرسایەوە و، نە لە سایە و پەنای ئاغاکانی خزمی دایکیشیا حەسایەوە!... ئەوانەی هەموو بەجێ هێشت و هاتە کایەی گوزەرانێکی سەربەست و ئازادەوە، کە تەنیا بەرەنجی شانی خۆی بژی... دەمێک جگەرە و چەمچەی ئەگێڕا و ئەفرۆشت. دەمێک بەمناڵانی ئەخوێند... دەمێک بەسەر کرێکارانەوە ئەوەستا... دەمێکیش لە شێوەیەکی پچڕ پچڕا، وەک مامۆستایەک لە (خوێندنگای زانستی) و خوێندنگاکانی فەرمانڕەواییدا وانەی ئەگوتەوە....

## ژیانێکی سەخت

(بێکەس) ژیانی بۆ ئاسان نەبوو. پڕ بوو لە ئەرک و ئازار. پڕ بوو لە ئاخ و ئۆف. گەلێک تەنگوچەڵەمەی بەسەر هات. گەلێک جار کەوتە تەنگانە و هەژاری و دەست کورتییەوە. ئاوارەیی و

---

(١): لە هۆنراوەیەکی (بێکەس)دا ئەمە دیارە. (ش. ف)

دەربەدەری و بەندیخانە و لێدان و ئازاردانیشی زۆر چێشت... لە ڕاستیدا ژیان بۆ ئەو سەخت بوو. پڕ بوو لە کولەمەرگی و دەرد و هاوار!...

## خەم ئەبێ بەمامۆستای

بەڵام ئەو خۆیشی هەستی بەوە نەئەکرد، کە خوا ئەم بەشەی بۆیە پێ بەخشی بوو، کە پێی بگەیێنێ و بیکات بەبوێژێکی شیرین زمان و بەرۆشنبیرێکی دڵسۆزی نیشتمان، کە تا ئەمێنێ تێ بکۆشێ و خەبات بکات بۆ سەربەرزی کوردەواری و ئاواکردنەوەی کوردستان.

بەڵێ (خەم) بۆ پیاوی خۆی (مامۆستا)یەکی شارەزا و چاکە. پێی ئەگەیێنێ!... (بێکەس)یش، بەسەرپەرشتی خواوە، (خەفەت) پێی گەیاند!... لەبەرئەوە سوپاسی (خوا) ئەکەین کە (خەفەت)ی کرد بە(هۆ) و (فائق)ی پێگەیاند!...

چونکە تا ما لە ڕێی ڕاستی نیشتمانپەروەری، لای نەدا. ئینگلیزەکان چەند جارێک ویستیان (فائق) بکڕن بەڵام نەیانتوانی. دەسی نا بەڕوویانەوە!... نە هەژاری، نە بێ نەوایی، نە ئەرک و ئازاری نان پەیداکردن، نە لێدان و بەندیخانەی کاربەدەستانی میری، ئەمانە هیچیان (بێکەس)یان لە هەوڵ و تەقەلای نیشتمانی نەخست!. نە کۆڵیدا و، نە ورەی بەردا. نە خۆی لە کاربەدەستان بردە پێشەوە و، نە خۆیشی فرۆشت بەپارەی بێگانەی داگیرکەر!... هەتا ما بەوتارە خۆشەکانی و، بەهۆنراوە ئاوازەکانی هۆش و دڵ و دەروونی هاونیشتمانەکانی زیندوو کردەوە و، هانیشی داین بۆ خەباتکردن، بۆ ڕزگاری نیشتمانەکەمان لە دەست (زۆرداری) و (هەژاری) و (نەخۆشی) و (نەخوێندەواری)...

## هەژارێکی دەوڵەمەند

(فائق) هەرچەندە تەمەنێکی کەمی هەبوو، لەپاش چل و سێ ساڵ ژیان، لە ساڵی ١٩٤٨دا مرد، بەڵام بە(هونەری ژیانی) و بە(هۆنراوەکانی)، گەنجینەیەکی گەورەی وێژەیی پێ بەخشین. لاپەڕەی ژیانی (بێکەس) سپی و بێ گەردە. پاک و پیرۆزە. تا ما نموونەیەکی نیشتمانپەروەری و سەر ڕاستی بوو. بوێژێکی سەربڵند بوو.

## بێکەسی شۆڕشگێڕ!...

لە هەراکەی بەردەرکی سەرادا، لە سلێمانی، لە ٦/٩/١٩٣٠دا، (فائق) یەکێک بوو لەوانەی کە سەرکردایەتی شۆڕشی ناو شاری سلێمانییان ئەکرد، بۆ سەندنەوەی مافی نەتەوایەتیمان گیرا و، لێی درا و، سەری بریندار کرا و، خرایە بەندیخانەوە. بەڵام هێشتا ئەو لە زینداندا بوو کە ئەم هۆنراوەیەی پێشکەشی نەتەوەکەی خۆی کرد، تا چاویان نەترسێ و زۆرتر هۆگری خەباتی نیشتمانی خۆیان بن. هەستی هەموومانی پێ بزواند. ئەمە چامەکەیە:

ئەی وطن مفتونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە
وەختی بەندی و ئسارت پێ بەتەوق و کۆتەوە

گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم؟!
بۆچی بەناحق وا ســـووکت کـــردم؟!

(٥)

بیـــست و حـەوت ســاڵە من بەتەمــاتم
چاوەڕێی نەخـــستنی لطف و خـــەڵاتم
بـبـــــووژێنتـــــەوە خـــاکی وڵاتم
هیچ گـــوێ نـادەیتـــە دەرد و ئاواتم
چـونـکـە ئـەیـزانی بێ دەســـــــەڵاتم
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم؟!
بۆچی بەناحق وا ســـووکت کـــردم؟!

(٦)

بیـست و حـەوت ســاڵە زووخـاو ئەنۆشم
لـە ظـلم و جـــــورت هـەر چاو ئەپۆشم
بۆ رضـــامــــەندی تـۆ تێ ئەکـــۆشم
لـەبەر تـۆ ضــــربەم داوە لـە خــــۆشم
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم؟!
بۆچی بەناحق وا ســـووکت کـــردم؟!

(٧)

بیـست و حـەوت ساڵە تەفرەی خۆم داوە
وازم لـە هەمـــوو کــەســـێک هێناوە
تۆم گـرتووە و، دنیـــام خـــستـۆتە لاوە
بۆیـە پێـم ئەڵێـن کـــەر و ڕیژ گـــاوە
ئـەوی تـۆی نـاسـی مـلـی شـکـاوە
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم؟!
بۆچی بەناحق وا ســـووکت کـــردم؟!

(٨)

بیـــست و حـــەوت ســاڵە دەم بەهاوارم
جـــارێ نـاپرسی لـە حـــاڵی زارم
ســـووتام، پرووکـــام، زۆر بێ قـــەرارم
(ئـەزانی لـە تـۆ بـۆچی بێـــــزارم؟

شـــارەزای دەردمی، ناکـــەی تیـــمـــارم
گـــــوناهـم چی بـوو بەم دەردەت بـردم؟!
بۆچـی بەناحق وا ســــووکت کـــــردم؟!

(٩)

بیـست و حـەوت سـالە بەبێ زیاد و کـەم
ئەپارێمـــــــەوە، هەر هاوار ئەکـــــەم
یاخـــوا کـــافـــریش نەبێ بەجـــەســتـــەم
وێڵ و سـەرگـەردان بێ تێن و خـەسـتـەم
هیـچم پێ ناکـرێ، دیل و دەس بەسـتـەم
گـــــوناهـم چی بـوو بەم دەردەت بـردم؟!
بۆچـی بەناحق وا ســــووکت کـــــردم؟!

(١٠)

بیـــست و حـــەوت ســـالە دڵم لێت پڕە
احـــــوالـم بەدەست تۆوە زۆر شـــــڕە
ســـــەد بەڵـێن بدەی لە لای مـن (...)ە
بەســـیــــەتی ئـیـــتـــر ئەم وڕە، وڕە
نـۆکـــــەریت نـاکـــــەم ورگم هەڵـدڕە
گـــــوناهـم چی بـوو بەم دەردەت بـردم؟!
بۆچـی بەناحق وا ســــووکت کـــــردم؟!

(١١)

من ڕەنجـبـــەرێکم پاک و بەســـەزمـــان
هەوڵـم بـۆ داوی بـەدڵ و بـەگـــــیـــــان
بەســـیـــەتی ئیـــتـــر درۆ و تەفـــرەدان
وا ئەبێ عـــــدل و إنصـــاف و وجـــدان
ئەمکەی بەدیلی عـــیـــراق و ئێـــران
گـــــوناهـم چی بـوو بەم دەردەت بـردم؟!
بۆچـی بەناحق وا ســــووکت کـــــردم؟!

***

لەسـەر ئەمـە (بێکەس) خـرایە گیـر و گـازەوە و ئەنجامیـشی بەوە گـەیشت کە بەناوارەیی گـەیاندرایە (حلە) و، لەوێیشـەوە بۆ (عـمـارە). کە ئەویش وەرامـەکـەی ئەوە بوو وازی لە مـامـۆسـتـایی هێنا و،

گەڕایەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆی!... بۆ ئەمەی سەرلەنوێ سەرکردایەتی بیروباوەڕی گەلەکەی خۆی بکاتەوە!.

## هوروژم ئەباتە سەر مەلاکان

(بێکەس) لە کۆڕی کۆمەڵایەتیشا هوروژمی ئەبردە سەر ئەو مەلایانەی کە خۆیان دوور ئەخستەوە لە خەباتی گشتی. سوێندیشی ئەدان و تکایشی لێ ئەکردن کە سەرکردایەتی کوردایەتییەکەمان بکەن و ئایینەکەیشیان لەسەر شێوەیەکی نوێ بەکار بهێنن بۆ کەڵک و چاکەی نیشتمانەکەمان. ئەمە چامەکەیە:

(هەردوو گوێم پڕ بوو لە باسی وعظ و سرفطره و زکات
هەر هەواڵی حشر و نشرم پێ ئەڵێی تاکو ممات
بەسیە لەم موضوعە لادە فێری نوێژ بوو کائنات
خطبەیێکی اجتماعیم پێ بڵێ بۆ ڕێی حیات
ئەی مەلا توو بی خوا لەم فکره کۆنەت لابده
فنی تازەم پێ نیشان دە بۆ ترقی و ڕێی نجات

***

(اطلبوا العلم ولو بالصین) گەر تێ گەی تمام
قطعیا تحصیلی فن و معرفت ناکەی حرام
فائدەی چی (قام زید) کەڵکی چی دێ؟ پەشمە لام
(عالەمت کەر کرد مەلا خوا لێت بسێنێ إنتقام
ئەی مەلا توو بی خوا لەم فکره کۆنەت لابده
تۆی بەڕاستی مانعی بەرزی و ترقی و إنتظام!.

***

چاو لە دەقنە و نانی ڕاتوو مەبڕە دائم مل قەوی
خوا بەڵات لێ دا هەتا کەی هەر لە خۆراک و خەوی
تەمبەڵی، مردووت مرێ، بەسیە لە کن خۆت پێشڕەوی
هەستە تشویقێ بکە بۆ ئیشی دین و دنیوی
ئەی مەلا توو بی خوا لەم فکره کۆنەت لابده
واسطەی تۆ بوو کە دینی بەرزی إسلام بوو نەوی

***

هەر کەسێ هات و بەزۆڵی مێزەری نا سەر سەری
عالمە و مسموعە قولی گەر کەریش بێ و سەرسەری

حـاصلی خلقی ئەبێـتـە نۆکـەر و عـبـد و کـەری
مـاڵی ئیسـلامی بەقـوڕ گـرت و لە دینی کـرد بەری
ئەی مـــەلا توو بی خـــوا لەم فکرە کـــۆنەت لابدە
خـائنی گـەر وا دوام کـەی ڕووسـیـاهی مـحـشـری

***

(ئەوروپا پاپای لەناوبرد دەســـتی دایە علم و فن
بۆ تەل و کەشتی دورروست کرد طوپ و طیارە و تفەنگ
قەومی إسلامیش (مەلا) گەر بێتو زوو إصلاح نەکەن
دائمـا دیل و أسیـرن، سووک و ڕیسوا و ناپەسەن[1]
ئەی مـــەلا توو بی خـــوا لەم فکرە کـــۆنەت لابدە
باسی قـبـر و مـار بگۆڕە و بێـرە سـەر باسی وطن

***

خوایە یەک (لۆتەر)[*] بنێری بۆ گەلی کـوردی فـقـیـر
تا نجـاتی دا لەژێر دەسـتی مـەلا و شـێـخـان و پیـر
ئەم شەوی دەیجـووڕە تا کـەی؟ دەرکـەوێ ڕۆژی منیـر
ئەوروپایی بوونە حـاکم ئێـمـە هەر دیل و أسـیـر
ئەی مـــەلا توو بی خـــوا لەم فکرە کـــۆنەت لابدە
کۆن بووە، باوی نەمـاوە، باسی فـردوس و سـعیـر!...)

***

ئەم هەڵبـەسـتـە هەرچەندە، لە هەندێ جـێـیـا (بێکەس) لە ئەندازەی ترازاندووە و، لە وزەی کـردۆتە دەرەوە، بەڵام ئەوە ئەو لەو هەڵانە ئەبەخشێ، کـە لەپشت ئەم قـسـانەیەوە هەسـتـێکی پاکی بۆ گـەردی هەبووە، بەرامبەر گەل و نیشتمانەکەی خۆی، کە ویستوویەتی مەلاکانمان، ڕێڕەوی مەلا بەڕێزەکانی ترمان

---

(١): مەبەسی (پەسەند)...[**] (ش. ف)

(*) مـارتین لۆسـەر: ١٤٨٣ - ١٥٤٦ قـەشـەیەکی لاهوتی مـەسـیـحی و نووسـەرێکی ئاڵـمـان بوو، بەتوندی بەربەرەکـانی - صکوك الـغفـران -ی دەکـرد و بووە ڕابەری بزووتنەوەی چاکسـازی لە سەرجەم ئایینەکە و دەسەڵات و بەڕێوەبردنی کارەکانی پاپا و کەنیسە و پیاوانی دێر و کەنیسەکاندا؛ بەڵام بەشێوازێکی لەسەرەخۆ و دوور لە توندوتیژیی. جا ئەوە وای کـرد پرۆتسـتـانتی پەرە بسـێنێ و بچەسپێ. تەوراتی وەرگـێڕا بۆ سـەر زمانی ئاڵمانی.

*(**) بەڵکو مانای وشەکە (ناپەسەن) لە جێی خۆیدایە و بەنیوەی یەکەمی دێڕەکەدا دەردەکەوێ.*

بگرن و ئایینەکەیان لە پێناو کەلکی کوردەواریدا بەکار بهێنن. واتا وەک: (احمدی خانی) و (حاجی قادری کۆیی) و (مەلا محمدی کۆیی) و (زێوەر) و (مەلا کاکە حەمە) بکەن. چونکە ئایینی پاکی ئیسلام و هەموو ئایینێکی ئاسمانی، فەرمان بەچاکەکردن ئەدا بۆ کەلکی نەتەوە و نیشتمان، نەک بەنوستن و ڕاکشان!. بێجگە لەمە (بێکەس) گەلێک هۆنراوەی تریشی هەیە لە دژی سەردار و دەولەمەند و کۆلکە خوێندەوارەکانمان.

## بانگ ئەدا بۆ ئازادی

(بێکەس) لە لایەن نیشتمانپەروەرانەوە خۆشەویست بوو. دەستی ئەگیرا. هەندێک ئەلێن ئەندام بووە لە کۆمەڵی (ژ. ک)دا. هەروەها لە (پارتی دیموکراتی کوردستان)دا. من ئەمەم بۆ ڕاست نەکرایەوە. بەڵام بیر زۆرتر بەلای ئەوەدا ئەچێ جارویار بەنهێنی ئەندامێک لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵانە گفتوگۆیان لەگەڵدا کرد بێ و داوای بەرهەمی شۆڕشگێڕانەیان لێ کرد بێ. چونکە (فائق) لەوانە نەبوو، ڕاز لە دڵی خۆیدا بهێڵێتەوە و ئاشکرای نەکات. بەتایبەتی لە کاتی سەرخۆشیدا کە زۆری ئەخواردەوە، گوێی لە کەس نەئەگرت، هەموو شتێکی بەرەو ڕووی دوژمنەکانی کورد و نۆکەرەکانیان ئەگوت. دیارە ئەم خووەیش بۆ کاروباری کۆمەڵانی نهێنیی ئەو سەردەمە دەستی نەئەدا. ئەم چامەیەیش کە وا لە خوارەوە ئەینووسم، لە ساڵی ١٩٤٨دا گوتوویەتی، کە هەر لە بڕانەوەی ئەو ساڵەدا گیانی پاکی بەخاک سپاردووە. پڕیەتی لە گیانی پاک و هەستی بڵند و بیروباوەڕی بەرز و پیرۆز بۆ کەلکی کوردەواری. چامەیێکە لە شا کارەکانی (بێکەس) ئەژمێررێ. گڕ و کڵپەی شۆڕشگێڕانەی ئەو سەردەمە پێشان ئەدات لە کوردستاندا، کە بانگێکە بەئاشکرا بۆ ئازادی.

ئەمە چامەکەیە:

(داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری أبد سەر ناگرێ
پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حقی لە کوشتن سڵ نەکا
هەر (بروخێ) بەس نییە تاکو نەسەندرێ نادرێ
کورد ئەگەرچی مدتێکە دیل و داماوە، بەڵام
باوەڕت بێ ڕۆحی مللی هەر ئەمێنێ نامرێ
تۆ ئەگەر إصلاحی قوم و نیشتمانی خۆت ئەوێ
لێت محقق بێ بەبێ شۆڕش محاڵە ناکرێ
بیری ئازادی جیهانی گرتەوە، توخوا بەسە
ئەم نظامە کۆنە تا کەی؟ هیممەتێ کەن لابرێ
قەت مەڵێن دوژمن بەهێزە تۆپ و طیارەی هەیە
إتفاقتان گەر هەبێ زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگرێ

ئەم عێراقە خۆشەویستە خاکی گوڵگوون بوو بەخوێن
تا حەقی دسگیر نەبێ لەو خوێنە دەس هەڵناگرێ
نێر و مێ هەردوو بەجووتە بۆ وطن هەوڵێ ئەدەن
دوورە دەرچوونی لە دیلی، مەل بەبێ باڵێ نافڕێ
هەولی ڕاستی هەردوو لا ئامانجی ملت سەر ئەخا
چونکە معلومە بەیەک دەس چەپڵە قەت لێ نادرێ
وا گلۆڵەی کەوتە لێژی باوی (استعمار) نەما
هیچ کەسێ ئیتر بەزوڕنا و تەپڵی ئەو هەڵناپەڕێ
دۆستیی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تأریخ شاهدە
ناحەزی ڕوو ڕەش لە داخا با یەخەی خۆی دادڕێ.

## شین ئەکات بۆ ئەفسەرە کوژراوەکانمان

بەبۆنەی هێنانەوەی لاشەکانی چوار ئەفسەرە کوردەکانمانەوە: (مصطفی خۆشناو)، (محمد قدسی)، (خیرالله عبدالکریم)، (عزت عزیز)، کە لە (بغداد)، لە ساڵی ١٩٤٧دا بەپەتا کران، لەسەر ئەوەی کە بەشداری شۆڕشی بارزانیان کرد بوو لە ساڵی ١٩٤٣دا بێکەس گڕ لە دەروونی بەرنەبێ و ئەم چامەیەیان بۆ ئەڵێ:

(قومی کورد إثباتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
ملتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین
ملتێ لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە بێ ترس، دەم بەخەندە و پێکەنین
قومی وا نامرێ ئەژی، با دوژمنی هەر شەق بەرێ
صاحبی ڕۆڵەی ئەبەردە، خاوەنی عەزمی متین
ئەو کەسەی گیانی لە ڕێگەی نیشتمانا بەخت ئەکا
پێی مەڵێن مردوو، شهیدە وا لە فیردەوسی بەرین
لاوی کورد مەردە، لە مردن قطعیا باکی نییە
پەندی پێشینانە، ڕاستە: (بەرخی نێر بۆ سەربڕین)
وا وطن دیسان بەمحزونی ئەڵێ: ئەی لاوەکان
بۆچی وا ماتوملولن، بەسیەتی شین و گرین
ڕۆژی تێکۆشانە، سادەی همتێ تاکو زووە
بەشکو لەم حالە نجاتمان بێ و لە دیلی دەربچین
گەرچی هەندێ کەس خەریکن ورگ و گیرفان پڕ ئەکەن
شەو بەبێ خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین، هەر سەر سەرین

پیـاو نەبێ دائم خـەمی قـوم و وڵاتی خـۆی هەبێ
ئەو کەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکە نین!).

## مانگ ئەکا بەهاوده‌می خۆی

(بێکەس) جارێکیـان بۆی گێڕامەوە: کە گەلێک شەوی هاوین بەسەر گـازی پشتـا ڕائەکشـێم و ڕوو ئەکەمە ئاسمان و مانگ و ئەستێرەکان. لێیان ورد ئەبمەوە و لە کڵۆڵی و سەرگەردانیی خۆم و کوردەواری ئەکۆڵمەوە، خەوم لە چاو ناکەوێ تا بەیان. جاری وا هەیە لەتاو دڵتەنگی و (خەم و خەفەت دەست ئەکەم بەگریان...) ئەیگووت: (جا کە من فێری خواردنەوەی مەی بووم، هەر لەبەر ئەمەیە کە خەوم لێ بخات و بنووم، خۆم و خۆمانم لەبیر بچێتەوە، بام بۆ چەند تاوێکیش بێ!.)...

جا بام سەیری ئەم چامەیەی (بێکەس) بکەین، کە چ ڕاستی پەرستی (فەلسفە)یەکی لە نێوانی باری خۆی و باری مانگدا دەرهێناوە. (بێکەس)، شاکارێکی تری خۆیان لەم چامەیەدا پێشکەش ئەکات:

ئەی مـانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین
هەردوو گـرفـتـار یەک ئاهی سـەردین
تۆ وێڵ و ڕەنگ زەرد بەئاسـمـانەوە
منـیش دەربـەدەر بـەشـارانـەوە
دەخیلتم ئەی مـانگ قـیبلەی دڵداران
دەرمـانی دەردی دڵەی بیـمـاران
شـەوێکە و ئەمـشـەو بگەرە فـریام
بێ یار و هاودەم عـاجـز و تەنیـام
دڵزار و بێـزار پەست و غـەمگینم
گـیـرۆدەی داوی یاری شـیـرینم
(دڵبـەندی عـشـقی ئەو بەڵەک چاوەم
شێت و شـەیدای ئەو ئەگـریجـە خـاوەم
لەو سـاوە ئەوم کـەوتۆتە خـەیاڵ
گـریانە پیـشـەم بوومـە کـۆی زووخـاڵ
ئەی مـانگ تۆ شعلەی عـشـقی پیـرۆزی
تۆ نەشـئـە بەخـشی دڵی بەسـۆزی
من سـوێندت ئەدەم بەعـشق و جـوانی
بەنەسـیـمـەکـەی بەری بەیانی
بەسـەرهاتی خـۆت بۆ من بیـان کـە
دەردی گـرانم نەخـتێ ئاسـان کـە

دووچاری چی بووی وا پەشێواوی؟
لەبەرچی پەست و مات و داماوی؟
پێم بڵێ توخوا چەند جوانت دی؟
چەند جووتە یاری دەس لە ملانت دی؟
چەند کۆڕی بەزمی عاشقانت دی؟
چەند تەخت و بەخت و خانومانت دی؟
چەند قارەمان و سلطانت دی؟
چەند قوم و ملت، چەند شارانت دی؟
چەند شەڕوشۆڕی بێ ئامانت دی؟
چەند بۆردومانی کوردستانت دی؟
چەند کفنی ئاڵی شەهیدانت دی؟
چەند بێ کەسانی پەرێشانت دی؟
چەند دەربەدەر و ماڵ وێرانت دی؟
چەند چاوی سووری پڕ گریانت دی؟
ئەی مانگ ئەوەندە سەیری دنیات کرد
سەیری نفاق و ظلم و ریات کرد
بۆیە بەم ڕەنگە کاری لێ کردی
ڕەنگ و شعوری بەجاری بردی!).

## لە گۆیژە سروش وەرئەگرێ

لەمەوپێش گوتمان خەم (فائق)ی پێگەیاند. خەم (بێکەس)ی ئەخستە سەر بیرکردنەوە لە هەموو شتێک. تا هۆ و ئامانج و سەرئەنجامی تێ بگات. کە لە شاخی (گۆیژە)یش ورد بووەوە ئەم سروش (وحی)یەی وەرگرت، کە ئەمەندە جوان و تەڕ و تازە بوو، ئەمەندە ڕاستیپەرستییەکی ناوازە بوو، کرا بەگۆرانی و لە خوێندنگاکاندا ئەخوێندرایەوە. سەردەمێکیش لە لایەن هونەرمەندانی کوردی (کۆماری مەهاباد)ەوە، خرایە سەر ساز و ئاوازێکی شەنگ و پڕ جۆش و لەسەر باڵی (ئەثیر)[1] بڵاو ئەکرایەوە بەهەموو کوردستان و جیهاندا.

ئەمە چامەکەیە:

شاخی ڕەنگاوڕەنگی گۆیژە باعسی کەیف و سرور
هەر دەمە بەرگێ ئەپۆشی گاه سپی، گاه سەوز و سوور

(١) واتە لە ئێستگەی رادیۆوە.

وصفی قومی کورد ئەکەی تۆ بەم هەموو ڕەنگانەوە
ڕەنگی سوورت شاهدە بۆ کورد کە قومێکن جسور
بەرگی بێ گەرد و سپیشت ظاهراً هاوار ئەکا
قومی کورد دڵ صاف و پاکن ملتێکن بێ قصور
بەرگی سەوزیشت ئەڵێ ئەم خاکە هەر شینایییە
پڕ لە دەغڵ و دان و کانی، سەر بەڕزق و پڕ لە نوور
ئەی وطن شایانی فخری واجبە مدحت بکەم
دار و بەردت عینی گەوهەر، خاک و خۆڵت وەک بلوور)

## خەمی ئافرەت و منداڵ ئەخوات

(بێکەس)، لە هۆنراوەکانیا داوای گێڕانەوەی مافی ئافرەت ئەکات. بانگ ئەدات بۆ یەکسانی ئافرەت لەگەڵ پیاودا لە ماف و سەربەستیدا، لە خۆپێگەیاندندا، لە خەباتکردن و فرمانکردندا بۆ کەڵکی خۆی و نیشتمانەکەی. لە چامەی (نەسرین)دا ئەمە ئەڵێ:

خشڵ و جوانیی تۆ حیا و فێربوونە
پاشەڕۆژیشت هەر بەوان ڕوونە
کچی بێ علم دیل و زەبوونە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وەعدەی شەرمە؟

بۆ منداڵانیش گەلێک هۆنراوەی کورت کورتی داناوە لە چیرۆک و لە پەند و ئامۆژگاری و سروود و لە بابەتی یاری تا بەلەبەرکردن و خوێندنەوەیان دڵخۆش و کەڵکەوەر بن. ئەمە چەند دێڕێکە لە چامەی (ئەسپە ئاسنینە):

(بۆ کەسێکی ورد و وریا زیرەک و صاحب عقل
هەڵ بهێنێ ئەم سؤالە و هەم بدا جوابم بەدڵ
ئەسپی من دانم لە غارە و باکی هیلاکی نییە
مەیتەر و زین و تەویلەی ئەی برا لازم نییە)

بێجگە لەوە بەزمانی ژنەکەیەوە (حەلاو)، بۆ کوڕەکەی (شێرکۆ)، هۆنراوەیەکی بەناوی (لایە لایە)وە داناوە، ژنی یەکەمیشی کە ئەمرێ بەپارچە هۆنراوەیەک شینی بۆ ئەکات.

## جەژن بەلای بێکەسەوە

ئەمەیش ڕاستی پەرستییەکی تری بێکەسە لە بابەت جەژنەوە:

هەر زەمانێ قومی کورد دەرچوو لە ذلت بوو بەپیاو
جەژنی من ئەو ڕۆژەیە، نەک جەژنی قوربانی و پلاو)

## (هۆی دواکەوتنمان ئەدۆزێتەوە)

(بێکەس)، بەلایەوە وایە هۆی دواکەوتنمان (ناشێتی) و (بەدخوویی)یە وەک (پوولپەرستی) و (خەبات نەکردن) و (خۆپەرستی) و (نەبوونی خۆشەویستی). لە دوا دێڕی چامەی (کورد)دا ئەڵێ:

(ملتی بێ علم و اخلاق چۆن بەإستقلال ئەگا ؟
واسطەی بەرزی و ترقی هیممەتی مەردانەیە!...)

لە چامەیەکی تریشیا: (خوا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا) لە دوا دێڕیا ئەڵێ:

(ئێمە کوژراوی دەستی نفاقین
محتاجی پارە و علم و اخلاقین
بۆیە وا پەستین، بێ إتفاقین
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا!)

لە چامەیەکی تریشیا (سەرم سوڕماوە) ئەڵێ:

(لە لام وا باشە ئێستاکە بەکەس پشتێ نەبەستی تۆ
لە خزم و دۆست و ئاشنایان هەتا ئەتوانی هەر ڕاکە
ئەگەر پارەت نەبوو بەخوا هەزار خزمت ببێ پەشمە
کە پارەت بوو هەموو عالەم براتە و پێت ئەڵێ کاکە)

لە چامەیەکی تریشیا: (قومی کورد)، ئەڵێ:

(گەرچی هەندێ کەس خەریکن ورگ و گیرفان پڕ ئەکەن
شەو بەبێ خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین، هەر سەر سەرین
پیاو ئەبێ دائم خەمی قوم و وڵاتی خۆی هەبێ
ئەو کەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکە نین!).

## نرخ دانانێک بۆ وێژەکەی

(بێکەس) هەرچەندە لە هۆنراوەکانیا وشەی زل و ناشیرینی بێگانەی بەکارهێناوە، هەروەها لە کێش (وزن) و سەروا (قافیە)یشدا ڕێی کۆنی گرتووە کە بەزۆری سەر بەبێگانەن، بەڵام چونکە بیروباوەڕ و ئامانجەکانی بەرز و پیرۆزن و لە شێوەیەکی تەڕ و تازەیشدا، بەهێز و هەڕەتێکی خاوەن بڕواوە دەربڕیون، بەسامانێکی نرخداری وێژەیی کوردی دائەنرێن... بێجگە لەوە لە زۆر (بابەت)یش دوواوە کە لەوەپێش لەو شێوەیەدا و بەو جۆرە نەگوتراوە، وەک: (عەیبە، عەیبە)، (تیاترۆ)، (قومار)، (خومار) (درۆزنیی کاربەدەستانی بێگانە)، (شێخ و مەلا و دەروێش)، (بەهەشت)، (مانگی ڕۆژوو)، (مەی گێڕ)، (دەردی ڕاستیپەرستی)، (پارەپەرستی)، (کەرەکانی شێخ سلام)، (بۆمبای ئەتۆم)، (دەردی دانایی و زانایی)... کە ئەمانە هەموویان سەرنج ڕاکێشەر و سامانێکی تازەن بۆ گەنجینەی وێژەکەمان... ئەمەندە و

ئەو شاکارانەیش کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا پیشانم داون، هەموو سامانی نوێن بۆ وێژەی کوردی...

(بێکەس) ژین و گـوزەرانەکـەی تاڵ و ناخـۆش بوون، لە چڕ و چاو و بەژن و باڵاکـەیدا ئەیاننوواند، کەچی خۆی وا ناڵێ. لەسەر خۆی ئەکاتەوە. گوێ بگرە بەوێنەکەی خۆی چی ئەڵێ:

(سـیـمـام بۆیە وا مـاتە و پڕ مـەینەت
کـورد سـەر شـێـواوە و کـوردسـتـان لەت لەت!)

لەگەڵ ئەمەیشا لە لەتە چاوەکەیا، تروسکەیەکی ڕۆشنایی هەبوو، پڕ بوو لە خواناسی و دادخوازی و خۆشەویستی بەرامبەر مرۆڤایەتی و کوردایەتی. دڵی پیاوی کێش ئەکرد. خوا هێز و هەڕەتێکی وایشی بەلەشی بەخشی بوو، کە باکی لە دەرد و نەخۆشی و ستەمی ڕۆژگار نەبوو. جارێکیان پێی گوتم: (من بایەخ نادەم بەداو و دەرمان و پزیشک، کە نەخۆش ئەکەوم. خۆم لە خۆمەوە چاک ئەبمەوە!) لە ڕاستییشدا وا بوو. کە نەخۆش ئەکەوت پارێزیشی نەئەگرت. کەچی زوو بەزوو لە خۆیەوە چاک ئەبووەوە!... بەم ڕەنگە ئەو خـوایەی کـە توانیـویێتی لە مـەگـەزێکی وەک هەنگ ئەو هەنگوینە شـیـرینەمـان بۆ دەربهـێنێ و، بەخواردنی ئەو هەنگوینەیش تەندوروستیـمـان پێ ببەخشێ، هەروەها لەو لەشولارە نارێکوپێکە و لەو ژینە تاڵەی (بێکەس)یشەوە، ئەم کـۆمەڵە هۆنراوە شیـرینە و ئەم کـەسایەتییـە پڕ لە هونەرمەندییەی بۆ بەرهەم هێناوین کە هەتا ئەمێنین بەخوێندنەوە و لێ وردبوونەوەیان تەندوروستی بەلەش و هۆش و دڵ و دەروونمان ئەگات و سەریشمان پێی بەرز ئەبێتەوە.

## ژیانی تایبەتی بێکەس

(فائق) دوو ژنی هێناوە. ژنی یەکەمیان مرد. زۆری پێ ناخۆش بوو، پڕ بەدڵ شینی بۆ ئەکرد. کچێکی لەپاش بەجێ ماوە. لە ژنی دووەمیشی کوڕێک و دوو کچی هەروەها ماون.

(بێکەس) لە بەرگ و پۆشـەنیـدا پنتی بوو. لە کـۆڕی یاراندا بەبەزم و پێکەنین بوو. لە زۆر لاوە خۆشەویستیی دی. لە زۆر کەسیشەوە یارمەتی دی. بەڵام چونکە لە کردن و خواردن و خواردنەوەدا بێ ئەندازە بوو، لە سرەوت و ڕابواردندا بێ شیرازە بوو. لەتاو ئێشی دڵی مەی بوو بووە هاودەمی. دەمیشی لە دەم و بێ دەمیـدا، خۆی نەئەپاراست. گەلێک جـار تووشی گـەروگێـچەڵی ئەکرد!... کـە لەسەر مـەی خۆریش پلاری تێ ئەگیـرا لەسەر خۆی ئەکردەوە و لەسـەر مەی ئەکردەوە!... ئەویش پەڵی ئەگرتە وشکە صۆفییەکان!...[1]

(بێکەس) لەم دواییەدا، یەکجار قەڵەو بوو بوو. تووشی نەخۆشی تەوژمی خوێن بوو بوو. لەپڕ دایە دڵی و سەری پێ نایەوە. ئەو کاتەساڵی ١٩٤٨ بوو کە هێشتا تەمەنی (٤٣) ساڵان بوو!.

---

(١) هەر تەنیا وشکە سۆفی و سۆفیەکان ڕەخنەیان لەو خواردنەوەیەی نەدەگرت. بەڵکو دۆست و خوێشانیشی کە بەتەنگ گوزەران و باری تەندوروستییەوە بوون. وە یا کـە دەیاندی ئەو خـووە دەبێتـە هۆی شێـواندنی بار و ئاستی کەسایەتی ئەو پیاوە لە کۆمەڵەکەیدا.

## كۆچی دوایی

(بێکەس) مرد. پاڵەوانێکی نیشتمانیمان لە دەست چووا... بەڵام تا ئەمێنین ژیانە بەرز و پیرۆزەکەی و بەرهەمە ناوازەکەیان لەبیر ناچێتەوە. شایستەی ئەوەیشە کە پەیکەرێکی لە گەڕەکی گۆیژەدا بۆ دابمەزرێنرێ.

دروود بۆ گیانی پاکی و سوپاس و سەرکەوتنیش بۆ ئەندامانی خێزانەکەی کە لە کۆکردنەوەی ئەم زانیارییەدا یارمەتییان دام.

تەواو بوو

## کاکە حەمەی مەلا کەریم هاتۆتەوە مەیدان(١)

نووسینی: هەڵکورد

لەم ڕۆژانەدا (کاکە حەمەی مەلا کەریم) نامیلکەیەکی بچووکی بەدیاری ناردووە بۆ خوێندەواران، ناوی ناوە: (هەندێ لای ئەو دیوەکەی بیری قانیع)(٢).

دیسانەوە کەوتۆتەوە خۆی، بەرەنگاری (کوردایەتی) و (نیشتمانپەروەرە نەتەوەییەکانی کورد)

---

(١) کە ئێمە ئەم نووسینەی مامۆستا دەخەینە پاڵ بەرهەمە ئەدەبییەکانی تری و بەرچاو دەکەوێ، هیچ مەبەستمان هەڵدانەوەی ڕابردوو نییە و خوانە خواستە زویرکردنی ئەم و ئەو نییە، چونکە بابەتەکە و ئەو نامیلکەیەش کە بەهۆیەوە نووسینەکە نووسراوە -وەک ناوەڕۆک- کاتیان نەما و بەسەرچوون، ڕووداوەکانی ڕۆژگارەکانی داهاتوویان هەموو ڕاستییەیان ئاشکرا کرد و ڕووی ڕاستی بۆ دۆست و نەیار دەرکەوت، ئیدی من وای بۆ دەچم برای گەورە و بەڕێز کاکە حەمەی مەلا کەریمیش بۆ خۆی ئێستا چاوێکی بەبۆچوونەکانی جارانیدا گێڕاوەتەوە و ئەو تێڕوانینە ڕەهاییەی ئەوسای بۆ مەسەلەکە نەماوە، هەروەک هەموومان ڕۆژگار زۆر شتی بۆ ڕاستکردینەوە و سەرجەم تێفکرین لە ناوەڕۆکی نووسینی لەم بابەتانە چوونەتە خانەی کەلەپوور و پاشماوەوە... بەڵام خۆ بەشێکن لە سامانی کەلچەری و ڕۆشنبیریمان. بەڵام ئینکار ناکرێ کە لە دووتوێی ئەم نووسینەیدا مامۆستا بەئاشکرا بەندەری گیرسانەوەی خۆی ئاشکرا کردووە، لەو سەردەمەی کە ڕووکەشەکان بەری چاوی زۆر کەسی گرتبوو، ئەم بێ پەروا بەرگری لە بیری نەتەوەیی و کوردایەتی دەکات و خۆی بەهەڵگرێکی دڵسۆزی ئەو ڕێبازە دادەنێ. سەردەمەکەش وا نەماوە کە تەنیا ناوهێنانی (ناوێ، زاراوەیە، پەسەندکردنی هەڵوێستێ) ئیتر خاوەنەکەی وا لێبکات کە بەکۆڵ و دڵ سەر بەولایەنەیە، ئەگینا ئەگەر ئاوا بۆ ئەمە بچین دەبێ (قانیع)ی بەهەشتی بکەینە پیاوی ئینگلیز بەر لەوەی مێزەرەکەی داگرین و کراسی سووری لەبەرکەین!! (بۆ زیاتر بڕوانە شیعرەکانی کە بۆ ئینگلیز و بەریتانیای وتووە لە: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی - پێویستی ئەو شیعرانەی پێویستنین، چاپخانەی سلێمانی ٢٠٠٠، ل٣٩-٤٥).

(٢) محەمەدی مەلا کەریم: هەندێ لای ئەو دیوەکەی بیری قانیع، لە ژمارە ١٢ و ١٣ی ڕۆژنامەی - بیری نوێ- دەرهێنراوە. (دیاری نووسەرە بۆ خوێندەواران) بەغدا- چاپخانەی (دار الجاحظ) ١٩٧٢... نامیلکەکە ٣٢ لاپەڕەیە بەقەبارەی ١٣×١٦سم. برای نووسەر کاک فوئاد محەمەد ئەمین سەراج دەڵێ: ئەم نووسینەی =

*(*) کاک فوئاد محەمەد ئەمین سەراج لە چوارشەممەی ٢٠٠٢/٧/٣١دا دەربارەی ئەو گۆڤارە پێی وتم کە: دەنگی دەروون بەدەست دەنووسرایەوە، لە ساڵانی ١٩٧٢ - ١٩٧٣ لە سلێمانی لەلایەن چەند ڕۆشنبیرێکی گەنجەوە وەک: فوئاد محەمەد ئەمین، سمکۆ ناکام، هەمزە عەلی ساڵح و خوالێخۆشبوو ئەکرەمی مام عەلی ئامادە دەکرا، ئەمانە هەرچەند بیروبۆچوونی جیاوازیان هەبوو بەڵام توانیمان پێکەوە ١٣ ژمارەی لێ دەرکەین و دوایی دەسەڵاتی ئەوسا قەدەغەی کرد، بیروباوەڕی نەتەوەیی زیاتر بەنووسینەکانیەوە دیاربوو. ئەم بابەتەی مامۆستا بۆ گەلێ لە گۆڤار و ڕۆژنامە ئەو ساڵەی نارد بوو لە بەغدا، بەڵام هیچیان نەیانوێرابوو بڵاوی بکەنەوە. د. کاوێس عەزیز فەرەج، برای کاک شەوکەتی سەیدەلی، ئەو کاتە ماڵەکەیان بەرامبەر ماڵی مامۆستا بوو، هامشۆیەکی گەرمی دەکرد؛ باسی ئەم وتارەی بۆ کردبوو، بەهۆی ئەوەوە وتارەکەمان بەدەست گەیشت و لە ژمارە (٩)دا بڵاومان کردەوە.*

ئەکات. فڵچەیەکی سووری بەدەستەوە گرتووە خەریکە ڕەنگی (سوور) لە مامۆستای کوردپەروەری ڕۆشنبیر، خوالێخۆشبوو (قانیع) ئەدات.

بەکوردییەکی پەتی! کاکە حەمەی مەلا کەریم خەریکە قانیع بکات بە(شیوعی)، هەروەها بەبۆنەی (قانیع)یشەوە نیشتمانپەروەرە نەتەوەییەکانی کورد بکات بە(ئینگلیز پەرستێکی بێ هۆش و گۆش)، کە هەر بەهیوای ئەوەبوون کوردستان لەسەر دەستی ئینگلیزدا سەربەخۆیی دەستکەوێ.

محمدی مەلا کریم

هەندێ لای ئەردیوەکری بیری

قانیع

لە ژمارە (١٢)و (١٣)ی ڕۆژنامەی (بیری نوێ) دەرهێنراوە

( دیاریی نووسەرە بۆ خوێنەواران )

بغدا – چاپخانەی ( دار الجاحظ )
١٩٧٢

ئێمەش کە لە دەمێکەوە شارەزای کاکە حەمەین و ئەزانین ڕێوی چ کونێکە، سەرمان لەم کردەوەیەی سوڕنامێنێ، چونکە بیستوومانەتەوە شیوعییەکانی ئاشنای بۆنیان داوە بەلووتیا کە ئەینێرن بۆ مۆسکۆ بۆ خوێندن و (دکتۆرا وەرگرتن لە پیشەی ڕۆژنامەگەری)دا.

کەچی خۆی، کە لێی ئەپرسن، ئەمە بەرپەرچ ئەداتەوە، ئەڵێ: بۆ چاککردنەوەی (گوێچکە)م ئەچم!؟.

جا بۆ ئەمەی هەر لە ئێستاوە، لە مۆسکۆدا جێگایەک بۆ خۆی خۆشبکات، پێویستە دیاریەکی پێبێ، بۆ کۆمۆنیستەکانی ئەوێ، ئەویش ئەم نامیلکەیەیە کە تازە چاپی کردووە، بام نامیلکەکەیش لە ڕاستیەوە دووربێ و بام کرکراگەی گوێچکەی کوردپەروەرەکانی نەتەوەکەی خۆیشی پێ بشکێنێ... هەر کاکە حەمە خۆی پێی سەرکەوێ، بەسیەتی!

***

کاکە حەمە لە لاپەڕەی (١٦)ی نامیلکەکەیدا ئەڵێ:

«قانیع بەپێچەوانەی ئەو نیشتمانپەروەرە نەتەوەییە کوردانەوە کە هیچ عیبرەتیان لە ڕووداوی مێژوو وەرنەگرتبوو، ئەوەیان لەیاد نەمابوو کە بەریتانیا دەورێکی چەند نامەردانەی دی لە پێشێلکردنی مافەکانی گەلی کوردا و، هێشتا هەر بەتەمای ئەوە بوون کە -ساحێب- مافیان بۆ دابین بکا، ئەیزانی ڕێگای ڕزگاریی نەتەوەیی کورد ئەوەتە خەباتی خۆی ببەستێ بەخەباتی بەرەی سۆشیالیزمەوە و لە ڕیزی ئەم بەرەیەدە تێبکۆشێ بۆ مافی خۆی: چونکە هەر ئەم بەرەیەیە مەعنای پاشەکشە لە بەردەمی ئیمپریالیزمدا نازانێ و هەرگیز پشت لە ماف و داخوازیی گەلان هەڵناکات:

---

=مامۆستا شاکر کاتی خۆی لە گۆڤاری دەسنووسی (دەنگی دەروون - ژمارە نۆ)دا بڵاومان کردەوە[*]. بەڵام من بۆ خۆم نەمدیوە، لەناو دەسنووسەکانیدا ڕۆژی هەینی ٢٠٠٢/٧/٢٦ لەگەڵ د. شێرکۆی کوڕیدا بەردەستمان کەوت. حەز دەکەم سەرنجی ئەوەش بدەن کە هەندێ وشە و دەستەواژە کە پێویست نەبوون لێم هەڵگرتوون یان بە(.....) نیشارەم داونێ.

ئەی کوردە! بەسە قوڕبەسەری و گریە و ناڵین
تاکەی بەکزی و لارەملی عاجز و غەمگین
سوودێکی نییە بتپەرستی و خزمەتی (چەرچل)
ڕاستۆیە دەسا ڕووکەرە دەرباری (ستالین)

وا ئێمەیش لێرەدا بەند بەبەند وەرامی ئەدەینەوە.

## کوردپەروەر بڕوای بەهیچ داگیرکەرێک نییە

کاکە حەمە کە هەندێ لە کوردپەروەرەکانمان تاوانبار ئەکات بەئینگلیزپەرستی، قسەکەی لە ڕاستییەوە زۆر دوورە. چونکە پیاو کە کوردپەروەر بوو، ئینگلیزپەرست نابێ.

شێخ مەحموودی مەزن، لە سەرەتادا لەو باوەڕەدا بوو کە کورد ئەتوانێ بەهۆی ئینگلیزەوە سەربەخۆیی دەستکەوێ. کە زانی ئینگلیز ئەو سەربەخۆییەی ناداتێ، لێی ڕاست بووەوە و خۆی سەربەخۆیی کوردستانی ئاشکرا کرد. هەموویشمان ئەیزانین کە لەپێناو سەربەخۆیی کوردستان چ ڕەنجێکی دا و چەند جاریش چوو بەگژ ئینگلیز و نۆکەرەکانیا، بەڵام هەر شێخ مەحموود خۆیشی بوو کە داوای یارمەتی لە رووسەکانی سۆڤیەت کرد، هیچی دەستنەکەوت؟

مەلا مستەفای بارزانی، کە یەکێکە لە کوردپەروەرەکان، کە زانی هیچ لە ئینگلیزەکان هەڵناوەرێ بۆ کورد، چوو بەگژیاندا و شۆڕشەکانی خۆی بەرامبەر ئەوان و بەرامبەر نۆکەرەکانیان بەرپاکرد.

قازی محەممەدی سەرکۆماری مەهابادیش هەر لە سەرەتاوە دژی ئینگلیزەکان و ئەمریکاییەکان بوو. کەچی ڕووسەکانی سۆڤیەتی دۆستی، پشتیان بەرەڵلا کرد بۆ (ئینگلیز و ئەمریکا و ئێرانییەکان)، تا بەکورگانخواردویان دا.

ئەمە سێ کەس لە نیشتمانپەروەرانی کورد، کامیان سەر بەئینگلیز بوون؟! کامیشیان بەهیوای ئینگلیز بوون؟... کەی مامۆستا ڕەفیق حیلمی کە سەرۆکی (کۆمەڵی هیوا) بوو سەر بەئینگلیز بوو؟ کەی هیوای بەئینگلیز بوو؟

کەی ئەمین زەکی بەگ، مەحموود جەودەت، حاجی مستەفا پاشا، ساڵح زەکی بەگ، ئەمین ڕەواندزی، کامل حەسەن و دەیانی تر لە کوردپەروەران ئینگلیزیان پەرستووە و هیوایان بەئینگلیز بووە؟

لە ڕاستیشدا، کوردپەروەرەکان، نە بڕوایان بەئینگلیز هەبووە و نە بڕوایان بەڕووس و ئەمریکا هەبووە. نە بڕوایشیان بەهیچ داگیرکەرێک هەبووە، ئەو پیاوە نیشتمانپەروەرانە لە کاتی خەباتا هاواریان بۆ هەموو لایەک بردووە تا لە ڕزگارکردنی کوردستاندا یارمەتیان بدەن، بەڵام کە زانیویانە ئەو لایانە بەهاواریانەوە نەچوون و لەجیاتی ئەوە زۆرداریان لێکردوون؛ بەپێنووس بوویێ و بەشیر بەگژیاندا چوون.

ئەم هەموو شۆڕشانەیش کە لە کوردستاندا بەرپابوون بەرامبەر بەتورکیا و ئێران و عێراق و دۆستەکانیان کە ئینگلیز و ئەمریکا و ڕووس بوون، لەم دوو چەرخەی دواییەدا ڕاستی ئەم قسەیەمان دەرئەخەن.

## کوردپەروەران پەندیان لە مێژوو زۆر وەرگرت

من لەگەڵ کاکە حەمە دام کە ئەڵێت: ئینگلیزەکان زیانێکی زۆریان لە مافەکانی نەتەوەی کورد دا.

لە ڕاستیدا هەر لە ساڵی ١٨٢٦ەوە تا ئێستا، ئینگلیزەکان لەگەڵ فەرمانڕەوایانی ئێران و تورکیادا یەکیان گرتووە و لەسەر و پۆستمان ئەدەن، نە ئەهێڵن بحەسێینەوە و نە ئەیش هێڵن ببینە گەورەی خۆمان.

بەڵام هەرگیز لەوەدا لەگەڵتا نیم کە ئەڵێیت: کوردپەروەران پەندیان لەو مێژووە وەرنەگرتبوو بەهیوای ئینگلیز بوون سەربەرخۆییان دەسگیر بکات. چونکە کوردپەروەران هەر لە ساڵی ١٩٣٥ەوە هەستیان بەئینگلیز کرد کە (کۆمۆنیستی)یان لەناودا بڵاو ئەکاتەوە؛ تا هەر لە یەک کاتدا زیان بە(کۆمۆنیستی) و زیان بە(کوردایەتی)ش بگەیەنێ.

چی بێ لە تۆ نهێنێ بێ، هەر ئینگلیزەکان بوون کە لە ساڵی ١٩٤٦دا لە هاوبەشی -شرکە، کۆمپانیا. ا. ب-ی نەوتی کەرکوکەوە چەند کۆمۆنیستێکیان گەیاندە مەهاباد و ئاژاوەیان نایەوە لە دژی (کۆماری مەهاباد) و (چاپخانە)کەی!...

هەر ئینگلیزەکانیش بوون کە ئەو کۆمۆنیستانەیان هاندا دژی (کوردایەتی) بووەستن، لە کوردستانی عێراقدا، لە ساڵەکانی ١٩٥٨-١٩٦٣.

خۆ ئەوەیشت نابێ لەبیر نەبێ کە یەکەم گوللەی تۆپی (عەبدولکەریم قاسم) لە ساڵی ١٩٦١دا لەسەر دەستی ئەفسەرێکی کۆمۆنیستدا بوو کە لە دەربەندیخاندا نرا بەلەشکری پێشمەرگەی کوردەوە!...

هەروەها ئەوانەی ئاژاوەیان خستە نێوان (عەبدولکەریم قاسم) و (کورد)ەوە، لە ساڵی ١٩٦١دا، هەر کۆمۆنیستەکان بوون!...

کۆماری مەهابادیش کە دامەزرا، لەسەر خواست و ئارەزووی (حزبی دیموکراتی کوردستان) دامەزرا نەک لەلایەن لەشکری سووری ڕووسیەوە کە بەنابەدڵی ئەو دامەزرا.

کورد لەسەر دەستی کۆماری مەهابادا چووە بەر دەرگای (ستالین)، بەڵام داخەکەم ستالین لەگەڵ (قوام السلطنة)ی سەرەک وەزیرانی ئێران ڕێککەوت و کوردی فرۆشت بەئێران، بەنەوتی کوردستان... کوردی لەبیر چووەوە و دای بەگورگان خواردوو، بەدوژمنەکانی کورد و ڕووس کە ئەمریکاییەکان و ئینگلیزەکان بوون... لەگەڵ ئێراندا.

بەڵێ... ئێمە کە نیشتمانپەروەرە نەتەوەییەکانی کوردین، ئەم هەموو پەندەمان لە مێژوو وەرگرتووە، بەدەمیشیەوە نەماوە ئەگینا هی تریشمان بۆ هەڵ ئەڕشتیت... کەواتە بام ئەو پەندانەت پێ بڵێم:

ئێمە کەوتووینەتە ئەو باوەڕەوە کە هەموو فەرمانڕەواییەک بۆ کەڵکی خۆی هەوڵ ئەدات، کە زۆربەی ناپوختەیە. لەبەر ئەوە نە پشت بەبەرەی سەرمایەداری ئەبەستین و نە بەبەرەی سۆشیالیستی؛ چونکە ئەوانە هیچ لایەکیان بۆ (خوا) کار ناکەن، بۆ (خورما) کار ئەکەن، ئێمەیش ئەگەر خۆمان یەکبین ڕێگای خواناسی بگرینەبەر، هیچ هێزێک دەرەقەتمان نایەت.

(سەلاحەدین ئەیوبی) کە کوردێک بوو؛ وایکرد، بۆیەکا لەشکری (٢٢) فەرمانڕەوایی ئەورووپای شکاند و بەڕیسواییەوە لە خاکی خۆی کردنیە دەرەوە!... ئێمەیش کە کوردین و لەو کەمتر نین ئەگەر وەک ئەو بکەین. لەو کەمتر ناکەین و لەو کەمتریشمان دەستناکەوێت؛ واتا ئازادی و گەورەیی و کامەرانی لە خۆیانەوە دێنە بەردەستمان!

## قانیع شیوعی نەبوو!

هەرچەندە قانیع ئەو جۆرە هۆنراوانەی هەڵبەستووە کە ناوی (لینین و ستالین و سۆشیالیزم)ی تیایە، بەڵام من لەو باوەڕەدا نیم کە (شیوعی) بووبێ. چونکە من جارێکیان لە ساڵی ١٩٥٩دا دیم، بەهەموو کوڵی دڵیەوە گلەیی لە کردەوە و کاری شیوعییەکانی شارەزوور ئەکرد و جنێوی پێ ئەدان. ئەیگوت:

ئەمانە ئەمەندە... و... نن چوونەتە سەر مەلا (...) کە پیاوێکی زۆر خوێندەوار و زانا و چاکە و لە گوندی (...)دا دائەنیشێ لە ناوچەی شارەزووردا. پێیان گوتووە: ........................

مەلای بەسەزمانیش لەتاو نابرووی خۆی هەر بەو شەوە بەدزیەوە لەگەڵ ژنەکەیدا باری کرد و ڕووی کردە ئێران!... قانیعیش کە بەچاوی خۆی کردەوە و کاری ڕووسەکانی دیبوو لەگەڵ کۆماری مەهابادا، لە ساڵی ١٩٤٦دا، ئیتر ئەو ڕێز و باوەڕەی نەمابوو بەکۆمۆنیستی و کۆمۆنیستەکان.

هەموو جارێ دڵی خۆی بەو جۆرە هەڵ ئەڕشت بۆ دۆست و هاوڕێکانی خۆی.

ئێمەیش وەک قانیع لە ساڵەکانی دوایی جەنگی دووەمی جیهانیدا باوەڕمان بەبەرەی سۆشیالیزمی بوو، هەر لەبەر ئەوەی کە لە بەرەی سەرمایەداری و داگیرکەریی ئینگلیز و ئەمریکا و هاوڕێکانی تریان بێ هیوا بووین... بەڵام کە لە ساڵەکانی ١٩٤٦ەوە هەتا ١٩٦٣ ئەو کردەوە و کارانەمان لە شیوعییەکانی ڕووس و عێراق دی ئیتر باوەڕمان پێیان نەما و هەناسە ساردی جارێکی تریش دای گرتینەوە.

ئەمەندە هەیە (سۆشیالیزمی) کە ئێمەیش هەر بەچەشنی قانیع بەشتێکی بەکەڵکی دائەنێین بۆ دواڕۆژی کوردەواری؛ بەمەرجێ لەسەری ئەڕۆین کە لە سنووری (دیموکراتی و ئیسلامەتی و کوردایەتی) نەچێتە دەرەوە، چونکە تەنانەت ئەگەر (کوردایەتی)یەکەمان بگاتە پلەی (مرۆڤایەتی) و (جیهان پەروەری)یش بکەین، ئاینی پاکی ئیسلام لەگەڵ ڕەوشتە نەژادەکەی کوردایەتییەکەماندا بەسن بۆ ئەمەی ڕێگامان پیشان بدەن و هەموو گیروگرفتێکی خۆمانیان پێ چارە بکەین.

جا (قانیع)یش هەر لەسەر ئەم مەرجانە، بێ گومان، سۆشیالیزمی پەسەند کردووە. ئەگینا خواناسێکی کوردپەروەری وەک ئەو زۆر دوورە لە (شیوعێتی)یەوە کە دژی چوار شتی پیرۆزمان وەستاوە:

«ئاین و خێزان و گەلپەروەری و نیشتمانپەروەری...

## تەنیا، کەڵکی گشتیی کوردەواری، ئامانجمانە

ئێمەی کوردستان پەروەری نەتەوەیی، ئامادەی دۆستایەتین لەگەڵ هەموو فەرمانڕەواییەکا کە دۆستانە لەگەڵماندا بجووڵێتەوە. ئیتر بەتەنگ ئەوەوە نابین کە ئەم فەرمانڕەواییە لەبەری دیموکراتی بێ یان لە بەرەی دیکتاتۆری، لە بەرەی سەرمایەداریی بێ یان لە بەرەی سۆشیالیزمی.

ئەوەندەی (یەکێتی سۆڤیەت) داڵلای (مەلا مستەفا بارزانی) و هاورێکانی دا و چاکەی لەگەڵ کردن لە خاکەکانی سۆڤیێت دا، ئەوەندە پتر و چاکتر (مەلا مستەفا) داڵلای کۆمۆنیستەکانی دا و یارمەتی دان لە سنووری کوردستاندا.

(عەبدولکەریم قاسم) تا دۆست بوو لەگەڵ کورددا، بەسەری ئەو سوێندمان ئەخوارد، بەڵام کە بەتەفرەدانی کۆمۆنیستەکانی عێراق لێمان هەڵگەڕایەوە، چووین بەگژیا تا سەرگەردانمان کرد.

بەڵام سروشتی فەرمانڕەواییەکان، دەم دەمیە، هەر ڕۆژە لەسەر تەلێک یاری ئەکەن، لەسەر دەستی ئینگلیزەکاندا لە ساڵی ١٨٢٠ (یۆنان) لە تورکیا جیابووەوە و بوو بەفەرمانڕەواییەکی سەربەخۆ، هەروەها (عێراق و ئەردەن و حیجاز و کوێت و یەمەن و هیندستان و پاکستان و حەبەشستان و) گەلێک خاکانی تر لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەوروپا، لەسەر دەستی ئینگلیز و دۆستە سەرمایەدارەکانیاندا سەربەخۆییان وەرگرت.

لەسەر دەستی ڕووسیای قەیسەریشدا (بولغاریا و ڕۆمانیا) و گەلێک خاکی تر لە (تورکیای عوسمانی) جیابوونەوە و سەربەخۆییان وەرگرت، لەسەر دەستی فەرەنسەیشدا (سووریە و لوبنان) سەربەخۆییان لە تورکیا وەرگرت. کەچی ڕووسیا و فەرەنسە و بەریتانیا لە پێش شەڕی گەورەی یەکەمدا بەنهێنی لەسەر لاکی ئێمە ڕێککەوتبوون: کوردستانیان کردبوو بەسێ بەشەوە؛ هەر بەشەی بۆ یەکێکیان دانرابوو!.[1]

یەکێتی سۆڤیێت یارمەتیی فەرمانڕەوایی تورکیایدا لە سەردەمی لینین دا، کەچی یارمەتیی (شۆڕشی کوردستانی ژووروو)ی نەدا لە دژی کەمالیە تورکەکان.

لە ڕاستیدا، ئەگەر قسەی کۆمۆنیستەکان ڕاستبێ و بەیاسا و بیروباوەڕەکەی خۆیان بچن بەڕێوە، ئەبێ ئێمەی کوردەواری هەر ئەوان بەدۆستی خۆمان دابنێین و هەر ئەوانیش یارمەتیمان بدەن لە ڕزگاری و ئازادیماندا، کەچی داخەکەم ئێمە کردمان و ئەوان نەیانکرد، ئەمە نزیکەی (٥٥) ساڵی خشتە فەرمانڕەوایی (یەکێتیی سۆڤیێت) دامەزراوە و کوردەکان داوای دامەزراندنی کۆمارێکیان لێ ئەکەن (لە کوردستانی سۆڤیێت)دا، کەچی ئەوان هەر ئەمرۆ بەسبەینێیان پێ ئەکەن و گوێی خۆیانی لێ ئەخەفێنن!...

دەتوخوا پێم بڵێ یەکێتیی سۆڤیێت لەم ڕەوشتەیدا چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئێران و تورکیادا کە ئەمانیش هەر بەچەشنی ئەو پێ ئەماڵن بەمافی کورددا و ئەیپلیشێننەوە؟!

فەرمانڕەوایی یەکێتی سۆڤیێت و ئێران هەردووکیان ناوبەناو هانمان ئەدەن بۆ سەندنی مافی کوردەواری لە فەرمانڕەوایی (عێراق) و بگرە پشتگیریشمان ئەکەن، کەچی لە کوردستانەکەی لای خۆیاندا هیچ مافێکی نەتەوەیی و زرنگکاری (سیاسی) بەکوردەواریەکەمان نادەن!!

جا کە وای لێهات، ئێمەی کوردستان پەروەرانی نەتەوەیی مافمان هەیە، هەر فەرمانڕەواییەک دەستی

---

(١) مەبەستی ڕێککەوتننامەی سایکس - بیکۆی ١/٩/١٩١٦یە.

یارمەتیمان بۆ درێژ بکات، بەسوپاسەوە لێی وەربگرین.

بام ئەو فەرمانڕەواییە لەسەر بیروباوەڕیشمان نەبێ. بەڵام ئێمەیش خۆمان سەرشۆڕی ئەو دەستگیرۆییە ناکەین و خۆمانی پێ نافرۆشین؛ چاکەی ئەدەینەوە و لە تەنگانەیدا یارمەتی ئەدەین.

خۆ ئەگەر قسەکەی تۆ ڕاست بووایە، نەئەبوو (فەرمانڕەوایی چین)ی کۆمۆنیست و (فەرمانڕەوایی یەکێتی سۆڤییێت) شەڕە جوێن و شەڕە خوێنیان بکردایە[1].

هەروەها نەئەبوایە یەکێتی سۆڤییێت خاکی چیکۆسلۆڤاکیای کۆمۆنیستی لە ساڵی ١٩٦٨دا داگیر بکردایە،[2] ئەی بەمە ئەڵێی چی کە (ئەلبانیای کۆمۆنیست) بەیەکێتی سۆڤییێت ئەڵێ: «ئیمپیریالی سوور!!».

هەروەها نەئەبوایە یەکێتیی سۆڤییێت یارمەتی چەک و خواردەمەنی و پووشەنیی لە (ئەمریکای سەرمایەدار) لە ساڵی ١٩٤٢دا بخواستایە بۆ ئەمەی بەرگەی لەشکری (هیتلەر)ی بگرتایە!

کەواتە هەموو فەرمانڕەواییەک دوای کەڵکی خۆی ئەکەوێ، ئیتر بۆ چ بۆ کوردەواری ناڕەوایە یارمەتی و کەڵک و چاکە لە فەرمانڕەوایی سەرمایەداری یاخود دیمۆکراتی داوا بکا و وەربگرێ؟!

## کاکە حەمە، پەند تۆ وەری بگرە، نەک ئێمە

کەواتە کەم هەل مەبە. تۆڵەسێنەوە و قینین لە دڵ مەبە، دڵ ڕەشی و دڵ ڕەق مەبە. لە ساڵی ١٩٦٠دا هورووژمت بردە سەر کوردپەروەران و کوردایەتی، تەنانەت (حاجی قادری کۆیی)ش لە دەستت ڕزگاری نەبوو، ئەوەبوو کوردپەروەران لە بێشە بۆت دەرپەڕین و نووسراوی (کوردایەتی)یان بۆ (وەڵامدانەوەت) ئامادە کرد.

کەچی وا ئێستاکە، کە بای شەماڵی کۆمۆنیستی لە کەللەی داویتەوە، لە پاش (١٢) ساڵی خشت[3]، پەندت لەو هەموو شەڕە دەم و قیرە قیرەی لەگەڵتا کرا، وەرنەگرت.

(١) ئەو کاتە ناکۆکیەکەی نێوان ئەو دوو جەمسەرە کۆمۆنیستیە ناو دەبرا بە(خلاف عقائدی). خۆ ئەوانەی خۆیان لە کۆمۆنیستەکان بەکۆمۆنیستتر دەزانی و سەر بەبەرەی چین بوون (ماویەکان) وایان حەز لێبوو بەیەکێتی سۆڤیەت بڵێن: (ڕیڤینیزستەکان - تەحریفییەکان) گوایە مارکسییەت و لینینیەتیان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان وەرگێڕاوە!... (ئەلبانیا)ی (ئەنوەر خۆجە)ی ئەو کاتە سەر بەچینییەکان بووا.

(٢) ڕاپەڕینەکەی ١٩٦٨ی حیزبی شیوعی چیکۆسلیۆڤاکیا بەڕاپەڕینی (دۆپتشیک) و تەنگەتاوی مۆسکۆ لێی و ڕووداوی (بەهاری پراگ) لەلایەن قوتابیانی ئەو وڵاتەوە وای لە سۆڤییێت کرد کە بەناگر و ئاسن بکەونە گیانی خەڵکەکە و وڵاتەکە داگیر کەن.

(٣) ئیشارەیە بۆ ئەو دەمەتەقێیەی بەرپا بوو لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی نامیلکە شیعرییەکەی مامۆستا کامل ژیر (کوردایەتی - ١٩٦٠) و وەڵامی کاکە حەمە بەنامیلکەی (کوردایەتی لەژێر نەشتەری یەکالا کردنەوەدا) و دواجار وەڵامی (زەردەشت) بەنامیلکەی (نەشتەرە کولەکەی حەمەی مەلا کەریم...)، لە ڕاستیدا جموجۆڵێکی ئەدەبی و فیکری بەپێز بوو.

ئەم دەمەت بەهەل زانی کە یەکێتی سۆڤییەت بۆتەوە بەهاودەمی (عێراق)[1]، دووبارە پەلامارت داوینەتەوە.

ئێمە هەرچەندە ئاشتیخوازین و حەز لە شەڕ ناکەین، بەلام کە شەڕ یەخەی گرتین باشی ئەکەین -باش دەیکەین. أ. ب-، ئایا ئەم قسانە لە هی خۆتەوەبێ، یان لە هی دەستەی کۆمۆنیستەکانەوە.بێ ، ئۆبالێ بەئەستۆی خۆت...

١٩٧٢/١١/٢٣

## سینەماکانمان[2]

### فلیمەکان

زۆربەی فلیمەکان لەوانەنین نەتەوە ئاراستە بکەن بۆ کردەوە و ڕەوشتی جوان و پەسەند. یاخود بۆ هەست و تاسە و تەزووی پاک و بڵند. یان واتای (خواناسی) و (نیشتمانپەروەری) و (نەتەوە دۆستی) و (مرۆڤ خۆشویستن) و(دیموکراتی) و (سۆسیالیستی) ڕون بکەنەوە بۆ تەماشاکەران و تێیان بگەیێنن. زۆربەی فلیمەکان بابەتی بازرگانین. یان بێ کەڵک و بێ فەڕن و، بینەر هیچ سوودێکیان لێ وەرناگرێت. یاخود نەتەوە ئاراستەی کردەوە و ڕەوشتی خراپ دەکەن. هەندێکیش لە فلیمەکان ناوازە و نایابن بێجگە لەوەی باش دەرهێنراون و، چێشکەی مرۆڤی دڵتەڕ و وریا تێر دەکەن، نەتەوەییش ئاراستە دەکەن بۆ مرۆڤایەتی و نیشتمانپەروەری و گەل دۆستی و دیموکراتی و خواناسی و سۆسیالیستی.

(نەتەوەی کورد)، کە پاشکەوتووە، لە ڕاستیدا، داماوی ئەو فلیمانەیە، کە زانیارییەکی تەواوی پێ دەبەخشن لە بابەت و ژیانێکی پاکتر و چاکتر و خۆشترەوە. کە لە مێژووی شۆڕشە گەورەکانی جیهانی ئاگادار دەکەن: وەک شۆڕشی گەورەی فەرەنسە و، شۆڕشی پیشەسازیی ئینگلیز و، شۆڕشی گەورەی ڕووسیا و، شۆڕشی گەورەی هیندستان و، شۆڕشی مەزنی چین.

هەروەها (نەتەوەی کورد)، داماوی تەماشاکردنی ئەو فلیمانەیە کە ژیانی گەورەپیاوانی جیهان پێشان

(١) لە ١٩٧١ - ١٩٧٢دا وەک سیاسەتێکی (کاتیی) حکومەت و حیزبی بەعس لە عێراق بەشێوەیەکی بەرچاو بەسەرۆکایەتی (سەدام حوسێن) چووە مۆسکۆ، لێرە زۆر لێک نیزیک بوونەوە، لە ٦-١٠/٤/١٩٧٣ شاندێکی سۆڤییەتی بەسەرۆکایەتی (ئەلێکسی کۆسگین) ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی سۆڤییەتی و سەرەک وەزیرانی وڵات بۆ بەشداری کردن لە یۆبیلی زیوینی دامەزراندنی حیزبی بەعس لە ٧ نیسانی ١٩٧٣دا، گەیشتە بەغدا، ئەنجام هەردوولا پێکەوە ئاهەنگی دەرهێنانی نەوتی (ڕوومەیلە)یان پیرۆز کرد و (پەیمانێکی دۆستایەتی و هاوکاری - معاهدە الصداقە والتعاون) لە نێوان هەردوولادا بەزەماوەندێکی گەورەوە مۆر کرا. لێرەدا حیزب و حکومەت لە عێراق تەنیا خۆی بەخاوەنی ئەم دۆستایەتی و هاوکارییە دەزانی، بەڵام کۆمۆنیستەکان لەولاوە پێی شاگەشکە ببوون و دەستەسریان بۆ بادەدا.

(٢) ئەم بابەتە لە کتێبی (هاواری پێشکەوتن)دا بەکەمێ کورتکراوەیی بلاوکراوەتەوە. شاکر فەتاح - هاواری پێشکەوتن ١٩٧٩ دار الحریة - بغداد ص٣، من منشورات الأمانة للثقافة والشباب.

ئەدەن: وەک نووح و ئیبراهیم و یوسف و مووسا و عیسا و موحەممەد و زەردەشت و کۆنفۆشیۆش و کریشنا و غاندی و ئەهرۆ و سەلاحەدینی ئەیووبی و مارکۆنی و ئەدیسن و گۆتەمبەرگ و تۆلستۆی و ئەحمەدی خانی. تا چاو لە خەباتە شۆخ و شەنگەکانیان و کردەوە و کارە بڵندەکانیان بکات لە پێشخستنی خۆیدا.

هەروەها (نەتەوەکەمان) داماوی تەماشاکردنی ئەو فلیمانەیە کە مێژووی پێشکەوتنی مرۆڤ پێشان ئەدەن لە خاکە ئازادە پێشکەوتووەکانی جیهاندا: لە رووی خوێندەواری و هونەرەکانی و تیکنیک و چاپەمەنی و ئاوەدانی و کشتوکاڵ و پیشەسازی و بەرگ و پۆشەنی و شێوەی خواردن و هەڵسان و دانیشتن و کاروبار هەڵسووڕاندن و رابواردنەوە، تا چاوی بکرێتەوە و، وریا بێتەوە، دەست بکات بەپێگەیاندن و پێشخستنی خۆی.

هەروەک بۆ هەموو رۆشنبیرێک دەرکەوتووە، هەندێک لە فەرمانڕەواییە داگیرکەرەکانی جیهان، بەیارمەتیی هاوبەشی (شرکە)یە پوولپەرستەکانەوە، ژمارەیەکی زۆر فلیمیان دەرهێناوە بۆ تێکدانی رەوشت و خووی بڵند لەناو نەتەوەکانی رۆژهەڵاتدا. مەبەستیشیان لە پێشاندانی ئەو فلیمانە بەنەتەوە رۆژهەڵاتییەکان ئەوەیە، کە لە رێگای تێکدانی رەوشت و خوویانەوە، ئەو نەتەوانە لە خەبات و تێکۆشانی نەتەوەیی بۆ ئازادی و سەربەستی و پێشکەوتنی خۆیان، دووربخەنەوە. بۆ وێنە زۆربەی ئەو فلیمانە: ئاڵۆش و خرۆشی لەشی پیاو و ژن پێشان ئەدەن بۆ پوولپەرستی و دزی و درۆزنی و ناپاکی و شەڕ و شۆڕ و جوێن و خوێن. فلیمی واش دەردەهێنن، کە بەنهێنی لە یانەکان و لە ماڵەکاندا پێشان دەدرێن. ئەوانە بەنرخێکی زۆر گران دەفرۆشرێن و بەسینەما بچووکەکانی ناوماڵ پێشان دەدرێن. ئەو فلیمانە هەر بەیەجگاری دەستبازی و داوێن پیسییەکی رووت و ئاشکرا پێشان دەدەن!...

جا کەواتە، پێویستە فلیمە خراپەکان، لە سینەماکانمان دوور بخەینەوە. لە جێی ئەوانە فیلمی زانستی و هونەری و رۆشنبیری دڵداری و پاک و بێ گەرد و مێژوویی بەکەڵک و سوود بهێنین و پێشانیان بدەین. تا نەتەوەکەمان بۆ ژیانێکی باشتر و بڵندتر و خۆشتر ئاراستە بکەین.

جا بەم بۆنەیەوە، لە پێش هەموو کەسێکدا تکا لە خاوەن سینەما بەرێزەکانمان دەکەین، کە بایەخ بەفلیمەکانیان بدەن، کە لە هەندەرانەوە دەیانهێنن. هەر فلیمێک نەتەوە ئاراستە نەکات بۆ کردەوە و رەوشتی بڵند و هەستی بەرز و پیرۆز و رۆشنبیری وەری نەگرن و پێشانی نەدەن.

سینەمای راستەقینەش، لە راستیدا، دەبێ خوێندنگایەکی ئەفلاتوونی بێ، کە لە شێوەیەکی شیرین و خۆشدا، مرۆڤ فێری زانست و هونەر و وێژە و مێژوو رەوشت و خووی بڵند و چێشکەی شارستانێتییەکی راستەقینە و پێشکەوتووانە بکات. هەروەها وریای بکاتەوە و ئاراستەیشی بکات بۆ ژیانێکی باشتر و پاکتر و بڵندتر و خۆشتر.

دوای خاوەن سینەماکان، تکا لە کاربەدەستانیش دەکەین، کە بەپێی هێز و دەسەڵاتی خۆیان، ئەوانیش بایەخ بدەن بەهەڵبژاردنی ئەو فلیمانەی کە بەکەڵکمان دێن و واتای: «ئازادی و سەربەستی و برایەتی و دیموکراتی و سۆسیالیستی و مرۆڤ دۆستی و دادپەروەری و خواناسی»مان فێر دەکەن. هەروەها لەم رووەوە سەرپەرشتیی سینەماکان، لەسەر ئەو پێڕەوییەی لەسەرەوە نووسیمان، پەیتا پەیتا بفەرموون تا

سینەماکانمان لە (ڕاپەڕینی تازەی نیشتمانی)ماندا جێگای زانستگاکانمان بۆ بگرنەوە.

ئەمەیش خواستێکە، هەروەک گرنگ و بەنرخ و بەکەڵکە بۆ نەتەوەکەمان، جێبەجێ کردنیشی ئاسانە، چ بۆ خاوەن سینەماکان و چ بۆ کاربەدەستان. فلیمی باش هەتا بڵێیت زۆرن. سەرچاوەکانی دەرهێنانیشیان هەتا بڵێیت زۆرن. هەر ئەوەندەی پێ دەوێت داوای فلیمی پاک و پوختە و بەکەڵکی دیاریکراو لە بازرگانانی فلیمەکان بکرێت!.

## پێویستە فلیمەکان بکرێن بەکوردی

ئەمەیش بەدوو شێوە جێبەجێ دەکرێت: یەکەمیان لە دامێنی فلیمەکەوە پەرچڤە (ترجمە)ی قسەکان شارەزا و هونەرمەندانی کورد، بەدەنگ قسەکانی لاسایی کەرەوەکانی بێگانە بەزمانی کوردی بڵێن. ئەوساکە هەر وەک فلیمەکە لە بنەڕەتدا بەزمانی کوردی پێک هێنرابێت وەها دەردەچێت.

لام وایە ئەگەر هەوڵ و تێکۆشینێک لەلایەن خاوەن سینەماکانەوە بدرێت و کاربەدەستانی میرییش پشتگیرییان بفەرموون ئەمە زۆر بەئاسانی پێک دێت. چونکە خاوەن فلیمەکانی بێگانە، لەسەر خواستی ئەوان، ناچار دەبن، بۆ کەڵکی خۆیان، ئەو پەرچڤانە چ بەنووسین بێت، چ بەدەنگ لە بەرامبەر هەندێک پارەی تردا جێبەجێ بکەن. بەم بۆنەیەوە بەپێویستی دەزانم دداني پێدابنێم کە خاوەن سینەماکانی (تاران) چاک دەکەن، کە هیچ فلیمێکی بێگانە پێشانی نەتەوەی ئێران نادەن، تا بەزمانی فارسی پەرچڤەی نەکەن، چ بەنووسین بێت، چ بەدەنگ. هەروەها خاوەن سینەماکانی تورکیا و عەرەبستانیش لە دامێنی فلیمە بێگانەکانەوە بەزمانەکانی خۆیان پەرچڤەی قسەکانی ناو فلیمەکانیان نووسیوە.

لە بیرم دێ، چەند ساڵێک لەمەوبەر، فلیمێکی فارسیی خۆش، کە کارەساتەکانی لە ناوچەی کوردستاندا ڕوویان دابوو، لە بەغدا و لە سلێمانی پێشان درا، لە دامێنەکەیدا بەزمانی کورد پەرچڤە کرابوو. خەڵکەکە چ بەهۆی ئەوەوە کە فلیمەکە ژیانی کوردەواریی پێشان دەدا، چ بەهۆی ئەوەوە کە پەرچڤە فلیمەکەیان بەزمانی خۆیان کە کوردییە دەخوێندەوە، بەتەماشاکردنی چیرۆکەکە گەلێک شادمان بوون. جا هەتا وامان لێ دێت، خۆمان بەزمانی کوردی فلیمی سینەمایی و دەربکەین بچینە ڕیزی نەتەوە پێشکەوتووەکانەوە بام هەر لە ئێستاوە هەوڵی بدەین فلیمە بێگانەکان، لەو ڕێگایانەوە کە لەسەرەوە پێشانمان دان، بەنووسین بێ، یان بەدەنگ، بەزمانی کوردی پەرچڤە بکرێن. تا نەتەوەکەمان کەڵک لەو فلیمانە زۆرتر وەربگرێ.

ئەمەیش (خواستێکی نەتەوەیی)مانە، چاوەڕوانی کارامەیی و مەردایەتیی خاوەن سینەماکان و پشتگیریی میری و یارمەتیی لاسایی کەرەوە و هونەرمەندەکانی خۆمانە.

## پاک و خاوێنیی سینەماکان

بۆ خوا قسە دەکەم، خاوەن سینەماکان لە پاککردنەوەی سینەماکانیاندا دریغی ناکەن. بەڵام چونکە نەتەوە یارمەتییان نادات ئەو پاکی و خاوێنییە هەر ئەوەندە دەپارێزرێت تا بینەران دێنە سینەماکانەوە ئیتر لە پاش ساتێک، داخەکەم، ئەو پاکی و خاوێنییە لە سینەماکاندا نامێنێ. هۆی ئەمەیش ئەوەیە:

ئەوانەی دێنە سینەماکانەوە بۆ تەماشاکردنی فلیمەکان، زۆربەیان لە جێگای تەماشاکردنی فلیمەکاندا جگەرە دەخۆن، ساردەمەنی دەخۆن و دەخۆنەوە، سوێرەمەنی دەخۆن؛ وەک برێشکە و دەنکە کولەکە و قەزوان و چەقالە و ناوکی گولەبەڕۆژە. کە ئەو شتانەیش دەخۆن و دەخۆنەوە، توێکڵ و قنگەجگەرە و پارچە قاقاز و چۆرە خۆشاو (شەربەت) فڕێ ئەدەنە سەرزەویی سینەماکان. کاتێک دەزانیت زەویی سینەماکە دەبێتە سەرەنوێلکێکی ناشیرین و پیس و بۆن ناخۆش، خاوەن سینەماکانیش یان نایانپەرژێت، یان بۆ یان نالوێت شەو و ڕۆژی چەند جارێک ئەردی سینەماکە پاک بکەنەوە، لەبەرئەوە ئەو پیسی و پۆخڵییە لە زۆربەی سینەماکاندا لە ماوەی شەو و ڕۆژەکەدا هەر لە جێی خۆیدا دەمێنێتەوە و تا دێت زۆرتریشی لێ دێت. جا ئەم بارە، بەڕاستی ئەمەندە نەنگ و ناپەسەند و ناهەموارە، بووەتە پەڵەیەکی گەورە بەسەر شارستانێتیمانەوە کە پێویستە هەموو کوردێکی دڵسۆز خەبات بۆ لابردنی بکات. داخەکەم، پێشاوەکانی سینەماش، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئاوی پاکیان تێدا ئامادە کراوە و لەسەر شێوەیەکی نوێیش دامەزرێنراون، کەچی بەپاکی و خاوێنییەوە ڕاناگیرێن. لەمەیشدا تاوان تاوانی خاوەن سینەما نییە، تاوانی نەتەوەیە.

چارەکردنی ئەمەیش ئاسانە: یەکێک لەلایەن خاوەن سینەماوە ڕادەگیرێت بۆ چاودێری کردن و پاراستنی پاکی و خاوێنیی ئەو پێشاو و دەسشۆرانە. لە خاکە پێشکەوتووەکاندا ئەو کەسەی بۆ ئەوێ دادەنرێت، کە پیاو لە پێشاوەکە دێتە دەرەوە و دەس و پلی خۆی بەسابوون و ئاو دەشوات، هەندێ بۆنی خۆش بەدەستیدا دەکات. ئەمیش لە پاداشی ئەوەدا چەند پوول و پارەیەکی دەداتێ، بەناوی دەستگیرۆیی ڕەنجبەرێکی هەژارەوە. جا لەو جۆرە سینەمایانەدا ئەو پێشاو و دەش شۆرانە هەموو دەم بەپاکی و خاوێنییەوە دەپارێزرێن. چونکە لەلایەکەوە ئەو کارگەرەی بۆ ئەو پێشاو و دەست شۆرانە دادەنرێت پەیتا پەیتا پاکی دەکاتەوە. لەلایەکی تریشەوە ئەوانەی دەچنە ئەوێ بۆ خۆ پاککردنەوە، پاکی و خاوێنیی ئەو شوێنە، بەشی خۆیان، دەپارێزن.

## ڕازاندنەوەی سینەماکان

ئێمە لە سەردەمێکی شۆڕشگێرانەی سۆسیالیستی و نەتەوەیی داین. ڕاپەڕیوین و دەمانەوێت وەک پێشکەوتوان پێشکەوین. کەواتە بام هۆڵەکانی سینەماکانمان بەوێنە ڕەنگینەکانی چاوئەندازە جوانەکانی کوردستان و، شوێنەوارە مێژووییە گرنگەکانی کوردستان و، گەورەپیاوانی کورد بڕازێنینەوە. لەژێر هەر وێنەیەکیشدا بەکورتی لەو چاوئەندازە بدوێین، لە بابەت ئەو شوێنەوارەوە بنووسین، لە بابەت کردەوە و کارە گەورەکانی پیاوە گەورەکانیشمانەوە بنووسین لەگەڵ ڕۆژی لەدایکبوون و مردنیاندا. تا نەتەوەکەمان خۆی بناسێ و نەتەوەکانی جیهانیش بیناسن. هەروەها تا نەتەوەکەمان بەو چاوئەنداز و شوێنەوار و گەورەپیاوانەی خۆیەوە بنازێ و چاویشیان لێ بکات لە چاکەکاریدا.

بەکورتی ئەگەر خاوەن سینەماکان خەم بخۆن و کاربەدەستانی سەرپەرشتییان بکەن و هونەرمەندەکانیشمان یارمەتییان بدەن، سینەماکانمان، لەم بارە ناشیرینەی ئێستایانەوە دەگۆڕرێن و دەبنە ناوازگاهانی وەها کە نەتەوەکەمان و شارەکانمان شانازییان پێوە بکەن.

## پاراستنی ڕەوشتی گشتی

زۆر جاری وا هەیە، منالی ساوا و منالە وردکە دەهێنرێنە سینەما. بەدەنگە دەنگ و قاووقیژ و فیکەفیک ئارام و سرەوتی تەماشاکارانی فلیمەکە تێک دەدەن. جاری واش هەیە تف و چڵم و بابەتانی تر فڕێ دەدرێنە سەر زەوی سینەماکە. هەندێ جاریش گەنجی وا دەبینیت شەرم لە خۆی ناکات هەردوو قاچی دەخاتە سەر سەرووی تەختەکەی پێش دەمی خۆی. زۆری نامێنێت پێڵاوەکانی لە شانی دانیشتووانی پێش دەمی خۆی بکەوێت. هەروەها بۆگەنی گۆرەویی نەشۆراو و قاچ و قۆڵ و بن باخەڵ و ناودەمی هەندێکیش کە تازە لە پیاز و سیر خواردن بوونەتەوە دانیشتووانی ناو سینەماکە ئازار ئەدەن و وەڕس ئەکەن و دەیانخاتە بێ ئارامییەوە.

چارەکردنی ئەمەیش ئاسانە: دیسانەوە بەهۆی کارگوزاری و هاریکاری خاوەن سینەما و شارەوانی و باڵباز و دادگاوە قەڵاچۆ لەم جۆرە ڕەوشت و خووە پیس و ناپەسەندە دەتوانرێ بکرێت. هەر بۆ ماوەیەک و چەند جارێک جەزرەبە بگەیێنرێت بەو جۆرە کەسانە کە سرەوتی گشتی لەناو سینماکاندا تێک دەدەن، لەگەڵ چاوگێڕی (مراقب)یەکی هەموو دەمیدا، بەرە بەرە ئەو جۆرە ڕەوشت و خووە ناهەموارانە کەم دەبنەوە و لەناودا نامێنن.

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا گەلێک سینەمام دیوە. لە ڕووی خۆشی و ڕازاوەیی و پاک و خاوێنی و بێ دەنگ و سەنگییەوە، سینەماکانی بێرووتم لە هەموویان باشتر هاتۆتە پێش چاو. بەڕاستی شاری بێرووت مافی هەیە، لەو ڕووانەوە، نەک لە ڕووی فلیمەکانەوە، شانازی بەسینەماکانی خۆیەوە بکات.

## وشەی دوایی بۆ نەتەوەیی:

ئینجا ئەی نەتەوەی کوردی بەڕێز، هەر وەک لە هەندێک ڕووەوە کردەوە و ڕەوشتی وا جوان و بڵندت هەیە، لەناو نەتەوەکانی جیهاندا بەدانسقە دەیگێڕنەوە: وەک ئازایی و میوانداری و دڵپاکی و دۆستایەتی. تکایە بام لە ڕووی ڕاگرتنی پاک و خاوێنی و ڕازاوەیی و ڕێک و پێکیی ناو ساختمانی سینەماکانیشتەوە و، بێ دەنگ و سەنگی و کردەوە پەسەندیی تەماشاکەرانی فلیمەکانیشتەوە و، ناوازەیی و بەکەڵکی فلیمەکانی سینەماکانیشتەوە، ناوبانگت بەچاکی لە جیهاندا دەربکەیت.

ئێمڕۆ سەردەمی دیموکراتی و سۆسیالیستییە. هەر ڕوو بکەیتە خودا و ڕێگای ڕاست بگریتەبەر. هەر مەردانە تێ بکۆشیت و خەبات بکەیت، هەموو کارێکی چاکت بۆ دەچێتە سەر. گۆڕین و گەشەکردنیش بەسینەماکانت، کە بیانگەیێنیتە ڕیزی زانستگایان بۆ هەمووان، کارێکی پێشکەوتن خوازانەیە و بەرەو پێشکەوتنت دەبات. ئەمەیش تاقی کردنەوەیەکە بۆ خۆت، کە شارستانێتییەکی ڕاستەقینەی خۆت دەخەیتە پێش چاوی جیهان. جا هیوادارم کە ئەمەیش و لەمە گەورەتریشت لە دەست بێت. پێشینان گوتوویانە: «دەست لە دەس و هێز لە خودا»!...[1]

(١) بەیان – گ: دەزگای هاوکاری بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی – بەغدا، ژ (٢٩) ئەیلوولی ١٩٧٥.

## چاوپێکەوتنێک

اتحاد الادباء الاکراد
بغداد السعدون ١/٢/٥٠
ت: ٦٣٨٧٩
التاریخ: ١٩٧٢/١٢/١١

مامۆستای خۆشەویست

پاش هەواڵ پرسینێکی گەرم و ئاواتی تەندروستیتان.

بێ گومان لە مەیدانی چیرۆکنووسیدا یەکێکی لە پێشڕەوان، ئێمەیش بۆ ئەوەی مێژووی داهاتنی چیرۆکی کوردیمان بۆ روون بێتەوە و بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی دەسمایەیەکمان لا هەبێت، وامان بەچاک زانی چەند پرسیارێکتان بخەینە بەردەم، هیواداریین ئەگەر دەستتان پەرژا وەڵامی تەواومان بدەنەوە تا لە ژمارەی داهاتووی گۆڤاری نووسەری کورددا بڵاوی بکەینەوە.

١- تکایە کەمێک باسی بیرەوەری دەوری چیرۆکنووسیمان بۆ بکەیت، ئەوەی پاڵی پێوەنان سەر بەم دەرگەیەدا بکەن.

٢- دەربارەی ئاگاداریتان بەسەر چیرۆکنووسە کوردە هاوتەمەن و هاوچەرخەکانتان و پێش خۆتان، کەمێ زانیاری لەم رووەوە.

٣- ئایا چیرۆک نووسین لای ئێوەی بەڕێز هەر ئەنجامی بەهرە یا خولیایەکی ئەدەبی بوو یا بارێکی تایبەت چ کۆمەڵایەتی چ رۆشنبیری چ بیروباوەڕ وای کرد ئەوەی لە دڵتانە بەچیرۆک دای ڕێژن؟

٤- چ بار و زەمینەیەکی تایبەتی بووە هۆی دوورکەوتنەوەتان لە مەیدانی چیرۆکنووسیندا... لە کاتێکدا -تا ئێستاش-هیوامان بوو هیوامانە نەک هەر کورتە چیرۆک بەڵکو ڕۆمان و چیرۆکی درێژیش بنووسن.

٥- بەڕوانینێکی ڕەخنە گرانەوە بەلای ئێوە چیرۆکی کوردی بەچەند دەوریان قۆناغدا تێ پەڕیوە، چ لە بابەت شێوەوە چ لە بابەت ناوەڕۆکەوە و ئەمرۆ چیرۆکی تازە چۆن ئەبینن؟

تێبینی: مامۆستا گیان، سەربەستن وەڵامەکە پڕ بەپڕی پرسیارەکانمان بێت یان تاک تاک، یان هەرچۆنێکی ئێوە بەباشی ئەزانن. تکایشمان وایە وەڵامی جەنابتان وەکو دەڵێن: (بەبوون و نەبوون) کەمێ زوو پێمان بگاتەوە.

لە جیاتی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری
(نووسەری کورد) دڵسۆزتان
عەبدولڕەزاق بیمار

لە پەراوێزی نامەکەدا مامۆستا ئەمەی نووسیوە:

دوێنێ هات... ئیمڕۆ وەرامی درایەوە.

شاکر ١٩٧٢/١٢/٢١

ئەمەش وەڵامەکانی مامۆستایە وەک لە گۆڤاری نووسەری کورددا بڵاو کراوەتەوە:

**«من وازم لە چیرۆک نووسین نەهێناوە»**

* ئەوەی پاڵی پێوە نام بۆ چیرۆک نووسین، ڕۆشن کردنەوەی بیری نەتەوە و وریاکردنەوەی و ئاراستەکردنی بوو بۆ خەباتکردن لەپێناو پێشخستنی خۆیدا. لە پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر و دۆزینەوەی دەردەکانی (کوردەواری) و هۆی ئەو دەردانە و چۆنێتی چارەکردنیان، بڕیارم دا ئەو بیروباوەڕانەی هەم بوون، لە چەند چیرۆکێکی دیاریکراودا، لە شێوەیەکی سووک و ئاسان و ڕەواندا دایان بڕێژم و پێشکەشی خوێندەوارانیان بکەم.

یەکەم چیرۆکیان (بەهەشتی ژین) بوو لە ساڵی ١٩٣٤دا بڵاو کرایەوە، ئەوانی تریشیان لە ساڵی ١٩٤٧و پاشتردا بڵاوکرانەوە.

* چیرۆکی (لە خەوما) کە هی خوالێخۆشبوو (جمیل صائب) بوو لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ژیانەوە)دا کە لە ساڵەکانی ١٩٢٥ و پاشتردا دەرئەچوون کارێکی تەواوی کردە سەر دڵ و هۆشم. هەروەها چیرۆکی (پێشمەرگە)ی (دکتۆر رحیمی قاضی)یش کە لە ساڵی ١٩٦٠دا دەرچوو زۆر بەدڵم بوو بەڵام لە هەردووکیان گرنگتر چیرۆکی (مەم و زین)ی (احمدی خانی) بوو کە تا ئێستاکەیش کار لە بیر و هۆش و دڵ و دەروونم دەکات.

* بەلای منەوە (چیرۆک): هۆیەک بوو لەو هۆیانەی کە واتاکانی (مرۆڤایەتی) و (نەتەوایەتی) و (خواناسی) و (نیشتمانپەروەری) و (دیموکراتی) و (دادپەروەری) و (ڕاستی) و (دروستی) و (ژیانێکی پڕ لە ئازادی و کامەرانی)م پێ ڕۆشن ئەکردەوە بۆ (کوردەواری). بۆ ئەمەی وریایان بکەمەوە و بیان خەمە سەر ڕێگای (پێشکەوتن) و ژیانێکی باشتر.

* من تا ئێستاکەیش وازم لە چیرۆک نووسین نەهێناوە. هێشتا گەلێک چیرۆکم ماوە بڵاوم نەکردوونەتەوە. چاوەڕوانی کاتی خۆیان ئەکەم تا بڵاویان بکەمەوە. ئەوەندە هەیە، بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەوارییەکی بەکەڵک و کاریگەر لە زووترین کاتدا بۆ (نوێ - خوێندەوار)ەکان ئەمەم بەچاکتر زانی کە بایەخ بدەم بە(وتار) و (نووسراوی) زانستی و هونەری و وێژەیی. تا لە ماوەیەکی کەمدا نووسراوخانەیەکی (١٣٥) نووسراوی کوردی لە بەرهەمەکانی خۆم و ئەوانەی کە کردوومن بەکوردی بۆ (لاوە خوێندەوارەکان) پێک بهێنم. ئەمە ئاواتی هەرە کۆنم بوو، کە ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٨ کە ئەو دەمە تەمەنم ٣٤ ساڵان بوو. تا ئێستا هەر ئەوەندەم توانیوە کە (٢٤) نووسراویان لێ لە چاپ بدەم، هیوادارم بەخوا کە بتوانم ئەوانی تریش، بەرەبەرە، لە ساڵانی داهاتوودا، لە چاپ بدەم. ئێستا کە ئەوەم ناو ناوە: (پرۆژەی خوێندەواری کورد) کە ئەو (١٣٥) نووسراوەی تیا دانراوە، هەندێکی بەچاپکراوی و زۆریشی بە(دەس نووس).

جا لەناو ئەم نووسراوانەدا کە بریتین لە ١٨ زنجیرە، زنجیرەیەکی تەرخان کراوە بۆ چیرۆک کە بریتییە لە چەند نووسراوێک، کە هەندێکیان چیرۆکەکانی خۆمیان تیایە و هەندێکیشیان تەرخان کراون بۆ

چیرۆکی ژیانی (گەورەپیاوان) لە هەموو لایەکی (جیهان)دا، کە مێژوویەکن لە شێوەی چیرۆکدا. ئەگەر دەرفەتێکیشم دەستکەوت بۆم لووا دوور نییە (چیرۆکی درێژ)یش دابنێم بەڵکو ئەو هیوا و ئاواتەتان بهێنمەدی.

* زۆربەی چیرۆکە کۆنەکانمان بەهۆنراوە دانراون. کەمێکیشیان بەهۆنراوە و پەخشان، یاخود بەهۆنراوەی پەخشان دانراون، بابەتەکانیان بەزۆری: دڵداری و خواناسی و مێژوویی و شەڕ و شۆڕن. وەک (مەم و زین)ی کۆن و (ئەسپی ڕەش) و (یوسف و زولەیخا) و (دمدم) و (بەهنەسا) و (شیرین و فەرهاد). کەمێکیشیان تێکەڵن لە دڵداری و نیشتمانپەروەری، وەک (مەم و زین)ەکەی ئەحمەدی خانی کە لەسەر شێوەیەکی نوێ و ناوازە نزیکەی ٣٠٠ ساڵێک پتر لەمەوپێش دایناوە.

بەڵام لەم سەدەی بیستەمەدا، چیرۆکی کوردی زۆربەیان بەپەخشان دانراون. کەمێکیان بەهۆنراوە. ئەمانە زۆرتر لە دەردەکانی کۆمەڵایەتی و چارەکردنیان ئەدوێن. ئامانجیان پێشکەوتنی کوردەوارییە. چیرۆکەکانی کۆن هی سەردەمی ژیانی (زەویداری) و پاشکەوتوویی گەلەکەمانە، کە بۆ ئەو سەردەمە دەستی داوە، زۆرتر بۆ کات پێ ڕابواردن دانراون بۆ چینی باڵا بەکار ئەهاتن.

بەڵام چیرۆکەکانی ئەم سەدەی بیستەمە بۆ وریاکردنەوەی (کوردەواری) و ئاراستەکردنی بۆ ژیانێکی پاکتر و خۆشتر و چاکتر دانراون، هەموو چینەکانی نەتەوەکەمان کەڵکیان لێ وەرئەگرن. هەیە، چیرۆکە تازەکانی ئەمڕۆ هەرچەندە لە (ئامانج) و بیروباوەڕدا زۆر ناوازە و بڵندن، بەڵام لە شێوەی داڕشتندا، نەگەیشتوونەتە ئەندازەی خۆیان. بەواتایەکی تر پێویستە برا نووسەرەکانمان زۆرتر بایەخ بدەن بەچیرۆکەکانیان تا زۆرتر کەڵک ببەخشن بەخوێندەواران، زۆرتریش کار لە دڵیان بکەن.

شاکر فەتاح

١٩٧٢/١٢/٢١

(نووسەری کورد – گ: یەکێتی نووسەرانی کورد، خولی یەکەم ژ – ٧ نەورۆزی ١٩٧٣ بەغدا)

# هاجی قادری کۆیی

نووسراوێکە:

میژووی ژیانی بوێژی بەناوبانگ و مامۆستای نیشتمانپەروەری کوردان،

حاجی قادری کۆیی پێشان ئەدات، لەگەڵ وێژەکەیدا

## ئەم نووسراوە

(حاجی قادری کۆیی)، لە سەدەی نۆزدەهەمدا ژیا، کە پڕی بوو لە کارەساتی گەورە گەورە و، گۆڕانی گەورە گەورە و، داهێنان و دۆزینەوە و، گڕسەندنی گیانی نیشتمانپەروەری و گەلپەروەری، لە ئەندازەیەکی گەورە و فراواندا، کە هەموو جیهانی گرتبووەوە. هەروەها پڕی بوو لە شەڕ و شۆڕ و زەبر و زەنگ و داگیرکەری. لە هەموو لایەکیشەوە خەبات و شۆڕش لە ئارادا بوون بۆ دەستکەوتنەوەی ئازادی و سەربەستی... (حاجی) لە مزگەوتەکانی کوردستاندا پێ گەیشت. هەرچەندە لە خێزانێکی هەژار و بێ کەس لەدایک بوو بوو، بەڵام ئاغاکانی کۆیە داڵڵایان بەخۆی و دایکیدا بوو، بەهەتیوی لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە، لەژێر سێبەری ئەواندا گەورە بوو. لەناو جەرگەی چینی ڕەنجبەر و هەژار و چەوساوەیشدا ماوەیەکی درێژ ژیا و ڕای بوارد و تێکەڵیی کرد. لەمانە و لە حەیاتی خۆیەوە و، لە ئەرک و ئازاری ژیانیەوە کەڵکێکی زۆری وەرگرت. پێ گەیشت و هاتەوە (کۆیە). لەوێدا (مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە) و (حەمە ئاغای کۆیە) و (کەیفی) هاودەم و هاوڕازی بوون. خۆشیان ڕائەبوارد. لەبەر زیرەکی و بلیمەتی و دڵ ناسکیی خۆی. لەبەر خواناسی و نیازپاکی خۆی، هەستی بەچاکی و خراپی زوو ئەکرد. هەر لەو کاتەدا، کە لەبەر چاکەی گشتییان، ستایشی ئەو هاوڕێیانەی و (ئەمین ئاغای کۆیە)ی دەکرد، بەرەنگاریی (شێخ) و (مەلا) و (فەرمانبەر) و (دەوڵەمەند) و (لاوە) خراپەکانیشی دەکرد، لەسەر کەمتەرخەمی و زۆرداری و چەواشەکاری و بەدخووییان. (شێخ نەبی) یەکێک بوو لەو شێخانە، کە ئەویش بەخۆی و دەروێش و مەلاکان و هاوڕێکانیەوە بەرەنگاریی (حاجی قادر)ی ئەکرد.

(حاجی) چونکە زمان تیژ بوو و، ڕاستەوڕاست، بەئاشکرا، لە دوژمنانی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی توانج و پلاری ئەگرت، ئەندازەیەک توانییان بیپارێزن، ئیتر لە وزەیاندا نەمابوو. (حاجی) تەواو تەنگەتاو بووبوو. دوایی ناچارما، ڕەوی کرد بۆ (کەرکووک) و لەوێشەوە بۆ (هەولێر). کە لەگەڵ (کەیفی) بوو یەکیان گرت و لە ڕەواندزەوە ڕۆیشتن بەکوردستاندا تا گەیشتنە (ئەستەمووڵ)، کە ئەو سەردەمە جێگای زۆروستەمی فەرمانڕەوایی تورک و، مەڵبەندی شۆڕشگێڕان و ڕۆشنبیرانی نەتەوە چەوساوەکان بوو. (حاجی) چ لە تێکەڵیدا لەگەڵ زانایان و ڕۆشنبیران و نیشتمانپەروەرانی کورد لەو شارانەی کوردستان و ئەستەمووڵدا، چ بەهۆی زەبر و زەنگ و بەدخوویی فەرمانڕەوایی تورک و ئێرانەوە لەناو کوردستاندا، چ بەهۆی خوێندنەوەی نووسراو و ڕۆژنامانی جیهانیی ئەو سەردەمەوە، کە بەعەرەبی و فارسی و تورکی دەرئەچوون، تا ئەهات بیری ڕۆشنتر ئەبووەوە و، هەستی نەتەوایەتیشی بەهێزتر و بەکارتری لێ ئەهات. بێ گومان دامەزراندنی ئەویش بەمامۆستایەک بۆ کوڕەکانی (بەدرخان پاشا)

میرانی (جزیر و بۆتان)، کە ئەوانیش لە (ئەستەمووڵ)دا ئاوارەبوون و، تێکەڵبوونی بەو بنەماڵەیە، کارێکی گەورەی کردۆتە سەر دڵ و دەروونی (حاجی)، لە ڕووی کوردپەروەرییەوە، کە هەتا مرد هەموو هێز و توانایەکی خۆی بۆ ڕۆشنکردنەوەی مێشکی هاونیشتمانەکانی خۆی و، ئاراستەکردنیان بۆ خەبات و تێکۆشان، بۆ ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان و پێشکەوتنی نەتەوەی کورد تەرخان کرد.

لە هۆنراوەکانی (حاجی قادر)دا، بەشی هەرە ناوازە و گرنگی ئەوانەیە کە لە بابەت نیشتمانپەروەری و گەلپەروەری و کۆمەلایەتییەوە دایناون. بەشەکانی تری هۆنراوەکانی لەسەر شێوەی کۆن دایناون، چ لە ڕووی ناوەرۆک و، چ لە ڕووی کێش و سەروا و، دارشتن و بیروباوەڕەوە، چ لە ڕووی وشە و زمانەوە، ئەمانە زۆرتر لە هۆنراوەکانی (نالی) و (کوردی) ئەکەن، لە هونەری هۆنراوە داناندا. هەرچەندە لە پێش (حاجی قادر)یشدا زۆر کەس هۆنراوەی نیشتمانی و کۆمەلایەتیی داناوە، وەک (خانی) و (سالم) و (نالی) و (کوردی)، بەلام هۆنراوەکانی (حاجی) سنووریان فراوانترە، بابەتیان زۆرترە، واتایان پڕ ترە. واتا هەموو کەم و کوڕییەکی کۆمەلایەتی و زرنگکاریمانیان گرتۆتەوە. بابەتەکانیان تەڕ و تازەن، نایاب و ناوازە، هێشتا نەگوتراون. زۆربەشیان سووک و ئاسانن بۆ تێگیشتن. ئەو چامانەی کە لە بابەت: (بەهاری کوردستان) و (مێژووی کوردستان) و... (مێژووی وێژەی کوردی) و (پاراستنی کوردستان)ەوە نووسیونی، لە شاکارەکانی حاجی دەژمێررێن، کە هیچ بوێژێکی کورد لە پێش ئەوەوە بەو جۆرە و بەو شێوە پڕ سۆزە لێیان نەدواوە.

بێجگە لەوە (حاجی) لە بابەت شێخ و مەلا و دەوڵەمەند و فەرمانبەر و لاوەکانیشەوە بابەتی تازە و ناوازەی نووسیوە، کە کەس لە پێش ئەوەوە بەو جۆرە و بەو شێوەیەی نەگوتووە.

ئەوەندە هەیە ئەمیش وەک بوێژەکانی ئەو سەردەمە، گەلێک وشەی بێگانەی ناخۆش و ناشیرینی بەکارهێناوە، کە بۆ چێشکەی خوێندەوارانی کوردی ئیمڕۆ دەست نادەن...

هەروەها هەندێ ڕستەیشی هەیە، ئاسان نین بۆ تێگەیشتنی هەموو خوێندەوارێک...

بەهۆی دەستاودەست کەوتنی هۆنراوەکانیشەوە هەڵە و کەم و کوڕی لە هەندێکیاندا پەیدا بووە...

ئەمانە، مەگەر، لەدوا ڕۆژێکا، لەلایەن لێژنەیەکی زانا و وێژەوانانی شارەزای کوردەوە، بتوانرێ ڕاست بکرێنەوە...

(حاجی) تا ما ژنی نەهێنا. بەتەنگ خۆیەوە نەبوو. بەتەنگ گشتەوە بوو. دوایین قسەی ئەوە بوو کە (عەبدلڕەزاق بەگی بەدرخان) نووسراوە نایابەکەی: (غیرەتی ملی) بۆ چاپ بکات بەلام چونکە ڕەهەندەی دەستی زۆرداری ناوخۆ و بێگانە بوو، لە ئاوارەییدا مرد. نە سامان، نە خانوو، نە ژن و ماڵ و مناڵ، هیچی لە پاش بەجێ نەما. هەر تەنیا هۆنراوەکانی لێ بەجێ ما. کە هەروەک خۆی ئەڵێ، لە جێی کوڕ و کچ و کەسوکاری بوون... بەلام ئەوەی کە ماوەتەوە لە هۆنراوەکانی، هەروەک مێژووی ژیانی (حاجی) خۆی، تا جیهان مابێ، وەک مامۆستایەکی زانا و وێژەوان و هونەرمەند، واتای نیشتمانپەروەری و گەلپەروەری و خواناسیمان فێر ئەکەن. هەروەها ئاراستەیشمان ئەکەن بۆ خەبات کردنێکی بێ وچان لەپێناو کامەرانی و پێشکەوتنی کوردا.

بەڕاستی گەنجینەیەکی ویژەیین، کە (حاجی) پێشکەشی نەتەوەی کوردی کردووە، کە تا ئەمێنێ کەڵکی لێ وەرئەگرێ.

منیش کە ئەم نووسراوەم داناوە هەر بەو نیازەم داناوە کە کەسایەتیی (حاجی قادری کۆیی) و ویژەکەی بەشەنگ و شۆخی و بەرجەستەییەوە پێشانی خوێندەوارانی کورد بدەم. هیوام بەخوا وایە کە ڕەنجەکەم بەخۆڕایی نەڕۆشتبێ و تیا سەرکەوتبم. هەروەها لە خوایشم ئەوێ کە ئەو خوێندەوارانە (حاجی)ی خوێندەوار و مەرد و دلێری نیشتمانی بکەن بەنموونەیەک بۆ خۆیان و... چاوی لێ بکەن.

شاکر فەتاح

سلێمانی: ١٩٧٢/٢/١٦

## پێگەیشتنی حاجی قادری کۆیی

ناوی (قادر) و کوڕی (محەمەد)ە و دایکیشی ناوی (فاتیمە)یە. لە ساڵی ١٨١٥دا لە دێی (گۆڕ قەرەج) کە لە نزیک شاری (کۆیە)وەیە لەدایک بووە. لە ساڵی ١٨٩٨دا چۆتەوە لای خوای خۆی. کە باوکی مردووە، (حاجی قادر) هێشتا مناڵ بووە. لە باوکیەوە کەلەپووری هەتیوی و هەژاری بۆ بەجێ ماوە لەتاو برسێتی دایکی ئەیهێنێ بۆ (کۆیە). بەیارمەتیی ئاغاکانی کۆیەوە لە حەوت ساڵیدا ئەیخاتە بەر خوێندن. پاش ئەوە لە مزگەوتەکانی (کۆیە) و (خۆشناوەتی) و (ڕەواندز) و (هەولێر) و (کەرکووک) و (سلێمانی) و (سەردەشت) و (سابڵاخ) و (شنۆ)دا خوێندنی ئەوساکەی تەواو کردووە.

ئاغاکانی (کۆیە) لە پێگەیاندنی (حاجی قادر)دا و پشتیوان کردنیدا دەستیان هەبووە. بەڵام شێخەکانی بەپێچەوانەی ئەوانەوە دوژمنایەتییان لەگەڵ حاجی قادردا نوواندووە. (حاجی قادر) هاوچەرخ و هاوڕێی گەلێک مەلای کوردستان بووە، وەک (حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە)ی کۆیی و (کەیفی)ی جوانڕۆیی و (نالی)ی شارەزووری و (کوردی)ی سلێمانی. تا خوێندنی تەواو کردووە و بووە بەمەلا، زۆربەی ناوچە گەورەکانی کوردستان... گەڕاوە و تێکەڵ بەزانایان و گەورەپیاوانی کوردستان و ویژەوانان بووە و لێیانەوە شارەزای ویژە و مێژووی کورد و باری ڕۆژگارەکەی کوردستان بووە. هەروەها شارەزای کارەساتی جیهانیش بووە. (حاجی) بلیمەتێک بوو بۆ خۆی. هۆگری تێگەیشتن و پێگەیشتن بووە. دوایی گەڕایەوە (کۆیە)، بۆ ئەمەی لەوێدا و لەوێوە (نامە)کەی خۆی بەجێ بگەیێنێ و، ئەو ئاواتەی لە دڵیایە بۆ پێشخستنی کورد و ئاواکردنەوەی کورستان خەباتی بۆ بکات و بیهێنێتەدی.

## هەڵدێ بۆ ئەستەموول

هەژاری و بێ نەوایی و هەتیوی، بۆ (حاجی قادر) بوونە مامۆستا و پێیان گەیاند، سەرگەردانیی کوردەوارییەکەیش بەدەست داگیرکەرانی (ڕۆم و عەجەم)ەوە، مامۆستایەکی تر بوو بۆ (حاجی قادر) کە لە نەتەوەی خۆی نزیک بخاتەوە و، خۆشەویستی و دڵسۆزی و خۆبەخت کردنیشی فێر بکات و بیانخاتە دڵیەوە بەرامبەر (کورد) و (کوردستان). (حاجی قادر)، وەک دەرئەکەوێ، خۆی بەها و ئازار و هاوار و ئاواتی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی دادەنێ. بۆیەکا بەشەو و بەڕۆژ، بیروباوەڕی کوردایەتی بوو بوونە

هاودەم و هاوڕێی (حاجی)ی لاو لە (کۆیە)دا. هەروەها (حاجی) نیشتمانپەروەری و گەل پەروەرییەکەی لە (خواناسی)یەکەیەوە فێر بووبوو. جا ئەو لاوە پێگەیشتووە تێگەیشتووە کە لەو سەردەمەدا بوو بووە هاودەمی (کەیفی) و (حەمە ئاغای کۆیە) و (حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە)، چ بەوتار، چ بەزار، چ بەهۆنراوە، هوروژمی ئەبردە سەر ئەو کەسانەی کە فەرمانی سەرشانی خۆیان بەجێ نەئەهێنا بەرامبەر خوا و نیشتمان و نەتەوەکەیان. یاخود ناپاکییان لەگەڵ کوردا ئەکرد. توانج و پلارەکانی (حاجی)یش زۆرتر هەندێک لە (شێخ)ەکان و زۆربەی (فەرمانبەر)ەکانی ئەو سەردەمەی (کۆیە)ی دەگرتەوە. (حاجی) تافی کوڕێنی لە کۆیەدا بەو جۆرە بەرەنگاری کردنەوە ڕابوارد. بەڵام کاتەکەی ناساز بوو. فەرمانڕەواییەکی زۆردار و دەسەلاتدارانێکی بەدکردار هەبوون لە گۆڕێدا. ئەو شێخ و فەرمانبەرانە بوون بەدوژمنی و تەنگەتاویان کرد. ئاغاکانی کۆیە نەیانتوانی لەوە بەولاوە بیپارێزن. (کەیفی)ی هاوڕێیشی کە هەروەک خۆی بلیمەت و وریا بوو، لەبەر ئەوەی هوروژمی ئەبردە سەر ئاغاکانی کۆیە کە پشتی (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)یان ئەگرت، کە دوژمنێکی بوو، ئەویش هەروەها بەدەست ئەو ئاغایانەوە تەنگەتاو بووبوو: بەبیانووی دڵدارییەکەیەوە، لەگەڵ (هەیبەتی ئایشۆکێ)دا، لێیان هەڵپێچابوو، خەریک بوون ئازاری بدەن.

(کەیفی) پێش (حاجی) خۆی دەرباز کرد. چوو بۆ هەولێر. ئەم جیابوونەوەیەی (کەیفی) زۆر کاری لە دڵی (حاجی) کرد. زۆری پێ نەچوو، (حاجی)یش بەناچاری هەڵ هات و لە (کۆیە) دەرباز بوو. خۆی گەیاندە هاوڕێ خۆشەویستەکەی خۆی، (کەیفی). پاش ماوەیەک هەردوو لا و بەجووتە، بەناو دۆڵی (خۆشناوەتی)دا، خۆیان گەیاندە (ڕەواندز) و لەوێیشەوە بەناو هۆزی (حەیدەرانی)دا تێپەڕیان کرد بۆ (ئەستەموڵ) و خۆیان خستە پەنای (بەدرخانییەکان). ئەو کاتە ساڵی ١٨٥٤ بوو. (بەدرخانی)یەکانیش کە ئەو سەردەمە بەپێشەوای کوردایەتی دائەنران، لە شێوەیەکی زۆر جواندا (حاجی) و (کەیفی)یان داڵلادا. (حاجی)یان کردە مامۆستای تایبەتیی (کوڕەکانی بەدرخان پاشا) و، (کەیفی)یشیان خستە (زانستگای ماف)ەوە لە ئەستەموڵدا. تا ئەم دەمە، (حاجی) بەچاوی خۆی زۆروستەمی بێ ئەندازەی (تورکە عوسمانییەکان)ی چەند جارێک دیتبوو. لەبەر ئەو نیشتمانپەروەرییەکەی خۆی پاڵی پێوەنابوو، بچێتە لای ئەوان... چونکە شۆڕشی (بەدرخانییەکان) کە لە ساڵی (١٨٤٣)دا بەرپا بووبوو، بەشۆڕشێکی هەرە گەورەی نیشتمانی و ڕۆشنبیرانە دائەنرێ کە بۆ ڕزگارکردنی کورد و کوردستان کراوە، لە دەست داگیرکەرانی (عوسمانی) و بۆ دامەزراندنی فەرمانڕەواییەکی سەربەست و سەربەخۆ و ئازاد و دیموکراتی و دادپەرست و پێشکەوتوو لە کوردستاندا... بێ گومان (حاجی) بۆیەکا چۆتە لای (بەدرخانییەکان) تا ببێتە هاوکار و هاوخەبات یان لە کۆڕی نیشتمانپەروەریدا بۆ کەڵکی کورد و کوردستان. تا ئەو ئاواتانەی کە ساڵانی ساڵ لە دڵیا بوون، بیان هێنێتەدی و بەچاوی خۆی کوردەوارییەکی ئازاد و کوردستانێکی ئاوەدان ببینێ. ئەگینا ئەگەر هەر بۆ کەڵکی تایبەتیی خۆی بوایە، (حاجی)، پێویستی بەو ئەرک و ماندووبوونە نەبوو بیکات. چونکە بێ کەس و بێ سەر و سامان بوو، لە هەر شوێنێکدا بووایە ئەحەوایەوە.

## حاجییەکی حەج نەکردوو!

لە زۆر کەس وایە (حاجی قادر) حەجی کردووە، بۆیەکا ناوی خۆی ناوە (حاجی). کەچی لە ڕاستیدا، هەر لە تافی کورێتنییەوە نازناوی (حاجی)ی لە هۆنراوەکانیا بەکارهێناوە!. وەک لە دانیشتوانی (کۆیە)یش بیستراوە، ئەبێ (حاجی قادر) لە مانگی (حاجییان)دا لەدایک بووبێ، بۆیە لەسەر ڕەوشتی باوی ئەو سەردەمەی کوردستان نازناوێکی بۆ دانراوە و هەر لە منالییەوە ناونراوە (حاجی)... ئەگینا بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە کە (حاجی قادر) حەجی کردبێ!... لەگەڵ ئەمەیشا لە تاکە هۆنراوەیەکیا ئەمە دەردەخات کە بۆ ئەمەی پیاو بتوانێ هەست بەئاسایش و ئارام و سرەوت بکات، هیچ چارە نییە ئەوە نەبێ کە یان بچێتە شاری (مەدینە) یاخود شاری (مەکە):

«منزلی مامن نەماوە ئێستەکە ئایامەکە
راحتی ممکن نییە، نەچیتە(مدینە)یان(مکە)!»

جا ئەگەر، (حاجی قادر)، لەگەڵ هەژاری و دەستکورتیشیا، بۆی لوابێ، لەسەر ئەرکی کەسێکی تر چووبێ بۆ (حەج)، ئەوە پاش ئەوەبوو، کە سالانی ساڵ بووە، هەر لە تافی کورێتنییەوە، نازناوی (حاجی)ی بەکارهێناوە لە پێش (حەج) کردنیا!...

## ڕەوشت و سروشتی حاجی قادر

داخەکەم لە بابەت ژیانی تایبەتیی (حاجی)یەوە، زانینێکی تێروپڕمان دەست نەکەوت. بەواتەی ئەم و ئەو کەلەکۆیەدا بیستراوە هەروەها لە هۆنراوەکانی خۆیەوە تێ ئەگەین کە پیاوێکی چست و چالاک و زیرەک و ئازا و نەبەرد بووە. سەر و چاو جوان و قسەخۆش بووە. لە بەژن و بالادا مام ناوەندی، لووتێکی ڕاست و دوو چاوی گەورە و گەشی پێوە بووە. پیاوێکی گەنم ڕەنگ بووە. توندوتیژ بووە. دڵ ناسک بووە. زوو هەڵچووە. ڕەپ و ڕاست هەموو قسەیەکی دڵی خۆی کردووە. دڵپاکیش بووە. کە دڵنەوایی کراوە زوو ئاشت بۆتەوە. پیاوێکی دەروون ئازاد بووە. لە پێناوی قسەی ڕەوا و ڕاستدا، خۆی لە کەس نەکردۆتەوە. دڵسۆزی ڕاستی و دروستی بووە. ئامادە بووە کە لەسەر ڕاستی و دادپەروەری، یەخەی هەموو زۆردارێک بگرێ، هەموو خەباتێکیش بکات. باکیشی نەبووە لە ئەنجامی کارەکانی. ئەگەر سەر و سامانیشی لە پێناو ئامانجەکانیا دابنایە، کۆڵی نەئەدا و ورەیشی بەر نەئەدا. ئەمە لەوێ و کەچی لەسەرێکی تریشەوە خەمی خۆی نەخواردووە. بەتەنگ کەڵکی تایبەتیی خۆیەوە نەبووە. جا ئەمەتا ڕازی ئەوەی کە (حاجی قادری کۆیی) تا مردووە نە ژنی هێناوە و نە ماڵی پێکەوەناوە و نە منال و سامانیشی لە پاش بەجێ ماوە. چونکە هەرچی هێز و توانایەکی هەبوو، بۆ گەیشتن بەئامانجە پیرۆز و بەرزەکانی خۆی بەخت کردووە، کە ئەویش ڕزگارکردنی کورد و کوردستان بووە لە دەست: (زۆرداری) و (هەژاری) و (نەخۆشی) و (نەخوێندەواری). لەبەر ئەوە لەناو کۆمەڵە نهێنییەکانی کوردا بەشدار بووە. (حاجی قادر) لەناو جەرگەی کۆمەلانی ڕەنجدەر و چەوساوەدا گەورە بووە. لەبەر ئەوە لە هەست و هۆش و بیروباوەڕدا نوێنەری بەشە هەرە زۆرەکەی نەتەوەی کورد بووە. جا لەبەر ئەوەیە کە تا گیانی پاکی بەخاک سپاردووە،

بۆ ئەمەی نەتەوەکەی خۆی وریا بکاتەوە و، بیری ڕۆشن بکاتەوە و، ئاراستەیشی بکات بۆ ژینێکی پاکتر و چاکتر و خۆشتر، کە پڕ بێ لە ئازادیی و کامەرانی.

## مێژوویەک دائەنێ بۆ وێژەی کوردی و وێژەوانانی کورد

(حاجی قادر) ئەمەندە بەپەرۆش ئەبێ، بۆ هەموو کوردێکی دەربخات، کە نەتەوەی کوردیش لە کۆندا خاوەنی زمان و وێژەیەکی بەنرخ و گەورەپیاوانی زانست و وێژە و هونەر بووە، لێ کۆڵینەوەیەکی زۆر ئەکات و لێ وردبوونەوەیەکی تەواویش ئەکات لەو بەرهەمە کوردییانەدا کە بەهەزار ئەرک و ئازارەوە لەم کون و قوژبن و لەو سووچ و پەنای مزگەوتەکانی کوردستاندا ئەیدۆزێتەوە... دوایی بەسەرفرازیەکی زانایانەوە و، بەشانازییەکی بێ ئەندازەوە، چامەیەکی گەورە و بەنرخ لە بابەت (مێژووی وێژەی کوردی و وێژەوانانی کورد)وە دائەنێ، بۆ ئەمەی لە دوارۆژدا ناوونیشانیان لەبیر نەچێتەوە و کوردەوارییەکەیش بۆ لەمەو دوا بەتەنگ زیندووکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتیی خۆیەوە بێ و نەهێڵێ لەناو بچێ و بیانکات بنچینەیەک بۆ سەرکەوتن و پێشکەوتنی خۆی لە ژیای دوارۆژیا. ئەمە چامەکەیەتی:

شـــاســـــواری بلاغـــــتی کـــــوردان
یەکـــە تازی مـــصـــاحـــتی بابان
مـــصـطفی یە تـخلصی کـــوردی
غـــزلی کـــردە بەربتی کـــوردی
ناوی صـــاحب قـــرانی خـــاصی ئەوە
چونکە لەم عـرصـــە ئەسپی ئەو بەدەوە
ئەو کـــە نۆشی شـــەرابێکی تالی
(نالی) لەو عـــرصـــەدا بووە (تالی)
(نالی) ئوســـتـــادەکی گـــەلێ چا بوو
خـــضـــری ئابی حـــیـــاتی مـــعنا بوو
یەکی تر بوو (مـــحـــمـــدی فکری)
مـــووی دەئەنگاوت بەتیـــرەکی فکری
یەکێ (رەنجـــوور)ی أهلی کـــرکـــوکـــە
فکری بیکری هەمـــوو وەکـــو بووکـــە
یـــەکـــی تـــریـــان (امـــین بـــەگـــی دزەیـــی)
دز نیـــیـــە، شـــاعـــرێکی جـــەربەزەیی
(کـــەیفی) حـــاجت نیـــە بکەم باسی
ئەم کـــتـــێـــبـــە بخـــوێنی دەیناسی
(سالم)و(مشوی)(شێخ رضا)و (خەستە)
شـــاعـــرن، هەر چوار بەرجـــەســـتـــە

وەک (وەفایی) کەمە لە شعرایی
خطی وەک بەیتی چاک و ئەسپایی
لە کون و قوژبنی کەلاوەی دهر
چەندی تر هەن مثالی گەنج و گوهەر
سەبکی (جامی) و غیرەتی (سلمان)
بەیتیان ون بووە وەکو خۆیان[1]
چەند ئەوەندەی کە عرضی ئێوەم کرد
شعرامان هەیە بەدەست و برد
شاعری کۆن و تازەیی کوردان
کە لە تعدادی عاجزە إنسان
ئەوی خۆم دیومە یا نەخۆ آثری
ئەمەیە بۆت دەلێم بەمختصری
معدنی علم و عالم و عامل
قطبی دەوران و مرشدی کامل
هەر لە آول جنابی (مولانا)
نقشبندی رواقی الا اللە
غوثی ثانی و حاتمی مذهب
(عبدالرحمانی خالصی) مشرب
وەکو (بێتووشی) شاعری عربیۆ
تا قیامت نە کەس بووە و نە دەبی
خۆ مەلا مصطفای بێساران
بێ نظیرە لە نظمی کوردستان
(مەلکە)مان مەلکەمەوتی معنایە
یعنی هەر چۆنی حەز بکا وایە
وەک (مەلا خضری روودباری) نیە
شیعری ئاوی حیاتە تالیی نیە
حکمت و نظمی (میرزا یعقوب)
وەک (فلاطونە) لفظەکان وەک کووب
یعنی فکری لە ئاسمان بەدەرە
باعثی ژینە دافعی کدرە

(١) لە دوای ئەمەوە بەپێی چاپەکەی گیو موکریانی ١٩٥٣، سێ دێڕی بوارددووە.

(حسن)ی باوکی (فقی ئۆمەر)
کوڕی ئۆمەر، (محمد)ی سەروەر
مەنجەڵی نظمی، گەورە و گچکەن
بۆ خیالاتی عینی سێ کوچکەن
شاعیری (زەنگەنە) نیە حدی
وەکو شجعانی ناکرێ عدی
چونکە مجموعی طبعی موزونە
سینەیان مشلی ئایینە ڕوونە
انتخاب ناکرێن لەبەر چاکی
وەک لە شەڕدا سوار و چالاکی
دوو وحیدن (محمد) و (احمد)
یەکی (کۆماسی)یە، یەکی (دەربەند)
(هەمەوەند)یش کە خزمی خۆمانن
شاعری زۆرە پاکی دەیزانن
چونکە تیژی زبانیان یەکسەر
کەوتە نووکی ڕم و دەمی خەنجەر
بێ کتێبن ئەمە لە وان دوورە
مەردی ئازا لە ناقصان دوورە[1]
ئەسپی ڕەش بەیتی تا بڵێی چاکە
نظمی یەکجار سوار و چالاکە
(ئەسپی شەش پێ)و(قەهرەمانی عەجەم)
محضی کذبە بەاتفاقی امم
چونکە نووسراوە، خلقی دەیخوێنن
لەم هەموو بەیتی ئێمەدا کوێرن

---

(١) بەپێی چاپەکەی گیو موکریانی ١٩٥٣ لە دوای ئەم دێرەوە (نۆ) دێر پەڕێنراوە، کە لەمەوەیە:

دەشتی کەرکووک و کێوی هەورامان
شاعیری زۆرە بێ حەدد و پایان

هەتا کۆتایی دێ بە:

وەکو شانامە گەر بنووسرایە
لێت مەعین دەبوو چ وەستایە

بڕوانە هەر ئەو چاپە. لە: ٦٦-٦٧

وەرە ئینجا لە حسرتان مەمرە
چوارپەلی ئەسپی سنییان مەگرە
وەکو بەیتی (حەتەم) لە دعوادا
نیە (فیردەووسی) سەد کلک بادا
ئەم فصیحانە پاکی بێ ناون
باعشی پێت بڵێم: نەنووسراون
دوو (عەلی)ن شاعرن وەکو (حسان)
(بەردەشان) و (حریر)ە مسکنیان
یەکێ هاوناوی خۆم، بەخۆم دیبووم
(شێخ وەسانی) بوو مەردێکی معلوم
وەکو من بوو بەظاهری جاهل
باطنا شاعرێکی زۆر کامل
(احمدی کۆر) لە شاری (سابلاخ)ە
بەیتێکی داغە، بەیتێکی باغە
ئەمە مجموعی شاعری غران
هەروەکو (مثنوی)ن لە نێو کوردان
هەموویان بێ نظیر و یەک وەزنن
قابیلی بەزم و لائقی ڕەزمن
غیری (دمدم) لەمان بەنظمە جدا
بێ صدا طبلی نظمی دەنگ نادا
بەڕەوانی مشالی آبی ڕەوان
إرتجالین هەموو بەبێ دامان
کلی بەیتێکی دوو هەزار فردن
مانگێکی پێ دەوێ لەبەر کردن
ئەمە هەر کوردە لائقی تحسین
بێ کتێب و معلم و نووسین
کامە منداڵ و شێتی لێ بگری
هەر کە بیستی بەجارێ دێتە بەری
ئێستە مەعلومی بوو هەموو ملت
ئەی مەلای درس و مفتی امت!
ئێمە بێ غیرەتین و بێ عارین
ئەوی نەیخوێندووە لەمە عارین

قـیـد و تذبیب و شـرح و حـاشـیـەکـان
بوونە سـدی مـعـارفی کـوردان[1]
حـاصلی ئێـمـە وەک دەکـەم تخـمین
(کرمی ئاوریشم)ین و (مێشی هەنگوین)
نیـە ئارام و ڕاحـەتی و خـەوتن
شـەو و ڕۆژی هەتا دروسـتی دەکـەن
کـەچی (ڕۆمی) کـە ئێـمـە دەیناسین
وا دەزانن کـە ئێـمـە نسناسین!؟
یانە (ئێـران)ی یەک کـە مـعلومـە
دایکی (مـتـعـە)، باوکی مـوهومـە
ئەمـە دەیکاتە کـاسـە دەینۆشن
ئەو کـە وای لێ دەکـا و دەیپـۆشن»

ئا بەم ڕەنگە، (حاجی قـادری)ی دەس ڕەنگین، نرخێکی وێژەیی بۆ وێژەوانان و وێژەکـەمـان دائەنێ و مێژووی وێژە و وێژەوانەکانیشمان تۆمار نەکات لە پەنای ئەوەیشا هانمان ئەدات بۆ خوێندن و نووسین و تۆمارکردنی بەرهەمەکـانی وێژەکانمان. هەروەها توانج و پلاریش ئەگرێتە (مـەلا)کانمان و کـاربەدەستـە خوێندەوارەکانمان لەسەر ئەم کەمتـەرخەمییەیان دەربارەی تۆمارکردن و پاراستنی ئەم کەلەپووره بەنرخەی نەتەوایەتییەمان. کەچی ئێمەیش ئەمەندە سارد و سڕ و کەمتـەرخەمین خوومان داوەتە فێرکردنی (قید و تذبیب و شرح و حاشیەکان) بەزمانی بێگانە و، پشتیشمان کردۆتە خوێندەواری کوردەواری و، بەوانە زانست و وێژە و هونەری کوردیمان بەربەست کردووە لە مانەوە و گەشەکردن. کە لەم بارەدا کوردەوارییەکە، هەر ئەوەی بۆ ماوەتەوە ڕەنج بدا و (ڕۆم) و (عەجەم) بەری ڕەنجی بخوات!؟

## حاجییەکی شۆڕشگێڕ

وەک لەمـەوپێش گـوتمان حـاجی پیـاوێکی خـواناس بوو. لە خـواناسـیـیـەکـەیەوە بیـروباوەڕی نیشتـمـانپەروەری و گەل پەروەری و مرۆڤپەروەری چوو بووە دڵ و دەروون و مـێشـکییەوە. ئەویش کە هەمـوو گـیـانێکی خـۆی و هەمـوو هێـز و توانایەکی خـۆی بۆ ڕۆشنکردنەوەی مـێـشـکی کـوردەواری و وریاکردنەوە و ئاراستەکردنیان بۆ ژیانێکی باشتر و خۆشتر تەرخان کردبوو، لە هەموو کۆڕێکی نیشتمانی و کۆمەڵایەتیدا خەباتی ئەکرد بۆ کەلکی کورد و کوردستان. جا لەو سـەردەمەدا کە (حاجی) تیا دەژیا کوردەوارییـەکە ئەیناڵاند بەدەست زۆرداریی داگیرکەرانی بێگانە و ستـەمکارانی ناوخۆوە. خـۆپەرستی تەشەنەی کردبوو. جێگای خواپەرستیی گرتبووەوە. فەرمانڕەواییـەکـانی ناو کـوردستـانی گـەورە، یەک لەدوایییەک کەوتبوونە ژێر چنگی ئێرانییەکان و عوسمـانییەکانەوە. شیـرازەی ژیانمان تێک چووبوو. هەر

(١) ئەم دێرە لە چاپەکەی گیو موکریانی ١٩٥٣دا نییە.

کەسە خەریکی گیرفان پڕکردنی خۆی بوو. دەسی نەنەپەرژایە سەر خەم خواری گشتی. هەر چوار دەردەکە: (زۆرداری) و (هەژاری) و (نەخۆشی) و (نەخوێندەواری)، ئاودامان کوردستانی گرتبووەوە.

جــا (حــاجی)یش کــە دەروون ئازادێکی خــوێن گــەرم بوو، یەک بەیەک بەرەنگاری ئەو زۆردار و ستەمکارانە ئەبوو، ڕووتی ئەکردنەوە بۆ نەتەوەکەی خۆی، تا خەوش و ناپاکییان دەرکەوێ و نەتەوە بەرەنگارییان بکات و سەر ئەنگرێیان بکات. هەروەها ڕێگای خەبات و چارەکردنی گیروگرفتەکانی ناو کوردستانیشی بۆ ڕووناک ئەکردنەوە، تا زوو بەزوو چارەسەری پاشکەوتنی خۆیان بکەن و بکەونە سەر ڕێگای پێشکەوتن... جارێ لەپێش هەمــوو چینێکا بەرەنگاری شێخـە خراپەکان بوو، کە پێچەوانەی ئایینی پاکی ئیسلام ئەجوولانەوە:

هورووژمێک بۆ سەر شێخەکان

«شکڵی تەکیە و خانەقاهی شێخەکان
واقــــعـــــا ڕەنگینــە، أمّا بۆ ڕیان
لەم هەمـــوو شـــێخ و مـــریدانی ڕیا
تاکــەکی ناچێـتــە مـزگـەوتی خــودا
مـسـجـد و مـحـراب و منبر بێ کـەسـە
هەر مـەپرسـە حـاڵی چۆنە مـدرسـە»

ئینجا (حاجی) بەتەواوەتی لێیان هەڵئەسێتە سەر پێ و ئەڵێ:

«خانەقا و شێخ و تەکیەکان یەکسـەر
پێم بڵێ نفـعـیـان چییـە ئاخـر؟
غــیـری تعلیـمی تەنبـەڵی کـردن
جـمـعی امـلاک و خـەزنە کـۆ کـردن
دەفـعـەیەک امـتـحـانیـان ناکـەن
تـێ بـگـەن زەهـر یـانـە تـریـاکـن
مــحکی لێ بدەن ئەگــەر وەکــو زەڕ
تێ دەگــەن ڕێ گــرن وەیا ڕەهبــەر»

پاش ئەوە (حاجی) ئەڵێ:

«عــــشق بازی و هەوای دەروێشی
ملتی خـسـتـە فـقـر و بێ ئیـشی»

لەسەر نوشتە نووسین و چەواشەکردن و جادووگەریشیان ئەقیژێنی بەسەریاندا ئەڵێ:

«ئەی خـەریکی ڕمـوز و ناز و نیـاز
ئەوروپا فنی گـــەیوەتە اعـــجــاز

قـوللەیی (ئیـفـەڵی)[*] لە ئەفـلاکـە
عکسی ئەو گـەردوشی لەژێر خـاکـە
کـــوڕڕەیی ئەم زەمـــینـەیان پێـــوا
خـاطری تۆبێ چوونە جـەووی سـەمـا»

## پەلاماری مەلاکان ئەدات

هەروەها لەسەر ئەوەی کە هەندێ لە (مەلا)کان توانج ئەگرن لەوانەی کە لە خوێندنگاکاندا ئەخوێنن، (حاجی) لێیان ڕائەپەڕێ و ئاراستەیشیان ئەکات بۆ فێربوونی زانست و هونەر و ژیان بەپیاو و ژنیانەوە:

«چینی ئاگـر پەرستێ ئێـسـتـاکـەش
گـــەبری بێ دین و هیندوی ڕووڕەش
بۆچی فـــەرمـــوویەتی نبی امین:
(أطلبـــوا العلم ولـو بـالصین) ؟
ئێـسر و مێ لەم حـدیثـە فـرقی نیـە
گـەر مـەلا نهێ فـەرمـوو دینی نیـە
تۆ وەرە فن فـــێــربە چیستـــە لەوە
گـــاوورە، جـــووە، یاخـــود هیندووە
لازمـــە خـــول بخـــۆی وەکـــو بەرداش
هەمـوو قـرنێ دەگـۆڕێ امـری مـعـاش»

(حـاجی) هەرچەندە ڕێزی لە (مـەلا) خـوێندەوارە بەکـەڵکەکـان ئەگـرت، بەڵام بەرامـبـەر بە(مـەلا) خراپەکان هورووژمی توندوتیژی ئەبرد، ئاراستەیشی ئەکردن بۆ خۆ ژیاندن بەپیشەییێکەوە:

«علـمـــامـــان بەقـــولی بێ ســـەر و پا
پاکی خنـکا لـە بـحـــــری وشـکی هـوا
صنعـتـێک فـێـر نەبوون لە پاش تحـصـیل
ســـەیری چۆن بۆ مناهی بوونە دلیل؟!...
یەک بەیەک بوونە خـــــائنی دەولت
خـــــــائنی مـلـک و دوژمـنـی مـلـت[1]»

---

(*) ئەم قـوللەیە لە پاریس دایە، (٩٨٤) پێ بڵندە. لە ئاسن دروست کـراوە لە (١٨٨٩)دا تەواو بووە. بۆتە شاکارێکی ناوازە لە پاریسدا. (ش. ف)

(١) (حاجی) مەبەسی لەو مەلایانەیە کە بوونە هۆی سەرنەگرێ کردنی فەرمانڕەواییەکانی کوردستان. وەک (ادریسی بتلیسی) و (مەلای خەتێ) و (مەلا یەحیای مزوری)، کە بۆ کەڵکی (تورک) داگیرکەر و زیانی کوردی تێ ئەکۆشان!.

(حاجی) ئەیویست مەلاکانمان نووسراوەکانیان بەزمانی کوردی دابنایە، هەروەها پایەخیان بەگوتنەوەی زمان و وێژە و مێژووی کوردی بدایە بەزمانی کوردی. بۆ ئەمەی گیانی کوردایەتی هەر بەزیندوویی بمێنێتەوە و گەشە بکات و ببێتە بنچینەیەک بۆ سەربەرزی و کامەرانیمان. کەچی بەداخێکەوە پەردە لە روویان هەڵ ئەماڵێ و ئەڵێ:

«یەکسەر علما درشت و وردی
هیچ نەیخوێندووە دوو حەرفی کوردی!»

لە جێگایەکی تریشدا ئەڵێ:

«کوردی ئاخر بڵێ چییە عیبی؟
هەر کلامێ حقە نییە عەیبی...
یا لەگەڵ فارسی چ فرقی هەیە؟!...
بۆچی ئەو راستە، بۆچی ئەم کەمی؟!
با وجودی ئەگەر بکەی دقت
تێ دەگەی کام لە کامییە سرقت
چونکە ئێمە قدیمترین لە ئەوان
بەتواریخی جملەی ادیان»

ئینجا (حاجی) ئەم کەمتەرخەمیەیەی مەلاکانمان لەگەڵ وێژە و زمان و مێژووی کوردیدا ئەگەیێنێتە ئەوەی کە ناوی هەموو (مەلا) و (زانا) و (میر) و (پادشا)کانی خۆمان لەبیر چۆتەوە. بەواتایەکی تر کەسایەتیی نەتەوایەتیی خۆمان ونی کردووە:

«وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانی
تفنن خۆشە گەر چاکی بزانی:
(صلاح الدین) و (نورالدین)ی کوردی
عزیزانی (جزیر) و (مووش) و (وان)ی
(مهلهل)، (ئەردەشێر) و (دیسم)ی وەی
(قوباد) و (باز) و (میری ئەردەلان)ی
ئەمانە پاکیان کوردن، نهایت
لەبەر بێ دەفتەری ون بوون و فانی
کتێب و دەفتەر و تأریخ و کاغەز
بەکوردی گەر بنووسرایە زەمانی
مەلا و زانا و میر و پادشامان
هەتا محشر دەما ناوونیشانی»

پاشان (حاجی) ئەمەندە توورە ئەبێ لەو کەسانەی کە زمانی کوردییان خستۆتە لاوە و هۆگری زمانانی بێگانان بوون بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان، دەست ئەکات بەجنێو پێدانیان ئەڵێ:

«ئەگـەر کـوردێک قـسـەی بابی نەزانی
مـحـقق دایکی حـیـزە و با بی زانی»

هەروەها بەو کوردانەیش کە حەز لە زمانی باووباپیری خۆیان ناکەن ئەم جنێوە ئەدات:

«لە کـوردی حـەز نەکـا کـوردێ، مـەڵێن بۆچی وەیا چۆنە؟
لە دایکی پرسیارێ کەن: کە ئەو بێچوەی لە کوێ هێنا!...»

(حـاجی) ئەوەندە بەپەرۆش ئەبێ بۆ دامـەزراندنی زمـان و وێژەی کـوردی، سـتـایشـێکی خـوا ئەکـات بەچامەیەکی کوردی، ئاهی کوردپەروەری خۆی بەم جۆرە ئەگەیێنێت بەخوا. ئەمە دوا دێری چامەکەیە:

«معلومە بۆچی (حاجی) مدحت دەکا بەکوردی
تا کـەس نەڵێ بەکـوردی نەکـراوە مـدحی باری»

## گلەییەک لە کوردەواری

(حاجی) ئەمەندە وەڕس بووە لە نەخوێندەواریی نەتەوەکەمان، لە داخانا ئەم تاکە هۆنراوەیەی گوتووە کە بەتەواوەتی لە ئەندازەی ترازاندووە:

«مـــیللەتی بێ کـــتـــێب و بێ نووسین
غـەیری کـوردان نیـیـە لە ڕووی زەمین!»

## هێرشێک بۆ سەر فەرمانبەرانی میری

(حاجی)ی شۆڕشگێڕ کە لە شێخ و مەلا ئەبێتەوە، ئینجا پەلاماری فەرمانبەرەکانی میری عوسمانی ئەدات کە ئەوپەڕی خراپییان لەگەڵ کورددا نواندووە:

«ئەم سـەگـانە کـە لەلای ئێـوە وەزیر و کـلان
بێنە لای تۆ بەخـوا نایکەیە شـوان و گـاوان
ئەمـە کـەرمـیـزە دەڵێن وارثی شـرعی نبـوین
هەموو عەبدی صنمن، باسی مەکە گەورەکەیان!»

لە جێیەکی تریشدا ئەڵێ:

«حاکمی ڕێ گری معـمورەیە، قـاضیی دزی ڕۆژ
وزراو و وکـــلا گـــورگـــە، رعـــیت گـــەلەیە
ئەو گـەڕ و گـێـچـەڵی بۆ رعـیـتی خـۆی داناوە
زجر و توبیخی مەکە چونکە خطای گای بنەیە!»

## پلار ئەگرێتە چینەکانی تری نەتەوە

ئەمەیش هەر (حاجی)یە کە هورووژم ئەباتە سەر (دەوڵەمەند) و (دەسەڵاتدار) و (بۆرەپیاو) و (ئازا) و (مسکێن)ەکانمان، هەر لەبەر ئەوەی کە هیچیان بەتەنگ کوردەوارییەوە نین، هەر خەریکی بەزمورەزم و گیرفان پڕکردنن، یاخود نان پەیداکردن بۆ زۆردار یان کات بەفیڕۆ بەختکردنی خۆیانن! ئەوانە بۆ بێگانە و زۆردار بەکەڵک دێن، بەکەڵکی کوردەواری نایەن:

«ئەو کەسەی دەوڵەمەندێکی چاکە
بەندەی ڕۆمیانی ناپاکە!...
هەموو مردووی میان و سمتی خڕن
بەیتی مداحیان بەگیان دەکڕن»

***

«ئەوی أعلایە، سەردەستەی شکارە
ئەمی أدنایە، بەستەی زوڵفی یارە
ئەوی ئازایە، شانامە ئەخوێنێ
ئەمی مسکێنە گەنم و جۆ ئەچێنێ
ئەمانە بێ شعور و گێژ و وێژن
مطیعی لۆتەخۆر و هەرزە بێژن!»

لە جێگایەکی تریشدا (حاجی) لە کورد وەها ئەدوێ:

«خۆ دەزانن سلالەیی اکراد
لێرەوە بگرە تا دەگاتە (قوباد)
هەموو عالم هەموو شێخ و میرن
زیرەک و ژیر و اهلی تدبیرن
وسطی پانی پانزە ڕۆژ ڕێیە
پڕ لە ڕەشماڵ و خانە و دێیە
بەدرێژی لە (قاف) کە ڕابوردن
تا بە(شیراز) و (اصفهان) کوردن
شاسوارن، پیادەیان ئازان
بردنیشیان وەکو لکی مەیدان
دان و بەخشینیان لەلا باوە
خوێنی مەیدانیان لەکن ئاوە
بەشجاعەت هەموو وەکو ڕۆستەم
بەسەخاوەت هەموو وەکو حاتم

له وەفا (سموئیل) و (اسماعیل)
عهد و پەیمانیان چیای (قەندیل)
(گورد)ی شاهنامە پاکیان کوردە
کافی ئەم صافە، کانی ئەو وردە
لە شەڕا زۆر دەفعە قەوماوە
ڕۆمییانیان چلۆن جواب داوە
(حاجی) دەمرێت لە داخ، هاوارە
کوردی بێچارە دەبنە ئاوارە!...»

## مێژوویەک ئەنووسێ بۆ کورد

لە بابەت مێژووی میرنیشینییەکانی کوردستانەوە لە سەردەمی ئیسلامدا (حاجی) ئەمەی نووسیووە:

«حاکم و میرەکانی کوردستان
هەر لە (بۆتان)ەوە هەتا (بابان)
یەک بەیەک حافظی شریعت بوون
سید و شێخی قەوم و میللەت بوون
سید و شێخەکان لە ترسی ئەوان
منزوی بوون و ذاکری رحمان
ئەو کە فەوتان، ڕیای ئەوان دەرکەوت
سەیری چۆن بوونە پووش و ئاگر و نەوت!...»

(حاجی) لە جێگایەکی تریشدا ئەڵێ:

«لە (قۆچ پاشا)ەوە تا ئێستا ئەمیرەک
لە (کۆی) پەیدانەبوو یاخود و زیرەک
لەبەر بێ ئیتحادی بوونە مسکێن
لە ئاخردا وەکوو زانیومە هەڵدێن
لە مابینی (کڵاو سوور) و (کڵاو ڕەش)[1]
پەرێشانین دەبینە مثلی گای بەش!...»

لە شوێنێکی تریشدا نرخی نەتەوەی کورد دەرئەخات ئەڵێ:

«سەد شەهەنشاه و پادشا مردن
سەیری کە کوردی ئێمە هەر کوردن

---

(١) کڵاو سوور بەعوسمانییەکان ئەڵێ... کڵاو ڕەش بەئێرانییەکان ئەڵێ. (ش. ف)

میللەتە باقی مابقا فانی
هەر لە (جاف)ی هەتا بە(گۆران)ی
حەسرەتم هەر ئەمە لە دنیادا
(حاجی) دەمرێ بەدەوریان ناگا!»

وا لێرەیشا (حاجی) مێژووی لافاوەکەی سەردەمی (نووح) پێغەمبەرمان بۆ ئەگێڕێتەوە، کە لەسەر شاخێکی کوردستاندا، (جوودی) کەشتییەکەی نووح گیرساوەتەوە، کە ئێستا ناوی (جزیر)ە و لە خاکی (جزیر و بۆتان) دایە، کە بووە مەڵبەندی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی مرۆڤ بەهەموو جیهاندا:

«ئەو ڕۆژە بەئەمری حی منان
ئەو عالەمە پاکی بوو بەطۆفان
تاقێکی نەما لە جنسی ذی روح
غەیری ئەمە هاتە کەشتیی نووح
ئەو ڕۆژە گەیشتە وەختی مەعهود
وەستاوە لەسەر چیاکەی (جوود)
هەر سێ کوڕی کردیانە مسکن
ئەو جێ و مکانە مثلی گولشەن
ئێستاکە (جزیر)ە بێ محابا
مەعموورەیی اولە لە دونیا»

## هانە ئەدا بۆ کارگوزاری و چاندن و پیشەسازی و بازرگانی

(حاجی) کە هەموو دەم خەوی بەپێشکەوتنی کورد و ئاواکردنەوەی کوردستانەوە ئەدی، هانەی ئەداین بۆ بایەخدان بەکرد و کۆشی و چاندن و پیشەسازی و بازرگانی، تا لە دەست هەژاری و کزی و بێ دەسەڵاتی و گێژوویژی ڕزگارمان ببێت.

گوێ بگرە چی ئەفەرموێ:

«لە دەوری کلی باغێ، شاری (کۆیێ)
دووسەد مەن داری زەیتوونی بەجۆیی
لە ئێوە کامتان بوو یەک دوو بارەک؟
بیکاتە کیسەیەک یاخود خەرارەک
دوو پێی لێ دا لە کوڵا مثلی دۆشاو
وەکو ڕۆن، ڕۆنی زەیتوون بێتە سەر ئاو
وەیا کەی نێژراوە سەد ئەمامێ؟
لە نارنج و ترنج و هەر مەقامێ

بزانن: شین دەبێ، نابێ، بەبەردێ؟
لەجێگای گەرم و ساردی چیی بەسەر دێ؟»

لە جێگایەکی تریشدا دەڵێ:

«بەراو و ارضی ئێوە کیمیایە
دوڕ و گەوهەر گەزۆ و مازووی چیایە
معادن خاطری تۆ بێ لەگەڵ کان
کەمتەمتان زێڕە، حەتتی زیوە زیوان
ڕەژووی پاپۆڕ و خوێ و نەوت و گۆگرد
لە کێوی ئێوەدا کۆیە وەکو گرد»

لە بابەت پیشەسازییەوە ئەڵێ:

«أهلی ژاپۆن بەهۆی صنعەتی چاک
سەیری چۆن چینی گرت و کردیە خاک؟

لە بابەت کۆشش و خەباتی (ئەرمەنییەکان)یشەوە کە بۆ خۆیانی ئەکەن، (حاجی) ئەم پەندەمان ئەداتێ:

«هەقیانە قومی (ئەرمەن) غیرەت کەشن یەک و دوو
وەک ئێمە نین لەگەڵ یەک دعوا بکەن بەشیران
بۆ فنی حرب و صنعت، بۆ ضبط و ربطی ملت
دەنێرنە ئەورووپا گەورە و بچووکی خۆیان!

## وێنەیەکی ڕەنگین ئەکێشێ بۆ بەهاری کوردستان

(چامەی وتم بەبەختی خەوالوو)

ئەم چامەیەیش یەکێکە لە شاکارەکانی (حاجی قادری کۆیی) کە ئەتوانم بڵێم تا ئێستایش لەناو کورددا کەس بەهاریی وا تەڕوتازە و پڕ واتا و، نایاب و ناوازە و، ئاراستەکانی دانەناوە. (حاجی) لە بەهارییەکەیدا وەک سینەما پەردە، پەردە، هەموو جوانییەکی سروشتی کوردستان و هەموو جوانییەکی ژیانی پڕ لە ئاهەنگ و ساکاری کوردەواریمان پیشان ئەدات. وێنەکانی (حاجی) دەست ڕەنگینییەکی گەورەی تیا دەرئەکەوێ. ڕەندێن، ڕەنگاوڕەنگ، شەنگ و شۆخن، پڕ لە جۆش و خرۆشن، دڵگیرن، بەبەرجەستەیی دەرئەکەون. پڕن لە جووڵانەوە و بزووتن. واتاکانی قووڵن. وشەکانی پڕن لە ساز و ئاواز. داڕشتنەکانی بەهێز و توند و تۆڵن. ڕێک و پێک و ڕازاوەن. تا بیریشی لێ بکەیتەوە پڕن لە هەستی ناسک و سۆزی دەروون. بیرەکانیشی کورد ئاراستە ئەکەن بۆ کوردپەروەری و خەباتکردن بۆ ژیانێکی باشتر کە دووربێ لە ئازار و هاوار و زۆرداری. یان لە هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری.

لە ڕاستیدا، (حاجی)، لەم بەهارییەدا ئەمەندە ورد بۆتەوە لە کورد و کوردستان و ئەمەندەیش

وردەکاریی نوواند و، لە داڕشتنەکەیدا، وەک هونەرمەندێکی شارەزا و دڵتەڕ، بەهەشتی کوردستان و ژینە پاک و خاوێن و ساکارەکەی کوردەواریی لادێمان بەهەموو جوانی و ڕازاوەییەکیەوە بۆ دەرئەخات.

لەلایەکی تریشەوە کە ئەم سینەمایە ئەهێنێتە پێش چاوی خۆی و ئاوارەیی خۆی و هۆی ئاوارەیی خۆی لە (ئەستەموول)دا دێتەوە یاد، هەناسەیەکی سارد هەڵئەکێشێ. پاشەجار، لەسەر ئامۆژگاری بەختی خەواڵووی، هەر ئەوە بەچاکتر ئەزانێ کە چاوەڕوانیی کوردێک بکات کە لە کوردستانەوە بێت و ئەم چامەیەی پیا بنێرێ بۆ ناو کوردەواری، تا لە ڕووی خۆشەویستییەوە لەبەری بکەن و هەموو دەم یادی بکەنەوە، بەڵکو (حاجی) بەوە لەناو زیندووان و مردوواندا گیانی پێ شادبێ و سەریشی پێی بەرزبێتەوە، کە هەر ئەوەی بۆ ئەمێنێتەوە!. لە خوایش ئەپاڕێتەوە کە چامەکەی هەر دەست ئەوانە بکەوێ کە نرخی زمانی کوردی ئەزانن و ڕێزی لێ ئەگرن، نەک ئەوانەی ناشی و دڵڕەش و هەرزە گۆن و کەم و کوڕی لە هەموو شتێک ئەگرن... لە دوایی چامەکەیا وای دەرئەخات کە زۆر شتی نهێنی لە دڵیا هەیە و بیلێ، بەڵام چەرخی کەج ڕەفتار ڕێ نادات بیلێ، چونکە لەژێر چنگی فەرمانڕەواییەکی زۆرداری وەک (تورکی عثمانی) دایە، کە لەسەر قسەی ڕەوا و ڕاستگۆیی زمان ئەبڕێ!... فەرموون، ئەمەش چامەکەیە، بیخوێننەوە، کە بەڕاستی بەگەنجینەیەکی وێژەیی نوێ دائەنرێ کە (حاجی) پێشکەشی نووسراوخانەی کوردیی کردووە.

کوا ئەو ڕۆژەی هونەرمەندان و کاربەدەستانی کورد ببینم ئەم چامەیە بخەنە چوارچێوەی فلیمێکی سینەماییەوە، تا کەڵک و فەڕی بۆ نەتەوەکەمان زۆرتربێ و گیانە پاکە چاکەکەی (حاجی قادر)یش پێی شادمان بێ؟!...

بەهارییەکەی حاجی قادری کۆیی

وتم بەبەختی خەواڵو و بەسە ئەتووبی خوا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا
گوڕەی بەهارییە ئێستێکە شاخ و داخی ولات
پڕە لە لالە و نەسرین و نێرگسی شەهلا
لە گرمە گرمی سحاب و لە هاژەی باران
چیایە پڕ لە هەرا و نەوالە پڕ لە صدا
پڕە لە سەیل و لە گۆلاو و کانی ڕووی زەمین
پڕە لە بەرق و بریقەی برووسکە جەووی سەما
شکۆفە دەرهەمی شاباشی بای وەعدە ئەکا
لە شەوقی مەقدەمی، خەملێوە دار و بەردی چیا
پیاڵەیی زەڕی نێرگس لەسەر کەفی سیمین
پڕە لە شەونمی وەک دوڕ و لۆلۆئی لالا

گولیش بەپەنجەی پیرۆزە جامی یاقووتی
لە بۆ نشاری مەهسیایە پڕ لە زەڕی تەلا
لە شادی وەک صفی شایی لە کێو و کەژ ازهار
هوژا بەخلعتی گولگون دەکەونە رقص و سەما
چەمەن لە لالە مثالی خطی ڕوخی دولبەر
سیاه چادری لێ بۆتە خالی سەر گۆنا
لە کن بنەوشە و خاو و هەلاڵ و بەی بوونی
هەلاڵی پێستەی خاوە عبیر و موشکی خەتا
چیا لە تەوقە سەری داڕژاوە تاکە مەری
چو زولفی سونبولی درهەم، چو پەرچەمی بەرەزا
بەجۆش و ئاگری گوڵناری کانی هەڵ دەقوڵێ
مثالی دیدەی وامق لە حسرتی عذرا
قەلاتی زیوی ڕوخاوە هەرەس بەتۆپی نەسیم
سویاهی لالە و گوڵ چادری لە جێ هەڵدا
لە گۆلە شینێ کە قاز و مراوی دێن و دەچن
نظیری ماه وستارەن لە قلزەمی مینا
شنەی نەسیمە صدای ئاوی صافی سەر قەڵبەز
بەورشە و ڕەشە گیا شەنگەبی بووە شەیدا
خڕنگ و هووڕی قولینگ و قەتاری سی لەسەران
دەبێت و کەو دەفڕێت و شەهێن چریکە ئەکا
لە پیرە و پیر و لە سمکۆڵی پیرە گاکێوی
دەلەرزێ گاوی زەمین و دەترسێ گاوی سەما
لە بست و دووکەڵی شینە تفەنگی نێچیرەوان
مثالی سونبولی زولفێ کە تێک بچێ بەصبا
چیایە شێخ و کەوای سەوز و مێزەری بەفرە
سیواکی چووزەرە ڕێواسە تەیلەسانی کەلا
چەمەن لە لالە و ڕێحان و نەستەرەن ئیمڕۆ
شبیهی صبح و شەوە ئافتابی وقتی ضحا
چنار و عەرعەرە دەف زەن هوزارە نغمە سەرای
گیاش ذاکرە تسبیحی شەونمی لەملا
لە ژووری مێگەلی هەورە، لەژێر مێگەلی مەڕ

شبیهی گوڵشەنی خضرایە توودەی غبرا
لە کێو و گەژ کە سەر ئێوارە دێتەوە ماڵات
لە دەوری چادری صاحێبی موجیدا، وێستا
لە حیلە حیلی کە حێل و لە بارە باڕی مەڕان
لە دەنگی قۆڕەی گاجووت و بۆڕەی مانگا
لە گورگە قاڵ و حەپەی سەگ لە قارە قاڕی بزن
لە عکسی دەنگی دووبارەی کە دێتەوە لە چیا
لە ئۆحە ئۆحەی گاوان و قیرە قیڕی شوان
لە بگرە بەردەی کابان دەبێتە حشر و حەلا
مەلائکەی سەری تاق و ڕەواقی مینایی
دەبینە جونبوش و لەرزین دەکەونە رقص و سەما
کە هەڵکرا شەوێ ئاگر لە کلی ڕەشماڵێک
خجل دەبن لە زوایای خیمەیی واڵا
(عطارد) و (زوحەل) و (ئافتاب) و(ماە) تەمام
خلاصە ثابت و سیارە تا دەگاتە (سوها)
صبا دەزانی ژیانم لە دوورتان مەرگە؟
دەسا وەرە بەکزەی خۆت خجل بە(عیسا)
ئەگەر منم لە فراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ
ئەگەر دڵە وەکو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا
لە پاش ئەم هەموو داستانە بەختی خواب آلوود[1]
مثالی ئەژدەری نوستوو بەڕق لەخەو هەستا
جەوابی دامەوە أما جوابێکی وا ڕەق
نەما مجالی مقال و مباحثە لەم لا
وتی هەتاکو خەزان و بەهار و زستانە
مداری عیش و مەوالیدی عالەمی غەبرا
بەهاری وا هەموو ساڵێک دەبێتەوە أما
ئەمانە دەچنە دیاری ممالکی عقبا
یەکێکی نایەتەوە چوونیان هەر ئەو چوونە
لە شێخ و عالم و جاهل، لە پادشاە و گەدا
مکان شەوقی بەعێلاتە، پەشمە کۆنەهەوار

(١) خواب آلود: خاب ئالوود: خەواڵوو

حـــيـــات ذوقی بە احــبـــابە، بایە آب و هەوا
رەفـــیـــقی کـــۆنە نماون، جـــوانەکـــان پیـــرن
بەشـــەق دەڕۆن و لە دووری دیارە شـــەق و عـــصـــا
لە دوســـەدی یەکـــێکی زەحـــمـــەتە بیناســـیـــەوە
مـــەگـــەر بەناوونیـــشـــان و بەخـــزم و باب و برا
کـــە بێـــتـــو بچـــیـــەوە ئێـــســـتـێکە بۆ ئەوێ دیســـان
سـفـر دەکـەی لە وطن دەچیـە شـاری (جـابولقـا)
خـلاصـەی قـسـە ئێـسـتـێکە مـصلحت ئەمـەیە
بڵێ بەوجـهی نصـیـحت، بەکـاغـذ و انشـا
ئەمـــــان کـــوڕانی ڕفـــیـق و برادەرانی وڵات
بەئێـوە هەر کـە گـەیشت ئەم کـلامی بێ سـەروپا
لە پاش ئەوەی کـە تصـیـحـە و مطالعەی بکرێ
بەیادی من لەبەری کـەن لە ڕووی مـیـهـر و وەفـا
هەتا لە خطەی بێگانە فـــخـــری پێـــوە بکەم
لە بەینی زومـرەی أحـیـا و مـجـمـعی مـوتا
ونی مـەکـەن، وەکـو آثاری (نالی) و (کـوردی)
لە سـهـوی دیدە بپـۆشن گـوزەر بکەن لە خطا
نیـــە لە ممکنی إمکان خطا و ســـهـــوی نەبێ
بەغـــیـــری خـــواجـــەی دیوانی علم الاســـمـــاء
ئەوی حـــســـود و عـــجـــولن: لئـیم و ڕەخنەگـــرن
لە عـــیـب و ڕەخنەی عـــالەم بەری دەبن ئودەبا
ئەمـــانە زادەی أفکار و خـــۆشـــەویســـتی منن
ئەگـەر قـبـیح و کـریهن، ئەگـەر شـەل و أعـمـا
مـثـالی فـرخـەی ژیشـک کـە پێی دەڵێ دایکی:
إلهی قـــاقـــمـــە یاخـــود ســـەمـــوورە یادێبـــا
شـبـیـهی جۆلا کـە ڕاضی نەبێ بەسەر دری خۆی
مـــەڵێن فـــصـــاحـــتی کـــوردی بەفـــارسی ناگـــا
بلاغـــــتـــــێکی هەیە هیـچ زەمـــانێ نایگاتێ
لە بێ تعـــصـــبی کـــوردانە بێ ڕەواج و بەها
کـە خۆتی تێ نەگـەیێنی و لە نکتـەکـانی ناگـەی
دەڵێی هەمـــووی هذیانە خـــوا بەڵای لێـــدا

بەڵام ئەوانە کە صەرافی زێڕ و زیوی قسەن
چ شـاه ڕەوایە دەزانن، چ سکەیێکە ڕەوا
«چ حکمەتێکە کە آثاری کوردە نامـوسی
نە کیمیا و نە عنقا لە بیتی ئێمە نەما
إلهی نەیخەیە بەرچنگی مەندە بووری لئیم
نقودی (حاجی) کە نەیدیوە (خوسرەو) و (دارا)
آمین بەوایە نصیب و ئەگەر یەکێ وابێ
بەخێری باوک و دایکی لە ڕێی خێرا بیدا
گەلێ قسەم لە دڵا بوو، حکایەتم مابوو
کەچی لە بەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا!...»

## چاپکراو لە بەرهەمەکانی حاجی قادری کۆیی

* (حاجی) هۆنراوەی زۆرە، بەڵام گەلێکی لەناو چوون. لە ساڵی ١٩٢٥دا لەسەر خواستی خوالێخۆشبوو (عەبدولڕەحمان سەعید)، کۆمەڵەیەکی گەورە لە هۆنراوەکانی لە دەمی ئەم و ئەوە و، کە کاتی خۆی لەبەریان کردبوو، لەلایەن مامۆستا (عەلی شوقی)یەوە کۆ کرابووەوە و بۆی نێررابووە (بەغداد). ئەویش لە ١/١١/١٩٢٥دا چاپی کردبوو.

* بەناوی (غیرەتی ملی)یشەوە کۆمەڵەیەک هۆنراوەی هەڵبژێرراوی هەبووە، لای (عەبدولڕەزاق بەگی بەدرخانی)ی دائەنێ کە لە پاش مردنی چاپی بکات، بەڵام داخەکەم تورکەکان لەگەڵ کوشتنی (عەبدولڕەزاق بەدرخان)دا، ئەو نووسراوەیشیان سووتاندبوو.

* لە ساڵی ١٩٦٩دا مامۆستا (گیوی موکریانی) لە شێوەیەکی زۆر گەورەتردا بۆ سێیەم جار کۆمەڵەیەک لە هۆنراوەکانی چاپ کرد.

لاپەڕەکێشی بەزینکۆغراف لە دەست نووسی (حاجی قادری کۆیی) خۆی لەم نووسراوەیدا لە چاپ داوە. مامۆستا گیو ئەم هۆنراوانەی لە چەند کەشکۆڵێکی بەنرخ وەرگرتووە کە لەلای خۆی پاراستوونی.[١]

* لە ساڵی ١٩٥٢دا مامۆستا (عەلائەدین سجادی) لە نووسراوە بەنرخەکەیدا (مێژووی ئەدەبی کوردی) لەسەر مێژووی ژیانی و هەندێ لە بەرهەمەکانی لێکۆڵینەوەی کردووە.

* لە ساڵی ١٩٦٠دا (مامۆستا حەمەی مەلا کەریم) لە نووسراوەکەیا (حاجی قادری کۆیی) لێکۆڵینەوەی لەسەر بەشێکی زۆر لە هۆنراوەکانی (حاجی) کردووە.

---

(١) بەر لەمە، هەر مامۆستا گیوی بەهەشتی، ساڵی ١٩٥٣ (دیوانی حاجی قادری کۆیی) لە چاپخانەی کوردستان - هەولێر لە چاپداوە، بە(زنجیرەی پەخشیات: ٣٢).

* له ساڵی ١٩٧١دا له (کۆیه) میهرەجانێکی گەورە بۆ (حاجی قادری کۆیی) کرا، زۆر له وێژەوان و ڕۆشنبیرانی کوردستان و بێگانه تیا بەشداربوون.
* وا له ساڵی ١٩٧٢یشدا لەلایەن نووسەری ئەم نووسراوەوە ئەم لێکۆڵینەوەیه لەسەر مێژووی ژیان و وێژەکەی (حاجی قادری کۆیی) کراوه. هیوادارم که گیانی (حاجی)ی پێ شادبێ.
* له گەلێک ڕۆژنامه و گۆڤاره کوردییەکانیشا، ناوبەناو، له هۆنراوەکانی (حاجی) بڵاوکراونەتەوه و قسه لەسەر هۆنراوەکانی و مێژووی ژیانی کراوه. وەک گۆڤارانی: (هاوار) و (گەلاوێژ) و (هەتاو). هەروەها وەک ڕۆژنامانی: (خورماڵ) و (ژیانەوه).

## (حاجی) بەلای ڕۆشنبیرانەوه

* خوالێخۆشبوو (ئەمین زەکی بەگ)، مێژووناسی بەناوبانگی کورد له نووسراوه بەنرخەکەیا (مشاهیر الکرد و کردستان) دەربارەی (حاجی) ئەڵێ:

«هەر له منداڵییەوه گرفتاری خۆشەویستیی نەتەوه و نیشتمان و زمانی نەتەوەییی خۆی بوو بوو... لەناو گەوره پیاوان و ڕۆشبیرانی کوردا ناوبانگی دەرکردبوو... چامه (قصیده)کانی نیشانەیەکی ئاشکران بۆ ئەوەی که هەستێکی نەتەوەییی بێ ئەندازەی بووه لەگەڵ نیشتمانپەروەرییەکی کڵپەداردا. زۆربەی چامەکانی پڕن له سکاڵایەکی پڕ له ئازار و هاوار دەربارەی باری نەتەوەکەی و پاشکەوتوویی له هەموو جۆره ڕوویەکەوه، که یەکێک لەوانه ناکۆکی و دووبەرەکیی ناوخۆیانه و، بەکارنەهێنانی زمانی کوردی له نووسیندا...

* مامۆستا (ڕەوشەن بەدرخان)یش له نووسراوه ناوازەکەیا: (صفحات من الادب الکردی) له بابەت «حاجی قادری کۆیی»یەوه ئەفەرموێ:

«(حاجی قادری کۆیی) له بوێژه هەره گەورەکانی کورد ئەژمێررێ که له سەدەی نۆزدەهەمدا ژیاون. بەچامەی کۆمەڵایەتیی پڕ له ڕەخنه ناوبانگی دەرکردووه... له کۆی سەنجەقەوه کۆچی کرد بۆ ئەستەمووڵ. بوو بەمامۆستای کوڕەکانی بەدرخان پاشا. هەر لەوێیشدا مرد. چامه نیشتمانییەکانی کارێکی گەورەیان کرده سەر گیانی نیشتمانپەروەری لەناو کوردەواریدا...».

## کەشکۆڵێک بەدەستی خۆی ئەنووسێتەوه

کەشکۆڵێکی بەنرخی بوێژەکانمان، که بەدەستی (حاجی قادری کۆیی) خۆی نووسراوەتەوه، تا ئەم ساڵانەیش له نووسراوخانەی خوالێخۆشبوو، (مەلا محەمەد سەعید)دا که بە(صدر العلماء)ی شاری (سابلاخ) بەناوبانگه، پارێزراو بوو. حاجی له هۆنراوەکانی (حاجی قادری کۆیی) خۆی و له هی بوێژان: (شقایی، خەیاڵی، جامی، حریق، خاکی، خالید، خالص، رضا، ڕەنجووری، زەرگەر، سالم، شێخ ئەبو سعید ئەبو خەیر، تالیب، فضولی، کارێزی، کوردی، مەستووره، محتشم، وەفایی) تیا نووسیووەتەوه. هەندێک لەم بوێژانه بەزمانی فارسی و عەرەبی هۆنراوەکانیان داناوه. ئێستاکه ئەم کەشکۆڵه بەنرخه کەوتووەته لای مامۆستا گیوی موکریانی، که خوشکەزای (صدر العلمایه).[1]

---

(١) دیوانی حاجی قادری کۆیی، چاپی سێیەمین، گیوی موکریانی، ل (١). (ش. ف)

کەشکۆڵە کە بریتییە لە (٤٤٧) لاپەڕە. بێ گومان ئەم کەشکۆڵە، هەر لەبەر ئەوەی کە بەدەستی (حاجی قادری کۆیی) خۆی نووسراوەتەوە، لە دواڕۆژی نیشتمانیماندا جێگایەکی ناوازەی بۆ تەرخان ئەکرێ لە ناوازەگاهی کوردستاندا. هەروەها بەکەڵکی لێکۆڵینەوە دێ بۆ زانا و وێژەوانەکانمان...

## حاجی خەمی ئافرەتی کورد ئەخوات

(حاجی)ی ڕۆشنبیر، کە ئەیزانی هۆی دواکەوتن و سەرگەردانیمان دوو شتە:

١- نەخوێندەواری

٢- بەدخوویی

بانگی ئەدا بۆ نەتەوەکەمان: کە هۆگری خوێندەواری بن و فێری هونەر و پیشەسازی بن و خۆیشتان ڕابهێنن بەو کردەوە بڵندانەوە کە خواناسی پەسەندی ئەکات، وەک هۆگری و کۆکی و خۆشەویستی و یەکێتی و بۆ مەبەستی خەبات کردن لەپێناو کەڵکی کورد و کورستاندا. هەروەها بانگی ئەدا کە زانست و هونەر و پیشەکەمان بۆ کەڵکی گشتی بەکاربهێنن، تا خۆمان دەوڵەمەند کەین و خاکەکەمان ئاوەدان بکەینەوە. لەمەیشدا (ئافرەت) مافی هەیە وەک پیاو بخوێنێ و خۆی پێ بگەیێنێ و خەباتی نیشتمانی بکات و لەبەری ڕەنجی شانی خۆیشی تێر بخوات:

«بۆچی فەرموویەتی نبی الأمین
(اطلبوا العلم ولو بالصین)؟
نێرومێ لەم حدیثە فەرقی نییە
گەر مەلا نەهی فەرموو دینی نییە
تۆ وەرە فن فێربە چیتە لەوە
گاوڕە، جووە، یاخود هیندووە»

**سەرچاوەکان:**

١- دیوانی حاجی قادری کۆیی - گیوی موکریانی
٢- مێژووی ئەدەبی کوردی - عەلائەدین سجادی
٣- کۆمەڵە شعری حاجی قادری کۆیی - عەبدولڕەحمان سەعید
٤- حاجی قادری کۆیی - حەمەی مەلا کەریم
٥- خلاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان - محەمەد ئەمین زکی.
٦- مشاهیر الکرد وکوردستان /ج/٢ - محەمەد ئەمین زەکی.
٧- دراسات فی الأدب الکردی - روشن بدرخان.
٨- مقالات - رفیق حلمی.
٩- لێکۆڵینەوەکانی خۆم.

# مێژووی گۆرانی ئینتیباه

١٩٨٧

## پێشەکی

لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٢٠) و (١٩٣٠)دا ڕاپەڕینێکی گەرموگوڕ و پاک و پیرۆز، لە مەیدانی ڕۆشنبیری و هونەر و هۆنراوە و پەخشاندا، لە کۆڕی نیشتمانپەروەریی و کوردایەتی و مرۆڤ دۆستیدا لە سلێمانیدا ڕووی دا. کۆمەڵەیەکی گەورە هۆنراوەی نیشتمانی و ڕۆشنبیری لەلایەن بوێژ و وێژەوانەکانمانەوە دانرا کە زۆربەیان کران بەگۆرانی و، لە خوێندنگاکانی کوردستانی عێراقدا، بەئاوازێکی خۆش و بەجۆشەوە، لەلایەن شاگردەکانەوە دەخوێندرانەوە. مامۆستایان (زێوەر و ڕەفیق حلمی و فائق بێکەس و عەبدلواحید نوری و شێخ نوری شێخ سالح) لەو جۆرە بوێژ و وێژەوانانە بوون. ئەگەر بەپێی ژمارەبێ، (زێوەر) لە هەموویان زۆرتری دانابوو. بەڵام ئەگەر بەپێی نرخ و بایەخ و گرنگیی و کاریگەریی بێ، گۆرانییەکەی (شێخ نوری شێخ سالح)، کە ناوی (إنتباه) بوو لە هەموو ئەو گۆرانییانە پایەی بڵندتر بوو. ئەمەیش سەبارەت بەوە بوو کە ئەو گۆرانییە هەر هەستی نەتەوایەتیی (شێخ نوری)ی پێشان نەدابوو، هەست و تەزوو و، تاسە و بیروباوەڕی دڵ و دەروون و هۆشی کوردەواریی ئەو سەردەمەیشی دەربڕیبوو، کە دامابوون لەسەر (دادپەروەری) و (بەزەیی هاتنەوە)ی کاربەدەستانی جیهان و ئەوانەی پەیوەندییان بەکوردستانەوە هەبوو. هەروەها کە دژی ستەم و زۆرداریی ناوخۆ و، ئەو فەرمانڕەواییانە وەستابوون، کە بووبوونە هۆی سەرگەردانی و پاشکەوتوویی کوردەواریی و کاولبوونی کوردستان.

لە ڕاستیدا گۆرانی (إنتباه) هی (م. نوری) نەبوو. هی بوێژێکی ئافرەتی فەرەنسەیی بوو، کە ناوی (ماری ژۆزەف شەنی) بوو. ئەم ژنە بەبۆنەی یەکێک لە شۆڕشە گەورەکانی فەرەنسەوە ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەی دانابوو. کە هۆنراوەکە کرا بەگۆرانی و لە شێوەی (لاسایی کردنەوەیەکی بەگۆرانی)[1]دا، پێشانی نەتەوەی فەرەنسە درا، لە هەموو لایەکەوە خۆشەویستیی و ڕێزیان بەرامبەر گۆرانییەکە و خاوەنەکەی پێشان دا کە بەهۆی ئەوەوە ناوبانگێکی گەورەیشیان دەستکەوت.

جا لێرەدا هونەر بۆ (مەحموود جەودەت)ە، کە لە ڕووی نیشتمانپەروەریی و ئازایەتی و مەردایەتییەکەیەوە، وێژەوانێتییەکەی خۆی خستە کار و، ئەم گۆرانییەی لە ساڵی ١٩٢٥دا لە فەرەنسییەوە گێڕییە سەر زمانی کوردی. لە بوێژەکانیشمانی داواکرد، کە یەکێکیان ئەم پەخشانەی ئەو بخاتە شێوەی هۆنراوەوە و ئاوازێکیشی بۆ بدۆزێتەوە، تا لەلایەن شاگردانی خوێندنگاکانی کوردستانەوە، بەگۆرانییەوە بخوێندرێتەوە.

لێرەیشدا هونەری (شێخ نوری) دەردەکەوێت، کە لە پێش هەموو بوێژێکدا، ئەو پەخشانەی (مەحموود جەودەت)ی بەهۆنراوە خستە شێوەیەکی جوان و ڕەنگین و ئاهەنگ دارەوە و، ئاوازێکی جوانیشی بۆ

---

(١) واتە: ئۆپەرێت یان ئۆپێرا.

دۆزییەوە و، وەک گۆرانییەکی نیشتمانیی زۆر خۆش و بەجۆش و گەورە و گرنگیش لەناو خوێندنگاکانی کوردستاندا بلاوی کردەوە(*).

لەوەدا دەرەکەوێ کە ئەم گۆرانیی (إنتباه)ەیان لەگەڵ چیرۆکی (نیرۆن) و چیرۆکی (سکالانووس)دا، لەسەر شانۆی خوێندنگاکەیان، بە(تیپی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاساییکردنەوە)، لاساییکردەوە کە

---

(*) خوالێخۆشبوو (مەحموود جەودەت) ئەو ئۆپەریتەی لە فەرەنسیەوە بەناوی (ئینتیباه)ەوە بەشێوەی (پەخشان) کردۆتە کوردی و لە (ژیانەوە)ی ژمارە (٢١)ی ١٩ مارت ١٩٢٥دا لە لاپەرە چواردا بەشێکی بلاوکراوەتەوە، بەشی دووەمی لە ژمارە (٢٢)ی ٢٦ مارت ١٩٢٥دا بلاوبۆتەوە.

جا لەبەر گرنگی باسەکە و ئەو لک و پۆپانەی لە دواییدا لێی دەبنەوە، وای بەباش دەزانم کە دەقی وەرگێڕانەکە (بەپەخشان) وەک ئەوەی لە ژیانەوە دایە بخەینە بەرچاوی خوێنەر و بەشێوەی ڕێنووسی ئێستا پێشکەشی کەین:

**ئینتیباه**

دوێنێ شەو لە سکونەتی عەمیقەی نیوەشەوا لەناو ژوورەکەما کە بەڕۆشنایی مانگ نیوە رووناک ببووەوە، بەنیەتی نووستن ڕاکشابووم و چونکە زۆر هیلاک و ماندوبووم ئەمویست زوو خەوم لێ بکەوێ. فەقەت هەرچەندم ئەکرد و ئەکۆشام بەهیچ کلۆجێک خەو نەئەکەوتە چاوم. چونکە خەیاڵ و وەزعیەتی وەتەن و ئارەزووی تەئسیسی ئەمن و ئاسایش تیایدا موخەییەلەی بەسورەتێک ئیستیلا کردبوو لە پاش موددەتێکی زۆر کەم ئەوەی کە فکرم لێ ئەکردەوە عادەتا بەچاو دەمبینی.

لەم خەیالاتەدا وا ئەهاتە پێش چاوم کە لە (دەشتی وەیس)[1]دا؛

ریش سپی، منداڵ، پیاوی قەیرە، ژن، کوڕ، کچ، حاسڵ گەورە و بچووک عەشاماتێکی ئەوەندە کۆبووبودوە کە تەشبیهکردنی ئەم قەلەبالغە بەشارەمێروولەیەک جائیز بوو، ئەم خەڵقەش بەئیعتیباری ئەکسەریەتەوە پڕ چەک و سیلاح بوون، لەم دەشتەدا کە لەبەر ئینسان وەک بەحرێکی موتەلاتیم وابوو بەدەرەجەیەک سکووت و سکوونەت حوکم فرمابوو کە ئینسان عادەتا گوێی لە وزەی باڵە مێشوولە دەبوو.

منیش لە کن (گردەکەی شێخ محێدین)[2]ەوە لەناو ئەم عالەمەدا خۆم دەبینی. ناگەهان دەنگ و ئاهەنگ و گۆرانییەکی زۆر مونەسیرم هاتە بەر گوێ.[3] گۆرانییەکە مەوزون و گفتەکەش موهەیج بوو، چاوم هەڵبڕی کە تەماشام کرد ئەم گۆرانییە چەند سیلاح بەدەستێک لەسەر گردەکەوەن، ئەیانوت و نەقەراتی ئەم گۆرانییە بەیەک ئاهەنگ لە تەرەف عمووممەوە تیکرار ئەکرایەوە و لە تەنیشت ئەم سیلاح بەدەستانەوە چەند دایکێک کە هەر یەکە دەستی منداڵێک بەدەستەوە، چەند منداڵێکی دەدوانزە ساڵ، چەند ژنێکی مێردار، چەند =

---

*(١) دەشتی وەیس: کەوتبووە ڕۆژئاوای شارەوە بەپاڵ کارگەی جگەرەی ئێستاوە، شەخسێکی لێیە، خەڵکی بۆ نیاز و موبارەکی زیارەتیمان دەکرد، بەگۆرانیەوە دەوترا: بابچینە سەر (وەیس) وەیسی خۆمانە لە وەیس دەپرسین خەتای کامانە.*

*(٢) گردی شێخ محێدین: خوار دەشتی وەیسە، ئەو گردەی نێوان کارگەی جگەرە و کارگەی سەهۆلەکەی گەرەبێت، ئێستا (گەڕەکی شێخ محێدین)ە.*

*(٣) تا ئێرە لە ژیانەوەی ژمارە (٢١) دایە.*

بەسایەی دەستکەوتی ئەو ئاهەنگانەوە، کە سێ شەوی خایاند، گەلێک ئامێری ساز و ئاواز و، کەلوپەلی وەرزش و دیدەوانییـان بۆ خوێندنگاکـەیان کـری، بێجگە لەوەیش دەسـتگـیرۆیی گـەلێک شـاگـردی

---

=کچێکی چوارده ساڵ لەسەر خەتێک بەتەرتیب ڕێک ڕاوەستابوون و بەسورەتێکی حوزن ئەنگیز، جەسارەت بەخش دەستە دەستە بەڕیزە لەسەر ئەم گۆرانییە کە ئەقەراتەکەیی لە تەرەف عمـوومەوە تیکرار ئەکرایەوە دەوامیان ئەکرد.

گۆرانیەکەم عەینەن[1] لەبیر نەما، فەقەت خولاسەیی مەئالەکەی[2] ئەمەبوو کەوا عەرزی دەکەم.

## دەستەیی لاوەکان

ئێمـە دلاوەرانی کوردان بۆ تەئمـینی سـەعـادەتی مـیللەت ئەوا هەووەڵ هەنگاومان هاویشت. ئاڵای زەفـەر بەمەسروریەت لە پێشمـانەوە ڕەفعی مەوانیعی ئامالمان ئەکات. بۆ ئیمحای زوڵم و تەعەسسوب لە هەمـوو کوردستـاندا. تەپڵبـازی سوارانی جەنگاوەر دەستی کرد بەلێدان، ئەی دوشمنانی کوردسـتـان، ئەی زاڵمـان و خوێنخۆران بلەرزن ئەمە میللەتە کە هەڵساوە، ئەی غەدداران هەر لە ئێستاوە کفن بۆ خۆتان حازر بکەن.

«نقرات»

مادەری وەتەنمان، کوردستان، ئیستیمدادمان لێ دەکا. ئێمە کە ئەولادی ئەوین هاتین بەئیمدادیەوە و عەزمان کرد کە نجاتی بدەین و لە ڕێگای نەجاتی ئەودا بمرین. ئێمە هەر بۆ خزمەتی ئەو ئەژین لە ڕێی ژیانی ئەودا مردن بەژیان ئەزانین.

## سێ چوار دایک

ئەی دلاوەرانی وەتەن قەتعیەن زەن مەکەن کە لە دیدەیی مادەرانەیی ئێمە بەحوزنێکی زەلیلانەوە فرمێسک بێتە خوارێ، چونکە ئێمە ئەزانین کە ئێوە دەستـتان دایە تفەنگ تۆفیق ڕەفیقاتانە و زەفەر یار و یاوەرتانە، لەبەر ئەمە لازمە هەر لە ئێستاوە زاڵمان و دوشمنانی کوردستان ئەشکرێژی مەزەللەت بن.

ئەی جەنگاوەران ئێمە ئێوەمان هێنایە دنیـاوە لەبەر ئەمە حەیاتتـان هی ئێوە نییە. عائیـد بەوەتەنە. چونکە لە پێش ئێمەدا مادەر ئەوە.

«نقرات»

## سێ چوار باوک

ئەی (غظنفران) ئێوە کە قەلبتان بەڕابیتەیی ئەبەویەتەوە زەرەبات دەکا لە ساحەیی جەنگ و جیدالدا ئێمەتان لەبیر نەچێتەوە بۆ ئەوەی ڕۆحی ئێمە بەموفەقیەتی ئێوەوە دائێمەن شەعشەعانیێ، لە هیچ شتێک سڵ مەکەن و بەبریننداری و شان و شەرەفەوە وەرنەوە سەربالینی ئێحتیزاری ئێمە و بەدەستی خۆتان دیدەیی نوکرانی ئێمە لێک بنێن.

«نەرات»

## چەند منداڵێک

نەتیجەی زەفەر کە تەئمینی سەعادەت و مەسەرەتی دلاوەرانی وەتەن پەروەر دەکا، نەتیجەی ئامالی ئێمەیە؛=

(١) عەینەن: وەک خۆی، کتومت.

(٢) مەئال: پوختەکەی، ماناکەی. لە (ماآل إلیه) عەرەبییەوەیە.

هەژاریشیان پێ کرد بۆ کرینی جلوبەرگی وەرزش و دیدەوانی. تا ئێستاکەیش یادی ئەو کارگێر و ماموستایانە لەبیری ئەتەوەکەماندا ماون و، بەرێز و خۆشەویستییەوە ناویان دەهێنن. (سالح قەفتان،

---

= مردنێک کە تەئمینی ژیانی ئەبەدی دڵی میللەتێک بکا بکاتە غایەی موقەددەسی ئێمەیە.

ئەو ترسنۆکانە لەژێر باری حەیاتدا دەناڵێنن، لە ژیان نەگەیشتوون، ئەوانە کە لە رێی سەعادەت و رەفاهی میللەتی خۆیاندا ئیفنای حەیاتیان کردووە هەر ئەوان ژیاون و ئەژین. هەوەڵ دەرسی ئێمە لە ئاغووشی[1] مادەردا، لەسەر ڕیحلەی مەکتەب ئەمەبوو.

«نقرات»

## سێ چوار ژنی مێرددار

برۆن ئەی ڕەفیقان دلاوەران، شەڕ جەژنی ئێوەیە، برۆن ئەی جەنگاوەران، برۆن هەتا بەموزەففەریەت نەگەڕێنەوە. بۆ گوڵبارانی ئێوە و تەزیینی تاقی زەفەرتان ئێمەش گوڵ ئەچنینەوە.

ئەگەر دەستی زوڵمی زەمانە چەند وجودێکی عەزیزی ئێوە ئەبەدییەن لە ئێمە جوێ بکاتەوە، ئێمەش بەزەفەر و غالبیەتی ئێوەوە ئەبەدییەن ئەلاوێنینەوە و فیکری ئینتیقامی ئێوە بەسوورەتێک تەلقینی ئەو شێربەچانەی،[2] کە لە باوەش و سکماندان، دەکەین کە هەر قەترەیەکی خوێنی ئێوە ببێتە دەریایەک کە سەد هەزار زاڵمان غەرق بکات!

«نقرات»

## چەند کچێک

ئێمە کە خوشکانی قەهرەمانین و هێشتا رابیتەی موقەددەسەی ئیزدیوازج لامان مەجهولە، ئەگەر لەگەڵ حەیاتی ئێمەدا ئەوجەوانانی وەتەن ئارەزووی ئیشتیراک بکەن لازمە بەچەهرەیەکی ئارایش و ڕایەی زەفەرەوە عەودەت بکەنەوە و بۆ ئیستیحسالی ئەم غایە موقەددەسە لەم شەڕە موبارەکەدا خوێنی خۆیان ڕژاندبێ.

«نقرات»

## تاقمی جەنگاوەران

لەژێر ئەم چەک و سیلاحەدا، لە حزور خوای عالەمیان و ئەم عەشاماتە و دایک و باوک و خوشک و برا و ماڵ و منداڵماندا سوێند دەخۆین کە ڕیشەیی زوڵم و زاڵمان بکێشینەوە و ئەمن و ئاسایش لەم کوردستانەدا تەئسیس و تەئمین بکەین.

***

بەندە بەجامەییکی (زرین فرۆشتەنیەوە؟) کە بەئەمانەت لامبێ ئەوی خودغایی بکەم. بینائەن عەلەیهی دەرهەق ئەم گۆرانیە کە ناوی (گۆرانی عەزیمەت)ە، ئەختێ عەرزی مەعلومات بەلازم ئەزانم.

ئەم گۆرانییە لە تەرەف ژنە فرانسزیەکەوە کە ناوی (ماری ژۆزەف شەنی)یە وتراوە، لەناو فرەنسزەکاندا بووە بەگۆرانییەکی زۆر مەرغوب و مەشهوری میللی.

بەندە کە خوێندمەوە ئەم مەوزوعەم وەک فەوەرانی حیسیاتێکی عموم کە لەم موحیتەدا بەرامبەر زوڵم و=

(۱) ئاغووش: ئامێز، باوەش.

(۲) شێربەچە: بێچووە شێر.

زێوەر، سەعید کابان، عەلی ئاگا، فوئاد ڕەشید) لەو جۆرە مامۆستایانەن. هەروەها (عەبدولواحید نوری،

---

= ئیعتیسافی شێخ مەحموود و تەبەعەی و لە کوردستانی شیمالیدا بەرامبەر ئیستیبداد و وەحشیەتی تورک حاسڵ بووبێ، وا هاتە پێش چاوم. وە فیکری مونەزەمە کەی کە ئەساس تەشکیل دەکا بەنەزەر ئەحواڵی ڕوحیە و تەمایلاتی خۆمانەوە نەختێ هەڵمگێڕایەوە و بەموقەددیمەیەکەوە عەرزم کرد.
لە تەرجومەکردنی عەرزی ئەسڵیشم. ئەگەر یەکێ لە شاعیرەکانمان مەوزوعەکەی لا چا بوو (چاکبوو. أ. ب) بەزمانی خۆمان نەزمی بفەرموێ تاکو لە تەرەف منداڵەکانی مەکتەبەوە بەگۆرانی بیێژرێ، لام وایە ئەم هیممەتە هەموو هاوخوێن و هاوزمانمان خۆشحاڵ دەکا.

مەحموود جەودەت[1]

(1) وابزانم ئەسڵی بابەتەکەی لای خوێنەر ئاشکرایە، هەروا سەرچاوە ئەسڵیەکە، هەندێ وشە لە کاتی گواستنەوەدا، بەداخەوە، لە ڕۆژنامەکەدا باش دەرنەچوو بوو. (ژین - ژ ۲۱، ۱۹۲۵/۳/۱۹ و دواتر).
دەمێنێتەوە سەرنجەکەی کۆتایی مەحموود جەودەتی وەرگێڕی ئەم پارچەیە کە لە کارەکەیدا (نەختێ) دەستکاری وای کردووە تا خوێنەر وا نێزیکخاتەوە لە دەوروبەری ئەو ڕۆژەی سلێمانی بچێ یا کوردستانی شیمالی!!
لەو ڕۆژەشدا (مارتی ۱۹۲۵) شێخ مەحموود تەنگ بەشۆڕشەکەی هەڵچنرابوو و لە ناوچەی پێنجوین بوو، کەمالیە تورکەکانیش تەنگیان بەشۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران هەڵچنیبوو و ئیعلانی کورد قڕانیان کردبوو.
لێرەدا جەودەت ئەم دوو دیاردەیەی باکور و باشوور دەخاتە یەک تای تەرازووەوە! ڕابەری نەتەوەیەک لە ۱۹۱۸ وە دژی داگیرکەری تورک و ئینگلیز جەنگاوە و دەربەدەر، لەگەڵ جەللادێکی کورد کوژ.
(زوڵم و ئیعتیسافی شێخ مەحموود و تەبەعەی = ئیستیبداد و وەحشیەتی تورک لە شیمال)... ئەمە ئەگەر (سوئی فەهم) و (جەهالەتی) ئەو ڕۆژە نەبێ یا کینە و بێگانە پەرستی نەبێ دەبێ چی ناونرێ.
(ژیانەوە) ئۆرگانی ئینگلیز و حوکمە عەرەبیەکەی بەغدابوو لە سلێمانی، تەسخیر کرابوو بۆ (ڕاگەیاندنێکی دژ بەکورد و شۆڕشەکەی)، بۆ مێشک ئاودانی خەڵکی و تێگەیاندنیان بە بێ هودەیی (شۆڕش و یاخی بوون و جەردەیی)! بەسوود و قازانجی مام ئینگلیز و عەدالەت و مەرحەمەتی حوکمەتەکەی بەغدا، ژیانەوە ببووە (وردبینێ) و بەدووی زەڕەیە لە هەڵە و ناڵەباری حوکمی سەردەمی شێخدا دەگەڕا و نەشری دەکرد. (بڕوانە ژمارەکانی). بەداخەوە لەو هەوڵ و کارەشدا داگیرکەران دەسەپاچەنەبوون، داماونەبوون، هەر قەڵەمی لەم بابەتە زۆر بوو کە (فی سبیل الله) ئەوەی خۆیان نەیاندەزانی و پێیان نەدەکرا ئەمان بەخۆبەخشانە بۆیان دەکردن.
بەلام کە دوایی، دوای سێ چوار ساڵ ژیان لەژێر سایەی ئەو (بەیاخی عێراق و بەریتانیای موعەززەمەیەدا)، ڕەش و سپیان بۆ ئاشکرابوو، بۆیان دەرکەوت کە داگیرکەر هەر ئەوەیە کە بوو و دەبێ... ئەوساکە، د. کەمال مەزهەر وتەنی: (زۆری ئەبرد کاتێک ئەوانەی لە -ژیانەوە-دا دەیاننووسی لەوەگەیشتن... بۆیە بەشێکیان دەستیان لە نووسین هەڵگرت و لە کاری سیاسی دوورکەوتنەوە و بەشێکیشیان دایانەوە پاڵ شێخ مەحموود).
بۆ پەندی زەمان، مەحموود جەودەت یەکێک بوو لە تاقمی دووەم کە دایەوە پاڵ شێخ و شۆڕشەکەی، (لە دوای ٦ی ئەیلوولی ۱۹۳۰). بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان. کە وەرگێڕ داوای لە شاعیرانی کورد کرد ئەو پارچە شیعرە فەرەنسیەی بەپەخشان کردوویە بەکوردی، یەکێک بیکاتە شیعر تا لەلایەن منداڵانی قوتابخانەوە وەک سروودێ بوترێ... شێخ نووری شێخ ساڵح ۱۸۹٦ - ۱۹۵۸/۱۲/۲۰ ئەم کارەی بەجوانی ئەنجامدا.
جا گرێی باسەکەی مامۆستا شاکیر فەتاح ئا لێرەدایە! مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم ڕای وایە بێخوودی شاعیر ئەو کارەی کردووە، کاک ئازاد عەبدولواحید و مامۆستا هەردی و کۆمەڵێک لەگەڵ ئەوەدان کە، کردن بەشیعرەکە، لەلایەن شێخ نووریەوەبێ. ئەم باسەی مامۆستا بەدەوری ئەو تەوەرەدا دەخولێننەوە.

کەریم سەعید، مستەفا سائیب)یش لە لاوانی ئەو سەردەمەبوون و لە لاسایی کردنەوەکەدا یارمەتییان دا. جا ئەوانە هەموویان شایانی ڕێز و سوپاسن چونکە بەکاری نەتەوەکەمان هاتن.

کاروبار بەم ڕەنگە بوو، تا ڕوودانی کارەساتی شەشی مشتاخان (ئەیلوول) و ساڵی ١٩٣٠. ئیتر لەوە بەدواوە بەربەستی ئەو گۆرانییانە کرا. بەرەبەرە گۆرانییەکان لەبیر چوونەوە. تەنانەت گۆرانیی (إنتباه)یش بەخاوەنەکەیەوە کە (شێخ نوری شێخ ساڵح) بوو تا ماوەیەکی دوور و درێژیش لەبیر چووەوە... کەواتە ئێمە ڕێز و سوپاس و پیرۆزباییمان لەسەرە کە پێشکەشی سێ نووسەری تریشمان بکەین، واتا (دکتۆر کامل حەسەن عەزیز بەسیر) و (موسلیح مستەفا جەلالی) و کاک (ئازاد عەبدواحید)، چونکە هەریەکەیان لە ناوەند ساڵەکانی ١٩٨٠ و ١٩٨٥دا، نووسراوێکی لەسەر (شێخ نوری شێخ ساڵح) و بەرهەمەکانی نووسی و هەرسێکیشیان پایەی گەورەیان لەناو نووسەران و بوێژانی سەردەمی خۆیدا، کە شایستەیەتی بۆ ئامادە کرد. هەر وەها ئەوەیشیان چەسپاندە دڵی کوردپەروەرانەوە کە گۆرانیی (إنتباه) ئەو دایناوە؛ واتا ئەو لە پەخشانەکەی (مەحموود جەودەت)ەوە کردوویە بەهۆنراوە و ئاوازێکی نایابیشی بۆ دۆزیوەتەوە و، فێری شاگردەکانی خوێندنگای کوڕانی سەرەتایی یەکەمی سلێمانیشی کردووە و، لەوێیشەوە بڵاوبۆتەوە بەناو خوێندنگاکانی تری کوردستاندا.

هەروەها لە لاپەڕەکانی ئەم نووسراوەدا پیشان دراوە، نووسەری ئەم نووسراوە لە گەلێک دەرفەتدا هەوڵی داوە کە ئەم گۆرانیی (إنتباه)ە و گۆرانییەکانی تریش، لەلایەن کاربەدستانی (خوێندەواری) و (ڕۆشنبیری)یەوە، هەروەها لەلایەن تیپەکانی (لاسایی کردنەوە) و (ساز و ئاواز و گۆرانییەوە) سەرلەنوێ تازە بکرێنەوە و زیندوو بکرێنەوە و بخرێنەوە ناو خوێندنگاکان. چونکە پڕن لە ساز و ئاوازی خۆش و بەجۆش و، وشەی بەنرخی نیشتمانیی و مرۆڤایەتی. ئێستاکەیش دیسانەوە تکا دەکەمەوە لەو کاربەدستانە و لەو تیپانە کە ئەم کەلەپووری نەتەوایەتییەمان زیندوو بکەنەوە و نەهێڵن لەناوبچێ.

شاکر فەتاح

«خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد»

(سلێمانی): (١٩٨٧/١٢/١٧)

# مێژووی گۆرانیی (إنتباه)

جێگای دڵخۆشی و سوپاسی خودایە، کە لە ماوەی شەش ساڵدا، (١٩٨٠ - ١٩٨٥)، سێ نووسراو لە بابەت (شێخ نوریی شێخ ساڵح) و بەرهەمەکانییەوە، لەلایەن سێ نووسەری کوردی بەڕێزەوە چاپ کرا:

١- شێخ نوری شێخ ساڵح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا - د. کامیل بەسیر، ساڵی ١٩٨٠.

٢- شێخ نوری - دەنگی ڕەسەنی شیعر - موسڵیح مستەفا جەلالی، ساڵی ١٩٨٤.[1]

٣- دیوانی شێخ نوری شێخ ساڵح - ئازاد عەبدلواحید، ساڵی ١٩٨٥.

هەرچەندە ئەم سێ نووسراوە ناوازە و نایابانە، لە بابەت ژمارەی لاپەڕە و، شێوەی نووسین و داڕشتن و، بیروباوەڕەوە، هەندێک جیاوازن لەیەکتری بەڵام نووسەرەکانیان، هەموویان، لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (شێخ نوری شێخ ساڵح) سەردەستەی بوێژ و وێژەوانانی سەردەمی خۆی بووە، لە پایەبڵندیدا، لە تازەکردنەوەی وێژە و هۆنراوەی کوردیدا، لە ڕۆژنامەنووسیدا، لە بەکارهێنانی دەستووری زانستیی لە ڕەخنەسازی و نرخ دانانی وێژەییدا، لە خەباتی نیشتمانیدا، لە بەرزکردنەوەی سەری کوردەواریدا. بەرهەمە ناوازە و نایابەکانیشی بەڵگەن بۆ ڕاستیی قسەکانی ئەو سێ نووسەرە. هەروەها لەسەر ئەوەیش یەک بیروباوەڕن کە (گۆرانی إنتباه)، بەرهەمێکی پەرچڤەکراو و، پاک و پوختە و نەژادی (شێخ نوری)یە، نەک هی (مەلا مەحموودی بێخود).

لە ڕاستیدا (شێخ نوری شێخ ساڵح)، خودای گەورە، سێ بەهرەی گەورەی پێ بەخشیبوو: سەروسیمایەکی جوان و پرشنگداری هەبوو، کە دڵپاکی و دەروون ئازادی و، سەربەستیی بیروباوەڕت لەدەم و چاویدا دەخوێندەوە، لەگەڵ ڕووخۆشی و زمان شیرینی و نەرم و نیانیدا. دەنگێکی نەرم و

---

(١) ئەوەی پێویستە لێرەدا بخرێتە بەرچاو، دەربارەی ئەو کتێبەی خوالێخۆشبوو (موسڵح جەلالی) ئەوەیە کە ئەو کاتە ناوبراو بەڕێوەبەری گشتی دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بوو لە بەغدا، هیچ سەر و ساختییەکی لەگەڵ شیعر و ئەدەبیاتدا نەبوو؛ کاک عەبدولقادر عەلی مەردان کە کارمەندێکی هونری بووە لەو دەزگەیە لە یەک شەممەی ٢٠٠٢/٩/١ لە ماڵی لەتیف هەڵمەتی شاعیر بۆی باسکردم کە: ئەو کتێبەی لەسەر شێخ نوری، خوالێخۆشبوو (م. ن)ی شاعیر بۆی نووسیو ئامادەیکرد و بەناوی (موسڵح)ەوە بڵاوکرایەوە، لەوەشدا سوودێکی زۆر لە کتێبەکەی کاک (ئازاد عەبدولواحێد) وەرگیرا... نەک هەر ئەمە بەڵکو کتێبی (شوراتەکان)یش کە دیسان (م. ن) ئامادەیکرد و بەناوی ئەوەوە بڵاوکرایەوە. بڕوانە: (موسڵح جەلاکی - شوراتەکان، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی - دار الحریە للطباعە، بغداد ١٩٨٧ زنجیرەی ژمارە - ١٥٦-). جا لێرەدا هیچ ناوترێ جگە لەوەی زۆر جێی داخ و مەخابنە کە لە سەردەمەکاندا خاوەن قەڵەمی وا پەیدا دەبێ، بەکرێ، کار بۆ کەسانی خاوەن پایە و دەسەڵات دەکەن لە بەرامبەر سوود و دەسکەوتێکی کاتیی کەمخایەن و خۆیان دەکەنە (أقلام تحت الطلب) و (أقلام مأجورە)... نەک هەر ئەمە بەڵکو نموونەی لەم بابەتە زۆرن، ئەوساکە و ئێستاش، کەچی لە بەدبەختی و چارەڕەشییان، کارەناپەسەندەکانیان هەر ئاشکرا دەبێ.

خۆشیشی هەبوو، لە کاتی گۆرانی گوتندا، دڵی پیاوی کێش دەکرد و کاری تێدەکرد. بلیمەتی و، هەڵکەوتوویی و لێ هاتوویشی هەبوو، کە لە بەرهەمەکانیدا دەردەکەون، لەگەڵ کردەوە و ڕەوشت و خەباتە نیشتمانییەکانیدا. جا ئەم سێ بەهرەیە بوون، کە (شێخ نوری)یان گەیاند و پۆیەی ئاوبانگی بوێژیتی و وێژەوانی خەباتی نیشتمانی و ڕۆژنامەنووسیی، لە کوردستانی عێراقدا، بەتایبەتی لە سلێمانیدا، لە ساڵەکانی (١٩٢٠ - ١٩٣٠)دا.

لە ساڵی ١٩٢٥دا، (مەحموود جەودەت)، کە ئەفسەرێکی کورد و نووسەرێکی دەروون ئازاد و ئەبەرد و هونەرمەندێکی ڕەندبوو لە وێنەکێشاندا، کۆمەڵە هۆنراوەیەکی لە زمانی فەرەنسیزییەوە گۆڕییە سەر زمانی کوردی، ناوی نابوو: (إنتباه)(*)

خاوەنی ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە(١) ناوی (ماری ژۆزەف شەنی)یە کە ژنێکی فەرەنسزی بووە. وا دیارە ئەو ئافرەتە بەبۆنەی یەکێک لە شۆڕشە گەورەکانی فەرەنسەوە. ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەی هەڵبەستووە. (مەحموود جەودەت)یش داوای کردبوو لە بوێژەکانمان یەکێک ئەم هۆنراوەیە، کە (بریتییە لە گۆرانییەکی نیشتمانیش) بکات بەهۆنراوە و ساز و ئاوازێکیشی بۆ بدۆزێتەوە، تا لەلایەن شاگردەکانی خوێندنگا کوردییەکانەوە بەگۆرانییەوە بخوێندرێتەوە.

---

(*) تەماشای ڕۆژنامەی (ژیانەوە) بکە، کە لە شاری (سلێمانی)دا دەردەچوو ژمارە (٢١)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/١٩ و، ژمارە (٢٢)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٢٦. (ش. ف)

(١) بەڵکو: (ئەم هۆنراوەیە) کە لە ئەسڵەکەدا چامەیەکە و مەحموود جەودەت بەشێوەی پەخشان گۆڕیویە بۆ کوردی. مەحموود جەودەت لە ١٩٣٠دا دیسان (مەنزومەیەک)ی تری لە فەرەنسیەوە بەمجۆرە کردە پەخشان: (تەرجومەی پارچە مەنظومی - سولی پرودوم- کە یەکێکە لە ئەدیب و وطن پەروەران فرانسزە - گوڵی خوێنین-. ژیان: ژ ٢٤٣ لە ٥ حوزەیران ١٩٣٠). ئەحمەد موختار جافی شاعیر (١٨٩٨ - ١٩٣٥/٢/٦) بەزوویی ئەو پەخشانەی کردە پارچە شیعرێکی بەسۆز و هەر لە (ژیان، ژ ٢٤٧ی ٢٦ حوزەیران ١٩٣٠)دا بڵاوکرایەوە، دوادێڕی:

موقابیلی ئەم دەرد و بەڵایە
ئازاد ئەپشکون گوڵانی وطن
چەند بێ ویجدانن، ئێوە ئەبوایە
بۆ مردووەکانمان هەر بکەن شیوەن

هەروا هەر ئەو تەرجەمەیەی بەناوی (ازهاری خوێنین) لە گۆڤاری زاری کرمانجیدا لە گۆشەی (شیعر منسور)دا بڵاوکردۆتەوە. بڕوانە: زارکرمانجی. ژ ٢٣ ساڵی (٥) ٤ حوزەیرانی ١٩٣٠ ڕەواندز ل: ٩ - م. ج: ترجمەی پارچەیەکی منظومی سوللی پرۆدیۆم...

سۆلی برۆدووم Sully – Prudhomme (١٨٣٩ - ١٩٠٧) شاعیرێکی فەرەنسی بەتوانابوو، بایەخی زۆری بەلایەنی فەلسەفی لە مرۆڤدا دەدا، لە بەرهەمەکانی: تەنیاییەکان، چارەنووسەکان. لە ١٩٠١ پاداشتی نۆبڵی لە ئەدەبدا پێ بەخشرا.

(مەحموود جەودەت)یش، هەروەک پیاوێکی دڵناسک بوو و، بەزەیی بەنەتەوەکەی خۆیدا دەهاتەوە، کە ئەو سەردەمە لە هەموو لایەکەوە ئازار دەدرا و زیانی لێ دەدرا و، دەچەوسێنرایەوە، پیاوێکی زیرەکیش بوو. بۆیەکا لەو ڕۆژانەدا ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەی، بەپەخشان، کردبوو بەکوردی و، داوای کردبوو بیکەن بەهۆنراوە و بەگۆرانی، کە ئاگاداربوو لە خەباتی نیشتمانیی کە لە هەموو لایەکی کوردستاندا لە ئارادابوو، چ بەجەنگ و، چ بەپێنووس و خەباتی بێ خوێن، بۆ دەستکەوتنەوەی مافی نەتەوایەتی بۆ کوردەواری.

(شێخ نوری شێخ ساڵح)یش کە ئەو سەردەمە لە هەرەتی خەباتیدا بوو، لە پێش هەموو کەسێکدا ئەو خواستەی (مەحموود جەودەت)ی جێبەجێ کرد. هێنای (إنتباه)ەکەی (مەحموود جەودەت)ی، لە شێوەیەکی جوان و ڕازاوە و شۆخ و شەنگدا، بەجلوبەرگێکی کوردییەوە و بەبیروباوەڕ و گیانێکی کوردایەتییەوە، کرد بەهۆنراوە و، ئاوازێکی یەجگار پڕ ئاهەنگ و خۆشیشی بۆ دۆزییەوە کە لەسەر کێشی ئاوازی گۆرانییەکی فارسی بوو، کە ناوی (دیشب کی مەرا وضعی وطن در نظر آمەد) بوو. ئەمەیش هەر لە ساڵی ١٩٢٥دا پێکهات.[١]

لە ساڵی ١٩٢٥دا، دیسانەوە، ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە لەگەڵ چەند گۆرانییەکی تری کوردیدا کە بەهەموویان ژمارەیان دەگەیشتە (٢٠) بیست گۆرانیی کوردی، لەژێر ناوی (گۆرانی کوردی)دا، لەلایەن شارەوانی (سلێمانی)یەوە و لە چاپخانەکەی خۆیدا، وەک نووسراوێکی بچووک چاپ کرا. لە پشتەکەی

---

(١) لەکاتی خۆیدا باس و نووسین لەسەر ئەم بەرهەمە و کردن بەشیعرەی زۆر نووسرا: ئاخۆ لەلایەن بێخوودەوە بووە یان شێخ نووری؟، بەڵام وابزانم وتارە بەپێزە پڕ لە بەڵگە و ڕاستییەکەی مامۆستا ئەحمەد هەردی شاعیر کۆتایی بەهەموو ئەو گومان و ئەگەرانە هێنا و مەسەلەکەی یەکلایی کردەوە و خاوەنێتی شیعرەکەی دایە پاڵ شێخ نووری. جا لە باسی ئاوازی شیعرەکەشدا، مامۆستا هەردی دەڵێ: «مامۆستا گۆران لە پێشەکی شیعری - داستانی هەیاسی و کاکە عابیدین-دا دەڵێ: ... ئەو گۆرانییەی بەهاوکاریی خوالێخۆشبوو مەحموود جەودەت و شاعیری تەڕوپاراوم م. نووری پێکهات، ئاوازەکەی لەسەر پارچەیەک لە ئۆپەرای - ڕستاخیز شهر یاران...- دانراوە کە هی (عەشقی) شاعیری فارسییە، پارچەکە ئەمەیە:

دیشب کەمرا وضع وطن درنظر آمد

دیم کە زنی باکفن أز قبر درآمد

... ئەبێ بزانین کە -دلاوەران- سرودە... واتا ئەوەی ئەو سرودەی داناوە لە پێشا ئەو ئاوازەی بیستووە و کاری تێ کردووە و فێری بووە و ئەمجارە هاتووە شیعرەکەی لەسەر ئەو ئاوازە داناوە... بۆیە ئەو قسەیەی خوالێخۆشبوو مستەفا سائیب کە ئەڵێ: گوایە ئەو و کاک ئەنوەر سائیب ئەم شیعرەیان خستۆتە سەر ئاوازی: دیشب کە مرا...- زۆرم پێ ناخۆشە. تەنیا بەشی دوایی ئەم قسەیە بەتەواو ئەزانم کە دەڵێ شیعرەکە لەسەر ئاوازی - دیشب کەمرا...-یە). بەدوای ئەمەدا ئیتر مامۆستا هەردی کۆمەڵێ بەڵگەی هونەریی لە ئاوازدانانەدا بۆ شیعر یا بەپێچەوانەوە، دێنێ کە جێی باوەڕن. بۆ زیاتر بڕوانە: (هاوکاری - ڕۆژنامە: ژ ٩٩٣، ١٩٨٨/٧/٢١ ل: ٨- ئەحمەد هەردی: شیعری - دلاوەران- هی شێخ نوورییە).

نووسرابوو: «لەسەر آمری عالیی متصرف و مفتشی إداری چاپ کراوە». ئەوەی شایانی باسە، ئەوەیە کە گۆرانیی (إنتباه) بەناوی (م. نوری)، واتا (شێخ نوری شێخ سالح)ەوە لە چاپ درابوو. هەروەها ئەم گۆرانییەم لە چەند نووسراوێکی تریشدا دیوە کە بەناوی (شێخ نوری شێخ سالح)ەوە چاپ کراوە، وەک نووسراوەکانی: (کەریم سەعید)[1] و (موسلح مستەفا)[2] و (کوردی و مەریوانی)[3] و (ئازاد عەبدولواحید)[4]. کەچی لە سالی ١٩٧٠دا لەلایەن کاک (محەمەدی مەلا کەریم)ەوە، ئەم گۆرانییە کرابوو بەبەرهەمی (بێخود) و لە نووسراوی (دیوانی بێخود)دا بەناوی بێخودەوە چاپ کرابوو.

جا هونەری کاک (ئازاد عەبدولواحید) لەوە دایە، وەک لە نووسراوەکەیدا (دیوانی شێخ نوری شێخ سالح) و لە کۆڤاری (بەیان)، ژمارە (١٣٤)ی ئابی ١٩٨٧دا پیشانی داوە، بەتەواوەتی بۆ هەموو لایەکی خستۆتە روو کە ئەم گۆرانییە (إنتباه)ە، بەهەڵە کراوە بەهی بێخود، چونکە لە راستیدا هی (شێخ نوری شێخ سالح)ە، نەک هی بێخود.

(کاک ئازاد عەبدولواحید)، بێجگە لە گەلێک کەسی تر، وەک (کاک نوری کاکە حەمە) و کاک (ئەحمەد خواجە) و (مامۆستا فوئاد رەشید) کە خزم و دۆست و ئاشنای (شێخ نوری شێخ سالح) بوون و چووبووە دیدەنییان، هاتە لای منیش لە بابەت (شێخ نوری) و بەرهەمەکانییەوە، بەتایبەتی لە بابەت گۆرانیی (إنتباه)ەوە پرسیاری لێ کردم. منیش هەرچییەکم لەلا بوو، لە بەڵگە و بەرهەم و زانیاری پێشکەشم کرد و، بۆم چەسپاند کە گۆرانییەکە هی (شێخ نوری)یە نەک هی (بێخود). ئەو کەسانەی لەسەرەوەیش ناوم بردووم هەروەها لەسەر ئەوە سووربوون کە گۆرانی (إنتباه) هی (شێخ نوری)یە، نەک (بێخود).

لە سالی ١٩٢٧دا (شێخ نوری شێخ سالح) چەند رۆژێک هاتە خوێندنگای سەرەتایی یەکەمی سلێمانی، بەدەنگە خۆشەکەی خۆی ئەم گۆرانیی (إنتباه)ە کە خۆی داینابوو[5]، فێری کۆمەڵێکی گەورەی شاگردانی خوێندنگاکەی کرد. من خۆیشم یەکێک بووم لەو شاگردانە. ئەوساکە تەمەنم لە چواردە سالیدا بوو کە یەکەمی شاگردانی پۆلی شەشەم بووم. ئەمە لە بەهاری ئەو ساڵەدا رووی دا.

بەڵام لە هاوینی سالی ١٩٢٧دا، ئەم گۆرانییە، لە شێوەیەکی شەنگ و شۆخدا و، بەجلوبەرگ و چەک و روخسارێکی کوردانەوە، لەسەر شانۆی خوێندنگاکەمان، لەگەڵ چەند چیرۆکێکی تری لاسایی کردنەوەدا، بەگۆرانییەوە لاسایی کرایەوە.[6]

---

(١) گۆرانی: کەریم سەعید، سالی ١٩٢٨.

(٢) شێخ نوری، دەنگی رەسەنی شیعر: موسلح مستەفا جەلالی، ١٩٨٤.

(٣) گۆرانی کوردی: کوردی و مەریوانی، سالی: ١٩٣٧.

(٤) دیوانی شێخ نووری شێخ سالح: ئازاد عەبدولواحید، ١٩٨٥. (ش.ف)

(٥) بەڵکو راستتر: گۆڕیبوویە سەر نۆیەرێتێکی شیعریی.

(٦) بەشێوەی نۆیەرێت پێشکەش کرا.

مامۆستا (فوئاد ڕەشید) و کاک (کەریم سەعید) لەو لاسایی کردنەوانەدا بەشداربوون. گۆرانی (إنتباه)ەکە لەلایەن جەماوەرانەوە زۆر پەسەند کرا. من خۆیشم یەکێک بووم لەو شاگردانەی کە دەستەی منداڵانیان پێک هاتبوو. وەک دێتەوە بیرم فەرانبەرە گەورەکان و پیاوە ناودارەکانی شاریش بۆ ئەو ئاهەنگە هاتبوون. لاسایی کردنەوەکانیش تا سێ شەو دووبارە کرانەوە. بەپارەی ئاهەنگەکان گەلێک ئامێری فوویی و ساز و ئاواز و، کەلوپەلی دیدەوانی و، وەرزشی پێ کڕا، لەگەڵ دەستگیرۆیی کردنی شاگردە هەژارەکان لە دروستکردنی جلوبەرگی دیدەوانی و وەرزشدا. ئەو ئاهەنگانە لەژێر سەرپەرشتیی سەرمامۆستا (سالح قەفتان) و مامۆستا (زێوەر) و (مەلا سەعید کابان) و (عەلی ئاگا) و (فوئاد ڕەشید)دا پێک هێنران.

کاک (مستەفا سائیب) و کاک (عەبدولواحید مەجید)یش لەو لاوانە بوون کە لە بەغدادەوە هاتبوونەوە و، لە هەڵسووڕاندنی کاروباری ئاهەنگەکاندا یارمەتییان دەدان. ئاهەنگەکان بەلای دانیشتووانی شاری سلێمانییەوە ناوازەبوون، دڵی هەموو کوردپەروەرێکیان خۆش دەکرد.

ئەوساکە خوێندنگاکەمان لە ماڵی (بەهێ خان)دا بوو کە هاوسەری (شێخ محەمەدی مەزن) بوو یەکێک لەو چیرۆکانەی لاسایی کرانەوە، چیرۆکی زۆرداریی (نیرۆن) بوو، کە بریتی بوو لە شاهەنشاهێکی ڕۆمایی. چیرۆکی (سکالانووس)یشی تێدابوو کە هەموو لایەکی هێنایە پێکەنین. شایانی باسە مامۆستا (فوئاد ڕەشید) و کاک (کەریم سەعید)، لەناو لاسایی کەرەوەکاندا، هونەرمەندیی و شارەزاییان زۆر پیشان دا. هەر مەپرسە کە (شێخ نوری)یش ئەو شەوە چەند دڵخۆش و کامەران بوو بەتەماشاکردنی لاسایی کردنەوەی گۆرانیی (إنتباه)ەکە کە خۆی ڕەنجێکی زۆری تێدا دابوو تا هاتبووە ئەو شێوەیەوە.

خێزانی ماڵی باوکم و خێزانی ماڵی باوکی (شێخ نوری) ئاشنایەتی و هاتوچۆیان هەبوو. چونکە هەردوولایان لە گەڕەکێکدا بوون و ماڵیان لەیەکەوە زۆر نزیک بوو. خۆیشم کە لە ساڵی ١٩٢٧دا بەتایبەتی وێنەگرێکم کڕی، هەر بۆ ئەمەی وێنەی بوێژان و وێژەوانان و ڕۆشنبیرانی کوردی پێ بگرم و بینێرم بۆ حوزنی موکریانی، بەناوی ڕێزگرتن و خۆشەویستی پیشاندانەوە.

یەکەم جار چوومە سەرا، وێنەی (شێخ نوری شێخ سالح) و (میرزا مارف)م گرت. ساختمانی سەرا کە شوێنێکی مێژوویی بوو، لە سەردەمی تورکەکاندا بەپیتاکی دانیشتووانی شاری سلێمانی دروست کرابوو، بۆ ئەمەی بیکەن بەخوێندنگاه.

لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا کرا بەسەرا و ئەوساکە هەروا مابووەوە. لە ساڵی (١٩٤٤) دا چەند مانگێک من و (شێخ نوری) لە ناوچەی ڕانیەدا پێکەوە فەرمانبەر بووین. ئەو کارگێری لادێی (ناودەشت) بوو، منیش جێ نوشین (قائیمقام)ی ناوچەی (ڕانیە) بووم.

گەلێک جار لە ماڵی یەکتریدا خەریکی گفتوگۆی وێژەیی دەبووین. ئەمە بیست لێی هیچ جارێک بڵێ گۆرانی (إنتباه) هی (بێخود)ە.

بێجگە لەوە (مەلا مەحموودی بێخود)یش، دوور بوو لەوەوە کە بتوانێ هۆنراوەی وا بەجۆش و خرۆش و، شۆڕشگێرانە و بیروباوەڕی فەرەنسەییانە، بەدەمیدا یاخود بەپێنووسیدابێ. (شێخ نووری)یش گەلێک لەوە بڵندتر بوو، کە بەرهەمی بوێژێکی وەک (بێخود) بکات بەهی خۆی، بەتایبەتی ئەو جۆرە وێژەیە کە هەر لە خۆی دەوەشایەوە و لە (بێخود) نەدەوەشایەوە. ئیتر نازانم ئەم ئاژاوەیە بۆ چ نرایەوە، کە چل ساڵ پتر ئەم گۆرانیی (إنتباه)ە، بەناوی (شێخ نوری)یەوە ناوبانگی دەرکردبوو، نە (بێخود) نە کەسێکی تر، قسەی نەکردبوو و، بەرپەرچی نەدابووەوە کەچی لە ساڵی ١٩٧٠دا (کاکە حەمەی مەلا کەریم) کردی بەهی بێخود ؟!...[١] من ئەم گۆرانییەم زۆر بەدڵدا چووبوو.

هەرچەندە مافی ئەوەیشم نەبوو، ناوەکەی بگۆڕم، بەڵام گەلێک جار لە دڵی خۆمدا دەمگوت: کاشکی (مەحموود جەودەت) و (شێخ نوری) ناویان بنایە (پرشنگی ئازادی). چونکە لە ڕاستیدا هەر کەسێ گوێی لەو گۆرانییە بێت و، ناوەڕۆکەکەی تێبگات، (ئازادی) پرشنگ دەدات بەناو هەموو دڵ و دەروون و لەش و هۆشیدا و، ئاراستەیشی دەکات بۆ خەبات کردن لەپێناو دەستخستنی ئازادیی گشتیدا. گۆرانییەکە یەکێتیی نەتەوە پیشان دەدات بەهەموو چین و دەستە و کۆمەڵێکیەوە، بەهەموو خەباتێکیەوە دژی زۆرداری و ستەمکاری دەوەستێ و بۆ دەستکەوتنەوەی ماف و ئاسایش و ئازادیی گشتیی هانە دەدات.

ئەم گۆرانییە و (١٩) گۆرانییەکەی تریش کە لەناو نووسراوە خنجیلانەکەدا، لەلایەن شارەوانیی سلێمانییەوە چاپ کرابوون، بەتاسوقەوە لەناو خوێندنگاکانی کوردستانی عێراقدا، لەلایەن شاگردەکانەوە دەگوتران. لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٢٠) و (١٩٣٠)دا، کەس شاگردەکانی بەربەست نەدەکرد، لە خوێندنەوەیان. بەڵام کارەساتی شۆڕشی (٦)ی مشتاخان (ئەیلوول)ی ساڵی ١٩٣٠، بوو بەهۆی بەربەستکردن لە خوێندنەوەیان لە هەموو خوێندنگا کوردییەکانی کوردستانی عێراقدا.

---

(١) هەر لەم ڕووەوە مامۆستا هەردی دەڵێ: ئاشکرایە شیعری دلاوەران -مامۆستا شاکر هەر بەإنتباه ناوی دەبا. ا. ب- یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٥دا لە چاپخانەی بەلەدیەی سلێمانی لە نامیلکەیەکدا لە چاپ دراوە ناوی شێخ نوری لەسەر نووسراوە. لە ١٩٢٨دا کەریم بەگی سەعید بەگ بۆ جاری دووەم بەناوی شێخ نورییەوە بلاویکردۆتەوە لەگەڵ چەند گۆرانییەکی تردا، بۆ جاری سێیەم -کوردی و مەریوانی- لە ١٩٣٢دا بەناو شێخ نورییەوە لەگەڵ چەند سروود و گۆرانییەکی کەدا ناوی - گۆرانی کوردی-یان لێ ناوە. بلاویکردەوە، لە - دیاری لاوان-دا لە ١٩٣٤ سەرلەنوێ بەناوی شێخ نورییەوە بلاوکراوەتەوە، ئەمە ئەکاتە چوار جار، جگە لەوەی لە ١٩٥٣دا گۆرانی شاعیر باسی کردووە لە پێشەکی شیعری - داستانی هەیاسی و کاکە عابیدین-دا... ئەڵێم بۆچی کەسێک نەبوو لە پێش ئەم چل و هەشت ساڵەدا ئەو پێنج سەرچاوەیە ڕاست بکاتەوە و بڵێ ئەو شیعرەی لەو پێنج سەرچاوەیەدا بەهی شێخ نوری دانراوە، هی ئەو نییە و هی (بێخود)ە، بۆچی بێخود خۆی هەتا لە ژیاندا بوو -لە ١٩٥٥ کۆچی دوایی کردووە. ا. ب- ئەو پێنج سەرچاوەیەی ڕاست نەکردەوە؟ بڕوانە: (هاوکاری - ڕۆژنامە: ژ ٩٩٣ی ١٩٨٨/٧/٢١ بەغدا. ئەحمەد هەردی- شیعری دلاوەران هی شێخ نورییە. ل٨).

ئینگلیزەکان کە لەم بەربەستکردنەدا لەژێرەوە، دەستیان هەبوو، گرێیەکی کوێریان خستە ناو دڵی نەتەوەکەمانەوە، کە بەهۆی ئەوەوە توانییان ناکۆکییەک بخەنە نێوان (کوردەواری) و (فەرمانڕەوایی عێراق)ی ئەو سەردەمەوە.[1]

لە ساڵی ١٩٥٤دا کە لە شەقلاوەدا جێ نوشین بووم، لەسەر دەستی (دەستەی لاسایی کردنەوە و ساز و ئاوازی یانەی شەقلاوە)دا، گۆرانیی (إنتباه)م زیندوو کردەوە و، لەگەڵ چیرۆکێکی تردا کە ناوی:

(دادگاهی سەرچنار) بوو و خۆم دامنابوو، لەسەر شانۆی یانەکە، بەئاهەنگ و بەزمێکی پرشنگدارەوە، لە بەردەم دانیشتووانی شاری شەقلاوەدا لاسایی کرایەوە. گۆرانییەکە و لاسایی کردنەوەکەی بایەخی زۆر پێ درابوو، تەماشاکەرانی ئەو شەوە زۆر پێی گەشکەداربوون.

لە ساڵی ١٩٧١دا لە سلێمانی ئەم گۆرانیی (إنتباه)ە و (١٦) گۆرانی ترم لە نووسراوە بچکۆلەکە، خستە سەر کەلافەیەکی تۆمارکار، بەدەنگی خۆم، لەگەڵ وتارێکدا کە لە بابەت مێژووی ئەم گۆرانییانەوە تۆمارم کردبوو، لەبەردەم کۆڕێکی گەورەی نووسەرانی کورد و هونەرمەندانی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاسایی کردنەوە و، ڕۆشنبیران خوێندەوە و، تکام لێ کردن کە بەهەموویان هەوڵ بدەن ئەم گۆرانییە نیشتمانییە نازدار و بەکەڵکانە بۆ سوودی شاگردەکانمان زیندوو بکەنەوە.

لە ساڵی ١٩٧٤دا لەبەردەم کۆڕێکی وێژەیی جیهانیدا، کە ڕۆشنبیرانی کوردی خۆیشمان تێیدا بەشداربوون، لە شاری (بەیرووت)دا، لە ئاهەنگی دوا کۆبوونەوەماندا، لەسەر تۆمارکارێک، ئەو وتارەم و ئەو (١٧) گۆرانییەم کە بەدەنگی خۆم تۆمارکرابوون، دا بەگوێیاندا، لەگەڵ هەندێک قسەی ڕۆشنکردنەوە کە لەو بابەتەوە بەزمانی ئینگلیزی کردم. گوێ گرەکان کە زۆربەیان بێگانەیش بوون، بەکوردەکانی عێراق و تورکیا و ئێرانەوە، زۆربەیان پەسەندیان کرد.[2]

---

(١) ڕەنگە خوێنەر لێرەدا وا تێ بگات کە ئەو فەرمانڕەواییەی عێراق گەلێ نیازپاک و دڵسۆزی کورد بووە، بەڵام ئینگلیز ناکۆکی خستە نێوانیانەوە. ئەوەی نابێ لێی بەگومانبین کە ئینگلیز وەک داگیرکەری عێراق و باشووری کوردستان پێکەوە، بۆ زیاتر کۆنترۆڵکردن و جێ قایمکردن هەمیشە تۆوی دووبەرەکی نەک لە نێوان نەتەوە جیاجیاکاندا بەڵکو لەناو ڕۆڵەکانی یەک نەتەوەشدا دەچاند و هەر بۆی بکرایە بەگژیەکیدا دەدان... بەڵام خۆ وەنەبێ حوکمەکەی بەغداش لەو باشتربووبێ لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ کورد، ئەی ئەو دروستکراوی ئینگلیز نەبوو؟ جا بۆیە ناکۆکییەکە خۆی هەر هەبوو، بەڵام بەداخەوە لەو حەلەدا زۆر کەس بەتایبەت ڕووناکبیر و خوێنەوارەکان بەهەڵە لە هەڵوێستەکانی بەغدا دەگەیشتن. وەک هەموو سەردەمێ، کۆمەڵێ لەوانە، دەبوونە ئامرازی جێبەجێکردنی نیاز و مەبەستە پیسەکانی ئەو حوکمەتە و ئەوانی دی کە بەدویدا دەهاتن.

(٢) مامۆستا مەبەستی لە (کۆنگرەی پەرچڤەکردن)ەیە کە لە ٣/١٩٧٤دا لە بێروت گیراوە، بەئامادەبوونی هەندێ ڕووناکبیری کورد و جیهان وە لەلایەن (جمعية الكتاب المقدس و کۆڕی زانیاری ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە) ڕێکخرابوو... بۆ زیاتر بڕوانە: یادداشتەکانی شاکیر فەتاح - کتێبی یەکەم - هەر لەم پرۆژەیەی دەزگەی ئاراس. ئاوێنەی ژینم ل ٦٠١-٦٠٢.

له ۱۹۷۷/۳/۲۰دا نامەیەکی دوور و درێژم نووسی بەزمانی عەرەبی بۆ کارگێری (ڕادیۆی کوردی) لە بەغدا. لەگەڵ کەلافەیەک کە ئەو وتارەی خۆم و هەر (۱۷) گۆرانییەکەی تێدا تۆمار کرابوو، بەدەنگی خۆم. بۆ ئەمەی بەسایەی دەستەی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاسایی کردنەوە و، سەرلەنوێ زیندووی بکاتەوە و بلاویشی بکاتەوە. هەر بەو چەشنە لە ۱۹۸۰/۱/۲۷یشدا نامەیەکم نارد بۆ (ئەمینداری گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان) لە شاری (هەولێر) بەزمانی عەرەبی، لەگەڵ کەلافەیەک کە ئەو وتارەی خۆم و هەر (۱۷) گۆرانییەکەی تێدا تۆمار کرابوو، بەدەنگی خۆم، بۆ ئەمەی بەسایەی دەستەی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاسایی کردنەوەوە لە (ئێستگەی ڕادیۆی هەولێر)دا سەرلەنوێ زیندووی بکەنەوە و بلاوی بکەنەوە. جا هەروەک لەسەرەوە پیشانم داوە، لە هەموو دەرفەتێکدا، خەباتم کردووە گۆرانی (إنتباه)ەکەی (شێخ نوری) و گۆرانییە نیشتمانییەکانی تریشمان، لەلایەن تیپەکانی ساز و ئاواز و گۆرانی و، لاسایی کردنەوە، زیندوو بکرێنەوە، تا بەرچاو و دڵی هەمووان بکەوێ ئاواتی کوردپەروەرانیش هەر ئەمەتا کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لەلایەن ئەو دەسگایانەوە و، ئەو تیپانەوە کە لەمەوپێش ناوم بردن، ئەم گۆرانییانە سەرلەنوێ زیندوو بکرێنەوە و بلاویش بکرێنەوە و، لەناو ڕادیۆ و لەسەر پەردەی تەلەفزیۆندا پیشانی گوێگران و تەماشاکەرانی کوردەواری بدرێن. پێش ئەمەی وتارەکەم تەواو بکەم، حەز دەکەم سوپاس و ستایش و ڕێزی خۆم پێشکەشی ئەو سێ نووسەرە بکەم، کە نووسراویان لەسەر (شێخ نوری شێخ سالح) داناوە. لە ڕاستیدا هەرسێکیان شایستەی ئافەرین و پەسندکاری و سوپاسی هەموو کوردپەروەرێکن، چونکە بەنووسراوەکانیان سەری کوردیان بەرزکردۆتەوە.

ئەوەندەی پەیوەندیی بەنووسراوەکانی (دکتۆر کامل حەسەن عەزیز بەسیر) و (مامۆستا موسلح مستەفا جەلالی)یەوە هەیە، سوپاس بۆ خودا لە کاتی چاپ کردنیاندا تووشی تەنگوچەڵەمە و گیروگرفت و کەندوکۆسپ نەبووبوون. چونکە دەسگاکانی (کۆڕی زانیاریی عێراق / دەستەی کوردی) و، (ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی) لەسەر ئەرکی خۆیان بۆیان چاپ کردبوون.

بەلام نوسراوەکەی کاک (ئازا عەبدولواحید)، چونکە زۆر گەورەتر بووە لەهی ئەوان و، لەسەر ئەرکی خۆی چاپکراوە و، یارمەتیی (دەسگای ڕۆشنبیری و لاوان)یش ئەوەندە نەبووە کە بەشی بکات بۆ چاپ کردن، تووشی گەلێک تەنگوچەڵەمە و، گیروگرفت و، کەندوکۆسپ و، دەردی سەری و، ناحەزی و، وام (قرض) وەرگرتن بووە. تەنانەت هەندێک لە دڵ ڕەشانیش بەدزییەوە هەوڵیان داوە تەگەرە لە خەباتی بدەن و نەهێڵن چاپکردنی نووسراوەکەی سەربگرێ، یاخود هاش و هووشیان کردووە لەژێرەوە کە نەفرۆشرێ و هانەی وامدارەکانیشیان داوە کە زوو پارەکانی لێ بسێننەوە و، لە بەڵێنەکانی خۆیشیان پەشیمان ببنەوە! لە سەروو ئەمانەشەوە، کزی بازاڕی نووسراو. جا دەبینین،... لەگەڵ ئەم هەموو بارە ناهەموارانەدا، ئافەرین بۆ (ئازاد) کە کۆڵی نەدا و، وڕەی بەرنەدا و، تا نەگەیشت بەکامی خۆی و نووسراوە نایابەکەی خۆی بەتەواوی لە چاپخانە چاپ نەکرد، وازی نەهێنا...

(ئازاد) هەرچەندە ئەرک و ئازاری زۆر چێشت، بەلام بەهۆی ئارام و بەرگە گرتنەکەیەوە توانی بەسەر هەموو گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەکانیدا زاڵ ببێ... نووسراوێکی نایاب و ناوازە و، لێکۆڵینەوەیەکی

گەورە و فراوانی لەسەر (شێخ نوری شێخ سالح) و بەرهەمەکانی پێشکەش بەخوێندەوارانی کورد کردووە، سەری نەتەوەکەی خۆیشی پێ بەرزکردۆتەوە... ئەمەیش کارێکی پەسەندە کە پێویستە هەموومان پیرۆزبایی لێ بکەین.[1]

## هۆنراوەکەی (شێخ نوری)

(إنتباه)

(لەسەر وەزنی: دێشب کە مەرا وضع...)

أولادی وطن ئێـــمە کـەوا مـیللەتی کـوردین
بۆ غـایەی ئاسـایشی مـیللەت هەمـوو گـوردین
شـێـرانە ئەوا مـعـرکـە ئارای وغـا بووین
بۆ ڕشـتنی خـوێناوی عـد و حـاضـری ڕاە بووین
لە پێـشـمـانەوە هەروا، بەیداخی ظفـر دەڕوا
ڕیشەی عد و بادەڕێنین، حق بەدەستی خۆمان بسێنین
بۆ نـەمـانـی مظالم سـوارانی جـەنگیی
تەپڵی بازییـان لێـدا بەشـۆخ و شـەنگی

باوک:

لەم وضعـە گـەر ئەی دوشـمنی کـورد ئێـوە دەپرسن
ئەم هەمـهـەمـەیە مـیللەتە هەڵسـاوە بتـرسن
کـفن بۆ خـۆتان ببـڕن. هەر لە ئێـسـتاوە بمرن
لازمـە لەبەر غـەم و حَسْرَت، ببن ئەشکرێزی مـذلت
ئـەی دلاوەرانـی وطـن وەرنـە إمــداد
باوک بەپەرۆش لێـتـان ئەکـا اسـتـمـداد

***

---

(١) کاک ئازاد لە چوارشەممەی ٢٨/٨/٢٠٠٢ لە هەولێر، بەدرێژی باسی ئەو ئاستەنگ و تەگەرانەی بۆ کردم کە کەسانێکی ناحەز و خۆویست لەبەردەم چاپکردن و پەخشی ئەو دوو بەرگەی دیوانەکەیان دادەنا و بەزۆر شێوەی دوور لە هەڵسوکەوتی ئەدیب و ڕوناکبیرەوە بەربەرەکانیان کردووە... مەسەلەکەش لەوە زیاتر نەبووە کە وەک لەمەوبەر باسمان کرد ویستراوە ئەو دیوانەی بەناوی خوالێخۆشبوو (موسلح جەلالی)یەوە ئامادە کراوە پێشکەوێ و زووتر بخرێتە بازاڕەوە!! خۆ کە دوو بەرگەکەش چاپ کرا، پڕ بوو لە هەڵەی چاپ و ناڕێکی لە ڕووی هونەرییەوە، هەرچەندە لە کاتی خۆیدا لیستێکی دوور و درێژی ئەو کەموکوڕی و هەڵەی چاپانە لە (هاوکاری)دا خرایە بەرچاو خوێنەران، بەڵام ئەمە ئەو نالەباری و ئەقڵە منالانە و ناکامڵانەی هەندێ لەوانە پشیان دەدات کە داسەپاون بەسەر نێوەندە ئەدەبی و ڕۆشنبیریەکەماندا.

کوردانی غظنفر شکەنی معرکە ئاغوش
نابێ بکەن ئەم باوکی خۆتانە فەرامۆش
زێرا کە دوو چاوی آبدیی ئێمە لە گۆڕا
چاوی لە ظفرتانە لە حرب و شەڕ و شۆڕا
باوک بەقوربانتان بێ. ڕۆحەکەی فداتان بێ
وقتی فرصت و إتفاقە. ڕۆژی لابردنی نفاقە
ئارەزوو ئەکەم ئێوە وقتی إحتضار
بەشان و ظفرەوە بێن بۆ مەزار.

دایک:

بۆ دفعی مظالم لە موانع مەکە پەرهیز
سادەس بدەرە شیر و تفەنگ، خەنجەری خوونڕیز
بۆ ئێوە کەوا غیرەتە یەکدەفعە ڕەگ و ئێسک
حاشاکە بەحزنێکی ذلیلانەوە فرمێسک
لە چاوم بێتو بتکێ، دڵم یەکدەرە بشکێ
چونکو ئێوە جسور ئەبینم، نامێنێ ئازاری برینم
شیرەکەم حەڵاڵتان بێ، ڕۆژی هیمەتە
ڕۆحەکەم فداتان بێ، وقتی غیرەتە.

منالەکان:

نجمەی آملی ئێمە هەموو بەم دەس و بردە
خەڵقینە لە بۆ مسعدتی میللەتی کوردە
مەوتێ کە حیاتی وطنێکی لە دوابێ
سەد ژینی ذلیلانەی یارب بەفدابێ
ئەو کەسانەی جبانن، معنای ژیان نازانن
مردنێ لە ڕێگای میللەتا، چاکترە لە ژین لە ذلتا
هەر کەس خۆی بکا بەقوربانی میللەت
لە قبرا هەتا محشر ناکێشێ ذلت.

ئافرەت بەمنداڵەوە:

یاران و ڕەفیقان و دلێر و پەلی کوردان
شەڕ جەژنی هەموومانە بڕۆین بۆ صفی مەیدان
وقتێ کە بەتوفیق وظفر دێنەوە لامان
ئەوسا گوڵ ئەکەین ئێمە بەشاباشی قدمتان

گەر لە ئێوە چەند کەس شهید بێ، لازمە عزای ئێمە عید بێ
ئەم پڵنگ بەچانەی وا إنتـــقـــام ســـێنن
گـەورەیان دەکـەین ئێـمـە، حـقـتـان ئەسـێنن.

کچەکان:

ئێـمـە کـە ئەمـانکردووە بۆنی چەمـەنی شـوو
مـجـهـولی نظرمـانە گـوڵ و ئەسـتـەرینی شـوو
ئەم تازە جـەوانانە لەبەر سـیـرتی ئێـمـە
گـەر بێـتـو بکەن ئارەزووی شـرکـتی ئێـمـە
لازمە کە عودت بفەرموون، بێنەوە بەڕوویەکی گوڵگوون
یعنی چیـهـرە ڕەنگین بن، بەشـان وظفـر
خـوێنی دوشـمـن بڕێژن بەنووکی خـەنجـەر.

چەک بەدەستەکان:

ئێـمـە کـە مـسلح لە دەر و دەشت و لە شـارین
سوێندخۆری حضوری حق و باب و کەس و کـارین
بۆ مـسـعـدتی ئەم وطن و مـیللەتی کـوردە
ڕیشـە و ڕەگی ظالم ببـڕین بەم دەس و بردە
تا کـەی لە زەحـمـتـابین، لەناو مـذلتـا بین
لازمە بەکەیف و مسرت، ڕۆح بکەین بەقوربانی میللەت
ذاتەن ئێـمـە خـولقـاوین بۆ خـدمت کـردن
بۆ ئەوەی فـیـداکـار بین تا ڕۆژی مـردن.(*)

م. نوری

(*) ئەم گۆرانییەمان لە نووسراوی (گۆرانیی کوردی) وەرگرتووە، کە لە ساڵی ١٩٢٥دا، لە سلێمانیدا، لەلایەن شارەوانی سلێمانییەوە لە چاپخانەی شارەوانیدا چاپ کراوە. (ش. ف)

# ئاهەنگی ڕۆشنبیران

لەم نووسراوەدا (٣٠) وتوێژ لە بابەت (کۆمەڵایەتی) و (مێژوو) و (ئایین) وە پێشکەش کراوە، بەهیوای ئاراستەکردنی کوردەواری بۆ ژیانێکی پاکتر و چاکتر و بڵندتر

## پێشەکی

چوار دۆستی خوداناسی ڕۆشنبیر ویستیان لە مانگی ڕۆژوودا وەک باو و باپیرەکانی خۆیان فەرمانی خودایی بەجێ بهێنن.

واتا ڕۆژوو بگرن لە مانگی ڕۆژوویشدا چاکە بکەن لەگەڵ خێزان و دۆست و خزم و دراوسێ هەژار و لێ قەوماو و داماودا بێجگە لەوە خۆیشیان لە هەموو کردەوەیەکی خراپ و نەنگ و ناپەسەند درۆ و چەواشەکاری و، بەدگویی و هانەدانی کەسانی تر بۆ خراپەکردن. هەروەها لەسەر ئەوەیش بڕیاریان دا کە هەر شەوە لە مالی یەکێکیان کۆببنەوە، بیکەن بەئاهەنگ؛ لە بابەت (خوداناسی) و (مێژووی گەورەپیاوان) و (چاکەی گشتی)یەوە وتوویژ بکەن. گورانیی خۆش بڵێن و، گەمەو گەمەوگەپ بکەن.

شەوچەرەی خۆشیش بخۆن. بڕیاری هەندێ یارمەتی و باربووی چاکیش بۆ کەلکی گشتی بدەن. ئەمەیش بۆ ئەوەی کەلەپوورێکی کۆمەڵایەتیی کوردەواریان زیندوو بکەنەوە، کە هەتا نزیکەی پەنجا سالێکیش لەمەوپێش ئەم ڕەوشت و نەریتە لە مانگی ڕۆژوودا لە هەندێ جێگەی کوردستاندا باوبوو. منیش لێرەدا هەر (٣٠) وتوویژەکەی ئەو چوار ڕۆشنبیرە کە لە مانگی ڕۆژوودا کردوویانە شەو بەشەو دەگێڕمەوە. هیوادارم خوێندەوارە خوشەویستەکانمان خۆشی و کەلکیان لێ وەربگرن.

## خۆشەویستی

(شێرکۆ) گوتی:- براینە! ئیمشەو کە یەکەم شەوی مانگی ڕۆژووە بام لە خۆشەویستیی پێغەمبەرە گەورەکان بدوێین.

گوتیان:- باشە.

گوتی:- کەواتە ڕێم بدەن بام لەمنەوە دەست پێ بکات، من باسی ژیان و خەباتی (محەمەد) پێغەمبەرتان بۆ دەکەم.

گوتیان:- فەرموو بیکە.

(شێرکۆ) گوتی:- محەمەد پێغەمبەر، (خودای لێی خوشبێ)، خودای خۆشدەویست. دەستووری خوداییشی خۆش دەویست. دەیویست ژیانێکی پاک و چاک و دروست بۆ گەلەکەی خۆی -کە هەموو موسوڵمانانی دانیشتوانی جیهان بوو- دابمەزرێنی. بەرەنگاریی زۆرداری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و هەژاریی کرد لەناو گەلی عەرەب و گەلەکانی دراوسێیدا. کەچی خاوەن دەسەڵات و خاوەن سامان و قەشە و حاخامەکان و ڕێژگاوەکان و کردار خراپەکان، هەموویان بوون بە دوژمنی!... گەلێک سزا و ئازاریان دا، گەلێک چاووڕاویان لێ کرد بەڵام محەمەد: نە ترس، نە پارە، نە پایە، نە بەزم و ڕەزم کە عەرەبە

خودانەناسەکانی ئەو سەردەمە دەیانویست بیدەنێ و کاری تێ بکەن... هیچ شتێک لەوانە محەمەدیان لە خۆشەویستی خودا و لە خۆشەویستیی مرۆڤایەتی لانەدا.... چووە جەنگیانەوە. وازی نەهێنا: تا بەزاندنی!... بەڵام کە بەزاندنی، چەکێکی تری لەگەڵ بەکارهینان ئەویش خۆشەویستی بوو. دڵی خۆی کردەوە بۆ دۆستیشی و بۆ دوژمنیشی. دۆستەکانی خۆی زۆرتر نووساند بەخۆیەوە، دوژمنەکانیشی کرد بەدۆست، لە جیهاندا ئەم جارەیش خۆشەویستی سەرکەوتەوە بەسەر دوژمنایەتیدا. مێژووی ژیانیش، بەناوی زەرکەفت سەرکەوتنی خۆشەویستیی (ئیسلامەتی و محەمەد)ی، لە لاپەڕەکانی خۆیدا نووسییەوە.

(شاهۆ)یش گوتی:- منیش باسی ژیان وخەباتی (عیسا) پێغەمبەریان بۆ دەکەم.

(گوتیان):- فەرموو.

(شاهۆ) گوتی:- (عیسا) هەروەک لە سەروچاو و بەژن و بالادا جوان و شەنگوشۆخ بوو، لە دڵی پاک و کردەوەیچاک و ئامانجی پیرۆزیشدا هەر جوان وشەنگوشۆخ بوو. (عیسا)یش بەرەنگاریی زۆرداری و هەژای و نەخۆشی و نەخوێندەواری کرد لەناو گەلەکەی خۆیدا. کاربەدەستان و دەوڵەمەندان و «حاخامەکان» و بەدکردارەکانی گەلی جوولەکەیش بەرەنگارییان زۆر کرد!... عیسا خودای خۆش دەویست. دەستووری خوداییشی خۆش دەویست. تێدەکۆشا بەدڵ بۆ ژینێکی گشتیی بێ ئازار و بێ هاوار و، پڕ لە کامەرانی و، دوور لە خۆپەرستی و دوژمنایەتی، لەناو نەتەوەکەی خۆیدا. هەرچەندە دوژمنەکانی ئازاریان دا، بەڵام عیسا تا گیانی پاکیشی بەخاک سپارد، بەرامبەر دوژمنەکانی خۆی و خودا، دڵی گەردی نەگرت. هەمووجەم: داوای ئاشتی و خۆشەویستیی دەکرد لەناو گەلدا هەمووجەم ئامۆژگاریی گەلەکەی خۆی دەکرد، دەیگوت: «لەگەڵ دوژمنانتاندا دۆستایەتی بکەن. دوژمنەکانتان خۆش بوێ!» مێژوونووسان گوتیان: «عیسا، لە تەمەنی سی ساڵیدا بەداردا کرا.».

بەڵام لە ڕاستیدا عیسا بەداردا نەکرا. دوژمنی عیسا بوو بەداردا کرا. دوژمنەکانی عیسا. سەریان لێ تێکچوو. لە بریتیی عیسا، شاگردێکی عیسایان گرت و کردیان بەداردا! وایانزانی عیسایە. کەچی عیسا خۆی دەرباز کردبوو!... ئەو شاگردەی عیسای بۆ دۆزیبوونەوە بیگرن، لە بریتیی عیسا، هەر ئەو شاگردە خۆی بەهەڵە لەلایەن سەربازەکانەوە گیرابوو و بەداردا کرابوو!... عیسا هەڵات و خۆی نەدابەدەستەوە. بەڵام دوژمنەکانی هەموو کەس وایان زانی کە عیسا بووە بەداردا کراوە!... بەڵام کە جیهان چاوی کردەوە و لە ڕاستی تێ گەیشت، جێگای هەرە بەرز و پیرۆزی لە دڵی خۆیدا بۆ عیسا پێغەمبەر کردەوە.

عیسا تا ما نموونەیەکی خوداپەرستی و خۆشەویستی و کرداری چاک و بڵند بوو. عیسا هەرچەندە لە ژینیدا بەسەر دوژمنەکانیدا سەرنەکەت: تا ژمارەی عیساییەکانی گەیاندە نزیکەی شەش سەد ملیۆن!. بەڵێ، بەم ڕەنگە، جارێکی تریش، دەسەڵاتی خۆشەویستی لە مێژوودا دەرکەوتەوە!.

(فەرزهاد)یش گوتی:- براکان، بام ئیمشەو ئەمەندە بەس بێ. وا شەوچەرەکەمان هات. فەرموون بام شەوچەرەکەمان بخۆین.

## گەورە کێیە؟!

(فەرهاد) گوتی:- براکان ئیمڕۆ لەناو فەرموودەکانی (محەمەد) پێغەمبەردا فەرموودەیەکم دی، زۆر بەدڵم بوو.

فەرموودەکە ئەمەتا: «سید القوم خادمهم». واتا: «ئەو کەسە دەبێتە گەورەی نەتەوە کە بەکاریان دێت و فرمانیان بۆ دەکات و کاروباریان هەڵدەسووڕێنێت». لەم بابەتەوە چی دەفەرموون؟

(هۆشەنگ)یش وەرامی دایەوە گوتی:- «پێغەمبەر» ڕاستی فەرمووە. لە ڕاستیدا (گەورە) ئەو کەسەیە فرمانی خۆی بەتەواوەتی بەجێ بهێنێ: بەرامبەر خۆی، بەرامبەر گەلەکەی، بەرامبەر مرۆڤایەتی. ئەم فەرمانانەیش بەپێی توانا، بەپێی جێگا و سەردەم دەگۆڕرێن. کەواتە لەسەر گەورە پێویستە، بێ کەموکورتی فرمانی خۆی و گشتی بەجێ بهێنێ.

(فەرهاد)یش گوتی:- لەمەیشەوە تێدەگەین: ئەوی زۆر لەم و لەو بکات، یاخود سایە و ڕەنجی خۆی لە شتی پڕوپووچدا بەفیڕۆ بدات، بەگەورە ناژمێررێت. هەروەها گەورە، هەر لە چینی دەوڵەمەندان دەسەڵاتدارانداهەڵناکەون. لە چینی کز و بێدەسەڵات و هەژارانیشدا هەڵدەکەون. چونکە گەورە ئەو کەسەیە: ڕەوشت و خووی بڵند بێ، کردەوەی پەسەند بێ، دڵی پڕ بێ لە خۆشەویستی، بۆ کەڵکی گشت لایی. ئەگینا گەورەیی پەیوەندیی بەهەژاری و دەوڵەمەندییەوە نییە. هەروەها پەیوەندیی بەدەسەڵاتداری و بێ دەسەڵاتی و هێز و کزییەوە نییە.

(هۆشەنگ)یش گوتی:- کەچی داخەکەم، کۆمەڵایەتییەکەمان، گەورەیی بەستووە بەسایە و مایە و هێزەوە!... نەیبەستووە بەکردەوەی جوان و ڕەوشت و خووی بەرزەوە!...

(فەرهاد)یش گوتی:- لەبەرئەوە، ئێمە لەم کاتی ڕاپەڕین و، وریابوونەوەیەماندا، پێویستە ئەوەندە ئازا و بەجەرگ بین، کە هەر تەنیا، نازی ئەوانە بکێشین، کە کردەوەیان شیرینە و بەکەڵکی کۆمەڵایەتیمان دێن و، خۆیان دوور دەخەنەوە لە ئازاردان و زیان بەخشین بەم و بەو!...

(هۆشەنگ)یش گوتی:- بێجگە لەوە، پێویستە سەربەستانە و بێباکانە چەندوچوون لەگەڵ ئەو دەسەڵاتانەیشدا بکەین، کە ئارەزووی خۆیان دەپەرستن و، بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان گەلەکەیان دەڕووتێننەوە و، دەچەوسێننەوە بەزۆرداری! ئەمەیش بۆ ئەوەیە: کە بەسەر و گیان لە ژیاندا سەربکەوین.

ئەمەندە و لەم کاتەدا چایان هێنا بیخۆنەوە، بۆ ئەم شەویش بەمەندە وازیان هێنا. دوایی دەستیان کرد بەگاڵتەوگەوپ و گۆرانی گوتن.

## چاک بەم چاکە بکە!

شەوی سێهەم لە ماڵی (فەرهاد) کۆبوونەوە.

(شیرکۆ) گوتی:- خودا لە قورئانی پیرۆزدا فەموویەتی: «من عمل صالحا فلنفسه، ومن أساء فعليها». واتا: «هەر کەسێ کردەوەی چاک بنوێنێ، خۆی کەڵکی لێ دەبینێ. هەر کەسێکیش کردەوەی خراپ بنوێنێ، زیان بەخۆی دەگات». براکان لەم ڕووەوە ئێوە چی دەفەرموون؟

(شاهۆ)یش گوتی:- لە چاکەکردن مەترسە. بیکە لە گەڵ هەموو کەس. لە گەڵ کەس و ناکەس

* پێشینان گوتوویانە: «چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە.
* کە چاکەت کرد، چاوت لەوە نەبێ، کە چاکە لە گەڵکراو چاکەت بداتەوە.
* چونکە تۆ کە چاکەت کرد، بۆ خودای دەکەیت لەبەرئەوە دڵنیابە کەخودا بەچەندان چاکەکەت دەداتەوە.

(شیرکۆ)یش گوتی:- لە ڕاستیدا چاکەکردن، کورتترین ڕێگایە کە بتگەیێنێ بەخۆشەوستیی خودا و خۆت و نەتەوە. ڕاسترین ڕێگایشە کە بتگەیێنێ بەگەورەیی.

* جا بۆ ئەمەی سەر بکەویت بەرامبەری چاکە بکە بەچاکە.

بەرامبەری خراپەیش هەر بکە بەچاکە! بەڵام لە پاش پاراستنی سەر و گیان و سامانت، خۆت بدەرە دەست خودا!...

* ئەگەر هات و چاکە لەگەڵکراو، پاداشی بەخراپە دایتەوە، دڵتەنگ مەبە. ئەوە خودا تاقیت دەکاتەوە!...
* ئەوی خودای ناسی: خودای خۆش دەوێ. ئەوی خودایشی خۆش بوێ: چاکە دەکات. ئەوی چاکەیش بکات: کامەرلن و مەزن و خورت و سەربڵند دەبێ. بەڵکو تەندروستیش دەبێ!... ئینجا (شاهۆ) دەستی بەقسەکردن کردەوە گوتی:
* چاکە و خوداناسی، پێکەوە، دەتکەن: بەهاوڕێی خودا، بەسەرداری خۆت، بەخۆشەویستی هەموو کەس!...
* چاکە لە کەسێک دەوەشێتەوە کە کردەوە پەسەند و مەرد و سەربڵند بێ.
* چاکەکردن چەکێکە: هەموو گیروگرفتێکی ژینی پێ لەناو دەبرێ!...
* چاکە: بەرد نەرم دەکات. گەردن بەم و بەو کەچ دەکات. دڵ کێش دەکات. ژین ئاسان و پڕ فەڕ دەکات. دۆست پەیدا دەکات. دوژمن سەرەونگوون دەکات!...

ئینجا شێرکۆیش گوتی:

* چاکە، تەنیا شتێکە: کە پیاوی چاک و خراپ لەسەری ڕێک دەکەون. داوای دەکەن. هۆگری دەبن. پێ لە گەورەیشی دەنێن!...
* سەیر ئەوەیە پیاو لە هەموو شتێک تێر دەخوات. بەڵام لە چاکە تێر ناخوات.
* ئەوەی لە جیهاندا بۆ پیاو دەمێنێتەوە: هەر ناوی چاکە!... لەم کاتەدا شەوچەرەیان هێنا. دەستیان کرد بەخواردنی و وازیان هێنا لە وتوێژ تا سبەی شەو.

## جوانی بەخشینێکی خوداییە

شەوی چوارەم کە کۆبوونەوە، فەرهاد، کوڕەکەی گێڕا، گوتی:

«جوانی: دیارییەکی خوداییە، خودا دەیدا بەپیاو، بۆ ئەمەی پێی ببووژێتەوە، ڕەوشت و خووی پاکژبێتەوە، بشکەوێتە گەڕ بۆ چاکەکردن.

جوانی: هێزێکی بەتینە، دڵی ئەم و ئەو کێش دەکات بۆ یەکتر. لەناوەندیشیاندا تاسەی خۆشەویستی و دڵسۆزی و یاریدەدان و تێ گەیشتن لەیەکتری و یەکێتی دروست دەکات».

(هۆشەنگیش گوتی): «خودای مەزن کەسی لە جوانی بێ بەش نەکردووە. ئەگەر جوانیی لەشی پێ نەبەخشیبێ، جوانی چالاکی و کارگوزاری پێ بەخشیوە. یاخود جوانی زیرەکی و فەربەخشی و ڕووخۆشی و هێز و توانایی و بزووتن و بەکارهاتنی پێ بەخشیوە. هەروەک لە منداڵدا:

جوانی ڕووخۆشی و ئێسک سووکی و ساویلکەیی و بزێوی دەبینین، لە پیاویشدا جوانی پێ گەیشتوویی و توانایی و مەردایەتی و پیاوەتی، دەبینین. لە ئافرەتیشدا: جوانی ڕێکوپێکی و شەنگ و شۆخی و دڵ نەرمی و جگەرسۆزی و نازکی دەبینین. لە لاوانیشدا: جوانی هەڕەت و هێز و، گیانی پێشکەوتن و باوداهێنان و سەرکەوتن و بەرکەوتن دەبینین. لە ڕیش سپییەکانیشدا: جوانی تێگەیشتن و تێبینی زرنگی و ژیری و مەندی و پارێزگاری دەبینین».

ئینجا فەرهاد پرسی: «ئەی لە سروشتدا چی دەبینین؟».

هەر خۆی وەرامی خۆی دایەوە گوتی: «جوانیمان: گەورە و بەهێز و بەرجەستە دێتە پێش چاو. (ڕۆژ): جوانە بەڕووناکی بەهێز و گەرم و بەکەڵکیەوە؛ بۆ گەشەکردن و پەرەسەندنی گیانلەبەران و گژوگیا و جێبەجێ کردنی کار و فەرمانمان. شەویش: جوانە، بەمەندی و بێ دەنگی و سرەوت و بەزم و ڕەزمییەوە. چەند جوانە (زەوی) لە کەشی بەهاردا: کە گوڵ و ڕێحانە و سەوزەگیا و دارودرەخت سنگی دەڕازێننەوە! چەند جوانیشە (زەوی) لە کەشی هاویندا: کە میوە و سەوزە و دەغڵودان پێ دەگەن! ماوەی مرۆڤیش هەیە، کە بەئارەزووی خۆی تێ بکۆشێ و بێت و بچێ خۆشی لە ژیان بچێژێ! ئەی چەند جوانە لە پاییزدا: کە ژین دەکەوێتە کۆبوونەوە و خۆشرابوواردن و مەندی و سرەوتەوە! هەروەها، چەند جوانیشە (زەوی) لە زستاندا: کە هێزی بەرەنگاری کردن و کرد و کۆشی و ڕەنجدان بۆ دوارۆژ بەگوڕ و تەووژمەوە خۆی دەردەخات!...».

ئینجا (هۆشەنگ) دەستی کردەوە بەقسەکردن، گوتی: لە کاتێکدا کە گوڵ بەجوانی و بۆن خۆشیی خۆی فێری دڵتەڕی و دڵپاکی و بێ وەیبیمان دەکات... درەختیش بەجوانی و بەروبووم و سێبەری خۆی، فێری بەکەڵک هاتنمان دەکات بۆ هەموان. ئەی لەمەدا جوانی نابینێ: کە گیانلەبەر و پەڕندە و جروجانەوەر و گژوگیا، کەڵک و فەرمان پێ دەبەخشن، بێ ئەوەی چاویان لە پاداشێک یان سوپاسێکی ئێمەوە بێ؟!...

من هیچ باسی چاوئەندازە جوانەکانی دەمی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات ناکەم. هەروەها باسی هەڵهاتنی

مانگ و دەرکەوتنی ئەستێرانیش ناکەم، لەناو جەرگی شینی ئاسماندا. ئەمانە و چاوئەندازەکانی شاخ و کێوە بڵندەکان و، زریّ فراوانە شەپۆل هاوێژەکان و، تافگە خاوەن هاڕەهاڕەکان و، ڕووبارە گەورەکان، کە بەتەوژم یاخود بەمەندییەوە دەکشێن بەناو زەویدا... ئەمانە هەموو خاوەن جوانییەکن، چاوەبەستمان دەکەن و، دڵکێشمان دەکەن. بەڵام لەم جوانییانە گەورەتر ئەوەیە: کە لەو ڕۆژەوە (خودا) ئێمەی هێناوەتە بوون: ئەمانە هەموو دەم بۆ دڵخۆشی ئێمە، بۆ کەڵکی ئێمە، بۆ ئاسانکردنی ژینی ئێمە، (خودا) بەکاریان دەهێنێ تا ئیمڕۆ».

دوای ئەویش (فەرهاد) هاتەوە قسەکردن گوتی:

«سەرنجێک بدەن لە جیهان و ئاسمان، لە گیانلەبەران، لە دڕندە و پەڕەندە، لەو پێ ڕەوییانەی ئەمانە لەسەری دەڕۆن، لەو دەستوورانەی کە فەرمانڕەوان بەسەر پەیوەندی گیانلەبەر و داروبەردەوە، لە ڕەوشتی ژین و بزووتن. لەم ئافەریدە کراوانەی ئاسمان و زەوییەدا چی دەبینین؟...» هەر خۆی وەرامی دایەوە گوتی:

«جوانی ڕێکوپێکی و، جوانی یەکسانی و ئارام گرتن و، جوانی بزووتن و گۆڕان، جوانی دروستکردن و لەناو چوون دەبینین».

ئینجا (هۆشەنگ)یش گوتی:

«لەم زەمین و ئاسمانانەدا، هەموو شتێک جوان و ڕەنگینە. (خودا)یش کە زەمین و ئاسمانانی لەژێر چنگدایە، دیسانەوە جوان و ڕەندینە و، حەز لە جوانیش دەکات. چونکە خۆی هونەرمەندی مەزنە و، ئەم هەموو شتە جوانانەیش ئەو دروستی کردوون. بەڵام لە هەموو شتێک جوانتر کە (خودا)ی پاک و بێ هاوتا بەئێمەی بەخشیوە (هۆش) و (بیرکردنەوە)یە، ئەو هێزەی کە لە هەموو هێزێکی جیهانی گەورەترە؛ کە بەهۆی ئەوەوە دەتوانین بە(خودا) بگەین و، لە ڕێگای ئامۆژگاریی ئەویشەوە، هەموو ئاواتێکی ژینمان پێک بهێنین. کەواتە بام ئەم (هێزی بیرکردنەوە)یەمان لە شتی بەکەڵک و پەسندا بەکاربهێنین، بۆ خۆمان و بۆ هەمووان؛ تا بتوانین خۆشی ئەم ژینە جوانە ناوازەیە بچێژین.

ئەم ژینە، (خودا) بۆیەکی دروست کردووە، کە ئێمە خۆشی لێ وەربگرین. پاشان بەهۆی ئەو خۆشییەوە بگەین بەپایەی پیاوەتی. بەڵام ئێمە کاتێک دەگەین بەو کامەرانییە، کە ژیانمان تەرخان بکەین بۆ (بەکەڵک هاتنی گشت لایی) بەڵێ ئەو کاتەی، کە (خودا) و (گشت لا) دڵخۆش بکەین».

***

بەم ڕەنگە ئەمشەویش وتووێژەکە دوایی هات. لەم کاتەدا شەوچەرەیان هێنا و دەستەی ساز و ئاوازیش دەستیان کرد بەگۆرانی گوتن و ساز و ئاوازلێدان.

تا شەوێکی تر بەخوداتان دەسپێرم.

## پیاوێ پیاو بێ قومار ناکات

(شێرکۆ) گوتی: ئەوی قومار دەکات، دوور دەبێ لە دۆستایەتی و خزمایەتی و نیشتمانپەروەری و مرۆڤایەتییەوە. چونکە لەجیاتی خۆشەویستی پوولپەرستی لەناو دڵیدا دادەمەزرێ. ئەوی قومار دەکات، هەرچەندێک پارە بباتەوە، دەیدۆڕێنێتەوە. بێجگە لەوە هی خۆیشی دەخاتە سەر و دەیدۆڕێنێ. ئەمە لەلایەکەوە. لەلایەکی تریشەوە گەنجینەیەکی لە دەست دەچێ کە هەرگیز نرخی تەواو نابێ. ئەویش (خۆشەویستی)یە.

خۆشەویستیش، ئەو کەرەستەیەیە کە هەموو کردەوەیەکی پاک و پیرۆز و بەرزی لێ دروست دەکرێ. کەواتە ئەوی قومار دەکات: نەک هەر دوژمنی خاوخێزانی خۆیەتی، دوژمنی خۆیشێتی. بەڵکو دوژمنی نەتەوە و نیشتمان و مرۆڤایەتیشە. قومارچی دڵڕەق و تاوانکار نەبوایە، هاوڕێ و کەسوکار و هاونیشتمانی خۆی نەدەڕووتاندەوە و، زیانیشی بەخێزانی خۆی نەدەگەیاند. خۆیشی تووشی ڕیسوایی و نابووتی و سەرگەردانی نەدەکرد.

(شاهۆ)یش گوتی: ئەم دەردی قومارکردنە، بەدەردێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێ. ئەوانەی تووشی دەبن، لەو کەسانەن کە دەیانەوێ لە ڕووی ژیانی خۆیان هەڕا بکەن. زۆربەیان لەو کەسانەن کە تەمەڵ و ناتەوانان و، ڕەوشت و کردەوەیان خواروخێچە و، بەرگەی ڕاستی و دروستی ژیان ناگرن، هەڕا دەکەن لە دەست ژیانی ڕاستەقینەی خۆیان. چونکە لەناو ئەو ژیانەدا گوزەران ناکەن. دەچن سەری خۆیان بە(قومار)ەوە خەریک دەکەن، بۆ ئەمەی جیهان و ڕووداوی ژیانی خۆیان لەبیر بچێتەوە. بەڵام ئەو ڕووداو لەبیرچوونەوەیە هەر تاوێک دەخایێنێ. ئەویش ئەو تاوەیە کە قومارچییەکە قومارەکەی تێدا دەکات. کە لە قومارەکە بووەوە، سەرلەنوێ ئەو ڕووداوە ناخۆشەی ژیانی خۆی دێتەوە پێش چاو و، پێوەی هەراسان دەبێتەوە.

ئینجا (شێرکۆ) گوتی: تەنانەت قومارچی خۆیشی سووک دێتە بەرچاو هەر لەبەر ئەوەیشە کە لەگەڵ هەموو کەسێکی سووک و کردەوە نەنگیشدا پێی شەرم نییە دابنیشێ و قومار بکات.

قومارچی نە لە هەڵسان و دانیشتنندا بەئەندازە و ڕێکوپێکە و، نە لە خواردن و نوستنیدا و، نە لە بیروباوەڕیشدا. درۆکردن و چەواشەکاری و سپڵەیی و زۆرداری و هەموو کردەوەیەکی تری نەنگی لێ دەوەشێتەوە. نە هۆشی لە جێی خۆی دەمێنێ و، نە دڵی و نە دەروونی تەندروستیشی بەرە بەرە پێوە دەمێنێ. بێجگە لەوە خۆی تووشی مەی خواردنەوەی زۆر و کار و فەرمانی سووک و نەنگیش دەکات، وەک دوو زمانی و داوێنپیسی و دووڕوویی و بەرتیل وەرگرتن بۆ خۆی و بۆ کەسانی تر و دزی... خۆ لەگەڵ خێزان و کەسوکار و هاوڕێی خۆیشیدا، هەموو دەم لە چەقەچەق و شاتەشات و جەنگ و ناکۆکی دایە.

(شاهۆ)یش گوتی: ئافەرین بۆ فەرمانڕەوایی عێراق کە خەریکە قومار لە هەموو یانەکان و شوێنە گشتییەکاندا بەربەست دەکات. لە ڕاستیدا ئەمە یەکەمجار نییە قومار لە عێراقدا دەست بە بەربەستکردنی کرابێ گەلێک جاری تریش لە هەموو خاکی عێراق، یاخود لە هەندێ شوێنی عێراقدا

قومار بەربەست کراوە. بەڵام هیواداریین ئەمجارە فەرمانڕەوایی و عێراق، لەسەر بنچینەیەکی زانستی ئەم قومارە بەربەست بکات. واتا ئەوانەی قومار دەکەن، بیاندات بەپزیشکانی دەروون، بۆ دۆزینەوەی هۆی قومارکردنەکەیان و، چارەسەرکردنی دەردەکەیان. هەروەها ئەو شوێنە گشتییانەیش کە قوماریان تێدا دەکرا، وەک یانەکان، هۆی ڕابواردنی پاک و پوختەیان تێدا دابمەزرێنێ، وەک جێی مەلەکردن و وێنەکێشان و خوێندنەوە و ساز و ئاواز لێدان و هەڵپەڕکێ و یاریی تری بەکەڵک. تا ئەندامەکان بەهۆی ئەوانەوە، کاتێکی خۆش بەسەرببەن و کەڵکیش وەربگرن.

ئینجا (شێرکۆ) گوتی: کەواتە خودا بەخۆڕایی لە قورئانی پیرۆز و ئینجیل و تەوراتدا نەیفەرمووە قومار مەکەن:

ئیجا (هەر چوار دۆستەکان) بەجارێک گوتیان:

«ئەوی ڕاستی بێ، پیاو پیاو بێ، قومار ناکات».

گوێگرن خۆشەویستەکان: ئەم باسەیشمان بڕایەوە. لەم کاتەدا شەوچەرەیان هێنا بیخۆن. ئیتر تا سبەی شەو بەخوداتان دەسپێرم.

## خۆشی ببەخشە، نەک ناخۆشی

(فەرهاد) گوتی: هەموومان حەز دەکەین خەڵک دڵمان خۆش بکەن. بەڵام کەم کەسمان هەوڵ دەدات دڵی کەسانی تر خۆش بکات. ئەمەیش لە خۆپەرستیمانەوەیە، کە هەر چاومان لە کەڵک و خۆشی خۆمانە، نەک کەڵک و خۆشی کەسانی تر.

(هۆشەنگ)یش گوتی: ئەو گوڵەی دەگەشێتەوە و، بۆنی خۆش پەخشان دەکات، بۆ هەموو کەسێکی پەخشان دەکات: بۆ دۆستیشی و بۆ دوژمنیشی.

ئەو ڕۆژەی هەڵدێ، تیشک بۆ هەموو کەس دەهاوێژێ، بەدۆست و دوژمنەوە.

ئەو کزبایەیش لە بەیانیانی هاویناندا هەڵ دەکات، لەشی هەموو کەس فێنک دەکاتەوە، چ دۆستی بێ و چ دوژمنی، کەواتە تۆیش، کە لەلای خودا و بەلای ڕاستیشەوە، لە (گوڵ) و (ڕۆژ) و کزەبای هاوین بەنرختر دانراویت، خۆت لەوانە کەمتر ڕامەگرە. تۆیش وەکو ئەوان خۆشی بخەرە دڵی هەموانەوە، چ دۆستت بن و چ دوژمنت. بەڵکو نرخی خۆت بزانە، لەوان زۆرتر خۆت ڕابگرە. خۆت لەپێناو کەڵک و چاکەی هەمووواندا بەخت بکە. جا ئەگەر تۆ گەیشتیتە ئەم پایەیە، بێ گومان لە ڕیزی ئەوانەدا دەبیت، کە خودا بەخوداناس و خاوەن باوەڕیان دادەنێ و، چ لە جیهاندا و، چ لە پاش ژیاندا، پاداشی هەرە گەورەیان پێ دەبەخشێ، کە ئەویش (بەهەشت)ە. (خودا) لە (قورئانی پیرۆز)دا دەفەرموێ: «ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم واموالهم بأن لهم الجنة...». واتا: «خودا، لە خوداناسەکان و خاوەن باوەڕەکان، خۆیان و سامانەکانیانی کڕیوە: بەهەشتیان پێ دەبەخشێ»...

ئینجا (فەرهاد) گوتی: کەچی هەندێک کە دەچنە کۆڕێکەوە، ڕێز لە کۆڕەکە ناگرن و، خۆشەویستی بەرامبەر کۆڕەکە نانوێنن. دەچن زووخاوی دڵی خۆیان بۆ کۆڕەکە هەڵدەڕێژن. پەشم و قینی ناو دڵی

خۆیان، لە پاش ملە، بەخەڵک دەڕێژن. ئەوانە بەوە دڵی ناو دانیشتوانی کۆڕەکە تەنگ دەکەن، ژیانیان لێ بار دەکەن، وەڕسیان دەکەن. ئەنجامیش بەوە دەگات: خۆیشیان و دانیشتوانی ناو کۆڕەکەیش کاتێکی ناخۆش بەسەر دەبەن، ئینجا بڵاوەی لێ دەکەن! ئەمەیش زۆردارییەکە، ئەوپەڕی دیار نەبێ.

(هۆشەنگ)یش گوتی: جا ئەوانەی دڵی خەڵک بەم جۆرە تەنگ دەکەن، سروشت سزایان دەدات: کەس توخنیان ناکەوێت، کەس خۆیان تێ ناگەیێنێت، بەتەنیا دەمێننەوە، لە خەم و خەفەت بەولاوە هیچ بار و دۆستێکیان بۆ نامێنێتەوە.

ئینجا (فەرهاد)یش قسەکەی ئەوی تەواو کرد گوتی:

«کەواتە لەبیرت نەچێ: کە تۆی مرۆڤ لەلای (خودا) و بەلای (ڕاستی)یشەوە: لە (گوڵ) و (ڕۆژ) و (کزەبای هاوین) بەنرختر دانراویت. دەبێ کارێ بکەیت شایستەی پایەی خۆت بێ. واتا هەموو دەم گەش و ڕووخۆش و قسە شیرین و کردەوە ڕەنگین بیت لەگەڵ هەمواندا...

## خوازەڵۆکی[1]

(شێرکۆ) گوتی: خوازەڵۆکی پیشەیەکی نەنگ و ناهەموارە. نە ئاینی پاکی ئیسلام ڕێی پێ دەدات، نە هیچ ئایین و یاسایەکی کۆمەڵایەتیش ڕێی پێ دەدات. هەموو کەس بەچاوێکی سووک سەیری دەکەن.

(شاهۆ)یش گوتی: لەگەڵ ئەمەیشدا، هەندێ کەس، چ لەبەر پەککەوتوویی بێ، یان لەبەر سەرگەردانی، کە ناچار دەبن خوازەڵۆکی بکەین بەپیشە بۆ خۆیان، لە مرۆڤایەتیی ئێمەیش وا دەوەشێتەوە کە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن. کۆمەڵایەتی تازەیش کە دەبێ لەسەر ڕێبازی ئیسلامەتی بچێ بەڕێوە، لای لەم جۆرە کڵۆڵانە کردۆتەوە. میوانخانەیەکی لە هەموو شارێکدا بۆ دامەزراندوون. لەناو ئەو میوانخانەیەدا دەیانپارێزێ و دەیاننوێنێ و بەخێویشیان دەکات. بەڵام ناهێڵێ هیچیان خوازەڵۆکی لەناو شەقام و کۆڵان و بازاڕەکاندا بکەن. بالبازی فەرمانڕەوایی هەر خوازەڵۆکێکی لەوانە دی، خوازەڵۆکی دەکات، دەیگرێ و دەیباتە ناو ئەو میوانخانەیەوە کە فەرمانڕەوایی بۆی دامەزراندوون. لەوێدا دایدەنێ. کاربەدەستانی میوانخانەکەیش لە میوانخانەکەدا دەیهێڵنەوە و، بەجوانی دەینوێنن و، خۆرشتی دەدەنێ و، تەندروستیشی دەپارێزن. جا ئەو پەککەوتانە لەوێدا دەمێننەوە تا مردن. بەو میوانخانانە دەڵێن: «پەککەوتەخانە».

ئینجا (شێرکۆ) گوتی: هەرچەندە ئەم جۆرە پەککەوتەخانانە لەمەوپێش لە هەندێ شارەکانی کوردستاندا هەبوون؛ بەڵام سەردەمێک هاتە پێشەوە کاربەدستان لایانبردن. کەچی لەم دوو سێ ساڵەی دواییەدا، (فەرمانداریی خۆیی کوردستان) خەریکە دایاندەمەزرێنێتەوە بەڵام لەسەر بنچینەیەکی زانستییانە کە لە بنچینەکانی پێشوو چاکترین.

(شاهۆ)یش گوتی: ئێمەیش تکامان لە کاربەدەستانی کوردستان وەهایە: ئەم پرۆژەیە لە هەموو شارەکانی کوردستاندا ببەنە سەر، تا لەمە زۆرتر ئەو چاوئەندازە ناسۆر و نەنگ و ناشیرینانەی کە

---

(١) سواڵکردن: دەرۆزە کردن، دەست پانکردنەوە.

خوازەڵۆکەکان دەینوێنن لەناو بازاڕ و شەقام و کۆڵانەکاندا بەچاوی خۆمان نەیبینینەوە. هەروەها خوازەڵۆکە درۆزنەکانیش کە بەدرۆ خۆیان کردووە بە(پەککەوتە)، کۆ بکرێنەوە بەردەم دادگا، تا سزای خۆیان بدەنێ و، لەمە بەولایشەوە لەبەر چاوبرسێتی و تەمەڵی و نامەردی خۆیان بەخوازەڵۆکی پارە لە ساویلکە و دڵپاکەکان، بەخۆڕایی نەپچڕن و، دەستی کۆمەڵایەتییەکەیشمان نەبڕن.

## دادپەروەری

(فەرهاد) گوتی: ئێمشەومان داناوە بۆ ئەوەی لە (دادپەروەری) بدوێین. کامتان لە پێش هەمووماندا دەست پێ دەکات؟

(هۆشەنگ: من. پێشینان گوتوویانە: «فەرمانڕەوایی لەسەر بنچینەی دادپەروەری دادەمەزرێ». واتا هەر فەرمانڕەواییەک بەپێی دەستوورەکانی (دادپەروەری) نەجووڵێتەوە، دەڕووخێ و لەناو دەچێ. هەر فەرمانداریییەکیش بەپێی. دەستووری (دادپەروەری) بجووڵێتەوە، پایەدار دەبێ و بەشەنگ و شۆخییەوە دەژی.

(فەرهاد)یش گوتی: ڕاست دەکەیت. (سەلاحەدینی ئەیوبی) کە توانی ئەو فەرمانڕەواییيە گەورە و فراوانە بیات بەڕێوە و، لەشکری بیست و دوو دەوڵەتی ئەورووپایی بشکێنێ و، سەر بەهەموو شاهێکی ناپاکی ڕۆژهەڵاتی دابنەوێنێ و، ئەو هەموو ناوبانگە چاک و پاک و پیرۆزەی دەست بکەوێ، هۆیەکەی ئەوەبوو: لە کردەوە و ڕەفتارەکانیدا دادپەروەر بوو. هەندێ جاریش لە (دادپەروەری)ی دەترازاند و (چاکەخوازی)ی بەکارهێنا، کە لە (دادپەروەری) بەنرختر بوو.

(شێرکۆ)یش گوتی: بەڵێ وایە. (عومەری خەتاب)یش کە پێشەوایەکی ئایینی و دەوڵەتی ئیسلام بوو، بۆیەکا فەرمانداریییەکەی بەهێز و هەڕەت و شکۆهدار بوو، تێکڕا هەموو کردەوە و ڕەفتارێکی دادپەروەرانە بوو.

ئینجا (شاهۆ) دەستی پێ کرد گوتی: بەڵام دادپەروەری، کە دەرمانی دەردی نەتەوەیەکی زۆرلێکراو و بێچارەیە، هەر ئەوە نییە کە لە کۆڕی دەوڵەتیدا بەکاربهێنرێ. هەروەها دەبێ لە کۆڕی (ژیانی ڕۆژانە)ی تایبەتیشدا بەکاربهێنرێ. وەک ئەوەی گەورەی خێزان لەگەڵ هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەی خۆیدا دادپەروەرانە بجووڵێتەوە. چ مافێکیان لای هەیە، بیانداتێ. چ مافێکیشی هەیە لایان، لێیان بسێنێت. هەروەها دەبێ دادپەروەری لە بازاڕی کڕین و فرۆشتنیدا بەکاربهێنرێ. لەگەڵ دۆست و یار و دراوسێ و خزمیشدا، لەگەڵ بێگانە و خۆیشدا بەکاربهێنرێ.

دوای ئەو (هۆشەنگ) هاتەوە قسەکردن، گوتی: (خودای گەورە)، لە قورئانی پیرۆز)دا بایەخێکی زۆری بە(دادپەروەری) داوە. دەفەرموێ: «ان الله یأمر بالعدل والاحسان». واتا:

«خودا فەرمان دەدا، لە ژیانی ڕۆژانەدا، دادپەروەری و چاکەخوازی بەکاربهێنرێت». هەروەها خودا دەفەرموێ: «واذا حکمتم، فاحکموا بالعدل». واتا: «ئەگەر فەرمانداریشتان کرد، لەسەر بنچینەی دادپەروەری بجووڵێنەوە». لە جێگایەکی تری قورئانیشدا دەفەرموێ: «واذا قلتم، فاعدلوا». واتا:

«ئەگەر قسەیشتان کرد، دادپەروەرانە قسە بکەن».

(فەرهاد)یش گوتی: بەکورتی هەرچی شەڕ و ئاژاوەیەک لە جیهاندا ڕوو دەدات، هەمووی لەوەوەیە کە زۆرداری دەکرێت، واتا: دادپەروەری بەکارناهێنرێت. هەموو چاکەیەک لە دادپەروەری دەوەشێتەوە، وەک: ڕاستگۆیی، سەرڕاستی، ڕاستی، دروستی، دۆستایەتی، نەتەوەپەروەری، نیشتمانپەروەری، جیهاندۆستی، چاکەدانەوە، داوێنپاکی، دەروون ئازادی، سەربەستی. هەموو خراپەیەکیش لە زۆرداری دەوەشێتەوە، وەک: دزی، قسە هێنان و بردن، گزی کردن، سپڵەیی، سەرشۆڕی، دەستدرێژی، ئینجا (هۆشەنگ) دوایی بەوتووێژ کە هێنا، گوتی:

جا ئەوانەی دەیانەوێ لە ژیانیاندا سەرکەوتووبن، پێویستە دادپەروەربن. خۆ ئەگەر چاکەخوازیش بن، کە پلەیەک لە دادپەروەری گەورەترە، ئەوە زۆرتر سەردەکەون و بەردەکەون و، پێش دەکەون. هەرچی گیروگرفتێکی ناو تاک و تەرایان هەیە و، ناو نەتەوەکان و، ناو دەوڵەتەکان هەیە، لەسەر دەستی (دادپەروەری)دا چارەسەر دەکرێ و دەبڕێنرێتەوە. ئەگەر (دەوڵەتەکان) و (نەتەوەکان) و (تاک و تەراکان)یش، (دادپەروەری)یان بپاراستایە، نە شەڕۆشۆڕ ڕووی دەدا و، نە شۆڕش و نە ئاژاوە!...

## بیروباوەڕی دیموکراتی

(شێرکۆ) گوتی: ئیمشەو لێدوانەکەمان لە بابەت دیوکراتییەوەیە. (دیوکرات) وشەیەکی یۆنانییە؛ واتاکەی ئەوە دەگرێتەوە: کە نەتەوە خۆی فەرمانداری بەسەر خۆیدا بکات. واتا خۆی فەرماندار بۆ خۆی هەڵبژێرێ تا ئەو فەرمانداره کاروباری دەوڵەت بەڕێوەببات. جا ئەگەر ئەو فەرمانداره لە ڕێی ڕاست لای دا و، دەستی کرد بەزۆرداری، نەتەوە مافی هەبێ، لێی ڕاست ببێتەوە و لای ببات، یەکێکی تر بکات بەفەرمانداری خۆی: کە زرنگ و کردەوە پەسەند و کارامە و دادپەروەر و کارگوزاربێ.

(شاهۆ): تکایە لەم ڕووەوە چەند نموونەیەکمان بۆ بهێنەرەوە.

(شێرکۆ) بەپێی سەرگوروشتەی (نەورۆز) کە لە ناو (کوردستان)دا باوە، (کاوە)ی ئاسنگەر بۆیەکا شۆڕشەکەی بەرپاکرد، خونکاری ئەو سەردەمە زۆرستەمی لە کوردەکان دەکرد. (بیوراسپ)ی خونکاری لەسەر تەخت لابرد و کوشتی و، (فەرەیدوون)ی لەجێ دانا، بەهیوای ئەوەی (دادپەروەرانە) و (دیوکراتییانە) فەرمانداری بەسەر کوردستاندا بکات. ئەو ڕۆژەی ئەو شۆڕشە سەری گرت، بەرێکەوت بەر یەکەم ڕۆژی بەهار کەوت، بۆیەکا ناویاننا: (نەورۆز).

جا ئەم بزووتنەوەیە بەبزووتنەوەیەکی دیوکراتییانە دادەنرێ، چونکە نەتەوە فەرمانداری خراپی لابرد و، فەرمانداری چاکی لەجێ دانا.

هەروەها (٣٠٠) ساڵێک پتریش لەمەوپێش (چارلسی یەکەم) زۆر و ستەمێکی زۆری لە ئینگلیزەکانی نەتەوەی خۆی کرد. هەموو مافەکانی ئەوانی خستبووە ژێر پێیەوە. بەڵام (کرۆموێل) بەناوی نەتەوەی ئینگلیزەوە لێی ڕاست بووەوە لەشکرەکەی شکاند و، خۆشی کوشت. نەتەوەی ئینگلیزیش لە پاداشی ئەوەدا ئەوی کرد بە(سەرەک کۆمار)ی خۆی تا فەرمانداری بەسەردا بکات.

هەروەها ئەم جۆرە شۆڕشەیش بەکارێکی دیموکراتییانە دادەنرێ. چونکە نەتەوە، فەرمانداری خراپی لەسەر خۆی لابرد و، فەرمانداری چاکی لەجێ دانا، فەرمانداری بەسەردا بکات.

(شاهۆ)یش گوتی: کەواتە لە (فەرمانڕەواییەکی دیموکراتی)دا دەبێ فەرمانداری بەدەست نەتەوەوە بێت. نەتەوە بەسایەی نوێنەرانی خۆیەوە، کە (کۆڕی یاسادانانیان لێ دروست دەبێ). هەر کارێکی بوێ بیکات، بڕیاری لەسەر دەدات. (کۆڕی یاسا ڕاپەڕاندن)یش لەسەریەتی ئەو بڕیارە جێبەجێ بکات. بەواتایەکی تر (کۆڕی یاسا ڕاپەڕاندن) لەلایەن (کۆڕی یاسادانان)ەوە لێپرسینەوەی لێ دەکرێ. ئەگەر نەتەوە زانی (کۆڕی یاسا ڕاپەڕاندن) فەرمانی خۆی بەجێ ناهێنێ، مافی هەیە، بەسایەی (کۆڕی یاسادانان)ەوە لای ببات و، (کۆڕێکی تر) بخاتە جێگای.

(فەرهاد)یش پرسی: ئەی لە واتای دیموکراتییەوە مافەکانی نەتەوەیش تێ ناگەین؟

(هۆشەنگ)یش وەرامی دایەوە، گوتی: بەڵێ تێیان دەگەین. وەک مافی کۆبوونەوە و، سەربەستی قسەکردن و باوەڕکردن و، دەربڕینی بیروباوەڕ لە بەردەم کاربەدەستانی فەرمانڕەواییدا. هەروەها لە وشەی دیموکراتییەوە، واتای (دادپەروەری) و (یەکسانی) و (سەربەستی) تێ دەگەین، کە دەبێ هەموو هاونیشتمانێک، وەک یەک، (ماف) و (فەرمان)ی هەبێ و، بەرامبەر دەوڵەت بەکاریان بهێنێ. بێجگە لەوە واتای (سۆسیالیستی)یش هەر لە واتای (دیموکراتی)یەوە هەڵقوڵاوە، کە کۆمەڵایەتییەکی تەندروست و خوێندەوار و کامەران و ئازاد دروست دەکات.

(شێرکۆ)یش گوتی: بەڵێ وایە. کە فەرمانداری بەدەست نەتەوەوە بوو، زۆروستەم ڕوو نادات. نەتەوەیش ڕۆژ بەڕۆژ پێش دەکەوێت. بەڵام کە فەرمانداری بەدەست نەتەوەوە نەبوو، هەموو شەڕ و ئاژاوە و خراپەیەک ڕوو دەدات. ئەو ساکەیش نەتەوە دوا دەکەوێت.

(هۆشەنگ)یش وەرامی دایەوە گوتی: ئایینی پاکی ئیسلام بایەخێکی زۆری بە(بیروباوەڕی دیموکراتی) داوە. خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: «وامرکم شوری بینکم). واتا «هەر کاروبارێکی نەتەوەییتان هاتە بەردەم، بام تێگەیشتووەکانتان ڕاوێژ و وتووێژی لەسەر بکەن». هەروەها دەفەرموێ: «لا فضل لعربی علی اعجمی الا بالتقوی». واتا: بەکردەوەی پاک و پیرۆز و خوداناسی نەبێ، هیچ بێگانەیەک پایەی بەرزتر نابێ». هەروەها دەفەرموێ: «ان اکرمکم عند الله اتقاکم». واتا: «ئەو کەسەتان، لە هەمووتان زۆرتر، لای خودا پلەی بڵند دەبێتەوە، کە لە هەمووتان زۆرتر، خوداناس و ڕەوشت و کردەوە بڵند بێ».

(فەرهاد) پرسی: کاک شێرکۆ! لە بابەت (فەرمانداری خۆیی کوردستان)یش نموونەیەکە لە (فەرمانداری دیموکراتی). ئەم دەزگایە لەلایەن فەرمانڕەوایی عێراقەوە بۆ ئەوە دامەزرێنراوە کە (نەتەوەی کورد) تێر و پڕ چێشکەی (دادپەروەری) و (سەربەستی) و (یەکسانی) بکات. هەروەها بۆ ئەوەی هەرچی زۆرداریيەکی فەرمانڕەوایانی پێشووی عێراق هەیە و لەسەری کەڵەکە بووە لاببرێ. تا کوردەواری پێش بکەوێ و کوردستانیش ئاوەدان ببێتەوە. ئەم ئاواتە گرنگەیش بەوە دێتەدی، کە نەتەوەی کوردیش یارمەتی کاربەدەستانی کوردستان و فەرمانڕەوایی عێراق بدات لە پێشخستنی خۆیدا.

(هۆشەنگ)یش گوتی: وا (ئەنجوومەنی نیشتمانی)یش لە ئارا دایە کە ئەویش بریتییە لە دەزگایەکی دیموکراتی تر بۆ هەموو دانیشتوانی عێراق بەکورد و عەرەب و هەموو کەمایەتییەکانەوە.

## چاکەخوازی

(شێرکۆ) گوتی: چاکەخوازی چییە و ئەندازەکانی چین؟

(شاهۆ)یش وەرامی دایەوە گوتی: ئەوانەی حەز بەچاکەکردن دەکەن لە دادپەروەران پلەیەک گەورەترن. جا چاکەخوازی کە ئەمەندە بلند و گرنگ بێ، هەڵبەت دەبێ لێوردبوونەوەیەکی زۆری تێدا بنوێنرێ. ئەگینا لەوانەیە جێگای خۆی نەگرێ و، لەباتی کەڵک و چاکە بۆ نەتەوە، زیانی لێ بوەشێتەوە. بەواتایەکی ڕۆشنتر دەبێ کە چاکەمان لەگەڵ کەسێکدا کرد، تەماشای ئەوەیش بکەین: ئاخۆ ئەم چاکە کردنەی ئێمەیە زیان بەکۆمەڵایەتیمان دەگەیێنێ، یان کەڵکی پێ دەگەیێنێ. ئەگەر دزێک پەنای بردە بەر سەرەک هۆزێک و، سەرەک هۆزەکە داڵڵای دا و، پاراستی و شاردیەوە، ئەمە ڕاستە سەرەک هۆزەکە، بەپێ بیروباوەڕی دزەکە، چاکەی لەگەڵ ئەو، دزەدا کردووە. بەڵام لە ڕاستیدا خراپەی لەگەڵ نەتەوەی خۆیدا کردووە و، خراپەی لەگەڵ دزەکە خۆیشیدا کردووە! چونکە (دادپەروەریی کۆمەڵایەتی) وا فەرمان دەدات: کە هەموو دزێک بگیرێت و بدرێتە دەست دادگاه. تا دادگاه سزایەکی وای بدات، ئاراستەی چاکی بکات و، جارێکی تریش نەگەڕێتەوە سەر دزی کردن. (فەرهاد)یش گوتی: هەر بەم ڕەنگە ئەو کەسەی باربووی (لۆتی)ش بکات، ناپاکی لەگەڵ نەتەوەی خۆیدا دەکات. چونکە لۆتیتی کارێکی پەسەند نییە و زیان و سەرشۆڕی بەنەتەوەکەمان دەگەیێنێت.

هەروەها منداڵی لاساریش نابێ بەدەمیەوە بدرێ. چونکە کە گەورە بوو زیانی زۆرتر بەدایک و باوکی خۆی و کەسانی تر دەگەیێنێت.

ئەو دایک و باوکە ناشییانەیش کە نازی بێ ئەندازەی منداڵەکانیان دەگرن، فێری خۆپەرستییان دەکەن. کە گەورە بوون زیان لە خۆیان و لە نەتەوەیش دەدەن.

(هۆشەنگ)یش گوتی: هەروەها ئەو کەسانەیش کە یارمەتیی خوازەڵۆکی درۆزن دەدەن، لە ڕاستیدا خراپە لەگەڵ ئەو خوازەڵۆکانە خۆیان و، نەتەوەکەی خۆیاندا دەکەن. چونکە (دادپەروەری) وامان لێ دەخوازێت، بە(چاک) پاداش بدەین و، بە(خراپ)یش سزا. تا هەردوولایان ئاراستەی چاکەکردن بکەین بۆ کەڵکی گشتی.

(شێرکۆ) پرسی: ئەی چاکەکردن لەگەڵ پەککەوتە و داماودا بەکارێکی پەسەند دانانرێ؟

(شاهۆ)یش وەرامی دایەوە گوتی: جاران چاکەکردن لەگەڵ پەککەوتە و داماوەکاندا بەکارێکی پەسەند دادەنرا. بەڵام ئەم چاکەکردنە چونکە لە شێوەیەکی دروستدا بەجێ نەدەهێنرا و، لەسەر بنچینەیەکی زانست و هونەر پێک نەدەهات: زیانی لە کۆمەڵایەتیمان دەدا، نەک کەڵک و فەڕ.

لەبەر ئەوە گەلێک کەسی تەمەڵ و خوێڕیش کە هیچیان پەککەوتە و داماو نەبوون، دەستیان دەدایە خوازەڵۆکی و، کۆمەڵایەتیەکەیشمان بەهۆی ئەوەوە زیانێکی زۆری پێ دەگەیشت. لەبەر ئەوە (زانایانی -

کـۆمـەڵایەتی) چەند دەزگـایەکـیـان داهێنا، بۆ ئەمـەی چارەسـەری دەردی دامـاو و پەککەوتە و لێ قەوماوەکانیان پێ بکەن و، ئەو جۆرە مرۆڤە درۆزنە خوێڕییانەیش کە خوازەڵۆکییەکی ناڕەوا دەکەن لە خوازەڵۆکی بەربەست بکەن. (دەزگـای پەککەوتەخـانە) و (دەزگـای هەتیـوان) و (کـۆمـەڵی نەهێـشتنی نەخۆشییەکانی سنگ) و (خوێندنگای کوێران) لەو جۆرە دەزگایانەن.

(شێـرکـۆ)یش گوتی: خۆش بەختـانە هەندێک لەم دەزگـایانە لە شـارە گـەورەکـانی کـوردستـانیـشـدا کراونەتەوە، وەک (خوێندنگای هەتیوان) و (پەککەوتەخانە) و (کۆمەڵی نەهێشتنی نەخۆشـیـەکانی سنگ). بەرامبەر ئەوانەیش کاربەدەستـانی کـوردسـتـان نیـازیان وایە، هەرچی خوازەڵۆکی دەکات کۆیان بکەنەوە و بیـانخـەنە دەزگـای (پەککەوتەخـانە)کـانەوە. تا لەوێدا جـێگا و خـۆرشـتـیـان بدرێتێ و تەندروستییان بپارێزێ. هەروەها سیلدارەکانیش تیژ دەکەنە سەر ئەوەی خۆیان بگەیێننە (خەستەخانەی سیل) و (کۆمەڵی نەهێشـتنی سیل)، تا نەخۆشییەکانیان چاک بکرێنەوە و، باربووی خێزانەکانیـشیـان بکرێ تا چاک دەبنەوە. دەبێ باوک و دایکەکانیش تیژ دەکەنە سەر ئەوەی بچنە (خوێندنگای هەتیوان)، تا لەوێدا خواردن و نوستن و جلوبەرگ و خوێندنیان بۆ پێک بهێنرێ.

(هۆشەنـگ)یش گوتی: لە ڕاستیدا ئەم کارانەی (فـەرمانداری خۆیی کوردستان)ە، هەموویان پەسەند و بەجێن. مـاوەتەوە سەر ئێمەیش کە گەلی کوردین و حەز بەچاکەخوازی دەکەین، هەر پارەیەک لە ئاهەنگی (ژنهێنان) و (پرسەگرتن) و ئەو جۆرە بابەتانەدا نیـازمـان هەیە، بەفیـڕۆ بەختی بکەین: بەختـی نەکەین. بیدەین بەو دەزگایانە تا ئەوان بۆ پەککەوتە و دامـاو و لێ قەوماو و نـەخۆش و هەتیـوانی گەلەکەمـانی بەخت بکەن. چونکە پارەکانمـان لەم جۆرە دەزگایانـەدا جێی خۆیان دەگـرن و، (خودا) بۆمـانی دەنووسێ. بەڵام لەو جـۆرە ئاهەنگانەدا جـێی خـۆیان نـاگـرن و (خـودا)یش بۆمـانـی نانووسێ. چونکە ئەو جـۆرە ئاهەنگانە بابەتی خۆنواندن و کەش و فشن، هەر پارەیەکیان تێدا بەخت بکەین بەفیڕۆ دەڕوا.

## خۆشەویستی، نەک پوولپەرستی

(شـێـرکـۆ) گـوتی: ئەوانەی بەتـەنـگ دڵـی خـەڵکەوەن ڕای بگرن... ئەوانەی حـەز بەبەرهەمـهـێنـانی خۆشەویستی دەکەن لە نێوان خۆیان و کەسانی تردا... ئەوانەی دەست دەدەنە خوداناسی و، مرۆڤدۆستی و، نیـشـتـمـانپـەروەری و، گـەلپـەروەری... ئـەوانەی دڵداری و دۆسـتـایـەتی دەکـەن لەگـەڵ کـەسـانی تردا... ئەوانە، هەموویان، لە (کۆڕی مرۆڤایەتیدا پایەیان لە هەمـوو کەس بڵندترە. چونکە هۆگری خۆشەویستین، نەک پوولپـەرستی. خۆشەویستی بەلای ئەو جۆرە کەسانەوە بەنرخترە لە سایە و پایە و سامانی جیهـان. چونکە هەرچییەکیان هەیە لە سامان و تێکۆشان، بەختی دەکەن لەپێناو پاراستنی خۆشەویستییەکەیاندا.

(شاهۆ) پرسی: دەتوانیت کاک فەرهاد، چەند وێنەیەکمان لەم جۆرە خۆشەویستییە بۆ بهێنیتەوە؟

(فـەرهاد)یش گـوتی: بەڵێ دەتوانم، (سـوکرات) بەرامبـەر گوتنی (ڕاسـتی)، گـەیشـتـە ئەندازەیەک، گیانی پاکی خۆی لەپێناودا بەخت کـرد بۆ ئەمەی نرخ بدات بەقـسـەکـانی خۆی، هەرچەندە هەلیـشی بۆ هەڵکەوتبوو لە بەندیخـانە هەڕا بکـات، ژەهری بەندیخـانەکـەی نۆشی و لە بەندیخـانەکـە هەڕای نەکـرد، نەوەک یاسا بشکێنێ.

خۆشەویستی (سەلاحەدینی ئەیوبی) بەرامبەر نەتەوەکانی ژێر دەستی خۆی، گەیشتە ئەندازەیەک، هەموو هێز و هەرەتێک و هەموو لەش و هۆشێک و، هەموو چست و چالاکییەکی خۆی لەپێناو پاراستنی خاکی ئیسلامدا بەخت کرد. تەنانەت بەدەم نەخۆشی و، بەبرینەکانی لەشیشییەوە، بەرامبەر دوژمنانی سەربەستی و ئازادی و ئیسلامەتی لە کۆڕی شەڕدا دەجەنگا دەیگوت:

«کە لەپێناو ئەم بیروباوەڕانەدا، کە هەمە، دەجەنگێم، ئێش و ئازاری نەخۆشییەکەمم لەبیر دەچێتەوە!...».

(هۆشەنگ)یش بۆی تەواو کرد، گوتی: «مادام کوری)یش لەپێناوی خۆشەویستییەکەیدا بەرامبەر (زانست) و (کەڵکی مرۆڤایەتی)، وازی لە سامان و تەندروستی ناوبانگی خۆی هێنا و، لە کۆڵ تاقی کردنەوەکانی خۆی نەبووەوە، تا (ڕادیۆم)ی دۆزییەوە. مرۆڤایەتی کەڵکێکی بێ ئەندازەی لە دۆزینەوەکەی ئەو وەرگرت.بەڵام ئەم کەڵکی خۆی خستە لاوە، خۆی لەپێناو کەڵکی گشتیدا بەکوشت دا.

(پێشەوا عوسمانی کوڕی عەففان)یش، نرخی مرۆڤایەتییەکەی لەوەدا بوو کە بوو بەئیسلام، لەسەر دەستی پێغەمبەردا، هەرچی سامانێکی هەبوو لەپێناوی بڵاوبوونەوە و پاراستنی (ئایینی ئیسلام)دا بەختی کرد.

(شێرکۆ)یش گوتی: ئەی باسی (مەم و زین) بۆ نەکەین؟ کە هەردووکیان لە پێناو (ئەڤین)ەکەی خۆیاندا خۆیان بەکوشت دا. خۆیان مراند، بەڵام سەری نەتەوەی کوردیان بەرز کردەوە.

ئەڤینەکەیان چیرۆکی مەم و زینی گەیاندە پۆپەی هەرە بەرزی وێژەی (کوردی) و (جیهانی).

هەرچی ئەرک و ئازارێک هەیە، بەسەر پێغەمبەرەکاندا هات. کەچی چونکە (خۆشەویستی)یەکەیان بەرامبەر (خودا) و بەرامبەر (ئایین)ەکانیان بەهێز بوو، وازیان لە پایە و سایە و مایە هێنا و خۆیان لە پێناو ڕاگرتنی دڵی (خودا) و (ئایین)ەکانی خۆیاندا بەخت کرد.

(زەردەشت) لە پێناوی ئایینەکەیدا خۆی بەکوشت دا. (مووسا) لە پێناوی ئایینەکەیدا بەسەدان دەرد و ئازاری چێشت و سزا درا.

(عیسا) و (محەمەد)یش خۆشەویستییەکەیان بەرامبەر (خودا) و ئایینەکەیان، ئەمەندە بەهێز بوو، هیچ سایە و پایە و مایەیەکی جیهانیان نەهاتە بەرچاو. خۆیان لەپێناو دڵ ڕاگرتنی (خودا)دا بەخت کرد بەرگەی هەموو دەرد و ئازارێکیان گرت. تا بیروباوەڕەکەیان سەری نەگرت و وازیان نەهێنا.

ئینجا (شاهۆ) دوایی بەوتووێژەکە هێنا، گوتی: (خۆشەویستی) هەر لەدەست (مەرد) دێ. بەڵام (پوولپەرستی) لە دەست هەموو (نامەرد)ێک دێ. لە (خۆشەویستی)یەوە: هەموو کردەوەیەکی چاک و، هەموو ڕەوشتێکی جوان و، هەموو خوویەکی بڵند دەوەشێتەوە. لە (پوولپەرستی)یشەوە: هەموو ڕەوشت و خوویەکی نەنگ و ناپەسەند و، هەموو کردەوەیەکی ناشیرین دەوەشێتەوە.

جا ئێمەیش کە (فەرمانداری خۆیی کوردستان)مان خۆشدەوێ، بام لە پێناوی پاراستنی ئەو و، پێ گەیشتن و گەشەکردنی ئەودا، بەرگەی هەموو ئەرک و ئازارێک و، هەموو توانج و پلارێک بگرین. واز نەهێنین و کۆڵ نەدەین و، ورە بەرندەین تا بەئامانجی بەرز و پیرۆزی (کورد) و (کوردستان) دەکەین.

## ئەم سامانەت لەکوێ بوو؟!...

(شێرکۆ) پرسی: ئەنجامی پەروەردەکردنی منداڵ بەنازدارییەوە چییە؟

(شاهۆ)یش گوتی: ئەوانەی لە منداڵیدا دایک و باوکیان ڕوویان زۆر داونێ و، نازداریان فێرکردوون، زۆربەیان گرۆز و لاسار دەردەچنُ. کە گەورە بوون، دەبنە خۆپەرستێکی وەها، هەموو جۆرە کەتن و تاوانێکیان لێ دەوەشێتەوە. دایک و باوکە ناشی و نەزانەکانیشیان بەلای خۆیانەوە وایە، بەرامبەر منداڵەکانیان خۆشەویستیان نواندووە. لە ڕاستیدا هەر دایک و باوکێ منداڵی خۆی وەها فێر بکا و ڕابهێنێ، نەک هەر دوژمنایەتی لەگەڵ منداڵەکەدا دەکات، لەگەڵ (کوردەواری)یەکەیشماندا دەکات. هەروەها لەگەڵ خۆیشیاندا دەیکەن. چونکە منداڵەکە کە گەورە بوو، هەر ڕۆژە پەلپێکیان پێ دەگرێ. هەر ڕۆژە زیانێکیان لێ دەدات. ئەمە بێجگە لەوەی لەگەڵ کەسوکار و دراوسێیشدا بەسەدان گەڕ و گێچەڵ و گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیان بۆ دروست دەکات. ئەم جۆرە منداڵانە دوور نییە ببێ بەدز. دوور نییە ببێ بەپیاوکوژ. یاخود بەچەواشەکار و ئاژاوەگێڕ.

(شێرکۆ) پرسی: ئەم منداڵانە بۆ چ وایان لێ دێ؟

(فەرهاد) گوتی: چونکە باوک و دایکیان فێری فەرمانی سەرشانی خۆیان نەکردوون: نە بەرامبەر باوک و دایکان، نە بەرامبەر کەسوکاریان، نە بەرامبەر دۆست و یاریان، نە بەرامبەر نەتەوە و نیشتمان و مرۆڤایەتییان، واتا هەر بەدەمیانەوە هاتوون و مافیان داونێ. هیچ فەرمانێکیان لێ داوا نەکردوون بیکەن. کەچی فەرمانی سەرشانی هەموو باوک و دایکێک ئەوەیە: لە پێش هەموو شتێکدا، منداڵەکەی خۆی وەها فێر بکات، وەها ڕابهێنێت، کە بەرامبەر هەموو مافێک کە دەستی دەکەوێت، فەرمانێک جێبەجێ بکات. کە بەرامبەر هەموو سەربەستییەک کە دەستی دەکەوێت، لێ پرسراوییەک بگرێتە ئەستۆی خۆی: چ بەرامبەر باوک و دایکی خۆی، چ بەرامبەر کۆمەڵایەتی و فەرمانڕەوایی.

(شێرکۆ) پرسی: ئەی ئەگەر منداڵەکە ئەو فەرمانەی بەجێ نەهێنا چی بکەین؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: ئەوساکە بەپێی ئەوەندەی هەڵبگرێ و، بۆ ئاراستەکردنی بەکەڵک بێ و، بتوانێ بەرگەی بگرێ، سزایەکی بەجێی بدرێ. پێشینان گوتوویانە: «دار لە بەهەشتەوە هاتووە»[1]. واتا: «هەر سزادانێک لە جێی خۆیدا بێ و، ڕەوابێ و، مرۆڤ ئاراستە بکات بۆ چاکی، مرۆڤ لە گوناه پەشیمان دەکاتەوە و، دەیخاتەوە سەر ڕێی چاکە کردن. کە مرۆڤەکەیش دەستی کردەوە بەچاکەکردن، خودا لە پاداشی ئەوەدا (بەهەشت)ی پێ دەبەخشێ».

هەروەها باووباپیرمان گوتوویانە: «کوتەک دەزانێ قۆناخ لە کوێیە!». واتا «ئەگەر هیچ وتووێژێک و، هیچ ڕاوێژ و ئامۆژگارییەک، کاری لە منداڵەکە نەکرد، لە کردەوەی ناپەسەندی خۆی وازبهێنێ، زەبروزەنگی لەگەڵدا بنوێنە، تا سەری دادەنەوێنێ و، مل دەدا بۆ ڕێگای ڕاست و دروست».

ئینجا (شێرکۆ) گوتی: منیش ئەم پێشەکییەم بۆیەکا دامەزراند سەرنجی کاربەدەستە بەڕێزەکانی

---

(١) ڕاستتر: (تێلاڵە...).

کوردستان ڕابکێشم بۆ ئەوەی خەبات بفەرموون (یاسا)یەک دابنرێ بۆ ئەو کەسانەی (سامانی ناڕەوا) پێکەوە دەنێن: چەند و چوونیان لەگەڵدا بکرێ، تا بزانرێ ئەو سامانە ناڕەوایەیان لە کوێوە دەست کەوتووە؟!. ئەگەر بۆیان دەرکەوت بەدزی و گزی و فزییەوە پێکیانەوە ناوە، لەلایەن (دادگا)یێکی سەرڕاست و کاردروست و بەهێزەوە بڕیاریان بەسەردا بدرێ و، ئەو سامانە ناڕەوایەیان لێ داگیر بکرێ و بخرێتە سەر گەنجینەی (فەرمانداری خۆیی کوردستان)، تا پرۆژەی بەکەڵکی بۆ (کوردەواری) پێ ڕابپەڕێنرێ. بێجگە لەوە ئەو تاوانبارانە هەر یەکەیان بەپێی کەتنەکەی خۆی سزای یاساییش بدرێن، تا لە تاوانی خۆی پەشیمان دەبێتەوە و، مل دەداتە چاکی.

(فەرهاد)یش گوتی: نزیکەی (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش، پێشەوا (عومەری خەتاب)، یاسایەکی وەهای دامەزراند، کە ناونرابوو: (یاسای ئەم سامانەت لەکوێ بوو؟)[1] عومەری دادپەروەر و خوداناس و پایە بڵند ئەم یاسایەی لە بەرامبەر هەموو خاوەن سامانێکی ناڕەوادا بەکاردەهێنا. چ لە فەرمانبەران و، چ لە کەسانی تر، هەستی بەهەر کەسێک بکردایە (سامانی ناڕەوا)ی کۆکردۆتەوە، ئەم (یاسا) بەنرخەی لەگەڵدا بەکاردەهێنا و ڕاپێچی بەردەم (دادگاه) گرنگەکەی خۆی دەکرد. هەر کەسێک لەوانە تاوانەکەی لەسەر بچەسپایە، بەپێی تاوانەکەی سزای دەدا و، سامانەکەیشی لێ داگیر دەکرد[2] بۆ (سامانخانەی گشتی)[3]، تا کاری چاکی پێ هەڵبسووڕێنێ بۆ کەڵکی موسڵمانەکان.

(هۆشەنگ)یش قسەکانی ئەوی تەواو کرد، گوتی: «لە ڕاستیدا ئەم جۆرە بەڕێوەبەرایەتییەی (عومەری پێشەوا) بەکاری دەهێنا، کارێکی گەورەی کردبووە کردەوە و ڕەوشتی فەرمانبەران و هاونیشتمانەکانی ناو دەوڵەتە گەورەکەی.

(یاسای ئەم سامانەت لە کوێ بوو؟)، هەرچەندە نزیکەی (١٤٠٠) ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام هێشتا (خاکی کوردستان)، بەڵکو هەموو خاکێکی تری جیهان پێویستی پێی هەیە. چونکە ئەگەر (کوتەک) نەوەشێنرێ، زۆر کەس هەن نازانن (قۆناخ) لە کوێیە»!؟

## پارە بەفیڕۆ بەخت مەکەن

(شێرکۆ) پرسی: پارە بۆچی دروست کراوە؟ نرخی پارە چییە؟

(شاهۆ)یش وەرامی دایەوە گوتی: ئەوانەی نرخی پارە نازانن، بەڕەوا و ناڕەوا خۆی بۆ دەکوتن و، پەیدای دەکەن و، کۆی دەکەنەوە. هەروەها بەڕەوا و بەناڕەوایش بەختی دەکەن. یاخود هەر کۆی دەکەنەوە و، لە بابەتی ڕەوا و ناڕەوایشدا بەختی ناکەن!...

یاسای سووروشتیش وەهایە، هەر کەسێ نرخی پارە نەزانێ، هەر بەپارەکەی خۆی، تووشی دەردیسەری

---

(١) واتا: «من أين لك هذا؟».

(٢) ڕاستتر: لێ دەسەندەوە.

(٣) یان (بيت المال المسلمين).

و گیروگرت و تەنگانە و تەنگوچەڵەمەی دەکات!... چونکە پارە بۆ ئەوە دروست کراوە: کاری چاکی پێ بکرێ. پرۆژەی بەکەڵکی پێ هەڵبسوورێنرێ. دەستی هەژار و داماو و لێ قەوماوی پێ بگیرێ. لەپێناو سەرکەوتن و پێشکەوتن و بەرکەوتنی: نەتەوە و مرۆڤایەتیدا بەخت بکرێ.

(شێرکۆ) پرسی: ئەی ئێمە بەرامبەر پارە چۆن دەجووڵێینەوە؟

(فەرهاد)یش گوتی: لەگەڵ ئەمەیشدا کە فەرمانڕەوایی عێراق و (فەرمانداری کۆیی کوردستان)ەکەمان سۆسیالیسییان کردووە بەنامانجی هەرە گەورە بۆ خۆیان، کەچی ئێمە هێشتا زۆربەمان، بەدوای خۆنوواندن و کەش و فش و لەخۆباییبووندا دەگەڕێین. تێ دەکۆشین خانووەکەمان زۆر گەورە بێ. زۆر شەنگ و شۆخ بێ. نەک بۆ ئەمەی خۆمان و خێزانمان تێیدا بحەسێینەوە کامەران ببین. بەڵام بۆ ئەمەی خۆمانی پێوە هەڵبکێشین لەبەردەم کەسوکار و، نەیار و دوژمنماندا. هەروەها بەو مەبەسەی لە دراوسێکانمان کەمتر نەبین.

جا ئێستا کە کارەکە و مفردی دەست ناکەون، ئەم جۆرە خێزانانە کاڵەک بەنەژنۆی خۆیان دەشکێنن. چونکە هەر چەندێ دەکەن، لەبەر گەورەیی، خانووەکەیان بۆ پاک ناکرێتەوە، بۆ ڕاناگیرێ، بۆ نارازێتەوە. لە سەرێکەوە پەشیمانن لەوەی خانووی وا گەورەیان دروست کردووە. لە سەرێکی تریشەوە بەتەنگ ئەوەوەن: لووتبەرزی و خۆنوواندن و خۆهەڵکێشان و کەش و فشەکەی خۆیان بپارێزن. جا لە ناوەند ئەم دوو (هێز)ە پێچەوانەیەدا: واتا (هێزی هۆش) و (هێزی خرۆشی دڵ)، ژاکاو و داماو و پەشۆکاویان لێ هاتووە، هەموو دەم لە خەم و خەفەت و سەرلێشواویدا دەتلێنەوە.

(هۆشەنگ)یش گوتی: ئەی کێشەی ئۆتۆمبیل بۆ باس ناکەیت؟

(شێرکۆش)یش گوتی: ڕاست دەکەیت: هەر بەم جۆرە دەکەونە گێژاوی ئۆتۆمبیل دەست کەوتنیشەوە. کە ئۆتۆمبیلچییەکانیش کەوتنە داواکردنی مانگانەی لە ئەندازە بەدەرەوە، ناچارمان، خاوەن ئۆتۆمبیلەکان، خۆیان، ئۆتۆمبیلەکانی خۆیان لێ بخوڕن. ئۆتۆمبیل لێ خوڕینیش هێز و توانایی و هونەری دەوێ، بۆ هەموو کەسێک نالوێ. لەبەر ئەوە هاکا دەزانین مەرگەساتی سامناک لە ئۆتۆمبیلی لێ خوڕینی خاوەن ئۆتۆمبیلەکانیان دەکەوێ. ئەمانیش لە مێشکی خۆیاندا تێ دەگەن بەهەڵەداچوون و، ئۆتۆمبیل کڕینی پێ نەدەویست. بەڵام فیز و کەش و فش و بەخۆنازینەکەیان، ناهێڵێ واز لە ئۆتۆمبیلداری بهێنن. لەبەر ئەوە دەکەونە گێژاوی داماوی و خەم و خەفەت و ڕاڕاییەوە. هەرچەند دەکەن نازانن چۆن سەری لێ دەربکەن!...

(هۆشەنگ)یش گوتی: بەڵێ وایە: بەم ڕەنگە سروشت تۆڵە لەوانە دەکاتەوە کە یاساکانی دەشکێنن. ئەوانەی پارەی نارەوا دەپچڕن و، پارەیش بەفیڕۆ بەخت دەکەن، وەک یەک، تووشی ژانەسەر و گلاراوی و سەرلێشواو و دڵتەنگییان دەکات.

تۆ پارەت هەر ئەوەندە پێویستە کە خۆت و خێزانت پێی بژین و، بەخۆشییەوە گوزەران بکەن. واتا: بخۆن و بپۆشن و لە خانوویەکی بەجێدا بژین. ئیتر پێویست بەوە ناکات، پارەی نارەوا دەست خۆت بخەیت. ئەگینا بەفیڕۆ بەختی دەکەیت. کە بەفیڕۆیش بەختت کرد، تووشی گەڕ و گێچەڵ و سەرگەردانی

و تەنگانە و خەم و خەفەت دێیت. کەواتە کاری پەسەند هەر ئەوەتانە «لە ڕێگای پاکەوە پارە کۆ بکەیتەوە و، لە ڕێگای چاکیشەوە بەختی بکەیت».

لە قورئانی پیرۆزیشدا هەروەهایە: ئەوانەی پارەی نارەوا کۆدەکەنەوە و ئەوانەی پارە بەفیڕۆ بەخت دەکەن، هەردوولایان، لەلایەن خودای گەورەوە، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، سزا دەدرێن و دەخرێنە دۆزەخەوە.

## خەڵکت خۆش بوێ، خەڵک خۆشی دەوێی

(شێرکۆ) پرسی: کامتان دەتوانن لە خۆشەویستی (خودا) بدوێن؟

(شاهۆ) گوتی: من. خودای پاکی بێ هاوتا، مرۆڤی خۆش دەوێ. ئەگینا ئەم هەموو جیهانەی نەدەخستە بەردەمی، بەروبوومی بخوات و تێیدا کامەران بێ. (خودا) تەنانەت، دوژمنەکانی خۆیشی خۆش دەوێ. ئەگینا بەری ڕۆژی لێ دەگرتن و، بای لێ بەربەست دەکردن و، ئاوی لێ دەبڕین، تا لە ناوی دەبردن. لە ڕاستیدا (خودا) سەرچاوەی هەموو خۆشەویستییەکە. تەنانەت هەندێ لە زاناکان (خودا) بە(خۆشەویستی) دادەنێن. (خودا) کە بەهەشت دەبەخشێ بەچاکانمان، لە خۆشەویستییەتی. تا ئاراستەمان بکات بۆ چاکی. (خودا) کە خراپەکانیشمان دەخاتە دۆزەخەوە، هەر لەبەر خۆشەویستییەتی. تا پاکمان بکاتەوە لە گوناە و، ئاراستەیشمان بکات بۆ چاکی.

(شێرکۆ) پرسی: ئەی مرۆڤ کێن؟

(فەرهاد) گوتی: مرۆڤ هەموویان لەو (ئادەم و حەوا) لەدایک بوون کە باپیرونەنکمانن. کەواتە بۆ چ بەبرا و خوشکی خۆمانیان دانەنێین؟ بۆ چ لەگەڵیاندا باش نەبین؟ بۆ چ یارمەتییان نەدەین؟

لە ڕاستیدا ئێمە ئەگەر خەڵکمان خۆش بوێ، کەڵکی بۆ خۆمان تێدایە. چونکە ئەوانیش ئێمەیان خۆش دەوێ. کە خۆشیشیان ویستین، هەموو چاکەیەکمان لەگەڵدا دەکەن. (خودا) ئایینی بۆیە داهێناوە، ئەگەر پێڕەویمان کرد، ببێتە هۆی خۆشەویستیمان لەگەڵ یەکتردا. بۆ وێنە ئەگەر لە بازرگانیدا، سەر ڕاست و خاوەن دەروون و دادپەروەر و، دەسپاک بووین: هەموو کڕیار و فرۆشیارێک کە دێنە لامان خۆشیان دەوێین. ئێمەیش ئەوانمان خۆش دەوێ.

(هۆشەنگ)یش گوتی: بەڵێ وایە. (خودا) چونکە خۆشی دەوێین، فێری مرۆڤدۆستی و، نیشتمانپەروەری و، گەلپەرستی کردووین. چونکە هەرکامێکیان ئەو بیروباوەڕانە بەکاربهێنێ و، پەیڕەویی دەستوورەکانیان بکات، خۆی لای هەموان خۆشەویست دەکات. کە خۆیشی لای هەموان خۆشەویست کرد، هەست بەسەربەرزی و کامەرانی و سەرکەوتن دەکات لە ژیاندا. بەواتایەکی تر، (جیهان) بۆ خۆی دەکاتە (بەهەشت)ێک.

ئارامی گیان و، ئاسوودەیی دڵ و سووکبوونی سەر و، خۆشی لەش و، دامرکانی دەروون... هەموویان لە خۆشەویستییەوە دەستت کەوتوون.

کەواتە: «خەڵکت خۆش بوێ، تا خەڵکیش تۆی خۆش بوێ».

## له چیرۆکی ئادەم و حەوا چی تێ دەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کامتان دەتوانن چیرۆکی ئادەم و حەوا بگێڕنەوە؟

(شاهۆ) گوتی: من دەتوانم. بەپێی فەرموودەکانی خودا کە لە قورئانی پیرۆزدا نووسران: خودا ئادەمی لە قوڕ دروست کردووە. حەوایشی لە پەراسوویەکی ئەو دروست کردووە. نیاز و جیاوازێکی زۆریشی بەهەردووکیان بەخشیوە. لە زۆربەی ئافەریدەکراوەکانی خۆیشی زۆرتر بەخشندەیی لەگەڵدا کردوون. بۆ وێنە: بەهەشتی پێ بەخشیون کە ژیانێکی پڕ خۆشی و کامەرانیی تێدا راببوێرن. نەتێیدا برسی ببن و، نە تێیدا تینوو ببن و، نە تێیدا رووت و قووت بمێننەوە و، نە تێیدا ماندوو ببن و، نەتێیدا برەنجێن. بەمەرجێک هەرچی خودای گەورە پێی گوتوون وا بکەن. لە فەرمووەدەکانی ئەو نەچنە دەرەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کە خودا زۆر شتی فێری ئادەم کرد و، لەسەر فەرمووەدەی ئەو، شەیتان نەبێ، هەموو فریشتەکان کڕنووشی نەوازشیان بۆ کێشا، هەروەها خودا کردی بەجێنشینی خۆی لەسەر (زەوی)دا تا فەرمانداریی بەسەردا بکات و ئاوەدانی بکاتەوە و، بەخۆی و نەوەکانیەوە فەرمووەدەکانی خودا بەجێ بهێنن لە ژیاندا. کەچی ئادەم و حەوا هەردووکیان فەرمووەدەی خودایان شکاند و، چوونە سەر قسەی شەیتان، لەبەری ئەو درەختەیان خوارد کە خودا فەرمووبووی لێی نەخۆن. پاشان ئادەم و حەوا هەردووکیان پەشیمان بوونەوە لە کردەوەی خۆیان و پاڕانەوە لە خودا کە بیانبەخشێت. لای خودایش پاڕانەوەکەیان گیرابوو. بەڵام لە (بەهەشت) دەری کردن و بڕیاری دا بەسەریاندا تا دەمێنن بەڕەنجی شانی خۆیان و دەست و بازووی خۆیان بژین. خودا پێیشی گوتن: شەیتان دوژمنتانە. وریابن جارێکی تر لە خشتەتان نەباتەوە. ئێوە هەتا پەیڕەوەیی دەستوورەکانی ئایینەکەی من بکەن، لە ژیانتاندا سەردەکەوتن. هەرچەند لە دەستوورەکانی ئایینەکەی منیش لابدەن ژێر دەکەون. لەبیرتان نەچێ: پەیڕەوی کردنی دەستووری خوداییە کە سەرگەردانتان دەکات». هەرچی (شەیتان)یش بوو چونکە قسەی خودای شکاند و کڕنووشی نەوازشی نەکێشا بۆ ئادەم و، چوویش ئادەم و حەوای چەواشەکرد و هانەی دان فەرمووەدەی خودا بشکێنن خودا کەنەفتی کرد و بڕیاری دا تا جیهان بمێنێ لە ناوی نەبات، بەڵام لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، بیخاتە ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ هەڤاڵ و ژێردەستەکانیدا بیانسووتێنێ.

(شێرکۆ) پرسی: باشە. ئەی ئێوە لەم چیرۆکی ئادەم و حەوایە چی تێ دەگەن؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: ئەم چیرۆکە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ڕەگەزی مرۆڤ، لەبەرئەوەی خودا هۆشی داوەتێ، هێز و دەسەلاتێکی زۆری پێ بەخشیوە، کە بەهۆی ئەوەوە دەتوانێ رووی سەرزەوی ئاوەدانکردنەوە و، بەرووبوومی هەموو ڕەنگەی بخوات و بەکامەرانییشەوە بژی. بەڵام بەمەرجێ پەیڕەویی (یاسای خودایی) بکات کە لە نووسراوەکانی خودادا پێشان دراوە، کە بۆ پێغەمبەرەکانی ناردۆتە خوارەوە. جا ئەگەر هات و ڕەگەزی مرۆڤ بەفەرمووەدەکانی خودا جووڵایەوە، ئەوا تەندروست و کامەران و سەربەست و ئازاد و خۆشگوزەران دەژی خۆ ئەگەر پێچەوانەی ئەو فەرمووەدانەیش جووڵایەوە ئەوا سەرگەردان و نابووت و ماڵوێران دەژی واتا ئەگەر بەپێی (یاسای خودایی) جووڵایەوە (سەر زەوی)ی بۆ دەبێتە (بەهەشت) ئەگەر بەپێی (یاسای خودایی)یش نەجووڵایەوە، (سەر زەوی)ی لێ دەبێتە (دۆزەخ).

## لە چیرۆکی قابیل و هابیل چی تێ دەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کامتان چیرۆکی قابیل و هابیلمان بۆ دەگێڕێتەوە؟

(هۆشەنگ) گوتی: من دەیگێڕمەوە. لە باوە ئادەم و دایکە حەوا گەلێک منداڵ کەوتنەوە، هەرچەند دایەحەوا منداڵی ببوایە کوڕ و کچێکی پێکەوە دەبوو کە (قابیل)یش لە دایک بوو کچێکی ناشیرینی لەگەڵدا بوو کە ئەو چوارە پێگەیشتن خودا فەرمووی بەئادەم خوشکی قابیل لە (هابیل) مارە بکات قابیل هەرچەندە لە هابیل گەورەتر بوو، بەڵام لاوێکی خۆپەرست بوو بەرپەرچی قسەی خودای دایەوە.

گوتی: من خوشکی خۆم جوانە نایدەم بەهابیل لە خۆم مارەی دەکەم ئەمەیش بەپێی (دەستووری خودایی)ی ئەو سەردەمە ڕەوا نەبوو بەکردەوەیەکی گوناه دادەنرا دوایی ئادەم گوتی: «بام شتێکی تر بکەین تۆیش و هابیلیش هەر یەکەتان دیارییەک پێشکەشی خودا بکات خودا لە کامتانی وەرگرت، کچە جوانەکە بۆ ئەوتان بێ». (قابیل) چوو لە بەرهەمی دانەوێڵەکەی خۆی کامی چروک و قرپۆک بوو ئەوەی پێشکەشی خودا کرد (هابیل)یش چوو چاکترین بەرخی قەڵەوی خۆی پێشکەشی خودا کرد لەگەڵ هەندێک ماست و کەرە و ڕۆندا کە ئادەم لە خودا پاڕایەوە یەکێکیان پەسەند بکات، ئاگرێک هاتە خوارەوە، لە هەردوو دیارییەکە نزیک بووەوە، لە پاشدا دیارییەکەی (هابیل)ی پەسەند کرد و خواردی زوو بەزوو ئاگرەکە لە کەلی شاخەکەوە هەڵکشایەوە بۆ ئاسمان باوە ئادەم و دایە حەوا و هەموو کوڕ و کچەکانیان چاویان لەمە بوو پیرۆزباییان لە (هابیل)کرد گوتیان: «کچە جوانەکە بۆ تۆ مایەوە» (قابیل) کە خۆی لە خۆیدا لاوێکی خودانەناس و بەدخووداڵ ڕەق بوو، ئەمەندەی تر لە خراپەکاریدا گری سەند بڕیاریدا (هابیل)ی برای بکوژێت، نەهێڵێ خوشکە جوانەکەی مارە بکات، تا بۆ خۆی بێنێتەوە، وەک نووسراوە ئایینییەکانی کۆن دەڵێن (شەیتان) لە بن کێڵشەی (قابیل)دا بوو.

هەر ڕۆژە بەجۆرێک لە خشتەی دەبرد و ڕێی پێشاندەدا: کە (هابیل) نوست لەسەر کەڵەبەردێک، لە هەلێکدا بەردێکی زل بماڵێ بەسەریدا و بیکوژێ.

واتا: چۆن ڕۆژەکە چۆلەکەیەکی پەڕسەوزی نایەسەر بەردێک و بەردێکی بەتەپلی سەریدا دا و کوشتی، لە دەرفەتێکدا (هابیل)ی برایشی وەها بکوژێت زۆری پێ نەچوو، (قابیل)، ئەوەی بۆ هەڵکەوت و (هابیل)ی بەسەرزمانی بەو جۆرە کوشت بەڵام خودا تۆڵەی ئەو کوڕە چاکە خوداناسەی لە (قابیل) کردەوە (قابیل) بەجۆرێکی وا زارەترەک بوو و ترسی خودا و دایک و باوک و برا و خوشکەکانی چووە دڵەوە، ئۆقرەی بەخۆی نەدەگرت دەمێک لە کەژ و کێودا سەری پێوە دەنا، دەمێکیش لە چۆڵەوانی و دەشت و بیاباندا هەڕای دەکرد هەمووودەم شێوەی (هابیل)ی بێ گوناهی برای دەهاتەوە بەرچاو دوایی وەک شێتی لێ هات دایە باریکی و پنێسی نە خەوی ما نە خۆراک خۆی بێ کەس و بێ دۆست و بێ یار دەهاتە پێش چاو لەپڕ لەسەر کەلی شاخێک لە شێوەی هابیلی برای داچڵەکی و هاتە پاشەوە، پێی ترازا و کەوتە خوارەوە ناو دۆڵێکی بەردەڵانەوە، کەللەی پژا و هەپروون بوو.

ئینجا (شێرکۆ)یش پرسییەوە : باشە لەم چیرۆکە چی تێ دەگەین؟

(فەرهاد)یش وەرامی دایەوە گوتی: ئەوە تێدەگەین: کە خودای دادپەروەر باکی ئەوەی نییە کەسێک بیپەرستێ یان نەیپەرستێ نایەوێ بەزۆریش کەس بکات بەخوداناس بەڵام ئەو کە ئەم ئایینە جوانەی بۆ ئێمەی مرۆڤ داناوە، مەبەسی کەڵک و چاکەی ئێمەیە نەک خۆی. (هابیل) لاوێکی خوداناسی دڵنەرمی کردەوە چاک و دەست ڕەنگین بوو هەرچەندی کرد (قابیل) لەگەڵیدا نەسازا چونکە ئەو خۆشەویستی خودا و هەمووان بوو، قابیل چاوی پێ هەڵدەهێنا ڕقی لێی دەبووەوە دوایی کوشتی.

خودایش کە ئەوەندەی گەردێک (زۆرداری) بۆ کەس پەسەند ناکات، تۆڵەی (هابیل)ی جوانە مەرگی بەو جۆرە کردەوە لە (قابیل) کەدیان.

## لە چیرۆکی نووح چێ تێدەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کامتان چیرۆکی نووحمان بۆ دەگێڕێتەوە؟

(فەرهاد)یش گوتی: من دەیگێڕمەوە نووح پێغەمبەرێکی گەورە و مامۆستایەکی مەند و زرنگ و لەسەرخۆ بوو (٩٥٠) ساڵ مایەوە لە ناو گەلەکەی خۆیدا پێغەمبەرێتی کرد کەچی لەو هەموو ساڵانەدا هەر ئەوەندەی بۆ هاتەسەر ڕێ کە لەگەڵ خۆیدا بردنیە ناو کەشتییەکەیەوە، کە ژمارەیان لە (٧٠) کەس تێپەڕی نەدەکرد سەیر ئەوەبوو نە ژنەکەی خۆی باوەڕی پێهێنا، نە کوڕەکەی گەلەکەیشی هەرچی تیز و فیز و توانج و پلارێک هەیە تێیان گرت و لە بتپەرستی خۆیان وازیان نەهێنا دوایی ڕیسوایشیان کرد و هەڕەشەیشان لێ کرد: ئەگەر وازیان لێ نەهێنێ بەردبارانی بکەن تا دەمرێ ئینجا کە نووح بەتەواوەتی خۆی ڕەنجەڕۆ هاتە پێش چاو، لە خودا پاڕایەوە لەو خودانەناسانە هیچیان نە هێڵێتەوە هەموویان لەناو ببات خودایش نزاکەی گیرا کرد.

فێریشی کرد کەشتییەکەی چۆن دروست بکات کە دروستی کرد پێی گوت:

«لافاوێک هەڵدەستێ هەموو جیهان دەگرێتەوە ئەم خودانەناسانەیشی پێ نوقووم دەکەم لەبەرئەوە خۆت و ژن وماڵت و ئەو کەسانەی باوەڕیان پێ هێناویت بچنە ناویەوە هەروەها هەمووە دڕندە و پەڕندە و جروجانەوەر و درەخت و سەوزە و گژوگیایەک، نێرومێیەک یاخود تۆوێک بخەرە ناو کەشتییەکەتەوە سەرلەنوێ لە پاش نیشتنەوەی لافاوەکە ژیان دەست پێ بکاتەوە جا کە کاتی خۆی هات، لافاوەکە هەڵسا و خودانەناسەکانی نوقووم کرد بەخۆیان و خانووبەرە و شار و دێهاتیانەوە، تەنانەت کوڕەکە و ژنە خودانەناسەکەی نوحیشی بەرکەوت بەڵام نووح و پەیڕەوەکانی کە لەناو کەشتییەکەدا بوون بێوەی لەسەر شاخی (جوودی) کە لە کوردستانی تورکیا دایە نیشتنەوە.

(شێرکۆ) پرسی: باشە ئێوە لەم چیرۆکی نوحە چی تێ دەگەن؟

(هۆشەنگ)یش وەرامی دایەوە گوتی: هەر کاتێ شوێنێک لە جیهاندا خودای لەبیر چووەوە و دەستی دایە خۆپەرستی، کەتن و، گوناه و داوێن پیسی و زۆرداری و دزی و درۆزنی و ناپاکی و پوولپەرستی و دووڕوویی و چەواشەکاری و هەلپەرستی و هەموو کردەوەیەکی گەنگ و لە ناویاندا ڕوو دەدەن خودایش بۆ ئەمەی دانیشتووانی ئەو شوێنەی جیهانە ڕزگار بکات لە سزای خۆی، لەپێشدا پێغەمبەرێکیان بۆ

دەنێرێ، پەشیمانیان بکاتەوە لە گوناه و تاوانبارییی خۆیان و، بیانخاتەوە سەر ڕێی خودا ناسی، واتا کردەوە و ڕەوشتی پاک و چاک و بڵند کە زانی ئەوانە گوێ نادەنە فەرموودەکانی خودا و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرەکەیان، لە هەر شێوەیەکدا بێ لە ناویان دەبات، وەک نەتەوەی نووحی بەو لافاوە لە ناوبرد!...

(شێرکۆ) پرسی: ئاخۆ نووح خەڵکی کوێ بووبێ؟

(شاهۆ)یش گوتی: بەپێی ئەو سەرگوروشتەیەی پیاوە ئایینییەکانی (یەزیدی) دەیگێڕنەوە، لە دانیشتوانی (عەین سفنی)بووە، کە بنکەی ناوچەی (شێخان)ە نووح کەشتییەکەی خۆی لەوێدا دروست کردووە لافاوەکەیش لەو کانییەوە هەڵقولاوە کە لەو شارەدایە کە ئێستا پێی دەڵێن (عەین سفنی) وشەی (عەین سفنی)یش واتاکەی (کانی کەشتییەکە) دەگرێتەوە لەبەرئەوە (یەزیدییەکان) خۆیان بەباپیرە گەورەی مرۆڤ دادەنێن ئەوەندە هەیە تا ئێستا لە هیچ نووسراوێکی ئایینیدا پاڵ پشتێکم بۆ ئەم سەرگوروشتەیە بەرچاو نەکەوتووە.

(هۆشەنگ)یش گوتی: بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە شاخی (جوودی) لە کوردستانی تورکیادایە هۆزی (گەودان)یش کە لە بناری ئەو شاخەدان بەکوردی قسەدەکەن هەندێ تیرەی ئەو (گەودان)ەیش ئێستاکە لە ناوچەی شێخان دان بێجگە لەوە (یەزیدییەکان) لەناوچەی (دهۆک) و (زاخۆ)یشدا هەن لە گوندی (سەنات)یشدا کە لە سنووری (زاخۆ) و (کوردستانی تورکیا) دایە گەلێک شوێنەوار هەیە کوردەوارییەکە دەڵێن (جێ نزرگەری نووح) بووە لە خوار شاخی (جوودی)یشەوە دوو شاری کورد هەن پێیان دەڵێن (شیر ناخ = شاخی نووح) و (دوورناخ = شاری نووح).

فەرهادیش گوتی: کە (نووح و پەیڕەوەکانی لە شاخی جوودی هاتنە خوارەوە، دەستیان کرد بەئاوەدانکردنەوەی زەوی وەک نووسراوە ئایینییەکانی کۆن دەڵێن: هەموو جیهان سەرلەنوێ لەم سێ کوڕەی نووح کەوتوونەتەوە: (سام) و (حام) و (یافیس) هەرچی برا عەرەبەکانمانن لە (سام) کەوتوونەتەوە.

هەرچی ئەفریکاییەکانن لە (حام) کەوتوونەتەوە نەتەوەی کوردی خۆیشمان لە (یافیس) کەوتوونەتەوە.

شێرکۆ پرسی: کەواتە ئەگەر مرۆڤی سەرزەمین بیەوێ لەسەرگەردانی و ماڵوێرانی و شەڕوشۆڕی و نەخۆشی و هەژاری و زۆرداری و خوێندەواری ڕزگاری بێ، دەبێ واز لە (خۆپەرستی)ی خۆی بهێنێ و خوو بداتە (خوداپەرستی) ؟!.

هەموویان گوتیان: بەڵێ وایە ئەگەر مرۆڤ بیەوێ هەتاسەر بەکامەرانی و ئازادی و سەربەرزی و خۆش گوزەرانییەوە ژیان بەسەر ببات، پێویستە، لە ژیانیدا لەسەر (یاسای خودایی) بڕوات بەڕێوە، کە ئەویش هەموو ئاینێکی ئاسمانی دەگرێتەوە، کە پوختەی هەموویان لە ئایینی ئیسلامدایە.

## له چیرۆکی ئیبراهیم چی تێدەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کامتان چیرۆکی ئیبراهیم مان بۆ دەگێڕێتەوە؟ له چیرۆکی ئیبراهیمیش چی تێدەگەین؟

(هۆشەنگ) گوتی: من دەیگێڕمەوە ئیبراهیم پێغەمبەرێکی شۆڕشگێڕ بوو بەقسەی هەندێک له شاری (ئوور)دا له دایک بووە، کە ئەو دەمە له سنووری خاکی کلدانییەکاندا بووە، لەسەردەمی شاهێتیی (نەمروود)دا بەم پێیە بەلاوێکی عێراقی دادەنرێ، (ئیبراهیم) زۆر ئازا و سەربەست بووە له بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیدا کە ناوی ناوە (ئایینی ئیسلام) له پاش ئەمەی هەموو هەوڵ و تەقەلایەکیدا لەگەڵ باوکی خۆیدا کە واز له بتپەرستی بهێنێ و ببێت بەئیسلام، (ئازەر)ی باوکی نەک هەر بەقسەی نەکرد، کە نەفتیشی کرد و دەریشی کرد ئەویش کە زانی باوکی هێشتا هەر دوژمنی خودایە، بەتەواوەتی لێی جیابووەوە.

هەرچەند لەگەڵ گەلەکەی خۆیشیدا خەریک بوو، واز له بتپەرستی بهێنن، کەڵکی نەگرت تەنانەت لەگەڵ (نەمروود)ی خونکاریشدا لەسەر ئایینەکەی کەوتە دەمەقاڵییەوە نەمروودی دەمکوت کرد بەڵام ئەنجامەکەی بەخراپ دەرچوو چونکە ڕۆژێکیان ئیبراهیم چووە پەرستگای شارەکەوە، بتە گەورەکەیان نەبێ، هەموو بتەکانی شکاند و پارچە پارچەی کردن کە دانیشتوانی شارەکە بەمەیان زانی دۆزییانەوە و دەستیان کرد بەچەند و چوون کردن لەگەڵیدا گوتی: «ئەگەر بتەکانتان ڕاستە خودان و بتە گەورەکەیشتان خودای هەرە گەورەتانە، چۆن لاوێکی بێ دەسەڵاتی وەک من توانی هەموویان بشکێنێ و لەتوپەتیان بکات؟ ئاخۆ له بتە گەورەکەتان نا پرسن ئەمە چۆن ڕوویداوە؟!».

بە(نەمروود)یشی گوت: «ئەگەر ڕاست دەکەیت تۆ خودایت، دە بەپێچەوانەی (خودا)وە ڕۆژ والێ بکە له جیاتیی ڕۆژهەڵات له ڕۆژئاواوە هەڵبێت!». خودانەناسەکان له زیرەکی و بلیمەتی و ئازایەتیی ئیبراهیم، سەرسام مابوون هەژارەکان هەندێکیان باوەڕیان پێ هێنا بەڵام بەشی هەرەزۆریان بەتایبەتی دەوڵەمەندەکان و خاوەن دەسەڵاتەکان باوەڕیان پێ نەهێنا دوایی لەسەر شکاندنی بتەکانیان ڕقیان زۆر لێی هەڵسا بڕیاریان دا (ئیبراهیم) بخەنە سەر ئاگرێکی نێڵەنێڵ و بیسووتێنن بەپێی قسەی خودا کە له قورئانی پیرۆزدایە، (خودا) فریای ئیبراهیم کەوت و ئاگرەکەی بۆ کرد بەفێنکایی و خۆشانی، (خودا)یش کە بۆی دەرکەوت ئیبراهیم ئەوەندە ئایینەکەی خۆی خۆش دەوێ و خۆی له پێناوی خۆشەویستی خودا و ئایینی خودادا بەو جۆرە بەخت دەکات، ئیبراهیمی زۆر بەدڵدا چوو: کردی بەهاوڕێ و دۆستی خۆی، تاما پشتی گرت و پاراستی له دوژمنەکانی.

پێغەمبەرێتییشی بەخشی بەنەوەکانی سامانێکی زۆر و بەختیارییەکی زۆریشی پێ ببەخش له ژیانی خێزانییدا لەگەڵ هێز و دەسەڵات و سەرکەوتندا ئیبراهیم بۆ بڵاوکردنەوەی (ئایینی ئیسلام چووە خاکی (شام) و (میسر) و (حیجاز) له هەموو خاکێکیاندا مەردانە خەباتی کرد (کەعبە) کە بەیەکەم مزگەوتی ئیسلامەتی دادەنرێ ئەو لەگەڵ (ئیسماعیل)ی کوڕیدا له شوێنی ئێستای شاری (مەککە)دا دروستی کرد چ لەسەردەمی خۆیدا و، چ له پاش خۆی له نەتەوەکانی ئەو گەلێک پێغەمبەری گەورە گەورە هاتنە

جیهـانەوە و ئەو «ئایینی ئیسـلام»ەیان بلاوکردەوە گرنگەکانیـان ئەمـانەن: (یووسف. مووسا. عـیسـا. محمد). لە چیرۆکی ئیبراهیمیش ئەوە تێدەگەین هەرکەسێ لە پێناو بیروباوەڕ و ئایینی خۆیدا، زانایانە و شۆڕشگێڕانەو خوداناسانە خەباتی مەردانە بکات، خودا سەری دەخات.

(شێرکۆ) پرسی: ئایا ئیبراهیم لە چ نەتەوەیەک بووە؟

(فەرهاد)یش گوتی: هەندێک دەڵێن، خەڵکی (ئورفە) بووە کە شارێکە لە شارەکـانی کوردسـتانی تورکیا هەندێکیش دەڵێن (ئیبراهیم) و (زەردەشت) یەکن.

جوولەکـەکان دەڵێن: جوو بووە مەسـیحـییەکـانیش دەڵێن لە ئێـمە بووە ئەمـانە هیچیـان بەتەواوەتی نەچەسپاون.

لە بابەت ئایینەکەیەوە خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (مـاکان ابراهیم یهودیا ولا نصرانیا ولکن کان حنیفا مسلما) واتا: ئیبراهیم نە جوو بووە و نە نەسرانی (مەسیحی)، موسوڵمانێکی پاک و تەواو بووە» ئەوەندە هەیە عێراقی بووە و لەسەردەمی (نەمروود)یشدا پێغەمبەرێتی کردووە پێغەمبەرانیش، ڕاستییەکەی، بۆ هەموو نەتەوەیەک، وەک یەک ئایینەکانی خۆیان ڕاگەیاندووە.

چونکە ئامـانجی خودا هەمـوودەم ئەوە بووە مـرۆڤ بگەیێنێـتـە پۆپەی مرۆڤـایەتیی خۆی کـە ئەویش خوداناسینە و پێڕەویکردنی ئایینی خودایە.

(شێرکۆ) پرسی: ئایا ئیبراهیم لە ژیانی خێزانیدا چۆن ژیاوە؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: (سارا)ی ژنی خەڵکی فەلەستین بووە یەجگار جوان بووە کە تەواو پیربوون، خودا دڵی ئەو ئیبراهیمی خۆش کرد کوڕێکی پێ بەخشین ناویان نا (ئیسحاق).

لە (هاجەر)ی ژنیشی کە کەنیزەکێکی میسری بوو، (فیرعەونی میسر) پێی بەخشی، یەکەم کوڕی بوو ناوی نا: (ئیسماعیل).

(ئیسماعیل)ی برد سەری ببڕێ و پێشکەشی خودای بکات خودا بەزەیی پێداهاتەوە نەیهێشت سەری ببڕێ ئیسـمـاعـیل لە ناو عـەرەبدا گـەورە بوو، ژنی لەوان هێنا نەوەکـانی بوون بەعـەرەب چونکە لە عەرەبستاندا گەورە بوون.

## لە چیرۆکی یوسف چی تێدەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کاک شاهۆ دەتوانیت چیرۆکی یوسف مان بۆ بگێڕیتەوە؟

(شـاهۆ)یش گـوتی: بەڵێ، (یوسف) و (بنیـامین) لە دایکێک بوون دە براکـەی تری یووسـفـیش لە دایکێکی تر بوون.

ئەمانە هەموویان کوڕی (یەعقووب) پێغەمبەر بوون، کە پێیشیان دەگوت: (ئیسرائیل) جا (ئیسرائیل زادەکـان)، واتا (بەنی ئیـسـرائیل) کـە بریتی بوون لە دوانزە تیـرە لەم دوانزە برایە کـەوتوونەتەوە (یەعقووب)ی باوکیشیان کوڕی (ئیسحاق) پێغەمبەری کوڕی (ئیبراهیم) پێغەمبەر بوو یەعقووب و کوڕەکانی لە ناوچەی کەنعاندا دادەنیشتن کە کەوتبووە خاکی (شام)ەوە، کە ئەو ساکە بەهەموو خاکەکانی

(سوورییە) و (ئەردەن) و (لوبنان) و (فەلەستین) پێکەوە دەگوترا: «خاکی شام».
(یوسف) لاوێکی جوانی کردەوە شیرین و ڕووخۆش بوو نەرم و نیان و مەندبوو زرنگ و لەسەرخۆ بوو
لەبەرئەوە باوکی خۆشی دەویست بنیامین برای لەو بچووکتر بوو بەڵام براکانی تری هەموویان لەو
گەورەتربوون شەوێکیان (یوسف) خەوێکی دی، لە خەویدا مانگ و ڕۆژ و یانزە ئەستێرە کڕنووشی
نەوازشیان بۆ کێشا کە خەوەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە، باوکی پێی گوت: کوڕم ئەم خەوەت بۆ براکانت
مەگێڕەرەوە نەوەک چاوت پێ هەڵبهێنن و داوێکت بۆ بنێنەوە، تووشی سەرگەردانییەکت بکەن هەروەها
خەوەکەت بۆ کەس مەگێڕەرەوە خەوەکەت وا دەگەیێنێت کە تۆ پایەت زۆر بڵند دەبێتەوە لە ژیانتدا،
تەنانەت باوکت و دایکت و هەر یانزە براکەیشت ناچار دەبن ڕێزت لێ بگرن و کڕنووشی نەوازشت بۆ
بکێشن»... بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، کە دە براکەی (یوسف) دەیاندی باوکیان یوسف زۆر
دەلاوێنێتەوە و ڕوو بەوان نادات، چاویان پێ هەڵنەهێنا لە ناو خۆیاندا گەلە کۆمەکێیان لە یوسف کرد و،
لەگەڵ خۆیاندا بردیان بۆ دەشت، بۆ ئەمەی لەوێ سەرەونگوونی بکەن، تا باوکیان ڕوویش بەوان بدات و
ئەوانیش بلاوێنێتەوە دوایی لەسەر بەرپەرچدانەوە و ئامۆژگاریی براگەورەکەیان، وازیان لە کوشتنی
یوسف هێناو بەڵام تێروپڕ لێیان دا و تێیان هەڵدا و جنێویان پێدا و، بەتوێی کراسێکەوە فڕێیان دایە
بیرێکی تاریک و نووتەکەوە کە ڕۆیشتنەوە ماڵەوە، بەدرۆ بەباوکیان گوت گورگ خواردوێتی، ئەوەیش
کراسە خوێناوییەکەیەتی.
هەر مەپرسە کە یەعقووبی باوکی چەند بەوە دڵشکاو و ڕەنجەڕۆ بوو بەڵام خودا ئاگای لە یوسف بوو،
چاودێریی دەکرد.
چونکە داینابوو بیکات بەپێغەمبەرێکی هەڵکەتووی، زۆری پێ نەچوو کاروانێکی بۆ ڕەخساند کە
ئاویان لە بیرەکە هەڵ هێنجا، یوسف بەسەتڵەکەوە هاتە دەرەوە بەوە زۆر دڵخۆش بوون.
بردیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ (میسر) لەوێ بەنرخێکی هەرزان فرۆشتیان بەسەرۆکی کاربەدەستانی
(میسر) ئەویش کردی بەکوڕی خۆی و لەگەڵ ژنەکەیدا پەروەردەی کرد و پێی گەیاند.
تا دەهات (یوسف) کارگوزاری و دڵسۆزی و چاکیی زۆرتر دەردەکەوت سەرۆکە کەیش تا دەهات زۆرتر
کاروفرمانی خۆی و ماڵەکەی دەخستە ژێر دەستییەوە بەڵام ژنی سەرۆکەکە گرفتاری ئەڤینی یوسف بوو
بوو لە یوسفی داواکرد لنگ بازیی لەگەڵدا بکات یوسف لە ترسی خودا خۆی لە دەست ڕاپسکاند ژنەکە
بەدگۆیی بۆ کرد لای مێردەکەی دوایی مێردەکەی وای بەچاک زانی بیخاتە زیندانەوە یوسف حەوت ساڵ
لە زیندانندا مایەوە ئنجا لەبەر لێکدانەوەی خەوێک کە (خونکاری میسر) دیبووی لە زیندان هێنرایە
دەرەوە کە یوسف کەینەوبەینەی خۆی بۆ خونکار گێڕایەوە و، ئەویش پرسین و لێکۆڵینەوەی تێدا کرد و،
پاکی و چاکی و نەژادی و بێ گوناهی یوسف بۆ دەرکەوت، یوسفی کرد بەکاربەدەستی دارایی خۆی و
هەموو گەنجینەکانی خاکی میسریشی خستە ژێر دەستییەوە یووسفیش بەو ڕاوێژە و ڕەنگرێژییەی بۆ
خونکاری میسری کرد، هەموو دانیشتوانی میسر و خاکە دراوسێکانیشی لە دەست گرانی و نەبوونی و
برسێتی ڕزگار کرد لێرەدا پێغەمبەرێتییەکەی یوسف بەتەواوەتی دەرکەوت بەڕێکەوت هەر دە براکەی

یوسف لە تاو برسێتی و گرانی و نەبوونی هاتنە میسر بۆ گەنم کڕین یوسف ئەوانی ناسییەوە بەڵام ئەوان ئەویان نەناسییەوە لە دوای پرسینێکی زۆر پەلپێکی لێ گرتن: تا بنیامینی برایان نەهێنن لەگەڵ خۆیاندا جارێکی تر گەنمیان پێ نەفرۆشی کە بنیامینیشیان هێنا فێڵێکی لێ کردن، بەهۆی ئەو فێڵەوە بنیامینی لای خۆی گلدایەوە ئنجا کە خۆی لێ ئاشکرا کردن، هەموو ترس و لەرزیان لێ نیشت: (یوسف) تۆڵەی خۆی لێ نەکردنەوە، بەشەکر دوژمنەکانی خۆی شکاند: ڕێزیشی لێ گرتن و نان و چێشتی دەرخوارد دان و دیاریشی پێشکەش کردن و لە گوناهیشیان چاوی پۆشی و لە خودایش پاڕایەوە کە لە گوناهەکەیان بیان بەخشێت ئەوانە کە چوونەوە کراسەکەی یوسفیان خستە سەرچاوی (یەعقوب)ی باوکیان، چاوی چاک بووەوە پاشەجار یوسف هەموو براکانی و دایک و باوک و خێزانەکانیانی بەڕێز و خۆشەویستییەوە، لە ناوچەی (کەنعان)ەوە گواستەوە بۆ خاکی میسر و هەموویانی لە چاکترین زەویدا دامەزراند کە باوک و دایکی و هەر یانزە براکەی گەیشتنە بەر تەختی یوسف کڕنووشی ئەوازشیان بۆ کێشا یوسفیش بەو پەڕی ڕێز و خۆشەویستییەوە پێشوازیی کردن یوسف سوپاسێکی بێ پایانی خودای کرد و بەباوکی گوت: «بابە گیان ئەمە خەوەکەمە هاتەدی. خودای گەورە قسەی خۆی بردەسەر لە زیندان هێنامیە دەرەوە ئێوەیشی گەیاندە لام براکانیشمی پێوە نووساندمەوە.

خودای من کردەوەی جوانی هەیە لەگەڵ بەندەی خۆیدا هەر خۆیەتی زانا و هەر خۆیشییەتی ژیر و تێگەیشتوو».

ئینجا کڕنووشی ئەوازشی بۆ خودا کێشا و ڕووی تێکرد گوتی: «خودای گەورە، زەوی و سامانت پێ بەخشیم، فێری لێکدانەوەی خەو و قسەت کردم، هەر تۆی دروستکاری زەوی و ئاسمانان. لە جیهان و پاش جیهانیشدا هەر تۆی دۆست و کاربەدەست و پشتیوانم. تووبی خۆت بەموسوڵمانییەوە بمرێنە لەوانەیشم بژمێرە کە پیاوچاکن».

(شێرکۆ) پرسی: باشە لەم چیرۆکی یوسفە چی تێدەگەین؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: هەر کەسێ زانین و کردەوە و ڕەوشتی چاک و دەسەڵات لە ژیانیدا بەکاربهێنێ، وەک (یوسف) سەربەرزی و دەسەڵات و خۆشگوزەرانی و کامەرانی دەست دەکەوێت.

(یوسف) پێغەمبەرێکی بلیمەت و هەڵکەوتوو بوو ئەوپەڕی دڵچاکی و داوێن پاکی و دڵسۆزی و کارامەیی و پیاوەتی و دادپەروەری و خوداناسی نوواند لەبەرئەوە هەر لە خونکاری میسرەوە هەتا دەگاتە دانیشتوانی خاکی میسر و برا دوژمنەکانی لە ئەنجامدا ڕێز و خۆشەویستییان بەرامبەری نیشاندا ئەمەیش پاداشتی خودا بوو بۆ ئەو کە هەتا مابوو، هۆی شانازی بوو بۆ خۆی و خێزانەکەی.

## لە چیرۆکی مووسا چی تێدەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کاک هۆشەنگ دەتوانیت چیرۆکی مووسامان بۆ بگێڕیتەوە؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: مووسا پێغەمبەرێکی گەورەبووە.

گەلپەروەر و نیشتمانپەروەر و خوداناس و مرۆڤدۆست بووە ئەو هەرچەندە لە ماڵی فیرعەونی میسردا

گەورە بوو بوو، بەڵام کە زانی فیرعەونەکانی میسر نزیکەی (٤٠٠)ساڵ نەتەوەکەی ئەویان، لە ژێر زۆروستەمی خۆیاندا چەوساندۆتەوە، پێغەمبەرێتییەکەی خۆی لە ڕزگارکردنی جوولەکەکانی نەتەوەی خۆیدا بەخت کرد لە پاش ڕەنج و تەقەللایەکی زۆر، کە لەژێر سەرپەرشتیی خودادا دای، توانی جووەکانی لە دەرفەتێکدا دەرباز بکات و لە زرێی سوورەوە بپەڕێتەوە ئەوبەر بۆ نیوە دوورگەی سیناء هەرچی فیرعەون و لەشکرەکەی بوو کە دوایان کەوتن لە ناو ئاوی زرێکەدا خنکان، نەیانتوانی بگەنە جووەکان کوشتاریان لێ بکەن.

(شێرکۆ) پرسی: فیرعەون و مووسا لەبەرچی ڕێک نەدەکەوتن؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: هەرچی مووسا بوو لەسەر فەرموودەی خودا لەگەڵ (هاروون)ی برایدا چوونە لای (فیرعەون)، بەشیرینی تکایان لێکرد جووەکان ڕێ بدات لەگەڵیدا بڕۆنەوە بۆ خاکی کەنعان کە بەنیشتمانی باوباپیری خۆیان دادەنا (فیرعەون)یش کە خۆی بەخودا دادەنا توانج و پلاری دەگرتە مووسا و خودای مووسا مووسا، گەلێک شاکاری خودایی پێشانی فیرعەوندا وەک: داردەستەکەی، کە بوو بەئەژدیهاو مارە دەستکردەکانی جادووگەرەکانی فیرعەونی قووت دا وەک دەستی کە دەیخستە بن باخەڵی و دەری دەهێنایە دەرەوە سپی و ڕووناکی لێ دەهات وەک ئەوەی کە لە خودا پاڕایەوە گەلێک سەرگەردانی بەسەر میسریەکاندا هێنا بۆ وێنە: ئاوی نیلی کرد بەخوێن، لەشکری بۆق و کێچ و کوللەی یەک لە دوای یەک تێ بەردان هەموو جارێکیش ڕزگاری دەکردن لە دەست ئەو سەرگەردانییانە، بەمەرجێ بەڵێن بدەن، جووەکان بەڕەڵلا بکەن بڕۆنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان کەچی پێچەوانەی بەڵێنەکانی خۆیان ڕەفتاریان دەکرد ئیتر کە مووسا زانی بەهیچ کلۆجێک ناتوانێ لەگەڵ فیرعەوندا ڕێک بکەوێ و، فیرعەونیش وازی لە خۆپەرستیی خۆی نەهێنا و نەهاتە سەر ئایینی مووسا، ناچارما بەئامۆژگاریی خودا جووەکانی لە شەوێکدا لە ناکاو دەرباز کرد، وەک لەسەرەوە پێشانمان دا.

(شێرکۆ) پرسی: ئایا دەتوانیت بەکورتی ئایینەکەی مووسامان پیشان بدەیت؟

(هۆشەنگ) گوتی: ئایینی مووسا بریتییە لە خوداپەرستی و فەرمانەکانی خودا و ئامۆژگارییەکانی، کە ئەمانە هەموویان لە نووسراوێکدا نووسراونەتەوە ناویان ناوە (تەورات) چیرۆکی پێغەمبەرەکانی پێشوویشی تێدایە بەگشتی ڕێگای ژینێکی پاک و چاک و پیرۆز پێشانی مرۆڤ دەدەن (تەورات) یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی مێژوو و ئاینی ئەویش پشتی ئایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆی دەگرێ بەکورتی خودا لە (تەورات)دا فەرمان دەدات بەچاکەکردن و، بەخراپە نەکردن بۆ وێنە: (مەکوژە. داوێن پیسی مەکە. دزی مەکە. درۆ مەکە ئازاری کەس مەدە.، نوێژ بکە. ڕۆژوو بگرە. یارمەتیی هەژار و داماو و لێ قەوماو بدە. ڕێز لە باوک و دایکت بگرە ڕاستگۆبە.)، ئەمانە لە تەوراتدا هەن.

(شێرکۆ) پرسی: جووەکان بۆچ خودا لە بیابانی سینادا چل ساڵ هێشتنیەوە؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: جووەکان نەتەوەیەکی گرۆز و سەرکێش و ناهەموار و ئاژاوەگێڕ و خۆپەرست بوون مووسا بەو هەموو چاکەیەوە کە لەگەڵیدا کردن، بەقسەیان نەدەکرد بەسەدان پرتەو بۆڵەو قسەی ناشیرین و توانج و پلار و سەرکێشییان لە ڕوویدا کرد پێی گوتن: خودا فەرموویەتی بچینە خاکی پیرۆز

تا لەژێردەستی خودانەناسەکانی دەربهێنین». بەقسەیان نەکرد و دڵیان شکاند ئەویش لە خودا پاڕایەوە: «خۆی و هاروونی برای لە دەست ئەو نەتەوە گوناهکارە ڕزگار بکات». خودایش نزاکەی گیرا کرد چل ساڵی خشت جوولەکەکانی لە بیابانی سینادا هێشتەوە نەیاندەزانی چۆن بگەنە ئامانجی خۆیان مووسای بەسەزمانیش بەرەنجەڕۆیی و دڵشکاوییەوە گیانی پاکی بەخاک سپارد.

## لە چیرۆکی قاروون چی تێدەگەین؟

(شێرکۆ) پرسی: کامتان چیرۆکی قاروونمان بۆ دەگێڕێتەوە؟ لە ئەنجامەکەیشی چی تێدەگەین؟

(فەرهاد) گوتی: من. قاروون خزمی مووسا پێغەمبەر بوو. بەڵام تەواو پێچەوانەی مووسا بوو هەرچی مووسا بوو هەر بەتەنگ کەڵک و چاکەی نەتەوەی ئیسرائیلەوە بوو هەرچی قاروون بوو هەر بەتەنگ کەڵک و چاکەی خۆیەوە بوو مووسا بەرەنگاریی زۆروستەمی فیرعەونی میسری دەکرد خەریک بوو ئیسرائیلییەکان بکات بەیەک و هەموویان پێکەوە ڕزگار بکات لە دەست زۆروستەمی فیرعەون بڕیاری دابوو هەموویان بباتەوە بۆ خاکی باوو باپیریان هەرچی قاروون بوو، حەزی دەکرد خۆی و ئیسرائیلییەکان هەر لە میسردا بمێننەوە بۆ ئەمەی سایەو پایەو مایەی خۆی بپارێزێت و زۆرتریش پەرەی پێبدات قاروون پیاوێکی زەلام و سەروچاو جوان و زیرەک و کارامە و چالاک بوو توانی لە کشتوکاڵ و بازرگانییەکەیدا زۆر سەربکەوێ توانی لای فیرعەون و دەس و پێوەندەکانی فیرعەونیش خۆی تەواو نزیک بخاتەوە کارێکی وای کرد فیرعەون کردی بەفەرمانداری‌کی خۆی و هاودەم و پشتیوانێکی خۆی لەمەوە سامانێکی یەجگار زۆری پێکەوەنا، هەروەها پشتیوانێکی زۆر و دەس و پێوەندێکی زۆریشی بۆ خۆی لە ناو ئیسرائیلییەکاندا پەیدا کرد هەمووده‌م ئامۆژگاریی ئیسرائیلییەکانی دەکرد لەگەڵ فیرعەوندا هەڵبکەون و لە میسریشدا بمێننەوە، سەر لە خۆیان تێک نەدەن، واتا بەقسەی مووسا نەکەن بەتایبەتی ئەو سەردەمەی مووسا لە ترسی کوشتن لە میسر دوور کەوتبووەوە و، چووبووە (مەدیەن)، لەبەر ئەو پیاوە قیبتییەی کە کوشتبووی، هێز و دەسەڵات و سامانی قاروون یەجگار گەشەی کردبوو بەڵام کە مووسا هاتەوە و، بەناوی خوداوە خەباتی کرد ئیسرائیلییەکان لە دەست فیرعەون ڕزگار بکات و بیانباتەوە بۆ خاکی کەنعان، قاروون تەواو تەنگەتاو بوو دەترسا لەوەی ئەگەر ئیسرائیلییەکان لە میسر دەربچن، سامان و هێز و دەسەڵاتەکەی لە دەست بچێ مووسایش کە داوای لێ کرد (زەکات)بدات بۆ ئەمەی بەپارەکەی ئەو و بەپارەی دەوڵەمەندەکانی تری ئیسرائیل بتوانێ یارمەتیی هەژار و داما و لێ قەوماوەکانی نەتەوەی ئیسرائیل بدات، قاروون تەواو تێک چوو لەسەرێکەوە فیرعەونی لێ هان دەدا، لە سەرێکی تریشەوە دەوڵەمەندەکانی ئیسرائیلی لێ هاندەدا، بۆ ئەمەی ئەو (زەکات)ە نەدرێ و خەباتی مووسا سەرنەگرێ و کەسی لە دەورو پشت کۆنەبێتەوە بێجگە لەوە هەوڵی دا گەڵێک قسەی گەنگ و نەنگ و ناووناتۆرەی خراپ دوای مووسا بخرێ، بۆ ئەمەی ئیسرائیلییە هەژارەکان لێی بتەکێنەوە یەکێک لەو گەلەکۆمەکێیانە ئەوەبوو: پارە و جلوبەرگی جوان و خشڵی بەنرخیاندا بەئافرەتێکی سۆزانی بۆ ئەمەی بێت لەبەردەمی مووسا و ئیسرائیلییەکاندا بڵێ: «مووسا دەستی بۆ بردووم داوێن پیسیم لەگەڵدا بکات!...». کە ئەوە بۆ قاروون چووە سەر، مووسا هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ لە خودا پاڕایەوە بکەوێتە فریای و ڕاستی بۆ

هەموان دەربخات، تا رووڕەشی بۆ قارووون و هەڤاڵەکانی بێنێتەوە کاتێکیان زانی خودا کاری کردە دەروونی ئافرەتەکە و پەشیمانی کردەوە لە گوناهەکانی خۆ و بەزمانی خۆی بەئاشکرا گوتی: «ئەی گەل، ئاگاتان لێ بێ من هەرچییەکم بە پێغەمبەری خودا مووسا گوت هەڵبەست بوو، قارووون بەزەبری بەرتیل پێی کردم وا لە کردەوەی خۆم پەشیمان بوومەوە ئەم بەرگانەی لەبەرمدایە دەیسووتێنم هەرچی یەکیشم لە قارووون وەرگرتووە دەیدەم بەمووسا چیی لێ دەکات بیکات.

وا لەسەر دەستی خودادا بڕیارم دا لە کردەوەکانی پێشووم واز بهێنم و دوای مووسا بکەوم و یارمەتیی بدەم بەڵکو ئەمە خودایە لای خودا کردەوەم پەسەند بێ». قارووون و دەس و پێوەندەکانی بەقسەی ئافرەتەکە شەرمەزار بوون قارووون لە هۆش خۆی چوو دەس و پێوەندەکانی هەڵیان گرت و بردیانەماڵەوە خەڵکەکەیش های و هوویان لێکردن ئینجا چوون بەلای مووساوە پیرۆزباییان لێ کرد ئەمە بوو بەهۆی ئەوە کە مووسا سەری بەرز بووەوە.

قارووونیش پێی شکا و سەرشۆڕیی بۆ مایەوە ئینجا مووسا لە خودا پاڕایەوە: قارووون و خانووەکەی و هەرچی سامانێکی هەبوو نیشتە ناو زەوییەوە و نوقووم بوو، لەم چیرۆکەیشەوە ئەوە تێدەگەین کە سەرکەوتن هەر بۆ ئەوانەیە کە خودا دەناسن و کردەوە و ڕەووشتی چاک و پاک بەکاردەهێنن.

## لە چیرۆکی داوود چی تێدەگەین؟

(شێرکۆ) گوتی: جووەکان، وەک لەمەوپێش گوتمان، لەسەر ئەوەی خودایان شکاند و نەچوونە خاکی فەلەستینەوە، خودا (٤٠) ساڵ بەسەر لێ شێواوی و ماڵوێرانی و سەرگەردانییەوە، لە چۆڵ و بیابانی سینادا ڕێی لێ ون کردن مووسای پێغەمبەری خودا بەداخی ئەوانەوە سەرینایەوە خودا پێغەمبەرێکی تری بۆ ناردن جووەکان لە سزاکەی خودا چاویان شکابوو ئەمجارە بەقسەی پێغەمبەرەکەی خۆیان کرد و چوونە خاکی فەلەستینەوە.

دانیشتوانی ئەوێ کە هەموویان خودانەناس بوون لە شەڕدا شکان و جووەکان ئەو خاکەیان داگیرکرد بەڵام جووەکان بەدەردی خۆیانەوە دانەمرکانەوە، سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بەشکاندنی قسەی خودا خودایش لە تۆڵەی ئەوەدا لەسەر دەستی فەلەستینییەکاندا شکاندنی و دەری پەڕاندن و ڕیسوای کردن.

پیاوەکانی بەکوشت دان و کوڕەکانی بەگرتندان تەنانەت (تابووت) واتا سنووقە ئایینییەکەی ئەوەی ئیسرائیلیشی دەست خستن، کە (تەورات)ەکەی مووسا و داردەستەکەی و کەمێک گەزۆ و هەندێک کەلوپەلی هاروونی تێدابوو ئیسرائیلییەکان بەو شەڕانە پەرت و بڵاوبوونەوە و ئاوارە بوون و کز و بێ دەسەڵات مانەوە.

پاشان لەسەر خواستی خۆیان و پاڕانەوەی پێغەمبەرەکەیان خودا (تالووت)ی کرد بەخونکاریان، تا لەپێناوی خودادا خونکارییان بەسەرەوە بکات و شەڕیان پێ بکات بۆ ئەمەی باوەڕ بەقسەی پێغەمبەرەکەیان بکەن، خودا بەفریشتەکانی خۆیدا سنووقە ئایینییەکەیانی خستە بەردەم (تالووت)ی خونکاریان جووەکان بەمە زۆر دڵخۆش بوون، هەرچەندە (تالووت) هەژار و دەست کورت بوو، بەڵام لەسەر قسەی خودا کردیان بەخونکاری خۆیان.

(شاهۆ)یش گوتی:- تالووت جووەکانی ئامادەکرد بۆ شەڕ.

داوود لاو بوو لە هەموو براکانی پچووکتر بوو (تالووت) جووەکانی تاقی کردەوە گوتی: «هەرچی لە ئاوی ئەم رووبارە بخواتەوە، نابێ لەگەڵ مندا بێتە شەڕەوە». زۆربەی جووەکان لە ئاوەکەیان خواردەوە (تالووت) تەنیا ئەو سەربازانەی هێشتەوە کە لە ئاوەکەیان نەخواردەوە کە چووە بەرامبەر لەشکری (جالووت)ی خونکاری فەلەستینییەکان جووەکان لە هێز و هەڕەتی (جالووت) گەورەیی لەشکرەکەی زەندەقیان چوو.

گوتیان: «ئێمە دەرەقەتی لەشکری جالووت نایەین». بەڵام خوداناسەکانیان گوتیان: «کە خودامان لەگەڵدابێ و، ئێمەیش باوەڕمان بەو هەبێ، ئیتر بۆچی لە زۆریی دوژمنی خودانەناس بترسین؟ هەرچەندە ئێمە کەمین خودا یاربێ دەرەقەتیان دێین». کە (جالووت) بەبەرگی جەنگەوە هاتە پێشەوە کەس نەبوو بێتە پێشەوە بەرەنگاریی بکات، (داوود) نەبێ (داوود)یش ئەمەندە بچووک بوو، جالووت بەزەیی پێداهاتەوە، گوتی: «ئەی لاو بگەڕێرە پاشەوە، با نەتکوژم!. بەڵام داوود لە زەلامی و کەش و فشی (جالووت) نەسڵەمییەوە. گوتی: «من دەمەوێ بتکوژم!». ئەوەی گوت و بەقۆچانییەکەی بەردێکی گرتە ناوچاوانی (جالووت) پێکای. جالووت لەپەوڕوو کەوتە سەر زەوی. (داوود) زوو گەیشتە سەری و سەری بڕی. کە لەشکرەکەی جالووت، خونکارەکەی خۆیان دی کوژرا، ترسان شکان و هەڵاتن. بەم ڕەنگە بەسایەی ئازایەتیی (داوود)ەوە ئیسرائیلییەکان بەسەر دوژمنە خودانەناسەکانیاندا سەرکەوتن.

(فەرهاد)یش گوتی: لەم چیرۆکی (داوود)ەوە ئەوە تێ دەگەین کە خوداناسی و بیروباوەڕی پۆلایی و خۆبەکوشتدان لە پێناوی ئایینی خودادا هەموو سەرکەوتنێک دەست مرۆڤ دەخات. دوژمنی خودانەناس هەرچەندێ بەهێز و گەورەبێ. بەرگەی لەشکری خوداناس و خاوەن بیروباوەڕی پاک ناگرێ، بام بچووکیش بێ.

(هۆشەنگ)یش گوتی: ماوەتەوە بڵێین (داوود) پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش بوو کە بەئاوازە ناوازەکەی سروودی ئایینی دەگوت کاری دەکردە دڵی گوێگران. خوداپەرستییەکی تەواوی دەکرد. خودا کردی بەخونکاری ئیسرائیلییەکان بۆ ئەمەی دادپەروەرانە لە جێی ئەو فەرمانداری بەسەریاندا بکات. زۆر شتیشی فێر کرد. داوود لەگەڵ ئەوەیشدا کە بوو بەخونکار، بەدەستی خۆی ئاسنگەری دەکرد زرێی دروست دەکرد و گەلێک شتی تر. (داوود) ژمارەی ژنەکانی گەیشتە (٩٩) ژن. خودا (سلێمان)ی پێ بەخشی. بەجوانی پەروەردەی کرد و پێی گەیاند. کە پیر بوو ئەوی کرد بەخونکاری نەوەی ئیسرائیل. چونکە هێز و هەڕەت و ژیری تێدا دی.

## سولەیمان و بەلقیس

شێرکۆ گوتی: (سولەیمان) پێغەمبەرێکی گەورە و بەدەسەڵات بووە. چونکە خاوەنی بەزەیی بووە و ژیر و دادپەروەر بووە، ئەو بڕیارانەی داونی دروست و پەسەندبوون. ئامۆژگاری و بەندەکانی (سولەیمانی ژیر) ئێستاکەیش باون و کاریان پێ دەکرێ. لەبەر ئەوەی خودا خۆشی ویستووە، هەرچییەکی لێ داواکردووە،

داویەتێ: چاوی لە گوناهەکانی پۆشیوە، بای خستۆتە ژێر چنگیەوە، جنۆکەکانی کردووە بەدەس و پێوەندی، زمانی پەلەوەر و گیانلەبەریشی فێر کردووە. سولەیمانیش سوپاسی خودای گەورەی کردووە و، زۆرتر لە جاران پەیڕەویی فەرموودەکانی کردووە و پەرستوویەتێ، تا هەتا سەر ئەو نیاز و جیازە گەورانەی بۆ بپارێزێ.

(شاهۆ)یش گوتی: ڕۆژێکیان (سولەیمان) بەخۆی و لەشکرە گەورەکەیەوە چووە دەرەوە. پەلەوەرەکانیش بەئاسمانەوە بەسەرسەریەوە دەڕۆیشتن سێبەریان بۆ دەکرد. کە گەیشتە (دۆڵە مێروولە = وادی النحل)، مێروولەیەک بەهاوڕێکانی خۆی گوت: «بچنەوە ناو کونەکانی خۆتان. نەوەک سولەیمان و لەشکرەکەی چاویان لێتان نەبێ بتانپلیشێننەوە». سولەیمان، کە قسەکانی مێروولەکەی گوێ لێ بوو پێکەنی و گوتی: «خودایە! ڕێم بدە سوپاسی ئەو نیاز و جیازانەت بکەم کە بەخۆم و باوک و دایکمت بەخشیون. هەروەها یارمەتییشم بدە ئەو کردەوە چاکانە بنوێنم کە دڵی تۆ پێیان خۆش دەبێ. لە ڕووی دڵنەرمیی خۆیشتەوە وەک بەندەیەکی کردەوە چاکی خۆتم دابنێ».

(فەرهاد)یش گوتی: هەر لەو کاتەدا کە لەشکرەکەی خۆی دەپشکنێ، تەماشای کرد (پەپوسلێمانەکە) دیار نییە، تووڕە بووە زۆری پێ نەچوو، پەپوسلێمانەکەکە پەیدا بوو. مـوژدەی دایە: کە لە خاکی (سەبەء)دا شاژنێکی جوانی دەوڵەمەندی دیوە، فەرمانداریبان بەسەرەوە دەکات، تەختێکی شاهانەی یەجگار گەورە و بەنرخی هەیە. کەچی ڕۆژ دەپەرستن». سولەیمانیش نامەیەکی پیا نارد بۆ ئەو شاژنە. پەپوسلێمانەکەکە لە کونی پەنجەرەوە چووە ناو ژووری نوستنی بەلقیسەوە. نامەکەی فڕێ دایە سەر سنگی. خەبەری کردەوە. بەلقیس لەم کارە سەری سوڕما. پاشەجار ڕاوێژی بەکاربەدەستان سەرلەشکرەکانی خۆی کرد. گوتی: خۆتان چی بەباش دەزانن پێم بڵێن. سولەیمانی خونکاری ئیسرائیلییەکان و پێغەمبەری خودا، بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبانەوە داوای لێ کردووین واز لە ئایینی (ڕۆژپەرستی) بهێنین و دەست بکەین بە(خوداپەرستی) کە ئایینی ئەوە». ئەوانیش گوتیان: «ئێمە بەچنگین. لەشکری زۆریشمان هەیە. دەتوانین بەرگریی لەشکرەکەی ئەو بکەین. لەگەڵ ئەمەیشدا فەرمانی خۆتە». شاژنیش گوتی: «ئەگەر هاتوو ئەو سەرکەوت بەسەرماندا، خاکمان بەتوورەکە دەبێژێ و ماڵمان کاول دەکات. لەبەر ئەوە شەڕ ناکەین، چەند پیاوێکی کاربەدەست بەدیارییەکی زۆرەوە دەنێرمە لای. بزانم چیم وەرام دەداتەوە.

(هۆشەنگ)یش گوتی: پەپووسلێمانەکەکە گەڕایەوە لای سولەیمان گوتی بەلقیسی شاژن دیارییەکی زۆری بۆ ڕەوانە کردوویت. کە پیاوەکانی بەلقیس هاتن و دیارییەکانیان پێشکەشی سولەیمان کرد لێی وەرنەگرتن، گوتی: «من پێویستم بەدیاری نییە، هەروەک خۆتان چاوتان پێ دەکەوێ خودا سەروسامانێکی زۆر و خاکێکی شۆخ و شەنگ و دەسەڵاتێکی زۆری داومەتێ. ئەوی من دەمەوێ ئەوەیە ئێوە واز لە ڕۆژپەرستن بهێنن و ئەو خودایە بپەرستن کە خۆتانی دروست کردووە و، ئەم هەموو بەخشندەییەی لەگەڵدا کردوون. هەر ئێستا بڕۆنەوە لای شاژنتان پێی بڵێن وا بەخۆم و لەشکرێکی واوە دێمە سەریان کە نەتوانن بەرگەی بگرن. بێجگە لەوەی خاکەکەیان داگیر دەکەم و دەریان دەپەڕێنم،

دەیشیان شکێنم». لە پاش ئەمەی کاربەدەستانی (سەبەء) گەڕانەوە لای بەلقیس و هەموو شتێکیان تێ گەیاند، بەلقیس بڕیاری دا خۆی بچێ سولەیمان ببینێ. بەلقیس لە پێشدا تەختەکەی خۆی لە ژوورێکی کلیل و کڵۆم کراودا شاردەوە و یاساوڵی لەم دیو دەرگاوە دانا بیپارێزن. ئینجا بەخۆی و کاربەدەست و کەڵەپیاوەکانی خاکی سەبەئەوە رووی کردە خاکی سولەیمان. بەڵام هەتا ئەو گەیشت سولەیمان بەهۆی خوداناسێکی پڕ باوەڕەوە (تەختەکەی بەڵقیسی) لە چاوترووکانێکدا گەیاندە کۆشکی خۆی. لە ڕاستیدا تەختەکەی بەلقیس زۆر جوان و بەنرخ بوو. لە زێڕ و یاقووتی سوور دروست کرابوو. سولەیمان هەندێ شتی لێ گۆڕی و خستیە ناو کۆشکێکی گەورەوە کە لە بلوور بۆیان دروست کردبوو. ئەوی بیدیایە وای دەزانی تەختەکە لەناو ئاودا دانراوە. کە بەلقیس هات، سولەیمان تێی گەیاند، پێویست ناکات داوێنی کراسەکەی هەڵبداتەوە، چونکە کۆشکەکە لە بلوور دروست کراوە. تەختەکەیش بەچاوترووکاندنێک لە سایەی خوداوە گەیێنراوەتە ئێرە. کە بەلقیس لەسەر تەختەکە دانیشت گوتی: «ڕاست دەکەیت ئەمە تەختەکەی منە، هەر بەمەیشدا دەزانم کە ڕۆژم دەپەرست. ئێستاکە وا باوەڕم بەو خودا گەورەیە هێنا کە تۆ دەتەوێ بیپەرستم». ئینجا ڕووی کردە خودا و گوتی: «خودایە پەشیمانم لەوەی کە زۆرداریم لە خۆم کرد و ڕۆژم پەرست. وا لەگەڵ سولەیماندا خۆم دایە دەست تۆ کە خودای پەروەردگاریت و بووم بەئیسلام».

## شاکارێک لە شاکارەکانی عیسا

(شێرکۆ) پرسی: کامتان دەتوانن شاکارێک لە شاکارەکانی عیسا بگێڕنەوە؟

(هۆشەنگ) گوتی: من دەتوانم. عیسا بەهۆی شاکارە نایابەکانییەوە کە لە بەردەمی جووەکاندا دەینواند، کەسانێکی زۆری نووساندبوو بەخۆیەوە. خودای گەورە دەسەڵاتی دابوویە: کوێر و شەل و گرویی چاک دەکردەوە. هەر نەخۆشێکیان ببردایە لای بەدەست پیاهێنانێکی ئەو بەسەر جێ نەخۆشییەکەیدا چاک دەبووەوە. گەلێک مردوویشی زیندوو کردەوە. ئارەزووی بکردایە بەچەند کولێرە و چەند ماسییەک هەزاران کەسی تێر دەکرد.

جارێکیان شاگردەکانی داوایان لێ کرد لە ئاسمانەوە نان و چێشتیان بۆ بهێتە خوارەوە، بۆی هێنان. بەرامبەر ئەم هەموو یارمەتییانەیش کە دەیدا بەو هەژار و داماو و لێ قەوماوانە، یاخود بەو دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندانە هیچ شتێکی وەرنەدەگرت، بەخۆڕایی بۆی دەکردن، لە ڕێی خودادا دەیکرد، تا جووەکان باوەڕ بەپێغەمبەرێتییەکەی بکەن و، پەیڕەویی بکەن لە ئایینە تازەکەیدا. لەبەرئەوە دەچووە هەر جێگەیەک بەهەزاران لێی کۆ دەبوونەوە. بەهەزارانیش دەهاتنە سەر ئایینی مەسیحی. پیاوە ئایینییەکانی جووەکان و، دەوڵەمەندەکان و دەسەڵاتدارەکانیان خاوەن زەوییەکانیان، لە عیسا ترسیان لێ نیشت. دەترسان لەوەی بەهۆی ئامۆژکارییەکانی ئەوەوە سامان و دەسەڵاتەکانیان کز بێ یاخود لە دەست بچن. لەبەر ئەوە هەموویان لەژێرەوە گەلەکۆمەکێیان لە عیسا دەکرد، داوی بۆ بنێنەوە تێی بکەوێ. بەڵکو بەهۆی فەرمانداره ڕۆماییەکانی ئەوساوە، کە فەلەستین لەژێر چنگیاندا بوو بەکوشتنی بدەن؛ بێ ئەمەی لەو کوشتنە، پەیڕەوە بێ شومارەکانی عیسا، بووروژێن و تۆڵەیان لێ بکەنەوە.

رۆژێکیان عیسا لە پەیکەرگاه (هیکل)ەکەی شاری قودسدا خەریک بوو پەند و ئامۆژگارییەکانی ئایینی مەسیحیی فێری ئەو کەسانە دەکرد کە لەوێدا کۆ بووبوونەوە. لە پڕ چەند کەسێک هاتنە بەردەمی ئافرەتێکیان راپێچ کردبوو لەگەڵ خۆیاندا.

پێیان گوت: «کە هاتین بەسەر ئەو ژنەدا: داوێن پیسیی دەکرد. ئایینی مووسایش دەڵێ: بەردبارانی بکەن. ئەی تۆ چی دەفەرموویت؟!». فروفێڵبازەکانی جووەکان ئەم داوەیان بۆ عیسا نابووەوە، تووشی کوشتنی بکەن. چونکە بەپێی تەوراتی مووسا ئەگەر عیسا بیگوتایە: بەردبارانی مەکەن، دەبوو خۆی بکوژرایە! چونکە پێچەوانەی تەورات دەجووڵایەوە!... عیسایش کە چاوێکی بەو چەند کەسەدا خشاند کە ئافرەتەکەیان راپێچ کردبوو، دانەوییەوە سەر زەوی و بەپەنجە دەستی کرد بەنووسین لەسەر خۆڵەکە. ئینجا پێی گوتن: «هەر کامێکتان گوناهی نەکردووە، بام بەردێکی تێ بگرێ!». پاشان دانەوییەوە دەستی کردەوە بەنووسین لەسەر گڵەکە!... هەر کامێکیان دەهاتە پێشەوە و خۆی ئامادە دەکرد فەرماندەکەی تەورات جێبەجێ بکات، سەیری ئەوەی دەکرد کە مەسیح لەسەر زەوییەکە بۆی نووسیوە، کە دەیدەی گوناهەکانی خۆی لەسەر خۆڵەکە نووسراوە و دەیخوێندەوە، دەگەڕایە پاشەوە و، سەری دادەخست و لەبەرد بارانکردن وازی دەهێنا! بەم ڕەنگە هەر کەسێ لەوێدا بوو بەپیر و جوانەوە یەک لە دوایی یەک کشانە دواوە. بێ ئەمەی یەکێکیان بتوانێ بەردێک لەو ئافرەتە بگرێ. ئینجا کە مەسیح لە ژماردنی گوناهەکانی ئەو کەسانە بووەوە، سەری هەڵبڕی، کە تەماشای کرد کەس لەوێ نەماوەتەوە، ئافرەتە داوێن پیسەکە نەبێ!... ئەویش بەچاوێکی ڕێز و خۆشەویستی و بەزەیی پێداهاتنەوە سەیرێکی ئافرەتەکەی کرد و بەڕوویەوە پێکەنی، لێی پرسی: «کوان ئەوانەی دەیانویست بەردبارانت بکەن؟ ئاخۆ کەسیان بەردیان پێدامالیت؟».

ئافرەتەکەیش گوتی: «نەء گەورەم کەس بەردی پێدانە مالیم!».

مەسیحیش گوتی: «دەبڕۆ منیش بەردت پێدانامالم. بەڵام نەکەیت جارێکی تر گوناهی وا بکەیتەوە!». ئافرەتەکەیش لە خۆشیدا گەشکەدار بووبوو. گەڕایەوە مالی خۆی. قسە جوانەکانی مەسیح و کردەوە شیرینەکانی کاریان لە دلی کردبوو. وازی لە داوێن پیسی هێنا.

## شاکارێکی محەممەد (د.خ)

(فەرهاد) گوتی: (ئەبو سوفیان) کە سەرۆکی (قوڕەیش) بوو لە (مەککە)دا، دوژمنی هەرە گەورە (محەممەد)ی پێغەمبەر بوو. هیچ فروفێلێک و هیچ خراپەیەک نەما لێی نەکات. تەنانەت داوی بۆ نایەوە بیکوژێ. تا ناچار بوو بەخۆی و موسولمانەکانی هاوئایینییەوە کۆچ بکات بۆ شاری (مەدینە). تەنانەت کە لەوێیشدا بوو، (ئەبو سوفیان) وازی لێ نەهێنا، گەلێک ئاژاوەی بۆ (محەممەد) نایەوە. گەلێک جاریش کەوتە جەنگەوە لەگەڵ محەممەد و موسولمانەکاندا. بەڵام خودا پێغەمبەری خۆی خۆش دەویست: لە زۆربەی جەنگەکاندا ڕێی پێشانی محەممەد دا و، بەهێزی فریشتەکانی خۆیەوە یارمەتی دا، تا هێزی دوژمنی ئیسلامەتی کەوتە کزی و دواجار (محەممەد) گەڕایەوە شارەکەی خۆی و (مەککە)ی

گرت. جا لەپێش ئەمەی بگاتە (مەککە)، (ئەبو سوفیان)ی دوژمنە گەورەی پێغەمبەر ترسێکی تەواوی لێ نیشتبوو، لە سەرکەوتنەکانی محەممەد. دەترسا لەوەی هێز و دەسەڵات و سامانی نارەوای لەدەست بچێ. لەوەیشدا مافی هەبوو بترسێ، چونکە ئیسلامەتی دژی زۆرداری و بەدکرداری و چەوساندنەوەی هەژاران و بێ دەسەڵاتان بوو، کە ئەو دەیکرد. هەروەها دژی ئەو سامانە بوو کە بەنارەوایی کۆی دەکردەوە. لەبەرئەوە یەجگار شپرزە بووبوو، یەکجار دامابوو. نەیدەزانی چۆن لەو تەنگ و چەڵەمەیە سەر دەربکات.

(هۆشەنگ)یش گوتی: لەو کاتەدا (ئەبو سوفیان) لە نزیکبوونەوەی لەشکری ئیسلام دا بەشاری (مەککە)، گەیشت بە(ئەلعەباس)ی مامی پێغەمبەر، لێی پاڕایەوە داڵاڵای بدات. ئەویش بەڵێنی دایە پشتی بگرێ و بیپارێزێ. یەکسەر لەگەڵ خۆیدا بردیە لای (محەممەد) پێغەمبەر. هەر ئەوەندە (عومەری خەتتاب) چاوی بە(ئەبو سوفیان) کەوت، ڕاپەڕی و بەمحەممەدی گوت: «ئەی پێغەمبەری خودا. ئەمە ئەبو سوفیانە. بێ ئەمەی لەگەڵیدا ڕێککەوتبێن و گفت و پەیمانی بدەینێ خۆی بدات بەدەستەوە، خودا خستوێتییە ژێر چنگمان. ڕێم بدە بام ئەم دوژمنی خودایە کەللەی بپەڕێنم!».

(ئەلعەباس)یش گوتی: «ئەی ڕاسپێرراوی خودا، من پەنام داوە!...». پێغەمبەریش فەرمووی بیهێڵنەوە بۆ بەیانی. ئەوە پێغەمبەر پێی گوت: «ئیسلام ببە». (ئەبو سوفیان)یش گوتی: «لە جێی دایک و باوکم! تۆ زۆر ڕەوشت شیرین و دڵنەرمیت. من ئەوە باش دەزانم کە خودا لە هەموو کەس گەورەتر و لەویش بەولاوە کەسی تر لە ئارادا نییە.

(محەممەد)یش گوتی: «خودا نەتگرێ ئەبو سوفیان. هێشتا نەگەیشتوویتە ئەوەی کە بزانیت منیش ڕاسپێرراوی خودام؟!».

(ئەبو سوفیان)یش گوتی: ئەی لەجێی دایک و باوکم چەند دڵ فراوانیت، چەند میهرەبانیت، چەند خزم دۆستیت. بەڵام بەخودا سوێندت بۆ دەخۆم هێشتا لێی دڵنیانیم!...»... کەچی (محەممەد)ی زرنگ و دڵ چاک و ڕەوشت بڵند لەم وەرامە تووڕە نەبوو!.

(شاهۆ)یش گوتی: بەڵام (ئەلعەباس) وازی لە ئەبو سوفیان نەهێنا تا ئیسلام بوو. لە بەرامبەر ئەوەدا (ئەبو سوفیان) وای پێ خۆش بوو، پێغەمبەریش چاو لە کەسوکارەکانی ئەو بپۆشێ، بۆ ئەمەی لەبەردەم قورەیشدا بەو چاوپۆشینەوە بنازێ. (محەممەد)یش مەردانە و زرنگانە هاتە دەست، لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە شەڕەکانیدا سەرکەوتبوو و، دەیتوانی هەموو شتێکیان لێ بکات، ئەوپەڕی پیاوەتی لەگەڵدا کردن. گوتی: «بام لە دانیشتوانی شاری مەککەوە ئاشکرا بێت، کە خۆیان لە قورەیشن: هەر کەسێ چووە ماڵی (ئەبو سوفیان)ەوە دەستی لێ ناوەشێنرێ. هەر کەسێ دەرگای ماڵی خۆی داخست هیچی لێ ناکرێ. هەر کەسێکیش چووە ناو مزگەوتی کەعبەوە کەس دەستی بۆ نابات!». کە (محەممەد) چووە ناو (کەعبە)یشەوە دانیشتوانی شاری مەککەی کۆکردەوە و پێی گوتن: «گەلی قورەیش! بەلای ئێوەوە وایە، چیتان لێ دەکەم؟!». گوتیان: «چاکە. تۆ برایەکی ڕەوشت بڵندیت و کوڕی برایەکی ڕەوشت بەرزیشیت!». (محەممەد)یش گوتی: «کەواتە بڕۆنەوە ماڵی خۆتان، هیچتان لێ ناکەم»...

(شێرکۆ)یش گوتی: ئاوا دەبێ پیاوی مەرد. قورەیش ئەم هەموو خراپانەیان لەگەڵ کردبوو. کەچی (محەممەد) چاوی لێ پۆشین!. لە ڕاستیدا ئەم ڕەوشتە دادپەروەرانە و چاکەخوازیی (محەممەد) نواندی بوو بەهۆی ئەوەی پۆل پۆل قورەیشییەکان هاتن و لەسەر دەستی ئەودا بوون بە(ئیسلام).

## لاپەڕەیەکی پرشنگدار لە مێژووی سەلاحەدیندا

(شێرکۆ) گوتی: (سەلاحەدینی ئەیوبی)، لەژێر ئالای ئیسلامەتیدا هەموو ئیسلامەکانی یەکخستبوو، سنووری شاهێتییەکەی هەر لە ڕووباری (دجلە)وە دەیگرتەوە تا (تەرابلوسی ڕۆژئاوا)، هەر لە کوردستانی گەورەیشەوە هەتا خاکی (نۆبە). (لیبیا، میسر، سودان، یەمەن، حیجاز، ئەردەن، فەلەستین، لوبنان، سوورییە، بەشێکی زۆر لە عیراق، بەشی هەرە زۆری کوردستانی گەورە...» کەوتبووە ژێر چنگیەوە. هەر تەنیا شاری (قودس)ی مابوو بیگرێ، لەشکری بۆ ئەویش برد. هەرچەندە خەریک بوو لەگەڵ مەسیحییە خاچەکاندا، بێ شەڕ بیگرێ. کە مەسیحییەکان زانییان ئالاکانی سەلاحەدین بەسەر شوورەی قەڵاکەیانەوە دەشەکێتەوە، ناچاربوون، شارەکەیان لەسەر چەند مەرجێک دابەدەستەوە. مەرجەکانی سەلاحەدین پیاوانە و خوداناسانە بوون. شێوەی کوردێکی مەرد و ئیسلامێکی نەبەردی پێوە بوو. کە مەرجەکان جێبەجێ کران. مەسیحییە هەژار و داماو و لێ قەوماوەکانی کردە سوپاسگوزاری خۆی. نەک هەر ئەوان مەسیحییەکانی تریش و ئیسلامەکانیشی هێنایە سەرسوڕمان. (سەلاحەدینی ئەیوبی) بەم کردەوەیە لاپەڕەیەکی شەنگ و شۆخ و پرشنگداری بۆ خۆی و نەتەوەکەی و ئیسلامەتی لە مێژووی جیهاندا نووسییەوە.

(هۆشەنگ)یش گوتی:

مەرجەکانی (سەلاحەدین) ئەمانە بوون:

١- لە ماوەی چل ڕۆژدا هەر مەسیحییەکی خاچ باجیدا دەتوانێت لە شاری قودس بچێتە دەرەوە. ئەگەر نەیتوانی بچێتە دەرەوە دەکرێت بە(بەندە).

٢- باجی گەردن ئازادی لە پیاو (١٠) دینار، لە ژن (٥) دینار، لە منداڵ (٢) دینار دەستێنرێت.

٣- لەم باجەدا دەوڵەمەند و هەژار وەک یەک لێی دەستێنرێ. گاورەکان بیانکەن بەدیل و بیانفرۆشن و ڕیسوایان بکەن. چونکە خۆیان دەترسان سەربازە ئیسلامەکان بیانکوژن و بیانبڕن و تالانیان بکەن و وایان کرد بوو لە ساڵی (١٠٩٩)دا، لە موسڵمانەکان، کە شاری (قودس)یان لێ داگیر کردبوون. بەڵێ گاورەکان ترس و لەرز و خەم و خەفەت دڵی داگیر کردبوون، لە تاواندا دەگریان. ئەو کاتەی خۆیان و شارەکەیان دابەدەستەوە ساڵی (١١٨٧) بوو. (سەلاحەدین) کارێکی وای کرد، هیچ موسڵمانێک نەیتوانی ئازاری گاورێک بدات، یاخود زیانی پێ بگەیێنێت لە شاری قودسدا. (سەلاحەدین) لەژێر خێوەتەکەیدا دانیشتبوو سەیری کۆچ کردنی گاورەکانی دەکرد. کە دی هەندێک لە فەرەنگەکان باوک و دایکە پەککەوتەکانی خۆیان بەکۆڵ هەڵگرتووە، یان خزمە نەخۆشەکانیان بەسەر شانەوەیە، بەزەیی پیایاندا هاتەوە. فەرمووی: پارەیان دەنێ. بارگیریشیان بەسەردا دابەش کردن، بۆ

ئەمەی بارەکانیان بۆ ببەنە ئەو جێگایانەی کە دەیانەوێ بۆیان بچن. لە پاش تەواوبوونی چل ڕۆژەکە بەهەزاران هەزار مابوونەوە، نە(پەتریارکی گەورە) بەهەموو گەنجینەکانی کڵێسا و کەلوپەلە زێڕینەکانیەوە، نە هاونیشتمانە گاورە دەوڵەمەندەکان، هیچیان بەزەییان پیایاندا نەهاتبووەوە باجیان بۆ بدەن و ئازادیان بکەن لە بەندەیی، هەروا هێشتوویانەوە.

(فەرهاد)یش گوتی: (ئەلعادیل)ی برای سەلاحەدین، تکای لە کاکی کرد هەزار کەسی لەو هەژارانە لە باج دان بەخشی. لەبەر دڵی (پەتریارک) و (باڵیان)ی سەرکردەی گاورەکانیش هەزار کەسی تری لێ بەخشین. خۆیشی فەرمانی دا هەر پیرێک مابووەوە و نەیتوانیبوو باج بدات لە باجدان چاویان لێ پۆشراو ئازاد کران. ژمارەیەکی زۆر لەو ئافرەتانەی باجیان دابوو و، چووبوونە دەرەوە، هاتنەوە سەر (سەلاحەدین)، لێی پارانەوە، گوتیان: «ئێمە یان ژنین یان دایکین یان کچین. هی ئەوانەین کە بەدیل گیراون، یاخود لە شەڕدا کوژراون. ئێستاکەیش نە دەرەتانمان هەیە، نە باوان، نە کەس، روویان تێ بکەین». ئینجا دەستیان کرد بەگریان. (سەلاحەدین)یش کە چاوی بەوانە کەوت دەگرین، دڵی پێیان سووتا، خۆی پێ نەگیرا، خۆیشی گریا. فەرمانی دا پیاوەکانیان لە بەندیخانە دەرهێنان، بەرەڵڵای کردن، بەخشینی بەو ئافرەتانە. بەڵام ئەوانەی کەسیان نەمابوو، پارەیەکی زۆری پێ بەخشین و تۆڵەی بۆ کردنەوە. ئەوانیش بۆ هەر کوێیەک دەچوون پیاوەتی و کردەوە بڵندیی (سەلاحەدین)یان دەگێڕایەوە!...
بێجگە لەوە: سەلاحەدین ژنی شاهێکی ڕوومی لە شاری قودسدا دڵنیا کرد کە دەتوانێ بەخۆی و دەس و پێوەند و سامانیەوە بمێنێتەوە لە شاری قودسدا خوداپەرستیی خۆی بکات. هەروەها ژنی خونکاری قودسی بەرەڵڵاکرد بەخۆی و دەس و پێوەند و هاودەمەکانیەوە بچێتە لای مێردەکەی، (جۆی)، کە لە کەلاتی (نابلس)دا، لە بەندیخانەدا بوو. دوای ئەوە خونکار (جۆی) مێردیشی بەرەڵڵا کرد. تەنانەت (ڕیجناڵد)یش کە سەرکردەیەکی خراپی گاورەکان بوو و، سەلاحەدین لە سەرکەوتنەکانی و کردەوە زۆردارانەکانی بەدەستی خۆی کوشتبووی لە شەڕی (حەتتین)دا، ژنەکەی بەرەڵڵا کرد و سامانەکانیشی بۆ پاراست. ئەمە لەلایەکەوە و کەچی لەلایەکی تریشەوە: گاورەکانی (ئەنتاکیە) نەیان هێشتبوو گاورە هەژارەکان کە سەلاحەدین بەرەڵڵای کردبوون، بێنە شارەکەیانەوە. گاورەکانی (تەرابلوس)یش هەر بەدەرکردنی ئەو گاورانە وازیان نەهێنابوو: ڕووتیشیان کردبوونەوە!!...

## لاپەڕەیەکی پرشنگدار لە مێژووی کەریم خانی زەندا

(شێرکۆ) گوتی: کەریم خانی زەند لە ساڵی ١٧٧٩دا گیانی پاکی بەخاک سپارد. بەڵام (٢٨) ساڵی خشت فەرمانداریکی سەربەخۆ بوو بەسەر هەموو خاکی ئێران و بەشێکی گەورەی کوردستانی گەورە و بەشێکی عێراقەوە. وەک مێژوو دەیگێڕێتەوە لە هەموو خاکی ئێراندا دوانی وەک (کەریم خانی زەند)ی تێدا نییە وا دادپەروەر و خوداناس و نیشتمانپەروەر و گەلپەروەر بووبێ... کە (کەریم خانی زەند) مرد هەموو ئەو کەسانەی لەژێر چنگیدا بوون خەفەتیان بۆ خوارد، بۆی گریان، چونکە وایان زانی باوکێکی بەخشندە و میهرەبان و خۆشەویستیان لە دەست چووە.

(فەرهاد)یش گوتی: لە سەردەمی (کەریم خانی زەند)دا نەتەوەکانی ئێران بەکورد و عەرەب و فارس و تورک و بلووج و ئازەرییەکانەوە، لەوپەڕی شادمانی و خۆشگوزەرانیدا ڕایان دەبوارد. چونکە (کەریم خانی زەند) ماوەی بەکەس نەدەدا زۆرداری لە کەس بکات. ئاسایش و ئارامیشی بەرهەم هێنابوو. باجی سەر جووتیارەکانی تەواو سووک کردبوو. ڕێگای بۆ هاتوچۆ و گەشتوگوزار و بازرگانی تەخت و ئاسان کردبوو. گەشەی بەخوێندەواری و کشتوکاڵ و ئاوەدانی و دەستکرد و پیشەسازیدا بوو. بایەخێکی زۆریشی بەدادپەروەری و چاکەخوازی دەدا. دەستی هەژار و داماو و لێ قەوماوانی دەگرت. بەکورتی سەری (نەتەوەی کورد) و ئیسلامەتی بڵند کردبووەوە.

(هۆشەنگ)یش گوتی: (کەریم خانی زەند) بەو هەموو ئازایەتی و کردەوە جوانانەوە کە هەیبووە، بریتی بووە لە کوڕە کوێخایەکی نەخوێندەوار، کە باوکی هەموو دەم لە یاخی بووندا بووە. کەچی ئەو وا دەرچووە. خۆی لە کوردە (زەند)ەکان بوو کە تیرەیەکن لە هۆزی (لەک). (لەک)یش دەچنەوە سەر هۆزە گەورەکەی (بەختیاری).

(شێرکۆ) پرسی: باشە چۆن (کەریم خانی زەند) گەیشتە تەختی شاهەنشاهی؟

(شاهۆ)یش گوتی: (نادر شاهی هەوشار) شاهێکی یەجگار زۆردار و خوێنڕێژ و خۆپەرست بوو. نەتەوەکانی ناو خاکی ئێران لە سەردەمی ئەودا ژیانێکی پڕ ئاواز و هاواریان بەسەر دەبرد. دوایی لەلایان یاساوڵەکانی خۆیەوە کە (کورد) بوون بەهاندانی سەرەک هۆزەکەیان (نادر شاه) لەناو خێوەتەکەی خۆیدا بەخەنجەر لەتوپەت کرا. دوای مردنی ئەو خاکی ئێران کەوتە ئاژاوە و شەڕ و شۆڕشێکی یەجگار ناخۆشەوە. نە ئاسایش ما، نە ئارام، تا دەهات نەتەوە سەرگەردانتر وماڵوێرانتر دەبوو. هەر سەرکردە لەشکرێک، یاخود هەر سەرەک هۆزێک لایەکی ئێرانی داگیر کردبوو، بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆی شەڕی دەکرد و ئاژاوەی دەنایەوە و، نەتەوەکەی خۆی دەچەوساندەوە. (کەریم خانی زەند)یش کە ئەوساکە لە هەڕەتی تێگەیشتوویی و پێگەیشتوویی و نیشتمانپەروەری و خوداناسیدا بوو، ئازار بەدڵی گەیشتبوو کە نەتەوەکانی ئێرانی بەو جۆرە سەرگەردان دەهاتە پێش چاو، بەدەست ئەو زۆردار و ناپاکانەوە. یەک لەدوای یەک هەڵمەتی بردە سەریان. هەشت ساڵی خشت کەوتە جەنگیان تا خاکی کوردستانی گەورە و ئێرانی لێ پاککردنەوە. ئینجا فەرمانڕەواییەکی هۆشمەندی پڕ خوداناسی و دادپەروەری و مرۆڤدۆستی و پێشکەوتن خوازی تێدا دامەزراند، کە نەک هەر نەتەوەکانی ئێران بەڵکو نەتەوە بێگانەکانیش خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێ دەگرت.

(شێرکۆ) پرسی: کامتان سەرگوزەشتەیەکی (کەریم خانی زەند)مان بۆ دەگێڕنەوە؟

(هۆشەنگ)یش گوتی: من. (کەریم خانی زەند) ڕەوشتی وا بوو هەر ڕۆژە چەند کاتێکی تەرخان دەکرد بۆ پرسینی سکاڵای گەل و چارەکردنیان. ڕۆژێکیان بەماندوێتییەوە لە (دەزگای دادپەروەری) دەگەڕێتەوە ماڵەوە. لەو کاتەدا کابرایەکی ڕەنگ زەرد و پەشۆکاو هاواری بۆ دەهێنێ، دەڵێ: «شاهم دادا». من بازرگانێکم هەژار و بێ دەسەلات، هەرچییەکم هەبوو دز بردی. (کەریم خان) دەڵێ: «بۆ چ نوستییت، هێشتت بیدزن؟». گوتی: «وام زانی تۆ هۆشیاریت!». کەریم خان نەک هەر بەوەرامی کابرا

تووڕه نەبوو، فەرمانیشی دا هەرچییەکی لێ دزرابوو بیدەنەوە. هەولیش بدەن ئەوەی لێی دزراوە بۆی بدۆزنەوە! بەکورتی ژیانی (کەریم خانی زەند) لاپەڕەیەکی پرشنگدارە لە مێژووی کورد و ئیسلامەتیدا.

## یەکەم مامۆستامان خودایە

(شێرکۆ) گوتی: ئێمە کە (قورئانی پیرۆز) دەخوێنینەوە، تێ دەگەین، (خودای مەزن) هەر لە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤەوە، کە (ئادەم)ی باپیرە گەورەمانی دروست کردووە، تا دەگاتە (محەممەد)ی پێغەمبەر، ورده ورده هەموو زانیارییەک و، هەموو دەستوورێکی ژیان و، هەموو بیروباوەڕێکی فێری مرۆڤ کردووە. هەروەها بەو شێوە سەرسوڕهێنەرانەی کە هەر خۆی زانیویەتی، مرۆڤی پەروەردە کردووە. تا ئەم (ئایینی ئیسلام)ەی لە سەردەمی (محەممەد) پێغەمبەردا تەواو کردووە؛ کە دەتوانین بڵێین بۆ کامەرانی و سەربەرزی و خۆشگوزەرانیی مرۆڤ هیچی نەهێشتۆتەوە لێی نەدوابێ.

خودا لە قورئانی (پیرۆز)دا دەفەرمووێ: «وعلمنا آدم الاسماء». واتا «ئادەمان فێری ناوەکان کرد». ئەم فەرموودەیەیش وا دەگرێتەوە کە خودا هێزی تێ گەیشتنی بەمرۆڤ بەخشیوە تا لە ڕازەکانی سروشت و کارەکانی تری خودا تێ بگات، بۆ ئەمەی بەهۆی ئەو زانیارییانەوە کە دەستی دەکەون، بتوانێ ژینی خۆی بەرێوپێکی و ئاسانییەوە بەرێوە ببات و، گەشەیش بەو ژینەی بدات.

(هۆشەنگ)یش گوتی: ڕاست دەفەرموویت وایە. بۆ وێنە (خودا) ویستوویەتی فێری (گەل) پەروەرمان بکات. تەماشا دەکەیت بەهەموو پێغەمبەرێکی گوتووە بچۆوە کن گەلەکەت پێیان بڵێ وابکەن و، بۆ ئەمەی بێنە سەر ڕێگای خوداناسی و ژیانێکی خوداناسانە بەسەر ببەن، تا سەرکەوتن و بەرکەوون و پێشکەوون لە ژیانیاندا. یاخود فێری خەباتمان دەکات لە پێناوی دادپەروەریدا. خودا بەمووسا دەفەرمویێ «اذهب الی فرعون انه طغی». واتا: «بچۆرە لای فیرعەون لە خودا هەڵگەڕاوەتەوە و زۆرداری دەکات»، ئەویش بۆ ئەمەی نەوەی ئیسرائیل بەرەڵلا بکات و بچنەوە ناو نیشتمانی خۆیان و، لە زۆروستەمی فیرعەونیش ڕزگاریان بێ.

یان فێری خزمایەتی و، دۆستایەتی و، کردەوەی جوانمان دەکات لەگەڵ کڕیار و فرۆشیاردا لەگەڵ دراوسێ و بێگانەدا، لەگەڵ خێزاندا، لەگەڵ گەورە و سەرۆک و ژێردەستاندا.

(فەرهاد)یش گوتی: بێجگە لەوە هەرچی خودا داوامان لێ دەکات بیکەین یان نەیکەین، ئەگەر بەقسەی بکەین بۆ خۆمان باشە، هەرگیز زیانمان پێ ناگات. بۆ وێنە: فەرمان دەدات: دزی و درۆزنی و کوشتن و برین و چەواشەکاری و ناپاکی و خوێڕێتی نەکەین. ڕاستگۆبین و دڵسۆزبین و کاردروست و دادپەروەر و نیشتمانپەروەر و مرۆڤدۆست بین. جا ئەگەر فەرموودەکانی ئەو بەجێ بهێنین جیهانمان لێ دەبێت بەبەهەشت. ئەگەر فەرموودەکانی ئەویش بەجێ نەهێنین ژیانمان لێ دەبێتە دۆزەخ.

(شێرکۆ) گوتی: ئێمە کە دێینە سەر (مافی ئافرەت). خودا بایەخێکی زۆری پێ داوە. تێکڕا، لە یەک دوو جێگادا نەبێ، کە ئەویش کەڵکی ئافرەت، خۆی، تێدایە، ئیتر لە هەموو شتێکدا خودا ئافرەتی وەک پیاو (ماف) داوەتێ. بێجگە لەوە ئافرەت لە پێش (محەممەد) پێغەمبەردا، پایەی زۆری نزم بووبووەوە

لەناو کۆمەڵایەتیدا، بەهۆی (ئایینی ئیسلام)ەوە پلەی کۆمەڵایەتیی وەک پیاوی لێ هات زۆر بەرزبووەوە. (محەمەد) کە خودا سەرپەرشتیی دەکرد، ڕێزێکی زۆری لە ئافرەت دەگرت، دەیپاراستن لە زۆرداران، یارمەتیی دەدان لە کاتی تەنگانەیاندا. تەنانەت لە پاش مردنی (خەدیجە)ی ژنیشی بەساڵان، هەر چاکەی ئەوی دەگێڕایەوە و، ستایشی دەکرد و، لە خودایش دەپاڕایەوە کە بیخاتە بەهەشتەوە.

(فەرهاد)یش گوتی: لە قورئاندا خودا بایەخێکی زۆری داوە بەهەژاران و لێ قەوماوان و داماون، بەنەخۆشان و، بەپیران و، بەمنداڵان و، بەندە و دیل و سەرگەردانان. هانەی موسڵمانەکان دەدات خەمیان بخۆن، یارمەتییان بدەن، دەستگیرۆییان بکەن، تا دیمەنی ئازار و هاوار نەمێنێ لەناو کۆمەڵایەتییاندا. بەم ڕەنگە (ئایینی پاکی ئیسلام) لە هەموو پەیوەندییەکی ناوەند مرۆڤ خۆی و، ناوەند مرۆڤ و گیانلەبەران و ڕووەک و هەموو شتێکی تری کۆڵیوەتەوە و چارەی بۆ دۆزیوەتەوە و، ڕێیشی پێشان داوین چۆن بەخۆشی و سەربەرزییەوە بژین.

## ئیسلامەتی هەر بەقسە پێک نایەت، نیازی پاک و کردەوەی بڵندیشی دەوێت

(شێرکۆ) گوتی: ئایینی ئیسلام هەر بەوە وازناهێنێت کە تۆ بڵێی ئیسلامم. دەبێ بەدڵیش خۆت بەئیسلام بزانیت و، باوەڕت بەخودا و بەپێغەمبەرانی خودا و، بەفریشتەکانی خودا و، بەنووسراوانی خودا و، بەڕۆژی زیندووکردنەوەی مرۆڤ و چەندوچوون کردنی خودا لەگەڵیاندا هەبێ. دەبێ باوەڕت بەهەموو فەرمووده و فەرمان و دەستوور و ئامۆژگارییەکی خودا هەبێ. دەبێ هەر بڕیارێکیش خودا بیدات بەچاکی بزانیت و ملی بۆ کەچ بکەیت. دەبێ هەرچی خودا فەرموویەتی بیکەیت، وەک: نوێژ و، ڕۆژوو و، (زەکات) واتا سامان پاککردنەوە و، ڕاستی و دادپەروەری، بیکەیت. دەبێ هەرچییش خودا فەرموویەتی نەیکەیت، وەک: بەدگۆیی و، دووڕوویی و، دزی و درۆزنی و گزی و فزی و داوێن پیسی و کوشتن، نەیکەیت. بەکورتی دەبێ موسڵمانان لە دەست و زمانت بێ وەی بن و، بەکەڵک و چاکەیشت شادمان بن. بەکورتی تر: موسڵمانی ڕاستەقینە لە کردەوە و ڕەفتاردا وەک فریشتەی لێ دێ. واتا دەبێتە مرۆڤی ڕاستەقینە. وەک پێغەمبەرێکی لێ دێ: خۆی دەداتە دەست خودا. خودا هەرچییەکی لێ بکات پێی خۆشە.

(هۆشەنگ)یش گوتی: پیاوێکی دەوڵەمەندی بازرگان لە شاری سلێمانی دا ناوی (کەریمی ئەلەکە) دەبێ. ڕۆژێک ئێوارە دێتەوە ماڵەوە، کە تەماشا دەکات ئاوی پلاو لە ماڵەکەیانەوە بەجۆگەلەیەکدا هاتۆتە ناو کۆڵانەوە. هەندێک هەژار و لێ قەوماو لەو ئاوە دەخۆنەوە تا ئاهی سکیان پێی بشکێ. ئەمە لە گرانییەکەی ساڵی ١٩١٤دا ڕوودەدات، کە سولەیانیش نەبوونیی خۆرشت و گرانی لە سەرەتای جەنگی جیهانیدا شپرزەی کردبوو. (کەریمی ئەلەکە) سوێند دەخوات هەتا گرانییەکە دەبڕێتەوە ئەویش وەکو هەژار بخوات. بەخێزانەکەی دەڵێت: «پێویستە لەمەولا هەموو ڕۆژێک لە مەنجەڵێکی گەورەی ساوەر لێ ناندا شۆربا لێ بنێن بۆ هەژاران و لەگەڵ کولێرەدا بەسەریاندا بیانبەشنەوە». وەک دەگێڕنەوە (کەریمی ئەلەکە)ی خوداناس و گەلپەروەر و نیشتمانپەروەر قسەکەی خۆی بردە سەر. نەک هەر هەژارە

گاورەکانی گەڕەکی خۆیان زۆربەی هەژارە ئیسلامەکانیش لەو خوداناسییەی ئەو کەڵکیان وەرگرت. (کەریمی ئەلەکە) خۆی مەسیحی بوو، بەم کردەوە ئەژادەی ئەوەی چەسپاندە دڵی هەمووانەوە کە (مەسیحێتی) و (ئیسلامەتی) هەردووکیان یەک ئامانجیان هەیە ئەویش دڵخۆش کردن و پەرستنی خودایە. (کەریمی ئەلەکە) بەم کردەوە بڵندی سەری کوردەواریی بڵند کردەوە. خودا لە تۆڵەی ئەوەدا لە سەردەمی فەرمانداریی (شێخ مەحمودی گەورە)دا کردی بەکاربەدەستێکی گەورە، کاروباری دارایی کوردستانیان دابووە دەست. نەتەوەی کورد هەتا ئێستاکەیش بەچاکییەوە ناوی دەبەن. تەنانەت بەئیسلامیشی دادەنێن.

(فەرهاد)یش گوتی: وەک بۆیان گێڕاومەتەوە (سەید محەمەدی جەباری)یش هەر لەو گرانییەدا، چارەسەری هەژاریی ناو چل گوندی هۆزەکەی خۆی کە (جەباری) بوو لە ناوچەی (قادرکەرەم)دا کرد. ئەویش سەری نەتەوەی کوردی بەرز کردەوە و ئیسلامەتیی خۆی نوواند.

(سەید ئەحمەدی خانەقا)یش کە لە شاری (کەرکووک)دا دادەنیشت دەرگای خانەقاکەی خۆیانی کردبووەوە بۆ هەژاران و رێبواران هەموو رۆژێک نانی دەدانێ. هەر کەسێکیش کارێکی بکەوتایە میرییەوە بۆی ڕاهی دەکرد، بێ ئەمەی مز یاخود دیاری لە کەسێکیان وەربگرێ. ئەویش نموونەی کوردی ڕاستەقینە و موسڵمانی ڕاستەقینە بوو.

(حەمە ئاغای کۆیە)یش هەر بەو چەشنە لە گرانییەکەدا دەستگیرۆیی هەژاران و لێ قەوماوانی دەکرد. سەری نەتەوەی کورد و موسڵمانانی بەرز کردەوە.

(حەپسەخانی نەقیبیش) خۆی کردبووە پشتیوانی هەژاران و داماوان و لێ قەوماوان، هەموو سامانەکەی خۆی لەپێناو چاکە و خوداناسی و نیشتمانپەروەری و کوردپەروەریدا بەخت دەکرد. بەکوردایەتی و موسڵمانێتییەکەی سەری هەموومانی بەرز کردەوە. خودا لە هەموویان خۆش بێ و بەبەهەشت گیانیان شاد بکات.

# مێژووی کۆمەڵی زانستیی کوردان

سەرنجێک:

ئەم نامیلکەیە کە بابەتی ئەو کۆڕە بوو یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی بەبۆنەی دوو سەد ساڵەی شاری سلێمانییەوە ڕێکی خستبوو، مامۆستاش بەم باسە بەشداری تێدا کرد و لە پاییزی ساڵی ١٩٨٥ لە هۆڵی کرێکاران خوێندویەتیەوە.

دوایی دراوە بەڕەقابەی چاپەمەنی لە بەغدا بەمەبەستی ڕێگەدانی بۆ چاپکردن، ڕەقابەش بەمۆڵەتی ژمارە ١٧٨ لە ١٩٨٥/٩/٢١ بڕیاری لەسەر دراوە... بەڵام هەر بەدەسنووسی لە لای ماوەتەوە.

ئەوەی دەبوو بوترایە لە پێشەکی ئەم باسەدا ئەو بارودۆخەی دوای شۆڕشەکەی شێخ مەحموود بوو کە بەسەر دەڤەری سلێمانی بەتایبەتی و کوردستانی خواروو بەگشتیدا هات.

ئەو شۆڕشە ١٩١٨ - ١٩٢٧ ببووە جێگای هیوا و ئەمەلی کوردی باشوور لە پێکهێنانی قەبارەیەکی کوردی سەربەخۆ و دەستخستنی مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورد. بەڵام کە ئینگلیزی داگیرکەر لە عێراقدا حوکمەتەکەی بەغدای پێکهێنا و فەیسەڵی یەکەمی هێنا و کردیە مەلیکی عێراق، ئیتر بەتەواوی کۆششی بۆ ئەوە دەدا کە باشووری کوردستانیش بەڕەوڕەوەی بەغداوە ببەستێ.

لەم پێناوەدا هەموو تواناکانی خۆی و کاربەدەستانی بەغدا کەوتنە گەڕ، بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستە، هەتا لە ١٩٢٧دا شێخی نەمر ناچار کرا چەک دانێ و لە (ۆڵەژێر)ی ئێران دانیشێ.

ڕۆژنامەی (ژیانەوە)[1] بووە ئۆرگانی ئەو تەقەللا دوو قۆڵییەی ئینگلیزەکان و حوکمی بەغدا لە پێناوی ناشیرینکردنی ڕوخساری شێخ و جووڵانەوەکەی و لە بارچاوخستنی لای خەڵکی، ئەمەش بەهۆی کۆمەڵێ لەو نووسەرانەی کە لە سەردەمی شێخدا زەرەرمەندبوون یا (بەهەر هۆیەکەوە بێ) حەزیان لە شێخ و شێخان نەدەکرد.

لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژنامەیە پڕن لە نموونەی ئەو هێرش بردنانە و بڵاوکردنەوەی دیکۆمێنتی هەڵەکانی سەردەمی حوکمی شێخ و کردنیان بەدێوجامە بۆ ڕاوکردنی خەڵکی بەدەوری ئاراستەکردنەکەی ئینگلیز و حوکمەتی بەغدادا.

هەر بۆ ئەوەی خەڵکی سادە و ساکاری ئەو ڕۆژگارە بەهەڵەدا بەرن (ژیانەوە) کەوتبووە بایەخدان بەدەنگوباس و بەرچاوخستنی ڕووداوەکانی شۆڕشی کوردی کوردستانی باکور (کوردی شیمال) و پیا هەڵدانیان.

ئەمە هەرچەند کارێکی چاک بوو لەو ڕۆژەدا بەڵام ڕۆژنامەکە دەیویست ئەو بۆشایی و دەلاقە گەورەیەی پێ پڕ کاتەوە کە لەبن دەستیدا دروستی کرد بوو، کە شێخ و شۆڕشەکەی بەخراپ بداتە قەڵەم خۆ ناکرێ

---

(١) ژیانەوە: ڕۆژنامە ١٨ ئاغستۆسی ١٩٢٤ - ١٤ کانوونی دوو ١٩٢٦، سلێمانی.

داوای (بەدیل)ێک بکا لەناو باشووردا تا جێی ئەو بگرێتەوە لە بەگژاچوونەوەی داگیرکەران و حوکمی عەرەبی بەغدا!!... جا باشتر ئەوە بوو لاپەڕەکانی لە باس و بابەتی کورد و کوردایەتی خالی نەبن!، شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران و ڕووداوەکانی باشترین کەرەسەیەک بوون. بەمانایەکی دی، عەرەب وتەنی: «کلمه حق اریدبها، الباطل».

خۆ پاساودانەوەکەی مێژوونووسی هێژا د. کەمال مەزهەر بۆ دەستە و دایەرەی (ژیانەوە) لە جێی خۆیدایە، بەلام لە لای منەوە ئەوانە زانیبێتیان یان نا بەو کار و هەلوێستەیان لە خزمەتی ئینگلیز و حوکمە دروستکراوەکەیدا بوون لە بەغدا و زۆر بەداخەوە کە منەوەران و ڕووناکبیرانی کورد ئاوا لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی ئەم نەتەوەیەدا پێنووسەکانیان دەوری خزمەتی بەرژەوەندی دوژمن دەبینێ.

بەلام کاتێ ڕاستی و چەوتی دەردەکەوێ کە فایدەیەکی ئەوتۆی نامێنێ: (... زۆری نەبرد کاتێک ئەوانەی لە - ژیانەوە -دا دەیاننووسی لەوە گەیشتن کە سیاسەتی ئینگلیز لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی بەریتانیا دەرناچێت و شتێکی ئەوتۆی بۆ کورد لێ چاوەڕوان ناکرێت، بۆیە بەشێکیان دەستیان لە نووسین هەلگرت و لە کاری سیاسی دوورکەوتنەوە و بەشێکیشیان دایانەوە پال شێخ مەحموود.)[1] لەم بارودۆخەی ئەمبەر و ئەوبەرکردنی فیکری و هەلوێست وەرگرتنەی خەلکی (بەتایبەت چینی خوێنەوارەکە) و هەر وا کە حوکمی بەغداش لە دەڤەرەکەدا بووە واقیعێک، ئیتر منەوەران و ڕووناکبیران هاتنە سەر ئەو ڕاستییەی کە پێویستە شێوازی خەبات و هەولدان بۆ بەدەستهێنانی (ئەوەی دێتە دەست) بگۆڕێ، لە ڕێی موسایەرە و موهادەنە لەگەل کاربەدەستانی بەغداوە بەشکو بتوانرێ جۆرە مافێکی ڕۆشنبیری و ئیداری و خۆ بەڕێوەبردن بەدەست بێ، ئەمەش لە ڕێی هوشیارکردنەوە و تێگەیاندنی خەلکە دواکەوتووە نەخوێندەوارەکەوە، بۆ ئەمە هەلکردنی چرای خوێندەواری و زانستی لەناو میللەتدا باشترین شێواز بوو.

ئەوەبوو لە بەغدا (یانەی سەرکەوتنی کوردان) ۳۰ مایسی ۱۹۳۰ لە لایەن ڕووناکبیرانی کوردی ئەوێوە کرایەوە، (کۆمەلەی لاوان) لە بەغدا کاری لە سنووری تەسکی خۆیدا دەکرد.

لە سلێمانیش ڕووناکبیران ئەم شێوازەیان گرتە بەر، بڕوانە (ئەحمەدی عەزیز ئاغا) لە (ژیان)ی ژمارە (۲)ی سالی (۱)، ۱۹۲٦/۱/۲۸ لەژێر سەردێری (ئیتر نۆرەی ئێمەیە)دا چی دەلێ:

(... بەسورەتێکی ئاشکرا دەمەوێ عەرزتان بکەم کە میللەتی ئێمە ئەمڕۆ لە هەموو شتێک زیاتر محتاجی تشکیلکردنی جەمعیەتێکە، یەعنی لازمە جەمعیەتێک کە عیبارەت بێ لە ئەشراف و موتەمەیزان و مونەوەران لە داخلی پرۆگرامێکی باش و ڕێکوپێکدا وە لە جێگایەکی معلومدا تەشەکول و تەجەموع بکات و ئەو جەمعیەتە دائیما لە جێگایەکی تایبەتی کۆبنەوە و هەر کەس بەقەدەر حیسییاتی

---

(۱) عەبدوللا زەنگەنە: ژیانەوە و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا - پێشەکی د. کەمال مەزهەر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، دەزگەی موکریانی - هەولێر ۲۰۰۰، ل ١٤ - ١٦.

(۲) هەمان سەرچاوە... ل: ١٦.

خۆی دەردی میللەت بەیان بکات، وە ناتەواوی میللەت لە جیهەتی معارف، تجارەت، صنایع، دەردی ئەخلاق و إقتصاد وە هەموو شتێکی ترەوە بخاتە بەرچاو، وە هەموو بەجەمعی لێی وردبینەوە وە دەرمانی بۆ بدۆزینەوە، هەر کەس بەقەدەر حاڵ و وەصفی خۆی بۆ ڕووناککردن و ڕاخستنی ئەو جێگایە معاوەنەت بکات.)

هەرچەندە د. کەمال مەزهەر ئەم دیاردەی دروستبوونی کۆمەڵە و یانە ڕۆشنبیریانە بەچاولێکەریەکی ئەوانەی ئەوروپا دەداتە قەڵەم کە عەرەبەکان لە بەغدا دەستیان پێ کرد وەک: (جماعة الأهالي، نادي القلم، نادي المثنى) بۆ چالاکی نوواندنی ڕۆشنبیری و وەرزشی و کولتووری وە چاپ و پەخشی بلاڤۆک و نامیلکەی هوشیارکردنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی و دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار... ئەم دیاردەیە لەوانیشەوە ڕووناکبیرانی کورد لێیەوە فێربوون. ئەوە بوو کۆمەڵێ تەقەللایەکی سەرنەکەوتوویاندا بۆ دامەزراندنی (یانەی سمکۆی شوکاک ٤/٣/١٩٣٥).[1]

جا بەلای منەوە کارکردن و دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستی کوردان) هەر لەو بازنەیەدایە و ئەگەر چاولێکردنیش بێ کارێکی باش بووە.

(مژدەیەکی گەورە بۆ هەموو کوردان

مەعلوم خوێندەواران گەر ئەمە کە تاکو ئەمڕۆ هەموو ئارەزوو و ئەمەلمان حەسر کردۆتە سەر بلاوکردنەوەی عیلمومەعاریف، ئەوا ئەمڕۆ شوکرەن لیلاه بەکەماڵی ئیفتیخار بەری ئەم سەعیە ئەخەینە بەرچاوی میللەت، بنا لەسەر تەشەبوساتی چەند کەسانێکی میللەتپەروەر و تەصدیقی وەزارەتی داخلیە وە معاوەنەتی گەورەی جەنابی موتەصەڕیف وە موفەتیشی ئیداری پرۆگرامی و نظامنامەی جمعیەتی زانستی کوردان نشر و اعلان دەکەین...

بەنەشر و تەقدیم کردنی ئەم مژدە خۆشە، ئەم خەبەرە بەقیمەتە - ژیان - جیدەن مەسرور و موفتەخیرە.)[2]

ئا بەم شێوەیە و لەو ڕەوشەدا بوو کە (جەمعیەتی زانستی کوردان) لە سلێمانی دامەزرێنرا.

**تێبینی:** لە پێشکەشکردنی ئەم نامیلکەیەدا نووسەر خۆی هەندێ پەراوێزی ئیشارە کردووە کە لە کۆتایی باسەکەدا نووسراون، ئەوانی دی پەیوەندییان بەوەوە نییە.

«ئەحمەد»

---

(١) د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەرەیەک لە مێژووی گەلی کورد - ئامادەکردنی: عەبدوڵلا زەنگەنە - چاپ و پەخشی دەزگەی موکریانی - هەولێر ٢٠٠١ (بەرگی دوو): ل ٣٣١ - ٣٤٤.

(٢) ژیان: ڕۆژنامە - ژمارە (١١) ساڵی (١) ١/٤/١٩٢٦ سلێمانی.

## پێشەکی:

ئەم نووسراوە:

(کۆمەڵی زانستیی کوردان) کە لە ساڵی ١٩٢٦دا لە شاری سلێمانیدا دامەزرا، (نەتەوەی نەژادی کورد)[1] بەهیوا و ئاواتێکی زۆرەوە و، یارمەتییەکی مەردانەوە پێشوازییان کرد. ئەمەیش سەبارەت بەوە بوو کە ئەندامەکانی کارگێڕیی کۆمەڵەکە، لە پیاوانی کەڵە کەڵەی ڕۆشنبیران و نیشتمانپەروەرانی کوردی ئەو سەردەمە دەژمێرران. لە ڕاستییشدا وا دەرچوون. چونکە لە ماوەیەکی کەمدا زۆربەی. ئامانجەکانی کۆمەڵەکەیان هێنایە دی، وەک (بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری) و (فێرکردنی زمانانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی بەخوێندەواران) و (کردنەوەی نووسراوخانەیەکی ئاوازە) و (دەستگیرۆییکردنی ئەو شاگردە هەژارانەی دەیانخوێند لە خوێندنگاکانی کوردستان و دەرەوەی عیراقدا) و (ڕاهێنانی شاگردەکانی بەوتاردان و، وتار نووسین بەسەربەستییەوە) و (کردنەوەی پێشانگا بۆ دەستکردی تازە بابەت و داهێنراوی شاگردەکان) و (بلاوکردنەوەی گیانی کوردایەتی و مرۆڤایەتی بەهۆی وتاردانی هەفتەییەوە بەناو جەماوەرانی کورددا) و (بەشداری لە ئاهەنگەکانی لاساییکردنەوەدا بۆ کەڵکی شاگردە هەژارەکانی خوێندنگا سەرەتاییەکانی کوڕان و کچان) و گەلێک شتی تر... بەلام جێی داخە کە (کۆمەڵی زانستیی کوردان) لە تەمەنێکی نزیکەی (١٩) ساڵییدا، هەر یەک دوو ساڵێک بەشۆخوشەنگی و هێز و هەرەتیەوە ژیا. ئیتر لەوەدوا بەکزی و لاوازییەوە کاروباری خۆی بەڕێوە دەبرد. ئەگەر یارمەتی دانیشتووانی شاری سلێمانی و لاوەکانی لە ئارادا نەبووایە زۆر زووتریش لەناو دەچوو! دوایی لە ساڵی (١٩٤٤ - ١٩٤٥)دا، کۆمەڵەکە داخرا و خوێندنگایەک لە جێی خوێندنگاکەی ئەو دامەزرێنرا ناوی نرا: (قوتابخانەی زانستیی ئێواران)، کە لە لایەن میرییەوە بەڕێوە دەبرا!...

(کۆمەڵی زانستیی کوردان)، لەبەر دوو هۆ وای بەسەر هات: (یەکەم) لەبەر کارەساتی ناهەمواری ڕۆژگار. (دووەم)لەبەر هەندێک هەڵەی خۆمان، کە لەناکۆکیی ئەندامە گەورەکانی کۆمەڵەکەوە ڕوویان دا.

لەگەڵ ئەمەیشدا (نەتەوەی کورد)، چاوی نەترسا و نەبەزی. لە هەموو لایەکەوە (ڕۆشنبیرانی کورد) چاکی مەردایەتییان لێ کرد بەلادا و، وازیان نەهێنا، تا زۆربەی ئامانجە پیرۆز و بەرزەکانی (کۆمەڵی زانستیی کوردان)یان هێنایە دی، کە تا ئێستاکەیش خەباتەکانیان هەر لە پەرەسەندن و گەشەکردندان و بەرهەمەکانیشیان هەر ڕووەو چاکی و شۆخوشەنگی دەچن.[2]

ئەم نووسراوەیش کە ناوم ناوە: (مێژووی کۆمەڵی زانستیی کوردان)، ئامانج و ئاواتی کۆمەڵەکە و،

---

(١) دیارە مامۆستا مەبەستی دڵسۆزان و ڕووناکبیرانی کوردی سلێمانییە، چونکە دامەزراندن و مەودای چالاکییەکانیشی هەر لەو سنووورەدا بووە.

(٢) لێرەدا نازانم مەبەستی مامۆستا چییە، بەتایبەت کە دەڵێ: تا ئێستاکەیش، چونکە ساڵی ١٩٨٥ کە ئەم پێشەکییەی نووسیوە، لەمێژ بووە کە بوون و چالاکی ئەو کۆمەڵەیە نەما بوو!؟.

پێڕەوییەکەی و، خەباتەکانی و، بەرهەمەکانی پیشان دەدات لە ماوەی ژیانیدا. هیوادارم خوێندەوارە بەڕێزەکانمان کەڵک و خۆشیی لێ وەربگرن.(*)

شاکر فتاح
(خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد)
(سلێمانی): (۱۷ - ۷ - ۱۹۸٥)

## پێڕەویی کۆمەڵی زانستیی کوردان

(ناوی کۆمەڵەکە و بنکەکەی)

۱- ناوی کۆمەڵەکە (کۆمەڵی زانستیی کوردان)ە. بنکەکەیشی لە شاری (سلێمانی)دایە.

(مەبەسی کۆمەڵەکە)

۲- مەبەسی کۆمەڵەکە: بڵاوکردنەوەی زانین و زانستییە لە کوردستاندا ئەوەیش بەم شێوەیەیە:

أ- بەبڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و نووسراوانی سەرپێیی.

ب- بەپەرچڤەکردنی نووسراو و، دانانی نووسراوەکانی خوێندنگاکان و بابەتانی تریش.

ج- بەکردنەوەی خوێندنگا و وانەگوتنەوە بەڕۆژ و بەشەو.

ح- بەوتار خوێندنەوە بۆ ڕۆشنکردنەوەی مێشکی هاونیشتمانەکان.

د- بەکردنەوەی نووسراوخانە.

هـ- بەشاگرد ناردن بۆ خاکە پێشکەوتووەکانی جیهان بۆ ئەمەی بخوێنن و ببن بەپسپۆر.

۳- کۆمەڵەکە، لە شێوەیەکی تایبەتیدا، لە ڕووی مێژوو و زەویناسی و کۆمەڵایەتییەوە، لە بارەی (کوردەواری) و (کوردستان)ەوە لێکۆڵینەوە دەکات و، هەرچییەکی دەست کەوت بڵاوی دەکاتەوە.

٤- کۆمەڵەکە بۆ پێکهێنانی خۆشەویستیی و کۆکی لە نێوان (کوردەواری) و (فەرمانڕەوایی)دا، هەروەها بۆ پتەوکردنی گیانی پەیڕەویکردنی یاساکانی فەرمانڕەوایی و فەرمانڕەوایی خۆی، بەهۆی ئامۆژگاری کارانەوە کە بەتایبەتی دەیاننێرێت بۆ ناو کوردەواری، شیرەت و ئامۆژگاری بڵاو دەکاتەوە.

٥- کۆمەڵەکە بەهیچ شێوەیەک دەست لە زرنگکاری نادات.

| مەعرووف بەگ زادە | پارێزەر | حاجی فەتاح زادە |
| --- | --- | --- |
| فائیق | ڕەفیق | ڕەمزی |

(*): ئەم وتارە لە پاییزی ساڵی ۱۹۸٥دا لە هۆڵی کرێکارانی سلێمانیدا خوێندرایەوە. کۆڕەکەیش (یەکێتی نووسەرانی کورد) بۆی ئامادە کردبووم، کە بەبۆنەی تێپەڕبوونی دوو سەد ساڵەوە بەسەر دامەزراندنی شاری (سلێمانی)دا، گیرا بوو. (ش. ف)

## پێڕەویی ناوخۆ

شێوەی ناونووسین و ئەندام وەرگرتن و ئەندام دەرکردن:

١- بێ جیاوازیی ڕەگەز و ئایین هەموو کەسێک بەپێی ئەو مەرجانەی لە خوارەوە نووسراون، دەتوانێ بەپێی بڕیاری دەستەی کارگێری بێتە ناو کۆمەڵەکەوە:

أ- تەمەنی لە بیست ساڵ کەمتر نەبێ.

ب- بەش براو نەکرا بێ لە مافی شارستانێتی و، خاوەنی ڕەووشت و خووی جوانیش بێ.

٢- هەچ کەسێک پێچەوانەی مەبەسەکانی کۆمەڵەکە بجوولێتەوە، یاخود مانگانە و پارەی هاتنە ناو کۆمەڵەکە نەدات، یان بەجۆرێکی وەها بجوولێتەوە کە لەناو هاونیشتمانەکاندا بەبێ ئابڕوویی دابنرێ، بەبڕیارێکی دەستەی بەڕێوەبەران لە کۆمەڵەکە دەردەکرێت.

شێوەی دوروستکردنی[1] دەستەی بەڕێوەبەران و فرمانەکانیان

٣- کۆمەڵەکە بەسایەی (دەستەی بەڕێوەبەران)ەوە کە لە سێ کەس کەمتر نابێ و لە حەوت کەس زۆرتر نابێ کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرێن.

٤- (دەستەی بەڕێوەبەران)، لە لایەن زۆربەی کۆبووەکانەوە لە گشت ئەندامەکان هەڵدەبژێررێن.

٥- سەرۆک و نووسیار و ژمێریاری کۆمەڵەکە و فەرمانبەران لە (دەستەی بەڕێوەبەران) یاخود لە ئەندامانی کۆمەڵەکە دادەمەزرێنرێن و هەڵدەبژێررێن. بەڵام پێویستە سەرۆک لە دەستەی بەڕێوەبەران بێ.

٦- (دەستەی بەڕێوەبەران) بۆ بەجێهێنانی مەبەسەکانی کۆمەڵەکە هەرچی پێویست بێ دەیکات. (دەرامەت) و (بەختکردن)ی[2] کۆمەڵەکە دیاردی دەکات. تەرازووکاری (بودجە)ی ساڵی داهاتوو ئامادە دەکات و دەیخاتە بەردەم گشت ئەندامانی کۆمەڵ. هەموو ساڵێکیش هەرچی کردووە و، هەرچی پێویستە بکرێ بۆ بەجێهێنانی مەبەسەکانی کۆمەڵەکە، لە نامەیەکی دوورودرێژدا پێشانی گشت ئەندامانی کۆمەڵەکە دەدات.

٧- (دەستەی بەڕێوەبەران)، فرمانەکانی فەرمانبەران و نووسیارەکان دیاردی دەکەن و بەسەریشیانەوە دەگەڕێن تا بزانن چۆن فرمانەکانی خۆیان دەبینن.

دەرامەتی کۆمەڵەکە و بەختکردنەکانی

٨- دەرامەتی کۆمەڵەکە بریتییە لەو پارانەی کە وەردەگیرێن لە ئەندامانی کۆمەڵەکە لە کاتی بوون

---

(١) ڕاستتر: شێوەی پێکهاتنی.

(٢) بەختکردن: واتە خەرجکردن -صرف-.

بەئەندامیاندا و، مانگانەی ئەندامەکان و، پیتاک و بەخشینی چاکەخوازەکان.

٩- هەموو ئەندامێک لە کاتی هاتنە ناو کۆمەڵەکەدا، دەبێ بەپێی توانای خۆی، هەندێک پارە بەناوی هاتنە ناو کۆمەڵەکەوە بدات. ئەم پارەیە هەرە کەمی ڕوپییەیەکە. هەروەها دەبێ بەپێی توانای خۆی مانگی شتێک بەکۆمەڵەکە بدات.

١٠- دەرامەتی کۆمەڵەکە تەنیا بۆ بەجێهێنانی مەبەسەکانی کۆمەڵەکە بەخت دەکرێ. هەر پارەیەکیش بەخت کرا بەفەرمان و پەسەندکردنی (دەستەی بەڕێوەبەران) پێک دێت.

١١- (دەستەی بەڕێوەبەران) دەبێ ئەو پەڕاوانەی کە (یاسای کۆمەلان) فەرمانیان پێ دەدات بیانگرێت. ئەگەر لەوانە زۆرتریش پێویست بوو، پەڕاو (دەفتەر) بگرێت.

دەستەی گشتیی

١٢- (دەستەی گشتیی) هەموو ساڵێک لە یەکەم ڕۆژی مانگی پەڵە (تشرینی ئەوەڵ)دا کۆدەبێتەوە. فرمانەکانی ئەمەتان:

أ- دەرامەت و بەختکردنی کۆمەڵەکە بنج بەست دەکات.

ب- بەپێی پێویست پێڕەویی کۆمەڵەکە دەگۆڕێ.

ج- سەرلەنوێ (دەستەی بەڕێوەبەران) هەڵدەبژێرێتەوە.

د- بۆ ساڵی داهاتوو کاروباری کۆمەڵەکە ڕێک دەخات.

١٣- سەرۆکی (دەستەی بەڕێوەبەران) دەبێتە سەرۆکی (دەستەی گشتیی)یش.

١٤- سەرۆکی (دەستەی بەڕێوەبەران)، یاخود جێگرێک کە کۆمەڵەکە دایدەنێ، لە دادگاهەکان و دەسگاکانی میریدا کۆمەڵەکە دەنوێنێ و لە جێی کۆمەڵەکە دادەنرێ.

١٥- چ لەناو (دەستەی بەڕێوەبەران)دا بێ و، چ لەناو (دەستەی گشتیی)دا بێ وتووێژکردن و بڕیاردان، لە لایەن زۆربەی ئەو کەسانەوە دەدرێت کە کۆبوونەتەوە.

١٦- کە پێویست بەوە بکات (دەستەی گشتیی)، لەسەر بانگکردنی (دەستەی بەڕێوەبەران)، بێجگە لە کۆبوونەوەی ئاسایی ساڵانە، هەموودەمێک دەتوانێ کۆببێتەوە و، بەپێی ئەم پێڕەوییە فرمانەکانی خۆی بەجێ بهێنێ.

٢٧ی مانگی چلە (کانوونی ثانی) ١٩٢٦

| مەعرووف بەگ زادە | پارێزەر | حاجی فەتاح زادە |
| --- | --- | --- |
| فائیق | ڕەفیق | ڕەمزی |

(دەقەکە چەشنی خۆیەتی: ٢١ - ٢٦٣)

## ڕێدان بەکۆمەڵەکە دابمەزرێت

بەپێی فەرمانی کاربەدەستیی کاروباری ناوخۆ (وزارة الداخلية) ژمارە (٢٥٧١)ی ڕۆژی ٢٤ - ٢ - ١٩٢٦ کە بۆ پارێزگای سلێمانی نێررا بوو، ڕێ درا بە(کۆمەڵی زانستیی کوردان) بەپێی (یاسای کۆمەڵان) و ئەو (پێڕەوی)یەی بەپێچراوەیی نێررا بوو، و لە سەرەوە پیشان درابوو، دەست بکات بەفرمانکردن و بجووڵێتەوە. موتەسەریفی سلێمانییش کە (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) بوو، وێنەی ئەو نامەیەی بەهەرسێ خاوەن سکالاکان (ڕەمزی حاجی فەتاح) و (ڕەفیقی پارێزەر) و (فایەقی مارف بەگ) ڕاگەیاند، بۆ ئەمەی دەست بکەن بەکارکردن و جموجووڵ، بەپێی (پێڕەوی)یەکەیان و (یاسای کۆمەڵان).(١)

## ئاهەنگی کردنەوەی کۆمەڵی زانستیی کوردان

لە شەوی ١٩٢٦/٤/٣دا ئاهەنگێکی گەورە، لە ساختمانی شارەوانیی سلێمانیدا، بەبۆنەی کردنەوەی (کۆمەڵی زانستیی کوردان)ەوە گێڕرا. جێگاکە لە شێوەیەکی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و پەسەنددا ڕازێنرابووەوە. سێ سەد کەسێک لە فەرمانبەران و ئەفسەرانی گەورە و بچووک و پیاوی گەورە و ناسراو و بازرگان و زانایان و ڕۆشنبیرانی شاری سلێمانی لەوێدا کۆبوونەوە. پێڕەویی ئاهەنگەکە کە بەزمانانی (کوردی) و (ئینگلیزی) چاپ کرابوو، لە بەردەم میوانەکاندا دانرا. ئنجا دەست کرا بەئاهەنگەکە. (ڕەفیقی پارێزەر) و (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) و (حاجی تۆفیقی پیرەمێرد) و (جەمال بەگی بابان) و (شێخ مستەفای دادگەر) هەریەکەیان وتارێکی پێشکەشی دانیشتووان کرد. وتارەکەی پیرەمێرد بەهۆنراوە بوو.[1]

پوختەی وتارەکانیان ئەوە بوو پیرۆزبایییان لە نەتەوەی کورد کرد کە (کۆمەڵی زانستیی کوردان)ی بۆ دامەزرێنراوە بۆ ئەمەی بەسایەی بلاوکردنەوەی زانست و هونەر و وێژە و پیشەسازییەوە لەناویدا پێش

---

(١) بەپێی ئەو ڕیپۆرتاژەی (ژیان) لە ژمارە (١٢، ١٣)ی ١٢، ١٩٢٦/٤/٢٢ دەربارەی ئاهەنگەکەی نووسیوە، دوا بەدوای وتارەکەی ئەحمەد بەگی موتەسەریف (لە تەرەف جەنابی حاجی تۆفیق بەگەوە شیعرێک خوێنرایەوە) کە تیایدا دەڵێ:

ئیمشەو گوڵی ئومێدی وطنمان ئەپشکوێ
میللەت ئومێدەوارە بە(زانستی) سەرکەوێ
زانستییە سویەی میللەت بلند ئەکا
زانستییە کە ئێمە بناسێ بەئەوروپا
زانستی زۆر بەقیمەتە ئومێدی ئاتیە
ئەم إحتفالە فەئلە، وەطەن ڕوو لە هاتیە
(تۆفیق)ی حەق بێتە ڕەفیقمان لەم ئیشەدا
وا دەست لە دەستە، ئەڵبەتە خوا قوەتیش ئەدا

بکەوێ و بگاتە ڕیزی نەتەوە پێشکەوتووەکانی سەرزەمین و، هەست بەمرۆڤایەتی خۆی بکات. هەروەها داوایان لە نەتەوەکەمان کرد کە هۆگری خوێندەواریی ببێ و یارمەتی (کۆمەڵی زانستیی کوردان)یش بدات بەسەر و بەپارە لە پێناو پێشکەوتنی خۆیدا.

وتارەکانی ئەو ئەندامانە هەموویان دڵگیر و پەسەندبوون و کاریان کردە سەر دڵ و دەروون و مێشکی دانیشتووەکان. (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) کە موتەسەڕیفی سلێمانی بوو، قسەکانی پڕ بوون لە هەستی کوردایەتییەکی بەرز و پیرۆز بەرامبەر کۆمەڵەکە و کورددواری. پڕ بەدڵیش بەڵێنی دانێ کە هەرچییەکی لە دەست بێت بیکات بۆ سەرگرتنی کاروباری کۆمەڵەکە و گەشەکردنی خوێندەواری لەناو نەتەوەکەی خۆیدا. هەر ئەو شەوە دەستکرا بەهەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبردن:[1]

| | |
|---|---|
| موتەسەڕیفی سلێمانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ: | سەرۆک |
| دادگەری تەنیا جەمال بەگ بابان: | جێگری سەرۆک |
| شێخ مستەفای قەرەداخی (دادگەر): | ئەندام |
| موحەممەد ئاغای عەبدوڕەحمان ئاغا: | ئەندام |
| عیززەت بەگی وەسمان پاشا: | ئەندام |
| غەفوور ئاغای حاجی عەبدوڵڵای گەورە: | ئەندام |
| ڕەمزی فەتاح: | ئەندام |
| فایەق بەگی مارف بەگ: | ژمێریار |
| پارێزەر ڕەفیق ئەفەندی تۆفیق: | باوەڕپێکراو |

هەر ئەو شەوە، پاش هەڵبژاردن، دەستکرا بەکۆکردنەوەی پیتاک،[2] (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)، لە هەموو کەسێکی زۆرتر بەخشی بەکۆمەڵەکە. (٢٠٥) ڕوپییەی پێشکەش کرد. بەڕاستی ئەو شەوە،

(١) بەپێی ڕیپۆرتاژی کردنەوەی ئاهەنگی زانستی (کە ئیشارەمان پێدا) لە شەوی ٢/٣ - ٤ - ١٩٢٦ ئاهەنگی کردنەوەی جەمعیەتەکە گێڕراوە، لە (ژیان)ی ژمارە (١٣) لە ١٩٢٦/٤/٢٢دا هاتووە کە: شەوی ١٣ نیسان ١٩٢٦ لە دائرەی بەلەدیەدا ئیجتماعێ کرا بالاتفاق زەواتی موحتەرەمەی ژێرەوە بۆ هێئەتی ئیدارەی جمعیەتی زانستی هەڵبژێرراون. کەواتە (هەر ئەو شەوە) هەڵبژاردنەکە نەکراوە.
بەڵام بەپێی ژمارە (١٣)ی ڕۆژنامەی (ژیان). لاپەڕە (٣) ساڵی ١٩٢٦، لە شەوی ١٩٢٦/٤/١٣دا لە شارەوانی سلێمانیدا کۆبوونەوەکە کرا... لام وایە ئەم مێژووە کە بۆ (هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆمەڵی زانستیی کوردان) دانراوە، دەبێ ١٩٢٦/٤/٣ بێ، چونکە ئاهەنگە گەورەکە بۆ کردنەوەی کۆمەڵ، هەر لەو شەوەشدا هەڵبژاردن و پیتاک کۆکردنەوە کرا.

(٢) دیسانەوە (هەر ئەو شەوە) پیتاک کۆنەکراوەتەوە، بەپێی ڕیپۆرتاژەکەی (ژیان) لە شەوی ئاهەنگی کردنەوەی جەمعیەتدا دوای وتارەکان و چا خواردنەوە دەستکرا بەپیتاک کۆکردنەوە. ئەو کارە هەتا ماوەیەکی زۆر هەر بەردەوام بوو.

هەموو دانیشتووەکان بەچاوتێرییەکەوە پیتاکیان پێشکەش کرد. بەهۆی ئەو شەوەوە و بەهۆی ئەوانەیشەوە کە لەوە پاش لە ناوچەکانی خاکی سلێمانی و هەولێر و جێگایانی ترەوە کۆکرانەوە، پارەیەکی گەورە کۆکرایەوە بۆ کۆمەڵەکە. کە لە (٦١٥٧) روپییە تێپەڕی کردبوو. ئەو شەوە هەستێکی گەرموگوڕی پاکی (کوردایەتی) بەدڵی هەموو دانیشتووانی ئاهەنگەکەدا دەهات. هیوا و ئاواتی خۆش دەهات بەدڵی هەموو لایەکیاندا. دڵخۆشی و کامەرانی هەموویانی مەست کردبوو. ئیتر ئەمەندە و لە ماوەی ئاهەنگەکەدا جگەرە و قاوە و چا درا بەمیوانەکان و، گۆرانی بەجۆشیش درا بەگوێیاندا و، هەموو لایەک بەدڵێکی خۆش و پڕ هیواوە بە(دواڕۆژی کورد): بڵاوەیان لێ کرد.

## کارەکانی کۆمەڵی زانستیی

(کۆمەڵی زانستیی کوردان) لە کاتی کەوتنە ئیشیەوە گەلێ کار و چالاکی ڕۆشنبیرانەی نواندووە، گرنگەکانیان بریتی بووە لە: (بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری لە سلێمانیدا)، بەڵام لەسەر چەند بنچینەیەکی زانستیی و پەروەردەیی ڕاست و دوروست. ئەوەیش بەڕاستی دیمەنێکی جوان بوو، کە پیاو دەیبینی، ژمارەیەکی زۆر لە خاوەن کار و پیشەی جۆراوجۆر لە تەمەندا، بەهەڵەداوان خۆیان دەگەیاندە ژوورەکانی خوێندنگای ئەو کۆمەڵە کە بۆ بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری، لەو سەردەمەدا کردبوونیەوە. هەروەها ئەو ژمارە زۆرەیش کە لە خانەدانەکان و پیاوە ناسراوەکان و دەوڵەمەندەکان و ڕۆشنبیرەکانی شاری سلێمانییش بوو بوونە ئەندامی ئەو کۆمەڵە، خۆشی و کامەرانی خستبووە ناو دڵی نیشتمانپەروەرانی کوردەوە. لە ساڵی ١٩٣٣دا کار و کردەوەی ئەو خوێندنگای بەرەنگاریکردنی نەخوێندەوارییە تا ئەندازەیەکی گەورە گەشەی کرد. چونکە بایەخێکی زۆری دا بەڕاهێنان و مەشق پێکردنی شاگردەکانی لەسەر (گۆرانی خوێندنگایانە) و (وەرزش) و (وتاردان) و (دەستکردی تازە بابەت) لە گەلێک جۆرە پیشەسازیدا کە ئەوساکە لە سلێمانیدا باوبوون. تەنانەت خوێندنگای کۆمەڵەکە پێشانگایەکی بۆ دەستکردە تازە بابەتەکانی شاگردەکانی کردەوە، کە هەر کەسەیان لە کار و پیشەکەی خۆیدا بابەتێکی تازەی داهێنا بوو. ئێستاکەیش دێتەوە بیرم کە یەکێک لەو شاگردانە لە تەختە و تەنەکە (فرۆکە)یەکی دروست کردبوو، تا ماوەیەکی بیست سی گەزی، بەهۆی هێزی زەمبەلەکەوە دەڕۆیشت بەڕێگادا. شاگردێکی تریشیان کەڵاشێکی جوان و ڕازاوەی تازە بابەتی داهێنا بوو و، دروست کردبوو، کە هەر شایستەی ئەوە بوو لەگەڵ جلوبەرگی کوردی و فەرەنگیدا لە پێ بکرێ. شاگردێکی تریش (ڕۆژژمێر)ێکی لە زەرد و ئاسن دروست کردبوو، ڕۆژ و حەفتە و مانگ و ساڵی بە(زمانی کوردی) لە شێوەیەکی ڕازاوە و جواندا پێشان دەدا. خوێندنگا کە هەر لەوە پێشەوە لە پێشکەشکردنی لاساییکردنەوە (تمثیل)دا، هاوبەشی دەکرد لەگەڵ خوێندنگای سەرەتایی کوڕانی سلێمانیدا. بیرمە لە ساڵی ١٩٢٧دا شانۆگەریی (نیرۆنی زۆردار)ی پێشکەش بەجەماوەرانی سلێمانی کرد. هەروەها لە ساڵی ١٩٢٨یشدا شانۆگەریی (شۆڕشی گەورەی فەرەنسە)ی پێشکەشکردن. هەردوو شانۆگەرییەکە لەسەر شانۆی خوێندنگای کۆمەڵی زانستیی کورداندا کرا. کەچی کەڵکی شانۆگەرییەکان بەرەو ڕووی

(خوێندنگای سەرەتایی یەکەمی کورانی سلێمانی) کرابووەوە، لەگەڵ (خوێندنگای سەرەتایی کچانی سلێمانی)دا.

لە ساڵی ١٩٣٣دا ئاهەنگەکانی (وتاردان) و (وتووێژی زانستیی و وێژەیی)، هەموو هەفتەیەک، لە شێوەیەکی ڕێکوپێکدا دەکران. ئەوەیش بۆ ئەمە بوو: کە شاگردەکان وریا بکرێنەوە و، شارەزا بکرێن لە وێژە و مێژوو و زانستی گشت لایێدا، فێری ئەوەیش بکرێن، کە لە بەردەم هەموو کەسێکدا بتوانن بەسەربەستییەوە قسەی خۆیان بکەن و مافی خۆیان و نەتەوەکەیان بپارێزن.

پێویستە ئەوەیش بڵێم، کە زۆر لە مامۆستاکانی خوێندنگاکە بەخۆڕایی وانەیان دەگوتەوە. نەیاندەویست لە کۆمەڵەکە مانگانە وەربگرن. تا لە ڕووی ئابوورییەوە یارمەتی بدەن. (لاوانی کورد) لەم ڕووەوە، یارمەتییەکی باشی خوێندنگاکەیان دەدا. لە ساڵی ١٩٣٣دا ژمارەی شاگردانی خوێندنگاکە گەیشتە (٢٤٠) شاگرد، خوێندنگاکە دەستەیەکی تایبەتی بۆ (گۆرانی گوتن) دانا بوو. ئەو دەستەیە، هەموو شەوێک (گۆرانی زانستی)ی بۆ شاگردەکان دەگوت، کە بەتایبەتی بۆ (خوێندنگای زانستیی کوردان) دانرا بوو.

(کۆمەڵی زانستیی کوردان)، لە بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری و، زیندووکردنەوەی گیانی (نیشتمانپەروەری) و (کوردایەتی)دا مەردایەتییەکی زۆری دەنوواند. بیرمە لە ساڵی ١٩٢٦دا، لەسەر ئەرکی خۆی، یەکێک لە شاگردە کوردەکانی نارد بۆ (لەندەن)، بۆ ئەمەی لە زانستگایەکی ئەوێدا بخوێنێ و ببێتە پسپۆر لە (زانستی ئەندازە)دا. شاگردەکە ناوی (ئەنوەر صائیب) بوو. بەبۆنەی ڕەوانەکردنیەوە بۆ شاری (لەندەن) ئاهەنگێکی گەورە کرا.[1]

هەروەها کۆمەڵەکە ژوورێکی دانا بوو، بۆ خوێندنەوەی نووسراو و گۆڤار و ڕۆژنامە. نووسراودانێکی

---

(١) لە ڕاستیدا وەک دەردەکەوێ ئەو قوتابییە لە لایەن حوکومەتەوە بە(بعثة) نێرراوە. (ڕەسمی ویداع): ڕۆژی چوارشەممە ١٩٢٦/٨/١٨ لە طرف طلبەکانی مکتبی سلێمانییەوە وە طلبەکانی مکتبی بەغداد کە بەمناسبتی تەعطیلەوە لێرەن. لە جمعیەتی زانستیدا حەفلەیەکی وداع بۆ جەنابی -انور صائب- افندی کرا کە حکومەت بوو إکمالی تحصیل بۆ ئەوروپای ئەنێرێ. لەم حفلەیەدا لە طرف قوتابییەکانەوە دائر بەمنافعی بعثاتی عیلمیەوە وە حالەتی زانستی جمعیەتی علمیەوە فوائد و خدمەتی، نطق خوێنرایەوە. لە طرف جنابی -انور صائب-ەوە بەنطقێکی مقابل بەیانی تەشەکورات کرا، بەنەشیدیکی وطنی طلبەکانی مکتب ختام بەحفلەکە هات). ژیان: ژمارە (٣٠)، ١٩٢٦/٨/٢٦، بەلام جەمعیەت وەک لایەنێکی ڕووناکبیری ئەو ڕێوڕەسمەی بۆ سازاندووە.

الحكومة العراقية/ وزارة الداخلية　　　　العدد: ٧٤٧٦

بغداد في: ٣ حزيران ١٩٢٦

حضرة رمزي أفندي بن حاجي فتاح - محلة گوێژە رقم ٣٣/٧١ في السليمانية

الموضوع/ مجلة -زانست-

بعد التحيه: اجابة الى طلبكم نأذن لكم باصدار مجلة علمية نصف شهرية باسم (زانست) تصدر في =

گەورەیشی تێدا دانرا بوو کە پڕ بوو لەو نووسراوانەی بەکەڵکی (خوێندەواری کورد) و (خوێندەواریی کوردی) دێن، چ بەزمانی کوردی و چ بەزمانانی تر. لە ساڵی ١٩٣٣دا کۆمەڵەکە هەوڵیدا (گۆڤاری زانستیی کوردان) دەربهێنێ بەڵام داخەکەم ڕێ نەدرا دەریبهێنێ.(٢)

بەڵام دەسگای خوێندنگای بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواریی کۆمەڵی زانستیی کوردان، توانی ژمارەیەکی زۆر لە هۆی ڕوونکردنەوە (وسائل الایضاح) کە بۆ گفتوگۆ لەسەرکردنی شاگردان ئامادە کرابوون، وێنەیان لێ دەربهێنێ. لە زمانی فەرەنسزییەوە بیانکات بەکوردی. وێنەکان ڕەنگاوڕەنگ و جوان دەرچووبوون. دڵی شاگردەکانیانی کێش دەکرد، بەتایبەتی هەر لەبەرئەوەی کە لەژێریاندا بەزمانی کوردی نووسرابوون. ئەم کارەیش هەمووی لە ماوەی دوو هەفتەدا لە شێوەی هەرەوەزدا تەواو کرا. لەمەدا لاوە کوردەکان یارمەتییان زۆر داین.

بروانامەیەکی هونەرمەندانەی جوانیش کە لە لایەن خودا لێخۆشبوو (سەید حسەین حوزنی موکریانی)یەوە بەکلێشە هەڵکەندرا بوو و بۆمان چاپ کرابوو ڕووەکانی بەزەڕکەفت نووسرابوون، دڵی پیاویان کێش دەکرد.

بەتایبەتی هەر لەبەرئەوەی کە بەزمانی کوردی لە شێوەیەکی هونەرمەندانەی ڕازاوە و جواندا سێ وشەی بەرز و پیرۆزیان لەسەر نووسرا بوو کە ئەمانەن: (بیری چاک)، (وتەی چاک)، (کردەوەی چاک). ئەم بڕوانامەیەیش تایبەتی بوو بۆ ئەو شاگردانەی لە تاقیکردنەوەکانی دوا ساڵدا دەردەچوون. ئامانجیشمان ئەوە بوو کە شاگردەکان هەتا دەمێنن ڕەفتار بەو سێ وشە پیرۆزە بکەن، تا لە ژیانیاندا هەمووده‌م سەرکەوتوو بن. لە ساڵی ١٩٣٣دا کە گەلێک شاگرد لە تاقیکردنەوەی دوا ساڵیاندا دەرچوون

=السليمانية باللغة الكردية على ان لا تتطرق في أبحاثها الى المواضيع الآتية:
١- السياسة وما تعلق بها.
٢- المباحث التي توجد المتفرقة الدينية أو القومية.
٣- الشخصيات وما يسمى بالآداب العامة.
ويجب ان تراعوا في اصدارها احكام قانون المطبوعات وتبعثوا بنسختين من كل عدد يصدر منها الى هذه المديرية حسب الأصول. ولكم الأحترام

مدير المطبوعات

هەروا لە ١٩٢٧دا ئیجازەی دەرکردنی (مجموعەی زانستی) درا. ئەویش هەر نەتوانرا جێبەجێ بکرێ. بڕوانە (ژیان) ژ (٥٧) ١٩٢٧/٣/١٠: (لە مدیریەتی مطبوعاتەوە ئەمجارە ئیجازەی دەرهێنانی مجموعەی زانستی بەسکرتێری جمعیەتی زانستی گەیشت. وەکو خیالی لێکراوە لە مجمعی (١٦) یا (٢٤) پەڕەدا بێ، هەر پانزە ڕۆژ جارێ، بەهیواین کە بەم نزیکانە بەمقالاتی مفیدەی زانستی و ئەخلاقی بخرێتە پێش چاوی خۆشەویستانی زانست و ئەدەب).

(٢) بەڵکو حوکومەت ڕێگای دەرکردنی گۆڤارێکیدا بەناوی (زانست)ەوە، بەڵام لەبەر هەر هۆیەک بێ ئەو گۆڤارە نەتوانرا دەربکرێ.

لەناو ئەو بڕوانامـانەدا پلەی زانیـارییـانمان لە وانەکـاندا تۆمـار دەکرد. ئەنجـامـەکـانی کـار و کـردەوەی (خوێندنگای نەهێشتنی نەخوێندەواریی) سەر بە(کۆمەڵی زانستیی کوردان) لە سلێمانیدا، زۆر گەورە و گرنگ دەرچوون. چونکە لە کۆڕەکانی (نەتەوەیی) و (نیشـتـمـانی) و (مرۆڤـایەتی)دا وریـابوونەوەیەکی وەهای خستە ناو دڵ و دەروون و مێشکی شاگردەکانیەوە، کە پاڵی پێوەنان هەر کەسەیان لە مەیدانی کار و پیشـەی خۆیدا پەرە بەبەرهەمی خۆی بدات و گـەشـەیشی پێ بکات. واتا لە (چاولێکەری)یەوە باز بدات بۆ (داهێنان). بێجگە لەوە هەمـوو شاگردەکانیشی وەها لێ کرد کە هەست بەبوونی خۆیان بکەن و، بەرگی کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆیان بپۆشن.

ئەمـەیش بەخـۆش دەزانم کـە بیگێـڕمـەوە: شـاگـردێکی منداڵ هاتە لای کـارگێـڕی خـوێندنگاکـەمـان، سکاڵای کرد گوتی: (لە کاتی پشوودا پێنووسێک و لاستیکێک و توورەکەیەک و دە فلسیان لێ دزیوم. هاتوومـە لات لە دزەکـەم بۆ بسـێنیـتـەوە). کـارگـێـڕی خـوێندنگای زانسـتـیی کـوردانیش دەمـودەست شـاگـردەکـانی پۆلی شـاگـردە منداڵەکەی کـۆکـردەوە. هەڕەشـەی لێکردن گـوتی: (یان ئەوەتا هەریەکـەتان چەشنی ئەو شتانەی دزراون بیانهێنن بۆ دەسگای خوێندنگاکەمان، یان ئەوەتا دزەکە ئەو شتانەی دزراون دەمودەست بیانهێنێ و بیانداتە دەست کارگێڕی خوێندنگاکە، یان ئەوەتا بێن دزەکەمان بۆ ئاشکرا بکەن. خۆ ئەگەر بێتو دزەکە ئەمەندە ئازا و سەربەست بێ، بێتە لامان، پێ بنێ لە تاوانی خۆی و، ئەو شتانەی دزراون بیداتەوە دەسـتـمـان. بام هیچ نەترسێ، ئێمـە چاو لە گـوناهی دەپۆشین، هەر لەبەرئەوەی کە تیژی بکەینە سەر (پەشیمانبوونەوە) لە گوناه و پاڵیشی پێوە بنێین بۆ کردەوەی مەردانە و ئازایەتی).

سەیر ئەوە بوو هەمـووی سـاتێکی پێ نەچوو، شـتـە دزراوەکـان هێنرانەوە و، درانە دەست کـارگـێـڕی خوێندنگای زانسـتـیی کوردان، ئەویش دایەوە دەست شـاگـردە منداڵەکەی سکاڵای هێنا بووە بەردەم. بەم ڕەنگە ئەم گیروگرفتە زوو بەزوو چارەسەر کرا و، لە شێوەیەکی سەیر و سەرسوڕهێنەریشدا بڕایەوە.

ئەمـەیش پێـویسـتـە بڵـێم: کـە زۆر کـەس لە شـاگـردانی ئەم خـوێندنگایە لەپاش دەرچوونیـان لە خـوێندنگاکـە، وازیان لە خـوێندن نەهێنا، بەوە تێـر نەبوون کـە سـەرەتای (خـوێندنەوە) و (نـووسین) و (ژمـێـر) فـێـربوون، چوونە ناو خـوێندنگا شـەوییـەکـانی مـیـرییـەوە و، درێژەیان بەخـوێندنەکـانیـان دا تا بڕوانامـەی هەرە بڵندیان وەرگرت و چوونە ڕیزی ئەو کـەسانەوە کە لە کار و پیشـەی خۆیاندا هەمـوودەم سەردەکەون.[٤]

خوێندنگای کۆمەڵی زانستیی

(خوێندنگاکەی کۆمەڵی زانسـتـیی کوردان) هەر لە سـەرەتاوە دوو جۆرە شاگردی تێـدا کۆبووبووەوە: هەندێکیـان هیچیان نەخوێند بوو، کە ئەمـانە بەشی زۆری شـاگردەکـان بوون. هەندێکیشـیان خوێندبوویان بەڵام بۆ زمـان فـێـربوون هاتبـوونە ناوی. لەبەرئەوە سێ پۆل کـرابووەوە، یەکـێکیـان بۆ زمـانی کـوردی، یەکـێکیـان بۆ زمـانی عـەرەبی یەکـێکیشـیـان بۆ زمـانی ئینگلیـزی. کـە پرسیم لەم و لەو: ئەوسـاکـە خوێندنگاکە چەند شاگردی تێدا جێ بوویووەوە؟. گوتیان: ژمارەی شاگردەکان لە ناوەند (١٥٠) کەس و (٢٠٠) کەسدا بوو.

کەواتە هەر هیچ نەبێ دەبێ شاگردەکان بەلای کەمەوە پێنج شەش ژوورێکیان داگیر کرد بێ. جا لەبەرئەوەی هەر ژوورەیش پێویستیی بەمامۆستایەک بووە کە وانەی تێدا بڵێتەوە، کەواتە دەبێ خوێندنگاکە، بێجگە لە کارگێر، پێنج شەش مامۆستای هەبوو بێ کە وانەی تێدا بڵێنەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا کە پرسیارم زۆر کرد، تەنیا ناوی چوار کەسم بۆ دەرکەوت کە لە ساڵی ۱۹۲٦دا وانەیان لە خوێندنگاکەدا گوتۆتەوە. ناوی ئەوانەیش ئەمانەیە: مامۆستا (فوئاد ڕەشید)، ئەلفبای عەرەبیی گوتۆتەوە. مامۆستا (ئەحمەدی عەزیز ئاغا)، ئەلفبای کوردی و ژمێری گوتۆتەوە. مامۆستا (سەعید قەزاز)یش ئەلفبای ئینگلیزیی گوتۆتەوە، بەڵام پارەی لە خوێندنگاکە وەرنەگرتووە، پێشکەش بەخۆی کردۆتەوە.[1]

وادیارە لە پاش چەند مانگێک هەندێ کۆسپ هاتۆتە بەردەمی خوێندنگاکە[2]، بۆیەکا ڕۆژنامەی (ژیان)، ساڵی (۱)، ژمارەی (۳۱)، ڕۆژی ۱۹۲٦/۹/۲، لە لاپەڕەی سێهەمیدا ئەم هەواڵە بلاو دەکاتەوە؛ دەڵێ:

(خەبەرێکی خۆش)[5]

(جەمعییەتی زانستیی کە شوعلەی ئومێدمانە، غوبارێکی زۆر جوزئیی لێ عاریز بوو بوو. جەنابی موتەسەرڕیفی (مەبەسی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگە)، مەعاریفپەروەر تەئمینی ڕەفعی ئەوەی کرد و، (خۆیشی تەئمیناتی سەحیحی دا زیاتر دەوام بکا و، تێبکۆشێ و بەو سوورەتە، بەهەوەسێکی باشتر لەپێشتر، جەمعییەت دەوامی فەعالییەت دەکا، لە ئیعتیباری ڕۆژی جومعەوە، هەموو ڕۆژ و شەوی جومعە و سێشەمموویەک، ئیجتیماعاتی عومومیی ئیجرا و (دومبەڵە)یش کەما فیسابیق دەوام دەکات. تەدریسات ئایا بۆ ئومی و ئایا بۆ خوێندەوارەکان ئەخرێتە شکڵێکی مونتەزەمترەوە و حاڵی حازر جەنابی (جەلال صائیب ئەفەندی) و (ئەحمەد حەمدی ئەفەندی)، هەریەکە دەرسی ئینگلیزی و دەرسی ئومیی سونفێکیان دەرعوهدە کردووە. بۆ سونفەکانی تریش قەریبەن مامۆستای ئەهل هەڵدەبژێرێ و تەعیین ئەکرێ. بینائەن عەلەیە ڕجامان لە هەموو مەعاریفپەروەران و تالیبانی عیلم و مەعاریف ئەمەیە کە ئایا بۆ دەرس و ئایا بۆ ئیشتیراک لەگەڵ جەمعییەتدا، مونتەزەمەن دەوام بفەرموون).

لەپاش یەک دوو ساڵێ ژیانی سەرکەوتووانە، داخەکەم کۆمەڵەکە و خوێندنگای زانستییەکە کەوتنە

---

(۱) تەعینی مامۆستا: بۆ تەدریسی لوغەی ئینگلیزی چەند موعەلمێکی بەمەعاش گرت، بەڵام سعید أدیب قزاز مەعاشەکەی ڕەفض کرد وە بەتەبەروع کردی بۆ جەمعیەت. هەینەت لە ۱۹۲٦/۵/۱٤ بەتەحریری سویاسیان کرد. ژیان: ژ (۱۷۱) لە ۱۹۲٦/۵/۲۰ سلێمانی.

(۲) هەر دوای دوو مانگ (ژیان) ئەم هەواڵە بلاو دەکاتەوە: (ئەعضا بۆ جمعیەت... غفور ئاغا، عضویەتی قبوڵ نەکرد لەبەر ئەسبابی ذاتی خۆی. جمال بەگ بابان وە شێخ مصطفی إستعفایان کرد. باقی ئەندامەکانی تر بەرێکوپێکی إجتماعیان نەئەکرد، لەبەرئەوە مصالحی جەمعیەت سکتەدار بوو). ژیان: ژ (۳۰) ساڵی (۱) ۱۹۲٦/۸/۲٦ سلێمانی.

کزبیەوە. چونکە دوو ئەندامی کارامە و کارگوزار و ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەریان لێ جیابووەوە. یەکەمیان: (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) بوو کە سەرۆکی کۆمەڵەکە بوو. دووەمیشیان: (جەمال بەگی بابان) بوو کە جێگری سەرۆکی کۆمەڵەکە بوو.

جێی داخە کە ئەم دوو پیاوە گەورەیە، لەپاش ماوەیەکی تەواو هاریکاری و هاوکاری لەگەڵ یەکتردا بۆ کەڵکی (کوردەواری) و (کوردستان)، ناوەندیان تێکچوو و، بەدگۆیان و هەلپەرستانیش ناگرەکەیان خۆش کرد، تا کەینەوبەینەکەیان گەیشتە ئەندازەیەکی وەها کە هەردووکیان بەناچاری لە سلێمانی جیابوونەوە. ئیتر بەم کارەساتە جەرگبڕە، کۆمەڵەکە و خوێندنگاکەی بێ باوک مانەوە. ئەگەر خۆشەویستیی دانیشتووانی شاری سلێمانی بەرامبەر (کۆمەڵەکە) و (خوێندنگاکە)ی بەهێز و هەڕەت نەبووایە، دەمێک بوو لەناو دەچوو. لەبەرئەوە زۆر کەس لە خوێندەواران، بەتایبەتی لە لاوەکانمان، سنگیان هێنایە پێشەوە بۆ فەرمانکردن لە خوێندنگاکەدا بێ ئەمەی داوای مانگانە بکەن. لەگەڵ ئەمەیشدا کە کۆمەڵەکە دەستی کورت بوو بوو، بەڵام ئەوەندەی هەر پێ دەکرا کە خۆی بپارێزێ لەسەر ئەنگرێبوون. دەیشیتوانی تا ئەندازەیەک پارە پەیدا بکات و بەخت بکات بۆ کاروبارە هەرە پێویستەکانی. ئەمەیش بوو بوو بەباو لە هاویناندا گەلێک لە لاوە بەنرخەکان کە دەهاتنەوە بۆ پشوودان بۆ سلێمانی یارمەتی خۆیان پێشکەشی (خوێندنگای زانستیی) دەکرد، بێ ئەمەی پوول و پارەیەک وەربگرن.

کە ساڵی ١٩٣٠ هات، (خوێندنگای زانستیی کوردان) تێکەڵ بەشۆڕشەکەی ١٩٣٠/٩/٦ بوو، کە داوای (مافی کورد)ی دەکرد لە فەرمانڕەوایی ئەوسای عیراق. خوێندنگا کە داخرا، گەلێک لە مامۆستاکان و شاگردەکانی گیران و خرانە بەندیخانەوە و ئازار دران.[١]

بەڵام لە ١٩٣١/٢/٢٥دا بەسایەی هەوڵ و تەقەلای (کەریم سەعید) و چەند پیاوێکی ترەوە، کە لای موتەسەریفی سلێمانی تکایان کرد، ڕێ درایەوە بە(کۆمەڵی زاستیی کوردان) سەرلەنوێ دەست

---

(١) سەبارەت بەبەشداریکردنی جەمعیەتی زانستی لە (ڕاپەڕینەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی ١٩٣٠/٩/٦، جێگای گومان نییە؛ چونکە ئەگەر ڕاستەوخۆ نەبوو بێ ئەوا لە ڕووی وشیارکردنەوەی سیاسیی نەتەوەییەوە زۆر کاریگەریی بووە، بەڵام وەک نووسراوێکی مامۆستا (مستەفا سەعید) باسی دەکا و خۆی لە دەمی زۆر لەوانەی بیستووە کە ڕابەرایەتی ڕاپەڕینەکەیان کردووە (رمزی فتاح افندی) وە یا هاوزەمانی بوون (مامۆستا ئەخۆلی شاعیر، مەلا محەمەدی کوردی و عمر عبدالرحیم) کە لەسەر ئەوە یەکبوون گوایە: (ڕۆژی ١٩٣٠/٩/٤ فایق بێکەس قوتابییەکانی زانستی لە سابونکەرانەوە هێنایە خوارەوە. بەدەوری سەرادا دانیشتن، نەشیدیان دەوت یا هیتافیان دەکێشا و قرە قربان دەکرد. لەپڕ سیارەکەی مفتشی ئیداری دەرکەوت، دایانە بەر هێلکە و تەماتە! لە ١٩٣٠/٩/٦ کە شەممە بوو، فایەق بێکەس شتێکی چڕیاند بەگوێی تۆفیق قەزازدا، پاش تۆزێک ورتە ورت لەگەڵ یەکتر، قوتابییەکانی زانستی و فایەق بێکەس لە بازاڕ کەوتنە دوکان داخستن بەخەڵق. بەشی زۆری خەڵق دوکانیان داخست و چوونە بەردەرکی سەرا). مامۆستا مستەفا کە خۆی ئێستا لە کالیفۆرنیای وڵاتە یەککرتووەکانە، ئەمەیم بەنووسراوی لای خۆم هەڵگرتووە.

بکاتەوە بەکارگوزارییەکانی خۆی. خوێندنگای زانستیی کوردان ٢٥/٢/١٩٣١دا کرایەوە. لە لایەن شارەوانیی سلێمانییشەوە دەست کرایەوە بەیاریدەدانی. لەپاش کردنەوەی خوێندنگا کە بەدوو شەو (١١٠) شاگرد کۆبوونەوە و هاتنەوە بەرخوێندن. سێ مامۆستایش خۆیان پێشکەش بە(کۆمەڵی زاستیی کوردان) کرد، کە بەخۆڕایی بەو شاگردانە بخوێنن. مامۆستاکان ئەمانە بوون:

(کەریم سەعید)، (فایەق بێکەس)، (ئەولا سامی)، کە بەڕاستی شایانی ئافەرین و سوپاسن. خوێندەوارانیش بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار و نووسراوانی هەمەڕەنگە، بەپۆل و بەتاکە تاکە ڕوویان کردەوە ناو ژووری خوێندنەوە و نووسراوخانەی کۆمەڵەکە.[٦]

لە ساڵی ١٩٣٣دا کە خودا لێخۆشبوو (پیرەمێرد) لێپرسراوی کۆمەڵەکە بوو، بەڕێوەبردنی خوێندنگاکەیان دایە دەست من. مانگانەیان بۆ بڕیەوە، بەڵام من پێشکەشی کۆمەڵەکەم کردەوە و لێم وەرنەگرتن. چەند مامۆستایەکیشم لەگەڵدا بوو مانگانەیەکی کەمیان وەردەگرت. یەکێکیان ناوی (عەبدورەحمان مفتی) بوو، ئەوی تریشیان (ئەبوبەکر هەوری)، لەگەڵ ئەوانە و چەند کەسێکی تردا ڕاوێژم کرد، دوایی بڕیارمان دا و وامان بەچاک زانی کە خوێندنگاکە هەر بۆ بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری بهێڵینەوە. چونکە شاگردەکان دەیانناڵاند لە دەست زۆریی وانەکانیان و سەختییان کە هەروەک پێڕەویی خوێندنگاکانی میرییان لێ کردبوو. بێجگە لەوە هەمووەمێکیش مامۆستای لێهاتوو و شارەزایان دەست نەکەوتبوو کە بتوانن ئەو وانانە بڵێنەوە. لەبەرئەوە وانەکانمان وا لێ کرد کە تەنیا بریتی بن لە سێ بابەت: (خوێندنەوە و نووسین) و (ژمێر) و (زانستی گشت لایی). من شەش مانگ لەم خوێندنگایەدا مامەوە. ئیتر چوومەوە بۆ خوێندن بۆ بەغداد.

ئەوەی لەو شەش مانگەدا بەخۆم و هاوڕێکانم کرا لە لاپەڕەکانی سەرەتای ئەم وتارەدا نووسیومن، پێویست نابینم دووبارەیان بکەمەوە. بەڵام ئەوەندە دەڵێم کە بێجگە لە ساڵی ١٩٣٣ لە زۆربەی ساڵەکانی تریشدا بەهاوینان وانەم بەشاگردەکان دەگوتەوە داخەکەم لە ساڵی ١٩٣٧دا هەمیسان خوێندنگای کۆمەڵەکە داخرایەوە. بەڵام لە ساڵی ١٩٤٢دا، لە سەردەمی موتەسەڕیف (بەهائەدین نوری)دا، ڕێ درایەوە بەکردنەوەی. ئەوانەی بوونە هۆی کردنەوەی خوێندنگاکە ئەم مامۆستا و لاوە بەڕێزانەبوون کە هەوڵیاندا بوو، خوێندنگاکە سەرلەنوێ بکرێتەوە:

مامۆستا (کەریم زەند، ئەبوبەکر هەوری، نوری شاوەیس، موحەڕەم موحەممەد ئەمین، موحەممەد شێخ مستەفا، محەممەد تۆفیق عەزیز، نوری محەممەد ئەمین، فایەق هوشیار، هادی محەممەد خوێفرۆش، قادر عەبدورڕەزاق). لەمانەدا هی وایان تێدا بوو هەمووەمێ وانەی دەگوتەوە. هی وایشیان تێدا بوو هاوینان لە بەغداد دەهاتەوە و وانەی دەگوتەوە. مامۆستا (کەریم زەند) و (ئەبوبەکر هەوری) و (محەممەد تۆفیق عەزیز) و (موحەڕەم موحەممەد ئەمین) لەو مامۆستایانە بوون کە هەمووەمێ بوون. ئەو دە لاوە لەناو خۆیاندا (مامۆستا کەریم زەند)یان هەڵبژارد بەکارگێڕی خوێندنگاکە هەر دەیشیان بەرامبەر موتەسەڕیفی سلێمانی لێپرسراوبوون. لەم خوێندنگایەشدا هەر شەش پۆلەکەی خوێندنگای سەرەتایی هەبوون. بەڵام چونکە زۆربەی شاگردەکان نەخوێندەواربوون، زۆرتر بایەخیان بەنەهێشتنی نەخوێندەواری دەدا. هەموو

مامۆستاکانیش بەخۆڕایی وانەیان دەگوتەوە. هەر کامێکیشیان بچووایەوە بەغداد بۆ خوێندن، لاوان هەبوون جێگایان پڕ دەکردنەوە.

لە ساڵی ١٩٤٤ - ١٩٤٥دا (خوێندنگای کۆمەڵی زانستیی کوردان)، بەبڕیارێکی تایبەتیی میری، کرا بەخوێندنگایەکی شەوی سەرەتایی کوڕان، ناوی نرا (قوتابخانەی زانستیی ئێواران). ئیتر لەوساکەوە خوێندنگاکە لە لایەن میرییەوە کاروباری دەبرێت بەڕێوە و پارەی تێدا بەخت دەکرێت. ئەمەیش لەسەر دەستی خودا لێخۆشبوو (مارف بەگ جیاووک)دا جێبەجێ بوو کە ئەوەدەمە موتەسەڕیفی سلێمانی بوو.[٧]

## گۆرانی زانستی

(١)

وا وەرن، وا وەرن، کۆمەڵی لاوان
یەککگرین، پێش بخەین زانستیمان
زانستی جێگای عیلم و عیرفانە
شوێنی ڕووناکی و ژینی کوردانە
وا وەرن لاوەکان یەککگرین، یەککگرین
زانستی ڕاگرین

(٢)

یاریدەی لاو نەبێ، کۆششی لاو نەبێ
هەوڵ و کۆششمان شەو لەگەڵ ڕۆژ نەبێ
بۆ بڵندکردنەوەی زانستی کوردان
ناگرین جێگەمان، ون دەکەین نیشتمان
وا وەرن لاوەکان، یەککگرین، یەککگرین
زانستی ڕاگرین

(٣)

ئیمڕۆ لاوی هەموو میللەتی سەرزەمین
هەوڵ ئەدەن بۆ بلاوکردنەوەی زانین
بۆیە وا بەرزن و گەورە و دووربین
ئێمە پاشکەوتووی دەستی نەزانین
وا وەرن لاوەکان، یەککگرین، یەککگرین
زانستی ڕاگرین

له ساڵی ۱۹۳۳دا بەدەنگێکی خۆش و ئاوازێکی پڕ سۆزەوە هەموو شەوێک لە (خوێندنگای زانستیی کوردان)دا لاوەکانمان بەدەنگێکی خۆشەوە دەیانگوت ئنجا دەچوونە ژوورەکانەوە بۆ خوێندن.[1]

## جێگای کۆمەڵی زانستیی کوردان لە دڵی نەتەوەی کورددا

(کۆمەڵی زانستیی کوردان)، لە دڵی نەتەوەی کورددا، جێگایەکی بەرز و پیرۆزی بۆ خۆی داگیر کردبوو. چونکە لە ماوەیەکی کەمدا توانی کەڵکێکی زۆر گەورە و گرنگ بگەیێنێت بەنەتەوەی نەژادی کورد. (خوێندنگای زانستیی)ی کردەوە بۆ بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری، بۆ فێرکردنی زمانانی (کوردی) و (عەرەبی) و (ئینگلیزی) بەخوێندەواران. هەموو هەفتەیەک وتاری ڕۆشنبیری دەدا بەگوێی جەماوەرانی کورددا.[1] (نووسراوخانەی زانستیی)ی کردەوە بۆ خوێندەواران و پڕی کرد لە ڕۆژنامە و

---

(۱) ئەم هۆنراوەیە شاکر فەتاح خۆی دایناوە، لە (پرشنگ)دا ناوی ناوە (بانگی زانستی) کە لە ۱۹٤۷دا لە بەغدا چاپکراوە، هەرچەندە ئەم پارچە شیعرەی مامۆستا بووە سروودی مارش ئامێزی جەمعیەتەکە و ناوێشی دەرکرد، بەڵام پیرەمێردی شاعیریش لە لای خۆیەوە (نەشیدی زانستی) دانا و لە (ژیان)دا بەم شێوەیە بڵاوی کردەوە: (نەشیدی زانستی - لەسەر وەزنی کە کێ دەڵێن دەشت و کێو شینە-)

نیشتمانمان کە دایکی دڵسۆزە
سەری ڕێکخست بەلەعل و پیرۆزە
نەوبەهار هاتوو جەژنی نەورۆزە
سەیری سەحرا کە ڕۆژی بەهرۆزە
خوایە ئاوا بێ ئەم بەرو و هۆزە
تێگەیشتووین بەفەیضی زانستی
پێگەیشتووین بەمایەی هەستی
شەرتە هەرچی کە دایکمان ویستی
دەستەبەر بین و تیا نەکەین سستی
تا بەخوێندن دەگەینە سەربەستی
نەوجەوانانی کوردی پڕ جەوهەر
دەوری دەوران بووە بەدەوری هونەر =
= ئەورووپا ڕێی فنونی گرتە بەر
ئێوە کارێ کە بیگرن ئەیبەنە سەر
حەیفە ناوتان نەنێن وەتەنپەروەر

(ژیان: ژ (٤٧٢) لە (۱۹۳٦/۳/۲۱).

(۱) ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ، ئەوەیە کە ئەو دەورەی جەمعیەتی زانستی لەو سەردەمەدا بینی، پاشتر و لە داهاتوودا هیچ کۆمەڵە و ڕێکخراوێکی ڕووناکبیری و ئەدەبی لە شارەکەدا نەیتوانی جێگای بگرێتەوە: چ لە ڕووی وشیارکردنەوە و نەهێشتنی نەخوێندەواری و ڕێنماییکردنی خەڵکەوە لە بوارە کۆمەڵایەتی و =

گۆڤار و نووسراوانی هەموو جۆرە زمانێک کە پەیوەندییان بەکوردەوە هەیە. شاگردێکی کوردی لەسەر ئەرکی خۆی ناردە ئەوروپا بۆ وەرگرتنی خوێندەواریی هەرە باڵا تا کوردستانی پێ ئاوا بکاتەوە. بۆ گەلێک شاگردی کوردی هەژار و داماو مانگانەی بڕییەوە بۆ ئەمەی بتوانن بێنە خوێندنگاکانی میری، لە سلێمانی و جێگایانی تردا بخوێنن. گالی دا بۆ پاککردنەوەی (نووسینی کوردی) لە وشەی بێگانە. هەوڵی دا (بەرهەمی) زانا و بوێژ و نووسەر و هونەرمەندەکانمان کۆبکاتەوە، تا لە شێوەیەکی زانستییانەدا چاپیان بکات. یارمەتی (خوێندنگای سەرەتایی کوڕانی سلێمانی)ی دا لە (لاساییکردنەوە)دا بۆ ئەمەی بەدەسکەوتی ئاهەنگەکان ئەو خوێندنگایە و (خوێندنگای کچانی سلێمانی) بۆ کەڵک و پێشکەوتنی خۆیان بەختی بکەن. (پاداش) دەدا بەو شاگردانەی لە (خوێندنگای زانستیی کوردان)دا بەباشی لە تاقیکردنەوەکاندا دەردەچوون. شاگردەکانی خوێندنگای زانستیی کوردانی ڕادەهێنا بەنووسینی وتارەوە، بەوتاردانی سەربەستانەوە، بەگۆرانی گوتنەوە، بەوەرزشەوە، بەبەرهەم داهێنانەوە، بەگیانی کوردایەتی و نیشتمانی و مرۆڤایەتییەوە، بەپێشکەوتنی ڕاستەقینەوە لە کار و پیشە و بیرکردنەوە و ڕەووشت و کرداری مەردانەدا.

ئەمانە و (کۆمەڵی زانستیی کوردان) گەلێک کار و کردەوەی بەرز و پیرۆزی تری کردبوو بەئامانج بۆ خۆی، بەتەکانەوە هەوڵی دەدا جێبەجێیان بکات، وەک دەرهێنانی ڕۆژنامە و گۆڤار و نووسراوانی پێویست بەزمانی کوردی بۆ کەڵکی کوردەواری. بەڵام داخەکەم نەگەیشتە ئەو ئامانجانەی.

هەروەها وەک هەوڵدان بۆ نزیک خستنەوەی نەتەوەی کورد و فەرمانڕەوایی عیراق لە یەکتری، تا نەتەوەی کورد بەئامانجە بەرز و پیرۆزەکانی خۆی زووتر بگات.

جا لەبەر ئەم کردەوە بڵندانەی (کۆمەڵی زانستیی کوردان)ە بوو، کە نەتەوەی کورد بەگەورە و بچووکییەوە، بەدەوڵەمەند و هەژارییەوە، بەخوێندەوار و نەخوێندەوارییەوە، بەهاوارییەوە دەهات و، یارمەتی دەدا و، باربووی دەکرد، چ لە کاتی شەنگوشۆخی و دەسەڵاتیدا، چ لە کاتی تەنگانە و کزی و لاوازی و گیروگرفتەکانیدا، هەر بۆ ئەمەی بمێنێ و لەناو نەچێ و، (کوردەواری)یش بەئامانجەکانی خۆی بگەیێنێ.

=تەندروستی و ئابووری و... هتد.

ڕۆژنامەی (ژیان) بەردەوام چالاکییەکانی ئەو جەمعیەتەی بڵاو دەکردەوە، بۆ نموونە لە سێ ژمارەیدا باس لە هەندێ لەو چالاکییانەی دەکات:

١- هەفتەی دوو جار کۆنفرانس ئەدرێ (ناوی وەقت و ناوی محاضرە لەپێشا بەجیا اعلان ئەکرێ. (ژیان: ژ ١٥ - ١٩٢٦/٥/٦).

٢- بەقصدی تنویرکردنی خەڵکی، دکتۆر حمدی محاضرەیەکی لەسەر (صحە) دا لە ئێوارەی جمعە ١٩٢٦/٥/٢٨. (ژیان: ژ ١٨ - ١٩٢٦/٥/٢٧).

٣- محاضرەیەکی جمال بەگ بابان لەسەر تەشکیلاتی محاکم لە عیراقدا وە ڕوونکردنەوەیەک لەسەر تەشکیلاتی محکەمەکانی سلێمانی. لە بنای زانستی لە ١٩٢٦/٦/٤. (ژیان: ژ ٣٩ - ١٩٢٦/٧/١٥).

(کۆمەڵی زانستیی کوردان) نزیکەی (١٩) ساڵ لە ناوەند هێزداری و دەسەڵاتداری و، کزی و لاوازیدا، ئەم دیو و ئەو دیوی دەکرد. ڕۆژگاری ئەو سەردەمە و هەڵەکانی خۆمان نەیانهێشت بژێنی. بەڵام ئەو گیانە پاک و نەژادەی (کۆمەڵی زانستیی کوردان) بەخشیی بە(کوردەواری)، هەرگیز لەناو ناچێ و، تا دەمێنین، هەمووممان، بۆ ئەو ئامانجە بەرز و پیرۆزانە تێدەکۆشین و خەبات دەکەین کە ئەو بۆی داناوین.

ئیتر ڕێز و سوپاس بۆ گیانی پاکی ئەو پیاوە گەورانەمان کە (کۆمەڵی زانستیی کوردان)یان دامەزراند و بەڕێیانەوە برد و، یاریدەیان دا. ئەمە بوو بەپوختەیی مێژووی (کۆمەڵی زانستیی کوردان) کە هەتا دەمێنین بەتاسوقەوە یادی خۆی و کردەوە و کارەکانی دەکەین.

(شاکر فتاح احمد)
(خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد)
سلێمانی: (١٧ - ٧ - ١٩٨٥)

پەراوێزەکان:[١]

(١): بڕوانە: (پرۆغرامی جەمعییەتی زانستیی کوردان)، لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا، ژمارە (١١)، ساڵی ١٩٢٦، ل (١ و ٢ و ٣).

(٢): بڕوانە: (کردنەوەی جەمعییەتی زانستیی کوردان)، لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا، ژمارە (١٢)، ساڵی ١٩٢٦، ل (١و ٢ و ٣ و ٤).

(٣): بڕوانە: (هەیئەتی ئیدارەی جەمعییەتی زانستی کوردان)، لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا، ژمارە (١٣)، ساڵی ١٩٢٦، لاپەڕە (٣).

(٤): بڕوانە: (صفحات مشرقە من تأریخ مكافحە الامیە فی کردستان) لە گۆڤاری (ئۆتۆنۆمیی)دا، ژمارە (٥)، ساڵی ١٩٧٨، لاپەڕە: (٣).

(٥): بڕوانە: (خەبەرێکی خۆش)، لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا، ژمارە (٣١)، ساڵی ١٩٢٦، ل: (٣).

(٦): بڕوانە: نووسراوی (خەباتی ڕۆشنبیران)، لاپەڕە (٩) و (١٠)، لە نووسینی (شاکر فتاح).

(٧): زانیاری لە بابەت کردنەوەی خوێندنگاکەوە لە ساڵی ١٩٤٢دا لە مامۆستا (کەریم زەند) وەرگیراوە. سوپاسی دەکەم.

---

(١) ئەم پەراوێزانە نووسینی مامۆستا خۆیەتی کە وەک دەستنیشانکردنی سەرچاوەکانی باسەکەی دایناون.

## پرشنگی ئازادی[1]

١٩٨٥

**ئەم نووسراوە:**

بۆیەکا ئەم نووسراوەم ناو ناوە (پرشنگی ئازادی) کە هەروەک لە ناوەڕۆکی وتارەکانمدا دەردەکەوێ: گەلێک جار (ڕۆژی ئازادی) پرشنگی پەخشان کردووە بەسەر کورد و کوردستاندا و ڕووناکی و کامەرانی و سەربەرزی و خۆشگوزەرانی پێ بەخشیوون.

بەڵام چونکە نەمانزانیوە چۆن ئەو (ئازادی)یە بپارێزین، دیسانەوە کەوتووینەتەوە شەوەزەنگی زۆرداری و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەوارییەوە.

هەموو نەتەوەیەک لە توانایدا هەیە (ئازادی) دەست بکەوێ، پرشنگی ئەو ئازادییەش پێشکەوتن و کامەرانی و سەربەرزی و خۆشگوزەرانی پێ ببەخشێ و ئازادیەکەیشی بپارێزێت، بەڵام بەمەرجێ پێڕەوی (یاسای خودایی) بکات و لەو ڕێگایە لانەدات، کە هەر ئەو ڕێگایە هەیە بۆ (پێشکەوتن)ی ڕاستەقینەمان ببات، ئەمەیش بە(خوێندەواری) نەبێ سەرناگرێ.

خوێندەواریش هەر بریتی نییە لە زانایی؛ کردەوە و ڕەوشتی پاک و چاک و جوانیشی دەوێ.

ئێمەیش کە کوردەوارین -نەتەوەی کوردین. ا. ب- بۆ ئەمەی بگەین بەئامانجی پیرۆز و بەرزمان، پێویستە هەرچییەک دەکەین لەسەر بنچینەی زانست و، کردەوە و کاری چاک و پاک و بڵند و، دادپەروەری بیکەین. (خواپەرستی)یش هەر وامان پێ دەڵێ کە (مرۆڤایەتی)یش دەگرێتەوە لەگەڵ (کوردپەروەری) و (نیشتمانپەروەری)دا. جا ئەم بابەتانە کە بەتەواوەتی لە وتارەکانمدا ڕۆشن کراونەتەوە، هیوادارم خوێندەوارە بەڕێزەکان کەڵک و خۆشییان لێ وەربگرن.

ئیتر ئەمەندە و سوپاسی کاربەدەستانی ئەو دەسگایانە دەکەم کە ئەو کۆڕانەیان بۆ ئامادە کردم و، توانیم تێروپڕ بیروباوەڕی خۆمیان تێدا دەرببڕم بۆ کەڵکی گشتیی.

شاکر فتاح

(خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد)

(سلێمانی): ٨ - ٩ - ١٩٨٥

---

(١) ئەم نامیلکەیە کاتی خۆی دراوە بە(ڕەقابە)ی چاپەمەنی لە بەغدا؛ لە ١٩٨٥/٩/٢١ ڕێگای پێدراوە، بەڵام هەندێ ڕستە و پەرەگرافیا لێ قرتاندووە و نیشانەیان کردووە بە(یحذف)... دیارە ئێمە لێرەدا وەک خۆیان دامانناوەتەوە. کاتی خۆی هەرسێ بابەتەکە لە کۆڕی جیاوازدا پێشکەش کراوە:

١- ڕێگایەک بۆ پێشکەوتن: لە زستانی ١٩٨٣ لە هۆڵی کرێکارانی سلێمانی.

٢- نەورۆز: لە بەهاری ١٩٨٥ لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی چاودێریکردنی نەوجەوانانی کوڕان و کچان لە سلێمانی.

٣- یادداشتەکانی ڕەفیق حیلمی: لە هاوینی ١٩٨٥ لە هۆڵی کرێکارانی سلێمانی، دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بۆ مامۆستا و چەند کەسێکی تری لە نووسەران ڕێکخستبوو.

# رێگایەک بۆ پێشکەوتن

**(خودا پەرست بین چاکترە یان خۆ پەرست؟)**

ئێمەی (کوردەواری) کەوا دەزانین نەتەوەی کورد لە هەموو نەتەوەکانی تر ئیسلامترە بەهەڵەدا دەچین. چونکە ئەگەر وا بووایە، دەبوو ئێمەیش لە نەتەوە موسڵمانەکانی تر کەمتر نەبووینایە!... لە ڕاستیدا (ئیسلامەتیی ڕووالەتی) جوێیە، (ئیسلامەتیی ڕاستەقینە)یش جوێیە. هەموو کەس دەتوانێ بەدرۆ نوێژ بکات و، حەج بکات و، ڕۆژوو بگرێت. هەموو کەس دەتوانێ بەدرۆ مێزەری سپی لەسەر بکات و، کەشیدەی زەرد ببەستێتە پشتی و، شاڵی سەوزیش لە بەر بکات. هەموو کەس دەتوانێ، بەدرۆ، پرچ و ڕیش و سمێڵی دەروێشانە بهێڵێتەوە و، ڕست (تەزبێح)ی دەنک زل بەدەستەوە بگرێت و، بەتەپڵ و دەفیشەوە گۆرانی ئایینی بڵێ. بەڵێ، هەموو کەس دەتوانێ لای کەسانی ناشیی و نەزان، تا ماوەیەک بەهۆی ئەم جۆرە کردەوانەیەوە، خۆی وا پێشان بدات کە پیاوێکی موسوڵمانە، یاخود ئافرەتێکی خوداناسە. بەڵام ناتوانێ هەتا سەر ئەم درۆزنییەی خۆی و، ئەم خەڵک چەواشەکردنەی خۆی، بشارێتەوە. چونکە کاتێک بەخۆی دەزانێت، کەسانی شارەزا و جیهان دیو و، وت و وریای تووش دەبێت، کە دەکەوێتە کردەوە و کار و گەشتوگوزارەوە لەگەڵیاندا، لەپڕ درۆزنی و چەواشەکردنەکەی دەردەکەوێ و ئابڕووی دەچێ. ئەوساکە کەس بەئیسلامەتییەکەی بڕوا ناکات...

خودا هەر داوای کردەوەی چاکمان لێ ناکات. نیازی پاکیشی لێمان دەوێ. باوەڕکردنیشی لێمان دەوێ: بەخودا و، بەپێغەمبەرانی خودا و، بەنووسراوانی خودا و، بەفریشتانی خودا و، بەچەندوچوونکردنی خودا لەگەڵ مرۆڤدا، لەپاش زیندووکردنەوەیان لە لایەن خودا خۆیەوە. هەروەها ئەوەیشی لێمان دەوێ: کە هەر چاکەیەک دەکەین، بەنیازی دڵخۆشیکردنی خوداوە بیکەین و، لە هەر خراپەیەکیش خۆمان لادەدەین، لە پێناوی دڵڕاگرتنی خودا و لە ترسی خودا و، لەبەر دڵخۆشکردنی خودا خۆمانی لێ لابدەین. بەکورتی خودا چاکە بۆ پیاوی دووڕوو و ناپاک و خودانەناس پەسەند ناکات. لەبەرئەوە دەبێ: (دڵ) و (دەم) و (دەست)مان لە خوداناسیدا یەک بێ، ئنجا خودا کردەوە چاکەکانمان بۆ پەسەند دەکات.

ئێمەی کوردەوارییش، هەرچەندە گەلێک کەسانی وامان تێدا هەڵکەوتووە، کە لە هەموو سەردەمێکدا، بەخوداناسی تەواو و ئیسلامی تەواو دادەنرێن. بەڵام داخەکەم زۆربەمان، بەتایبەتی زۆربەی دەسەڵاتدارەکانمان، هەر لەگەڵ (خۆپەرستی)ی خۆیاندا خەریکبوون و، بەڕووالەت نەبوو بێ، (خوداپەرستی)یان نەکردووە!... کامیان دەسەڵاتی هەبووە، یاخود بۆی لوواوە، ناپاکی لەگەڵ نەتەوەکەی خۆیدا کردووە. نەتەوەی چەوساندۆتەوە و ڕووتاندۆتەوە و، زۆر و ستەمی لێ کردوون و، دزی لێ کردوون و، گزی لێ کردوون و، ئازاری داون، کە ئەم جۆرە کردەوانەیش لە (خۆپەرست) نەبێ ناوەشێنەوە. لەبەرئەوە دەتوانم بڵێم: هۆی هەرە گەورەی (پاشکەوتن)مان هیچ نییە ئەوە نەبێ کە زۆربەمان (خۆپەرستی) بەکار دەهێنین، نەک (خوداپەرستی).

خۆپەرستی و خوداپەرستی لە یەک جیاوازن:

لە ڕاستیدا (خوداپەرستی) و (خۆپەرستی) تەواو پێچەوانەی یەکترین.

لە (خوداپەرستی)یەوە: نیشتمانپەروەری و، گەلپەروەری و، مرۆڤ دۆستی و هەموو چاکەخوازییەک و، هەموو کردەوەیەکی پاک و پیرۆز و، هەموو ڕەوشتێکی جوان و ڕەنگین دەوەشێتەوە، لەگەڵ گیانی (دادپەروەری)دا.

لە (خۆپەرستی)یەوە: هەموو کردەوەیەکی گەنگ و نەنگ و ناپەسەند دەوەشێتەوە، لەگەڵ (زۆرداریی)دا.

(خوداپەرستی): بۆ پێشکەوتنمان دەبات.

(خۆپەرستی): بۆ پاشکەوتنمان دەبات.

(خوداپەرستی): سەربەرز و کامەرانمان دەکات.

(خۆپەرستی): سەرشۆڕ و سەرگەردانمان دەکات.

## منداڵەکانتان لە خۆپەرستی دوور بخەنەوە

لەبەرئەوە تکا لە باوک و دایک و مامۆستا بەڕێزەکانمان دەکەم: چەندیان لە دەست دێت واتای (زۆرداری) و (داگیرکەری) و (کۆنەپەرستی) و (ڕەگەزپەرستی) و (هاوبەشی = الأشتراکیە) و (بەشداری = الشیوعیە) و (خوداناسی) و (خوداپەرستی) و (پێشکەوتنخوازی) و (مرۆڤ دۆستی) بۆ منداڵەکانمان ڕوون بکەنەوە و، وێنەیان لەسەر ئەو کردەوە و کارانە و، ئەو بیروباوەڕانە و، ئەو یاسایانە، بۆ بهێننەوە، تا منداڵەکانمان هەر لە ئێستاوە چاک و خراپ لە یەکتر جوێ بکەنەوە و، دۆست و دوژمنی نەتەوەکەی خۆیان بناسن و، فرمانی سەرشانی خۆیان بەرامبەر هەریەکەیان بزانن و جێبەجێ بکەن.

هەروەها بایەخیش بدەن بەوەی (گیانی خۆپەرستی) لە دڵ و دەروون و مێشکی منداڵەکانمان لە ڕەگ و ڕیشەوە بهێننە دەرەوە. چونکە لە ڕاستیدا دوژمنی ڕاستەقینەی نەتەوەکەمان لەناو دڵ و دەروون و مێشکی خۆماندایە. ئەگەر بمانتوانیایە بەتەواوەتی هۆگری (خوداپەرستی) ببین و، خۆیشمان لە (خۆپەرستی) دوور بخەینەوە، هەتا سەر بەئازادی و سەربەرزی و خۆشگوزەرانی و کامەرانییەوە دەژیاین. نە جەنگمان تووش دەبوو و، نە سەرشۆڕی. نە سەرگەردانمان تووش دەبوو و، نەماڵوێرانی.

کەواتە ئەگەر بمانەوێ نەتەوەکەمان (پێش بکەوێ)، پێش هەموو شتێک پێویستە ڕێگەی (خوداپەرستی) بگرین و، لە (خۆپەرستی)یش، خۆمان دوور بخەینەوە. چونکە هەروەک لە سەرەتاوە پێشانمان دا، (خوداپەرست) بین چاکترە لەوەی کە (خۆپەرست) بین.

## (خوداپەرستی) و (خۆپەرستی) لە مێژوودا

(فیرعەون) خۆپەرست بوو. نەتەوەکەی خۆی ئازار دەدا و زیانی پێ دەگەیاند و، دەیچەوساندەوە و، دەیڕووتاندەوە، بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆی. (مووسا) خوداپەرست بوو. وازی لە سایە و پایە و مایە هێنا

و، هەمـوو هێز و تواناییـیەکی خـۆی بەخت کـرد، بۆ ڕزگـارکـردنی نەتەوەکـەی خـۆی لە دەست زۆرداری فیرعەون و دەس و پێوەندەکانی، کە یەکێک لەوانە (قارووون)ی خزمی مووسا خۆی بوو!... لەسەر ئەوە فـیرعـەون بوو بەدوژمنی مووسـا و نەتەوەکـەی مـووسا. بەڵام مـووسـا چونکە خـودای لەگـەڵ بوو و، ڕێی پیشـان دەدا، توانی بگاتە ئامـانجی خـۆی: شـەوێک لە ناکـاو نەتەوەکەی خـۆی ڕزگـار کـرد و لە سنووری میسـریش دەربازی کرد. بەڵام فیرعـەون کە بەخۆی و هەمـوو لەشکرەکەیەوە دوایان کەوت تا ڕێیـان پێ بگرێت و لەناویان ببات نەیتـوانی بگاتە ئامانجی خۆی، بەخۆی و لەشکرەکەیەوە لە زەریای سووردا نوقوم بوون و خنکان.

(جەنگیزخان) و (تەیموری لەنگ) و (هۆلاکۆ)یش کە هەموویان دیلی دەستی (خۆپەرستی)ی خۆیان بوون، دوایی خۆیان و فەرمانڕەواییە زۆردارەکانیان بەڕیسوایی ناو مێژووەوە لەناوچوون.

(ناپلیۆن)یش کە خۆپەرستییە بێ ئەندازەکەی پاڵی پێوە نا، ئەو هەموو خاکە گەورانەی دراوسێکانی فەرەنسە بگرێت، دوایی لە خاکی ڕووسیادا تێشکا و خۆی و لەشکرە بێ شومارەکەیشی بەنابووتییەوە گەڕانەوە بۆ فەرەنسـە، کە زۆری پێ نەچوو، لە ڕێگادا دوژمنەکانی کـە بریتی بوون لە لەشکرانی خـاکە داگیـرکـراوەکـان و نـەتەوە زۆر لێکراوەکـان تەنگیـان پێ هەڵچنی و شکاندیان و، بەسـەرگـەردانییـەکی تەواوەوە بەدیلی دوور خرایەوە بۆ دوورگەی (سەنت هێلانە).

(هیتلەر)یش کە ئەو هەموو خاکانەی ئەوروپای بەزۆر داگیر کرد، لە ئەنجامدا خۆی و نیشتمانەکەی لە ناپلیۆن و فەرەنسەیان خراپتر بەسەرهات!...

(سەلاحەدینی ئەییووبی)، کە شاهێکی کورد بوو، لە سایەی خوداناسییەکەیەوە بوو کە توانی بچێتە جەنگی (٢٢) دەوڵەتەوە و، بەرگـەیشـیـان بگرێت و، بەسـەریشـیـاندا زاڵ ببێت. ئەو بەوە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی تا چەند سەد ساڵێک لە دەست داگیرکەرانی خۆپەرستانی ئەوروپا ڕزگار کرد و دوور خستەوە.

(کەریم خانی زەند)یش کە شاهێکی کورد بوو، هەروەها لـە سایەی خوداناسییەکەیەوە بوو، کە توانی هەشت ساڵی خشت بچێتە جەنگی ئەو هەموو سەردارە خۆپەرستە زۆردارانەی ئێرانەوە و، زاڵیش ببێ بەسەریاندا و، نەتەوەکانی ئێران لە دەست چەوساندنەوە و، ڕووتاندنەوە و، ئازاردان و، زیان لێدان ڕزگار بکات و، ژیانێکی پڕ دادپەروەری و خۆشگوزەرانی و کامەرانییان بۆ ماوەی (٢٨) ساڵ پێ ببەخشێ.

(فیـرعەون) و (قارووون) و (جەنگیزخان) و (تەیموری لەنگ) و (هۆلاکۆ) و (ناپلیۆن) و (هیتلەر)، خۆپەرستییـەکـەیان بوو، تووشی جاڕسکردنی هەمـوو جیـهانی کردن و، لە مـێژوودا ناویان بەخـراپەکـار دەبرێ.

بەڵام (مـووسا) و (سەلاحەدینی ئەییـووبی) و (کەریم خانی زەند)، ئەوەتی جیـهان تێیان گەیشـتووە، ناویان بەچاکەکـار دەبرێ و جێگایان لە دڵی هەمـوو دەروون ئازادێکی جیـهاندا کـردۆتەوە بۆ خـۆیان و، مێژووی ئادەمیزادیش شانازییان پێوە دەکات.

هەروەها لە مـێژووی ئێـراندا (کـیسـرا نەوشیـرەوان)، کە شـاهێکی کورد بووە، ناوی بەدادپەروەری و چاکـەخـوازییـەوە دەبرێ. بێ گـومـان ئـەویش دادپەروەری و چاکـەخـوازییـەکـەی لە سـەرچاوەی

خوداناسیـیـەکـەیەوە هەڵقـوڵاوە. ئەگینا پیـاوی خـۆپەرست دادپەروەری و چاکەخـوازی لێ ناوەشێـتـەوە (شێخی سەعدی) کە پیاوێکی زرنگی زانا و تێگەیشتووی کورد بوو، بەهۆنراوە لە نووسراوە نایابەکەیدا کـە ناوی ناوە (گـوڵسـتـان) سـتـایشی (نەوشیـرەوان) دەکـات و ناویشـی بەچاک دەبات. بەڵام ناوی (قارووون) بەخراپ دەهێنێ.

دوو خاوەن شکۆی تریشـمـان ماوە لەم کۆڕەدا ناویان بهێنین. یەکێکیان ناوی (عـومـەری خەتتاب)ە. یەکێکیشیان ناوی (عومەری عەبدولعەزیز)ە. ئەم دوو موسوڵمانەیش مێژووی ئیسلامیان بەخوداناسی و دادپەروەرییـەکەیان ڕازاندۆتەوە. داخەکـەم هەردووکیـان بەدەسـتی ناحەزانی (خـۆپەرست) کـوژراون، کە مێژوو هەتا دەمێنێ ئەو پیاوکوژانە لە مرۆڤایەتی کەنەفت دەکات.

## هۆی خۆپەرستی

جا ئەم (خۆپەرستی)یە داخەکـەم هەر لە سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤـەوە، تا ئێـسـتـا هـەر لە ئارادایە. بووەتە هۆی بەرپابوونی (ناکـۆکی) و (دووبەرەکی) و (دوژمنایەتی) و (شـەڕوشـۆڕ). بووەتە هۆی سەرگەردان بوون و، ماڵوێرانی و، ڕیسـوایی ئادەمـیزاد. لەناو هەمـوو نەتەوەیەکـیشـدا هەیە. لە هەمـوو شوێنێکی جیهـانیشدا هەیە. دیارە ئێمەیش کە (کورد)ین بەشی خۆمان لەو خۆپەرستییە پێ براوە. هەر هۆی ئەوەیشـە کە وەها پاشکەوتوو و ماڵ کاولین. لەبەرئەوە بەپێویستی دەزانم ئەوەندەی پێم زانیـوە، لە هۆی ئەم (خۆپەرستی)یەمان لێکۆڵینەوەی خۆمتان بخەمە بەردەم. هەر نەتەوەیەک دوور کەوتبێـتەوە لە خوێندەواری، واتا لە (زانین) و (ڕەوشت و خووی چاک) و (کـردەوەی پەسـەند)، بێ گـومـان تووشی ئەم دەردی (خۆپەرستی)یە دێت.

دایک و باوکی ناشی، لەبەر نەزانی خـۆیان و کـۆڵەوارییـان لە هونەری پەروەردەکـردندا، نازانن تا چ ئەندازەیەک نازی منداڵەکانیـان بکێشن. تا پێیـان دەکرێ نازیان دەکێشن و، خۆشەویسـتی لە ئەندازە بەدەر بەرامبەریان دەنوێنن؛ هەر بۆ ئەمەی لە گریان ژێریان بکەنەوە، یاخود لە گرۆزیی دووریان بخەنەوە. لە جیاتی ئەمەی فێری ڕێزگرتنیان بکەن بەرامبەر مافی کەسانی تر و، بەرامبەر مافی گشتی و، بەرامبەر یاسا و دەستووری خودایی، دەچن لە هەموو کار و کردەوە و ڕەوشت و خوویەکی خراپیان چاو دەپۆشن و، بێ دەنگ دەبن، هیچ سزایەکیـان نادەن، هیچ سەرزەنشـتێکیان ناکەن، هیچ چارەسەرێکی هەڵەکـانیان ناکەن. بێجگە لەوە لەناو خێزان و لەناو کۆمەڵایەتییەکەیشماندا ئەوەندە پیاوی خوداناس و کار دروست و، دادپەروەر و خاوەن بەزەیی نابینن کە چاویان لێ بکەن. جا کە گەورە دەبن، بە(خۆپەرستی)یەوە گەورە دەبن، کە هەرچی زۆرداری و کردەوەیەکی نەنگ و ناپەسەند هەیە، لێی دەوەشێتەوە.

## چارەکردنی خۆپەرستی

ئەم دەردەیش بەدوو شت چارە دەکرێت:

١ - بەپەروەردەکـردنی منداڵەکانمان لەسـەر دەسـتی پسـپـۆڕانی دڵسـۆز و شـارەزادا. ئەمـەیش کـارێکی گـەورە و گـرنگە، لەسـەر دەسـتی فـەرمـانڕەواییـدا نەبێ پێک نایەت. پارەیەکی زۆر و ڕەنجـێکی زۆر و

پشوویەکی درێژیشی دەوێت، کە هیوادارم ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ نەتەوەکەمان پێک بێت.

٢- پیاو و ئافرەتەکانیشمان، کە لە تەمەنی منداڵی تێپەڕیون، بەتایبەتی ئەوانەیان کە بەخوێندەوار و کوردپەروەر دادەنرێن، بڕیارێکی مەردانە دەربکەن بۆ خۆیان، کە سەرلەنوێوە پەروەردەی دڵ و دەروون و هۆشی خۆیان بکەنەوە. بەڵام ئەمجارە لەسەر بنچینەیەکی (خوداناسی) بێ، کە پیاو دوور دەخاتەوە لە هەموو خراپەکارییەک و، پیاو دەخاتە سەر هەموو چاکەخوازییەک. هەموو کەس دەزانێ (چاکە) چییە و، (خراپە) چییە!... دەبا بڕیار بدەین هەرچی (چاکە)یە بیکەین و، هەرچی (خراپە)یە نەیکەین. بام هەموو شەوێک جارێک لەژێر پێخەفەکانماندا چەند و چوون لەگەڵ خۆماندا بکەین. لە شەو و ڕۆژی پێشووماندا چی چاکمان کردووە و چی خراپمان کردووە بیهێنینە بەرچاومان ئەگەر کردەوەی چاکمان کردبوو: ئافەرینی خۆمان بکەین. ئەگەر کردەوەی خراپیشمان کردبوو: سەرزەنشتی خۆمان بکەین، یاخود سزای خۆمان بدەین. ئەم بڕیار و کردەوە جوانانە کە زۆر دووبارە کرانەوە، کار دەکەنە دڵ و دەروون و هۆشمان. کار دەکەنە ڕەوشت و کردەوە و خوومان. ڕۆژێک دێت بەتەواوەتی لە دەست (خۆپەرستی) ڕزگارمان دەبێت و (خواپەرستی) لەناو دڵ و دەروون و هۆشماندا جێگیر دەبێ و بنج دادەبەستێ. ئیتر ئەوساکە بەجارێک ژیانمان دەگۆڕێت و، کۆکی و دۆستایەتی و برایەتی لەناوماندا سەردەگرن.

کە ئەوانەیش پێکهاتن ژینمان لێ دەبێت بەشایی. چونکە نە شەڕوشۆڕ و ئاژاوە بەرپا دەبن لەناوماندا و، نە تووشی سەرگەردانی وماڵوێرانی دەبین. ژیانمان پڕ دەبێ لە سەرکەوتن و تەندروستی و خۆشگوزەرانی و کامەرانی.

## چەند نموونەیەکی خۆپەرستیمان

زۆربەی منداڵەکانمان خۆشی لەوە دەبینن کە بەدارلاستیک چۆلەکە بکوژن. کە گڵۆپەکانی شارەوانی بشکێنن. کە هەڵبگەڕێن بەسەر دیواری ماڵاندا، بۆ ئەمەی بەدزییەوە میوە لە درەختەکانیان بکەنەوە. کە گڵۆپ و شووشەی خانووەکانیان بدزن و بشکێنن. کە تۆپ تۆپێنە لە ناوەڕاستی شەقامە گشتییەکاندا بکەن. کە ڕووی دیواری خانووەکانیش بەنووسینی ناڕەوا و ناشیرین ڕەش بکەنەوە.

زۆربەی دوکاندارەکانمان و ئەوانەی لە دانگی ئەواندان خۆشی لەوە دەبینن کە بەنرخێکی یەجگار گران شت بەکڕیارەکانیان بفرۆشن، یاخود کاریان بۆ بکەن. کە پێچەوانەی نرخی میری شت بفرۆشن. کە خواردەمەنی و کەلوپەلی پێویست دەریاز بکەن بۆ دەرەوەی نیشتمانەکەیان، تا بەگرانتر بیانفرۆشن. یان دەستدرێژی بکەن بۆ سەر سامانی گشتی و ئاسایشی گشتی و مافی گشتی.

ئەمانە و گەلێکی لەمانە خراپتریش ڕوویان داوە و ڕوو دەدەن لەناوماندا، وەک بەرتیل وەرگرتن و، قۆپیەکردنی هەندێ شاگردان و، یاخی بوونیان لە مامۆستاکانیان و، بایەخ نەدانی هەندێ لە فەرمانبەران بەفرمانەکانیان و، سەندنی سەرقفلانە و، فرۆشتنی کرێی دوکانە بەکرێ گیراوەکان بەدزی خاوەنەکانیانەوە، بەپارەیەکی یەجگار زۆر... وەک پوول پەرستی هەندێک لە نەوت و گاز و چەمەنتۆفرۆشەکان و، ڕازدزی (جاسووسی)ی هەندێکمان بۆ بێگانە و، نۆکەرییان بۆ دوژمنانی نەتەوە و

نیشتمانەکەمان و، زۆرداری برا گەورە لە خوشک و براکانی و دایکی و، یاخیبوونی کوڕ و کچەکان لە دایک و باوکیان، یاخود کەمتەرخەمییان بەرامبەریان. جا ئەمانەیش، هەموویان لە یەک سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن، کە ئەوەیش ئەوەیە خومان گرتووە بە(خۆپەرستی)یەوە. کەی توانیمان، هەموومان خۆمان لەم دەردە کوشندەیەمان لابدەین، کەی توانیمان خۆمان بکەینە (خوداپەرست) کە سەرچاوەی هەموو کردەوە و کارێکی مەردانەیە، ئەو کاتە ڕوو دەکەینە (پێشکەوتنی ڕاستەقینە). بەڵێ وایە. (خوداپەرستی) تەنیا ڕێگایەکە، کە دەمانگەیێنێ بە(پێشکەوتنی ڕاستەقینە).

## ئەنجام

لە ئەنجامی وتارەکەمدا تکاتان لێ دەکەم، قسەکانم بام توندوتیژیش بوو بن، دڵتان نەڕەنجێ. چونکە قسەی ڕاست و ڕەوان کە بۆ کەڵکی گشتی بێت، خودا فەرموویەتی بیکەین... ئەم قسانەی منیش لە ڕووی دڵسۆزیەوەیە دەیکەم... خودای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: (قولوا الحق ولو علی انفسکم). واتا: (بام قسەکەتان زیانی بۆ خۆیشتان تێدا هەبێ هەر ڕاست بڕۆن). هەروەها تکایشتان لێ دەکەم پێشنیازەکەم پەسەند بکەن کە دەڵێم: (بام واز لە خۆپەرستی خۆمان بهێنین و، مل بدەینە خوداپەرستی) و کاریشی پێ بکەین. چونکە من خۆشی ئێوەم دەوێ و ئازادی و کامەرانی و خۆشگوزەرانیتان، کە ئەگەر بەقسەم بکەن، پێی دەگەن.

ئیتر خۆشی ئێوە و ئازادیتان بۆ داوا دەکەم لە خودا، براکانم.

# نەورۆز

## نەورۆز جەژنی ڕاستەقینەی کوردە

نەورۆز جەژنی ڕاستـەقـینەی کوردە. جـەژنێکی پیرۆز و بەرزیەتی. چونکە بەر یەکەم ڕۆژی بەهار و سەری ساڵ دەکەوێت. لەم ڕۆژەدا هەموو ساڵێک (کوردستان) لە زەبروزەنگی زستان ڕزگاری دەبێت و، دەکەوێتە ناو بەهەشتی بەهارەوە، کە ژیانی گیانلەبەر و گژوگیا و درەخت و گوڵ سەرلەنوێ تازە دەبێتەوە و، کاروباری کشتوکاڵ و، دەرامەتی تر دەست پێ دەکاتەوە.

شەوی ئەم جەژنە لە هەموو لایەکی کوردستاندا ئاگری نێڵە نێڵ دەکرێتەوە. پیاو و ژن، کوڕ و کچ و منداڵ بەدەوریدا گرد دەبنەوە. بەگۆرانی و هەڵپەڕکێوە ڕادەبوێرن. بەیانی لە هەموو لایەکەوە بەزموڕەزم و ئاهەنگ و زەمـاوەند دەست پێ دەکـرێت دووکـان و بازاڕ هەڵدەگـیـرێت. هەمـوو کـار و فـرمـانێک دەوەستێنرێت. کوردەکان بەرگی جوان دەپۆشن و خۆیان دەڕازێننەوە. خواردەمەنی خۆش دروست دەکەن و، دەسـتـە دەسـتـە ڕوو دەکـەنە دەرودەشت. بەسـەیران و گـەشت و گـەڕانەوە ڕۆژ ئاوا دەکـەنەوە. منداڵانی خوێندنگا کۆنەکانیش بەخۆشی ئەم جەژنەوە، هەریەکە لە لایەن مامۆستای خۆیەوە، (نەورۆز نامە)یەکی بۆ دەنووسـرێـتـەوە، کـە لەبەری بکات و، لە بەردەم دایک و باوکی خـۆیدا بیـخـوێنێـتـەوە. ئەوانیش شاباشێک بەخۆیان و پاداشێک بەمامۆستاکانیان دەدەن، بەڵام شاگردانی خوێندنگا تازەکان لە هەموو لایەکی (کوردستان) و ئەو شوێنانەدا کە کوردیان تێدا کۆبۆتەوە، ئاهەنگ و زەماوەندی گەورە و ناوازە و نایاب، بەبۆنەی (جەژنی نەورۆز)ەوە دەگێڕن.

لەوێدا هەرچی گەورە پیاو و خوێندەوار هەیە لە (کورد) و لە بێگانە بانگ دەکەن. ئەو ڕۆژە بەگوتنی وتار و گۆرانی و لێدانی ساز و ئاواز و، هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەکی کوردانە و، خواردنی خۆرشتی نایابەوە و، گەمەوگەپ و یارییەوە، کاتی خۆیان بەسەر دەبەن. گیانی نیشتمـانپەروەری و برایەتی و سەربەستی و خـۆشگوزەرانی زیندوو دەکـەنەوە. بۆ پێـشـخـسـتـنی (کـورد) و (کـوردسـتـان)یش دەمـاری مـەردایەتی نیشتمانپەروەران دەبزوێننەوە.

### سەرگوزشتەی جەژنی نەورۆز

جەژنی (نەتەوەی کورد) یاخود (نەورۆز)، سـەرگوزشـتـەیەکی خۆشی هەیە. سا سەرگوزشـتـەکە لە بنجـوبناواندا ڕاست بێت، یان درۆ، مـەبەست نیـیـە. بەڵام هەرچی چۆنێک بێت، ئەوە دەگـەیێنێت، کـە (نەتەوەی کورد)، لە هەمـوو دەمـێکدا (مەرد) و (ئازا) و (ئازادیپەروەر) بووە. ئەم شۆڕشانەیش کە لە تەمەنی درێژی خۆیدا بەدەیان جار هەڵیگیرساندوون دژی (زۆرداری) و، بۆ دامەزراندنی (دادپەروەری)، نیشانەی ڕاستی قسەکە من.

ئەوەندە هەیە، جارێکیان ناوی پێشەوای شۆڕشەکە (کاوە) بووە، جارێکیشیـان ناوی (کەی ئاخسـار) بووە، جارێکیـشـیـان ناوی (کەریم خـانی زەند) بووە، جارێکیـشـیـان ناوی (سـمکۆی شـوکـاک) بووە،

جارێکیشیان ناوی (قازی محەممەد) بووە، ئەم جارەیش ناوی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)ە کە دژی زۆر و ستەمی فەرمانڕەوایی وەستاوە.[1]

وا دەگێڕنەوە کە چەند هەزار ساڵێک لەمەوپێش لە کوردستانی ئێراندا، شاهێکی بێگانەی زۆردار، هەڵکەوتووە؛ ناوی (بیوراسپ) یاخود (ئەژدەهاک = ضحاک) بووە.

گەلێک زۆر و ستەمی لە کوردەکان کردووە. دوو ماری گەورەی بووە، پەرستوونی. هەر ڕۆژەی دوو کەسی بۆ سەر بڕیون و مێشکیانی دەرخوارد داون. (کوردەکان) لەمە گەلێک بێزار دەبن و لەوە بەولاوە ناتوانن بەرگەی ئەو بەدکارییەی بگرن. لەناویاندا: ئاسنگەرێکی ئازا و مەرد و ژیر پەیدا دەبێ، ناوی (کاوە) دەبێ. بەزەیی بەهاوخوێنەکانی خۆیدا دێتەوە. دەچێت هانە هانەی هاونیشتمانەکانی خۆی دەدات. پێستەکەی بەرۆکی کە لە ئاسنگەریدا بەکاری دەهێنا دەکات بە(ئالا). بەخۆی و ئالاکەیەوە پێشیان دەکەوێت و، دەدات بەسەر سەرای (شا)دا. شا دەگرێت و دەیخاتە زیندانەوە. لە جێی ئەو شازادەیەکی کوردی سەرڕاست و نیشتمانپەرست و دادپەروەر کە ناوی (فەرەیدوون) دەبێت، لەسەر تەخت دادەنێت و دەیکات بە(شا). بەم ڕەنگە (کوردەکان) ئەو ڕۆژە دەکەن بە(جەژنێکی گەورە) و بەرز و پیرۆز، ناوی دەنێن (نەورۆز). جا بەرێکەوت ئەو ڕۆژە بەر سەری ساڵ دەکەوێ کە (٢١)ی مانگی ئاودار (ئاذار) دەگرێتەوە.

### فرمانی سەرشانمان لە جەژنی نەورۆزدا

لە (جەژنی نەورۆز)دا پێویستە پیاو هەتا پێی دەکرێ خۆش ڕاببوێرێ. خۆشی بدات بەدڵی خۆی و، خۆشییش بدات بەدڵی کەسانی تر. چونکە (نەورۆز) جەژنێکی پیرۆزی کوردە. (کورد) لەم ڕۆژەدا بووە کە هۆشی هاتۆتەوە بەر خۆی و، ڕۆژی ڕەش و تاریکی، لە ڕۆژی ڕووناک جیا کردۆتەوە... لە ڕۆژێکی وەک ئیمڕۆدا بووە کە (نەتەوەی کورد) خۆی لە دەست دوژمنێکی زۆرداری ستەمکار ڕزگار کردووە و، کەوتووەتەوە ڕۆژی ئازادی و سەربەستی و کامەرانی پێشووی خۆیەوە. واتا ئیتر خۆی خۆی بەڕێوە بردووە و، ئەو فەرمانڕەواییە گەورەیەی بۆ خۆی دامەزراندووە و، ژیانێکی پاکتر و چاکتر و بڵندتری بۆ خۆی بەرهەم هێناوە.

ئێمە نابێ ئەوەیشمان لەبیر بچێ کە (ڕۆژی نەورۆز)ەکانمان بەهەل بزانین بۆ ئاشتکردنەوەی ئەو کەسانەی دڵمان شکاندوون، یاخود دڵی یەکترییان شکاندووە. هەروەها لەبەر پیرۆزی (جەژنی نەورۆز) دەستی (یارمەتی) و (باربوو) و (پیتاک) بۆ داماوان و لێ قەوماوان و هەژاران و سەرگەردانانی نەتەوەکەمان بکێشین. بێجگە لەوە هەوڵ بدەین بۆ بەرهەم هێنانی پرۆژەیەکی وەها کە بە(گەلە)، کۆمەکیی بکەین و کەڵکی گشتیی کوردەواری تێدا بەئەنجام بگەیێنین.

---

(١) دەبێ خوێنەر سەرنجی ئەوە بدات کە باسەکە لە ساڵی ١٩٨٥دا نووسراوەتەوە و ئامادە کراوە. باری سیاسی و ڕەوشی ئەو کاتەی کوردستانی ئێران ڕەچاو کراوە.

## ئایینی ئیسلام دژی نەورۆز نییە:

هەر لەبەرئەوەی کـە (جـەژنی نـەورۆز) پەیوەندی بە(بزووتنەوەی ئازادیخـوازانەی کـورد)ەوە هەیە، کاربەدەستانی فەرمانڕەواییە داگیرکەرەکانی کوردستـان بەپێچەوانەی ئایینی پاکی ئیـسلام، هەندێک لە (مەلا خۆفرۆشەکان)یان هانە هانە دەدا، کە بەچاو و ڕاو و چەواشەکاری (نەتەوەی کورد) وا تێبگەیێن، کە (جەژنی نەورۆز) جەژنێکی سەردەمی ئاگرپەرستانە و، دژی ئیـسلامەتییە. لەبەرئەوە نابێ (جەژنی نەورۆز) بکرێ. کەچی لە زاناکانی خۆمانم بیستووە کە لە کۆڕی خوداناسی و ئایینی ئیسلامدا جێی باوەڕن، نە (محەممەد پێغەمبەر)، خودالێیخۆش بێ جەژنی نەورۆزی قەدەغە کردووە، نە (خەلیفە)کانی پاش خۆی. تەنیا (عومەری عەبدولعەزیز)ی (ئەمەوی) بۆ دوو سێ ساڵێک قەدەغەی کرد. (خەلیفە)ی عەبباسییش (موتەوەکیل) ماوەیەک قەدەغەی کرد. بەڵام لە پاشان قەدەغەکەی هەڵگرت.(١)

مەلایەکی زانا و خوداناسی وەک (ئەحمەدی خانی)، سێ سەد ساڵێک پتر لەمەوپێش لە چیرۆکە ناوازەکەیدا کە ناوی ناوە (مەم و زین)، لە شێوەیەکی شاکارانە و ناوازەدا، جەژنی نەورۆزی سەردەمی (مەم) و (زین)مان پیشان دەدات. ئەگەر (جەژنی نەورۆز) ناڕەوا بووایە و دژی ئایینی پاکی ئیسلام بووایە، چۆن ئەو دەیتوانی بەو ڕێز و خۆشەویستییەوە لە جەژنی نەورۆز بدوێ؟!...

تا ئەم سەردەمەیش لە جەژنی نەورۆزدا (نەورۆز نامە) بەپێنووسی مەلا خوداناسەکانمان دەنووسرایەوە و، دەدرایە دەست شاگردەکانیان تا لە بەردەمی باوک و دایکیاندا بیخوێننەوە. ئەگەر (جەژنی نەورۆز) ناڕەوا بووایە و، دژی ئایینی ئیسلام بوەستایە، چۆن ئەم مەلایانە دەیانوێرا ئەو تاوانە بخەنە ئەستۆی خۆیان؟!...

خودا لێیخۆش بوو، بوێژی بەناوبانگ، (پیرەمێرد)، کە پیاوێکی خوداناس و حاجییش بوو، بیرمە لە شەوی ١٩٣١/٣/٢٢دا لە سلێمانیدا، لای (باخی پووره بەگی)یەوە، بەیادی (جەژنی نەورۆز)ەوە ئاهەنگێکی گێڕا. لە هەموو پیاوە گەورەکانی شاری سلێمانی بانگ کردبووە ئەوێ. بەئاهەنگ و زەماوەندەوە تا دەمێکی درێژ ڕایانبواردبوو لە لایەن دوو سێ کەسەوە وتار خوێندرا بووەوە. بەگۆرانییەکی جوانیشەوە کە (پیرەمێرد)، خۆی، هۆنراوەکانی بۆ هەڵبەستبوون، شاگردەکان شادمانییان خستبووە دڵی هەموو ئەو کەسانەوە کە لەوێدا بووبوون بەڵام لەبەر ڕەشەبا نەیانتوانی بوو (ئاگری نەورۆز) بکەنەوە. جا لەبەرئەوەی هۆنراوەکەی (حاجی تۆفیقی پیرەمێرد) نرخێکی مێژوویی و وێژەیی هەیە، حەز دەکەم بۆتانی بخوێنمەوە، فەرموون گوێی لێ بگرن:

گۆرانیی نەورۆز:

مـــوژدە بێ ســـاڵ گـــەڕایەوە

ئـاگـــری (نـەورۆز) کــــرایەوە

---

(١) گۆڤاری کاروان، ژمارە (٦)، ل (٤٠)، کورتە باسێک لەسەر نەورۆز - حوسێن ڕەشوانی.

بەفـــری زســـتـــان تـووایەوە
گـــژوگـــیـــا و گـــوڵ ژیایەوە
(نوخـشــە بێ لە کـوردی هەژار)
گــوڵ لە باغـــدا خـــۆی دەنوێنێ
بولبـــول بەڕوویـدا دەخـــوێنێ
هــەور مـــــــرواری دەپـڕژێـنــێ
شـــەمـــاڵ زیندەگـــانی دێنێ
(نێرگس مـەستە و چاو بەخـومار)
وا فـــەرشی چیـــمـــەن ڕاخـــرا
گـــــوڵاڵـە بـوو بـەشـــــەوچرا
گــوڵ دەســـتـەیان بەست وەک برا
نەســـرین و لاولاو تێـکخـــزا
(هاتنە لەنجــــە ســـەروو چنار)
بـولبـــــول شــــەو بەئاواتـەوە
بـادەی شـــــەونم دەخـــــواتـەوە
دەڵـــێ: وا (نـــەورۆز) هـــاتـــەوە
یـــەزدان دەروو بـــکـــاتـــەوە
(ئێـمــەیش پێی بکەوینە بەهار)

### ئاگری نەورۆز موژدەی دادپەروەری دەدات

جەژنی نەورۆز، جەژنێکی نەتەوەیی کوردە. فری بەسەر هیچ ئایینێکەوە نییە. هەرچی ئاگرەکەیشێتی، کە ناشییەکان وا دەزانن، کەلەپووری ئاگرپەرستانە، پێیەوە نووساوە، لە ڕاستیدا بۆ ئەوە داهاتووە کە ئەوانەی ئاهەنگ و بەزمەکە لە شەوی نەورۆزدا دەگێڕن، ئەگەر شەوەکەی سارد بوو، خۆیانی پێ گەرم بکەنەوە، ئەگەر شەوەکەی تاریکیش بوو، ئەو ناوەی ئاهەنگەکەی تێدا دەکەن ڕووناکی بکەنەوە. ئاگریش کە لەسەر لووتکەی شاخەکان دەکەنەوە، بۆ ئەوەیە کە هەموو کەس تێبگەیێن کە سبەینێ جەژنی نەورۆزە، تا هەر کەسە فرمانی خۆی بزانێ و بەجێی بهێنێ.

هەروەها ئاگرەکان ئەوەیش دەخەنەوە یادی کوردەواری، کە باو و باپیریان توانیویانە لەو ڕۆژەدا خۆیان لە تاریکیی ناشـێـتی و زۆرداری کـاربەدەستـانی خـراپ ڕزگـار بکەن و، خـۆیان بخـەنە ڕووناکی تێگەیشتوویی و، دادپەروەریی کاربەدەستانی چاکەوە.

لە بیرمە لە ساڵی ١٩٥٤دا (سەعید قەزاز) کاربەدەستێکی کاروباری ناوخۆی چاک و دادپەروەر بوو، کوردێکی دڵسۆز بوو هاتە کایەوە، بەندە لەو کـاتەدا جێ نشـینی موتەسەڕیفی هەولێر بووم، هەرچەندە

نەریتی کاربەدەستیی ناوخۆی پێش خودا لێخۆشبوو سەعید قەزاز وا بوو کە مەیدان نەدات لە هیچ شار و بازێر و گوندێکی کوردستاندا ئاهەنگ بۆ جەژنی نەورۆز بکرێ. بەڵام ئەو بەئاسانی ڕێی داین ئاهەنگمان بۆ جەژنی نەورۆز لە شاری هەولێر و بنکەکانی ناوچەکانی هەولێردا بەشۆخوشەنگییەوە گێڕا، تەنانەت توانیمان لە هەندێ جێگایشدا وەک شاری (شەقلاوە) ئافرەتیش لە ئاهەنگەکانماندا بەشدار بکەین، کە ئەو ساڵانە ئافرەت تێکەڵ بەئاهەنگی پیاوان نەدەبوون، خودا و ڕاستان مامۆستا (عەونی یوسف) لە هەولێردا ئاهەنگەکەی بەجوانی بردە سەر، هیچ گیروگرفتێکمان لە هیچ لایەکدا نەهاتە بەر. لە فەرمانڕەواییشەوە هیچ گلەییەک لە ئاهەنگەکانمان نەکرا.

## یاداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی

یاداشتەکانی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)، ئەوەندەی دەستم کەوتوون بریتین لە شەش بەرگ، کە کۆمەڵەی لاپەڕەکانیان دەگاتە (٦٣٧) لاپەڕە. لەسەر قاقەزی ڕۆژنامە چاپ کراون، کە لە بەژن و باڵادا بەناوونجی دادەنرێن. لە بەغداد، لە چاپخانەی (مەعاریف)دا چاپ کراون لە ١٩٥٦/٧/٢٥دا دەست بەچاپکردنیان کراوە، لە ١٩٥٨/٤/١٥دا لە چاپکردنیان بۆتەوە. چاپکردنەکانیان جوانە، نووسراوەکانیش پڕن لە وێنەی ئەو کەسانە و ئەو شوێنانەی پەیوەندییان بەشۆڕشەکانی (شێخ مەحموود)ی گەورەوە هەیە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕەنجێکی زۆری لە داڕشتنی ئەم یاداشتانەیدا داوە. هەوڵێکی زۆریشی داوە کە نووسراوەکانی بەکوردییەکی پەتی بنووسرێن و، لە شێوەیەکی وایشدا بنووسرێن، کە سووک و ئاسان و ڕەوان بن بۆ خوێندنەوە و، هەموو خوێنەرێکیش خۆشی لە خوێندنەوەیان بچێژێ و، کەڵک و سوودێکی تەواویش لە بابەت مێژوو و بەسەرهاتی (کورد) و (کوردستان) و (جیهان)ەوەی دەست بکەوێ. لە ڕاستیدا یاداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەسەرچاوەیەکی گرنگ و بەنرخ و ناوازە و نایاب دادەنرێن، بۆ مێژووی (کورد) و (کوردستان) و بەتایبەتی بۆ مێژووی شۆڕشەکانی (شێخ مەحموودی گەورە) چونکە خودا لێخۆشبوو، هەموو کەل و قوژبنێکی ئەو شۆڕشانە و ئەو کارەساتانەیش کە پەیوەندییان بەو شۆڕشانەوە هەیە و قەوماون لە جیهاندا، بەتەواوی ڕۆشنیان دەکاتەوە. لەبەرئەوە پیاو کە یاداشتەکانی مامۆستای بەڕێز، (ڕەفیق حیلمی)، دەخوێنێتەوە، هەست بەزاخاوێکی مێشک و ئارامێکی دڵ و ئاسایشێکی دەروون دەکات، نایەوێ وازیان لێ بهێنێ تا تەواویان دەکات. هۆی ئەمەیش ئەوەیە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی خەباتی کردووە و چۆتە بنج و بناوانی هەموو شتێکەوە کە پەیوەندییان بەشۆڕشەکانەوە هەیە، تا ڕاستییشی بۆ دەرنەکەوتبێ وازی نەهێناوە. ئەو ڕاستییانەیش کە دەستی کەوتوون، لە شێوەیەکی تەڕ و تازە و ناوازەدا، بەسەربەستییەکی بێ ئەندازەوە دەربڕیوون، کە دڵی ڕاستیپەرستان خۆش دەکەن و سەریشیان دەهێننە سەرسوڕمان. مامۆستا ڕەفیق زۆر هەوڵی داوە کە بێ لایەن کارەساتەکان پێشان بدات، کەسایەتییەکان دەربخات. تەنانەت لە گەلێ جێگادا پێ لە هەڵەکانی خۆیشی دەنێ و، سەرزەنشتی خۆیشی دەکات و، پەشیمانی لە کردەوەکانی خۆیشی ئاشکرا دەکات. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی هەروەک زانا بوو، دانایش بوو، بوێژ و وێژەوان و ڕاستیپەروەر بوو. حەزی دەکرد بەم یاداشتانەی ڕاستی شۆڕشەکانی

کوردەواری و، بەجۆرێکی تایبەتی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی گەورە لە کوردستانی عێراقدا پێشانی ڕۆشنبیرانی کورد و هەموو جیهان بدات. تا لەمەندە زۆرتر درۆ و چاو و ڕاوی دوژمنانی (کورد) و (کوردستان) کە لە بابەت شۆڕشەکانی کوردەوە کردوویانە، ڕاستی لە کاربەدەستان و ڕۆشنبیرانی جیهان نەشارنەوە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە یاداشتەکانیدا ناپارێزێ لە کەس، لە هیچ فەرمانڕەوایی و نەتەوە و کاربەدەستێکیش سڵ ناکات، قسەی ڕاستی خۆی هەر دەکات. لە جێگای خۆیدا چاک بێ دەیڵێ، خراپیش بێ هەر دەیڵێ. تەنانەت بەرامبەر خۆیشی و دوژمنەکانیشی چیی چاک هەبێ و چیی خراپ هەبێ، بێ پەروا بەسەربەستییەکی بێ ئەندازەوە دەیڵێ. تەنانەت ئەگەر یەکێک هەڵەیەکی ئەوی دەرخستبێ، بێجگە لەوەی هەڵەکەی خۆی ڕاست دەکاتەوە، سوپاسی ئەو کەسەیش دەکات و، هەڵەکەی خۆیشی بۆ هەمووان ئاشکرا دەکات. لە ڕاستییشدا مامۆستا لە ڕووی پەرچڤەی هەندێک وشە و واژەی بێگانانەوە، هەروەها لە ڕووی (ڕێنووس)یشەوە، لە ڕووی هەندێک ڕووداویشەوە، لە چەند جێگایەکی کەمدا بەهەڵەدا چووە. بەڵام ئەو خۆی تکا لە خوێنەران دەکات کە لە هەڵەکانی ئاگاداری بکەن تا هەڵەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە. بەڵام ئەو هەڵانەی کە مامۆستا کردوونی ئەوەندە کەمن، لە نرخی یاداشتەکانی کەم ناکەنەوە. چونکە یاداشتەکانی پڕن لە ڕاستیی و، ڕاستییش دڵی هەموو تێگەیشتوویەک و پێگەیشتوویەک کێش دەکات.

## لەسەر شۆڕشەکانی کورد دەکاتەوە

(ناحەزان) و (دوژمنانی کورد) و (فەرمانڕەواییە داگیرکەرەکان) وای بۆ دەست دەدات کە هەموو شۆڕشەکانی کورد بەدناو بکەن بەوەوە کە بەفیتی دەوڵەتە بێگانەکان هەڵگیرسێنراون. کە پێشەواکانی شۆڕشگێرەکانیشمان چاوبرسێتی و سایە و پایە و مایە کێشی کردوون بۆ هەڵگیرساندنی ئەو شۆڕشانەمان، نەک دڵسۆزی بۆ (کورد) و (کوردستان).

بەڵام مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەسەر شۆڕشەکانی کورد دەکاتەوە. لە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان و ئاشکرادا، بەبەڵگە و بروانامەی مێژووییەوە، دەریدەخات، کە شۆڕشەکانی کورد هەموویان لەبەر زۆر و ستەمی فەرمانڕەواییە داگیرکەرەکانی (ئێران) و (تورکەکانی عوسمانی) و (ئینگلیزەکان) بەرپابوون. هەروەها شۆڕشگێڕانی کوردیش نوێنەری هەموو (نەتەوەی کورد) بوون بۆ ئەوە شۆڕشەکانیان بەرپا کردووە، کە لە زۆر و ستەمی ئەو داگیرکەرانە کورد و کوردستان ڕزگار بکەن. بۆ نموونە: شۆڕشەکانی (شێخ مەحموودی مەزن) چ بەرامبەر بەتورکەکانی عوسمانی چ بەرامبەر بەئینگلیزەکان، بەفیتی کەس و هیچ دەوڵەتێک هەڵنەگیرساون تەنیا بۆ دەستکەوتنی سەربەخۆیی بۆ کوردستان و ڕزگارکردنی کوردەواری لە دەست زۆرداریی و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری بەرپابوون. ئەمە ڕاستە (شێخ مەحموودی گەورە) خۆی نزیک خستۆتەوە لە کاربەدەستانی عوسمانی و ئینگلیزەکان، بەڵام بۆ ئەوە خۆی لێ نزیک خستوونەتەوە تا لە ڕێگایەکی کورت و ڕاست و نزیکەوە و لە شێوەیەکی شیرین و بێ وەیدا ئاواتەکانی کوردەواری بهێنێتە دی. بەڵام کە (شێخ) ئەوەی بۆ دەرکەوتووە، کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتانە، پەیمانی خۆیان ڕاناگرن و (مافی کورد) دەخەنە لاوە و پێ شێلی دەکەن، لێیان ڕاست بۆتەوە و چووە بەگژیاندا تا

ناچاریان بکات دان بەمافی نەتەوایەتیی کورد و کوردستاندا بنێن. شێخ مەحموود پیاوێکی لێهاتوو و ئازا و بەجەرگ بووە، لە کانگای دڵییەوە حەزی بەسەربەرزی کورد و ئاوەدانی کوردستان کردووە، بێجگە لەوە هەموو گیان و سامانی خۆی لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی کورد و کوردستاندا بەخت کردووە. ئنجا مامۆستا ڕەفیق حیلمی، بۆ بەڵگە قسەکانی شێخ مەحموود دەگێڕێتەوە، کە بەوپەڕی سەربەستی و ئازاییەوە، لە بەردەم دادگای سەربازی ئینگلیزەکاندا لە بەغدادا کردوویتی و، هورووژمی بردۆتە سەر خۆیان و دەوڵەتەکەیان کە ناهێڵن مافی کورد، بەپێی ئامۆژگارییەکانی (ودرۆ ویلسن) و (١٤) بەندەکەی و، پەیماننامەی (سیڤەر) سەر بگرێ. هەروەها ئەو قسانەی (شێخی مەزن) بەبەڵگە دەهێنێتەوە کە لەپاش گەڕانەوەی لە هیندستان لە بەردەم خونکاری عیراق (فەیسەڵی یەکەم) و (باڵوێزی بەریتانیا)دا، بەهەموو سەربەستییەکی خۆیەوە لە بەغدادا کردوویتی، لە بابەت سەربەخۆیی کوردستانەوە. شێخ مەحموودیش ئەو شێخ مەحموودە بوو، کە لەپاش هاتنەوەی بۆ سلێمانی و کردنی بەفەرمانداری سلێمانی لە لایەن فەرمانڕەوایی بەریتانیا و فەرمانڕەوایی عێراقەوە، کە زانی نە لە لایەن تورکە کەمالییەکان و نە لە لایەن فەرمانڕەوایی بەریتانیا و نە لە لایەن فەرمانڕەوایی عێراقەوە هیچی ڕاستەقینە بۆ (کورد) و (کوردستان) ناکەن و، دەیانەوێ بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان خۆی و نەتەوەکەی بچەوسێننەوە، بێ ئەمەی پرسێک بەهیچ لایەکیان بکات و، نرخێک بەچاو و ڕاوەکانیان و درۆ و فیشاڵەکانیان بدات (خونکارێتی)ی خۆی ئاشکرا کرد و ناوی خۆی نا (خونکاری کوردستان). شێخ مەحموود بەوەیش نەوەستا، بێجگە لەوەی فروفێڵی هەموویانی ئاشکرا کرد بۆ هەمووان، داوای هەموو ناوچە و شارەکانی کوردستانی عێراقیشی لێکردن کە بیانخەنە سەر ناوچەی سلێمانی. هەروەها لە بڕیارنامەیەکدا کە هەموو سەرەک هۆزە گەورەکانی کوردستانی عێراق و بەشێکیش لە کوردستانی ئێران مۆریان کردبوو، ئەوەی لە هەموو لایەک گەیاند، کە مافی کورد هەر تەنیا شێخ مەحموود داوای ناکات، هەموو کوردەواری داوای دەکات.

بێجگە لەوانە ئاڵای کوردستانیشی هەڵکرد و، پوولیشی بەناوی فەرمانڕەوایی کوردستانی باشوورەوە چاپ کرد.

ئا بەم ڕەنگە مامۆستا ڕەفیق حیلمی ڕاستیی شۆڕشەکانی کورد و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و کەسایەتیی شێخ مەحموود دەردەخات بەڵام مامۆستا ڕەفیق حیلمی کەموکوڕیی فەرمانڕەواییەکەی شێخ مەحموود و هەڵەکانی شێخ مەحموودیش ناشارێتەوە. بەئاشکرا دەریاندەخات. بەکورتی وا پێشان دەدات: کە شێخ مەحموود لەسەر بنچینەیەکی زانست فەرمانڕەواییەکەی خۆی نەبردووە بەڕێوە. گەلێک کاروباری گرنگی بەپیاوی زانا و کارامە و کارگوزار نەسپاردووە. جڵەویشی بەرداوە بۆ کەسوکار و دەس و پێوەندی نەزان و تێنەگەیشتوو و هەلپەرست و لە خۆبایی بوو. لە ڕاستییشدا شێخ مەحموود لە کاروباری زرنگاریدا شارەزا نەبوو. لەناو ئەو هەموو گەڕ و گێچەڵ و تەنگوچەڵەمە و گیروگرفتەیشدا کە داگیرکەرانی کوردستان و دوژمنانی کورد بەرپایان کردبوو، شڵەژا بوو، سەری سوڕما بوو نەیدەزانی چی بکات.

لەبەرئەوە ئەو کەموکووڕی و هەڵانە بوو بوونە شتێکی سروشتی، هەر دەبوو ڕوو بدەن. ئەمە لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە چاوبرسێتی دەوڵەتە سوێندخوارەکان کە بریتی بوون لە (بەریتانیا) و (فەرەنسە) و (ئیتالیا)، کە چاویان بڕیبووە خاکی عوسمانی، هەروەها هەڵەی (یەکێتی سۆڤییێت) کە دەربارەی کورد کردی، ئەمانە هەموویان بوون بەهۆی ئەوەی مافی نەتەوایەتی کورد بخرێتە ژێر پێوە، پەیماننامەی (سیڤەر) هەڵبوەشێنرێتەوە و گوێ نەدرێتە بەندەکانی (وێلسن)ی سەرەک کۆماری ئەمەریکای یەکگرتوو.

لەجیاتی پەیماننامەی (لۆزان) گرێ درا، لە ئەنجامدا نەتەوەی کورد ڕەنجەڕۆ و سەرگەردان و ماڵوێران مایەوە!...

## یاداشتەکانی پڕن لە ڕاستی گشت لایی

بەبۆنەی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەزنەوە، مامۆستا ڕەفیق حیلمی گەلێک ڕەوشت و خووی بڵندی کوردەواریان پێشان دەدات... بۆ وێنە:

ئەوە پێشان دەدات کە کوردەکان بەدەوڵەمەند و هەژارەوە، بەگەورە و بچووکەوە، بەدەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتەوە، بەخوێندەوار و نەخوێندەوارەوە چۆن لە ڕۆژی ١٩٢٢/٩/٣٠ چوون بەپیر شێخ مەحموودەوە، خۆش هاتن و پیرۆزباییان لێ کردووە.

هەروەها چۆن هەموودەم لاوە خوێندەوارەکان و ڕۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمە کە خۆیشی یەکێک بووە لەوان، لە شێوەی پێکەوەنانی کۆمەڵانی نهێنی و ئاشکرادا ڕەنجیان داوە و تێکۆشاون لە پێناو دەستکەوتنی مافە نەتەوەیییەکانی کورد و سەربەخۆیی کوردستاندا. بەم بۆنەیەوە مامۆستا ڕەفیق حیلمی ناوی یەک دوویەک لەو کۆمەڵانەمان بۆ دەهێنێ، وەک (جەمعییەتی کوردستان) و (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان) کە خۆیشی ئەندامێکی کارگوزار بووە لەناویاندا.

هەروەها ناوی ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەیشمان بۆ دەهێنێ کە خۆی بەهۆنراوە و وتار بەزمانانی کوردی و تورکی و فارسی یارمەتی داون وەک (بانگی کوردستان) و (ڕۆژی کوردستان) کە لە شاری سلێمانیدا دەردەچوون بۆ کەڵکی کێشەی کورد و کوردستان. لە بابەت ڕەوشت و خوو و نەریتی کوردەوارییەوە، چ هی چاکمان، چ هی خراپمان، مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەجوانی و بەشێنەیی پێشانیان دەدات. لە بابەت کەسایەتییە گەورەکانی کوردی ئەو سەردەمەیشەوە کە خەریکی کێشەی کورد و کوردستان بوون ناوی گەلێک کەس دەهێنێ وەک: (حەمدی بەگی بابان) و (شەریف پاشا) و (سەید تەهای شەمدینان) و (ئیسماعیل ئاغای شکاک) و (کامەران بەدرخان) و (جەلادەت بەدرخان). هەروەها ناوی کۆمەڵە زرنگکارەکانی کوردیش دەهێنێ کە لە ئەستەمووڵ کوردەکان دایانمەزراندبوون بۆ ئامانجە پیرۆز و بەرزەکانی نەتەوەکەمان لەپێش شەڕی گەورەی یەکەمی جیهانیدا وەک (جەمعییەتی تەعالی و تەرەققی) و (جەمعییەتی هێڤی).

مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەوەیش ناوەستێ مێژووی شەڕی (چاڵدیران) دەگێڕێتەوە کە بەسایەی

لەشکرەکانی میرنشینییەکانی کوردستانەوە، تورکەکانی عوسمانی لە شەڕەکەدا لەشکری (ئیسماعیل شای سەفەوی)ی ئێرانیان شکاندووە. کەچی لەپاش ئەوە خونکارەکانی عوسمانی، لەباتی چاکە دانەوەی میرەکانی کوردستان، چاویان بڕیوەتە میرنشینییەکانیان و پیلانیان داناوە بۆ تێکداتیان، تا بەرە بەرەو یەکە یەکە لەناویان بردوون و داگیریان کردوون.

بەکورتی یاداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی لە سەرێکەوە دۆستایەتی و مەردایەتی و ئازایەتی کوردەوارییان پێشان دەدەن کە چۆن بەڕاستی و دروستییەوە پەیمانی خۆیان لەگەڵ بێگانەکاندا ڕاگرتووە، لە سەرێکی تریشەوە سپڵەیی و ناپاکی و نامەردی هەندێ لەو بێگانانەمان پێشان دەدەن کە (دڵپاکی) و (خۆش باوەڕی)ی نەتەوەی کوردیان بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆیان بەکارهێناوە کەچی لەپاشدا لەباتی چاکە، خراپەیان لەگەڵ کردوون. ئەو پەندەیش کە کورد داوێتی بەو کاربەدەستە زۆردارانە ئەوە بووە کە لە بەرامبەریاندا وەستاوە و شۆڕشی هەڵگیرساندووە و تۆڵەی خۆیشی لێ کردوونەتەوە.

بێجگە لەمانە یاداشتەکان لە شۆڕشەکانی عەرەبەکان دەدوێ چ لە عێراق و چ لە جێگاکانی تردا بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٢٠دا کە کوردەکان و عەرەبەکان لە عێراقدا پێکەوە تیایدا بەشداربوون.

ئەوەندەی پەیوەندییشی بەکێشەی کوردەوە هەیە لە کەسایەتییە گەورەکانی جیهان دەدوێ وەک (لینین) و (لوید جۆرج) و (مستەفا کەمال) و (عیسمەت ئینونوو) و (چەرچل) و (میس بێل) و (مارک سایکس) و (ودرۆ وێلسن) و (کلیمەنسۆ) و (وەنزیلۆس)...

هەرچی فەرمانداەرەکانی ئینگلیز بوون لە کوردستاندا مامۆستا ڕەفیق ناوی هەموویان بەخراپە دەهێنێ لە هەڵسووڕاندنی کاروباری کوردستاندا، وەک (مێجەرسۆن) و (کاپتان بۆند) و (کاپتان بیل) و ئەو فەرمانداارانەی لە چەمچەماڵ و ئاکرێ و زێبار و ئامێدیدا کوژراون، لە ئەنجامی کردەوە و ڕەوشتە خراپەکانیاندا تەنیا لە ڕەوشت و کرداری (مێجەر نۆئیل) و نیازی دڵی بەرامبەر بەکورد و کوردستان دڵنیایە و بەچاکییەوە ناوی دەبات.

یاداشتەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی گەلێک بەکەڵکن بۆ ئێمەی کوردەواری. چونکە بێجگە لەوەی دۆست و دوژمنیان بۆ لە یەک جیا کردووینەتەوە، ئەو پەندەیشمان دەدەنێ کە دەبێ هەرچییەک دەکەین لە پێناوی سەربەرزی کورد و کوردستاندا بێ.

# پێکەنین پرشنگ دەدات لە ژین

لە دوو توێی ئەم بەرگەدا هەڵبژاردەیەک لە پێکەنینی
(کوردەواری) و (جیهانی)ت پێشکەش دەکرێ
بەهیوای ئەوەی خۆشی و شادمانی بەژینت ببەخشرێ

## یەک دوو سەرنج لەم بەرهەمە

(پێکەنین پرشنگ دەدات لە ژین) یەکێکە لە بەرهەمە ناوازەکانی مامۆستا، کە دەتوانین لێوەی بڕوانینە دنیای نوکتە و قسەی نەستەق و پرمانای دەگمەن لە دنیای ڕۆشنبیری و ئەدەبدا، (نوادر و نکات) بەشێکن لە هونەری ئەدەبی و لە ناو هەر نەتەوەیەکدا جێی خۆیان گرتووە.

مامۆستا، چونکە مەبەستی سەرەکی لە نووسیندا خزمەت گەیاندنە بەخوێنەری کورد، بۆیە دەبینین هەر لە نێوان ئەم بابەتەوە کۆمەڵێ لە ژیاننامە و ڕووداوی دەگمەن و پڕ لە پەندی کۆمەڵێ گەورە پیاو و سەرکردەی بەناوبانگی گەلانیشی تێهەڵکێش کردووە... بەلای منەوە ئەمە بەدەرە لەو مەرامەی کە ویستبێتی قەبارەی کتێبەکەی پێ زلتر بکات بەڵام من لە خوێندنەوە و سەرنجدانی وردمدا بۆ بابەتەکان، گەلێ باس و بابەتی (ناوخۆیی) وام تێدا کەوتە بەرچاو، کە مامۆستا لەوەبەر لە یادنامە و بەرهەمی تریدا نووسیبوونی و خستونیەتە ڕوو، ئەمەش دەبێتە هۆی کات بەفیڕۆدانێکی خوێنەر و جێگا گرتنیش لەم کتێبی دووەمەدا، بۆیە ئەوانە هەر لە جێی خۆیاندا (لەپەراوێزدا) ئیشارەمان پێ داون و بواردومانن، تەنیا ناونیشانی بابەتەکەمان هێشتۆتەوە... خوێنەری وریا و زرنگ خۆی هەست بەم دیاردەیە دەکات و لەمەو پێشیش هەروا باسی وا هاتۆتە پێش کە لە جێی تردا خراوەتە توێی باسەکان: نەرۆز، کەریم خانی زەند، سەلاحەدینی ئەیوبی، ئەدیسن.

وەنەبێ مامۆستا خۆیشی ئەمەی بەسەردا تێپەڕیبێ، لە کۆتاییدا و لە ڕیزی ئەو سەرچاوانەی کە بۆ ئەم بەرهەمە کەڵکی لێ دیون، دەسنیشانی ئەو سەرچاوانەی کردووە، بەتایبەتی:

ڕۆژنامەکانی: خورمال، باسەرە، چەمچەماڵ، ئاکرێ، بیرەوەریەکانی.

بیری خستونەتەوە، بەڵام ئێمە لەم کارەی ئێستاماندا ئەوە بەباش دەزانین کە دووبارەیان نەکەینەوە.

هەر پەراوێزێکیش کە مامۆستا خۆی داینابێ ئەوا بە(ش. ف) نیشانەمان کردووە، وەک لە بەرهەمەکانی تریدا پەیڕەو کراوە.

جا بۆیە ئەنجامم دەبینین قەبارەی بەرهەمەکە لە ئەسڵەکەی بچوکتر بۆتەوە.

حەزمان کرد خوێنەری هێژا ئاگاداری ئەمە بێ و سوپاس.

ئەحمەد

## پێشەکی

(١)

(گاڵتەوگەپ) و (قسەی نەستەق) و (ناسکە قسە) و (وتاری خۆش) و (دەنگ و باسی گەورە پیاوان و ڕۆشنبیران) و (مەتەڵ) و (هۆنراوەی بەجۆش) و (پەندی پێشینان) لە باریاندا هەیە مرۆڤ دڵخۆش بکەن و بیشیهێننە پێکەنین پێکەنینیش لە باریدا هەیە پرشنگ بدات لە ژین و، لەش و هۆش و دڵ و دەروون و گیان ببووژێنێتەوە و، هێز و تینیان پێبدات و، ئاراستەیشیان بکات بۆ ژیانێکی چاکتر و پاکتر و بڵندتر.

کەواتە (پێکەنین) پێویستییەکی (ژین)ە چونکە بەختیاری دەخاتە ناو ماڵەوە زیندەگانی دەخاتە ناو فرمانەوە ئازار و هاواری ژین لە کۆڵ پیاو دەکاتەوە لە ماندووبوون ڕزگارمان دەکات لە دوژمنایەتی دوورمان دەخاتەوە ترس و لەرز لە دڵمان دەکاتە دەرەوە لە سەدان تەنگ و چەڵەمەیش دەربازمان دەکات.

کەواتە ئەگەر ژینێکی پڕ تەندروستی و سەرکەوتن و بەختیاریمان دەوێ: «بام پێبکەنین»!.

(٢)

منداڵی ساوای بێ گوناه، پێدەکەنێ...

لاوی بەگوڕو هەڕەت، پێدەکەنێ...

پیاوی نەژاد و سەروەر و کارگوزار، مرۆڤی سەرکەوتوو و سەرفراز هەر پێدەکەنێ...

گوڵیش بەدەم کزەبا فێنکەکەی بەیانیانەوە هەر پێدەکەنێ...

یاری شەنگ و شۆخیش بەدەم مێردی پاشەڕۆژیەوە، هەر پێدەکەنێ... دۆستی ڕاستەقینەیش بۆ دۆستی خۆی، باوک و دایکیش بۆ جگەرگۆشەی خۆیان، مامۆستایانیش بۆ شاگردە زیرەک و ئازاکانیان هەر پێدەکەنن...

کەواتە (پێکەنین): هێزێکە...

پیاویش هان دەداتە سەر کار و فرمان و، خۆشی ژیان و، پێکەوەنانی دەسەڵاتداری و سەرکەوتن...

سەرچاوەیەکی خوداییە: لەش و دڵ و دەروون و گیان دەبووژێنێتەوە.

پیاویش هان دەداتە سەر کار و فرمان و، خۆشی ژیان و، پێکەوەنانی دەستەبرا و دولبەران...

کەواتە بام پێبکەنین!...

(٣)

پێبکەنە!...

تا دەتوانیت: پێبکەنە!...

قا قا: پێبکەنە!...

تا دەکەویت بەسەر گازی پشتتدا: هەر پێبکەنە!.

تا لە پێکەنیندا بڕستت دەبڕێ: هەر پێبکەنە!...

چونکە خەم و خەفەت چارەی گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمە و ئەرک و ئازارەکانتی پێ ناکرێ!...
کەواتە پێبکەنە!... بام پەشیمان نەبیتەوە لەوەی تەمەنت بەدڵتەنگی و خەم و خەفەتەوە ڕابوواردووە!...
پێبکەنە: لە خۆشیتدا!...
پێبکەنە: لە ناخۆشیتدا!...
پێبکەنە: بەدەم سەرکەوتن و پەککەوتنتەوە!...
پێبکەنە: لە جوانی و پیریتدا!...
پێبکەنە: لە دەوڵەمەندی و هەژاریتدا!...
پێبکەنە: لە تەندروستی و نەخۆشیتدا!...
پێبکەنە: لە ژین و دەمە و مردنتدا!...
کەواتە: هەر پێبکەنە!...

(٤)

پێبکەنە: بام سوپای خەفەت و ئازار بشکێنی...
بام دوژمنی بەدکار بمرێنی...
بام بەسەر گیروگرفتی ژینتدا زاڵ بی...
بام هەموودەم بەدەستەبرا و هەڤاڵ بی...
بام لە کاروفرمانتدا بەکار بی...
بۆ هەموو کەس بەفەڕ و بێ ئازار بی...
پێبکەنە: بام لەش و هۆش و دڵت، خۆش و بەهێز بن... تا بتوانیت بەرەنگاریی (زۆرداری) و (هەژاری) و (نەخوێندەواری) و (نەخۆشی) بکەیت لەناو گەلەکەتدا...
تا بتوانیت بگەیت بەئامانجی بەرزی خۆت و نەتەوە و نیشتمانت...
تابتوانیت بە(ئازادی) و (شادمانی)یەوە بژیت...

(٥)

ئەو کەسە هەڵە دەکات کە بەدەم گیروگرفت و دەرد و ئازارەوە پێناکەنێ!؟... چونکە (پێکەنین) هێزێکە چارەسەری هەموو گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەیەک دەکات!...
ئەو (ژین)ەی هەمانە زۆرتر بەنرخ دەبێ، ئەگەر بەدەم (پێکەنین)ەوە بەکارو فرمان و تێکۆشانی مەردانەوە بەسەری بەین، بۆ (کەڵکی گشت لایی)... نەک بەشین و شەپۆڕ و گریان و کردەوەی خۆ پەرستانەوە... لەبەرئەوە پێویستە: لە هەموو بارێکدا، لە هەموو جارێکدا، (کۆششی مەردان)و دەموچاوی (گوڵ خەندەرانە)مان ببێ...
واتا: هەر بەکەڵک بین و پێبکەنین تا ژینی وا خۆش و ئایانمان دەست بکەوێ!.

***

منیش ئەی خوێندەواری خۆشەویست! بەم نیازەوە ئەم نووسراوەم پێشکەش کردوویت لە خودام دەوێ: پرشنگ بدات لە ژینت و، خۆشی و شادەمانیت پێبگەیێنێ هەروەها ئاراستەیشت بکات بۆ ئەوەی (کەلک) و (شادمانی) بەنەتەوەکەی خۆت بگەیێنیت.

سلێمانی: ١٩٦٧

شاکر فتاح

(خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد)

***

## پێکەنینی کوردەواری

(گاڵتەوگەپ)، (قسەی نەستەق)، (ناسکەقسە)، (وتاری خۆش)، (دەنگ و باسی گەورە پیاوان و رۆشنبیران)، (هۆنراوەی بەجۆش)، (پەندی پێشینان)، (مەتەڵ)

### سەلاحەدین

(١)

کە (سەلاحەدینی ئەیوبی)، کوڕە گەورەکەی خۆی (زاهیـر)ی کرد بەخونکار ئەم ئامۆژگارییەی کرد، فەرمووی:

«خودناس بە چونکە خودناسی سەرچاوەی هەموو چاکەیەکە.

ئەوەی خودا فەرمانی داوە بکرێ، منیش فەرمانت پێ دەدەم بیکەیت.

چونکە ئەوەیە کە دەبێ بەهۆی رزگار بوونت خۆت لە خوێن ڕشتن بپارێزە چونکە خوێن نانوێ دڵی (گەل)ەکەت ڕابگرە و، ئاگات لێی بێ و، چاودێریی بکە چونکە تۆ لە جێی من و لە جێی خودا بەسەریانەوە دانراویت دڵی میرەکان و کاربەدەستانی فەرمانڕەواییەکەت ڕابگرە.

چونکە سەرکەوتنی من لە سایەی دڵ ڕاگرتنی خەڵکەوەیە چاو بەکەس هەڵ مەهێنە چونکە کەس لە دەست مردن ڕزگاری نابێ زۆر بەووردییەوە کاروباری خەڵک هەڵ بسووڕێنە چونکە ئەگەر ئەوان دڵخۆش نەبن، خودا چاو لە گوناهت ناپۆشێ بەڵام ئەوەی لە ناوەند(خۆت) و (خودا)دا ڕوویدات، بەپەشیمان بوو نەوەیەک لە گوناهەکانت خۆش دەبێ چونکە خودا گەورە و لێ بووردەیە»[١].

(٢)

(سەلاحەدینی ئەیوبی)، لە شەڕێکدا کە دژی خاچەکانی ئەورووپا دەجەنگا، بەرامبەر لەشکری ئینگلیز،

(١) خولاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان- بەرگی دووەم- محەممەد ئەمین زەکی، ل١٧٩- چاپی بەغداد- ١٩٣٧(ش.ف)

که سەرۆکەکەیان ناوی (ریچارد) بوو، یاخود (شێردڵ)، لە تیرەبارانی دوژمنەکانی نەترسا، بەسواری هەڵیکوتایە مەیدانی جەنگەوە و، نەڕاندی بەسەریاندا، فەرمووی:

«بۆ خۆتان وا چاکترە کە لە جێگای خۆتاندا بوەستن چونکە دڵی شێری ئێمە لە دڵی شێری ئێوە گەلێک بەهێزترە!».

(٣)

(سەلاحەدینی ئەیوبی) بەشەکر دوژمنەکانی خۆی دەشکاند.

لەگەڵ ئەوەیشدا کە (ریچارد)شاهی ئینگلیز دوژمنێکی خوێنڕێژ و درندەی بوو، لە کاتی جەنگدا، کە دژی سەلاحەدین خۆی دەیکرد، ئەسپەکەی کوژرا و کەوتە خوارەوە بەناچاری بەپێوە شەڕی دەکرد.

(سەلاحەدین) چاوی لێی بوو دەمودەست ئەسپێکی ڕەسەنی چاکی خۆی بۆ نارد بەدیاری، تا بەسوارییەوە بجەنگێ بەرامبەری ڕایشی سپارد پێی بڵێن: «سەلاحەدین حەیفی لێ هات ئازایەکی سوار چاکی وەک تۆ بەپێوە شەڕ بکات حەزی کرد ئەم ئەسپەت بەدیاری بۆ بنێرێ، تا بەسوارییەوە بەرامبەری بجەنگێیت!».

(٤)

کە (ریچارد) شاهی ئینگلیز نەخۆش کەوت، (سەلاحەدین) زانی کە داماوە لەسەر بەفر و میوە ئیتر هەموو ڕۆژێک بەفر و میوەی هەموو ڕەنگەی تەڕوتازەی بۆ دەنارد بەدیاری تا چاک بووەوە!.

(٥)

کە (ریچارد)ی شاهی ئینگلیز نەخۆش کەوت و، (سەحەلاحەدین) زانی کە داماوە لەسەر پزیشکێکی شارەزا و پسپۆڕ بۆ ئەمەی چاکی بکاتەوە، خۆی لەگەڵ پزیشکێکی تایبەتیدا خستە شێوەی پزیشکەوە و، چووە بارەگای (ریچارد)، گوتی: «سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی پێی ناخۆش بوو، تۆ لەم نەخۆشییە گرنگەدا بێنیتەوە لەبەرئەوە هەردووکمانی ناردووە بۆ لات دەرمانی نەخۆشییەکەت بکەین، بەڵکو ئەمە خودایە زوو چاک بیبیتەوە!»...

کە (ریچارد) لە نەخۆشییەکەی چاک بووەوە، ئەو ساکە زانی کە ئەو دوو پزیشکە یەکێکیان (سەلاحەدینی ئەییوبی) خۆی بووە!...

(٦)

(سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی) زۆر بەتەنگ پاراستنی (گیان) و (سامان) و (ئابڕوو)ی نەتەوەکەی خۆیەوە بوو هەر کەسێ زۆر و ستەمی لێ بکردنایە جەزرەبەی پێ دەگەیاند جارێکیان، لە پاش شکاندنی لەشکرێکی گەورەی خاچەکانی ئەورووپا و بەدیل گرتنیان، (سەلاحەدین)، خێوەتێکیان بۆ هەڵدا و، لەگەڵ هەندێک سەرلەشکر و گەورە پیاوانی ئەو ناوەدا لە ناویدا دانیشت ئینجا فەرمانی دا دیلەکانیان هێنایە بەردەمی.

لەناو دیلەکاندا (ڕینۆڵد) سەرداری کەلاتی (کەرەگ) و، گەلێک خونکار و، سەرکردە و، سەرداری

فەرەنگەکان گیرابوون، لەگەڵ چەند گەلەیەک سەربازیاندا خونکار (جۆی) لە بەفراوەکەی خواردەوە، کاسەکەی دایە دەست (ڕینۆڵد) سەرداری (کەرەگ)، تا ئەویش تۆزێکی لێ بخواتەوە بەڵام سەلاحەدین دەمودەست بەربەستی کرد، فەرمووی: «ئێمە ئاومان نەداوە بەو بیخواتەوە، تا لە دەستمان ڕزگار ببێ!...».

دوای ئەوە گورج (سەلاحەدین) هەستایەسەر پێ و، دەستی کرد بەگێڕانەوەی کردەوە گەنگ و نەنگەکانی سەردار (ڕینۆڵد) و، پەیمان شکاندنەکانی، بۆ هەمووان: کە گەلێک جار دەربارەی کاروانە بێ تاوانەکانی موسوڵمانەکان و حاجی یە موسوڵمانەکانی کردبوو، لە کاتی هاتوچۆیاندا، وەک ڕووت کردنەوەی پیاوان و ئافرەتانیان و، بەدیل گرتنیان و، ڕیسواکردن و، زۆروستەم لێ کردنیان ئەمە بێجگە لەمەی کە جنێوی پیسپیشی دابوو بەئایین و پیاوە گەورەکانی ئیسلام!. دوای ئەوە (سەلاحەدین) فەرمووی: (جا من، لەسەر ئەو کەتنانە کە گەلێک جار پەیمانی شکاندووە و، دووبارەی کردوونەتەوە، سوێندم خواردووە ئەم سەردارە ستەمکارە (ڕینۆڵد) بەدەستی خۆم بکوژم لەبەرئەوە سوێندەکەی خۆم ناشکێنم و هەر دەبێ بیکوژم!». (سەلاحەدین) ئەوەی گوت و (ڕینۆڵد)ی هەستاندە سەر پێ و شیرەکەی هەڵکێشا و بەوەشاندنێک کەللەی ڕینۆڵدی پەڕاند خونکار و سەرکردە و سەردارەکانی خاچەکان، لەوە زەندەقیان چوو بوو بەڵام (سەلاحەدین) کە زانی ترس نیشتۆتە دڵیانەوە، بەچەند قسەیەکی شیرین و نەرم و نیازی خۆی، دڵی دانەوە و، ترسی لە دڵ کردنەدەرەوە و بەڕێزێکی زۆریشەوە ڕەوانەی کردن بۆ (شام) تا لەپاشدا بەشێنەیی کاروباریان ببڕێنێتەوە.

بەڵێ، (سەلاحەدین) وابوو، ئەم (شاهەنشاهە کوردە)، بەخوداناسییەکەی و، بەکردەوە چاک و پاک و بڵندەکانی، سەری (نەتەوەی کورد) و (ئیسلامەتی)ی بڵند کردەوە تەنانەت نەک هەر دۆستەکانی و ژێر دەستەکانی دوژمنەکانیشی خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێ دەگرت.

## کەریم خانی زەند[1]

## مەحموود پاشای جاف

(مەحموود پاشای جاف) سەرەک هۆزێکی مەند و زرنگ دەبێ.

هەموو جارێک ئامۆژگاریی جافەکانی هۆزی خۆی دەکات منداڵەکانیان بنێرنە بەر خوێندن، بۆ ئەمەی ژیانێکی پاک و چاک و بڵند بژین، ڕۆژێکیان ئەفسەرێکی تورکی عوسمانی دێتە دیدەنیی لەپاش ماوەیەک هەڵدەسێ و لە نزیک خێوەتەکەی مەحموود پاشاوە، لەبەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە بەپێوە میز دەکات!... لەپاش ئەوەی ئەفسەرەکە دەڕواتەوە جافەکان بە(محموود پاشا) دەڵێن:

(١) ئەم باسە لە کۆمەڵە چیرۆکی (خودای هەژاران)دا دەقاودەق دووبارە بۆتەوە: ل ٨٥-٩١، بۆیە بەچاکمان نەزانی دووبارە بێتەوە. بڕوانە: شاکر فەتاح- چیرۆک بۆ منالان- خودای هەژاران ١٩٧٩ چاپخانەی شارەوانی هەولێر.

«پاشا! خۆ تۆ بەنێمە دەفەرموویت بەمنداڵەکانتان بخوێنن، تا فێری کردەوە و ڕەوشتی جوان و مەردانە بن کەچی ئەم ئەفسەرە خوێندەوارە ئەمەندە بەدخوو بوو، لە نزیک ئێمەوە و بە بەرچاوی ئەم هەموو کەسەوە، بەپێوە میزی کرد! ئەی کەواتە ئەم هەموو خوێندنەی بەکەڵکی چی هات؟!».

(مەحموود پاشا)یش کە گەورە پیاو و هونەرمەند و جوامێر دەبێ، بەم جۆرە وەرامی جافەکان دەداتەوە:

«براگەل! ئەمە تاوانی خوێندن نییە کە ئەم ئەفسەرە وەهای کرد.

هەر خۆی لە خۆیدا بەدخوو و ناپیاوە خراپیش پەروەردە کراوە بەڵام ئەگەر نەیخوێندایە میزەکەی دەکرد بەسنگمدا!.».

## وەسمان پاشای جاف

(وەسمان پاشای جاف)یش سەرەکی هۆزی جاف دەبێ پیاوێکی هۆشمەند و زیرەک و بەچنگ دەبێ زۆر حەزیش لە گاڵتەوگەپ دەکات.

ڕۆژێکیان هەست دەکات پیاوێکی دزیی لێ دەکات پیاوەکە دەنێرێتە ژووری خۆرشت ڕۆن دەربهێنێ خۆیشی لێ دەگرێ بزانێ دزییەکەی چۆن دەکات کابرا هەندێک ڕۆن دەخاتە سەر تەپڵی سەری و تەپلەکەی خۆی دەکاتەوە سەری لە پڕ وەسمان پاشا دەکات بەژووردا کابرا دادەچڵەکێ پاشا پێی دەڵێ:

«برا سەرمامە تا زووە لەو سۆپایەدا ئاگرێکی نێڵەنێڵم بۆ بکەرەوە!...».

– میرم بەم قرچەی گەرمایە ئەم سۆپایەت بۆ چییە؟ ڕێم بدە بچم نوێنت بۆ بهێنم بیدەم بەسەرتدا تا گەرمت بێتەوە.

– نە، نوێنم ناوێ هەر سۆپاکەم بۆ دابگیرسێنە و لەلامەوە بوەستە تا گەرمم دەبێتەوە.

– میرم وا دەچم داردێنم سۆپاکەت بۆ دادەگیرسێنم.

– نە، نابێ بچیتە دەرەوە یەکێک لەو پێچکە تەختانە بشکێنە و بیکەرەوە بەئاگر!...

کابرایش کە تێ دەگات (وەسمان پاشا) میچی گرتووە لەسەر ئەوەی کە بەو جۆرە ئاگری بۆ بکاتەوە، ناچار دەبێ فەرمانەکەی بەجێ دەهێنێ کاتێک دەزانێ ئەوا ئەو ڕۆنەی دزیویەتی و، ناویەتە سەر سەری، دەتوێتەوە و بەدەم و چاویدا دێتە خوارەوە!...

(وەسمان پاشا)یش تێروپڕ پێی پێ دەکەنێ و، پێی دەڵێ:

«ئاوا دەتگرم لە دزییەکانتدا دەبڕۆرەوە ماڵی خۆت پیاوی وەک تۆم ناوێ!...».

## نالی

(١)

(نالی) بوێژێکی گەورە و زانا و بەهرەداری کورد بووە لە سەردەمی بابانەکاندا ژیاوە کە لە (قەرەداخ) دەبێ، دڵی بەکچێکدا دەچێ، ناوی (حەبیبە) دەبێ دوای ئەمەندە گرفتاری دڵداری ئەو کچە دەبێ مارەی دەکات بەڵام ئەم و ئەو لە کوڵی نابنەوە پێی دەڵێن: «وەک زانیومانە یارەکەت چاوەکانی خێل و قیچن بێجگە لەوە شەڕانییشە!»...

ئەویش وەرامیان دەداتەوە دەڵێ: «یارەکەم چاوەکانی خێل و قیچ نین بەڵام وەک دوو تای تەرازوو وانە، لە ڕووی نازەوە نەختێ سەر دەکەن!».

(٢)

هەندێ کەس توانج و پلاری تێ دەگرن کە بەزمانی کوردی هۆنراوە دەهۆنێتەوە ئەویش بەم جۆرە وەرامیان دەداتەوە، دەڵێ:

کەس بەئەلفازم نەڵێ خۆ (کوردی)یە، (خۆکردی)یە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تابیعی (مەعنا) دەکا

(٣)

لە جێگایەکی تریشدا (نالی) دەڵێ:

(فارس)و(کورد)و(عەرەب)، هەرسێم بەدەفتەر گرتووە
(نالی) ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە (دیوان)ی هەیە

(٤)

(نالی) کە سەربازەکانی تایبەتی (ئەحمەد پاشای بابان) دەبینێ بەم جۆرە لە شێوەیەکی تەڕ و ناسکدا پێشانمانی دەدات:

ئەو تاقمە مومتازە کە وا خاسەی شاهن
ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن
سەف سەف کە دەوەستێ بەنەزەر خەتتی شوعاعن
حەلقە کە دەبەستێ وەکو خەزمانەی ماهن
نێرگس نیگەهو ساق سەمەن کورتە وەنەوشەن
موو سونبول و ڕوومەت گوڵ و هەم لالە کولاهن
گولزاری دەرو دەشتێ و غیلمانی بەهەشتێ
ئاهوو سەف و ئاتەش بەکەف و تیز نیگاهن
سەحرا بەتەجەللا دەکەنە وادیی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەزهەری ئەلتافی ئیلاهن

گەهـ تاووس و گەهـ کەبکن و گەهـ بوو قەلەموونن
گەهـ شوعلە و گەهـ ئاتەش و گەهـ دوودی سیاهن
لایق بە بەدەن ئەتلەسی ئەخزەر کە دەپۆشن
ئەو ڕستە گوڵ و بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن
«بۆ سەیری خەرامیدنی ئەو سەروو قەدانە
(سۆفی) لە تەڵەبدان و هەموو سالیکی ڕاهن»

(٥)

جارێکیان هاوڕێکانی (نالی) دەچن بۆ جێگایەک دەیانەوێ ئەویش لەگەڵ خۆیاندا بەرن بۆ ئەوێ دەڵێن: «ئەسپێکیش بۆ (نالی) پەیدا بکەن، تا سواری ببێ و، بتوانێ لەگەڵماندا بێ» نالییش لە وەرامدا دەڵێ: «من ئەسپم پێیە»!... ئەوانیش دەڵێن: «کوا ئەسپەکەت؟» نالییش دەڵێ: «ئەی ئەوەنییە ئەسپەکەم؟...» ئەوە دەڵێت و دەست دەبات بۆ «پێ»ی خۆی... دەڵێ: ئەی بەم پێیانەی خۆم ناڕۆم؟!».

(٦)

(نالی) پیاوێکی زۆر دڵتەڕ دەبێ سەیری! جوانی ئەگریجەی یارەکەیان چۆن هونەرمەندانە و وەستایانە پێشان دەدات، دەڵێ:

لاولاوە کە لەو لاوە بەئەم لاوە کشاوە
یا یاسەمەنی خاوە لە ڕووی ڕۆژە ڕوواوە!

## مەولەوی

(١)

(مەولەوی) بوێژێکی هونەرمەندی گەورەی (کورد) بووە ڕۆژێکیان لە شاری (سنە) لە کۆڕێکدا دەبێ، لێی دەپرسن، دەڵێن: «تۆ هەر دەڵێیت هۆزەکەم خۆشیان دەوێم و بەگەورەم دەزانن بەچیتدا پێشانی دەدەیت کە ڕاست دەکەیت؟».

(مەولەوی)یش لە وەرامدا دەڵێ: «خۆ ئەگەر هیچ نەگێڕمەوە، ئەوە بۆ من بەسە، کە هەورامییەک بارێکی گران لە کەرەکەی دەنێ و، ڕێی دەکەوێتە (ملەی ئەوێ هەنگ) و، دەیەوێ بەوێدا کەرەکەی سەر بخات، کە کەرەکەی ناڕوات، پێی دەڵێ:

«هەچە دەی!... بەخودا ئەگەر وەک مەولەوییش بیت، هەر سەرت دەخەم!».

(٢)

کە (مەولەوی ) دەچێ بۆ حەج، لە ڕێگادا، لە بەغداد، لەتەکیەی شێخ (عبدولقادری گەیلانی)، پشوویەک دەدات بەڵام نەخۆشییەکی سەرەمەرگ دەگرێ پیاوەکەیشی ئەمە بەهەل دەزانێ هەر پارەیەکی لە باخەڵدا دەبێ دەیدزێ و لە بەغدادەوە دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی کە ناوی «سەرشاتە»یە لەوێ دەست دەکات بەبا و کەڕۆی درۆ!... بەخێزانی مەولەوی دەڵێ: «باوە مەولەویم لە بەغداد نەخۆش کەت و مرد

منیش لەویٚ ناشتم و پارەی حەجەکەیشیم بۆ بەشییەوە بەسەر هەژاران و داماواندا» . خێزانی مەولەوی بەسەزمانیش دەکەونە شین و شەپۆر و گریان و پرسەگرتنەوە کەچی لە پاش دوو مانگ مەولەوی لەویٚ چاک دەبێتەوە لەبەرئەوەی نابووت دەمێنێتەوە حەجەکەی بۆ ناکریٚ بەناچاری دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی کە مەولەوی دەگاتە ماڵەوە پیاوە ناپاکەکەی لە ترسدا هەڵدێت بەڵام کوڕەکانی مەولەوی دوای دەکەون، ناهێڵن لە دەستیان دەربچێت، دەیگرن ئینجا دەیبەنە بەردەم باوکیان، خەریک دەبن بیکوژن بەڵام مەولەوی دەڵیٚ: مەیکوژن وازی لیٚ بهێنن.

هەرچی رووی داوە رووی داوە و براوەتەوە، بەس نییە خۆم هاتوومەتەوە؟!» .

ئینجا مەولەوی روودەکاتە پیاوەکەی و پێی دەڵیٚ:

«برا!... خودا رووی مردن رەش بکات کە تۆی لای من وا شەرمەزار کرد ئەگەر من بمردمایە تۆ بۆچ ئەم شەرمەزارییەت بەسەر دەهات؟» .

دوای ئەوە پیاوە ناپاکەکە دەردەکەن.

(٣)

رۆژێک (مەولەوی) رێی دەکەوێتە (پاوە)، لە ناوچەی هەوراماندا، دەبێتە میوانی مەلایەکی پاوەیی (مەولەوی) سیٚ رۆژ لای مەلاکەی خانەخۆیی دەمێنێتەوە، کەچی خاوەن ماڵەکە هەر (توو) و (دۆ)ی دەرخوارد دەدات!... ئەویش خۆی ئامادە دەکات بگەڕێتەوە مەلاکە پێی دەڵیٚ: «مامۆستا! زوو ئۆغرت کرد مەڕێکم دانابوو بۆت سەرببڕم» .

مەولەویش ناکاتە نامەردی، دەڵیٚ: «کەواتە سوێندم وا بیٚ، تا لێی نەخۆم ناڕۆمەوە!...» .

کە (مەولەوی) ئەوە دەدا بەگوێی خانەخوێکەیدا، خانەخویٚ بەتاسەوە دەچیٚ!...

## عەبدوڵڵای حەسەن

(عەبدوڵڵای حەسەن) باخەوانێکی هەژاری، نەخوێندەواری دەشتی شارەزوور بووە لە تیرەی (نەورۆڵیی جاف)دا لەگەڵ ئەوەیشدا بەرهەمی (هۆنراوە) و (راستی پەرستی)ی ناوازە و نایابی پێشکەشی نەتەوەکەمان کردووە دۆستی (مەولەوی) بووە مەولەوی زۆری خۆش ویستووە.

ئەمە نموونەیەکە لە هۆنراوەکانی کە بەئاشکرا راستی پەرستیی تێدا دیارە لێرەدا (عەبدوڵڵا حەسەن) سکاڵاکەی و گلەییەکەی بەرامبەر خودایە:-

ئەوە نان نەبوو تۆ دات وە بەنە
وە هەولی قول و، وە زۆری چەنە
چەند ساڵ لەسەر یەک رەمەزانم گرت
وە نان و وە ئاو پارشێوم دەکرد
وە گەلیٚ دەدەی ماینی محەنەک
وە منت نەدا کەلاشێکی چەک!...

ژێرم خـاک دەکـەی، سـەرم سـەنگ دەکـەی
ئەمن دەنگ ناکـەم، ئەتۆ دەنگ دەکـەی؟!

## مەحوی

(١)

(مـەحوی) بوێژێکی گەورە و زانایەکی خاوەن پایە و ڕاستی پەرستێکی خوداناسی چاکەخواز بووە پایەی (مەحوی) لە پایەی (شێخی سەعدی) کەمتر نییە، لە بەرهەمی ناوازە و نایاب و بەکەڵکدا ئەمە چەند نموونەیەکی هۆنراوە و بیروباوەڕەکانێتی کە لە بارەی (کوردەواری)یەوە دایناون:

«شـێـخی هەمـەوەندێکی ئەدا وەعـزە و نەسـیـحـەت
ئەو قـوڕبەسـەرەی دابووە بەر فـەخش و فـەزیحـەت
خۆش هاتە جەواب و، وتی: «تۆ حەقـتە فەقـەت من،
قـوتـتـاعی تەریقم، نەکـو قـوتـتـاعی تەریقـەت!»»

(٢)

«زەمـــانەی پڕ تەعـــەب دەتکاتە تیــــرۆک
لــە تــێ نــانــت دەداتــێ: دوویــەشــی نــۆک»

(٣)

«دنیـــا (تیـــتـــرۆ)یە مـــەوەســـتـــە تەنیـــا بڕۆ
کێ مـــــاوە تیـــــا نەبووبێ تیـــــا (تڕۆ)؟!»

(٤)

«نامـــەرد ئەوەندە مـــوعـــتـــەبەرن لەم زەمـــانەدا
مەرد ئیعـتـیـباری کەم بووە، (مـەردی خودا) خـوسـووس!

(٥)

«لە هەمـــوو جێ لە چ کـــەس بێنی مـــرووەت نایە!...
(کەرەم)و(سیـدق)و(وەفا) ئێستـە لە عالەم بووە قات!»

## ئەحمەدی خانی

(ئەحمەدی خانی)، لە بەرهەمە ناوازە و نایابەکەیدا، کە ناوی ناوە (مەم و زین)، لە مەیدانی (وێژە) و (هونەرمەندی) و (مرۆڤپەروەری) و (کوردایەتی)دا سەری (نەتەوەی کورد)ی بەرز کردۆتەوە ئەمە بۆ ئێمەی کوردەواری شایانی شانازییە، کە (مەم و زین)ە کەی (ئەحمەدی خانی) لە دەمێکەوە لە جیهانی پێشکەوتوودا بایەخ و نرخی پێدراوە و، بەگـەلێک زمـانی زیندووی پێشکەوتوویش پەرچڤە کراوە تەنانەت زۆر کەس لە پسپۆڕانی وێژەی جیهانی، (مەم و زین)ەکەی (ئەحمەدی خانی)، لە (ئەلیادە) و

(ئۆدیسه)کەی (هۆمیرۆس)ی یۆنانی و، (شاهنامه)کەی (فیردەوسی)ی ئێرانی، بڵندتر و بەنرختر دادەنێت.

سەیری پێشەکییەکەی (مەم وزین)ەکەی (ئەحمەدی خانی) بکە، کە لە (٣٠٠) ساڵ پتر لەمەو پێشەوە نووسیویەتی، چۆن شارەزایی و پسپۆری و کوردایەتی خۆی نواندووە بەرامبەر چارەسەرکردنی کێشەکانی نەتەوەکەی خۆی ئەمە بەشێکە لەو پێشەکییەی کە ئەوپەڕی لێکۆڵینەوەی زانایانەی تێدا نواندووە:-

«جوامێری و هیممەت و سەخاوەت
مێرێنی و غیرەت و جەلادەت
ئەو خەتمە ژ بۆ قەبیلی (ئەکراد)،
وان دانە بەشێر هیممەت و داد.
هەندێ ژ شەجاعەتێ غەیوورن
ئەو چەند ژ مینەتێ نەفوورن
ئەڤ غیرەت و ئەڤ عولووی هیممەت
بوو مانیعی حەملی باری مینەت
لۆ پێکڤەهە هەمیشە بێ تفاقین
دائیم بەتەمەرود و شیقاقن!...
گەردێ هەبووا مە ئیتتیفاقەک
ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەک
(ڕۆم) و (عەرەب) و (عەجەم) تەمامی
هەمیان ژ مەرا دکر غولامی!...
تەکمیل دکر مە (دین)و (دەوڵەت)
تەحسیل دکرد مە (عیلم) و (حیکمەت)
تەمییز دەبوون ژ هەڤ مەقالات
مومتاز دەبوون خودان کەمالات».

## حاجی قادری کۆیی[1]

## شێخ ڕەزای تاڵەبانی

(١)

«لە فکرم دێ (سولەیمانی) کە دارولمولکی (بابان) بوو
نە مەحکوومی (عەجەم)، نە سوخرەکێشی (ئالی عوسمان) بوو
لەبەر قاپیی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهید
مەتافی (کەعبە) بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی (پاشا)
سەدای مۆزیقە و نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە، ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەشتی (کانی ئاسکان)بوو
«بەزەربەو حەملەیی (بەغداد)ی تەسخیر کرد و تێی هەڵدا
(سولەیمان)ی زەمان ڕاستت دەوێ باوکی (سولەیمان) بوو
(عەرەب) ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەڵن ئەمما
(سەلاحەدین) کە دنیای گرت لە زومرەی (کوردی بابان) بوو
قوبووری پڕ لە نووری ئالی (بابان) پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان وەک هەوری نیسان بوو
کە (عەبدوڵلا پاشا) لەشکری والیی (سنە)ی شڕکرد
(ڕەزا) ئەو وەختە عومری پێنج و شەش تیفلی دەبستان بوو

(٢)

«قەومەکان بەو خوایە وا حوکمی لە سەر بەحر و بەڕە
بەرخەنێرێ گەر نەنێرێ هەر کەسێ ساحێب مەڕە
دێم بەگژیا دەیدڕم گەر فیلە سەل شێری نەڕە
با نەقەومێت و نەزانن ئەم هەموو شۆڕ و شەڕە
گشت لەسەر بزنی شەل و کاوڕی گەڕ و بەرخی لەڕە!».

(٣)

«کەڵەشێرێ بە(ڕەزا) لازمە کرماشانی
زیرەک و چابوک و دەم گەرم و دڕ و شەڕانی

---

[1] ئەم بابەتە لە نامیلکەی (حاجی قادری کۆیی)دا دووبارە بۆتەوە، باشترە کە دیسان دانەنرێتەوە.
بڕوانە: شاکر فەتاح، حاجی قادری کۆیی- چاپخانەی شارەوانی هەولێر ١٩٧٨

«کەڵەشێرێ کە قەپی گرت لە بنا گوێی کەڵەشێر
پڕ بەدەم بیــــپــــچــــڕێ وەک ســـەگی هەورامـــانی
کەڵەشێرێ کە ئەگەر شێری نەڕی بێتە مەساف
ڕایبڕفـــێنێ بەشـــەقێ مــــیـــسلی کـــەری تاڵانی
بەدرێژی وەکو مەولان بەگـەکـەی میری بەیات
بەجـەسـامـەت وەکـو کـوێخـا زلەکـەی بیـبـانی
ئەی (نەقیب زادە) بنێرە کەڵەشێرێکی وەها
بۆ(ڕەزا)کەی سەگەکەی قاپییەکەی (گەیلانی)!»

(٤)

«میر بەسەد مینەت هەناردی ئێسترێکی ڕووت و قووت
دەست و پاست و سەقەت ئەندامی هەروەک عەنکەبووت
خـــاوەنی ئالێکی ئاڵێم پێی نەداوە مـــوتلـــەقـــا
داوێتی ئەمما وەکو بیســتـوومـە قـوتی لایەمـووت!...
پشتی ڕیش و شانی زامدار و جەدوو بوو ناعیلاج
چەند قـــڕۆشـــێکم هەبوو بۆم دا بەنەوت و عەنزەڕووت
سەی فەتاحی مەیتەرم ڕۆژێ بەحوجـجـەت لێی نەوی
کلکی دەرهێنا لە بن، ئنجا بەعاستەم گوێی بزووت!.
«گـــەرچی ناتوانێ ببـــزوێ هێند لەڕو کـــەم قـــووەتە،
دەنکە جۆیێکی نیشان دەی تا قیامەت دێ لە دووت
پووش لە لای حەڵوایە حەتتا گەر پلـووشەی دەس کەوێ
بای دەداو لوولی دەداو قــووتی دەدا وەک نێــرە حـووت
گـەر قـەڵەو بێ ئەم ئەجنەی نێـرە چار ناکـرێ مـەگـەر
(شێخ ڕوفاعی) بێ عیلاجی کا بەئەسمای (جەلجەلووت)
مـەسـڵـەحـەت وایە هەتا نەیخـواردووم بینێـرمـەوە
زۆر دەترسم دەفـعـەیەک قـووتم بدا بمکا بەقـووت!».

(٥)

«مـاینەکـوێت جـاران کـە دەتگوت ڕەوتی ڕەوتی ئاهووە
ئێـــســـتـــە هەســـتـــانی لەســـەر ئاخـوڕ بەیاهوو یاهووە
قەت لە یەک قسناخ کەمی جۆ نادەمێ و هێشتا لەڕە
ســاڵ دوانزەی مــانگ ســواری نابم و هەر مــاندووە

گەر بەئاوزەنگی پەراسووی ئەم سەر ئەوسەر هەڵدڕی
هێندە نابزوێ بزانی مـاوە یاخـود مـردووە!...
«خـاوەنی پێشوویشی نازانێ کـە تەئریخ و سنەی
چەندە، ئەمما من لە پیـرانی قـەدیم بیسـتووە:
وەختێ (نادر شاه) هجوومی کردە سەر ئیقلیمی (ڕۆم)
تازە گـوایە ئەو لە زگ دایکی خـرووجی کـردووە!».

## زێوەر[1]

## قانیع

(١)

جارێکیان مامۆستا (قانیع)، بوێژی بەناوبانگ، لەسەر فرمان دادەمێنێ ڕوودەکاتە (دەربەندیخان) بۆ فرمان دەست کەوتن کە دەگاتە ئەوێ نامەیەک دەنووسێ بۆ مامۆستا (کەریم زەند)ی دۆستی کە بریتی دەبێ لە تاکە یەک دێڕی بچووک: «یا کەریمی کارساز مەددەدێ»

مامۆستا کەریمیش بەهەڵەداوان خۆی دەگەیێنێتە کن کاربەدەستانی دەربەند، تا (قانیع) دانامەزرێنێ لەسەر فرمانێکی باش وازناهێنێ!...

(٢)

ئەی (فلس) وەڵڵا لە داک و باب و باپیر چاتری
تۆ لە دووسەد خزم و خوێش و شێخ و دەسگیر چاتری
هەی بەقوربانی زەڕەت بم، ڕۆژی سەودا و مامەڵە
تۆ لە شـیـر و خەنجەر و بڕنەو گـەلێ ئازاتری
وابزانم بێ ئەدەب نابم ئەگـەر ئەمـڕۆ بڵێم
تۆ لە لوقمان و ئەرەستوو، عـالم و داناتری
من بەچاوی خۆم دەبینم کەمتیارت کرد بەشێر
بەینی بینەڵڵا لە خواجە و فـەیلەسووف وریاتری
چەند زەبەللاح و قورمساخ و تەڕاحت کرد بەپیاو
جـا کـەوابوو تۆ لە خـوێندن چاتر و بالاتری
کلکی کەر بەرز کەیتەوە، ئەیکەی بەپێشەنگی قەتار
ئافـەرین بۆ تۆ (فلس)، بێـشک لە من داناتری

---

(١) ئەم باسە و نموونە شیعریەکانیش، دیسان وان لە نامیلکەی (زێوەر)دا، بۆیە باشتروایە بیبوێرین.
بڕوانە: شاکر فتاح- زێوەر- چاپخانەی کامەرانی- سلێمانی ١٩٧٤

(٣)

(قانیعا)! گشت کەس ئەزانێ تۆ کزۆڵە و سەرکزی
تۆ لە گشت کەس بێ(فلووس)و بێ دەس و ڕیسواتری
کاکە (نانە)و مامە (درهەم) کۆمەکم بن بێمەلات
تۆ لە جەم جەمەتر، لە دارا بێ خەم و دارا تری
ئێستە کانێ، چۆن جەنابی (من) لە تۆ دوورم تەواو
تۆ لە ڕێوی، گەر خراپتر، لات و بێ عەنواتری
خوانەخواستە دەفعەیێ نەقشم ببینی تۆ بەخەو
جا ئەزانم چۆن لە گشت کەس، هار و بێ مەعناتری!.

(٤)

برابن غایەتان یەک بێ، برایی غایە یەکبوونە
ئەوەی کۆمەک بەفیکرت بێ، لە هەر لا بێ براتانە

(٥)

با سێ قات نەبێ خانوو و سەراکەت
پارەی قاتێکیان بدە بەبراکەت
دەوڵەمەند مەڵێ هەولی بۆ خۆیە!...
نەبوونی هەژار، نەبوونی تۆیە

(٦)

پرچ و بەرماڵ و سیواک ڕیش و کەشکۆڵ و عەبا
بۆ (سواڵ)ن، کەی ئەمە ئەسبابی ژین و حورمەتە ؟!...

(٧)

دەستی (مەردی) توند لە ئەڵقەی (کاسبی) مەحکەم بکە
پولێ ناکا هیممەتی (پیر شالیا و) (کۆنەپۆش)!...

(٨)

کاکی (مالیک)! پێم بڵێ بۆچی ئەمە نایبینتە ؟
خوێن مژینی ژێردەسەی بێ دەستەڵاتان دینتە!...
یەک قڕۆشت دا بە(ڕەبعیی تورک) و (تاپۆ)ت گرتە دەست
تا قیامەت ئەو قڕۆشە مایەکاری ژینتە ؟!...

(٩)

گوێ گره (قانوونی سۆشیالیستی) دەنگی دایەوە:
ڕۆژی مـەرگت زۆر نزیکە ئەو دەنگە (یاسین)تە!.
نۆکەر و پێش خزمەت و کارەکەر و دایەنەکەت:
کەوتە ڕۆژی خۆی بزانە (دوژمن)ی خوێنینتە!.
باخێ هێندە قایم و مەحکەم نەبووی من نەتگەمێ
(دەستی ئیستعمارە) هێز و کۆمەک و پەرژینتە!.

(١٠)

لە تۆزی ئاشدا غەرقم، لە تەوقی سەر هەتا ئەژنۆم
بەڵام چەند خۆشە ئەو تۆزە، کە هەر خۆم ئامیرم بۆ خۆم
نە ترسی ئەمری مافەوق و نە مەحکوومی بەراتی تۆم
لەسایەی زەحمەتی قاچ و سەرو دەس و ئەستۆم
لە بۆ کەس چاو لەبەر نێم و، خەیاڵی ڕێی ڕیا ناکەم!...(*)

## میرزای خورماڵی(١)

### مچەی حاجی برایم ئاغا

(١)

ئۆتۆمۆبیلچی، لە پاش ئەمەی ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆی لە دامێنی باخەکانی بەر گوندی (عەبابەیلێ)دا وەستاند، ڕووی کردە ئۆتۆمۆبیل سوارەکان و گوتی:- ئۆتۆمۆبیلەکەم مەکینەکەی کزبووە لەمە بەولاوە بەسەر بەرەو ژوورکەدا بڕ ناکات تکا دەکەم دابەزن، بەپێ بڕۆنە سەرشاخەکە!... (مچەی حاجی برایم ئاغا)یش کە یەکێک بوو لە گەشت کەرەکان تووڕە بوو بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:
- باوکم ئێوە ئەمە ناناسن... جارێکی تریش هەر وای لە ئێمە کرد... ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆی تۆقاندووە، هەر نەختێ بەرزایی ببینێ، وا دەزانێ کێوە و، پێیدا سەرناکەوێ!...

(٢)

بەرێکەوت سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجە و باوک و براکانی، هەموویان چاویان کزبووە (مچەی حاجی

---

(*): (قانیع) بەناگری (زۆرداری) و (دەربەدەری) و (نەخۆشی) و (بێ کەسی) و (نەخوێندەواری) تووایەوە، بەڵام کانزایەکی پاکی بێ گەردی ڕەسەنی پرشنگداری لێ پەیدابوو، کە بەپرشنگی هەست و بیروباوەڕی خۆی مێشکی (کوردەواری) ڕووناک کردەوە (ش.ف)

(١) ئەم بابەتەو (حلمی، ئەمە کۆستە، شێخ تۆفیقی گوڵپ، مەلا عارف) لە کتێبی یەکەم (یادداشتەکان...) ڕۆژنامەی خورماڵدا بڵاوکراوەتەوە، بۆیە لامان برد. بڕوانە (ئاوێنەی ژینم) ل: ٢٤٨-٣٢٦.

برایم ئاغا)یش، سالی ۱۹٤۰، لە هەڵەبجە فەرمانبەر بوو (مچە) پیاوێکی قسە خۆش بوو هاورێکانی، بەتایبەتی تووڕەیان دەکرد، هەر بۆ ئەمەی قسەی خۆشی پێ بکەن.

ڕۆژێکیان لە بابەت چاوکزی و چاوبەهێزی ئەو پیاوانەوە، فەرمانبەرەکانی هەڵەبجە لەگەڵ (مچە)دا کردیانە دەمەقاڵێ، دوایی (مچە) بەسوێندێک دەمەقاڵێیەکەی خۆی و ئەوانی بڕییەوە گوتی:-

«سا ژنەکەی خۆمم سێ بەسێ بەرەڵڵا کردبێ، تا پێنجەم شەو و شەشەم شەوی مانگیش، مانگ لە لایەن ماڵی سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجەوە نابینرێ!...».

## کفر ئەحمەد

### (۱)

جارێک (کفر ئەحمەد) دەچێتە گەڕاو (حەمام)ێک لە سلێمانی.

پارەی لە باخەڵدا نابێ دەترسێ لەوەی خاوەن گەرماوەکە بچێ بەگژێدا و تەریقی بکاتەوە دەس هەڵدەبڕێتە ئاسمان و دەڵێ: «خودایە! یان چەند پوولێک بخەیتە باخەڵمەوە، بیدەم بەم خاوەن گەرماوە یاخود گەرماوەکە بڕووخێنی، بەڵکو دەربازبسم و لەم شەرمەزارییە ڕزگارم ببی!.». زۆری پێ ناچێ گەرماوەکە بن میچەکەی قرچە دەکات و دەست دەکات بەڕووخان هەر کەسە بەلایەکدا دەرباز دەبێ (کفر ئەحمەد)یش بۆی تێ دەقاچێنێ و، لە دەست کابرای خاوەن گەرماو ڕزگاری دەبێ!.

(کفر ئەحمەد) لە ڕێگادا چاوی بەهەژارێک دەکەوێ لە خودا دەپاڕێتەوە، دەڵێ: «خودایە، بەگەورەیی خۆت یەکێکم بۆ بڕەخسێنیت چەند پوولێکم بداتێ». (کفر ئەحمەد)یش دەم و دەست پێی دەڵێ: «مردووت نەمرێ!... شێت بووی داوای پارە لە خودا دەکەیت؟! هەر ئێستە بۆ چەند پوولێک کە لێم داوا کرد، گەرماوێکی ڕووخاند!؟.».

### (۲)

(کفر ئەحمەد) مانگایەک و کەرێکی دەبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان مانگاکەی نەخۆش دەکەوی دڵی پێی تەنگ دەبێ دەست دەکات بەپاڕانەوە لە خودا دەڵێ:- «خودایە! کەر و مانگاکەم مەکوژە ئەگەر هەر دەیشکوژیت[1] کەرەکەم بکوژە!.».

کەچی کە بەیانی لە خەو هەڵدەستێت، تەماشا دەکات مانگاکەیەتی تۆپیوە! ئەویش ناکاتە نامەردی، دەچێتە بازاڕ، کوێرێک دەدۆزێتەوە و، دەیباتە ماڵەوە ئنجا دەستی کوێرەکە دەخاتە سەر مانگاکە و لێی دەپرسێ: «مەلا ئەمە چییە؟».

کوێرەکە دەڵێ: «ئەمە مانگایە!.».

ئنجا (کفر ئەحمەد) دەستی کوێرەکە دەخاتە سەر کەرەکە و، لێی دەپرسێ: «ئەی ئەمە چییە؟...». کوێرەکە دەڵێ «ئەمە کەرە».

---

(۱) ڕاستتر: دەیشیان کوژیت.

(کفر ئەحمەد)یش کە ئەوە لە کوێرەکە دەبینێ، دەست دەدات بەتەپڵی سەری خۆیدا و، ڕوودەکاتە ئاسمان، دەڵێ: «خودایە! ئەم کوێرە بەکوێری خۆیەوە زانی کامیان (کەرە) و کامیان (مانگا)یە ئەی تۆ بۆچی بەو هەموو چاوانەوە کە هەتە، لەجیاتی کەرەکە، مانگاکەت کوشتم؟!».

## مەلا سەعید

(١)

لە سلێمانیدا (مەلا سەعید) ناوێک پەیدادەبێ پیاوێکی ڕاستگۆ و خوداناس دەبێ حەز لە پیاوی درۆزن و دوو ڕوو ناکات لەبەرئەوە بەدڵ قینی لە سۆفییە مل قەوییە ریش پانە دووڕووەکەی مزگەوتی گەورە هەڵدەگرێ ئەم سۆفییە بۆ ئەمەی خەڵکەکە پێی بڵێن پیاوی چاک و خودا ناسە، دێنێ لە ڕۆژانی هەینیدا هەر لەبەر دەرگای مزگەوتی گەورەوە، بەردە وردە دەخاتە ناو قوڕ و چڵپاوەکەوە، هەتا بەهەیوانی مزگەوتەکە گوایە مەبەسی ئەوە بێ، کە موسوڵمانان بەسەر ئەو ڕێچکەیەدا بڕۆن، تا پێڵاوەکانیان قوڕاوی نەبن، تا ئەویش بەو کارەی، خودا لە گوناهی خۆش ببێت کە کاتی نوێژی ڕۆژی هەینی دێت، خەڵکەکە، هەموو بەسەر ئەو بەردە وردانەدا دەڕۆن کەچی (مەلا سەعید) پێڵاوەکانی خۆی دادەکەنێ و بەناو ئەو قوڕوچڵپاوەدا دەڕوات، تا دەگاتە سەر ئەستێرکی مزگەوتەکە کە لێی دەپرسن:

«مەلا سەعید! بۆ چ وا دەکەیت؟!» مەلا سەعید کوت و پڕ دەڵێ:

«بۆ ئەمەی بەشی من خودا لە گوناهی سۆفی خۆش نەبێت!».

(٢)

دەگێڕنەوە: (مەلا سەعید) بەدەست یەکێک لە شێخەکانی سلێمانیەوە ئازار و زیانی پێ دەگات ئەویش ڕوو دەکاتە شارەوانی سلێمانی (عەبادیا) ناوێک کە ئەندامی کۆڕی شارەوانی دەبێ، لەوێ دەبینێ کاتێک دەبینن ئەوا (مەلا سەعید) دەچێ دەستی (عەبادیا)ی مەسیحی ماچ دەکات! خەڵکەکە دەست دەکەن بەپێکەنین دەڵێن: «مەلا سەعید ئەوە چۆن دەستی (عەبادیا)ت ماچ کرد؟!...». مەلا سەعیدیش دەڵێ: «پێویستە گاورەکانی سلێمانی، هەموو ڕۆژێک سوپاسی خودا بکەن، کە پێغەمبەرەکەیان (مەسیح)، ژنی نەهێناوە، منداڵی بێ ئەگینا ئەوانیش وەک موسوڵمانەکانی ئێمە بەدەست نەوەکانی پێغەمبەرەکەیانەوە گیریان دەخوارد و تووشی ئازار و هاوار دەبوون!... منیش لە خۆشی ئەوەی کە (عیسا) پێغەمبەر ژنی نەهێناوە و منداڵی نەبووە، دەستی (خواجە عەبادیا)م ماچ کرد!... دیارە ئەگەر (عیسا) پێغەمبەرم بدیایە لێرە دەستی ئەوم ماچ دەکرد!».

## ئەمینەشێت[1]

شاکر فەتاح

(١)

###ماینە بۆرە

ئەو دەمە لاو بووم، تازە پێ دەگەیشتم ڕۆژێکیان ماینێکم لە هاوڕێیەکم خواست و چووم بۆ سەیران بۆ گوندی (زرِ گوێز)، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا بۆ ئێوارە هاتینەوە ماڵێ بەڵام ئەمەندە لە ڕێگادا غارمان کردبوو، خۆیشمان و ماین و ئەسپەکانیشمان لە پەلوپۆ کەوتبووین لە ڕاستیدا من خۆم حەزم لەو هەموو غارکردنە نەدەکرد.

بەڵام چونکە ئەوان بەغار دەڕۆیشتن، ئەگەر بەغار دوایان نەکەوتمایە، دوا دەکەوتم ئەو ڕێگا درێژەیشم درەنگ بۆ دەبڕرا هەر دوور نەبوو ڕێگایشم لێ ون ببێ بەکورتی: هاوڕێکانم جەربەزەبوون، بلیمەتبوون، چاویان لە ماندووبوون نەدەترسا کەهاتمەوە ماڵێ، گورج ماینەکەم نەبردەوە بۆ خاوەنی ئەمەیش لەسەر ئامۆژگاری باوکم بوو هەروەها، تا تەواو نەحەسایەوە و، کا و جۆ و ئاویشم نەدایە، نەم بردەوە بۆ خاوەنی کاتێ ماینەکەم بردەوە بۆ خاوەنی، ئامۆژگارییەکەی باوکم بۆ گێڕایەوە و پێم گوت: «باوکم دەڵێ: تا دوو سێ ڕۆژێکی تر سواری ماینەکە نەبێ ئەگینا ئەمەندە ماندوو بووە لەوانەیە بتۆپێ بەڵام هاوڕێکەم بەگوێی ئامۆژگارییەکەی باوکمی نەکرد ئەمەندە سواری ماینەبۆر بوو، سێ ڕۆژی تری پێ نەچوو تۆپی!... هاوڕێکانی سەیرانەکە بۆ ئەمەی پێ بکەنن، خاوەنی ماینەکەیان هانەدەدا لە من بەدناویان دەکردم بەکوشتنی ماینەکەوە ئەویش خۆش باوەڕ بوو، دڵی شکا!... بەڵام من هاوڕێکەم زۆر خۆش دەویست نەم دەویست دڵی لێم بشکێ زۆری لەگەڵدا خەریک بووم دڵی چاک بکەمەوە[1] بەڵام هەرچەندم کرد کەڵکی نەبوو!... دوایی خۆم و چەند هاوڕێیەکی تر ئەمەمان بەهەل زانی: بڕیارمان دا بەزمێکی لێوە بەرپابکەین بەڵکو بەسایەی ئەم بەزمەوە، ڕێگایەک بدۆزمەوە بۆ ئاشتبوونەوەمان.

بێ ئەمەی بهێڵێن خاوەن ماینی هاوڕێمان بەم کەینەوبەینەیە بزانێ، بیست و پێنج نامەمان نووسی و بەناوی ئاهەنگی مردنی ماینەبۆرەوە، دابەشمان کرد بەسەر هاوڕێ و ئاشنا و ناسیاوەکانماندا خاوەن ماین کاتێ زانی، هەموویان لە کاتی هەشتەمی بەیانیدا، لەناو دالانەکەی ماڵی ئەواندا کۆبووبنەوە

---

(١) ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی خورماڵدا -لە یاداشتەکان- کتێبی یەکەم، بڵاوکراوەتەوە هەروا بابەتەکانی دوای ئەمەیش: کابرایەکی شارەزووری، شەکر فرۆش، ڕەشید ئاغا، کوڕی مەلا سالح، مەلای دێی بەهرام بەگ، ڕەنجبەر و ئاغا، شەڕەدەم، مەلایەک و دەوڵەمەندێک، سەبیلکێشان، کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە، مەلا و حاجی، پشوی هاوینە، جووت ژمێرکردن، ئەمانە وان لە ڕۆژنامەی باسەڕەدا باشتر وایە دووپات نەبنەوە.

(١) لە دەسنووسی (خۆشخوانی)دا شیعرێکی تێدایە بەناوی (ماینەبۆرە) وەکە مامۆستا بەم بۆنەیەوە هەڵی بەستووە، لەم کتێبی دووەمدا لە بەشی (شاکر فەتاح و شیعر)دا دەیبینی.

بەسەزمانە، سەری سورمابوو، واقی ورمابوو، نەیدەزانی لەبەرچی لەوێدا کۆبووینەتەوە ڕوویشی نەدەهات لێمان بپرسێ: «بۆچی هاتووینەتە میوانی؟». بەڵام زۆری پێ نەچوو، ڕازی هاتنەکەمانی لێ ئاشکرا کرا و، گوتمان: «بۆ پرسەی ماینەبۆرە هاتووین، ئەلفاتیحە» ئیتر دەستمان کرد بە(فاتیحە) خوێندن و پێکەنین و سەرخۆشی کردن لە هاوڕێکەمان!... دوای ئەوە وتاربێژان و بوێژان دەستیان کرد بەوتاردان و هۆنراوە خوێندنەوە، کە هەموویان ستایش بوون بۆ (ماینەبۆر)و، بۆ پرسەکردن لە (خاوەنی بەڕێزی ماینەبۆر)!...

خاوەن ماینیش کە ئاهەنگەکە تەواو بوو، تێروپڕ قسەی پێ گوتین و، توانج و پلاریشی تێ گرتین ئێمەیش وەرامەکەمان ئەوەبوو: هەموومان دەستمان کرد بەپێکەنین بەڵام لەو کاتەدا کە خەریک بووین بڵاوەی لێ بکەین، شتێکم بیرکەوتەوە حەیفم لێ هات ئەو هەلە دەست بدەم دەمودەست چووم بۆ تەویلەکەی ماڵی هاوڕێکەمان و، زین و ڕەشمە و لەغاوی ماینەکە و، توورەکەی کاو جۆکەیم دا بەکۆڵمدا و هێنامە بەردەم ئاهەنگ گێڕەکان وگوتم: «ئەمەیش کەلەپووری خوداڵێ خۆش بوو، (ماینەبۆر)ە، (ئەلفاتیحە)!... دانیشتووانی هەموویان دەستیان کرد بە(فاتیحە) خوێندن و پێکەنین.

ئیتر لە ناوەند تووڕەیی خاوەن ماین و، تریق و هووڕ و پێ کەنینی بانگ کراوەکاندا بڵاوەمان لێ کرد!...

ئەم هەموو کەتنە و کەچی، لەپاش چەند ڕۆژێک من و هاوڕێکەم بە ئاسانی ئاشتمان بووەوە!...

(٢)

## بەزمێک لەسەر کۆنەپەرستی!

لاوێک لە ئەمەریکا هاتەوە خوێندنێکی باشی خوێندبوو بەڵام لە خۆی زۆر بایی بووبوو گاڵتەی بەهەموو شێوەیەکی ژیانی (کوردەواری)مان دەکرد، تیزی دەکرد بە(ترخێنە)و (نێرگەلە)!.

توانج و پلاری دەگرت لە (کەشیدە) و (مێزەر)!... خۆ (کووپەی شین) و (سوێنەی جل شتن) و (مەسینە) و (لەگەن) و (گلێنە) و (مەرکانە)ی هەر بەجارێک دابووە بەر کلکان!. کە (مزگەوت)ێکی دەبینی ڕووی دەکرد بەو لاوە!. کە (کەشیشێک)ی دەدی، دەستی دەکرد بەپێکەنین!... هەرچی (ڕیشو) و(سمێڵ) و (پاوانە) و (خرخاڵ) و (خەتەنەسووران) و (خەنەبەندان) و (پاش تێلانە)یش هەبوون، ئەوە هەر بەجارێ هورووژمی دەبردە سەریان!... کە ناوی (مەلا کوێرەکان)ی مزگەوتی گەورە و (تەزبێح) و (سیواک)ی دەروێشەکان بهاتایە دڵی تێکەڵ دەهات!... کە ناوی (پرسەکردن) و (سێ ڕۆژگانە) و (کولێرەی ئیمام عەباس) و (شەوی شەوی بەراتێ)یشت لا بهێنایە، ئەوە هەر شێت دەبوو!...

کە دایکی مرد، ناشتی بەڵام تەلەفۆنی بۆ خاڵی کرد، گوتی:

«من ئارەزووی (پرسەکردن) ناکەم تۆ لەوێ پرسەی بۆ بگرە!». بەکورتی هاوڕێکەمان وای لێ هاتبوو، کە دەستیان دەگوشی، دەستی دەشت!... کە ماچیان دەکرد، دەموچاوی خۆی گڵاو دەکرد!... کە دەرگایەکیشی دەکردەوە بەچمکی چاکەتەکەی دەیکردەوە، نەوەک دەستی پیس ببێ!؟...

هەرچی (کاربەدەستان) و (دەوڵەمەندان) و (خاوەن سایە و پایە)یش بوون، ئەوە هەر بەشوورەیی

دادەنا کە پیاو تێکەڵییان بکات!...

بەکورتی هاورێکەمان ئەمەندە لە وزە دەرچووبوو، هاورێ و ناسیاو و ئاشناکانیشی، کە ئەمەیان لێ دەبیست و لێ دەدی، زۆرتر سەریان دەکردە سەری بەتایبەتی هەرچی پێچەوانەی دڵی ئەو بووایە ئەوەیان دەکرد، بۆ ئەمەی توورەی بکەن و پێی پێبکەنن!؟.

لەگەڵ ئەمانەیشدا هەمووی لاوەکە کورێکی چاکەخواز و دڵتەڕ و دەست بڵاو و دڵپاک و بەرێزمان دەهاتە پێش چاو هەندێک لە قسەکانیشی لە ڕاستی بەدەرنەبوون هەندێک لە کردەوەکانیشی ناپەسەند نەبوون.

لەبەرئەوە من و چەند کەسێکی تر بووبووین بەهاورێی بەڵام لە دەست توانج و پلار و هورووژمی ئەو ڕزگارمان نەدەبوو ئێمەیش لە توورەکردنی ئەو و، پێکەنینی خۆمان درێغیمان نەدەکرد!...

ڕۆژێکیان بەنهێنی پێمان زانی: کە چەند کەسێکی لە خاوەن (پایە) و (مایە) و سایە، بانگ کردبوو بۆ نان خواردن، کە یەکێکیان لە کاربەدەستە گەورەکان بوو بەڵام لە هاورێکانی خۆی کە ئێمە بووین کەسمانی بانگ نەکردبوو!. ئێمەیش ئەمەمان بەهەل زانی کە بەزمێکی لێوە پەیدا بکەین!... لیژنەیەکمان بۆ دوروست کرد بەنهێنی بریاری چەند شتێکمان دا بیکەین تا کەلوپەلی ئەو بەزمەمان پەیداکرد شەو و ڕۆژێکی پێوە خەریک بووین دەنگمان نەکرد تا لە نان خواردن بوونەوە کاتێکیان بەخۆیان زانی سەرمان کرد بەژووردا یەکێمان نێرگەلەی هێنابوو لەگەڵ خۆیدا دەیکێشا!. یەکێمان بوخووری دەسووتاند لەبەردەمی خۆیدا!... یەکێکمان لە ناو دەسکەوانێکی زلدا قاوەی بۆ دەکوتا!... یەکێمان نوشتەیەکی سێ سووچی لە قەنەوزی سەوز گیراوی بەپشتی چاکەتەکەی هاورێکەمانەوە قایم دەکرد!...

یەکێکمان کووژەکەیەکی شینی بەپێشی سیدارەکەیەوە بەند دەکرد!.

یەکێکمان بەسیواک دەمی خۆی پاک دەکردەوە! یەکێکمان ڕستە (تەزبێح)یەکی بەدەستەوە گرتبوو، ناوی خودا و پێغەمبەری دەهێنا!... یەکێکمان زەرگێکی دەروێشانەی بەدەستەوە گرتبوو هەڵی دەسووڕاند!.

یەکێکیشمان لە پارچە تەختەیەکی درێژ کۆڵەدا چەند فەرموودەیەکی خودایی نووسیبووەوە بۆ چاوەزار، بەپێش دەرگای خانووی هاورێکەمانەوە دایدە کوتا!...

کە بانگ کراوەکان ئەمەیان چاو پێکەوت، تێگەیشتن نیازی چیمان هەیە، هەموویان دەستیان کرد بەپێکەنین!. بەڵام هاورێکەمان لچی هەڵدەقورتاند و، ڕووی گرژ دەکرد و، لێمان توورەدەبوو.

جار بەجارێکیش قسەی پێدەگوتین و هەڕەشەی لێ دەکردین!... بەڵام ئێمە تا ئەو وای دەکرد زۆرتر پێدەکەنین!...

دوایی پێمان گوت: «بۆچ توورە دەبیت؟... نان و خوانی گەورە پیاوان ئاهەنگی وای دەوێ!... بۆچ خراپمان کردووە دڵی میوانەکانتمان خۆش کردووە؟ ئەویش پێی گوتین:

«ڕۆژێکم مابێ بۆ ئێوە دەمێنم!...».

ئەمەندە و، کەچی زۆری پێ نەچوو، (میر) لەگەڵماندا ئاشت بووەوەو، نان و خوانێکی جوانیشی بۆ ڕازاندینەوە!؟.

(٣)

ڕەنجەڕۆ دەڵێ: «ئەوەی من دەیچێنم، دەیچنن. ئەوەی من دەیچنم، دەیچنن. ئەوەی منیش دەیچنم، دەیجوون!...

(٤)

دووڕوو، بەسەرزاری: زاریەتی، لە پاش ملە: تلی لیلی!...

(٥)

لێرە تێر برسی ترە لە برسی، خوێندەوار بەهاوارترە لە نەخوێندەوار.

(٦)

«لە ئاستی ڕاستدا بەد هەر دەنەوێ، خودا ڕاستە و پیاوی ڕاستی خۆش دەوێ».

(٧)

دڵخۆشی هێزە، دڵتەنگی گوناهە، تۆیش خۆت مەکە بەگوناهبار.

(٩)

هەر بۆ ژیانی جیهانی خەبات مەکە، هەر بۆ ژیانی پاش مردنیش خەبات مەکە، بۆ هەردوو ژیانەکە خەبات بکە، پێغەمبەریش هەروای فەرمووە.

(١٠)

تۆ چۆن بیر لە دواڕۆژی خۆت بکەیتەوە وەهات لێ دێت، لەبەرئەوە هەر لە ئێستاوە بیر لە سەرکەوتن بکەرەوە، تا لە ژیانتدا سەرکەوتوبیت (زانستی خۆناسین)یش هەروا ئامۆژگاریت دەکات.

## قسەی نەستەق پەندی پێشینان

### ناسکە قسە

١- لە عیسایاندا، مووسا بەتاسەوەچوو.
٢- سەگی کونەماسییە و پاسی جرتاوا دەکات.
٣- کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە.
٤- دار هەڵبڕیت سەگی دز دیارە.
٥- ئەوەی بەتەمای کاسەی دراوسێ بێ، بێ شێو سەردەنێتەوە.
٦- کە پشیلە لە ماڵ نەبێ، مشکان تیلیلییانە.
٧- کە شێر لە بێشەدا نەما، چەقەڵ و ڕێوی دەکەونە سەما.
٨- لە جێی سندان قوززەرقورتە.

٩- نه داربێ و نه پەردوو، لەعنەت بێ لە هەردوو.

١٠- کوتەک دەزانێ قۆناخ لە کوێیە.

١١- تۆبەی گورگ مەرگە.

١٢- سابوون مەدە لە ژێر پێم.

١٣- تا ماڵ خۆ دزی گرت، دز ماڵ خۆی گرت.

١٤- کەر بکەویتە ماڵی ددانی دەشکێ.

١٥- زستانان پینە و پەرۆ، هاوینان وردە وردە برۆ.

١٦- ئەمە ئیشە بەڵمە ریشە؟! ئەمە کارە مام تەپاڵە؟! ئەمە دینە مام پەڵپەینە؟!...

١٧- کەمتیار پیاوی چاکە، قولەپێی بسمی دەنگ ناکا.

١٨- بزن بۆ شەوێکیش بێ، جێی خۆی خۆش دەکا.

١٩- برامان برایی، کیسەمان جیایی.

٢٠- لە بێ خەبەران کەشکەک سەڵەوات.

٢١- مەنیشە بەلای نوشتەی مەلاوە، بنیشە بەلای کەرەمی خوداوە.

٢٢- ئەوەندە توورەیە، شەڕ لەگەڵ کلکی خۆیدا دەکات.

٢٣- مەبە بەئاردی ناو دڕکان.

٢٤- قسە کە کەوتە زارێ، کەوتە شارێ.

٢٥- ڕێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ کە، دەیگوت ترشە نایخۆم!...

٢٦- هەرچی ڕیشی سوور بێ، هەمزە ئاغا نییە.

٢٧- هەر لە عەرش هەتا قورش، کەس بەدۆی خۆی نالێ ترش.

٢٨- وەک کەری دێز وایە، تۆپینی خۆی و زبانی خاوەنی دەوێ.

٢٩- ماست نییە بەسمێڵتەوە دیار بێ.

٣٠- لە پاش باران، کەپەنەک.

٣١- نە پێڵاوی تەنگ، نەخانەی بەجەنگ.

٣٢- کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە.

٣٣- بچۆرە شارێ کە کەس نەتناسێ، خۆت هەڵبکێشە پڕ بەکراسێ.

٣٤- کالاّبە پێی بالاّیە.

٣٥- ئەوەندەی بەڕەی خۆت پێت ڕابکێشە.

٣٦- مێشوولە نەچێ چاکە بەگژ قوللەی قافدا.

٣٧- درۆزن هەر جارێ ئاشتا دەکا.

٣٨- کێچ لە باخەڵیدا سەوزەڵە گیانم دەڵێ.
٣٩- وەکو نیسک وایە بەروپشتی بۆ نییە.
٤٠- هەزار ئەفسوون و جادووی پێوە ئاوێزانە ئەم ڕیشە.
٤١- بەڕیش نیە بەئیشە.
٤٢- ئەوەندە دزە کل لە چاو دەفڕێنێ.
٤٣- لە هوویەک موویەک دەکاتەوە.
٤٤- موویەک لە بەراز ببێتەوە چاکترە.
٤٥- سەگی هەڵەوەڕ، دز دەهێنێتە سەر خاوەن ماڵ.
٤٦- ڕێوی تا قەواڵەی خوێندەوە پێستیان کەند.
٤٧- لە ڕێویان پرسی: «کێ شاهێدتە؟». گوتی: «کلکم!».
٤٨- لەکن خۆی چوو بۆ ڕیش، کەچی سمێڵیشی نایە بانی!...
٤٩- نە سەگی دڕو، نە زمانی شڕ.
٥٠- گوڵ بێ دڕک نابێ.
٥١- دار پوازی لە خۆی نەبێ نابڕێتەوە.
٥٢- ئاو ببرێ لە ڕۆخانە، هەر خۆ چاکترە لە بێگانە.
٥٣- ژنیش هەیە و ژانیش هەیە.
٥٤- من بۆیە پێت دەڵێم «مامە»، کە چۆلەکەم بۆ بگربت.
٥٥- ئەو نانە نانە ئیمڕۆ لە خوانە.
٥٦- بەحوشتریان گوت: «کوڕت بوو». گوتی: «بەمن چی»!...
٥٧- پادار بگرە، بێ پا ماڵی خۆمانە.
٥٨- دۆست و دوژمن لە ڕۆژی تەنگانەدا دەردەکەون.
٥٩- دۆست ئەوەتا دەتگریێنێ، دوژمن ئەودتا پێت پێدەکەنێ.
٦٠- لە ئێستریان پرسی: «باوکت کێیە؟». گوتی: «خاڵم ئەسپە!»
٦١- پوور ئەگەر نێر بوایە، مام دەردەچوو!...
٦٢- برا لە پشت برابێ، مەرگ مەگەر لە لای خودا بێ.
٦٣- چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاودوە.
٦٤- چاکە بۆ خوێش، نەک بۆ دەروێش.
٦٥- دیواریش گوێی هەیە.
٦٦- سوار تا نەگلێ نابێ بەسوار.
٦٧- پرسابە و زانا بە.

٦٨- کابە بڕوخێنە و دڵێ مەڕەنجێنە.
٦٩- دەرزی بەخۆتدا بکە، ئنجا شووژن بەخەڵکدا بکە.
٧٠- دڵ ئاوێنەی دڵە.
٧١- ئەو جێیە خۆشە کە دڵ تیا خۆشە.
٧٢- دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.
٧٣- کە دادپەروەری لە ئارادا بوو، گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە.
٧٤- سەر بۆ سەربڕین، نەک بۆ سەرزەنشت.
٧٥- دوو شووتی بەدەستێ هەڵناگیرێ.
٧٦- دەستێ دۆست بیبڕێ خوێنی نایە.
٧٧- دەستێ نەتوانیت بیبڕیت، ماچی بکە.
٧٨- ناچاری سەر بەماڵی دوژمندا دەکا.
٧٩- گوندۆرە بەڕەنگ نیە.
٨٠- یاخوا دەستی چەپیشت داماوی دەستی ڕاستت نەبێ.

## مەتەڵ

ئەمە چییە؟ هەڵی بهێنە:

١- بنی تەسکە و دەمی بڵاوە؟
٢- دەمەو خواری کەی: پڕە، دەمەوژووری کەی: بەتاڵە؟
٣- سەری یەکە و بنی دوو، بەریشی باو و باپیرتا هەڵچوو؟
٤- پێتەوە دەنێن، لێت نابێتەوە؟
٥- هەر ئەڕۆیت و لێت بەردەبێتەوە؟
٦- تەڕی نەکەی، بەلی ئەکەی، بەخۆتیا ئەکەی؟
٧- سواری نەزێ بووم دام لە نەوەڕ چووم بۆ نەکێڵ.
٨- چەند دەوران دەورێ، دوو ئاو لە جامێ، هەریەک لە تەورێ.
٩- لە دوور هات، لە نوور هات، دوو کەڵافەی زەرد و سوور هات.
١٠- کەڵافەی چین چین، مورغی بێ زبان، هەرچی هەڵی بهێنی ئەحمەد پاڵەوان.
١١- قسەیەکم هەیە یەجگار باریکە: شەوی ڕۆشن لە ڕۆژی تاریکا.
١٢- هەشت پاسەل حورتی، دوو پا مانووتی دوو پا مالووتی: حا دەکا، هەشت پاسەل حورتی ڕا ئەکا.
١٣- (یەک)ی من و (دوو)ی خەڕات خرەخرێتی: لە (پێش) و لە (دوا)ت لە (تۆ)ی دەرئەکەم، نەیخەمە (برا)ت.

١٤- هەڵمەت دەبا بۆ پێشێ، ددانی نییە بیکێشێ.
١٥- زڵ زەیستان، قاڵیی کوردستان، هەرچی هەڵی بهێنێ ئێستری بستان.
١٦- قەڵای گەچین، ڕێ نیە تێی چین.
١٧- قەڵای گۆشتین، پێ پیلکەی ئاسنین.
١٨- هەر دەڕۆیت و نایگەیتێ؟
١٩- بەسێ برا کلاوێکیان هەیە؟
٢٠- ئەم لا پەرژین، ئەولا پەرژین، تێدایە کۆترێکی نەخشین؟
٢١- یەکێک بوو لە دێی (خورماڵ)دا دەژیا: پاسەوان بوو، بەڵام تفەنگی نەبوو چیرۆک خوان بوو، بەڵام نووسراوی بەدەستەوە نەبوو کەبابچی بوو، کەچی شیشی کەباب برژاندنی نەبوو.
ئێشکگری دووکانەکانی خورماڵ بوو، کەچی دەنوست کە دەیشنوست لەسەر هەشت کورسی دەنوست بەکورتی هەشت جۆر کار و فرمانی هەبوو، کەچی نانی شەوی نەبوو گریانیشی نەدەهات، کەچی دەگریا!...

**وەرامەکان ئەمەتان:**

١- کلاوە. ٢- کلاوە. ٣- دەرپێیە. ٤- ناوە. ٥- شوێن پێیە. ٦- کەوچکە. ٧- واتا: سواری ئێستر بوو دام لە ئاو چووم بۆ خوێ. ٨- هێلکەیە. ٩- زەردەواڵەیە. ١٠- مارە. ١١- چاوە. ١٢- جووتی گایە. ١٣- خەرەکە. ١٤- مەشکەیە. ١٥- حەسیرە. ١٦- هێلکەیە. ١٧- ماینە. ١٨- سێبەرە. ١٩- سێپایە. ٢٠- چاوە. ٢١- ئەمە کەس نییە (میرزای غەفووری خورماڵی)نەبێ!...
(ش.ف)

## پێکەنینی جیهانی

(ناسکە قسە)، (وتاری خۆش)، (قسەی نەستەق)، (هۆنراوەی بەجۆش)، (دەنگوباسی گەورە پیاوان و ڕۆشنبیران)، (پەندی پێشینان)، (گاڵتەوگەپ)

### محەمەد پێغەمبەر (د.خ)

(١)

«وا تێبکۆشە بۆ جیهانەکەت، هەروەک تا سەر دەمێنیت و نامریت».

«وایش تێبکۆشە بۆ پاش مردنت، هەروەک سبەینێ بمریت».

(٢)

«چیت پێخۆشە بۆ خۆتی بکەیت، ئەوەیش بۆ براکەت بکە».

(٣)

«هەر لە بێشکەکەوە هەتا گۆڕەکەت هۆگری زانست بە».

(٤)

«هۆگری زانست بە، تەنانەت ئەگەر لە چینیشدا دەستت بکەوێ، هۆگری بە».

### عومەری خەتتاب

«هەر کەسێک لە کاربەدەستەکانم زۆری لە یەکێک کردبێ و پێم زانیبێ و ئەو زۆرداریەم لەسەر ئەو زۆر لێکراوە لانەبردبێ، لە ڕاستیدا زۆردارییەکە خۆم لێم کردووە!...»

### زوهەیری ئەبوو سەلما

(١)

«سەربەرزی، هەتا لەم لاو لەولایەوە خوێن نەڕێژێ، ڕزگاری ناکرێ».

(٢)

«ئەو کەسەی دەستی بڕوا و درێغی بکات لە نەتەوەی خۆی، ئەفەرۆز و بەدناو دەکرێ».

### ئەبول عولا ئول مەعەڕری

(١)

«لە ئاودا سەرتان لە مەلەوان شێواند

لە ئاسمانیشدا پەلەوەرتان داچڵەکاند

ئەمە ئێوە لە ئاودەچن و ئەمە دەکەن:

هەی بێ ئابڕووینە، ئەگەر نەمردنایە چیتان دەکرد؟!».

(٢)

نە چاکە خوازیان و، نە خودا ناسیان:
کەسێکیان تێدا نابینیت، بۆ خودای بکات، هەر کەسەیان بۆ کەڵکی خۆی دەیکات لە ڕاستیدا کەڵەبەردێک لە هەرە چاکەکەیان چاکترە چونکە نە زۆروستەم لە کەس دەکات و نە درۆیش دەکات.

(٣)

لە (ئەبول عولا)یان پرسی «بۆچ ژن ناهێنیت منداڵت ببێ؟»
گوتی: «باوکم کە منی هێنایە جیهانەوە، کەتنی کرد بەڵام من نامەوێ کەتن بەرامبەری هیچ کەسێک بکەم!».

## جەمالەدینی ئەفغانی

(جەمالەدینی ئەفغانی)، پیاوێکی زانا و وێژەوان و زرنگکار و خوداناس و ئازادی پەروەر بووە کە ڕێی دەکەوێتە (ئەستەمووڵ)، (سوڵتان عەبدولحەمید) زۆر ڕێزی لێ دەگرێ ڕۆژێکیان لە بەردەم (سوڵتان عەبدول حەمید)دا ڕستە (تەزبێح)ەکەی خۆی دەردەهێنێ و خۆی پێوە خەریک دەکات کە لە (سوڵتان) جیا دەبێتەوە، کاربەدەستەکانی کۆشک بەشیرینییەکەوە ئامۆژگاریی (جەمالەدینی ئەفغانی) دەکەن کە جارێکی تر لەبەردەم (سوڵتان عەبدول حەمید)دا ڕستەکەی بەکارنەهێنێ.
(جەمالەدین)یش دەمودەست دەڵێ:- «بەڕاستی ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە (سوڵتان عەبدول حەمید) کە یاری بەکاروباری ئەم هەموو نەتەوانەی ژێر دەستی خۆی دەکات، کردەوەکەی پەسەند بێ، کەچی ئەگەر من یاری بەڕستەکەی خۆم بکەم، کردەوەکەم، پەسەند نەبێ!؟.».

## شێخ محەمەد عەبدە

(شێخ محەمەد) پیاوێکی زانای خوداناسی شۆڕشگێڕی خەباتکار بووە لە میسردا لە بنچینەدا کورد بووە ئەمە یەکێکە لە هۆنراوەکانی:- «من ویستم و خەباتم کرد (ئایینی ئیسلام) بەڕاستی و دروستییەکەی خۆیەوە، جارێکی تر بهێنمەوە کایەوە و کاری پێ بکرێ.
چونکە لەوە دەترسام هەندێک لە خاوەن مێزەرەکان لە ناوی ببەن».

## شێخی سەعدی

(١)

(شێخی سەعدی) هەرچەندە بەوێژەوان و بوێژ و زانایەکی تێگەیشتووی (فارس) دادەنرێ، بەڵام لە ڕاستیدا (کورد)ە. ئەمە، پەرچڤەی هەندێک لە هۆنراوە نایابەکانێتی، کە هەتا مرۆڤ دەمێنێ، کەڵکیان لێ وەردەگری:-

نەوەی ئادەم هەموویان وەک پەلوپۆی یەکتر وانە
چونکە لە بنچینەدا هەموویان لە یەک گەوهەر کەوتوونەتەوە

ئەگەر پەلوپۆیەک، لە لایەن ڕۆژگارەوە دەردی تووش بێ
هەموو پەلوپۆیەکانی تریش لە تاو ئەو ئازارە ئارام بەخۆیان ناگرن.

(٢)

ئەگەر تۆ لە چارەسەرکردنی سەرگەردانی کەسانی تردا کەم تەرخەمی بنوێنی هەڵناگریت ناوت بنرێ (مرۆڤ)!؟...

(٣)

ئەی ئەو کەسەی پابەندی (خێزان) خراوەتەپێت
ئیتر جارێکی تر بەبیرتدا نەیێتەوە کە ئازادیت!.

(٤)

ناشێ کەس خەمی کەڵک و چاکە و پێشکەوتنی مرۆڤ لەم جیهانەدا نەخوات.
هەر کەسێ ئەو خەمەی نەخوارد، بەنەوەی ئادەم دانانرێت.

## غاندی

(١)

(غاندی) لە توانایییدا هەبوو، جێگای هەرە باش و هەرە گران، لە کاروانە ئاسنینە (شەمەندەفەر)دا سواربێ کەچی هەر سواری ژووری پلەی سێهەم دەبوو!... مەبەسیشی لەوە ئەوە بوو کە هەموو دەم لەناو جەرگی بەشی زۆری نەتەوەی هێندا بێ، کە زۆربەیان لە هەژار و ناوەڕاست بوون جارێکیان لێیان پرسی: «بۆچ تۆ، هەموو جارێ هەر سواری ژووری سێ هەم بابەت دەبیت؟...».

ئەویش لە وەرامدا گوتی: «چونکە چوارەم بابەتم دەست ناکەوێت!؟...».

(٢)

جارێکیان (غاندی) دەچێتە (لەندەن) دوای بەئەنجام گەیاندنی کاروباری (سەربەخۆیی هیندستان) دەکەوێ خونکاری (بەریتانیا)یش بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکی نانخواردنی بۆ دەگێڕێ بەڵام (غاندی) لەسەر دوو مەرج ئەو ئاهەنگە پەسەند دەکات:

١- کە هاتە ئاهەنگەکە بزنەکەی خۆی لەگەڵ خۆیدا بیات تا لەوێ شیرەکەی بۆ بدۆشرێ و بیخواتەوە!...

٢- بەجلوبەرگە ساکارە (هیندی)یەکەی خۆیشییەوە، لەناو ئاهەنگەکەدا دابنیشێ!...

سەیر ئەوەیە شاهەنشاهی ئینگلیز هەردوو مەرجەکەی غاندیی پەسند کردبوو!...

(٣)

لە (غاندی)یان پرسی: «ئینگلیز چۆن دەناسیت؟».

ئەویش گوتی: ئەگەر لە ناو دەریادا دوو ماسی شەڕ بکەن، پەنجەی ئینگلیزی تێدایە!؟.».

## ئەدیسن

(١)

که (ئەدیسن) گەیشتە تەمەنی هەشتا ساڵی، لە ئەورووپا و لە ئەمەریکاوە سێ سەد زانا و داهێنەر لە ماڵەکەی ئەودا کۆبوونەوە، ئاهەنگ و زەماوەندی جەژنی لەدایکبوونی خۆی بۆ بکەن کەچی کە (ئەدیسن) تێگەیشت بۆچی هاتوون، وەک منداڵێکی ساوا دەستی کرد بەپێکەنین بەجێی هێشتن و رایکردەوە ناو (کارگە)کەی خۆی!.

زاناکان و داهێنەرەکان هەرچەندە ئەمەیان لەو ڕانەدەپەرموو کە وا بکات، بەڵام لە ترسی ئەوەی سەری لێ بشێوێن، وازیان لێ هێنا ئەو چوو خەریکی (داهێنان)ی خۆی بێ و ئەمانیش چوون ئاهەنگ و زەماوەندی بۆ بگێڕن!؟.

(٢)

جارێکیان (ئەدیسن) بەگەرمییەکەوە لە فەرمانبەرێکی تەلگرافخانەی کۆنی پرسی کە تەلگرافی تێبگەیێنێ چییە؟. کابرایش پێی گوت: «تا سەگێک نەهێنیتە پێش چاوت، ئەمەندە درێژ بێت: کلکی لە شاری (ئەدینبورگ) و سەلکی لە شاری (لەندەن) بێ ئەنجا هەتا لە (ئەدینبۆرگ) بەکلکیدا ئەنووسیت ئەو لە (لەندەن) ئەلوورێنێ، تۆ لە تەلگراف تێ ناگەیت!؟...».

بەڵێ کە (ئەدیسن) هەرزەکار بوو، کابرای تەلگرافخانە وای پێ گوت (ئەدیسن)یش ئەو (ئەدیسن)ە بوو، کاتێ کە مرد، داهێنراوەکانی لە دوو هەزار داهێنراو تێپەریان کردبوو!...

## بەرناردشۆ

(١)

(بەرناردشۆ) نووسەرێکی گەورەی ئیرلاندیی بوو بەڵام لە بەریتانیادا دەژیا خووی وا گرتبوو: بەناو خانووەکەی خۆیدا دەگەڕا و قسەی لەگەڵ خۆیدا دەکرد جارێکیان هاوڕێیەکی لێی پرسی: «بۆچ ئەمەندە لەگەڵ خۆتدا قسەدەکەیت؟...».

(بەرناردشۆ)یش وەرامی دایەوە گوتی:

«بۆ ئەم کردەوەیەم دوو هۆ هەیە: یەکەمیان ئەوەیە حەزدەکەم لەگەڵ پیاوێکی زیرەکدا قسە بکەم دووەمیشیان ئەوەیە کە حەزدەکەم گوێ لە مرۆڤێکی زیرەک بگرم!.».

(٢)

(بەرناردشۆ) کە پیربوو، ریشێکی سپی تۆپ و سەرێکی رووتی بێ تووکی هەبوو... جارێکیان لێیان پرسی: «جیهانت چۆن دێتە پێش چاو؟». (بەرناردشۆ)یش دەستی برد بۆ سەروریشی خۆی، گوتی: «باری جیهان وەک باری ناوەند سەرو ریشم وایە: بەرهەمی یەجگار زۆرە بەڵام شێوەی دابەشکردنی ئەو بەرهەمەی یەجگار خراپە!.».

(٣)

جارێکیان (بەرناردشۆ) لە ئاهەنگێکدا تووشی (میستەر چەرچل) دێ، کە ئەوساکە سەرەکی کاربەدەستانی بەریتانیا و سەرەکی دەستەی کۆنە پارێز (محافظین)بوو... (چەرچل) پێی دەڵێ: «هەرچەند تۆ دەبینم نەبوونی و برسێتی و گرانیم بیر دەکەوێتەوە!...».

(بەرناردشۆ)یش ناکاتە نامەردی، دەمودەست وەرامی دەداتەوە، دەڵێ: «منیش هەرچەند تۆ دەبینم هۆی نەبوونی و برسێتی و گرانیم بیر دەکەوێتەوە!؟».

(٤)

جارێکیان کچێکی جوان بە(بەرناردشۆ) دەڵێ:

«خۆزگە من ژنی تۆ بوومایە ئەوساکە منداڵەکەمان، زیرەکی تۆ و جوانی منی دەبوو!.».

(بەرناردشۆ)یش وەرامی دەداتەوە دەڵێ: منیش لەوە دەترسم زیرەکی تۆ و جوانی منی ببوایە!...».

## تەیموور لەنگ

(١)

جارێکیان (مەلای مەزبوورە) و (تەیموور لەنگ) لەناو سەرشۆرکێکدا خۆیان دەشت (تەیموور) لە (مەلا)ی پرسی: «ئەگەر بمبەنە بازاڕ، بمفرۆشن، چەند دەکەم؟.».

(مەلا)یش وەرامی دایەوە گوتی: «هەزار لیرە!»...

(تەیموور)یش گوتی: «خودا نەتگرێ خۆ هەر کەوڵەکەی لەبەرمدایە بای هەزار لیرەیە!»...

(مەلا)یش گوتی: «دەمن بەوەیشەوە ئەو نرخەم بۆ داناویت!؟».

(٢)

جارێکیان دانیشتووانی ئاوایی تکایان لە (مەلای مەزبوورە) کرد، بۆیان بپاڕێتەوە لە (تەیموور لەنگ)ی دۆستی، بەڵکو فەرمان بدات نێرەفیلەکەی بگرنەوە، تا ئەوەندە بەناوباخ و شینایییەکانیاندا هاتوچۆ نەکات و نەیان پلیشێنێتەوە و زیانیان لێ نەدات.

(مەلا)یش پێی گوتن: «باشە دەچم پێی دەڵێم بەڵام بەو مەرجەی ئێوەیش هەمووتان لەگەڵمدا بێن، تا ئێوە منتان ڕاسپاردووە بۆ ئەم کارە دوایی خۆی و دانیشتووانی ئاوایییەکە، هەموویان، بە گەلە، چوون بۆ بارەگای (تەیموور) لە دوور خێوەتەکەیەوە وەستان.

(مەلا)یش چووە پێشەوە بۆ لای (تەیموور) کاتێ کە (تەیموور) پێی گوترا: «کۆمەڵێکی وا گەورە هاتوون». بەشتێکی خراپی زانی لە پڕ هاتە بەرخێوەتەکەی خۆی کە دانیشتووانی ئاوایییەکە (تەیموور لەنگ)یان چاوپێکەوت بەو جۆرە هاتە دەرەوە، وایانزانی لێیان توورە بووە، لە ترسدا ڕایانکرد و مەلایان بەتەنیا هێشتەوە!...

(تەیموور)یش ڕووی کردە مەلا و گوتی: «ئەمانە بۆچی هاتبوون و، بۆچی ڕایانکرد؟.» (مەلا)یش

گوتی: «گەورەم ئەمانە منیان ناردۆتە لای ئێوە کە تکاتان لێ بکەم فیلە مێچکەیەک بۆ نێرە فیلەکەتان بهێنن، تا فیلەکەتان بێ ئارام نەمێنێتەوە بۆیەکا هەراشیان کرد وایانزانی تۆ لە پێشنیازەکەیان دڵت شکاوە، بۆیەکا هاتوویتە دەرەوە بۆ بەر خێوەتەکەت».

(تەیموور)یش تکاکەی (مەلا)ی پێ خۆش بوو ئەوەندەی پێ نەچوو، (فیلێکی مێچکە)یشی هێنایە ئەوێ!...

ئنجا کەلادێییەکان ڕووبەڕووی (مەلای مەزبوورە) بوونەوە، گوتیان: «ئێمە بەفیلێک دارزابووین، کەچی تۆ بۆت کردین بەدوو فیل؟!.».

(مەلای مەزبوورە)یش گوتی: «ئەگەر ئێوە مەرد بوونایە و پشتی منتان بەردایە، من دەمتوانی لەو فیلە ڕزگارتان بکەم، بەڵام کە ئێوە هەڕاتان کرد، ناچاربووم، بۆتان پینە بکەم و، وای پێ بڵێم کە پێم گوتووە ئەگینا ئەگەر وەهام پێ نەگوتایە، لەوانەبوو، نەک ئێوە، خۆیشم لەناو ببات!».

(٣)

(تەیموور لەنگ) لەگەڵ (بایەزید خانی عوسمانی)دا لە خاکی (تورکیا)دا جەنگێکی خوێنینی دەکرد... هەردوولا جەنگاوەر و خوێنڕێژ و دڕندە، هەردوولا بەچنگ و بەزبروزەنگ بوون... خاکەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوایان پڕ کردبوو لە کوشتار و ئازار و هاوار... دوایی (تەیموور لەنگ)، شەڕەکەی بردەوە و، خونکاری عوسمانی (بایەزیدخان)ی گرت بەدیل!...

دوای ئەوە بردیە ناو خێوەتەکەی خۆیەوە بەڵام (تەیموور لەنگ)، هەرچەندە ڕێزی لە (بایەزید خان) گرت، خۆی پێ نەگیرا، دایە قاقای پێکەنین!... (بایەزید خان) گوتی: «جوان نییە بۆ شاهێکی وەک تۆ، بەدیلێکی وەک من پێبکەنێ!.».

(تەیموور لەنگ)یش گوتی:- «خودا ئاگادارە من بەتۆ پێ ناکەنم.

بەڵام بەوە پێ دەکەنم کە ئەم (جیهان)ە گرفتاری دەستی (کوێر)ێکی وەک تۆ و، (شەل)ێکی وەک من بووە!؟...».

## پێکەنینی ناو ژن و مێرد و ژن هێنەران

(١)

پیاوێک ژنێکی بێوەژنی مارەکرد کاتێ لای دانیشت و دەستی کرد بەدوواندنی، چەند پیجامەیەکی ڕەنگاوڕەنگ و گەورە و بچووکی چاو پێکەوت، کە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوون لێی پرسی: «ئەم پیجامە شینە هی کێیە؟...» ژنەکە گوتی: «ئەمە پیجامەی خوداڵێخۆش بوو، مێردی یەکەمە دەستی شکاوم بۆ ئەو لەو کاتەدا کە پلێتەی گازەکەی دادەگیرساند، گازەکە گڕی گرت و کڵپەی کرد و، گڕی لەویش بەردا و سووتاندی...».

ئنجا مێردەکەی پرسی: «ئەی ئەم پیجامە سەوزە هی کێیە؟».

ژنەکەیش گوتی: «ئەمیش پیجامەی مێردی دووەمە خودا بیبەخشێ بۆ خۆی، هەتا بڵێی خراپ لە

ناوچوو... لە کاتێکدا کە بەناو شەقامێکدا دەڕۆیشت ئۆتۆمۆبیلێکی لێ کەوت و کوشتی!...».

کە ژنەکە ئەوەی گوت، مێردەکە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا... ئنجا پرسی: ئەی تو خودا ئەم پیجامە سوورەیان هی کێیە؟.».

ژنەکەیش گوتی: «ئەمیش پیجامەی مێردی سێ هەمە خودا لێی خۆش بێ، لە سەربان کەوتە خوارەوە و ملی شکا و دەمودەست مرد!...».

کە ژنەکە ئەمەی گوت، مێردەکە، کە هێشتا نەیشبوو بوو بەزاوا، دەمودەست پیجامەکەی بەری خۆی داکەند و، تووڕی هەڵدا بۆ ژنەکەی.

ئنجا بەهەڵەداوان خۆی لێ دوورخستەوە و پێی گوت: «ها بگرە، ئەوە پیجامەی مێردەکەی چوارەمیشت، کە بەڕووت و قووتییەوە، خۆی لە دەستت ڕزگار کرد!؟».

(٢)

یەکێک لە ناودارەکان کە ژیانێکی خێزانی ناخۆشی ڕادەبوارد، لێی پرسرا: «ئەگەر بەدەست تۆ بووایە کارێکی وا بکەیت چاکەی هەموو جیهانی تێدابێ و، هەموو جیهان بخاتە سەر ڕێی چاکی، چ ئاواتێکت دەخواست بۆت بهێنێتەدی؟» گوتی: «ئەوەم دەخواست کە بابە ئادەم مرد هیچ پەراسوویەک لە لەشی جیانەبووایەتەوە!».

(٣)

ئافرەتێکی شارەزا لە گفتوگۆکردندا لەگەڵ گیانی مردووان، دانیشت و دەستی کرد بەبانگکردنی گیانی مێردەکەی خۆی تا ئامادەبێ لەبەردەمیدا دوای ئەمەی لە کاری خۆی بووەوە، گیانی مێردەکەی هاتە لای ژنەکەیش پێی گوت:

«ئاخۆ گوێت لە قسەکانمە، گیانی مێردە خۆشەویستەکەم؟».

(گیانی مێردەکە): بەڵێ گوێم لێتە...

(بێوەژنەکە): ئاخۆ لەم جیهانە تازەیەتدا شادمانیت؟

(گیانی مێردەکە): بەڵێ... یەجگار شادمانم...

(بێوەژنەکە): ئەی خەمی ئەوە ناخۆیت کە ئەم جیهانەی ئێمەیەت بەجێ هێشتووە؟

(گیانی مێردەکە): نەء. نایخۆم!...

(بێوەژنەکە): بۆچ تۆ ئێستاکە لە کوێ یت؟!...

(گیانی مێردەکە): لە دۆزەخدام!؟...

(٤)

یەکێک لەوێژەوانەکان ژنێکی بێ ئابڕووی بەدخووی خراپی هەبوو، ژینی لێ تاڵ کردبوو بەسەزمانە

هیچی بۆ نەمابووەوە ئەوە نەبێ کە بەشەو و بەڕۆژ بەخوێندنەوەی نووسراوانەوە خۆی خەریک بکات کە ژنەکە هەستی پێ کرد مێردەکەی ڕووی خۆی لێ وەردەگێڕێ و، خووی داوەتە نووسراو خوێندنەوە، ڕۆژێک لە ڕۆژان هاتەلای بۆ ئەمەی دڵی بداتەوە ڕووی کردە مێردەکەی و پێی گوت: «خۆزگە منیش نووسراوێک بوومایە لەو نووسراوانە.»... مێردەکەیشی گوتی: «بۆچ؟». ژنەکەیش گوتی:

«چونکە تۆ هەموو دەم لەگەڵ ئەودایت!...».

ئەویش پێی گوت: «بەڵام من وام پێ خۆشە کە تۆ ڕۆژنامە بوویتایە.».

گوتی: «بۆچ؟». مێردەکەیشی گوتی: «چونکە دەمتوانی هەموو ساڵێک بتگۆڕم!؟.»...

(٥)

پیاوێک خواستی خۆی لە ناو ڕۆژنامـاندا بڵاوکردەوە، کە دەیەوێ ژن بهێنێ پاش هەفتەیەک هاوڕێیەکی خۆی تووش هات پێی گوت: «من لە ڕۆژنامەکاندا جارەکەی تۆم خوێندەوە کە دەتەوێ ژن بهێنیت. ئاخۆ کەس وەرامی دایتەوە؟...».

ئەویش گوتی: «بەهەزاران وەرامم وەرگرتۆتەوە!».

گوتی: «چی یان لەناودا نووسرابوو؟.».

گوتی: «هەموویان نووسیبوویان کە ئامادەن لەبەر دڵی من، واز لە ژنەکانی خۆیان بهێنن و بەرەڵلایان بکەن!...».

## پێکەنین لە ناو نەخۆش و پزیشکاندا

(١)

پزیشکێک لەناو کۆمەڵێک کەساندا دەستی کرد بەپێشاندانی کەڵکی ئەو دەنکە دەرمانانەی کە دایهێناون گوتی: «ئەمە بیست و پێنج ساڵە ئەم دەرمانانەم داهێناوە کەچی لە هیچ نەخۆشێکەوە بۆڵەبۆڵم نەبیستووە ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە کە...».

لە پڕ یەکێک لە چوختییەکان قسەکەی پێ بڕی و لە خۆیەوە قسەکەی بۆ تەواو کرد، گوتی: «کە مردوان ورتە ناکەن!...».

(٢)

یەکێک لە دانیشتووانی شارێکی پرسی:

«ئێوە دەڵێن ئەم شارە پزیشکی تێدا نییە کەواتە ئەگەر یەکێک لە ئێوە نەخۆشییەکەی تاوی سەند، چی دەکەن؟.

هەموویان گوتیان: «وازی لێ دەهێنین تا بۆ خۆی دەمرێ!.».

(٣)

کە پزیشکەکە چووە لای نەخۆشەکەی خۆی، پێی گوت: نابێ ویسکی بخۆیتەوە ئەگەر هەر ناچار

بوویت بیخۆیتەوە ئەوا هەندێ ئاوی گەرمی بکە بەسەردا». نەخۆشەکەیش گوتی: «ئاوی گەرم لە کوێ بهێنم؟ هەرچەند ژنەکەم بزانێ بۆ ویسکی خواردنەوەیە ئاوی گەرمم بۆ ناهێنێ!». پزیشکەکەیش گوتی: «دەتوانی پێی بڵـــێی ئاوی گـــەرمم بۆ ڕیش تاشین دەوێ». ڕۆژی دوایی پزیشکەکـــە هاتەوە لای نەخۆشەکەی.

ژنی نەخۆشەکە دەرگای لێ کردەوە ئەویش لێی پرسی: «مێردەکەت نەخۆشییەکەی چۆنە؟». ژنەکەیش گوتی: «نازانم چیی بەسەرهاتووە!... وەک هۆشی بەخۆی نەمابێ و شێت بووبێ وایە!...». پزیشکەکەیش گوتی: «بۆچی چیی کردووە؟!.». ژنەکەیش گوتی: «دوێنێ پانزە جار زۆرتر ڕیشیی تاشیوە!.».

(٤)

پزیشکێک گۆڕ هەڵکەنێکی تووش هات لێی پرسی: «کاروباری ئێستات چۆنە؟» گۆڕ هەڵکەنەکەیش پێی گوت: «تا بڵێی خراپە...».

دوای ئەوە تاوێک بێ دەنگ بوو ئنجـــا ڕووی کـــردەوە پزیشکەکـــە و پێی گـــوت: «وا دیارە، کـــاکی پزیشک، لەم ڕۆژانەدا کار ناکەیت!؟.».

(٥)

پیاوێک چووە کن پزیشکێک پێی گوت: «لە ڕێی خودادا چارەیەکم بکە... تووشی بێ خەوییەکی بێ ئەندازە بووم... وەک کەسانی تر خەوم لێ ناکەوێ... دەرمانێکت لا نییە بمدەیتێ پێی چاک ببم؟».

پزیشکەکەیش لێی پرسی: کەی دەنوویت؟

نەخۆشەکە: لە کاتی هەشتەمدا.

پزیشکەکە: کەی هەڵدەستیت لە خەو؟

نەخۆشەکە: لە کاتی نۆهەمدا.

پزیشکەکە: لە شەودا چەند جار لە خەو ڕادەپەڕیت؟

نەخۆشەکە: هەرگیز خەبەرم نابێتەوە.

پزیشکەکە: کەواتە خەو لێ نەکەوتنەکەت لە کەیدا ڕوودەدات؟

نەخۆشەکە: پزیشکی بەڕێز لە ڕۆژدا هەمووی!.؟.

## پێکەنین لە ناو دادگەران و پارێزەراندا

(١)

تاوانبارێک لەبەردەم دادگەر (قاضی)دا وەستا ئەمیش بەپێی ڕەووشتی دادگا لە بابەت ناو و پیشە و تەمەن و بابەتانی ترەوە پرسیاری لێ کرد، کە بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

دادگەر: ناوت چییە؟

تاوانبار: ناوی من؟

دادگەر: بەڵێ... ناوی تۆ...

تاوانبار: بایز.

دادگەر: تەمەنت چەندە؟

تاوانبار: تەمەنی من؟

دادگەر: بەڵێ تەمەنی تۆ...

تاوانبار: تەمەنم چل و پێنج ساڵە...

دادگەر: ژنت هەیە یان بێ ژنیت؟

تاوانبار: لەگەڵ منتە گەورەم؟

دادگەر: بەڵێ لەگەڵ تۆمە...

تاوانبار: ژنم هەیە...

دادگەر: ئەی پیشەت چییە؟

تاوانبار: لەگەڵ منتە گەورەم؟

دادگەر(بەوەڕس بوونێکەوە): - نەء... من!؟.

تاوانبار: دادگەر، گەورەم!؟.

(٢)

یەکێک لە ئەندامانی دادگا، لە کاتی کۆبوونەوەدا لە کۆڕی دادگەریدا نوست، پارێزەرەکەیش ڕووی کردە سەرۆکی دادگا و پێی گوت: «سەرۆکی بەڕێز! چاوەڕوانی ئەندامی بەڕێزم لە خەو خەبەری بێتەوە، تا منیش فرمانی پارێزەرییەکەی خۆم تەواو بکەم».

سەرۆکی دادگایش وەرامی دایەوە گوتی: «مامۆستا! تۆ چوزانی ئەویش چاوەڕوانی تۆ ناکات لە پارێزەرییەکەی خۆت ببیتەوە، تا خۆیشی لە خەو ڕزگاری ببێ!؟.».

(٣)

وتاربێژ لە وتاردانەکەیدا تینی سەندبوو، بەجۆرێکی وەها کە ئاوڕەگ (ئارەق)ی دەردەدا لەبەرئەوە ناچار بوو فەرەنجی (پاڵتۆ)یەکەی خۆی داکەند و لە لایەکەوە داینا کارگێری ئاهەنگەکەیش کە ئەوەی لێ دی، بێزی لێ کردەوە و، ڕووی لێ گرژ کرد چونکە داکەندنی فەرەنجییەکەی بەکارێکی ناپەسەند دانا، کە لەبەردەم پارێزەرەکەی هاوڕێیدا کە لەناو بانگ کراوەکاندا بوو، شەرمەزاری کرد دەترسا لە وەیش کە پارێزەرەکە خۆی و ئاهەنگەکەی، بەهۆی ئەو کارەی ئەوەوە، بداتە بەر کلکان لەبەرئەوە کە وتاربێژەکە لە وتارەکەی خۆی بووەوە، لێی نزیک بووەوە و پێی گوت: «تۆ چۆن دەتوانیت بەو جۆرە فەرەنجییەکەی خۆت دابکەنیت؟... بۆ تۆ نەتدەزانی کە پارێزەرێکمان لە ناودایە؟ وتاربێژەکەیش وەرامی دایەوە گوتی: «بەڵێ ئەوەم دەزانی بەڵام هەموو دەم چاوم بڕیبووە فەرەنجییەکەم، نەوەک بیبات!.».

(٤)

دادگەر- سکاڵای چییە بەرامبەر سکاڵا لێ کراو؟

سکاڵانووس- ئەو پێی گوتووم کە من گەوج و کەرم منیش کەسانی وام لا هەن، کە ئاگایان لەم کەینەوبەینەیە بووە و، ئەم قسانەت بەتەواوەتی بۆ دەردەخەن!.

(٥)

پارێزەرێک لەناو دادگادا وەستابوو لەسەر خاوەن کێشەکەی خۆی دەکردەوە وایشی بەباش زانی، کە بۆ ڕزگارکردنی خاوەن کێشەکەی خۆی، لە دەست سزادانی دادگا، (شێتی) بداتە پاڵی لەبەرئەوە ڕووی کردە دادگەرەکە و پێی گوت: «دادگەری بەڕێز و چاکەخواز! ئەو کەسەی منی کردۆتە جێگری خۆی شێت بووە بەڵگەی شێتییەکەیشی ئەمەیە: هەر کەسێ دەبینێ، خۆی لێ دوور دەخاتەوە. وا دەزانێ پەلاماری دەدات و، ڕووتی دەکاتەوە تەنانەت خۆیشم کە پارێزەری ئەوم، خۆیم لێ دوور دەخاتەوە و، لە نزیک بوونەوەم دەترسێ!...». کە پارێزەرەکە ئەوەی گوت، دادگەرەکە زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: «بەڵام بەم بەڵگەیەدا وا دەردەکەوێ کە خاوەن کێشەکەی لە مەڕ تۆ شێت نییە!؟».

## پێکەنین لەناو منداڵان و شاگرداندا

(١)

مامۆستاکە منداڵەکانی تاقی دەکردەوە، لە ئایینی مەسیحیدا. دەیویست بزانێ ئەو شاگردە بچکۆلانە لە بابەت (ئەبیشالۆم)ەوە چی دەزانن، کە لە کەسانی تری جیا دەکاتەوە... شاگردەکان تاوێک بێدەنگ مانەوە نەیاندەزانی وەرامی مامۆستاکەیان چۆن بدەنەوە.

چونکە ئەوەیان لەبیر چووبووەوە کە (ئەبیشالۆم) قژی سەری تووکن و درێژ بووە... مامۆستاکەیش ویستی وەرامدانەوەکەیان بۆ ئاسان بکات.

دەستی خستەسەر، سەری خۆی، کە بێ تووک بوو ئینجا پێی گوتن: «ئێستە باش بیربکەنەوە (ئەبیشالۆم) وەک من نەبوو زۆر شتی وا بەسەریەوە بوو کە بەسەری منەوە نییە... دەبزانم دەزانن شتەکە چییە؟». منداڵەکانیش هەموو بەیەک دەنگ گوتیان: «مامۆستا: هۆشە!؟.».

(٢)

دایکەکە لەگەڵ دەستەخوشکێکیدا هاتەوەماڵەوە کە تەماشای کرد کچە بچکۆلەکەی چەند پیاڵەچایەکی لەسەر خوانەکە داناوە.

هەروەها چایەکەیش پاڵێوەراوە لێی پرسی: «بۆچ تۆ چا پاڵێوەکەت دۆزیوەتەوە؟». کچە بچکۆلەکەیش گوتی: «دایەگیان، نەم دۆزیوەتەوە... بەڵام نەوت پاڵێوەکەم بەکارهێناوە!.».

دایکەکە ئەوەندەی نەمابوو لە داخاند لە هۆش خۆی بچێ: ئەوەندە وەرامی کچەکەی پێ ناخۆش بوو بەڵام کچە بچکۆل ویستی دڵی دایکی بداتەوە، پێی گوت:

«دایە! دڵت نەشکێ لە وەرامەکەم خۆ من نەوت پاڵێوە تازەکەم بەکارنەهێناوە... نەوت پاڵێوە کۆنەکەم بەکارهێناوە!...

(٣)

شێرۆ لە خوێندنگا هاتەوە، دەگریا دایکەکەی لێی پرسی:

«کورە ئەوە چیتە؟ بۆ چ دەگریت؟...».

- مامۆستا لێی دام...

- بۆچ چیت کردبوو؟.

- چەکۆم دی دەرزیی چەقاندبوو بەرووی تەختی دانیشتنی مامۆستاکەماندا منیش ڕام بەباشترزانی، کە تەختەکە لە ژێر مامۆستاکە هەڵبگرم، نەوەک دەرزییەکان بەسمتیدا بچەقێن.

مامۆستاکەیش کە دانەوییەوە دابنیشێ، تەختی دانیشتنەکەی لەجێی خۆی نەمابوو، هەڵگیرابوو لەبەرئەوە بەپشتدا کەوت بەزەویدا... ئەویش هەڵسایە سەرپێ و دەستی کرد بەلێدانم.

- پاش ئەوە چیی تر ڕوویدا؟

- دوای ئەویش چەکۆ هەڵیکوتایە سەرم ئەویش لێی دام چونکە ئەم هێشتبوو مامۆستاکە لەسەر تەختەکە دابنیشێ و دەرزییەکان بەبن لەشیدا بچن!.

(٤)

مامۆستایەکی ئافرەت هەستایە سەرپێ و دەستی کرد بەوتاردان لە بابەت دزییەوە ئنجا گوتی: «ئەگەر هات و من دەستم برد بۆ گیرفانی پیاوێک و هەرچی پارەیەک لە گیرفانیدا بوو دەرم هێنا، من دەبم بەچی؟»...

کچۆڵەیەکیش هەستایە سەرپێ و پێی گوت: «دەبیت بەژنی ئەو پیاوە!».

(٥)

دوای ئەمەی مامۆستاکە ڕاستیی پەرستی (فەلسەفە)ی (ئەبولعولای مەعەڕری)ی بۆ شاگردەکانی خۆی ڕوون کردەوە، پێی گوتن کە (ئەبولعولا) کوێربووە ئنجا لە دواییدا لێی پرسین: «ئێستاکە پێم بڵێن: کەم و کووڕییەکەی (ئەبولعولا) چی بووە؟».

شاگردێکیش هەستایە سەرپێ و گوتی: «کەم و کووڕییەکەی (ئەبولعولا) ئەوە بووە کە (ڕاستی پەرست) بووە!...

## پێکەنینی ناو کڕیاران و فرۆشیاران

(١)

کڕیارێک چووە دووکانی چاویلکە (عەینەک) فرۆشێکەوە، گوتی: «چاویلکەیەکم بدەرێ بۆ چاوم» ئەویش گوتی: «من چاویلکەی وام هەیە کە هەرگیز لەوانە چاکتر دەست ناکەوێ هەتا بڵێی نایابن...».

کڕیارەکەیش چاویلکەیەکی لێ سەند و چاوی خۆی تاقی بکاتەوە دوای ئەوە سەیرێکی چاویلکە فرۆشەکەی کرد و پێی گوت:

«بەڕاستی ئەم چاویلکانە شت باش پێشان دەدەن من ئێستاکە پیاوێکم ئەوەندەی کەرێک دێتە پێش چاو!...». کە ئەوەی گوت چاویلکە فرۆشەکەیش چاویلکەکەی لە هاوڕێکەمان سەند و کردیە چاوی خۆی ئەویش سەیرێکی کڕیارەکەی کرد و پێی گوت: «ڕاست دەکەیت... قسەکەت تەواوە!.».

(٢)

بازرگانێکی دڵچاک، ڕۆژێکیان، هاوڕێیەکی خۆی هاتەلای لێی پاڕایەوە کە دە لیرەی بەدەستیاو (قەرز) بداتێ بازرگانەکەیش هەستایە سەرپێ و دە لیرەی لە سنووقەکەی خۆی دەرهێنا و، بەڕوویەکی خۆشەوە خستیە مستیەوە هیچ سەرپەڕەیەکی وەرگرتن (مقبوض)یشی لێ نەسەند کە ئەو پارەیەی لێ وەرگرتووە، لە دەمەو ئێوارەدا بازرگانەکە ئەمەی بۆ دۆستێکی خۆی گێڕایەوە و تێیشی گەیاند کە بەرامبەر ئەو پارەیە هیچ سەرپەڕەیەکی وەرگرتنی لە هاوڕێکەی خۆی وەرنەگرتووە.

دۆستەکەیشی کە ئەوەی لێ بیست، پەڕاو (دەفتەر)ێکی لە باخەڵی خۆی دەرهێناو، خۆی وا نوواند کە هەندێک شتی تێدا نووسی و، پەڕاوە بچکۆلەکەی خستەوە ناو باخەڵی، بازرگانەکەیش لێی پرسی:

«ئەوە چیت لە پەڕاوەکەتدا نووسی؟». کابرا گوتی:

«ئەم پەڕاوەم بۆ ئەوە داناوە کە ناوی شێتەکانی تێدا تۆمار بکەم.

منیش کە گوێم گرت لە چیرۆکەکەی تۆ و، بۆم دەرکەوت کە پارەت داوە بەدەستیاو، بێ ئەمەی نامەیەکی وەرگرتنی پارەکە لە دەستیاو پێدراوەکە وەربگریت، ناوەکەی تۆیشم لەناو پەڕاوەکەمدا نووسی!...».

بازرگانەکەیش پێی گوت: «باشە... ئەی ئەگەر هاوڕێکەم پارەکەمی هێنایەوە دەڵێی چی؟». ئەویش گوتی:

«ئەو دەمە ناوەکەی تۆ دەکوژێنمەوە لە جیاتی ناوەکەی تۆ، ناوەکەی ئەو لە پەڕاوەکەمدا تۆمار دەکەم!»...

(٣)

یەکێک لە بازرگانەکان نابووت بوو دادگەر فەرمانی دا لەسەر ئێسترێک سواریان کرد و، بەناو کۆڵان و شەقامەکانی ناو شاردا گێڕایان، تا هەموو کەس بیناسن و، کەسیان پارەی نەدەنێ ئەم ڕەووشتە لەو سەردەمەدا باو بوو لەگەڵ هەموو نابووتێکدا دەکرا.

هەتا ئێوارە کابرای بازرگانیان بەناو شارەکەدا سووڕاندەوە پاشان بردیانەوە ماڵەکەی خۆی کاتێ لە ئێسترەکە دابەزی خاوەن ئێسترەکە داوای مزی سواربوونی ئێسترەکەی لێ کرد... بازرگانە نابووتەکەیش دەستی کرد بەپێکەنین، گوتی: «خودا لە ناوی دەمت بدات ئەی لە بەیانییەوە هەتا ئێستا چی بووین؟!».

(٤)

بازرگانێک کومپالەیەکی هاتەسەر پارەیشی پێ نەمابوو، بیداتەوە.

خاوەن دەستیاوەکەیش هەموو ڕۆژێک پیاوەکەی خۆی دەناردەسەری، داوای پارەکەی لێ دەکردەوە کەچی ئەویش هەموو ڕۆژێک فریوی دەدا، دەیگوت بەیانی دەیدەم!.

جارێکیان وا ڕێکەوت لەناو یانەیەکی خێزانیدا دانیشتبوو، خەریکی وێسکی خواردنەوە بوو، لەپڕ پیاوێکی خاوەن کومپالەکە هاتە ژوورەوە، داوای دانەوەی پارەکەی لێ کرد ئەویش لێی توورە بوو، قیژاندی بەسەریدا پێی گوت: «کێ ڕێی دایت بێیتە ژوورەوە؟... بۆچ تۆ نازانیت کەس نابێ بێتە ئەم یانەیەوە، ئەندامەکانی نەبێ؟... کەواتە پیاوی چاک بە، ئەگەر شتێکت دەوێ لە من بۆت بکەم، بچۆرە دەرەوە، لەوێوە نامەیەکم بۆ بنێرە، داوای چاوپێکەوتنم لێ بکە کابرایش بەشەرمێکەوە سەری داخست و لە یانەکە چووە دەرەوە بەڵام لەپاش تاوێک نامەیەکی بەشاگردێکی یانەکەدا ناردە ژوورەوە داوای چاوپێکەوتنی لێ کرد بازرگانە نابووتەکەیش کە نامەکەی لە شاگردی یانەکە وەرگرت و خوێندیەوە، پێی گوت «بچۆ پێی بڵێ: لێرە نییە!.».

(٥)

جارێکیان ڕۆژنامەیەک ئەم جاڕەی بڵاو کردبووەوە:

«دوێنێ چوار سەنگ شەکرم کڕی نیو سەنگ لمی تێکەڵ کرابوو.

جا ئەگەر ئەو خاوەن دووکانەی چەواشەی کردووم نیو سەنگ شەکرەکەم بۆ نەنێرێتەوە لەم ڕۆژنامەیەدا ئابڕووی دەبەم!»...

هەر ئەوەندە چەند ساتێک بەسەر بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەدا تێپەڕی، لە نۆ دووکانەوە، نۆ توورەگەی نیوسەنگی لە شەکر، بەخاوەن جاڕەکە گەیشت!...

## پێکەنینی دەس و پێوەندان

(١)

مفردی (خزمەتکار) یەک هاتە لای پیاوێکی دەوڵەمەندی دەس قووچاو، داوای لێ کرد: لەسەر فرمانێک دایبمەزرێنێ پیاوەکە پێی گوت: «لای پیاوەکەی پێش من بەچەند فرمانت دەکرد؟.»... مفردییەکەیش پێی گوت: «گەورەی خۆم! هەر بەنانەسکی بوو.»... کابرای دەوڵەمەندیش تاوێک کەوتە بیرکردنەوەوە پاشان پێی گوت: «ئەی لەبەر دڵی من چەند لەو مزە دێیتە خوارەوە؟!».

(٢)

کارگێڕی کارگەکە ڕووی کردە کرێکارەکەی و پێی گوت: «گوێت لێ بێ مەچۆڵ!... دەمەوێ سبەینێ بەیانی لە ساتی شەش دا لێرە بیت.

جا بۆ ئەمەی بتوانیت لە ساتی پێنج دا خەبەر بییتەوە لەخەو، ئەم کاتژمێرە ببە لەگەڵ خۆتدا و لە ژوور

سەرتیەوە دابنێ لای نوێنەکەتەوە و، بیخەرە سەر ساتی پێنج هەر کاتێ لێیدا خەبەرت دەبێتەوە».

کەچی رۆژی دوایی، کرێکارەکە لە ساتی نۆهەمدا گەیشتە کارگەکە، نەک لە ساتی شەشەمدا!...

کارگێڕی کارگەکە، تووڕەیی گرتی و قیژاندی بەسەریدا گوتی: «بۆچ دواکەوتیت؟ وا دیارە کاتژمێرەکە کاری خۆی نەکردووە؟!».

کرێکارەکەیش پێی گوت: «گەورەی خۆم کاتژمێرەکە کاری کردبوو بەڵام ئەو کاتەی لێیدابوو من نوستبووم و، گوێم لێی نەبوو بوو!»...

(٣)

یەکێک لە هاوبەشی (شرکە)یە گەورەکان ئاهەنگێکی ڕەش بەڵەک و هەڵپەڕینی ئامادەکرد هەرچی کرێکار و دەس و پێوەندێک هەبوو لەناو هاوبەشییەکەدا هاتبوونە ئەو ئاهەنگە لە کاتی ئاهەنگەکەدا یەکێک لە فەرمانبەرانی هاوبەشییەکە ئافرەتێکی جوانی لە ناو ئافرەتەکاندا هەڵبژارد تا لەگەڵیدا هەڵپەڕکێ و سەما بکات لە کاتی سەماکردنەکەدا دەستی کرد بەگفتوگۆکردن لەگەڵ ژنەکە و پێی گوت: «خۆش بەختانە ئیمشەو کارگێڕی هاوبەشییەکە لێرە نییە لەبەرئەوە ئاهەنگەکەمان خۆشتر بووە!... کارگێڕەکەمان پیاوێکی گەوج و ئێسک قورسە!. هاتە هەر شوێنێک پری دەکات لە دڵتەنگی و مەترسی!؟.»... ئافرەتە جوانەکەیش وازی لە سەماکردن هێنا و، وەستا بەتووڕەییەکەوە پێی گوت:

- کوڕە تۆ نازانیت من کێم؟

- نە ء... نازانم!...

- من ژنی کارگێڕی هاوبەشییەکەم!.

ئنجا فەرمانبەرەکەیش لە پڕ وەستا و، بەتووڕەییەکەوە پێی گوت:

- ئەی ئێوە نازانن من کێم؟...

- نە ء... نازانم...

کابرا گوتی: «سوپاس بۆ خودا...».

ئەوەی گوت و دەمودەست بەهەڵەداوان لە هۆڵی کۆبوونەوەکە خۆی دەربازکرد!...

(٤)

کارەکەرەکە بەخانمەکەی خۆی گوت:

- پێیان گوتووم کە من هەزار جار لە تۆ جوانترم...

- کێ وای پێ گوتیت؟

- ئاغام!...

- هەروەها پێیان گوتووم کە من هەزار جار لە تۆ زیرەکترم...

- کێ وای پێ گوتیت؟...

- ئاغام!...

- هەروەها پێیان گوتووم کە ماچێکی من لە ماچێکی تۆ هەزار ئەوەندە خۆشترە.

- کێ وای بێ گوتیت؟... دیسانەوە ئاغات؟!...

- نەء... ئۆتۆمۆبیلچییەکەمان!...

(٥)

فەرمانبەرێک نیو سات لە کاتی فرمان کردن دواکەوت سەرۆکەکەی پێی زانی لێی پرسی: « بۆچ دوا کەوتوویت؟»... فەرمانبەرەکەیش بیانووی وا بۆ هێنایەوە، گوتی: «درەنگ خەبەرم بووەوە لە خەو لەتاو پەلەپەلیی خۆیشم، بەچارەکە ساتێک بەرگەکانی خۆم پۆشی...»...

سەرۆکەکەیش پێی گوت: «ڕاست دەفەرموویت وایە بەڵام من دەموچاویشم دەشۆم!.».

## پێکەنین بەڕژدی

(١)

پیاوێکی ڕژد (دەست قووچاو)، ئەمەندە دەست قووچاو بوو، تەنانەت لەگەڵ منداڵەکانی خۆیشیدا ڕژدیی دەنواند هەموو بانگی شێوانێک پێی دەگوتن: «هەر کەسێ واز لە شێوخواردن بهێنێ پێنج پەنجایی دەدەمێ». منداڵەکانیش هەموویان وازیان لە شێوخواردن دەهێناو، دەنووستن بەسکی برسییەوە، تا بەیانی... کە بەیانییش دەهات و بەو برسیتییەوە خەبەریان دەبووەوە، باوکیان پێی دەگوتن: «هەر کەسێ بیەوێ ناشتا بکات دەبێ پێنج پەنجاییم بداتێ!؟».

(٢)

پیاوێکی ڕژد لە بانگی شێواندا هاتەماڵەوە، بەگەشی و خۆشییەوە ژنەکەیشی لێی پرسی: «بۆچ ئیمڕۆ ئەوەندە دڵ خۆشیت؟!».

ئەویش پێی گوت:

«ئیمڕۆ لەو پارەیەی بۆم دەگەڕایەوە، بووە بەدوو ئەوەندە.

جا لەبەرئەوەیە کە دڵم خۆش بووە و هەست بەکامەرانی دەکەم.».

ئەویش گوتی: «بۆچ چی ڕوویداوە؟». ئەویش گوتی: «ئیمڕۆ نرخی ڕۆژنامە لە دە فلسەوە گەیشتە بیست فلس منیش کە هەموو ڕۆژێک لای سەرتاشەکە دەمخوێندەوە دە فلسم بۆ دەگەڕایەوە بەڵام ئیمڕۆ کە دەیخوێنمەوە، هەر ڕۆژە بیست فلسم بۆ دەگەڕێتەوە!؟.».

(٣)

(سکۆتلاند)ی یەک لە شاری (لیڤەرپوول)ەوە سواری کاروانە ئاسنینە (شەمەندەفەر) بوو، دەچوو بۆ شاری (لەندەن) کە سوارەکانی کاروانە ئاسنینەکە سەرنجیان دا: کابرا لە هەموو ئێستگەیەکدا دادەبەزێ و دەگەڕایەوە ناو ژوورەکەی بەڵام لە شێوەیەکی هەناسەبڕکێیدا جا کە تەماشایان کرد: هەموو جارێ وای

بەسەر دەهات، لێیان پرسی: «بۆچ وا دەکەیت؟». گوتی «من ئێستگە بەئێستگە سەرپەڕەی سواربوون دەبڕم...».

– دەتەوێ بۆ کوێ بچیت؟

– بۆ لەندەن.

– ئەی بۆچ یەکسەر بۆ (لەندەن) سەرپەڕەیەک نابڕیت؟

گوتی: «چونکە پزیشکەکان لە شمیان پشکنیوە و پێیان گوتووم: نەخۆشیی دڵت هەیە لە هەر کاتێکدا بێ دەتکوژێ!.».

(٤)

لاوێک بە مانگانەیەکی چوارسەد کرۆش (قرۆش)ی لەسەر فرمانێک دامەزرا لە مانگی یەکەمدا ٣٩٩ کرۆشی خستە دەستی باوکیەوە بۆ کرۆشەکەی تریش بیانووی بۆهێنایەوە، کە داوێتی بەجامێک خۆشاوی لێمو، کە لە کاتی فرمانە سەختەکەیدا خواردوێتییەوە باوکیشی لەسەر ئەو دەست بڵاوییە کە کردبووی سەرزەنشتی کرد!...

لە مانگی دووەمیشدا ٣٩٨ کرۆشی دایە دەست باوکی ئەم جارەیش بۆ ئەو دوو کرۆشەی کە بەختی کردبوون، بیانووەکەی ئەوە بوو کە دابوونی بەکرێی سواربوونی (ترام) تا لە کاتی فرمانکردنەکەی خۆی دوانەکەوێ چونکە درەنگ ڕێ کەوتبوو... لەسەرئەوە باوکیشی سەرزەنشتێکی توندی کرد و تا چەند ڕۆژێکیش ئاش و ماشی لەگەڵ کرد و نەیدوواند!... ئەو دوو کرۆشەی بەزۆرزانی بۆ کورەکەی بەختیان بکات لە خۆیدا!. لە مانگی سێهەمدا ٣٩٧ کرۆشی دا بەباوکی.

باوکەیش دەمودەست پەلی کورەکەی گرت و بردیە ژوورێکەوە، بەتەنیایی ئنجا پێی گوت: «منیش و تۆیش، هەردووکمان پیاوین وەک یەکتر... تۆ هیچ لە من مەشارەوە... ڕاستم پێ بڵێ: تۆ گرفتاری ئەڤینی کچێک نەبوویت؟!.».

(٥)

دەگێڕنەوە: کابرایەکی فەرەنسەیی نەخۆش دەکەوێ.

پزیشکەکان دەڵێن: «نەخۆشی خوێن کەمیت تووش بووە پێویستە لە لەشی پیاوێکی بەهێزەوە خوێن بگوێزینەوە بۆ ناو لەشت.». ئەویش دراوسێیەکی (سکۆتلاند)ی هەبوو، وەک هەموو سکۆتلاندییەکانی تر، لە دەست قووچاویدا ناوی دەرکردبوو... کە سکۆتلاندییەکە ئەوەی بیست گوتی: «من ئامادەم لە خوێندا یارمەتیت بدەم.». پاشان دەست کرا بەخوێن گواستنەوە لە لەشی سکۆتلاندییەکەوە بۆ ناو لەشی فەرەنسەییەکە کە ئەو کارە تەواوبوو، فەرەنسەییەکە هەزار (فرەنک)ی دا بەسکۆتلانییەکە، لە پاداشی ئەو چاکەیەدا کە لەگەڵی کردبوو... کابرای فەرەنسەیی جارێکی تریش پێویستی بەخوێن وەرگرتن بووەوە دیسانەوە ئەو کابرا سکۆتلاندییەیان بۆ هێنایەوە ئەم جارەیش خوێنیان لەو بۆ وەرگرت کە ئەم کارەیش تەواو بوو، کابرا فەرەنسەییەکە دەستی برد پێنج سەد فرەنکی دایە.

لەجاری سێهەمیشدا فەرەنسەییەکە خوێنی لەسکۆتلاندییەکە وەرگرتەوە بەڵام ئەم جارە سەد فرەنکی دایە.

بەڵام لە جاری چوارەمدا خوێنیان لە سکۆتلاندییەکە وەرگرت و خستیانە لەشی فەرەنسەییەکەوە، فەرەنسەییەکە هیچ پارەیەکی پێ نەبەخشی! پزیشکەکانیش لەوەوە زانییان و بریاریان دا: «کە تازە خوێنی سکۆتلاندییەکە بەناو لەشی فەرەنسەییەکەدا گەڕاوە!»...

## پێکەنین بە بەنگ کێش و سەرخۆشەکان

(١)

پیاوێکی ئایینی چاوی بە بەنگکێشێک کەوت دەستی کرد بەئامۆژگاری کردنی پێی گوت: «کابرا خۆت بپارێزە لە دڵ شکاندنی خودا... چونکە ڕۆژی دوامین لە پێشەوەیە... ئەوساکە کردەوەکانت دەکێشن ئەگەر کردەوە خراپەکانت لە کردەوە چاکە کانت گرانتر بن دەتخەنە دۆزەخەوە...».

بەنگ کێشەکەیش گوتی: کێ فڕێم دەداتە دۆزەخەوە؟».

پیاوە ئایینیەکەیش گوتی: «خودای هەموومان».

(بەنگ کێشەکە): کێ کردەوە چاکەکانمان دەکێشێ؟

(پیاوە ئایینیەکە): خودای هەموومان...

(بەنگ کێشەکە): تەرازووەکە هی کێیە؟

(پیاوە ئایینیەکە): هی خودای هەموومانە...

جا لێرەدا بەنگکێشەکە پێکەنی و گوتی: «نەء، خوداناسی خۆم، لای خودا کردەوەکانمان ناکێشین لە دەرەوە دەیانکێشین!؟.».

(٢)

شوانی ڕانەمەڕێک هەبوو خووی دابووە بەنگکێشان جا هەرچەند نوێژێکی دەکرد، یەکێک لە مەڕەکانی دەمرد دوایی هەموو مەڕەکانی مردن، مەڕێکیان نەبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو مەڕەی برد بۆ لەوەڕاندن بەڵام مەڕەکە ڕای کرد لە دەستی و، لێی دوورکەوتەوە.

ئەویش لێی ڕاوەستا و لە دوورەوە تێی خوڕی، گوتی: «ڕادەوەستیت باشە ئەگینا دوو تاکە نوێژی ئێوارێت تێ دەگرم!».

(٣)

بەنگکێشێک گێژ بووبوو چووە لای سەرۆکی کۆمەڵە باڵبازێک لە باڵبازخانەکەیدا و پێی گوت: «گەورەم هاتووم سکاڵا دەکەم لە دەست (هورمز)ی باڵباز دوێنێ یەجگار دڵڕەقی لەگەڵمدا نواند...

- بۆچ چی کردووە لێت؟

- کە منی دیبوو لەسەر ڕێبازەکە نوستبووم، لە جیاتی ئەمەی بمبات بۆ باڵبازخانە، بردوومیەوە بۆماڵی خۆمان بۆ کن ژنەکەم!؟...

(٤)

بەنگ کێشێک لەبەردەم باڵبازێکی ڕێپیشاندەردا وەستا و پێی گوت: «دەزانیت ماڵی خولەی گالیسکەوان لە کوێدایە؟».

باڵبازەکەیش لێی ورد بووەوە گوتی: «ئەی تۆ، خۆت، خولەی گالیسکەوان نیت؟!.». ئەویش گوتی: «بەڵێ من ئەوم... بەڵام من لە کوێ دادەنیشم!».

(٥)

بەنگکێشێک گالیسکەیەکی پێگەیشت خێرا دەڕۆیشت.

گالیسکەوانەکەی بانگ کرد وەستا پێی گوت: «گالیسکەکەت کەسی تێدا نییە؟».
گالیسکەوانەکەیش گوتی: «کەسی تێدا نییە فەرموو سواربە.».

ئنجا بەنگکێشەکە پێی گوت:

«هەتا کوێم دەبەیت و؟... بەچەندیشم دەبەیت؟!.».

## پێکەنین بەگەوجان

(١)

پیاوێک لە بەردەلانێکدا فرمانی دەکرد، بەردێک بەربووەوە بەسەریدا، کوشتی خاوەن بەردەلانەکەیش پیاوێکی نارده کن ژنی پیاوە کوژراوەکە و پێی گوت: «لە شێوەیەکی شیرین و نەرمونیاندا ئەم مەرگەساتەی تێ بگەیێنی.». پیاوەکەیش لە دەرگای ماڵەکەی دا و، ژنی پیاوەکە هات بەدەمیەوە ئنجا بەژنەکەی گوت: «ئاخۆ بێوە ژن پیرۆز لێرەیە؟» ژنەکەیش پێی گوت: «منم پیرۆز بەڵام من بێوەژن نیم!.».

پیاوەکەیش پێی گوت: «من گرەوت لەگەڵ دەکەم کە تۆ بوویت بەبێوەژن... ئەی تۆیش گرەوم لەگەڵ ناکەیت؟!.».

(٢)

ئافرەتێکی جوان لەناو دارستانێکدا گەڕانی دەکرد کە تەماشای کرد گۆمێکی تێدایە، ئاوەکەی ڕوونە ئارەزووی کرد مەلەی تێدا بکات.

کە تەماشای کرد شوێنەکە چۆڵە و کەسی لێ نییە سەیری بکات، دەستی کرد بەخۆ ڕووت کردنەوە ئنجا چووە پێشەوە بۆ سەر ئاوەکە بچێتە ناویەوە و مەلە بکات... لە پڕ کابرایەکی پاسەوانی لێ پەیدابوو، کە لە پشت درەختەکانەوە خۆی شاردبووەوە پێی گوت:

«خانمەکەم تۆم دی خۆت ڕووت دەکردەوە و، دەتویست بچیتە ناو گۆمەکەوە مەلە بکەیت منیش پێم ناخۆشە کە پێت دەڵێم: مەلەکردن لەم گۆمەدا بەربەست کراوە...».

ئافرەتە جوانەکەیش ڕەنگی تێک چوو پێی گوت: «کە تۆ منت دی خۆم ڕووت دەکەمەوە، بۆچ ئەوەت پێ نەگوتم؟!.».

ئەویش گوتی: «خانمەکەم! لێرەدا خۆ ڕووت کردنەوە بەربەست نەکراوە!؟».

(٣)

کوڕێک سواری کەرەکەی خۆی بووبوو بەناو باخێکدا ڕابورد، سەیری کرد چڵی درەختەکانی شۆڕ بوونەتە خوارەوە، میوەیان پێوەیە.

ئەویش هەستایە سەرپێ، لەسەر پشتی کەرەکەی وەستا و، دەستی کرد بەمیوەڕنین بەڵام زۆری پێ نەچوو، کەرەکە ڕای کرد و، کوڕەکەیش بەهەڵواسراوی مایەوە بەلقێک لە لقەکانی درەختەکەوە لەو کاتەدا ئافرەتێک هات، کە خاوەنی باخەکە بوو قیژاندی بەسەر کوڕەکەدا و پێی گوت: «کوڕە تۆ چی دەکەیت لە ناو ئەم باخەدا؟» ئەویش پێی گوت: «هیچ ناکەم بەڵام لەسەر پشتی کەرەکە، کەوتوومەتە خوارەوە!».

(٤)

خەسرەو چوو بووە ناو کێڵگەکەی خۆیەوە بۆ ئەمەی جەژن لەوێدا ڕاببوێرێ هاوڕێیەکی هاتە لای و پێی گوت: «خەسرەو! زانیوتە چی ڕووی داوە؟».

- هیچ هەیە؟
- ژنەکەی مامت مرد...
- بەسەزمانە... بەسەزمانە ژنەکەی مامم...
- هەروەها مامیشت مرد!...

کە خەسرەو ئەوەی لێ بیست، هەناسەیەک ماتبوو پاشان سەری هەڵبڕی و گوتی:- «بەسەزمانانە... هەردووکیان بوون بە(بێوە ژن) و (بێوە پیاو)!...

(٥)

بارام بەوەی زانی کە یەکێک لە دانیشتووانی گوند دەیەوێ کەرێک بکڕێ... ئەویش کەرێکی هەبوو دەیویست بیفرۆشێ لەبەرئەوە چوو بۆ لای کڕیاری کەرەکە و پێی گوت: «وەک بیستوومە دەتەوێ کەرێک بکڕیت جا تکات لێ دەکەم منت لەبیر نەچێ!.»...

## پێکەنینی ناو سەرتاشەکان

(١)

هەر ئەوەندە سەرتاشەکە دەستی دایە تاشینی چەناگەی کڕیارەکەی دەمودەست چەناگەی بڕی برینەکە زۆر گەورە بوو خوێنی زۆر لێ دەهاتە خوارەوە دەموچاوی کابرا تێک چوو، و زەرد هەڵگەڕا.

بەڵام سەرتاشەکە ویستی دڵی بداتەوە پێی گوت: «گەورەم، خەم مەخۆ، برینەکەت زوو چاک دەکەمەوە دەرمانێکی وەهام لایە، هەر بەتەنیا دڵۆپێکی برینەکەت سارێژ دەبێ و، هیچ ئێشێکیش نامێنێ!.». دوای ئەوە دەستی کرد بەپشکنینی دووکانەکەی بۆ دۆزینەوەی شووشە دەرمانەکە بەڵام بۆی نەدۆزرایەوە پرسی کرد لە بەردەستەکەی، گوتی: «شووشە دەرمانەکەت لە کوێ داناوە؟».

ئەویش وەرامی دایەوە، گوتی: «وەستام ئیمڕۆ هەموویم کارکرد!»...

(٢)

لاسایی کەرەوەیەکی قژ درێژ رووی کردە دووکانی سەرتاشێک.

لەسەر تەختی سەرتاشینەکە دانیشت ئنجا بەسەرتاشەکەی گوت: «دەمەوێ سەرم بتاشم بەلام پێم بڵێ، جاری دوایی، تۆ نەبوویت سەرت تاشیم؟ سەرتاشەکەیش لە شێوەیەکی ئاساییدا پێی گوت: نەء گەورەی خۆم، من نەبووم... چونکە من هەر دووساڵە کە لەم دووکانەدام!.».

(٣)

پیاوێکی پاک و خاوێن و رازاوە هاتە لای سەرتاشێک، کە بەپیسی و پۆخڵی ناوی دەرکردبوو سەرتاشەکەیش پیاوەکەی لەسەر تەختی سەرتاشینەکە دانا بەروانکەیەکی دەرهێنا و کردیە ملی پیاوەکە پاش ئەوە دەستی کرد، بەخۆ ئامادەکردن، کە سەری بتاشێ پیاوەکە پێی گوت: «ئەم بەروانکەیەم بۆ بگۆڕە چونکە خاوێن نییە».

سەرتاشەکەیش، بێ ئەمەی لە قسەکەی ئەو بسڵەمێتەوە، بە لەسەرخۆیبیەکی تەواوەوە وەرامی دایەوە، گوتی: «ئەمە زۆر سەیرە پێش تۆ بۆ پانزە کڕیاری ترم بەکارهێناوە، کەسیان بەمنیان نەگوتووە بەروانکەکەت پیسە... کەچی تۆ دەڵێی پیسە!؟».

(٤)

پیاوێکی سەرڕووتاو هاتە ناو دووکانی سەرتاشێکەوە، پێی گوت: تووکی سەری بتاشێ... پاش ئەمەی سەرتاشەکە سەری تاشی، کابرا پێی گوت: «پیاوی چاک بە، قژەکەم بەلای چەپدا بشکێنەرەوە.».

سەرتاشەکەیش وەرامی دایەوە گوتی: «دەتەوێ بەپێنووسی مز (قورقوشم)، وێنەی قژ لەسەر سەرت بکێشم، یاخود بەپێنووسی کۆپیە؟!.

(٥)

پیاوێک هاتەناو دووکانی سەرتاشێکەوە دانیشت تا نۆرەی سەرتاشینی هات ئنجا چووە سەر تەختی سەرتاشینەکە دانیشت.

سەرتاشەکە رووی تێ کرد و گوتی:- «دەتەوێ قژت چۆن بتاشم؟».

ئەویش گوتی: «بەشێوەیەکی وا سەرم بتاشە کە هەرگیز لە بابەت هەڵبژاردنەکانەوە و، باری زرنگکاری (سیاسەت)ی ئەوروپا و، پەیماننامەوە قسە نەکەیت!؟».

## پێکەنینی ڕاوکەرەکان

(١)

(بایز) و (بارام) و (بلە)، هەرسێکیان دانیشتبوون هەر کەسەیان سەگی خۆی پێ بوو لە بابەت ڕاوە نێچیر و زیرەکی سەگانی ڕاوەوە دەمەتەقێیان دەکرد هەر کەسەیشیان بەسەگەکەی خۆیدا هەڵ دەدا و، دەیگوت: «سەگی من لە زیرەکیدا هاوتای لە جیهاندا نییە!.».

(بله)یش هەستایە سەرپێ و گوتی: «من بڕوا ناکەم سەگی هیچ کەسێک لە سەگی من چاکتر بێ (بۆزە) هەتا بلێیت زوو بۆن دەکات هیچ شتێک لە ژێر دەستی دەرناچێت» (بارام)یش پێی گوت: «من دەست کێشەکانی خۆم لەبیرچووە... لەسەر تەختی نان خواردنەکەمانم داناوە جا ئەگەر ڕاست دەکەیت، سەگەکەت زیرەکە و بۆنیش زوو دەکات، بینێرە بام بچێ بۆ ماڵەوە و دەست کێشەکانی من بهێنێ. ئەوساکە منیش پلەی زیرەکییەکەی هەڵدەسەنگێنم!». (بله)یش هەستایە سەرپێ و بانگی کردە سەگەکەی خۆی، تا بۆنی دەستەکانی (بارام) بکات و، بینێرێت بۆ ماڵەوە، تا دەستکێشەکانی بۆ بهێنێ... (سەگەبۆزە)یش هات و دەستی کرد بەبۆنکردنی بەری دەست و پەنجەکانی (بارام)و لستنیەوە دوای ئەوە ڕایکرد بۆ ماڵی (بارام) سێ هاوڕێکەیش دانیشتن، چاوەڕوانی هاتنەوەی (سەگەبۆر) بوون، بۆ ئەمەی لەوە دڵنیابن کە ئاخۆ قسەکانی خاوەن سەگەکە ڕاستن یان نا... لەپاش تاوێک «سەگەبۆر» بەپرتاو هاتەوە... ئاخۆ، ئەی خوێندەوار دەزانیت، چی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو؟!...

– دەرپێی کارەکەرەکەیانی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو!...

(٢)

(ئەکۆ) و (چەکۆ) لە بێشەڵستانێکدا ڕاویان دەکرد فەرمانبەرێکی ڕاو تووشیان هات کە (چەکۆ) چاوی بەفەرمانبەرەکە کەوت، ڕای کرد، خۆی لە دەستی ڕزگار بکات کە فەرمانبەرەکەیش (چەکۆ)ی دی هەڵات، ئەویش بەڕاکردن دوای کەوت لەپاش ڕاکردنێکی سێ هەزار گەزی، گەیشتە (چەکۆ)و گرتی دوایی پێی گوت: «سەرپەڕەی ڕاوەکەت کوا؟».

ئەویش گوتی: «ئەمەتا سەرپەڕەی ڕاوەکەم وەری بگرەو بیبینە!».

فەرمانبەرەکەی سەرپەڕەکەی لێ وەرگرت و، دەستی کرد بەلێ وردبوونەوەی کە تەماشای کرد: دروستە، پێی گوت: «کە تۆ سەرپەڕەی ڕاوت پێ هەیە و، ڕێت پێ دراوە ڕاوبکەیت، ئیتر بۆچ هەڕا دەکەیت لە دەستم؟!». ئەویش گوتی: «من هەڕام نەکردووە لە دەست تۆ بەڵام پزیشک ئامۆژگاریی کردووم لە پاش هەموو ژەمە نان خواردنێک چارەکە ساتێک ڕابکەم». فەرمانبەرەکەیش گوتی: «بەڵام کە منت دی ڕادەکەم بەدواتا، پێویست بوو ڕابوەستیت»... (چەکۆ کە ئەوەی لێ بیست دەستی برد بۆ سەری خۆی، خوراندی ئنجا پێی گوت: «من وام زانی تۆیش پزیشک ئامۆژگاری کردوویت، کە لە دوای نان خواردن ڕابکەیت!». بەم ڕەنگە فەرمانبەرەکە (چەکۆ)ی بەرەڵلاکرد و، ڕۆیشت بەرێی خۆیەوە... بەڵام بەهۆی ئەم فێڵەوە، (ئەکۆ)ی هاوڕێی کە سەرپەڕەی ڕاوی پێ نەبوو، لەدەست فەرمانبەرەکە ڕزگاری بوو!...

(٣)

ڕاوکەرێکی تازە دەست پێ کردوو، دەستی کرد بەڕاوەکە و، لەناو شاخێکدا کە پڕبوو لە کەو هەرچەند کەوێکی دەدی چەند تفەنگێکی تێدەگرت بەڵام هیچ جارێک کەوەکەی نەدەپێکا بەڵام لە کاتی ڕۆیشتندا بەکەوێکی گەورە گەیشت دووجار تفەنگی تێ گرت.

پاشان ڕای کرد، بەدوایدا تا بزانێ: پێکاویێتی یان نا...

لێرەدا پیاوێکی لێ پەیدابوو، کە لە پشت کەڵەبەردێکەوە دانیشتبوو، تەماشای بزووتنەوەی ئەوی دەکرد ڕاوکەرەکە، لە پیاوەکە نزیک بووەوە ئنجا لێی پرسی: «تو خودا پێم بڵێ: کە تفەنگم گرتە کەوەکە هیچ پەڕێکیت دی بفڕێت بەئاسماندا؟!...».

کابرایش پێکەنی و پێی گوت: «بەڵێ پەڕم دی بەئاسمانەوە!... بەڵام کەوێکی بەخۆیەوە هەڵگرتبوو!؟.».

(٤)

(خەسرەو)ی ڕاوکەر چووە چایخانەیەک و دانیشت دەستی کرد بەگێڕانەوەی کارەساتی ناوازە و بێ هاوتا لە ڕاوکردنەکانیدا، گوتی: «من خۆم بەتەنیا بووم بەناو جەنگەڵێکدا دەڕۆیشتم، کە یەجگار چڕبوو لەپڕ شێرێکی سامناک لەبەردەممدا پەیدابوو منیش نەمکردە نامەردی، دەموودەست، دەستم لێدایە تفەنگ و تفەنگێکم تێ گرت. شێرەکە دەست بەجێ کەوت ومرد...

لەپاش نزیکەی سەد گەزێک شێرێکی ترم لێ دەرکەوت، کە لە هی پێشوو گەورەتر بوو... هەروەها درێتریش بوو بەڵام کوت و پڕ دەستم لێدایە تفەنگ و لە ماوەی پێنج وردیلەدا گینگڵەی دا و کەوت بەسەر زەویدا و، گیانی لە لەشی دەرچوو...

هەتا لەم تەنگ و چەڵەمەیەیش بوومەوە، شێرێکی ترم لێ هاتە پێشەوە لە شێوەیەکی زۆر سامناکدا دەینەڕاند بەسەرمدا منیش دەموودەست نامەوە بەنیشانی تفەنگەکەم...

پیاوێکیش لەنزیک (خەسرەو)ەوە لە چایخانەکەدا دانیشتبوو.

گوێی لەم هەموو درۆ و فیشاڵانە بوو لەتاو خۆهەڵکێشانەکانی (خەسرەو)، لە گیانی خۆی وەڕس بووبوو بەدڵێکی سووتاوەوە ڕووی کردە پیاوێک کە لە تەنشتییەوە دانیشتبوو ئنجا بەدەنگێکی بەرزەوە پێی گوت، مەبەسی ئەوە بوو (خەسرەو) گوێی لێی بێ:- «بەسەری خودای گەورە سوێند دەخۆم: ئەگەر بێتو ئەم شێرە بکوژێ، لێی ڕادەپەڕم و، دەیدەمە بەرشەق، تا لە تەختی دانیشتنەکەی فڕێ دەدەمە خوارەوە...».

(خەسرەو)یش کە گوێی لە قسەی دراوسێ کەی بوو، بێ گێرە و کێشە قسەکەی خۆی بەم جۆرە تەواو کرد: گوتی:-

«بەڵێ تفەنگەکەم تێ گرت و، گوللەیش لە تفەنگەکەمەوە دەرچوو.

بەڵام ئەم جارەیان نەم پێکا!...».

## پێکەنینی ناو لاسایی کەرەوەکان و گۆرانی بێژەکان

(١)

دەستەیەک لە لاسایی کەرەوەکان هاتنە شارێک بۆ ئەمەی یەکێک لە چیرۆکەکانی خۆیان لاسایی بکەنەوە وا دەرکەوت ئەوەندە تەماشاکەران نەهاتبوونە سەیری چیرۆکەکەیان تەنانەت هۆڵی تەماشاگا (مسرح)ە کە چۆڵ بوو چونکە چەند کەسێک نەبێ، نەهاتبوونە سەیر تەنانەت ئەو چەند کەسانەیش

بێزاری خۆیان لە لاسایی کردنەوەکەیان پێشان دا کاتێکیان زانی، یەکێک لە لاسایی کەرەوەکان، بەخۆی و جلە بریسکەدارەکانییەوە، هاتە سەر تەختی بەزمگاهەکە و، رووی کردە سەیرکەرەکان، کە لەوێدا کۆبووبوونەوە.

ئنجا پێی گوتن: «ئەگەر بێ دەنگ نەبن ورگتان دەدڕین ئێمە دەستەی لاسایی کەرەوەکانین ژمارەمان لە ژمارەی ئێوە زۆرترە!.».

(٢)

لاسایی کەرەوەیەکی فەرەنسزی کە ناوی (لۆجێە) بوو، یەکێک بوو لە لاسایی کەرەوەکانی دەستەی (بالێە ڕۆیال) فرمانی ئەو لەو چیرۆکەدا ئەوە بوو، کە لە یەکێک لەو چیرۆکانەدا کە دەستەکە لە شاری (پاریس)دا، لاسایی دەکردنەوە، ببێتە ڕابەر، نامە بهێنێت و ببات بۆ یەکێک لە لاسایی کەرەوەکان ئەو فرمانەکەی خۆی بەجێ هێنا.

لاپەڕەیەکی سپی دایە دەست لاسایی کەرەوەکە هەروەک نامەیەکی بۆ هێنابێ وای پێشان دا وایش ڕێ کەوتبوو، کە لاسایی کەرەوە کە ناوەرۆکی نامەکەی لەبەرنەکردبوو لەپێشەوە دەستی کرد بەزمان تێکچوون دوای پینەی کەم و کوڕییەکەی خۆی کرد، گوتی: «چاویلکەکەم نەهێناوە لەگەڵ خۆم... کوڕی خۆم ئەم نامەیەم بۆ بخوێنەرەوە...». کە لاسایی کەرەوەکە ئەوەی گوت، وایزانی خۆی بەوە لەو تەنگ و چەڵەمەیە ڕزگارکرد و هاوڕێکەی خۆی تووش کرد بەڵام (لۆجێە)ی هاوڕێمانی نەیکردە نامەردی، بەهەموو نازگرتنێکەوە، وەرامی گەورەی خۆی دایەوە، گوتی: «تکام لە گەورەی خۆم وایە کە بیانووەکەم پەسەند بکات من ئەم نامەیەم پێ ناخوێندرێتەوە چونکە باوک و دایکم هەرچەندە لە پیاوە خاوەن ڕێزەکان بوون، بەڵام لەبەر دەست کورتی خۆیان نەیانتوانی بمخەنە بەر خوێندن لەبەرئەوە لە بێ بەختی خۆم فێری خوێندنەوە نەبووم...».

کە لاسایی کەرەوەکە ئەوەی لە (لۆجێە) بیست یەجگار شلەژا گوێگرەکان دەستیان کرد بەپێکەنین و گاڵتەپێ کردنی.

هاوڕێکانی خۆیشی کە لاسایی کەرەوەکان بوون، زۆر بەوە پێکەنین.

هەموویان چوون بەپیر (لۆجێە)وەو، دەستیان کرد بەپیرۆزبایی لێ کردنی!...

(٣)

لە ئاهەنگێدا (ئوم کلسووم) دەرکەوت نوقوڵێک لەناو دەمیدا بوو دەیویست، لەپێش تەوابوونی سازەکاندا، کە سازلێدەرەکان لێیان دەدا لە پێش گۆرانییەکەدا نوقوڵەکەی ناودەمی بتوێنێتەوە.

بەڵام سازەکە تەواوبوو، کەچی نوقوڵە نەگریسەکە هەر تەواو نەبوو، چەند جارێک سازلێدەرەکان سازەکەیان دووبارە کردەوە نوقوڵەکە لە دەم (ئوم کلسووم)دا هەر نەتووایەوە تا کەینەوبەینەکە گەیشتە ڕادەیەکی وەها کە هەندێک لە پەلەپەل کەرەکان وەڕس بوون و خۆیان پێ نەگیرا، یەکێکیان بەدەنگێکی بەرزەوە قیژاندی، گوتی: «دە درەنگە، خانم! گۆرانی بڵێ، تاکەی بوەستین؟!.»... (ئوم کلسووم)یش

زەردەخەنەیەکی کرد و بەپەنجەی نیشانەی دەمی خۆی کرد و، گوتی: «گەورەی بەڕێز، خۆت بگرە تا دەتوێتەوە!؟.».

(٤)

نووسەری بەناوبانگی ئینگلیز، (بەردنادشۆ)یان بانگ کردبوو، بۆ ئاهەنگێکی نایاب و ناوازە، کە لەو ئاهەنگەدا سازلێ دەرێکی تازە قەڵای تێدابوو، کەوانچە (کەمانچە)ی لێدەدا لە دوای نانخواردن خانمی خاوەن ئاهەنگ هات بەلای (بەردناردشۆ)وە، پێی گوت: «لە بابەت ئەم سازلێدەرە تازەیەوە چی دەڵێیت؟». (بەردناردشۆ)یش وەرامی خانمەکەی دایەوە گوتی: «بەڵێ، وەک (بادرۆفسکی) کەوانچە لێ دەدات!؟.».

خانمەکەیش گوتی: «بەڵام (بادرۆفسکی) نازانێ کەوانچە لێ بدات!...».

(بەردناردشۆ)یش گوتی: «دە لەبەر ئەوەیە کە منیش دەڵێم وەک ئەو کەوانچە لێ دەدات!؟».

## پێکەنینی خاوەن ڕۆژنامە و نووسەرەکان

خانمێک هاتە ناو دەسگای ڕۆژنامەیەکەوە لە کارگێڕی ڕۆژنامەکەی پرسی: مزی جاڕدانی مردنێک چەند دەستێنن؟». کارگێڕەکەیش گوتی: «لە هەر سانتیمەترەیەک پەنجاییەک دەستێنین».

خانمەکە سەری سوڕما لە قسەی کارگێڕەکە بەدڵشکاوییەکەوە پێی گوت: «ڕەوای خودا نییە ئێوە ئەمەندە بەگران جاڕ بڵاودەکەنەوە... مزەکەتان یەجگار گرانە!». کارگێڕەکەیش پێی گوت: «نازانم بۆچ بەم جۆرە مزە دڵتان شکا؟!.». خانمەکەیش گوتی: «چونکە مێردەکەم، درێژیی مەترەیەک و حەفتا سانتیمەترەیە، کڵاو و پێڵاوەکەیشیم نەخستۆتە سەر!.».

(٢)

پیاوێکی خۆهەڵکێش بەوێژەوانییەوە لە خاوەن ڕۆژنامەیەکی داواکرد کە بیکات بەسەرەک نووسەری ڕۆژنامەکەی جا چونکە خاوەن ڕۆژنامەکە دامابوو لەسەر سەرەک نووسەرێک، ناچاربوو خواستەکەی هێنایەدی پێیشی گوت: «سەر وتاری ژمارەی داهاتوو ئەو بینووسێ».

ڕۆژی دوایی خاوەن ڕۆژنامەکە هات تەماشای کرد پیت ڕیزکەرەکان چاوەڕوانی وتارەکەی سەرەک نووسەرن کەچی ئەو هێشتا هیچی بۆ نەنووسیون!... ئەویش چوو بەلایەوە، لێی پرسی: «کوانێ وتارەکەت؟ بۆچ تا ئێستا نەتنووسیوە؟...». ئەمیش پێی گوت: «تا جگەرە نەخۆم ناتوانم بنووسم...». خاوەن ڕۆژنامەکەیش پێی گوت: «کەواتە جگەرە بۆچ ناخۆیت؟... کەس جگەرە کێشانی لە تۆ بەربەست کردووە؟!»

ئەویش گوتی: «نەء... بەڵام من خۆم حەز لە جگەرە کێشان ناکەم!؟.».

(٣)

ڕاسپێرراوی ڕۆژنامەیەک چووە کن دەوڵەمەندێک، ویستی چەند قسەیەکی لێ وەربگرێ، تا لەناو ڕۆژنامەکەیدا بینووسێ لێی پرسی:

«ئاخۆ هەندێک لە ئاواتەکانی منداڵیت هاتۆتەدی؟».

دەوڵەمەندەکەیش وەرامی دایەوە، گوتی: «بەڵێ هاتۆتەدی... کاتێ کە دایکم قژی بەشانە دادەهێنا، لە دڵی خۆمدا ئاواتم دەخواست: تووک بەسەرمەوە نەمێنێ!؟...».

(٤)

خونکاری روومانیا، (فەردیناند) بەسەردان چووبووە شاری (پاریس) رۆژنامەیەکی فەرەنسزی لەم سەرلێدانەی ئەو بەم جۆرە دووابوو:

«لەپاش ئەمەی خاوەن شکۆ میوانەکانی خۆی لەناو کۆشکدا بەرێ کرد گەیشتە لای هاودەمەکانی خۆی لەگەڵ ئەمەیشدا کە دەس و پێوەندەکان ویستیان نەچێ، گوێی نەدایە قسەی ئەوان دوایی هەر چووە ناو تەویلەکەوە لەگەڵ سێ مانگادا ئەویش سووتا هەرچی لەوێ دابوون تێکۆشان رزگاریان بکەن لە دەست سووتاندن، بەلام بۆیان نەچووە سەر!.». لە دوای ئەو هەواڵە سەرسوڕهێنەرە، رۆژنامەکە ئەمەیشی نووسیبوو: «ئاگر بەربووەوە لەناو کێڵگەی ژن و مێرد (جاریو)دا لە شاری (بۆنس دی لاس)دا ئەسپێکیش لە بەردەم خانووەکەدا بەسترابووەوە ئەسپەکە سڵەمییەوە و داچڵەکی.

هەوسارەکەی خۆی پچڕی پاشان لەناو چەپڵەرێزانی ئەتەوەدا، گەڕایەوە کۆشکەکەی خۆی!؟»...

لە نووسینی ئەم دوو هەواڵەوە کە بەم جۆرە رۆژنامەکە نووسیبوونیەوە خوێندەوار بۆی دەردەکەوێ، کە کرێکاری چاپخانەکە، هەواڵەکەی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە کە لە ئەنجامدا ئەم دووهەواڵە پێکەنین هێنەرەی لێ پەیدابووە.

جارێکیشیان خونکاری (پورتوگال) سەرێکی لە شاری (پاریس)دا.

هەر ئەم رۆژنامەیە هەواڵی گەیشتنەکەی ئەوی بەم جۆرە نووسیبوو:

«خاوەن شکۆ لە ساتی یانزەهەمدا لە کۆشکی (ئەلیزە) دەرچوو خۆی و کۆمەڵەکەی بەناو شەقامی (فۆبۆرسانتۆنوریە)دا تێپەری کرد نەتەوەیش دوای ئەو گیانلەبەرە کەوت کە لە ناو دووکانی سەوزە فرۆشێکدا خۆی شاردبووەوە لەناو ئەو شەقامەدا، کە لە وێدا یەکێک لە سەربازەکان دایە بەر شیر و کوشتی!؟.».

(٥)

نووسەری تازە وتارێکی نووسی لە ژێر ناوی (نیوەی ئەندامانی کۆمەڵەکە دزن!)... سەرەک نووسەریش لێی تووڕە بوو، گوتی: «ئەمە چییە نووسیوتە؟!. تۆ دەتەوێ ئەوانە لەبەردەم دادگادا سکاڵامان لە دەست بکەن؟!.». نووسەرەکەیش پێنووسەکەی خۆی گرت بەدەستەوە و، بەم جۆرە سەرناوی وتارەکەی گۆڕی:

(نیوەی ئەندامانی کۆمەڵەکە دزنین)!؟.

## پێکەنینی وتاربێژەکان و ئامۆژگارەکان

(١)

کەشیشێک لە گوندێکی بەندەکانی ئەمەریکادا دەستی کرد بەئامۆژگاری کردنی دانیشتووانی گوندەکە بابەتی ئامۆژگاری کردنەکەی (دزێتی) بوو؛ کە دەبێ هەموویان واز لەم کردەوە نەنگە بهێنن، بۆ وێنە ئەو دزێتییانەی ناوبرد کە لە ناو گوندەکە خۆیدا کرابوون ئنجا گوتی: «ژمارەی دەگاتە نزیکەی سەد کەس داخەکەم لە ناوتاندا پەنجا دز هەیە!؟.».

گوێ گرەکانیش قسەکەیان پێ بری و، دەستیان کرد بەهەرەشەلێ کردنی پێیان گوت: «لە قسەکانی خۆی پاشگەز بێتەوە، ئەگینا شلکوتی مەرگی دەکەن!...». کەشیشەکەیش قسەکانی خۆی کێشایەوە بەلام گوتی: «ئێوە ئێستاکە سەد کەسن... منیش ئەوەم زۆر پێ خۆشە کە لە ناوتاندا، پەنجا کەسی وا هەن کە زۆر دەس پاک و کردەوە بلندن، نە کەس رووت دەکەنەوە، نە لە کەسیش دزی دەکەن!.».

(٢)

جارێکیان ئەندامێکی کۆڕی نەتەوەی ئینگلیز لەناو کۆڕەکەدا وتاری دەدا بەلام وتارەکەی زۆر دوور و درێژبوو پیاو لێی وەڕس دەبوو جا پێش ئەمەی وتارەکەی خۆی تەواو بکات، دەستی کردەوە بەقسەکردن گوتی: «گەورەکانم! من وتار بۆ بەرەی هاتوو دەدەم...»...

یەکێکیش لە ئەندامەکانی کۆڕی نەتەوە قسەکەی پێ بری و گوتی: «کەواتە لە رێی خودادا، زوو، وتارەکەت تەواو بکە... ئەگینا پێش ئەمەی وتارەکەت تەواو بکەیت بەرەی پاشەڕۆژیش دەگەنەجێ!؟.».

(٣)

مامۆستایەکی وتاربێژ چووە سەر تەختی وتاردان، وەستا. ئنجا دەستی کرد بەقسەکردن گوتی: «پوختەی ئەو وتارەی دەمودەست بیدەم بەگوێتاندا ئەوە بوو: «کە مرۆڤ سەربەست و ئازادە هەموو شتێک بەئارەزووی خۆیەتی دەتوانێ، هەر دەمێ بیەوێ، چی دەلێ و چی دەکات، بەلام لێم ببورن، کە ئیمشەو پێم ناکرێ وتارەکەمتان بۆ بخوێنمەوە چونکە ناچارم لەگەلْ ژنەکەمدا بڕۆم بۆ ئاهەنگێکی هەلپەڕین!».

(٤)

کەشیشێک هەستایە سەرپێ لە بابەت پاش مردنەوە لەوە جیهاندا ئامۆژگارییان بکات لە بەهەشت و دۆزەخیش دوا دوای ئەمەی لە ئامۆژگارییەکانی خۆی بووەوە، یەکێک لە گوێگرەکان داوای لێ کرد، رێی بدات، قسە بکات گوتی: «باوکی هەموومان! پرسێکم هەیە دەیکەم... ئایا ئەو قولەڕەشانەی پیاو دەخۆن لە دوای مردنیان دەچنە ئاسمان؟».

کەشیشیش گوتی: «نە، کوڕم ناچنە ئاسمان...» ئەویش پرسی: «ئەی کەشیشەکان و پێغەمبەرەکان دەچنە ئاسمان؟». کەشیشەکە گوتی: «بێ گومان دەچنە ئاسمان.».

ئیتر کابرا تۆزێک بیری کردەوەو گوتی: «ئەی ئەگەر هاتو قولەڕەشێک کەشیشێکی خوارد، ئەنجامی بەچی دەگات؟!.».

(٥)

وتاربێژێک لە یانەیەکدا وەستاو وتاری دا بابەتی وتارەکەی بۆ بەزم و ڕەزم و پێکەنین بوو جا لەو کاتەدا کە وتاربێژەکە وتاری دەدا، لەژێر پەنجەرەی یانەکەدا کەرێک دەستی کرد بەزەڕین...

وتاربێژەکە تا ماوەیەکی درێژ، ناچاربوو، بێ دەنگ ببێ... یەکێک لە دانیشتووان پێی گوت: «وتارەکەت تەواو بکە!...».

وتاربێژەکەیش پێی گوت: «تا یەکێکمان بێ دەنگ دەبێ!؟.».

گوێگرەکان کە ئەوەیان بیست دەستیان کرد بەپێکەنین... لەناو خۆیاندا لە یەکتربیان دەپرسی:

«ئاخۆ وتاربێژە لە وشەی (یەکێکمان) مەبەسی کێ بووبێ؟!.

(وتاربێژ) یاخود ئەو (گوێگرەی کە هەڵی دایە)، یاخود (گوێ درێژەکە)؟!.

**سەرچاوەی نووسراو**


١- خلاصەیەکی تأریخی کورد و کوردستان- ب-٢- محمد أمین زکی.

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی- علاءالدین سجادی.

٣- کریم خانی زەند- حسن فهمی جاف.

٤- نوادر جحا الکبری.

٥- کشکول المضحک المبکی-

٦- ڕۆژنامەی خورماڵ- شاکر فتاح

٧- ڕۆژنامەی باسەرە- شاکر فتاح

٨- ڕۆژنامەی چەمچەماڵ- شاکر فتاح

٩- ڕۆژنامەی ئاکرێ- شاکر فتاح

١٠- بیرەوەریی- شاکر فتاح

١١- دیوانی قانع- برهان قانع.

# مجموعة مقالات
# الأستاذ الشهيد شاكر فتاح
# باللغة العربية

## صفحات مشرقة من تاريخ
## مكافحة الأمية في كردستان
## جمعية المعارف الكردية في السليمانية

تأسست جمعية المعارف الكردية (كومەلّى زانستى كوردان) في السليمانية في سنة ١٩٢٦، وقامت بعدة نشاطات ثقافية أهمها: (مكافحة الأمية في مدينة السليمانية)، على أسس علمية وتربوية سليمة. وكان منظراً جميلاً أن يرى المرء في ذلك العهد عدداً كبيراً من أصحاب الحِرَفْ والمِهَنْ من مختلف الأعمار يتهافتون على التعليم في الصفوف التي فتحتها تلك الجمعية لمكافحة الأمية. كما أن إنخراط عدد كبير من الأشراف والوجوه والأغنياء والمثقفين في عضوية تلك الجمعية كان يدخل السرور والسعادة الى قلوب الوطنيّين الأكراد. وأضافت الجمعية الى أعمالها البارة أن فتحت أبوابها لألقاء المحاضرات وقبول المناقشات في مختلف ميادين العلم والمعرفة بين المثقفين الأكراد والجماهير الكردية. وقد تطورت أعمال مدرسة مكافحة الأمية في سنة ١٩٣٣ إلى درجة كبيرة من الرّقي، إذ أهتمت بتدريب الطلاب على الأناشيد المدرسية والرياضة البدنية والخطابة والأعمال المبتكرة من مختلف الصناعات اليدوية. بل قد فتحت المدرسة معرضاً لمصنوعات تلاميذها المبتكرة كل حسب مهنته التي يزاولها. ولا زلت أذكر أن أحداً من التلاميذ قد صنع طيارة من الأخشاب والصفائح كان تسير إلى مسافة عشرات من الامتار بقوة الزنبركات. وآخر صنع حذاءاً مبتكراً يصلح ارتدائه مع الملابس الكردية. وأبتكر تلميذ آخر تقويماً للأيام والشهور والأسابيع باللغة الكردية. وقد ساهمت المدرسة في تقديم مسرحيات باللغة الكردية، أذكر منها (الثورة الفرنسية) و(حياة نيرون الطاغية). وكانت الاحتفالات الخطابية والمناقشات العلمية والأدبية تجري بانتظام في كل أسبوع. ومن الجدير بالذكر أن كثيراً من المعلمين كانوا يقومون بواجب مكافحة الأمية مجاناً. وكان للشباب الأكراد المثقفين دوراً بارزاً في خدمة مكافحة الأمية. وصل عدد التلاميذ في سنة ١٩٣٣ إلى (٢٤٠) تلميذاً. وكانت للمدرسة فرقة نشيد خاصة ولها نشيد خاص ينشد ليلياً.

لقد كان دور جمعية المعارف الكردية في مكافحة الأمية وفي بعث التوعية للروح الوطنية والقومية بارزاً جداً. وأرسلت الجمعية أحد الطلاب الأكراد إلى لندن للتخصص في علم الهندسة على حسابها. وفتحت الجمعية مكتبة عامرة بالكتب المتعلقة بالمعارف الكردية في مختلف اللغات.

كما أنها حاولت إصدار مجلة باسم (كۆڤارى زانستى كوردان) أي مجلة المعارف الكردية. لكنها لم

تتوفق. أما إدارة مدرسة مكافحة الأمية فقد أستنسخت عدداً كبيراً من وسائل الايضاح المتعلقة (بالمحادثات) من اللغة الافرنسية الى اللغة الكردية في مدة أسبوعين. وطبعت شهادة تخرج للتلاميذ خاصة بها كتب في زاوية منها بالأحرف الذهبية كلمات ثلاث باللغة الكردية، لا تزال ترن في أذني وهي: (الأفكار الطيبة) و(الأقوال الطيبة) و(الأعمال الطيبة). أما نتائج أعمال المدرسة المذكورة فكانت عظيمة جداً. إذ خلقت لدى التلاميذ وعياً قومياً ووطنياً وانسانياً دفعهم الى المزيد من الانتاج كل في حقل مهنته وصنعته وجسدت فيهم شخصياتهم الحقيقية.

ومن الطريف أن أذكر أن أحد التلاميذ وهو صبي قد أشتكى لدى مدير المدرسة بأنه سرق منه أثناء فترة الراحة قلماً ومحاية وكيساً مع عشرة فلوس. فجمع المدير تلاميذ الصف وأبلغهم بأنهم أما أن يقدموا إلى إدارة المدرسة -كل منهم- مثل الأشياء المسروقة، وأما أن يعيدوا الأشياء المسروقة حالاً الى إدارة المدرسة، وأما أن يشهدوا على السارق، وإذا تجرأ السارق على الاعتراف بجريمته وأعاد الأموال المسروقة كاملة، فلا خوف عليه تشجيعاً له على شجاعته الأدبية وعلى ندمه.

ومن الطريف أن الأشياء المسروقة قد أعيدت الى إدارة المدرسة في غضون ساعة من الإنذار. فأعادت الإدارة تلك الأشياء الى المسروق منه. وهكذا حلت المشكلة بأسرع وقت وأطرف سبيل.

وختاماً يجب ان أشير أن كثيراً من تلاميذ تلك المدرسة لم يكتفوا بما تعلموه من مبادىء القراءة والكتابة والحساب، بل راجعوا المدارس الليلية الحكومية بعدئذ وواصلوا الدراسة حتى ظفروا بالشهادات العليا وأصبحوا من الأشخاص الناجحين في مهنهم.

## مكافحة الأمية في خورمال

لم تفتح الحكومة أية مدرسة في مركز ناحية خورمال رغم الجهود المبذولة من قبل مدير الناحية فما كان منه إلا أن قام مع بعض المواطنين الخيرين على فتح مدرسة ليلية لمكافحة الأمية. وكان ذلك في أوائل سنة ١٩٤٠. وكان عدد تلاميذها عشرون شخصاً، معظمهم من أصحاب الدكاكين في قرية خورمال. وكان الشيخ الجليل حسام الدين من أعظم أعوان المدرسة. إذ قدم لها غرفة في الخانقاه مع اخشاب لصنع الرحلات والكراسي والسبورة ومبلغ قدره ديناراً واحداً ونصف دينار. ولم تمضي سوى مدة شهر واحد حتى تهيأ كل شيء. فباشر المدير مع صاحبه بالتدريس. وكان وضع التلاميذ مريحاً ساراً يبشر بالخير للجميع. إلا ان ظروفاً مانعة حالت دون استمرار معظم التلاميذ. فلم يبق منهم بالأخير سوى ستة أشخاص أكملوا دراستهم في المدرسة المذكورة ونجح منهم أربعة تلاميذ. ويظهر مما تقدم أن التسلسل في المدرسة هذه كان شعبياً خارجاً عن إرادة السلطة المركزية، تبرع بخدمة مكافحة الأمية أناس من الموظفين والأهليين بمجرد رغبتهم وإرادتهم. وإذا كان تناقص عدد التلاميذ لدى أعضاء هيئة التدريس مؤلماً فقد عوضت الهيئة عن ذلك بطرق أخرى لتثقيف الجماهير الكردية في قرية خورمال البالغ عدد بيوتها آنذاك مائة دار فقط. إذ بعد أن توفي المرحوم الشيخ حسام الدين، حل محله ابنه المرحوم الشيخ محمد فأبدى الشيخ الجديد مساعدات سخية كريمة من أجل إنشاء حديقة

عـامـة للمواطنين في خورمـال. فـتبـرع بقطعـة أرض وعدد كـبيـر من الأخـشاب مع المـاء لإنشـاء حديقـة مساحتها نحو ألف متر مربع. فسيجت الحديقة بسياج خشبي بديع وأنشيء فيها عريش كبير. وزينت باجمل الزهور والورد والرياحين على شكل ترتيب هندسي رائع، أستعمل في ممراتها وزواياها الاحجار الملونة جلبت من الانهار القريبة. فكانت الهيئة التدريسية تجمع أسبوعياً القرويين من سكان قرية خورمال في تلك الحديقة الجميلة، وبعد ان تقدم لهم السكاير والشاي وتسمعهم الاغاني والموسيقى بواسطة آلة الراديو التي كانت تعتبر من الاشياء النادرة إذ ذاك، تقرأ عليهم محتويات جريدة توجيهية باللغة الكردية اسمها (جريدة خورمال = رۆژنامەی خورمال). وهي تحثهم على التعلم والتهذيب والنظافة والصحة والانتاج والاهتمام بشؤون الحياة. كما وتثقفهم باخبار عن الناحية وأخبار ومعلومات عن خارج الناحية والعالم. كما أنها كانت تجيب على أسألتهم وإستفساراتهم بقدر ما يتعلق بمصلحتهم والمصلحة العامة. وقد صدر (٢٤) عدداً من جريدة خورمال خلال سنة ١٩٤٠. وكانت الجريدة تصدر مرتين في الأسبوع. وهي تهتم بسير التدريس في مدرسة مكافحة الأمية في خورمال وتنشر أخبار امتحانات التلاميذ وتطورهم. وكانت تعلق على لوحة خشبية داخل (حديقة خورمال العامة) لتتيسر قراءتها من قبل التلاميذ والجماهير الكردية. لقد كان تأثير مكافحة الأمية في خورمال بهذه الوسائل الثلاثة: (المدرسة) و(جريدة خورمال) و(حديقة خورمال العامة) عظيماً على نفوس القرويين في مركز الناحية والقرى التابعة لها، الأمر الذي أدى بكثير من أصحاب المرؤة والشهامة الى مساعدة هيئة التدريس والتبرع لمشاريعها العمرانية والثقافية بالأموال والعينات.

أنتهت أعمال مدرسة مكافحة الأمية في خورمال بعد نقل مدير الناحية. ولكن لم تمض على مجهودات المدير حول فتح مدرسة حكومية في خورمال سوى سنة واحدة حتى فتحت وزارة المعارف مدرسة رسمية هناك. فتهافت أولاد الموطنين على التعلم من سكان قرية خورمال وما جاورها من القرى وبذلك تحققت رغبات الأهليين في قرية خورمال بفضل اللّه.

## مكافحة الأمية في قرى ناحية قاردكرم

أما قرية قادركرم فقد أسس فيها مدير الناحية مع عدد من الشباب النابهين من أهالي المنطقة مدرسة لمكافحة الأمية بلغ عدد تلاميذها من الفلاحين أكثر من عشرين تلميذاً ثم بوشر بفتح مدرسة أخرى لمكافحة الأمية في قرية (قلا مكايل) وقرر تأسيس ثلاثة مدارس أخرى لمكافحة الأمية في القرى (قره جيوار) و(وەستا خدر) و(قشقة). وكان ذلك في سنة ١٩٤٢. وأسست الهيئة التدريسية حديقة عامة مساحتها (٩٠٠) ياردأ مربعاً على نفس الأسس السابقة في خورمال. سميت (باخى گشتى قادركرم) أي (حديقة قادركرم العامة). كما وأصدرت جريدة أسمها (باسەرە) بأسم النهر المار من قادركرم مركز الناحية بنفس الأهداف والأسس المبنية أعلاه. وكانت الجريدة تعتني بشؤون التلاميذ والقرويين مثل جريدة خورمال تماماً. وتصدر بنسختين لكي ترسل نسخة الى كل مدرسة من المدرستين المذكورتين. وكانت الحفلات الأسبوعية تقام بانتظام في الحديقة بالنسبة لأهالي قادركرم. أما بالنسبة

لقرية (قلا مكايل) فكانت تقام في ساحة عامة قرب المدرسة. صدر (٢٤) عدداً من جريدة (باسهره) خلال سنة ١٩٤٢. وأنتهت المكافحات وأعمال الجريدة والحديقة بنقل المدير مع الأسف الشديد. إلا أن تأثير أعمال الهيئتين التدريستين في نفوس سكان ناحية قادركرم لا يزال حياً، اذ كانت المنطقة تتغذى ذهنياً وفكرياً وروحياً من ثمرات عقول هؤلاء الشباب وخدماتهم المخلصة والمجردة عن المنفعة الذاتية. ومن الطريف أن أذكر أن تلاميذ مدرسة قادركرم لمكافحة الأمية، لم يغب منهم أحد طيلة مدة بقائها، ذلك لأن مدير الناحية الذي كان يسيطر على توزيع السكر والشاي في ذلك الوقت، كان يعطي لكل من لا يغيب من التلاميذ ضعف حصة القرويين الذين هم خارج مكافحة الأمية.

## حقائق يجب تسجيلها

لقد مر على كردستان عهد من الزمن كانت في كل قرية تقريباً مدرسة دينية يرأسها إمام المسجد في القرية يقوم بمكافحة الأمية ونشر الوعي الديني والقومي والوطني في حدود الشرع الاسلامي الحنيف وكان الأمراء الأكراد هم أنفسهم (غالبيتهم) من العلماء والأدباء والمثقفين. وهم بدروهم يهتمون بإنشاء المساجد وتكريم رجال الدين من العلماء الأكراد لغرض مكافحة الأمية بين الموطنين الأكراد بأوسع معانيها. بل كان منهم من يكرم رجال الدين من المسيحيين وغيرهم من أصحاب الأديان الأخرى في كردستان ويرعى معابدهم لنفس الغرض. ومن العلماء الأكراد من كان لا يكتفي بمدرسته، بل يختلط بالجماهير الكردية يومياً سواء كان في المسجد بعد الصلوات أو في المجالس فيقوم بمكافحة الأمية بين الحاضرين سواء كانوا متعلمين أو غير متعلمين، يوضح لهم واجباتهم الدينية والقومية والوطنية والانسانية ويوجههم نحو الخير العام، نذكر على سبيل المثال (احمد خاني) الذي عاش في الفترة الكائنة بين (١٦٥٠ و١٧٠٦) و(الحاج قادر كويي) الذي عاش في القرن التاسع عشر و(ملا كاكه حمه) الذي عاش في القرنين التاسع عشر والعشرين. إن هذا الرجل الفذ قام بمكافحة الأمية نحو (٣٦) سنة في منطقة كردية تمتد من اواسط لواء ديالى حتى حدود (ساقز) الايرانية وترك تجارته وعائلته ومدينته ووظيفته الرسمية وقام بمكافحة الأمية وعاش من أجل أن يرى شعبه الكردي يوماً من الأيام محرراً من الجهل والتخلف والخرفات والمظالم، وقد نال حقوقه القومية المشروعة ليشعر بانسانيته ومركزه اللائق بين الشعوب المتمدنة. ويجب أن لا يفوتنا ذكر العلامة (الملا محمد كويي) الذي قام بمكافحة الأمية والمظالم بيده ولسانه وقلمه، وساعد على تحرير المرأة الكردية، وناضل من أجل حقوق أمته المشروعة، وهو واحد ممن ترجم القرآن الكريم وفسره في هذا العصر علاوة على ديوان أشعاره الموجهة للشعب الكردي الى الرقي والتقدم. إنما قام هؤلاء العلماء الافذاذ بواجباتهم الدينية والوطنية والقومية والانسانية دون ان تكلفهم السلطات الحكومية بذلك. بل بمحض رغبتهم وإرادتهم. أما الشعب الكردي فقد كان دوره تقديم الاحترام اللائق لهم ومساعدتهم مادياً وأدبياً كمكافأة رمزية مقابل خدماتهم البارة النيرة التي لا يمكن تقديرها بثمن.

## * مكافحة الأمية في جمچمال[1]

في أواسط سنة ١٩٤٦، ظهرت حركة قوية وموسعة في چمچال في كافة نواحي العلمية والثقافية والأدبية والفنية، هدفها القضاء على الأمية في چمچمال في كافة أشكالها. ففتح صف لمكافحة الأمية، يعلم فيها مبادىء القراءة والكتابة والحساب من قبل لفيف من الشبان الوطنيين، لايريدون جزاءً ولا شكوراً، يخدمون شعبهم الكردي من تلقاء أنفسهم، تؤيد تلك الحركة المباركة جريدة خطية بنسخة واحدة تصدر في كل أسبوع إسمها (چمچمال) باللغة الكردية تلقى محتوياتها على مسامع الجماهير الكردية في قصبة چمچمال، بجانب المحاظرات والمسرحيات وحفلات الأغاني الكردية والمسابقات الفنية وذلك لتوجيه الشعب في القضاء نحو الخير العام. وكان ذلك يجري في كل أسبوع لمدة أشهر عدة.

## اقترام مكافحة الأمية

ومما يجدر ذكره - حسب اعتقادي - أن الأمية تعني عدم الوعي، وعدم تطبيق العلم في الحياة اليومية وعدم إستثمار العلم من أجل التنمية الإقتصادية وسد الحاجيات البشرية المشروعة. وحيث أن هناك عدداً هائلاً من الناس رغم علمهم وخبرتهم لا يطبقون العلم في حياتهم اليومية في الحقل العام وفي الحقل الخاص فيجب أن يعتبر هؤلاء أميّون. أما الذين لا يعرفون القراءة والكتابة والحساب، لكنهم يطبقون العلم في حياتهم الخاصة والعامة ويستثمرونه بالطرق المشروعة فيجب أن لا يعتبرون أميّين وإن كان من الأفضل أن يتعلموا القراءة والكتابة والحساب أيضاً. ويعتبر النبي محمد (ص) رجلاً من هذا القبيل. إذ رغم انه لم يكن يعرف القراءة والكتابة والحساب لكنه طبق ما تعلمه من العلم والأدب وفرائض الدين على يدي اللّه العلي القدير في حياته العامة والخاصة فكان خير قائد وخير إداري وخير زعيم سياسي. قاد الناس الى الحياة الحرة السعيدة الخيرة. فالعبرة في مكافحة الأمية إذن هي خلق مجتمع فاضل يقوم أفراده بواجبهم الديني والوطني والقومي والانساني بما يعود على الجميع بالخير العميم[2].

---

١ - وجدنا هذا الجزء من المادة مكتوباً بخط كاتبها أسفل الصفحة الخامسة (أي في نهايتها) مذيلاً بملاحظة: (يضاف الى البحث مايلي:...) وتوقيعه. فأرتأينا إضافته هنا.

(٢) نشرت المادة في مجلة (الحكم الذاتي) عدد (٥) للسنة الثالثة ١٩٧٨ من ص (٣) الى ص (٥).

سیمیناری ئۆریەنت کۆندە
زانکۆی گۆتەنبرگ ۱۹۷٥/۱/۲۲
بەڕێوەبەر

بەڕێز/ شاکیر فەتتاح ئەحمەد
گەڕەکی شۆڕش ۲٦٥/۲۰۰
سلێمانی/ عیراق

زۆر سوپاس بۆ ناردنی نووسراوەکانتان (۱۹۷٤/۱۹۷۳)،
بەناوی سیمینارەکەوە. کتێبخانەکەمان زۆر دەوڵەمەند ئەکات.
هیوادارم پەیوەندیمان هەر بمێنێتەوە.

زۆر دڵسۆزتان
پ. د. یۆهانس بێنزینگ

**Seminar für Orientkunde**
der Johannes Gutenberg-Universität

The Director

65 Mainz, den 22. January 1975
Saarstraße 21
Postfach 3980
Telefon 391
bei Durchwahl 39 } 2779 / 2780

Mr. Shākir Fattāh Ahmad,
Shōrish 200/265,
Suleymany/Irak.

Dear Sir,

You have anew had the great generosity of sending us a series of 1973/1974 publications of yours. On behalf of "The Seminar für Orientkunde" I thank you very much for this very esteemed addition to our library, and beg to remain, dear Sir,

Yours very truly

Johannes Benzing.
(Professor Dr. Johannes Benzing).

وەرم گرت
١٩٧٥/٢/٤

سیمیناری ئۆریەنت کۆندە
زانکۆی گۆتەنبرگ ٥/٦/١٩٧٥
یۆهانس بێنزینگ

بەڕێز/ شاکیر فەتتاح ئەحمەد
گەڕەکی شۆڕش ٢٠٠/٢٦٥
سلێمانی/ عیراق

زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان لە ٣/٣/١٩٧٥ بۆ ناردنی دانەیەک لە (شەرەفنامە). ببوورن کە درەنگ وەڵامتان دەدەمەوە، تکایە نرخەکەیم بۆ بنووسە چەندە.

ئێستا وانەکانی کوردی لە زانکۆکەماندا دەوترێتەوە، ئەم هاوینە لەژێر بەرگێکی تردا کۆرسی (تێکست بوک)ی کوردی دەخوێنین، دانەیەک لەو تێکست بوکەم بۆ ناردن.

وەک دەبینن من (تێکست)ێکی ئاسانم هەڵبژاردووە، بەڵام زۆر زەحمەتبوو بۆ ئەوانەی کە لەسەرەتادان (وەکو من) بەتایبەت، ڕزگارت کردم.

دەتوانن بەکوردی نامەم بۆ بنووسن، هیوادارم تێی بگەم، هاوکارم (د. مەهدی) دەتوانێت یارمەتیم بدات، بۆ ئەوەی نامەکان بخوێنمەوە.

زۆر دڵسۆزتان
پ. د. یۆهانس بێنزینگ

**Seminar für Orientkunde**
**der Johannes Gutenberg-Universität**

Johannes Benzing

65 Mainz, den 5th June 1975
Saarstraße 21
Postfach 3980
Telefon 391
bei Durchwahl 39 } 2779 / 2780

Mr. Shākir Fattāḥ Aḥmad
Shōrish 200/265,
Suleymany/Irak

Dear Sir,

With many thanks for your kind letter of 3rd of March, 1975, and the copy of the "Sherefname", I apologize for not having written immediately after receipt of this useful book. I was awaiting invoice and indications as to how the amount has to be settled up.; please inform me of this subject.

In the meantime the Kurdish lessons at our University continue. Under separate cover I send a copy of the Kurdish text we are reading this summer term. You will see that I chose a rather simple text, but it offers enough difficulties for beginners (among whom myself) such as Rizgarit kirdim 'you liberated me'.

You may write me in Kurdish, I hope to be able to understand, and in any case my colleague Dr. Mahdi can help me to read your letters.

Yours very truly

Johannes Benzing.

وەڵام درایەوە پارەم ناوێ چونکە
خۆشەویستیم لە پێوە ئەدوێ.

٢١/٦/١٩٧٥

سیمیناری ئۆریەنت کۆندە
زانکۆی گۆتەنبرگ ١٨/٤/١٩٧٤
بەڕێوەبەر

بەڕێز. شاکیر فەتتاح
گەڕەکی شۆڕش ٢٠٠/ ٢٦٥
سلێمانی- عێراق

بەڕێزی خۆشەویست
بەناوی سیمینارەکەوە زۆر سوپاستان دەکەم بۆ ناردنی (١٧) نووسراوی خۆتان. ئەم نووسراوانە کە تەرجەمە کراون بەقەڵەمی خۆتان، زۆر سوودمان لێ وەرگرتن بۆ سیمینارەکە.
هەروەها سوودیشی هەیە بۆ خوێندکارانمان و دەکرێت بە(تێکست بوک). هیواداریین لە کارەکانتاندا بەردەوامبن و سەرکەوتووبن

زۆر دڵسۆزتان
پ. د. یۆهانس بێنزینگ

Seminar für Orientkunde 65 Mainz, den 18.4.1974
der Johannes Gutenberg - Universität

<u>Mainz</u>

The Director

Mr. Shakir Fattah Ahmed,

Shorish 200/265
<u>Suleymany</u> / Irak

Dear Sir,

On behalf of the "Seminar für Orientkunde" of the Mainz University I have the honour to thank you very much for the generous donation of 17 publications of your publishing - house. These publications, translated works as well as the most valuable original contributions written by your own pen, are an appreciated enlargement of the Kurdish section of the library of our "Seminar". They will not only be at the disposal of our students, but extracts from them will also be prepared and used for reading exercises in a similar way as the sample of a text which we are mailing under separate cover.

We do hope that your work and publications will successfully continue.

With our best wishes I beg to remain, dear Sir,

yours very truly

Johannes Benzing

(Prof. Dr. Johannes Benzing)

هامی ژانا و خۆشەویستی وەنەوشە هاوڕێستا سکرتاری بەڕێز پێشکەشە

ڕۆژنامە باسێ

ئاواتەخوازم هەردەم لە خۆشبەختیدا بە ...

نووسراوی: دڵداری موکریانی کە لە نووسینی ئێوەی بەڕێزە
چەند ڕۆژێ لەمەوبەر نامە دەور داخی بەدیاری بۆ ڕەوانە کردم...
گرنگی نووسراوەکە.. دەربڕینی ڕاستی بەرامبەر بە هەستی هامن.. ڕوونکردنەوەی
بیوگرافیای هامن بە وانا بەسەرهاتی بە هێنانەوەی بەڵگە و بە ڕێگایەکی ڕاستی
هانیا بەدەم کە لە دڵەوە بەرامبەر سوپاسی پێشکەشی ئێوەی هەندە و
بەڕێز بکەم.

ئەوەی شایانی باسە. هەر چەندی وتارەکەی بە هەستی هامن بوو
هانی دام بە گیانی تەواوکردنی خوێندنم لە فەرهەنگی بەرز و لە کۆمەڵی بەرەنگاری
بکۆڵمەوە و گەواهینامەی پێ وەرگرم بەشکم بەم ڕێگایە بتوانم خزمەتی خۆشەویستی
نەتەوە گیانمە. کە لەم باوەڕەدام ئێستەش لەبەر باری ناهەمواری کورد
هەر نەسرەوتە.

ئیتر بە بڕوای من ڕاستە و خزمەت کردن لۆ سەرلی کوردەواری دواکەوتووانە
هیوادارم ڕۆژگار لەگەڵتان یاربێت.

بچووکتان
کوردستانی موکریانی / مۆسکۆ/ ۱۹۷۲/۴/۲۲

СССР Москва В 218 ул Крыжановского
д/ 18 к / 67
Курдистан Мукриани

**Seminar für Orientkunde**
der Johannes Gutenberg-Universität

65 Mainz, den 29.10.74
Saarstraße 21
Postfach 3980
Telefon 271
bei Durchwahl 17 } 2779 / 2780

أستاذنا الكبير فتاح شاكر الموقر

تحية اعجاب وتقدير وود ،

تسلم معهدنا بيد الشكر والامتنان مؤلفاتك المهداة
الينا . واضافة الى المكتبة يستفيد منها اهل العلم والمعرفة وعشاق
الادب واللغات . نرجو ونأمل ان لا تبخل علينا في المستقبل
بانتاجك الذي القيم .

لعله في وسعك تزويدنا بفقرة من الكتابات التي نشرت
حول قاموس الاستاذ توفيق وهبي باللغة الكردية في العربية . فانا
انوي القيام بكتابة بحث عن هذا القاموس قريبا .

اني سأكون ممتنا جداً لو تفضل سيادتكم باعطائي رأيك
السديد ونصائحك القيمة بهذا الصدد وتعريفي بالكتابات
المنشورة عن القاموس باللغة الكردية او ارسال هذه الكتابات لي
اذا كان ممكناً .

مع التقدير والاعجاب والتمنيات الصادقة
بالصحة والعمر المديد

المخلص
دكتور مهدي جباري

دڵسۆز و مهرەبانم

باوکی بەڕێزم و هاوڕێ تێگەیشتووەکەم

لە ناخی دڵەوە گەرمترین سەڵاوت لێ دەکەم... هیوادارم لەوپەڕی خۆشی و کامەرانیدا بیت... لەش ساغ و دەم بەخەندە... دوور لە ئەشکەنجە و گیروگرفت.

هەواڵی خیزانت دەپرسم و دەستەکانی ماچ دەکەم...

مامۆستا گیان کە ئەمڕۆ ڕۆژی شەممە و ١٩٧٣/٥/١یە بەتەنها لە ژوورەکەم دەرسمان نییە دانیشتم خەیاڵی فراوانم مەیل و ئارەزووی بینینت وای لێ کردم کە پەلاماری قەڵەمەکەم دا و داخی دووری و ناخۆشیم بۆت باس کەمەوە. بەیادی جاران... ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر تەم و ناخۆشە... ئاسمان شەڕ دەفرۆشێ ڕووی موسکو تەواو تاریک و تەماوی و گرژ بووە... منیش جار جارە لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە سەیری سروشت دەکەم کە هەر جارە جۆرێک خۆی دەگۆڕێ، ڕادیۆی ژوورەکەیشم مۆسیقایەکی غەربی وەکو گرامەکەی تۆ کە ڕۆژەکە هاتم بەسەرا ئەوەیە... زیاتر دڵم کرایەوە... چیت بۆ باسکەم لە مۆسکۆ کە زۆر دڵم ناکرێتەوە زمانەکە زۆر قورسە... ژیانی کۆمەڵایەتی باشە... بەڵام ناتوانم بەڕوونی باسی دوو جنس بکەم کە قسەکانت هاتەدی... ئاژەڵێن... زۆربەی زۆریان... شتیکیان زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشە ئەویش دیمەنی وەستانی دوو ئەفسەر لە نزیک گۆڕی لینین کە نزیکەی سەعاتێک نابێ بەهیچ جۆرێک بجوڵێن وەکو صنم دوای گۆڕانیان بەشێوەیەک کە موچرک بەگیانی ئینسانا دێت هێندە جوانن دەگۆڕێن... ئەوە زۆر خۆشە. دیمەنی مۆسکۆش زۆر خۆشە، ئێستا چیمەنەکان سەوز بووە... بەرگی درەختان قاوەیی و زەرد و سەوز هێندەی کە دیمەنیان جوان کردوون...

مامۆستا گیان: ئێستا لەگەڵ خوشکە کوردستان بەیەکەوەین وە دەرچوونمان بۆ بازاڕ و مطعم و جێگای پێویستی بێ یەکتری دەرناچین، بەڕاستی کیژێکی لێ هاتوو ڕەوشت بەرزە کە زۆرم بەدڵە و خوا خۆشی ویستم کە ئەو گەوهەردم دەست کەوت.

کە گەیشتمە مۆسکۆ بەدرێژی وتی ئەوە واقعە... دنیایە وایە... وە منیش وتم یەک شت لێرەدا هەیە باوەڕمان بەهەموو زەردەخەنەیەکی دروست کراو نەبێت... بەنزیک بوونەوەی ئەو ئافرەتانەی کە چاویان پێمان دەکەوێ و ماچمان دەکات بۆ نزیک بوونەوەمان لێیان باوەڕمان پێیان نییە... جا ڕەنگە نزیک بووبێتەوە لە مەبەستم کە بیرمانە.

چاوەکەم زۆر حەز دەکەم کە جار جار کاغەزم بۆ بنووسی و باسی شارەکەمان کە هەر ڕۆژە جۆرە ئەدەبێکە لە مێژووی کوردا بۆم باس کەیت... وە زیاتر پەیوەندیمان بەتوند بێت.

حفلەی نەورۆز کرا زۆر خۆش بوو وە بەجلی کوردییەکی زۆر جوانی سلێمانیانە چووم کە جێگای سەرسوڕمانی دانیشتوان بوو... شاییەکی جوانی کوردیم کرد لەگەڵ برادەران... بەوپەڕی سەربەرزییەوە... وە باوەڕ کردن بەخۆم و بەکیژی وەکو خۆم و کیژی کوردەوە کە شاییەکەی ئێمە گرتنی پەنجە بەوپەڕی پاکی و دڵ سافی و جوانەوەیە... من و کوردستان بانگکراین بۆ حفلەی (...؟) نەچووین. لەگەڵ برادەران چووین بۆ مطعم و بەقسەی خۆش ڕامان بوارد... کوردەکانمان زۆر باشن زۆر ڕێزمان لێ دەگرن... جێی شانازین.

مامۆستا: زمانی ڕووسی زۆر قورسە (ئۆچن ترودنە) پێویستی بەهیلاکی زۆر هەیە وە منیش تەنها ڕۆژی شمە و یەک شەمەم هەیە کە پشوویەک بدەین و لێ پرسینەوەی دەرس ئەوەش هەر کارێکی گرانە، بەڵام مامۆستاکان زۆر باش و ڕووخۆشن... دەرسەکەیان لا سووک کردووین... مامۆستاکانم زۆریان خۆش دەوێم زۆر ڕێزم دەگرن دەڵێن تۆ زوو تێ دەگەیت و سەعی دەکەیت... وە ئێستا زۆرترین کات گوێ لە ڕادیۆ و شەو سەیری تلفزیون و گفتوگۆ لەگەڵ کچانی داخلیەکەم وە سەعی خۆیشم هەموویم دابەش کردووە مامۆستا گیان... لە داخلیەکەم کە هەموومان کچین... پیاومان لەگەڵ نییە وەکی داخلییەکانی تر وە هەر لە عەینی بنایە دەرسمان هەیە زۆر خۆشە... کەی بێ ببیستم کە دێیت بۆ مۆسکۆ و دەعوەتی ماڵەکەمت بکەم و قوبلی سوورت بۆ لێنێم... خۆزگەم دەهاتی...

زۆر زۆر ڕێز و حورمەتم بۆ خێزانت...
خوشکە کوردستان سەلامت لێ دەکات.

دڵسۆزت
شکریە ڕەسوڵ
١٩٧٣/٥/١

٥

بەرواری ۱۹۷۳/۱/۱۸

برای زانا و گەورە و پایەبەرز و دڵسۆز مامۆستا شاکر فەتاحی بەڕێز و خۆشەویست.

ڕۆژتان باش و هەموو ڕۆژێکتان هەر جەژنە و پڕ خۆشی و شادمانی و کامرانی بێت. بەگەیشتنی بیست ژمارە لە بەسەر هاتەکەی بەهەشتی کاکم سەربلند و سوپاسگوزار بووم. ژمارەییێکم بردە ژوورەکەی خۆم دووجارم هەرسی لاپەڕەکانی خوێندەوە، دیارە هەتا ئاگر خۆشتر و بەتین تربێ:- سەماوەر باشتر دەکوڵێ، بەندەش لەبەرئەوەی کە هەتا لاپەڕەییێکم دەخوێندەوە بەقەد چەندین لاپەڕەی نەنووسراوم وەبیردەهاتەوە، بەدەست خۆم نەبوو دڵ دەکوتی بەڵام چاوەکانیشم بەفرمێسک هەڵوەراندن ساردی دەکردەوە و دایدەمرکاندەوە.

ئێوە بەم شاکارە تەنها سەری بنەماڵەی ئێمەتان بڵند نەکرد و بەس بەڵکو ڕەوانی پاکی زردەشتی موکریانی و قاضی محمدی نەمر و هەموو کوردێکی یەکڕەنگ و کوردستان پەرستان شاد و خەرۆ کردووە و بەڕاستی بەپێی توانا و تا ئەندازەییێکی کە شارەزاییتان لە دەست دا بووە مافی ویتان پارازتووە. بەڵێ پیاوەتی و مرۆڤایەتی و یەکڕەنگی و ئەمەگداری هەر لە ئێوەی خاوەند بیروباوەڕی پاک و یەکڕەنگ دەوەشێتەوە و بەس کاتێکی کە ئێمە لە سوریە دەربەدەر بووین و لەڕەواندزێ دا خۆمان گرتەوە و خەریکی پەخشی گۆڤاری زاری کرمانجی بووین لە ڕووی ئەوەوە کە زۆرترین خوێندەوارەکانی سلێمانی کۆنە مووچەخۆری عشمانیان بوون و بەناوی بەندیواری و ناسیاری و ئایینەوە زۆر تورکچێتییان دەکرد و ڕێشیان لە ئێمە بوو چونکو مستەفا کەمال و داروودەستەی وی دژی ئێمە بوون. زۆرباش لە بیرمە یەکەمین کەسێکی لە سلێمانی بەندیوارێتی لەگەڵ ئێمە کرد و یارمەتی دەداین ئێوە بوون وە لە کەرکووکیش مامەندی کەرکووکی و ئەثیری و لە هەولێریش قەرەنی نافع ئاغا بوون، کەوایە شارەزایی و دۆستایەتی و برایەتی ئێوە خۆی لە (٥٠) ساڵ دەدات و ئێستاش بەم شاکارە بەڵێنی برایەتی و دڵسۆزێتی خۆتان تازەتر کردەوە.

جا نازانم بەچە زاراوە و ڕاوێژێکی ناسک و شیاو سوپاسێکی کە شایانی شان و پایەی ئێوە بێ پێشکەش بکەم لە یەزدانی پاک ئاواتە خوازم کە تەمەنتان درێژ کات و هەمیشە بەخۆشی و تەندروستی و بەرزی ڕابوێرن.

بەندە لە بابەت بەسەر هاتەکەوە چەن پێشنیازێکم هەیە:

١- دەبوو لە جیاتی چیرۆک بەسەرهات بنووسرایە چونکو بەسەرهات چتێکی ڕاستەقینەیە و چیرۆک ئەفسانەیە.

٢- دەبوو بەسەرهاتەکە لە (٥٠) لاپەڕە کەمتر نەبووایە، کەلێک چتی گرنگی لێ فرێ دراوە و کورتکراوەتەوە.

٣- گومان لە دەرمانداری دا نییە فاتمەی خێزانی بەهۆی دوکتۆر ڕۆسوودەی هیندی کە پزیشکی تایبەتی باڵیۆزخانەبوو کردی کە بەدیدارتان شادبووم بەدووروودرێژی ئاگادارتان دەکەم.

ئیتر لە سوپاس و پێزانین و کۆڕنووشی پێویست چیترم لەدەست نایەت خودای تاک و تەنیا تا دێر نەمانێ ئێوەمان لێ نەستێنێ و هەمیشە بەخۆشی و سەربەرزێتی ڕابوێرن.

برای گچکەتان

گیو موکریانی

بەنای خۆم و خانەوادەکەمان و هەموو
کوردێکی موکری و کورد و کوردستان پەرستەوە سوپاسی خۆم دووپات دەکەمەوە.

کۆڕی زانیاری کورد

الوزیریە- بغداد

زۆر بەڕێز مامۆستا شاکر

سلاوێک لە دلەوە لەگەڵ سۆز و ئیحترام

چەند ڕۆژەک لەمەوپێش میهرنامەکەت مێشک و دڵمی ڕوون کردەوە، چەندجار بەقەد درێژی و زەحمەتی نووسینەکەت سوپاسگوزاری کردم. دەبوا لە هەمان کاتی گەیشتنی هەر نەبێ بەوەجهی وەفاکاری جوابەکەی بنووسمەوە بەلام بڕوات بێ بەجۆرێک مەشغەڵەت و سەغڵەتی ڕەنگاوڕەنگ و صەد ناهەنگ پابەندی کەم توانایی کردووم و فرسەتی لێ سەندوم بەحاڵ دەپەرژێمە سەر ئەنجامی کردنی پێویستی موجامەلە، بۆ میسال دەڵێم نامەی ئەوتۆ هەن لە دوو مانگ زیاترە بەدیار هەڵێکی لەبار، جارێ وا لەودیو پەردەی عەدەمن، جورئەت ناکەم دەست بۆ قەڵەم و کاغەز بەرم چونکە دەزانم بەپێی شیان نووسینم بۆ ناکرێ: کەوا بۆ جەنابت هانم دا بەرخۆم و ئەو چەند دێرە شڕوبڕە نووسی، پشت ئەستوور بووم بەوە چاوی لطفت عەیب پۆشە و لە تیلایی جوانکاریتانەوە ئارایشتێکیش دەبەخشن بەنامە ڕووت و قوتەکەم.

ئەوەی نوسیبووتان، هێندە سوودبەخش بوو زەحمەتێکی تێیدا بەخەرجتان بردبوو وەک دانەوێڵەی تو دەر بوو بەخەرمان و تێشووم لێ پڕکرد. دەمێنێتەوە مادەی (أويس القرني) وادیارە چار نییە دەبێ وەک هەڵە ڕاست بکرێتەوە چونکە هەموو سەرچاوەکانی کە مەعلوماتت لێ وەرگرتوون لێی لادەدەن بۆ ڕەچەڵەکێکی دیکە بەنیسبەت کتێبەکەی لای منیش، ڕوونکردنەوەی درەختی خانوادەی نووسەرەکەی کەلەبەرێکی فراوان پڕ دەکاتەوە، لەم ڕووەوە و لە ڕووی لطف و هیمەتیشەوە ئەوەندەی بڵێ مەمنونتم یاخوا هەر بمێنی بۆ سوودی گشتی و شەخسی و وەک نموونەیێکی هیمەتی بەرز و گیانی زانستپەروەری ئەمەو ئەوپەری خۆشویستن و ڕێز و ئارەزووی

برای خۆت

مسعود محمد

بەڕێز مامۆستا شاکر فەتاح پێشکەشە !

بە گەرمای دڵەوە سڵاوت لێ ئەکەم ، هیوای خۆشی و
بەختیاریت ئەکەم .

لە ڕێگای مامۆستا گیوموکریانییەوە کتێبە بەنرخەکەت لە
بارەی یەزیدییەکانەوە بەدەستم گەیشت . بەڕاستی ڕام زۆر هەیە
لەسەر ئەو کتێبەت و زۆر بەدڵمە . لەبەر ئەوەی ناونیشانت
نازانم هەر لە ڕێگای مامۆستا گیوموکریانییەوە زۆر لەمێژە نامەیەکم بۆ
ڕەوانە کردیت ، بەڵام تا ئێستا وەڵامم پێ نەگەیشتووە .
بڕیارم دا کە نامەیەکی کەت بۆ بنووسم .

لەبەر ئەوەی من لەسەر یەزیدییەکان ئەنووسم ئەمەوێ
چەند پرسیارێکت لێ بکەم : لە چ کتێبێکی عەرەبییەوە ئەو باسەت
وەرگێڕاوەتە سەر کوردی ؟ بە عەرەبی تەنها ئەو کتێبە هەیە
لەو بارەیەوە کە تۆ وەرت گێڕاوەتە سەر کوردی ، یاخود وەرگێڕاوی
کەی عەرەبی هەیە ؟ ئەو سەرچاوە عەرەبییەی کە تۆ
بەکارت هێناوە لە چ سەرچاوەیەکی کوردی یەزیدییەوە وەرگێڕاوەتە
سەر عەرەبی ؟ تکایە بە دوور و درێژی وەڵامی ئەم پرسیارانەم
بدەرەوە ، چونکە زۆرم پێویستە . هەروەها گەر ئەو کتێبانە
هەن و لە تواناتا هەیە بۆتو بۆم ڕەوانە بکەیت . گەر ئێوەش
پێویستیتان بە هیچ نووسراوێک هەیە بۆمان بنووسن

١٩٦٧/١٢/٢

بۆ وێژەری هەڵکەوتوی کورد مامۆستا شاکر فەتاح - بەڕێز

کاتی خوێندەنەوەی نامەت وە گشت کاتێکی ژینت شادبێت.

پێشەکی زۆر بەپەرووشەوە نامە بەنرخەکەتم بەدەست گەیشت، زۆر دڵشاد بووم بەوەی کە نامەم لەلای تۆی بەڕێز بۆ بێت.

وە هیوادارم کە هەمیشە وشە جوانەکانت لە ئاسمانی کوردەواریدا گەشەدارین بۆ ڕووناک کردنەوەی بیروباوەڕی گشت کوردێک.

مامۆستا بەڕێز:

ئەوەی کە من نوسبووم دەربارەی پەرتوکە بەنرخەکەتان (ئافرەتای کورد) دڵۆپەیەک بۆ دەرحەقی ئێوەی بەڕێز، کە بەڕاستی پایەبەرزن کە لە وێژەی کورد بەگشتی و لە پەخشانی کۆمەڵایەتی بەتایبەتی.

مامۆستای بەڕێز:

ڕاستە کە ئەمەوێ باسی پەرتوکەکەی تۆ بکەم لە ئێستگەی بێ تەلی بەغاوە. ڕەنگە چوارشەمەی ئاینندە سەعات ٨ شەو بتوانم باستان بکەن، هیوادارم کە ئەو گۆشەیە بەگشتی جێگای ڕەزامەندی ئێوە و وێژارانی کورد بێت.

ئیتر لە کۆتایی نامەکەمدا ئەحوالی گشتماڵەوە ئەپرسم تکایە سلامێکی تایبەتیم بگەینە مامۆستای بەڕێز (شیخ محمد خاڵ).

ئیتر هەر بژیت.

کامل بصیر

٢/١٠/٩٦

بۆ وێژەری ناسەکەوتووی کورد مامۆستا شاکر فەتاحی بەڕێز

سڵاوێکی فراوان بەوەی نامەت دەگەشتە کاتێکی زیندووی شاد بیت .
پێشەکی زۆر بە پیرۆزترەوە نامە بەنرخەکەی تۆم بە دەست گەیشت، زۆر
دڵ شاد بووم بەوەی کە نامەم لە لای تۆی بەڕێزە بوو بێت .
وە هیوادارم کە هەمیشە وردتر جوانەکانت لە ئاسمانی کوردەواریدا
بەشدار بن بۆ رووناککردنەوەی بیروباوەڕی گشتی کوردیک .
مامۆستای بەڕێز !
ئەوەی کە من نووسیبووم دەربارەی پەرتووکە بەنرخەکەتان (ئافرەتی کورد)
دڵۆپێکە لە بۆ دەرەقی ئێوەی بەڕێز کە بەڕاستی پایە بەرزن
لە وێژەی کوردی بەگشتی و لە پێشانی کۆمەڵایەتی بەتایبەتی
مامۆستای بەڕێز !.
راستەکەی ئەمەوێ باسی پەرتووکەکەی تۆ بکەم لە ئێستگەی بێتەلی بەغداوە
رەنگە چوارشەممەی ئاینده سەعات ٨ شەو بتوانم باسی بکەم هیوا
دارم کە ئەوکاتە بە یەکگرتن جێگای سەرنجی ئێوەو هەوادارانی کورد
بێت .
ئیتر لە کۆتایی نامەکەما ئەحوالی گشت ماڵەوە ئەپرسم تکایە سڵاوم
تایبەتیم بگەیەنە مامۆستای بەڕێز (شێخ محەمەد خاڵ) .

ئیتر هەر بژیت

کەمال بەسیر

هەولێر

١٩٦٩/٤/٢

برای زۆر خۆشەویست و بەرێز جەنابی کاک شاکر

ئەم کاتەتان باش و لە یەزدانی پاکم گەرەکە هەموو کاتێکتان بەپێی مەرامی ئێمە هەر باشی بێ، دیارییە بەنرخەکەتان بەدوو دەستی شانازیەوە وەرگرت بەرامبەر بەلوتفی بێ پایانی برایانەی جەنابتان کە گەلێک جاری دیکەش لێمانت روون کردۆتەوە نە زمان و نە قەڵەمم تەوانای ئەوەی نیە کە سوپاسێکی نەک تەواو بەڵکو بەنیوەییشتان بۆ بەجێ بهێنێ. لەوە زیاتر کە لە هەموو هەڵکەوتێکا گوتوومە و هەر ئەیڵێم (کاشکی ئەم گەلە ماڵوێران و لێ قەوماوەمان چەن ئەندامێکی وەکو مامۆستا شاکر فەتاحی راست و پاکو دڵسۆزی هەبوایە) هیچی دیکە نازانم بیڵێم.

کاکی بەرێز چیرۆکی مەم و زین هەرچەندە لە ئاسمانی ئەدەبی کوردا پایەیێکی زۆر بەرز و تایبەتی هەیە بەلام ئەم لێکۆڵینەوە بەنرخەی جەنابتان بەتەوانایێکی زۆر بەتین و چرایێکی زۆر بەئیشقی دڵسۆزانەی ئەدەبی پایەکەی ئەوەندەی دیکە بلند و مافەکەی گەلێک زیاتر روون کردۆتەوە. یاخوا تا دیرزەمان و تا گەلێک مافی واتان لێ وەرئەگیرێ هەر بژین بەتەندروستی و دڵ شادی بۆمان.

بەبۆنەی ئەو لێکۆڵینەوە بەنرخە بەدڵ ئارەزووم کرد کە ئەمجارەش چیرۆکەکە بەشێنەیی بخوێنمەوە کەچی داخەکەم هەرچەن لەناو کتێبخانەکەم گەرام ئەوی پیرەمێردم هەبوو نەمدۆزیەوە و لە هەموو کتێبخانەکانی هەولێریش نەمابوو. تەنها ئەوی مامۆستا گیو هەیە کە بەراستی باش تێی ناگەم. ئەمجا نازانم ئایا لە سلێمانی لە نوسخەکەی مامۆستا هەژار کە بەلامەوە باشترینیانە یا هی پیرەمێرد مست ئەکەوێ یا نا، مامۆستا ڕەشوانی زۆر سەلام و حورمەتی هەیە.

ئیتر هەر بژین کاکی خۆم

برای دڵسۆزتان

عبدالقادر قرگەیی

بۆ ماموستای زۆر بەڕێزی خۆم
پێشکەشە.

پێشەکی بە گەرمییەکەوە زۆر لە حاڵی تەندروستیتان ئەپرسم و هیوادارم
کە هەمیشە لەو پەڕی خۆشی و کامەرانیدا بن. زۆر سڵاو لە دایکی کاک
شێرکۆ ئەکەم.

ماموستا. ئەوێ بم بوری کە تا ئێستا نەم توانیوە بە خزمەتت بگەم
چونکە من لە کرکوک تەعین بوم بە ماموستای سەرەتایی لە ناحیەکی
شوان و ئەو کاتانەی کە هاتومەتەوە بو سلیمانی ماوەیەکی زۆر کورت
بوە.
بەڵام من تۆ بە گەورەی خۆم دائەنیم و هیچ کاتێک چاکەی جەنابت لە بیرم
ناچێ.
جا زور بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی بەرهەمە بەنرخەکانت ئەکەم
و هەمیشە لە یازدانی ئەپاڕێمەوە کە دریژت زۆر بێ !؟
ماموستا.
خوشکە آمینە مصطفی اللە جان و خوشکە پاکیزە معروف پێکەوە لە شوانین
ئەوانیش زۆر سڵاوت لێ ئەکەن و زۆر بیریتی ئەکەن ئەو دوو ژنانەیەکەشەوە
کە لە پۆلدا پێکەوە دائەنیشتن و گوێیان لە قسە بەنرخەکانی ماموستاکانی
ئەبو. وە هەمیشە بە سەربەرزییەوە ناوتان ئەهێنن.
داوا و ئومێدم ئەوەیە کە سەرکەوتوبێ لە ژیانتا.
و خۆشنیەمە بەستمانە

قوتابی بچوکت
جمیلە صبری
٢٧/٢/١٩٦٦

دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی
شاکر فەتاح لە ڕیزی پێشەوە لە ناوەڕاستدا، ژمارەیەکی زۆر لە شاعیران و
ئەدیبانی تر لە وێنەکەدا دەرکەوتوون

نووسراوخانەی
[پەروەردەی خوێندەواری کورد]
سلێمانی - گەڕەکی شۆڕش - ٢٦٥
١٥/٨/١٩٧٦

بۆ بەڕێز بەڕێوەبەری نووسراوخانەی گشتی صلاح الدین
بابەت - پێشکەشکردنی دیاری بۆ نووسراوخانەکەتان.

لە دوای ڕێزگرتن و پیشاندانی خۆشەویستی، [نووسراوخانەی پەروەردەی خوێندەواری کورد] پێی خۆشە کە ئەم بیست نووسراوەی بەرهەمی خۆیان پێشکەش بکات، بۆ کەڵک و چاکەی خوێندەوارانی نووسراوخانەکەتان.
تکایە کە گەیشتیان پێمان بڵێن و ئاگادارمان بفەرموون.
ئیتر سوپاس.

شاکر فتاح أحمد
[خاوەنی نووسراوخانەی پەروەردەی خوێندەواری کورد]

ناوی نووسراوەکان:

(١) - زەردەشت.
(٢) - سەرزات.
(٣) - گاریبالدی.
(٤) - دیفالێرا.
(٥) - لویی پاستێر.
(٦) - مادام کوری.
(٧) - چەند کەم و زۆرێ لە ئەورووپا.
(٨) - کورتە باری ئەفلاتون.
(٩) - پەروەردەی کادە، ئایینی یەزیدی.
(١٠) - چارلسی یەکەم لەبەردەم دادگادا.
(١١) - ستۆپالاتەنەتوون.
(١٢) - ڤۆڵتێر.
(١٣) - عمر خیام.
(١٤) - مەلا کاکە حەمە.
(١٥) - داماوی موکریانی.
(١٦) - گەشتی شارباژێڕ.
(١٧) - 〃 سرۆچك.
(١٨) - 〃 پشکوین.
(١٩) - 〃 هەڵچە و هەرمان.
(٢٠) - شێلۆدەر.

## بۆ / شاکر فتاح

خزمەتی ئەدەب و رۆشنبیری کوردی مەزنترین میدالیای هەرە بەرزی ژیانی ئیمڕۆی کوردەوارییانە یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد بە بۆنەی سێیەم میهرەجانی شیعری کوردییەوە قەدرزانی و ڕێز گرتنی ئێوە بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی چونکە ئێوە چرای ڕووناکی بوون لەم ڕێگە پیرۆزەدا کە خزمەتی چاکی گەل و ئەدەبی کوردییان کردووە...

ئێمە سەربەرزی و تەمەن درێژیتان بۆ دەخوازین .

یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد

١١-٩-١٩٨٦

شاکر فەتاح لە لوبنان - بەیروت، ساڵی ١٩٣٢

١٩٣٢/١/٤

## جەژنتانە پیرۆزبێ

ماڵی جەژنەیە روژی دڵخوشی • بوتو چارە بەرگی رەش پوشی

گەر لەت لەت کری هیچ رانەوەستی • هەتانەبینی جەژنی بەراستی

# پێرست